بەرگی دووەم

ڕۆمان

# گەمژە

فیۆدۆر دۆستۆیفسکی



وەرگێڕانی: حەمەکەریم عارف



# گەمژە

## بەرگی دووەم

چاپی دووەم
٢٠٢٠

فیۆدۆر دۆستویفسکی
وەرگێڕانی: حەمەکەریم عارف

ئەم ڕۆمانە لەنێوان
ساڵانی ١٨٦٧- ١٨٦٩دا نووسراوە و
بە زنجیرە لە گۆڤاری (پەیکی ڕووسی)دا بڵاو بووەتەوە

## بەشی سێیەم

### فەسڵی یەکەم

هەمیشە لە وڵاتی ئێمەدا گلەیی ئەوە دەکرێت کە پیاوی کردارمان نییە. بۆ نموونە دەڵێن سیاسەتوانان زۆرن، جەنەراڵان و بەڕێوەبەرانی پرۆژەێن جۆراوجۆر، ئەوەندە زۆرن هەرگیز پەکت ناکەوێ، وەکو دار وبەردن، بەڵام پیاوانی کار، پیاوانی مەیدان دەست ناکەون، هەموو خەڵکی ئەو گلەییەیان هەیە کە پیاوانی کار دەست ناکەون. تەنانەت دەڵێن لە هەندێ هێڵی سکەی قیتارا، بەزەقی هەست بە کەمی و نەبوونی کارمەندانی کارامە و لێهاتوو دەکرێت. دەڵێن هەندێ کۆمپانیای کەشتیرانی، مەحاڵە بتوانن فەرمانبەرانی تەکنیکی نەک کارامە، بەڵکو نیمچە کارامەش بدۆزنەوە. لەپڕ دەبیستی لە هێڵێکی تازەدا دوو قیتار تامپۆنیان کردووە، قیتارێک لەسەر پردێک، بە پردەکەوە کەوتووەتە خوارەوە. هەندێ جار لە رۆژنامانـدا هەواڵێک دەخوێنینەوە کە قیتارێک، لە سەفەرێکی زستانەی چەند سەعاتیدا، لە ناوجەرگەی بەفرەجارێکدا پەکی دەکەوێ و بە درێژایی زستانەکە ناکەوێتەوە ئیش. رێبوارانی داماو کە بە خەیاڵی خۆیان هەرچەند سەعاتێکیان پێدەچێ، پێنج دانە رۆژ لە بەفرا دەمێننەوە. یان جاری





وایەوەکو دەگێڕدرێتەوە سەدان تۆن کاڵا بەدەم چاوەڕوانی گواستنەوەوە دوو سێ هەیڤان لە جێی خۆی ماوەتەوە و خراپ و خەسار بووە. دەگێڕنەوە (کە باوەڕکردن بەمە زەحمەتە) کە گوایە جارێک یەکێک لە فەرمانبەرانی ئیداری، کە چاودێر و بەڕێوەبەری سکەی قیتار دەبێت، کاتێ نوێنەری بازرگانێک پەلەی لێ دەکات کە کاڵایەکی بۆ بار بکات، کە هیچ وەڵامێکی پێنابێت، تا دەتوانێ شەپازللەیەکی بە پەناگوێدا دەدات. کە لێی دەپرسنەوە بۆ ئەو کارەی کردووە، لە وەڵامدا دەڵێت چونکە "تووڕە" بووە. ژمارەی فەرمانگە و دایەرە و نووسینگەی دەوڵەتی، ژمارەیەکی خەیاڵییە، پیاو سەری لەو هەموو فەرمانگەیە دەسووڕمێ. هەرچی خەڵکی هەیە فەرمانبەری حکومەت بوون یان فەرمانبەرن یان گەرەکیانە کە لە ئاییندەدا ببن بە فەرمانبەر. باشە ماقوولە لەنێو ئەم هەموو هەزار بە هەزار خەڵکە زۆر و زەبەندەیەدا، چەند کادرێکی کەمی کارامە دەست نەکەوێ، بەکەڵکی ئەوەبێن لە کۆمپانیایەکی کەشتیرانیدا کار بکەن؟

هەندێ جار، وەڵامێکی هێندە سادە و ساکاری ئەو پرسیارە دەدرێتەوە کە زەحمەتە پیاو باوەڕی پێ بکات. خاوەنانی ئەو وەڵامە دەڵێن: هەموو خەڵکی لە وڵاتی ئێمەدا یا فەرمانبەر بوون یان هێشتا فەرمانبەرن، ئەم سیستمە لەوەتای دوو سەد ساڵە، هەڵبەتە بە چاولێکەری سیستمی ئەڵمانی. هەروا بووە و پشتا و پشت هاتووە و لە باب و باپیرانەوە بۆ نەوە و منداڵان ماوەتەوە، بەڵام دامودەزگا کارگێڕی و فەرمانگە دەوڵەتیەکان پڕن لە خەڵکانی بێکار و تەمەڵ و تەوەزەل، کار گەیشتووەتە ئەوەی تەمەڵی و کارنەزانی و نەشارەزایی عەمەلی، تا ئەم دواییانەش لەنێو خودی فەرمانبەرەکاندا، بە باڵاترین و باشترین خەسڵەت دەهاتە ژماردن.

بۆچی خۆمان بە باسی فەرمانبەرانەوە مژول بکەین، لەکاتێکدا دەمانویست باسی خەڵکانی مەیدانی وعەمەلی بە گشتی بکەین؟ دەتوانین لێرەدا بێ هیچ دوو دڵییەک بڵێین کە لە وڵاتی ئێمەدا شەرمنۆکی و نەبوونی دەست پێشکەری و داهێنانی شەخسی، لە کۆنەوە و تا ئێستاش بە باشترین نیشانەی پیاوی کار دانراوە و دادەنرێت. باشە ئێمە بۆچی خۆمان تۆمەتبار

بکەین، ئەگەریش بشێت ئەم بۆچوونە بە تۆمەت بێتە ژماردن؟ هەمیشە، لە هەموو شوێنێ، لە سەرانسەری دنیادا، نەبوونی دەست پێشکەری و داهێنانی شەخسی، بە یەکێک لە خاڵە ئەرێنییەکانی پێشکەوتن و سەرکەوتنی پیاوی کار و ئەهلی کاروکاسبی هاتووەتە ژماردن. بەلای کەمەوە سەدی نەوەد و نۆی خەڵکی لەگەڵ ئەو بۆچوونەدا بوون. لە سەدا یەک (بەلایەنی هەرە زۆرەوە) لەگەڵ ئەو بۆچوونەدا نەبوون.

داهێنەران و بلیمەتان، لە هەموو رۆژگارێکدا و لە سەرانسەری دنیادا، لە سەرەتای ژیانی داهێنانیانەوە و زۆر جار تا کۆتایی ژیانیان، لەلایەن کۆمەڵگەوەوەکو گەوج و ئەگەر زۆر زۆر خاتریان گیرابێ وەکو نیمچە گەوج تەماشا کراون. ئەم جۆرە بەرخوردە کۆنە، لە هەموو دنیادا باو بووە. بۆ نموونە خەڵکی بۆ ماوەی دەیان ساڵ بەوە راهاتبوون کە پارەوپووڵیان لە بانکی لومبارد* دابنەن و ملیاران پارەوپوول بە قازانجی سەدی چوار لەوێندەر کەڵەکە ببێت، کاتێ بانکی لومبارد لەکار کەوت و نابووت بوو، ئیدی ئەو خەڵکە دەستێکیان کەوتە ئەوبەر و دەستێکیان کەوتە ئەمبەر، ئیدی هەر کەسە خۆی و دەستپێشکەری و داهێنانی خۆی. ئیدی بە بەرچاوی هەموو خەڵکی یەوە، بەشی هەرە زۆری ئەو هەموو ملیۆنان پول و پارەیە کەوتە دەستی کەڵەکبازانی چەورە و چەکل و لە گەرمەی ساختە بازی (مچاربات)ی بێ بنجوبناواندا، فەوتاو هەڵم ئاسا چوو بە ئاسمانا، ئیدی ئەوە ئاکامی لۆجیکی دابونەریتە کۆمەڵایەتی و ئاکارە پەسەند و باوەکانی رۆژە. بۆیە دەڵێم " ئاکاری پەسەند و باو" چونکە ئەگەر شەرم و شکۆی پەسەند و گوێڕایەڵی و دوورکەوتنەوە لە هەر دەست پێشکەری و داهێنانێکی شەخسی، کە هێشتا لە وڵاتی ئێمەدا باوە، بە رای زۆربەی هەرە زۆری خەڵکی، نیشانە و سیفەتی هەر مرۆڤێکی جیدی و بە حورمەت بێ، ئەوا هەر کەسێک رەفتاری خۆی و شێوازی ژیانی لەناکاوا بگۆڕێت، دەبێ بە بنێشتەخۆشەی ژێر ددانان و لۆمەکاری خەڵکی، چونکە لە رێڕەوی گشتیی کۆمەڵگە لایداوە و ئەو کارەی نەک هەر دوورکەوتنەوەیە لە دابونەریتی کۆمەڵایەتی، بەڵکو بە جۆرە بێئەدەبیەکیش

دەژمێرێ. بۆ نموونە، کام دایکە، کە منداڵەکانی لە ڕووی سۆزدارییەوە زۆر خۆش دەوێ، ئەگەر کوڕەکەی یان کچەکەی، بەئاستەم. لە سکەی، دابونەریتی باوی کۆمەڵگە لا بدات و دوور بکەوێتەوە، هەراسان نابێت؟ لە دڵی خۆیدا دەڵێت: "نا، نا، بەختەوەری و ژیانی ئاسوودە زۆر باشترە لە داهێنان و ڕێساکان" هەموو دایکێک کە منداڵەکەی دەلاوێنێ، ئەو ئامۆژگارییەی دەکات، بەڵام دایەنانی لای ئێمە، لە قالو بەلاوە، کاتێ منداڵەکانمان لە بێشکەدا ڕادەژەنن، بەم لایە لایە ئەبەدیە دەیان خەوێنن!" تۆ ئەنجام دەبی بە خاوەن پلەوپایە، دەوڵەمەند دەبێ. دڵنیام لە کاری خۆتا، پێشدەکەوی، بە جەنەڕاڵ دەبی". بەو جۆرە دەبینین، تەنانەت دایەنانی منداڵەکانیشمان، هەمیشە بەو چاوە ڕوانیویانەتە پلەوپایەی جەنەڕاڵی، کە نیشانە و پێوەری باڵای بەختەوەری ڕووسییە. مانای وایە ئەم پلەوپایەیە، لەو بەها باڵایانەبووە کە هەموو خەڵکی ڕێزیان گرتووە و ئاواتیان پێ خواستووە و بە لوتکە و نیشانەی بێ چەند و چوونی شادمانی و خۆشی هاتووەتە ژماردن.

کام پیاوی ڕووسی هەیە، دوای ئەوەی تاقیکردنەوە و ئەزموونە ئاسایەکان یەک لەدوای یەک ببڕێت و سی و پێنج دانە ساڵ لە خزمەتا بگوزەرێنێ و پارەیەکی مۆڵ لە بانکی لومباردا دابنێت، نەبێت بە جەنەڕاڵ؟ بەو جۆرە تاکی ڕووس، بە خوت و خۆڕایی، بێ ئەوەی، زەڕەیەک خۆی ماندوو بکات، لە ئەنجامدا وەکو پیاوی کار، سەنگ و ئیحتوبار پەیدا دەکات. یانی هەموو کەسێکی تەمەڵ و تەوەزەل و بێکارە و گوێڕایەڵ، دەگاتە پلەی جەنەڕاڵی، تەنیا تاکی داهێنەر، تاکی یاخی و لاسار و گوێنەبیس و تاکگەرا، بە کورتیەکەی تاکی نیگەرانی بێئۆقرەی قاڵب ناپەزێر ناگاتە پلەو پایەی جەنەڕاڵی. ڕەنگە ئەم قسەیەی من جۆرە موبالەغەیەکی تیابێ، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی سەرنجێکی دروست و ڕاستەوئیدی پێوەر و پێناسەی کۆمەڵگەی ئێمە بۆ پیاوی ناو پیاوان، بۆ پیاوی کار و نموونەیی وابووە.

بەهەرحاڵ، وا دیارە زۆر لە باسەکەمان دوور کەوتینەوە، کە مەبەستی سەرەکیی ئێمە ئەوە بوو، چەند ڕوونکردنەوەیەک لەمەڕ ماڵباتی یەپانچین

پێشکەش بکەین... ئەندامانی خانەوادەی یەپانچین، یان بەگوتەیەکی دی ئەوانەیان کە زیاتر، بیریان دەکردەوە، هەر هەموویان خەسڵەتێکی هاوبەشیان تیابوو کە دروست پێچەوانەی ئەو پێوەر و خەسڵەتانە بوو کە تۆزێ لەمەوپێش باسمان کردن. هەندێ جار وایان هەست دەکرد، کە کاروباری ماڵی ئەوان، وەکو کاروباری ماڵی خانەوادەکانی دی بەڕێوە ناچێت، هەڵبەتە بەبێ ئەوەی بەتەواوەتی لە مانای ئەوە بگەین "چونکە دەرککردنی مانای ئەو هەستە زۆر دژوارە". ئەو ڕێگەیەی کە بۆ خانەوادەکانی دی تەخت و هەموار بوو، بۆ وان ڕێگەیەکی سەخت و ناهەموار و بەردەلان و پڕ هەوراز و نشێو بوو. یانی ڕەوشی خەڵکی ئاسایی و لە بەردلان بوو، بەلام ڕەوشی ئەوان، یانی ماڵباتی یەپانچین نا ئاسایی و دژوار بوو. خەڵکی گوێڕایەڵی قەراردادەکان بوون و بەئاسانی ژیانیان لە بەر دەڕۆیشت، بەلام یەپانچینەکان، هەمیشە بە پێچەوانەوە، لە قەراردادەکان دەردەچوون و پابەند نەدەبوون. خەڵکی هەمیشە بەگوێرەی دابونەریتانی باو ڕەفتاریان دەکرد، یانی دەگەڵ عامێ دەچوونە شامێ، بەلام خێڵی یەپانچین وانەبوون، ڕاستە لیزاڤیتا پروکو فیڤنا، هەندێ جار لەڕادەبەدەر سڵی دەکردەوە، مدارای دابونەریتی باوی دەکرد، بەلام هێشتا لەو ئاستەدا نەبوو کە کۆمەڵگە ڕازی بکات. ئەمە جگە لەوەی کە هەر لیزاڤیتا پروکوفیڤنا خەمی ئەو شتەی بوو، دەنا کیژەکانی هەرچەندە بە تەمەن بچووک بوون، بەلام لە ئێستاوە، گیانی یاخیگەرێتی و نۆڕینێکی ڕەخنەیی تەنزئامێزیان هەبوو، زۆر زیت و زرینگ و بە هۆشوگۆش بوون. جەنەڕاڵیش توانای خوێندنەوەی قووڵایی شتەکانی هەبوو (هەرچەندە بە درەنگەوە)، بەلام عادەتی وا بوو ئەگەر پەشێویەک هاتبا پێشێ، لەبن لێوانەوە "ئم"ێکی بۆ دەکرد و هیچی نەدەگوت. شتەکەی بەتەواوەتی بۆ لیزاڤیتا پروکوفیڤنا بەجێ دێڵاو، خۆی لە هەر بەرپرسیارێتیەک دەبوارد و شتەکەی بەملی لیزا ڤیتادا دەدا. ئەم خانەوادەیە خاوەنی دەستپێشکەری و داهێنانی تەواوەتی و تایبەتی خۆی نەبوو، یان ئاگایانە و بەئانقەست، ڕێگەی تاکگەرایی و یاخیبوونی نەدەگرتە بەر - چونکە ئەوە دەیکردە

بێحورمەتی بە دابونەریتی باو - بەڵێ، شتی وا لەئارادا نەبوو. هەرچەندە مەڵباتی یەپانچین، خەڵکانێکی بەڕێز وحورمەت بوون، بەڵام وێڕایی ئەوەش، پڕ بە پێستی پێناسە باوەکەی خانەوادەی بە حورمەت نەبوون. لیزاڤیتا پروکوفیڤنا، لەم دواییانەدا گەیشتبووە ئەو قەناعەتەی کە گوناهی هەر هەموو ئەو ناتەبایی و ناکۆکییەی ماڵەکەیان لە ئەستۆی ئەو دایە و زادەی تەبیعەت و سروشتی "نەحس" و شوومی ئەو. دیارە ئەم بیر و قەناعەتە هێندەی دی ئەزیەتی دەدا و هەمیشە گلەیی لە خۆی دەکرد کە "سەرشێتێکی خۆسەری گەوج و نالەبارە". خۆی بە کێشەی خەیاڵی و گومان و دوو دڵی بێ بنجوبناوانەوە ئازار دەدا. هەمیشە پەشێوو پەرێشان پەی بە چارەسەری ئاسانترین کێشە نەدەبرد، مێشێکی لە خۆی دەکرد بەگامێشی، ڕۆژ بە ڕۆژیش خراپتر دەبوو.

لە سەرەتای چیرۆکەکەمانەوە، باسی ئەوەمان کرد کە ماڵباتی یەپانچین، بە ڕاستی لەنێو خەڵکی دا قەدر و حورمەتی خۆیان هەبوو. جەنەڕاڵ ئیڤان فیدوروفیچ بە خۆی، هەرچەند لە بنەماڵەیەکی گومنا بوو، لە هەموو شوێنێ بەڕێز و حورمەتەوە پێشوازی دەکرا. ئەم ڕێزو حورمەتەش لەوەوە هاتبوو، کە یەکەم ڕێزی خۆی دەگرت و زۆر دەوڵەمەند بوو. دووەم زۆر بە ئەدەب و ئەرباب بوو، ئەگەرچی نەختێک کەم هۆش بوو، بەڵام وا دیارە ئەم کەم هۆشییە ئەگەر بۆ هەر کەسێکی ناسراوی ناودار زەروری نەبێ، ئەوا بۆ هەر پیاوێک کە بەجیددی لە خەمی پارە پەیداکردنا بێت. زۆر پێویست بێت. جەنەڕاڵ یەپانچین پیاوێکی خۆشخوو و خدە پەسەند، بێ فیز و خاکی، بوو. دەیزانی کەی بێدەنگ دەبێت و زاری تێکدەنێت، لێ وێڕای ئەوەش ڕێگەی زماندرێژی بەکەس نەدەدا، نەک هەر بەزەبری پلەو پایەکەی، کە جەنەڕاڵ بوو، بەڵکو بە هۆی ئەوەشەوە کە پیاوێکی سەنگین بوو، ڕێزی خۆی بە ڕادەیەک دەگرت، کە بەرانبەرەکەی ناچار بوو ڕێزی بگرێت. وێڕای هەموو ئەمانەش پشت و پشتیوانی بەهێز و دەسترۆی هەبوون.

بەڵام لیزاڤیتا پروکوفیڤنا، وەکو پێشتر گوتمان لە بنەماڵەیەکی




وەجاخزادە و ڕەسەن بوو. هەرچەندە لە وڵاتی ئێمەدا مەسەلەی خوێن و ئەسڵ و فەسڵ، ئەگەر کۆمەڵێک پەیوەندیی زۆر بەهێزی دیکەی لەپشت نەبێت، بایەخێکی ئەوتۆی پێنادرێت، بەڵام لیزاڤیتا پروکوفیڤنا ئەو پەیوەندییانەشی دروست کردبوو، لەنێو لایەنگران و دۆست و بناژۆکانیەوە، زۆر بە حورمەت و خۆشەویت بوو. بەکورتی لەنێو خەڵکیدا جێگەی ڕێز و حورمەت بوو. هەڵبەتە نیگەرانی و خەمە خانەوادەیەکانی، بێبنجوبناوان بوون و زادەی شتی زۆر بچووک و کەمبایەخ بوون و زیاتر بە خەیاڵ لە خۆی گەورە دەکردنەوە. ئیدی پیاو ئەگەر بالوکەیەک بەسەر کەپوی یان تەوێڵیەوە بێت، وا دەزانێ، خەڵکی هیچ ئیش و کاریان نییە تەنیا ئەوە نەبێ سەیری ئەو بالوکەیە بکەن و گاڵتە بە خاوەنەکەی بکەن، ئەگەر ئەو خاوەنەی دۆزەرەوەی ئەمریکاش بێت. هەڵبەتە پێویست بەوتن ناکات کە لیزاڤیتا پروکوفیڤنا لەنێو کۆمەڵگەدا، بەوە ناسرابوو کە تۆزێک "نەساز و نەبانە"، بەڵام ئەمە هەرگیز لە ڕێز و حورمەتی ئەوی کەم نەدەکردەوە، چونکە بە ڕاستی جێگەی ڕێز و حورمەتی خەڵکی بوو، بەڵام لە ئەنجامدا گومانی لەم ڕێزو حورمەتە پەیدا کردبوو، ئیدی ڕەگوڕیشەی هەموو گرفت کێشەکانی دەچووەوە سەر ئەم گومان و بەدگومانییە. کە دەیڕوانییە کیژەکانی، خەفەتی بەوە دەخوارد کە تەبیعەتی ئاڵۆز و نەساز و ناشایستەی سەیروسەمەرەی ئەو، کیژەکانی ئەزیەت دەدات و کاریگەری خراپی لەسەر ئایندەیان دەبێت، کەچی هێشتا ئەو گلەیی لە کیژەکانی و لە ئیڤان فیدروفیچی مێردی دەکرد، کە نە ساز و ئاڵۆزن و ئەوانی بە خەتابار دەزانی، هەمیشە لە شەڕابوو لەگەڵیانا، کەچی وێڕای ئەوەش لە گیانی خۆی خۆشتری دەویستن و ئامادەبوو خۆی بە قوربانیان بکات و شەیدایانە خۆشی دەویستن.

ئەوەی کە زیاتر ئازاری دەدا، ئەو خەیاڵە بوو کە کیژەکانیشی خەریکەوەکو ئەو "نەساز" دەردەچن و لە دنیادا نموونەیان نەبووە و نابێت. بەردەوام لە دڵی خۆیدا دەیگوت: "کار وابڕوات دەبن بە نەهلیستی." نزیکەیساڵێک دەبوو کە ئەم خەیاڵە خەمناکە ڕۆژ بە ڕۆژ لە زەینیا ڕەگاژۆ دەبوو

ویتر دەچەسپی و هەمیشە لە خۆی دەپرسی: "یەکەم: بۆچی شوو ناکەن؟ بۆ ئەوە هاتوونەتە دنیا تا عەزابی دایکیان بدەن- ئامانجی سەرەکی ژیانیان ئەوەیە، ئەمانە هەر هەمووی بەرەنجامی بیرین تازە مۆدە، بە تایبەتی بەرەنجامی ئەو مەسەلە نەگریسەیە، مەسەلەی ژن! ئەدی چۆن، مەگەر ئاگلایا شەش مانگێک لەمەوپێش کەڵکەڵەی ئەوەی نەکەوتبووە سەر کە قژە جوانەکەی ببڕێت؟ - پەنا بە خوا! من لە تەمەنی ئەودا، قەت ئەو قژە جوانەی ئەوم نەبوو! - ئەیەڕۆ قەیچییەکەم بەدەستیەوە گرت، ناچار بووم لەبەردەمیا چۆک دابدەم و لەبەری بپاڕێمەوە کە ئەو خەیاڵە لە مێشکی خۆی دەر بکات و کاری وا نەکات.. گریمان ئاگلایا بە درۆوە وای دەنواند بەتەمایە قژی ببڕێت و ئەم کارە تەنیا بۆ توڕەکردنی دایکی دەکات، چونکە کیژێکی جینگن و خۆسەر و نازدارە، یەک جار گوتمان شەڕانییە و بڕایەوە، بەڵێ شەڕانییە! ئەدی ئەو ئەلکسندرا بەستەزمانە بۆ ناڵێی، خۆ ئەو بە مەکروناز نییە، کچێکی زۆر ساویلکەیە، ئەو بۆچی دەیویست چاو لە ئاگلایا بکات و قژی ببڕێت. ئاگلایا بردبویە مێشکی ئەو بێ ئەقڵەوە کە بە قژی کورتەوە باشتر خەوی لێدەکەوێت و سەریەشەکەشی لە کۆڵ دەبێتەوە؟ لەماوەی ئەم پێنج ساڵەی ڕابردوودا، چەندین خوازگاریان هاتبوون، کە کوڕی زۆر قۆز و پیاوی زۆر شایستە و پایە بەرزیان تیابوو! باشە چاوەڕوانی چین؟ بۆچی مێرد ناکەن؟ ئەگەر مەبەستیان ئازاردانی دایکیان نییە؟ هەڵبەتە، گومانی تیانیە، هەر ئەوەیان مەبەستە! .

ئەنجام، یەکەم تیشکی هەتاو، دڵی دایکانەی ڕووناک کردەوە. بەلای کەمەوە یەکێک لە کیژەکانی، یانی ئادیلایە، هاتووەتە ڕەدا و لێبڕاوە شوو بکات و ماڵ و حاڵ بۆخۆی پێکەوە بنێ. لیزاڤێتا پروکوفیڤنا، هەر کە دەرفەتی بۆ هەڵدەکەوت کە گوزارشت لە خۆی بکات، بە دەنگی بەرز دەیگوت " تازە ئەم یەکەیانم لە دەست ڕۆیی! " - بەڵام لە ناخی خۆیدا زۆر خۆشحاڵ بوو": شوویەکی زۆر باشە، تا بڵێی گونجاو و لەبارە! تەنانەت لە ناوەندە ئەرستۆکراتەکەشدا بە باشی و بەڕێزەوە باسی دەکەن: دەزگیرانەکەی پیاوێکی ناسراوە، لە چینی ئەشرافانە، دەوڵەمەندە، پیاوێکی

ئەربابە. لە هەموو ئەمانە باشتر، ئەوەیە ئەم شووە بە حەزلێکردن بووە و کچە بەدڵیەتی. پیاو لەوەی پتر چی گەرەکە؟ هەڵبەتە لیزاڤیتا پروکوفیڤنا، هەمیشە سەبارەت بە ئادیلاید و ئایندەی ئادیلاید، لەچاو دوو خوشکەکەی دیکەیدا، کەمتر هەستی بە ترس و نیگەرانی دەکرد. هەرچەندە مەیل و ئارەزووی هونەریی ئەم کیژە ناوەنجیە مایەی پەرێشانی بەردەوامی دڵەی هەمیشە گوماناوی دایکی بوو، بەڵام ئەنجام بەوە دڵخۆشیی خۆی دەدایەوە و نیگەرانیی خۆی دەڕەواندەوە: "هەرچییەک بێ، تەبیعەتێکی کراوە و خۆشی هەیە، کیژێکی ئاقڵە و دەتوانێ تەکبیری حاڵی خۆی بکات".

زیاتر خەمی ئاگلایا و ئایندەی ئاگلایای بوو، بەڵام سەبارەت بە ئەلکسندرای کیژە گەورەی، ئەم دایکە داماوە بە خۆیشی نەیدەزانی ئایا پێویست دەکا خەمی بخوات یان نا. هەندێ جار بە تەواوەتی نائومێد دەبوو وای خەیاڵ دەکرد ئیدی ئەم کچە "هیچ ئایندەیەکی" نابێت، تەمەنی بیست و پێنج ساڵە و لەوەیە هەر بە قەیرەیی بمێنێتەوە. " چەند جوانیشە! " ئەم دایکە خەم دایدەگرت، شەو تا بەیانی بەدەم فرمێسک ڕشتنەوە، بۆ ئەلکسندرا دەگریا، ئەلکسندراش بێ خەم و خەیاڵ، هێدی و هێمن تا بەیانی دەخەوت! "ئاخر ئەم کچە چییە؟ لە هەوادارانی نەهلیزمە یان گێل و کەودەنە و هیچی تر؟"

لیزاڤیتا پروکوفیڤنا، زۆر چاک دەیزانی کە کیژەکەی نە گێلە و نە کەودەن. بەڵکو زۆریش لە هەست و هۆش و بەردەباری ئەلکسندرا ڕازی بوو، حەزیدەکرد لە کار و بارەکاندا پرسوڕا و شیرەتی پێبکات، بەڵام گومانی لە "نەرمونیانی" ئەلکسندرا نەبوو. "ئەوەندە هێور و ئارام بوو، بە هیچ شتێک شێلو نەدەبوو. ئاخ!... ئەمانە شێتم دەکەن!". لیزاڤیتا پروکوفیڤنا هەمیشە جۆرە سۆزێکی تایبەتی، سۆزێکی مەند و لە ڕوونکردنەوە نەهاتووی دەرهەق بە ئەلکسندرا هەبوو، تەنانەت لە ئاگلایاش کە نازداری خۆی بوو، خۆشتری دەویست، بەڵام کە لە ڕووی سۆزی دایکایەتییەوە توڕە دەبوو، تەشەری وەکو "نەرمک و دەڵەمە و وڵە"ی لێ دەدا، ئەلکسندرا، کەم و زۆر خۆی شێلو نەدەکرد، بەڵکو بە ڕوویەوە پێدەکەنی. لیزاڤینا

پروکوفیڤنا هەندێ جار، لەسەر شتی زۆر بچووک و بێمانا نەک هەر تورە دەبوو، بەڵکو دەهری دەبوو، وەکو فیشەکەشێتە بەئاسمانا دەچوو. بۆ نموونە ئەلکسندرا، حەزی دەکرد زۆر بنووێت و خەونی زۆری دەبینی، جا خەوی بێتام و منداڵانە بێتامتر لە خەونی سادە و ساکاری منداڵێکی حەوت ساڵان. ئیدی بەم خەونە سادە و ساکارانە قەڵس و توورە دەبوو، کەس نەیدەزانی بۆچی. بۆ نموونە جارێک ئەلکسندرا لە خەویا حەوت مریشک دەبینێ، ئەم خەوە دەبێتە بایسی شەڕێکی گەورە لەنێوان خۆی و دایکیا! لەبەرچی؟ کەس نازانێت بۆ. جارێکی دی، تاقە جارێک، بەڕێکەوت خەونێکی تۆزێ خۆش دەبینێ: لەو خەونەیدا، ڕەبەنێکی خەڵوەتنشین لە ژوورێکی تاریک تاریکدا دەبینێ، هەرچی دەکات ناوێرێ بچێتە ژوورەوە، کاتێ خەونەکەی بۆ هەر دوو خوشکەکەی گێڕایەوە، هەر دووکیان لە قاقای پێکەنینیان داو خێرا چوون، بەدەم تەوس و توانجەوە خەونی خوشکەکەیان بۆ دایکیان گێڕایەوە، دایکیان تورە بوو، بە "گێل و گەوج"ی وەسف کردن. لە دڵی خۆیدا گوتی: "بەڵێ... بە ڕاستی حەیوانێکە لەو گۆڕە، هەست سزی وەکو خۆی نەبووەتەوە، بەهیچ شتێک شێلو نابێ، بەڵام هەندێ جار خەمین دێتە بەرچاو. هەندێ جار نیگای یەکپارچە داخ و کەسەرە. نازانم هۆی ئەم خەمبارییەی چییە؟" لیزاڤیتا پروکوفیڤنا، هەندێ جار ئەو پرسیارەی لە ئیڤان فیدوروفیچ دەکرد. هەڵبەتەوەکو خووی هەمیشەیی، بە ڕووگرژی و پەستی، بە هەڕەشەوە پرسیارەکەی دەکرد و وەڵامی یەکسەریی دەویست.. ئیڤان فیدروفیچ مینگە مینگێکی دەکرد، چارەی بەیەکا دەدا، شانەکانی هەڵدەتەکاندن و دەستی بڵاو دەکردنەوە و بەرسڤی دەدایەوە:

- حەزی لە شووە، پێویستی بە مێردە!

لیزاڤیتا وەکو بۆمبا دەتەقێتەوە، هاواری دەکرد:

- لەخوا دەپاڕێمەوە، بەلای کەمەوە ئەو مێردە وەکو تۆ نەبێ.. ئومێدەوارم لە بیروباوەڕ و بۆچوونەکانیا وەکو تۆ نەبێت ئیڤان فیدروفیچ! هیوادارم وەکو تۆ زبر و دڵڕەق نەبێت، دێهاتییەکی وەکو تۆ نەبێت ئیڤان فیدروفیچ!...

ئیدی جەنەڕاڵ هیچ چاری نەدەما، فیزماڵێکی دەدایە و خۆی دەدزییەوە. پاشان لیزاڤیتا پروکوڤینا، پاش "تەقینەوەکە"ی هێور دەبوەوە، هەر ئەو ڕۆژە بۆ ئێوارێ، وەک نە بای دی بێ نە باران، بە ڕوویەکی خۆش و ناسکییەکی لەڕادەبەدەر، ئارام و سەرڕێژ لە ڤیان و ڕێز و حورمەت دەکەوتە مجامەلەی مێردەکەی. ئیڤان فیدروفیچی "زبر و دڵڕەق" نەدەما، دەگۆڕا، دەبوو بە ئیڤان فیدروفیچی ئازیز، میهرەبان، پەرستراو و پشت و پەنا، چونکە بەدرێژایی تەمەنی ئیڤان فیدروفیچی خۆی خۆش ویستبوو، بەدڵ عاشقی بووبوو، ئیڤان فیدروفیچ زۆر چاک ئەمەی دەزانی، لە ئەنداز بەدەر ڕێز و حورمەتی لیزاڤیتا پروکوفیڤنای دەگرت.

بەڵام، سەرچاوەی خەم و عەزابی هەمیشەیی لیزاڤیتا پروکوفیڤنا، ئاگلایای کیژی بوو. ئەم دایکە لە دڵی خۆیدا دەیگوت: "ئەو کچەتیوە،ڕێک دەقاودەق کۆپیەکی منە، لە هەموو ڕوویەکەوە، وێنەیەکی کوت و متی منە: بێچووە شەیتانێکی خۆسەری بەدخوو! نەهلیست، وازوازی، نەساز، سەرشێت، ڕکونی و ناجسن، شەڕانی، جنگن، جنگیز! ئاهـ... مەگەر هەر خوا بزانێ لە ژیانا چەند بەدبەخت دەبێ!... چ ئازارێ دەچێژێ!..." بەڵام وەکو پێشتر گوتمان، ڕۆژ هەڵهات و بەلای کەمەوە، بۆ ماوەیەکی کورت، دنیای ڕووناک کردەوە، ئارامیی بە ڕەوشەکە بەخشی. لیزاڤیتا پروکوفیڤنا نزیکەی مانگێکی تەمەنی، بەوپەڕی ئازادی، دوور لەهەر خەم و پەژارەیەک، بردبووە سەر، دەنگ و باسی شووکردنەکەی ئادیلاید لە ناوەندە ئەرستۆکراتەکەدا، کردیە کارێک کە ناوی ئاگلایاش بکەوێتە ناو ناوان، باس بکرێت. ئاگلایاش هەر خۆی ئاگلایا بوو، خۆی جوان بوو، کە خۆیشی دەڕازاندەوە، هێندەی دی جوان دەبوو، تا بڵێی سەلار و سەنگین، زیت و زرنگ، هۆشن، شادو ڕووخۆش، کەمێک بە ناز و فیز و عینوان بوو کە هەر لە خۆی دەهات! یەک مانگی ڕەبەق بوو سەبارەت بە دایکی یەجگار مێریڤان و بەنەزاکەت بوو. "ڕاستە دەبێ ئاگام لەم یەڤگێنی پاڤلوڤیچە بێت، پێویستە بەوردی چاودێریی بکەم، بە تەواوەتی بیناسم. لەوە ناچێت ئاگلایا مەیلێکی تایبەتی بەرانبەری هەبێت، وەکو هەر کەسێکی دی تەماشای

دەکات". ئاگلایا، لەناکاوا بووبوو بەو کیژە دلڕفێن و ڕند و خشکۆکە! "چەند ڕەزاسووکە! خوایە، چەند زێبایە! ڕۆژ بە ڕۆژ جوانتر دەبێ!" بەڵام...

بەڵام لەو ساوە کە ئەم میرە چکۆلە بەرەڵلایە، ئەم گێلە پیاوە لاتە گەڕابووەوە، هەموو شتەکان ئاوەژوو بووبوونەوە، ماڵی یەپانچین بەتەواوەتی شێوا بوو! بۆچی، چی ڕووی دابوو؟

ئەلهەقی هیچ شتێک ڕووی نەدابوو، ئەم ڕەوشە لە هەر ماڵێکی دیکەدا بوایە کەس گوێی نەدەدایە و خۆی شپرزە نەدەکرد، بەڵام لیزاڤێتا پروکوفیڤنا، وەکو هیچ کەسێکی دی نەبوو، دەهات، زۆربەی مەسەلە و ڕووداوە ئاساییەکانی بە جۆرێ لێک دەدایەوە و دەیدانە دەم یەکەوە و لە خۆی گەورە دەکردنەوە، کە ئەقڵ قەبووڵی نەدەکرد، ئیدی بە خەیاڵ و ترس و دڵەڕاوکێیەکی ئەوتۆی لە خۆی دێنا کە هەندێ جار نەخۆش دەکەوت. جا وەرە بیهێنە بەرچاوی خۆت، ئەوێک لە هیچی نەبوو، ئەوە حاڵی بوو، ئەوە پەرچەکرداری بوو، ئەگەر ڕووداوێکی ڕاستەقینە، ڕووداوێک کە بە ڕاستی مایەی نیگەرانی و گومان و دوو دڵی بوایە، چ پەرچەکردارێکی دەبوو، چۆن سەری دنیای لە خۆی دێنایەوە یەک؟ لیزاڤێتا پروکوفیڤنا، لە کاتێکدا میرزادەی دابووە پێش، بە درێژایی ڕێگا لە بەرخۆیەوە دەیگوت: "چۆن زاتیان کرد، چۆن توانییان ئەو نامە قێزەونە بێ ئیمزایە، دەربارەی ئەو "بوونەوەرە" و پەیوەندیی وی دەگەڵ ئاگلایادا، بۆ من بنووسن؟..." پاشان کە گەیشتنە ماڵەوە میرزادەی لەپشت مێزێکی خڕەوە دانیشاند، کە هەموو ئەندامانی خێزانەکە لەدەوری دانیشتبوون، دیسان لە فکران ڕاچوو، لە دڵی خۆیدا دەیگوت: "چۆن زاتیان کردووە تەنانەت بیریش لەم مەسەلەیە بکەنەوە؟ ئەگەر تاقە وشەیەکیم بە ڕاست زانیبا، یان نامەکەم پیشانی ئاگلایا دابا، خۆ لە شەرما دەمردم! چۆن زات دەکەن بەو جۆرە بە ئێمە، بە خانەوادە و ماڵباتی یەپانچین ڕابوێرن! هەمووی دەم چەوتی ئیڤان فیدروفیچە، هەمووی بە هۆی تۆوە ئیڤان فیدروفیچ! ئاخر بۆچی نەچووین بۆ دورگەی یەلاچین و ئەم هاوینە لە ڤێلاکەی ئەوێندەرمان بەسەر بەرین*؟ خۆ من گوتم با بۆ ئەوێ بچین!

لەوەیە ڤاریا لەمە ترسابێت و ئەم نامەیەی نووسیبێت! یان لەوەیە... ئاهـ. هەر هەمووی خەتای ئیڤان فیدروفیچە! هەر هەمووی! ڕەنگە ئەو کچەتیوە دەعەجانییە هاتبێ بە خەیاڵیا ئەم داوەی بۆ بنێتەوە و بە باسکردن و لە قاودانی پەیوەندی ڕابردوویان، بیکات بە گەپجاڕی ئاشنا و بێگانە. ڕێک وەکو ئەو زەمانەی کە ئەم ملەمرواری بە دیاری بۆ دەبرد و ئەویش بە کەپوو ڕایدەکێشا و گاڵتەی پێ دەکرد!... بەڵام ئێستا هەموومان تووش بووین، ناوبانگی ئێمەش زڕاوە. بەڵێ ئیڤان فیدروفیچ ناوی کچەکانیشت کچانی خانەدان وەچاخزادە. کچانی گەنجی پابەوەخت. ئەوانیش لەوێ بوون، گوێیان لە هەموو شتێک بوو، بەچاوی خۆیان دیمەنی گەنگەشە و چەنەچەنی ئەو هەرزەکارانەیان بینی. هەنوکە دڵت داکەوت؟ ئیسراحەتت کرد؟ بەڵێ لەو ێندەربوون و بەگوێی خۆیان، گوێیان لە هەموو شتێک بوو. من هەرگیز لەو میرزادە بڵح و بەدفەڕە خۆش نابم، نا قەتا و قەت، ڕۆژێ لە ڕۆژان لێی خۆش نابم! نازانم بۆچی ئاگلایا، بۆ سێ ڕۆژ دەچێ کە زۆر تووڕە و پەستە؟ نازانم بۆچی بیانوو بە خوشکەکانی دەگرێت، شەڕیان پێدەفرۆشێت، تەنانەت بە ئەلکسندرای خوشکە گەورەشی کە ڕێزی دایکێکی دەگرت و دەستی ماچ دەکرد؟ شەڕ بەویش دەفرۆشێت! بۆچی ئەمە سێ ڕۆژە مەتەڵان لە خەڵکی دادێنێ؟ باشە گافریلا ئاردا لیونۆفیچ بۆچی بۆ ئێرە هاتبوو؟ پەیوەندی بەم مەسەلەیەوە چییە؟ بۆچی ئاگلایا دوێنێ و ئەمڕۆ، کەوتە ستاییش و هەڵکشانی و پاشان لە هۆڕژنی گریانی دا؟ بۆچی ناوی ئەو "سوارچاکە لاتە" گومناوە، لەو نامە بێ ئیمزایەدا هاتووە، کەچی ئاگلایا نامەکەی میرزادەی تەنانەت بە خوشکەکانیشی نیشان نەدا؟ ئەدی بۆچی... من وەکو شێت بەهەشتاو خۆم گەیاندە "میرزادە" و بۆ ئێرەم هێنا؟ خودایا! لەوە دەچێ شێت بووبم. ئەمە چی بوو بە خۆم کرد؟ چۆن دەشێت دەگەڵ گەنجێکدا باسی نهێنیی کیژەکانم بکەم – نهێنییەک کە ڕاستەوخۆ پەیوەندیی بە خودی ئەوەوە هەبێت؟ شوکر بۆخوا کە گێلۆکەیەو... و دۆستی خانەوادەییمانە، بەڵام تۆ بڵێی ئاگلایا مەیل بە یەکێکی وەکو ئەم داهۆڵە بدات؟ خودایا، چەند قسەی قۆڕ دەکەم؟ ئۆف.. ئێمە خەڵکێکی





نەشـازین... هـەق وایـە لـە قەفـەزێکمان بنـەن و خـەڵکی بێن بـە دەکوپیکـان تەماشامان بکەن... بە تایبەتی من! ئاخ ئیڤان فیدروفیچ، قەت لێت نابوورم، قەت ڕۆژێ لە ڕۆژان، گەردنت ئازاناکەم! نازانم بۆچی ئاگلایا دەری ناکات؟ خۆ قەولی دابوو کە ئەم کارە بکات، کەچی نایکات! تەمەشا، بڕوانە چۆن نیگای بڕیوەتە سەراپای و ورتەی لەخۆبڕیوە، هیچ ناڵێت. لەوێ دانیشتووە و هەڵناسێت بڕوات. لە کاتێکا بە خۆی ئاگاداری کردەوە کە نەگەڕێتەوە! .. ئەویش لێوبەبارو ڕەنگزەرد لێی دانیشتووە. ئەدی ئەو یەڤگینی پاڤلوڤیچە چەنەبازە بۆ نـاڵێی، هـەژدەر، هـەژدەر، قسـە دەکات و ڕێ بـە کـەس نـادات تاقە وشەیەک بڵێ؟ ئەگەر بمتوانیبا ئاڕاستەی گفتوگۆیەکە بگۆڕم دەمتوانی بچمە بنجوبناوانی مەسەلەکە"...

میـرزادە ڕەنگـزەرد و لێوبـەبار، لـەدەوری مێـزە خڕەکـە دانیشـتبوو، پێدەچوو کەوتبێتە بەینی بەرداشی دوو هەستی هەڤدژەوە: ترسێکی زۆر و، نەشئەیەکی کوتوپڕی لەوەسف نەهاتووی نامەفهووم. لەلایەکەوە دەترسـا دزە نیگایەکی ئەو سووچە بکات کە لەوێندەرەوە دوو چاوی ڕەشی ئاشنا بەدیقەت تەماشای ئەویان دەکرد! لە لایەکی دیکەشەوە، زۆر خۆشحاڵ و شـادمان بـوو بەوەی کـە جـارێکی دی خـۆی لـەناو ئـەم خانەوادەیـەدا دەبینێتەوە و گـوێی لەو دەنگـە ئاشـنایە دەبێتەوە، دوای ئەو نامەیـەی بـۆ ئـەمی نـاردبوو!... "خـوای میهرەبـان دەبـێ ئێسـتا چ بڵـێ! " هێشـتا تـاقە وشـەیەکی لـە زار نـەهاتبووە دەرێ، بـەڵکو بـە ئەسـتەم هەوڵیدەدا گوێ بـۆ قسەکانی یەڤگینی پاڤلوڤیچ هـەڵبخات کە "هـەژدەر، هـەژدەر، قسانی دەکرد". و قەریحـەی قسـەکردنی کرابـووەوە و بەدەگمـەن بەو ڕووخۆشـی و کـەیف قنجی بینرابوو. میرزادە، هەرچەند گوێی بۆ هەڵخستبوو، بەڵام تاماوەیەک، زۆر بە زەحمەت لـە تـاقە وشـەیەکی دەگەیشـت. هـەموو ئەندامانی خێزانەکە ئامـادە بـوون جگـە لـە ئیڤـان فیـدروفیچ کـە هێشـتا لـە پترسـپۆرگ نەگـەڕابووەوە. میـرزادە "س.."ش لەوێ بـوو. دیـار بـوو بەتـەما بـوون دوای تۆزێکی دی لە کاتی چاخواردنەوە. بچن بۆ گوێگرتن لە مۆسیقا* .

دیار بوو، قسە و گفتوگۆکـان، پێش هـاتنی میرزادە دەسـتی پـێ کردبوو.

زۆری پێنەچوو کولیاش لە سووچێکەوە پەیدابوو، کەس نەیزانی کارگ ئاسا لەکوێوە هەڵتۆقی! میرزادە لە دڵی خۆیدا گوتی: "سەیرە! هێشتا وەکو جاران پێشوازی دەکەن!"

خانووە هاوینەکەی (ڤێلاکەی)ماڵباتی یەپانچین، یەجگار گەورە و جوان بوو، لەسەر شێوەی تەلارکاری سویسری دروست کرابوو، ئەم خانووە لە ناوەندی باخچەیەکی چکۆلەدا دروست کرابوو، بەڵام هەر چواردەوری گوڵ و گوڵزار بوو، تا بڵێی جوان و دڵگیر بوو، هەیوان و بەر بێڵایەکی وەکو بەربێڵاکەی ماڵەکەی میر مشکین، بەڵام کەمێ گەورەتر و جوانتری هەبوو، جەماعەت هەموو لەوێندەر دانیشتبوون.

لەوە دەچوو بابەتی باس و گفتوگۆکە بەدڵی هەموو ئامادەبووان نەبێت. وادیار بوو بەرە و ئاقارێکی باشیش نەچێت، بۆیە هەموو حەزیان دەکرد ئەو باسە بگۆڕن، بەڵام یەڤگینی پاڤلوڤیچ دابوویە تانی عینادی و بێگوێدان بە هەستی ئەوانی دی، هەر دەستبەردار نەدەبوو. دیار بوو هاتنی میرزادە، هێندەی دی لەسەر گەنگەشەی مەسەلەکە ڕژدی کردبوو. لیزا ڤیتا پروکوفیڤنا، هەرچەندە بە باشی سەری لە بابەتی گەنگەشە و گفتوگۆیەکە دەرنەدەکرد، نێوچاوانی دابوو بە یەکا و پەست بوو. ئاگلایا، دوور لەوانی دی، لە گۆشەیەکدا دانیشتبوو، بەوپەڕی بێدەنگی دانیشتبوو وگوێی دەگرت، بە جۆرێ زاری لێک نابوو، لە تۆ وایە بە کێردیش نایکاتەوە. یەڤگینی پاڤلوڤیچ بەگەرمی لەسەری ڕۆیشت:

- بە یارمەتیتان، من هیچ لاریەکم لە لیبرالیزم نییە. لیبرالیزم خراپ نییە، گوناح نییە. لیبرالیزم پارژە لە گشت، ئەو گشتە بەبێ پاژەکە ناژی، هەڵدەوەشێتەوە. لیبرالیزمیش وەکو هەر ڕێبازێکی توندڕەوی محافەزەکاری، هەقی ژیانی هەیە، بەڵام گلەیەکەی من، نارەزایەکەی من لە لیبرالیزمی ڕووسیە. دووبارەی دەکەمەوە، دووبارەی دەکەمەوە کە من دژی لیبراڵی ڕووسیم، چونکە لە بنەڕەتدا "ڕووسی" نییە، فرێ بە

ڕووسیاوە نییە. تاقە یەک لیبڕاڵی ڕووسیم پیشان بدەن، تا بە بەرچاوی هەمووتانەوە، ئەم لاو لاوی ماچ بکەم. ئەلکسندرا ئیڤانوڤنا، کە خوای نەمابوو گۆناکانی بە شێوەیەکی نائاسایی سوور هەڵگەڕابوون، گوتی:

- بەمەرجێ ئەو ڕازی بێ تۆ ماچی بکەیت!

لیزا ڤیتا پروکوفیڤنا،لە دڵی خۆیدا گوتی: "تۆ سەیری ئەمە ناکەیت، بە حەیاتی گوێی لە هیچ نییە، هەموو خەمێکی هەر خەوتن و خواردنە، ساڵی جارێک دێتە قسان، ئەویش قسەیەک دەکات، کە سەرت سووڕبمێنێ! ."

میرزادە، هەستی کرد کە ئەلکسندرا ئیڤانۆفنا، زۆری پێناخۆشە کە یەڤگینی پاڤلوفیچ، بەو زمانە سواو پواوە، بەو گەرمیە شۆخیئامێزەوە، گەنگەشەی بابەتێکی وا جیددی دەکات.

یەڤگینی پاڤلوڤیچ لەسەری ڕۆیشت:

- میرزادە، پێش ئەوەی تۆ بێی، باسی ئەوەم دەکرد کە لیبراڵانی ئێمە، زیاتر سەر بەدوو چینی کۆمەڵگەن: چینی موڵکدار وفیۆدالانی جاران و، چینی لاهوت خوازان. ئەم دوو چینەش، لە گیانەللادان، دابڕاو و تەریک لە جەماوەری خەڵک دەژین، نەوە دوای نەوەش، گۆشەگیرتر دەبن و دەوریان نامێنێ، بۆیە هەرچییەکیان کردووە و هەرچییەک دەکەن، لە خزمەتی نەتەوە و گەلدا نەبووە و نییە...

میرزادە "س..." بەرپەرچی دایەوە:

- چۆن؟ ماقوولە هەرچییەکیان کردبێت کەڕەتی سفر بکرێ و بە ناڕووسی و نانەتەوەیی و نانیشتمانی بژمێردرێت؟

- نەخێر هیچ شەقڵێکی نەتەوەیی و نیشتمانی پێوەنیە. لیبڕاڵانی ئێمە هیچ شتێکی ڕووسیان تیا نابینرێ، محافەزە کارەکانیش وەتر. دڵنیابە کە میللەتی ڕووس نە ئێستا و نە لەئاییندەدا، دان بەو کارانەدا نانەن کە کۆنەموڵکدران و لاهوتخوازن کردوویانە...

میرزادە "س..." بەجیددی بەرسڤی دایەوە.

- سەیرە! ئەم بۆچوونە غەریب و هەڤدژە چییە؟ من یەک لەباری خۆم، ئەم هێرشە بۆ سەر موڵکدارانی ڕووس قەبووڵ نییە. باشە تۆ خۆت یەکێک نیت لە کۆنە موڵکدارانی ڕووس؟..

میرزادە "س.." ئەو پرسیارەی زۆر بەجیددی لێ کرد. یەگڤینی پاڤلوفیچ بەرسڤی دایەوە و گوتی:

- مەبەستی من لە موڵکداری ڕووس، ئەوە نییە کە تۆ تێیگەیشتووی. ئەمە چینێکی بەڕێز و حورمەتە، چونکە من بەخۆیشم یەکێکم لە ڕۆڵەکانی ئەوان، بەتایبەتی ئێستا کە نەماون...

ئەلکسندرا ئیڤانۆڤنا، قسەکەی پێبڕی و پرسیی:

- باشە، ئێمە لە ئەدەبیاتیشدا هیچ شتێکی نەتەوەییمان نییە؟

- من شارەزاییەکی زۆرم لە ئەدەبیاتدا نییە، بەلام پێم وایە ئەدەبی ڕووسییش جگە لە لومونوسوڤ، پوشکین و گوگۆل، هیچ مۆرکێکی ڕووسی نەتەوەیی پێوە نییە، ناسنامەی ڕووسی نییە.

ئەلکسندرا، بە پێکەنینەوە گوتی:

- زۆر چاکە. ئەمە بەسە. خۆ ئەوانەی ناوت بردن تەنیا یەکێکیان کوڕە هەژارە، خۆ دوانەکەی دی لە چینی موڵکدارانن.

- دروستە، بەلام جارێ پەلە مەکە، نەشئەی سەرکەوتن نەتگرێ. هۆیەکەی ئەوەیە کە تا ئێستا تەنیا ئەو سیانە، توانیویانە شتێکی خۆماڵی بڵێن، لەواقیعی ڕووسیاوە هەڵێنجرا بێت* و لە کەسی ترەوەوەریان نەگرتبێ، بۆیە شەقڵی نەتەوەیی و خۆماڵیان هەیە. هەر ڕووسێک، شتێک بڵێت یان بنووسێت یان بکات کە بە ڕاستی شەقڵی ڕووسی پێوە بێت، شتێک کە هەڵقووڵاوی واقیعی خۆماڵی بێت، لاسایی کردنەوە و خوازراو نەبێت، ئەوا بمانەوێ و نەمانەوێ ئەو ڕووسیە، خۆبەخۆ دەبێت بە بابایەکی نەتەوەیی، ئەگەر زمانە ڕووسیەکەشی خراپ بێت. ئەمە بەلای منەوە شتێکی بەڵگە نەویستە، بەلام باس و گەنگەشەکەی ئێمە دەربارەی

ئەدەبیات نەبوو، بەڵکو دەربارەی سۆسیالیستەکان بوو. موناقەشەکەمان بەوان دەست پێ کرد. من پێموایە و دڵنیام کە ئێمە، تاقە یەک ڕووسی سۆسیالیستمان نەبووە و نییە. بۆچی؟ چونکە هەموو سۆسیالیستەکانی ئێمە یان لە موڵکدارانی کۆنن یان لە لاهوتخوازانن. هەر هەموو سۆسیالیستەکانی ئێمە، چ ئەوانەی ناو وڵات و چ ئەوانەی هەندەران، لەو لیبراڵانەن کە ڕەگیان دەچێتەوە سەر ڕۆژگار و سەروبەندی فیوداڵانی ڕەعیەتدار. بۆچی پێدەکەنی؟ کوا کتێبەکانیان، ڕێنمایەکانیان، پەیام و ڕێبازەکانیانم نیشان بدە، بزانە چۆن، هەرچەندە من ڕەخنەگرێکی پیشەیی نیم، بزانە چۆن بە ڕەخنەی قەناعەتبەخش ساغی دەکەمەوە کە لاپەڕە بە لاپەڕەی کتێبەکانیان، نامیلکەکانیان، نامە و پەیامەکانیان، هەر هەمووی دەستکرد و زادەی قەڵەمی بابەیەکی کۆنە موڵکداری ڕەعیەتداری ڕووسە. بەدخواییان، تورەییان، سوعبەت و پێکەنینیان بۆنی موڵکداری جارانی لێدێت " تەنانەت ئەم کۆنە موڵکدارەش نموونەیەکی زۆر کۆنە، وەکو نموونەکەی فاموسوف"* . یانی هەرچیان هەیە و نییە، لە سەرچاوەی چینی موڵکدار و لاهوتخوازانەوە هەڵدەقووڵێت. چییە دیسان پێدەکەنی؟ میرزادە تۆش پێدەکەنیت؟ تۆش هاوڕای من نیت؟

ئەلهەقی هەموو هەر پێدەکەنین، میرزادەش یەکێک بوو لەوان. میرزادە لەپڕ پێکەنینەکەی بڕی، وەکو قوتابیەک لەپڕ تاوانبار کرابێ، گوتی:

– من ناتوانم بەدڵنیاییەوە پێت بڵێم کە هاوڕەئی تۆم یان نا، بەڵام دڵنیات دەکەم. کە قسەکانتم زۆر لە گیان خۆشن بێئەناز لەزەتیان لێدەبینم...

میرزادە بەدەم ئەو قسانەوە خەریک بوو دەخنکا. ئارەقەیەکی سارد، مرواری ئاسا بەنێوچەوانیەوە دەدرەوشایەوە. لەوەتەی کە گەیشتبووە ئێرە، ئەمە یەکەم جاری بوو قسان بکات. ویستی سەیرێکی دەوروبەری خۆی بکات، بەڵام نەیوێرا. یەگڤینی پاڤلوڤیچ هەستی پێ کرد و بزەیەکی بۆ کرد، بەهەمان جۆشوخرۆش، بە هەمان گەرموگوڕی، بە هەمان نەفەسی

پێکەنین ئەنگێز لەسەری ڕۆیشت:

– خانمان و برادەران، گەرەکمە ڕووداوێکتان بۆ بگێڕمەوە، کە پێم وایە یەکەم کەس من هەستم پێکردووە و کەشفم کردووە، بەهەرحاڵ تا ئێستا کەس نە باسی کردووە، نە هیچی لەبارەوە نووسیوە. ئەم ڕووداوە ڕێک ڕەنگدانەوە و دەنگدانەوەی کرۆک و جەوهەری ئەو لیبرالیزمە ڕووسییەیە کە من ئاماژەم کردێ. با بێمە سەر باسەکە و دەستی پێ بکەم. جارێ با بپرسین لیبرالیزم بە شێوەیەکی گشتی دەکاتە چی؟ بریتی نییە لە هێرشکردن بۆ سەر سیستمی باو و جێگیر؟ "ئیدی هەڵەبێ یان ڕاست، ئەوە مەسەلەیەکی دیە" لیبرالیزم ئەوە نییە؟ ئەوەی من دەی بینم، لیبرالیزمی ڕووسی دژی سیستمی باو و جێگیر نییە. دژی ژیانی نەتەوەییە، دژی خودی ژیانە، نەک دژی دامودەزگاکان، دژی خودی ڕووسیایە نەک سیستمی ڕووسیا. ئەو لیبراڵەی من بۆتانی باس دەکەم، نکوڵی لە خودی ڕووسیا دەکات، بە گوتەیەکی دی حاشا لە دایکی خۆی دەکات، لەو دایکەی هێناویەتییە دنیاوەو، پەلاماری دەدا. یانی کە ڕووسیا نەگبەتیەکی بەسەر دێت، یان تووشی نەهامەتی و نشووستیەک دەبێت، ئەو لە کەیفان گەز گەز بالا دەکات. ڕقی لە هەموو داب و بەریتێکی میللی خۆماڵیە، قێزی لە مێژووی ڕووسیا و لە هەموو شتێکی وڵات دەبێتەوە. هەڵبەتە ئەمەی لە نەزانیە، ئەگەر بتەوێ پاکانەیەکی بۆ بێنیتەوە، تەنیا نەزانیەکەیەتی و هیچی دی، وا دەزانێت ئەم ڕق و نەفرەتەی لە ڕووسیا، باشترین لیبرالیزمە. لە نەزانی خۆی، دژایەتی ڕووسیا بە باشترین جۆری لیبرالیزم دەزانێت. ئەم وڵاتە پڕە لەو بەناو لیبرالانەی کە خەڵکی چەپڵەیان بۆ لێدەدەن، بەلام لە ڕاستیا، بێ ئەوەی بە خۆبزانن، ئەوەندە کاڵفام و گەوجن هیچ محافەزەکارێکیان ناگاتێ، لە ناخا لە هەر محافەزەکارێک، محافەزەکارترن! هەندێ لە لیبراڵەکانی ئێمە کە خۆیان لە خەڵکی دی بە نیشتمانپەروەرتر دەزانی، شانازیان بەوە دەکرد، لە خەڵکی دی زیاتر لە خۆشەویستی

ڕاستەقینەی نیشتمان دەگەن، وایان دەزانی بوغزاندن و بێزراندنی ڕووسیا، نیشتمانپەروەری ڕاستەقینەیە، بەڵام هەنوکە ئاشکراتر قسە دەکەن و بەکارهێنانی زاراوەی "خۆشەویستی نیشتمان" بە نەنگ و شووورەیی دەزانن. هەر کەسێک باسی ئەو شتە بکات گاڵتەی پێدەکەن. جا من سوورم لەسەر ڕاوبۆچوونی خۆم و پێویستە ئەم دیاردەیە درەنگ یان زوو، بەوپەڕی ڕوونی و ڕەوانی و ڕاستگۆیی لەقاو بدرێت و حەقیقەت بخرێتە ڕوو. بە ڕاستی لە بەرەبەیانی مێژووەوە تا ئێستا لە هیچ سەردەم و لە ناو هیچ میللەتێکدا دیاردەی وا نەبووە و ڕووی نەداوە. ئەمە خۆی لەخۆیدا بەڵگە و نیشانەی ئەوەیە کە دیاردەیەکی ڕێکەوتەکی و ڕەوتەنیە. پیاو سەری لەوە سوور دەمێنێ، لەکاتێکا لە هیچ شوێنێکی ئەم دنیایەدا، لیبراڵێک نییە ڕقی لە وڵاتی خۆی بێت، بۆچی دەبێ بابایەکی لیبراڵی ڕووس ڕقی لە وڵاتی خۆی بێت؟ هۆی ئەم دیاردەیە لە وڵاتی ئێمەدا، جگە لەوەی کە من تۆزێ لەمەوپێش باسم کرد هیچی تر نییە، ئەویش ئەوەیە کە لیبراڵی ڕووس، بە هیچ جۆرێ ڕووسی نییە، بەناسنامەی ڕووسیەوە کارناکات. ئەم دیاردەیە لەم لێکدانەوەیە زیاتر هیچ لێکدانەوەیەکی دیکە هەڵناگرێت.

میرزادە "س" بەرپەچیدایەوە:

– من هەر هەموو ئەو قسانەی تۆ بەسوعبەت دەزانم یەڤگینی بافلوفیچ....

ئەلکسندرا ئیڤانۆڤنا گوتی:

– من هەموو لیبراڵەکانم نەدیتوون، بۆیە ناتوانم هیچ داوەریەک لەو بارەیەوە بکەم، بەڵام لە قسە و بۆچوونەکانی تۆ پەستم. تۆ حاڵەتێکی تایبەتی فەردیت وەر گرتووە و بەسەر هەمووانەدا تەعمیمی دەکەیت، کە ئەمە دەکاتە تۆمەت و نەهەقی.

یەگڤینی بافلوفیچ، هەڵی دایە و گوتی:

– حاڵەتی تایبەتی فەردی؟.. ئا... چاوەڕوانی ئەو قسەیەم دەکرد. ئایا حاڵەتێکی تایبەتی فەردییە یان نا؟

هەنگێ ڕووی کردە میرزادە و پرسیی:

- تۆ چ دەڵێی میرزادە؟ ئەمە حاڵەتێکی تایبەتە یان نا؟

میرزادە گوتی:

- ئەوەی ڕاستی بێ، من شارەزاییەکی ئەوتۆم نییە.. زۆر تێکەڵی لیبراڵان نیم و هەڵسووکەوتم دەگەڵیاندا نییە، بەڵام پێم وایە تا ئەندازەیەک هەق بە تۆیە، ئە لیبرالیزمەی کە تۆ باست کرد، لە ڕاستیا هەندێ مایلە بەلای بوغزاندن و بێزراندنی ڕووسیادا نەک بەلای بوغزاندنی ڕژێم و سیستمە باوەکەی ڕووسیادا. هەڵبەتە ئەم بۆچوونە تەنیا هەندێک لە لیبراڵەکان دەگرێتەوە نەک هەموویان، ناتوانین بە هەمان چاو سەیری تێکڕای لیبراڵەکان بکەین، چونکە ویژدان شتی وا قبووڵ ناکات...

میرزادە، لەناکاو، دوو دڵ وەستا، قسەکەی تەواو نەکرد. هەرچەندە پەرێشان و پەشێو بوو، بەڵام باسەکەی بەلاوە زۆر خۆش بوو. میرزادە بە تەبیعەت هەندێ ساویلکە و سادە بوو، کە گوێی لە بابەتێکی سەرنجڕاکێش بگرتایە، جۆرە ساویلکەییەکی ئاشکرا دەنیشتە سەر سیمای. کە لەو بوارەشدا پرسیاری لێکرابا، بەهەمان سادەیی و ساویلکەیی ئاسایی خۆی وەڵامی دەدایەوە، هەرگیز نە لە سیمایا، نە لە ڕەفتار و هەڵسوکەتیا، نە لە ئاماژەیدا، ئەوە دەرنەدەکەوت کە گومانی ئەوە لە کەسێک بکات کە پێی ڕابوێرێ یان گاڵتەی پێ بکات. هەرچەندە یەڤگینی پاڤلوفیچ لە مێژبوو، خووی بەوەگرتبوو، کە بەدەم بزەی تەوسامێز و گاڵتەوە بیدوێنێ، لێ ئێستا کە گوێی لەم وەڵامەی میرزادە بوو، بەو پەڕی سەرسامی لێی ڕوانی، دیار بوو هەرگیز چاوەڕوانی ئەو وەڵامەی لێنەدەکرد. هەنگێ بەدەم مینگە مینگەوە گوتی:

- ئاوها! میرزادە بەجدیتە؟ گاڵتە ناکەیت؟

میرزادە، بەسەرسامی لێی پرسی:

- مەگەر پرسیارەکەی تۆ جیددی نەبوو؟

ئامادەبووان، هەموو لە قاقای پێکەنینیان دا.

ئادیلاید گوتی:

- دڵنیابن، کە یەڤگینی پاڤلوفیچ، زۆر حەزی لە چاو و ڕاوە، جدیەت لە مەزەبیا نییە، لە گەنگەشە و موناقەشەدا، شتی نا جیددی لەبەرانبەرەکەی دەکات بەشتی زۆر جدی! یانی مێشت لێ دەکات بە گامێش!

ئەلکسندرا بەتوندی گوتی:

- بە ڕای من ئەم باسە زۆر ناخۆشە، نەدەبوو خۆمان لەم باسە بدەین. خۆ ئێمە بەتەما بووین پیاسەیەک بکەین... یەڤگینی پاڤلوفیچ هاواری کرد:

- دەی بــا بـــڕۆین! ئێوارەیـــەکی زۆر جوانـــە! بـــەڵام ئـــەم جارەیـــان گەنگەشـەکەم زۆر بەجیددی بوو. بەجیددی دەمویست بابەتەکە بسەلمێنم، بە تایبەتی بۆ میرزادەی بسەلمێنم. "چونکە میرزادە تۆ زۆرت وروژاندم. باوەڕبکە، ئەوەندەش پوچ و پوچگەرا نیم وەکو بەڕواڵەتمەوە دیارە، هەرچەندە یەکێک لەعەیبەکانم عەبەسیەت و کەللەپووتییە." بۆیە، بەیارمەتی ئێوە، ئامادەبووانی بەڕێز، دەخوازم لە ڕووی گونجکاویەوە تەنیا یەک پرسیار لە میرزادە بکەم و ئیدی واز لەم بابەتە دێنم. ئەم پرسیارە نزیکەی دوو سەعاتێک لەمەوبەر بە مێشکمدا هات "میرزادە، من هەندێ جار بەجیددی بیر لە شتی جیددی دەکەمەوە". من بۆخۆم گەیشتوومەتە وەڵامی ئەو پرسیارە، بەڵام دەخوازم بزانم میرزادە چ دەڵێت. تۆزێ لەوەپێش لە باسەکەماندا زاراوەی "تایبەت و فەردیمان" بەکار برد. ئەم زاراوەیە باوی پەیدا کردووە و زۆر بەکاردەبرێ و کەوتووەتە سەر زاران. لەو دواییانەدا ڕووداوێکی ترسناکی تیرۆرکردن، بوو بە باسی ڕۆژنامەوانی و ڕای گشتی، ئەوە بوو گەنجێک بە جارێ شەش کەسی لە یەک خێزان کوشتبوو. خەڵکی سەریان لە مورافەعە سەیروسەمەرەکەی کابرای پارێزەر سوور مابوو، کە گوتبووی ئاساییە بیرۆکەی کوشتنی ئەو شەش کەسە بە مێشکی یارۆی بکوژدا بێت، چونکە زۆر نەدار و دەستکوت بووە. هەڵبەتە من لێرەدا




دەقی وتەکانی یارۆی پارێزەرم لەبەرنین، بەڵام پێم وایە بەو نێوەڕۆک و مانایە بوون. من پێم وایە کاتێ یارۆی پارێزەر ئەو بۆچوونە نائاسایی و غەریبەی دەربڕیوە، قەناعەتی تەواوی بەوە هەبووە کە لیبراڵیترین، مرۆڤانی ترین و پێشکەوتووترین بۆچوونی باوی سەردەمی ئێمەی دەربڕیوە. تۆ لەم بارەیەوە چ دەڵێی؟ ئایا ئەم کەچڕەوییە ئەقڵی و ویژدانییە، ئەم ڕاو بۆچوونە پووچ و نابەجێیە، حاڵەتێکی فەردی تایبەتە یان دیاردەیەکی گشتییە؟

قاقای پێکەنین لە هەموو لایەکەوە بەرز بووەوە.

ئەلکسندرا و ئادیلاید، بەدەم پێکەنینەوە، بە دوو قۆڵی گوتیان:

- هەڵبەتە حاڵەتێکی تایبەتییە.

میرزادە "س..." گوتی:

- یەگڤینی پاڤلوفیچ، بە ڕاستی شۆخی و سوعبەتەکانت تامیان تیا نەما!

یەگڤینی پاڤلوفیچ، خۆی لەو تەشەرە نەکرد بە خاوەن. کە بینی میرزادە، بەوپەڕی لاپرسەنێ و گونجکاوی و جدییەوە تەماشای دەکات، لە سەری ڕۆیشت:

- تۆ چ دەڵێی میرزادە؟ بە ڕای تۆ ئەمە حاڵەتێکی فەردیە یان دیاردەیەکی گشتیە؟ ئەوەش بزانە من ئەم پرسیارەم بەتایبەتی بۆ تۆ داناوە.

میرزادە، لیون نیکولایوفیچ بەکاوەخۆ، بەڵام بە شێوەیەکی بنجڕ گوتی:

- نا، ئەمە حاڵەتێکی فەردی نییە.

میرزادە "س.." بە نیمچە تووڕەیەکەوە هاواری کرد:

- بۆ خاتری خوا لیون نیکولایوفیچ، چما ئاگات لێ نییە کە دەخوازێ بتخاتە داوەوە، تەڵەت بۆ بنێتەوە؟ دیارە ڕادەبوێرێ، گەرکیەتی گاڵتە بە تۆ بکات.

میرزادە، سورروە بوو، گوتی:

– وامدەزانی، یەڤگینی پافلوفیچ بەجدیەتی.

بەدەم ئەو قسەیەوە چاوی داخست.

میرزادە "س.." درێژەی دایە:

– میرزادە گیان، بیرتە سێ مانگێک لەمەوپێش، باسی ئەوەمان دەکرد، کە دادگا ساواکانی ئێمە، وێرای ئەوەی تازە دامەزراون، زۆر پارێزەری گەورە و بەتوانا و پڕ بەهرەیان بەرهەم هێناوە، چەندها حوکمی زۆر جوان و شایستە لە دادگا جینایەکانمانەوە دەر چووە. بیرتە تۆ هەنگێ چەندت پێ خۆش بوو، من چەند بەخۆشحاڵییەکەی تۆ شاد بووم... بیرتە دەمانگوت، لەو ڕووەوە هەقی خۆمانە شانازی بە دادگاکانمانەوە بکەین... بۆیە ئەو مرافەعە گەوجانەیە، ئەو هەنجەتە سەیرانەی کە یەڤگینی گێڕایەوە، حاڵەتێکی ڕیزپەڕە، تایبەتی و فەردییە، ڕەوتەنییە، حاڵەتێکە لە هەزار حاڵەتدا.

میرزادە لیون نیکولایوفیچ، بۆ دەمێک لە فکرا ڕاچوو. هەنگێ بەوپەڕی قەناعەتەوە، بە دەنگێکی نەک هەر نزم، بەڵکو شەرمنیشەوە بەرسڤی دایەوە:

– من تەنیا دەمویست ئەوە بڵێم ئەو کەچڕەوییە ئەقڵی و ئایدولۆژی ویژدانیەی یەگڤینی پاڤلوفیچ باسی دەکات، زۆر جار لێرە و لەوێ دەبینرێ، زیاتر شەقڵی دیاردەیەکی گشتی وەرگرتووە تا شەقڵ و مۆرکی دیاردەیەکی تایبەتی و فەردی و ڕیزپەڕ. بۆیە ئەگەر ئەوەندە باو نەبوایە و ئەو شەقڵە گشتیەی وەرنەگرتبا، لەگین بوو هەرگیز ئەم جۆرە تاوانە ترسناکانەمان نەدیبا کە ئەقڵ قەبووڵی ناکات..

– تاوانێن ترسناکی خەیاڵی؟ من دڵنیات دەکەم جارانیش، لە کۆنیشا تاوانێن لەوەش دزێوتر و ترسناکتر ڕوویان داوە، ئەم تاوانە دزێوانە لە هەموو سەردەمێکا، نەک هەر لە وڵاتی ئێمەدا، بەڵکو لە هەموو شوێنێکدا هەبووە و پێم وایە لە ئاییندەشدا، تا ماوەیەکی زۆر هەر دەمێنێ.

جیاوازییەکە تەنیا لەمەدایە کە لەکۆنا، کەمتر ڕەنگی داوەتەوە و خەڵکێکی کەم پێیان زانیوە، چونکە کەناڵی پەخش و بڵاوکردنەوەی هەواڵان بەم فراوانییە نەبووە، بەڵام ئەمڕۆکە خەڵکی زۆر ئازادانە باسی ئەو ڕووداوانە دەکەن و لە ڕۆژنامانددا بڵاوی دەکەنەوە و لەناو جەماوەری بەرینی خەڵکدا دەنگ دەداتەوە و دەبێ بە داستانی سەر زاران، بۆیەوا وێنا دەکەین، کە ئەمە دیاردەیەکی تازەیە. ئەمە هەڵەکەی تۆیە میرزادە گیان. باوەڕبکە هەڵە بێگەردەکەی تۆ لەم خۆشباوەڕیەتدایە.

میرزادە "س.." بەو گوتەیە و بەدەم بزەیەکی تەوسامێزەوە کۆتایی بە قسەکەی خۆی هێنا.

میرزادە گوتی:

- من زۆر چاک دەزانم کە لەکۆنیشدا زۆر تاوانی گەورە کراون کە لەمەش ترسناکتر و دزێوتر بوون. من ماوەیەک لەمەپێش، سەردانی چەند زندانێکم کرد، توانیم ژمارەیەک مەحکوم بدینم، تاوانبارانی وایان تیابوو، زۆر ترسناکتر لەمەی کە باسمان کرد. هی وایان تیابوو چەندین تاوانی ئەنجام دابوو، بێ ئەوەی زەڕەیەک هەست بە پەشیمانی و عەزابی ویژدان بکات کە دەستەیەک خەڵکی کوشتووە، بەڵام ئەوەی لەوێ بۆم دەرکەوت، ئەمە بوو کە دڵڕەقترین تاوانبار، ئەوەی کە زەڕەیەک هەست بە عەزابی ویژدان ناکات، دەزانێت کە تاوانبارە، یانی لە هەست و نیهادی خۆیدا دەزانێ تاوانی کردووە، با هەست بە پەشیمانیش نەکات. ئەوە حاڵی هەموو ئەو زیندانیانە بوو، بەڵام ئەو تاوانبارانەی کە یەگڤینی پاڤلوفیچ باسیکردن، نایەوێ خۆیان بە تاوانبار بزانن و وا خەیاڵ دەکەن هەقی خۆیانە دەست بدەنە ئەو جۆرە کارە و گوایە کارێکی باش دەکەن، یانی جۆرە قەناعەتێکی لەو بابەتەیان لا دروست بووە. بەڕایی من ئەمە جیاوازییەکی گەورەیە. تۆ تەماشا بکە، هەموو ئەوانە گەنجن، یانی لە تەمەنێکان، زۆر بەئاسانی دەکەونە ژێر کاریگەری و باندۆری هزر و بیرێن کەچڕەوانەوە.

میرزادە "س.."، لە پێکەنین کەوتبوو، بەڵکو ئەبڵەق وحەپەساوە، بەدەم گوێگرتنەوە، دەیڕوانییە میرزادە، ئەلکسندرا ئیڤانۆڤا ماوەیەک بوو حەزی دەکرد سەرنجێک دەربڕێت، بەڵام وەکو ئەوەی شتێک، بیروخەیاڵێک ڕێگەی قسەکردنی نەدات، بێدەنگ بوو. لیَ یەگڤینی باڤلوفیچ بەوپەڕی سەرسامی دەیڕوانییە میرزادە و ئەم جارەیان ماکی هیچ جۆرە تەوس و توانجێک بەسیمایەوە دیار نەبوو.

لیزاڤیتا پروکوفیڤنا، بە شێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو، خۆی لە گفتوگۆیەکە هەڵقورتاند و گوتی:

– قوربان، خێرە بەو هەموو سەرسامییەوە تەماشای دەکەیت؟ یانی وا زەن دەبەیت لە تۆ کەودەنترە. وەکو تۆ کۆرفام و گەمشۆیە؟

– نەخێر خانم، مەسەلە ئەمە نییە، بەڵام میرزادە من سەرم لە یەک شت دەسووڕمێ "ببوورە کە ئەم پرسیارەت لێ دەکەم": باشە تۆ کە مەسەلەکان بەم ڕوونییە، بەم ئاشکراییە دەبینی، چۆن بوو (ببوورە).. چۆن بوو... لەو مەسەلە سەیرەدا... ئەوەی ئەو ڕۆژە.. لەمەسەلەی پیاوەکەدا... ئەو پیاوەی وابزانم ناوی بوردوفسکی بوو.. نەتتوانی پەی بەو کەچڕەوی و گەندڵییە ئەقڵی و ئەخلاقییە، ببەیت. خۆ هەر دوو مەسەلەکە لە ڕووی پراکتیکیەوەوەکو یەکن؟ من ئەو کاتەوای بۆچووم کە تەقەی سەرت دێ.

لیزاڤیتا پروکوفیڤنا، بە گەرمی هەڵی دایە:

– قوربان، گوێ بگرە با پێت بڵێم، ئێمە کە هەموومان لێرە ئامادەبووین، هەستمان بەوە کرد و زۆر بەخۆمان دەبەفشین کە لە میرزادە بە هۆشوگۆشترین، کەچی میرزادە ئەمڕۆ نامەیەکی لە یەکێک لە هاوڕێکانی بوردوفسکی یەوە، بۆ هاتووە. لە دیارترین هاوڕێی بوردوفسکی یەوە، لە یارۆ دەموچاو کونجەکەوە، لە بیرت ماوە ئەلکسندرا؟ لەم نامەیەدا، ئەو گەنجە داوای بووردنی لە میرزادە کردووە، هەڵبەتە بەشێوازی خۆی، دەڵێت پەیوەندیی دەگەڵ ئەو هاوڕێیەی بڕیوە کە ئەو ڕۆژە هانی دەدا. لە بیرتە

ئەلکسندرا؟ لە نامەکەیدا دەڵێت لە ئێستا بە دواوە جگە لە میرزادە باوەڕ و متمانە بەکەسی دی ناکات. نامەی وا بۆ هیچ یەکێک لە ئێمە نەهاتووە، لە کاتێکا ئێمە خۆمان لە میرزادە بەگەورەتر دەزانین.

کولیا گوتی:

- هیپولیتش هاتووە لە ماڵی ئێمە بژی.

میرزادە، بە پەرێشانیەوە گوتی:

- چۆن؟ هەنوکە لەوێندەرە؟

- بەڵێ، هەر کە تۆ و لیزاڤیتا ڕۆیشتن، ئەویش خۆی بە ماڵێدا کرد، من لەگەڵ خۆما، بەگالیسکە هێنام.

لیزا ڤیتا پروکوڤیتا، هەر کە گوێی لەو قسەیە بوو بە جارێ گڕی گرت، ئەوەی بیرچووەوە کە تۆزێ لەوەپێش لایەنگری لە میرزادە دەکرد، گوتی:

- من گرە و دەکەم کە میرزادە دوێنێ چووە بۆ ئەو کونە جنۆکەیەی ئەو هەتیوە نەگبەتەی تیا دەژی، بۆی هاتووەتە سەر چۆکان، داوای بوردنی لێکردووە، تکای لێ کردووە بێت لێرە بژی.. چوویت یان نا؟ ئایا چۆکت بۆ دادا یان نا؟ تۆ خۆت دانت بە مەدا نا.

کولیا، هاواری کرد:

- نا، چۆکی بۆ دانەدا، ڕێک بەپێچەوانەوە، هیپولیت دەستی میرزادەی گرت و دوو جاران ڕایمووسی. من بە چاوی خۆم دیتم. بەو جۆرە گەردنی یەکیان ئازا کرد و گلەییان لە یەکتری نەما. میرزادە گوتی کە تەندروستی هیپولیت لە هاوینەوار چاکتر دەبێت، ئیدی "هیپولیت"ش یەکسەر ڕازی بوو کە هەر کاتێ کەمێک حاڵی باش ببێت، بۆ ئێرە بێت.

میرزادە، کڵاوەکەی هەڵگرت، هەستا لەبن لێوانەوە گوتی:

- کولیا غەدرت کرد. نەدەبوو ئەم قسەیە بکەی، من...

لیزا ڤیتا پروکوفیڤنا، ڕای گرت و گوتی:

- میرزادە بۆ کوێ دەڕۆیت؟

کولیا، بەگەرمی. لەسەر قسەکەی ڕۆیشت:

- میرزادە، خۆت ئەزیەت مەدە، مەچۆ بۆلای، ماندووی ڕێگایە، خەوتووە. زۆر خۆشحاڵە کە بۆ ئێرە هاتووە پێم وایە ئەگەر ئەمڕۆ یەکدی نەبینن زۆر باشتربێ. باشتر وایە تا سبەینێ وازی لێ بێنی تا حاڵی خراتر نەبێت. ئەم بەیانیە دەیگوت شەش مانگیش دەبێت، وەکو ئێستا هەستی بە باشی نەکردووە. تەنانەت کۆکەکەشی زۆر کەمتر بووە، هاتووەتەسەر سێ یەک.

میرزادە، هەستیکرد کە ئاگلایا لەپڕ لە جێی خۆی هەستا و هاتە لای میزەکەوە. زاتی نەدەکرد تەماشای بکات، بەڵام بە هەموو بوونی خۆیەوە هەستی دەکرد چاوە ڕەشەکانی کیژێ، لەوە و تەماشای ئەو دەکەن. هەڵبەتە ئەو جووتە چاوە پەستییان لێدەباری، هەڕوگیڤیان دەنواند. هەڵبەتە دەموچاوی ئاگلایا سوور هەڵگەڕابوو.

یەگڤینی پاڤلوفیچ گوتی:

- نیکولا ئاردالیونوفیچ، پێم وایە خەراپت کردووە کە بۆ ئێرەت هێناوە، ئەگەر ئەو گەنجە سیلاویەکەی ئەو ڕۆژەبێ کە لەپڕ لە هۆرژنی گریانی دا و هەموومانی بۆ تازیەکەی خۆی دەعوەت کرد. زۆر بە ئاو و تاو باسی دیواری ماڵە دراوسێکەی بەرامبەر خۆیانی دەکرد. کە گومانی تیا نییە دوورکەوتنەوەی لەوێندەر، نیگەرانی دەکات.

- باوەڕناکەم. باوەڕ بەم قسەیە ناکەم. ئەگەر ئەمە ببیستێتەوە تورە دەبێت، دەگەڵت بەشەڕ دێت و دڵنیابە دەتۆرێ و دەڕوات.

لیزا ڤیتا پروکوفیڤنا بەدەم ئەو قسانەوە، بە پەستیەوە زەمیلەی کەرەستەی چنینکاریەکەی بۆ لای خۆی ڕاکێشا، بیری چووبوو کە هەموو ئامادەبووان بە نیازی چوونە گەڕان و پیاسە لە جێی خۆ هەستاون.

یەڤگینی باڤلوفیچ، لەسەری ڕۆیشت:

- لە بیرمە کە زۆر بەتاسەوە باسی ئەو دیوارەی دەکرد. دەیگوت، بەبێ ئەو دیوارە ناتوانێ بە شکۆوە بمرێت. هەموو ئارەزوو و ئاواتێکی هاتبووە

سەر ئەوەی مەرگێکی شکۆداری پێببڕێت.

میرزادە لەبن لێوانەوە گوتی:

- مەبەستت چییە؟ ئەگەر حەزناکەی بیبەخشیت، ئەوا بەبێ بەخشینی تۆ دەمرێت... ئەم جارەیان بۆ دیتنی دار ودرەختەکان هاتووە بۆ ئێرە.

- ها! من بەش بە حاڵی خۆم دەیبەخشم. گەردنی ئازا دەکەم. دەتوانن ئەمەی پێ بڵێن.

میرزادە، بە ئەسپایی، لە کاتێکا چاوی بڕیبووە ئەرزەکە گوتی:

- نا، لەوە دەچێ جوان لەمەسەلەکە حاڵی نەبوو بیت. دەبێ تۆ داوای بوردن لەو بکەیت.

- بۆچی؟ من چ هەڵەیەکم دەرهەق بەو کردووە؟

- ئەگەر لە مەسەلەکە ناگەیت، زۆری لێناکەم... بەڵام بێگومان تێی دەگەیت. ئەوسا حەزی دەکرد... هەموومان گەردنی ئازا بکەین و ئەویش گەردنمان ئازابکات.. هەر ئەوەندە و بەس.

میرزادە "س.." چاوێکی خێرای بە هەندێ لە ئامادەبوواندا گێڕا، ئەوسا بەهەشتاو گوتی:

- میرزادەی ئازیز، دامەزراندنی بەهەشت لەسەر زەوی کارێکی ئاسان نییە، تۆ دەتەوێ ئەم دنیایە بکەی بە بەهەشت، ئەمە کارێکی دژوارە، لەوە دژوارترە کە دڵە بێگەرد و پاکەکەی تۆ وێنای دەکات. باشتر وایەواز لەم مەسەلەیە بێنین. دەنا دیسان وەزعمان تێک دەچێتەوە و هەنگێ... لیزا ڤیتا پروکوفیڤنا، گوتی:

- دەی با بڕۆین گوێ لە موزیک بگرین.

هەنگێ بەتوڕەیی لەسەر کورسییەکەی هەستا و هەموو ئەوانی دی دوای کەوتن.

پەراوێز:

* - .."بانکی لومبارد..": یەکێک بوو لەو دەزگا دەوڵەتیانەی کە هەم

پارەی لێدادەنراو هەم پارەی لێ قەرز دەکرا، کە بانکێن مۆدرین پەیدا بوون، ئیدی بانکی ناقبری لەکار وەستا.

* – ..”دورگەی یەلاچین..”: یەکێکە لەو دورگانەی کە کەوتووەتە نێوان هەر دوو لقی رووباری نیڤاوە.یەکێک لە کۆشکە تزاریەکان کەوتووەتە ئەوێندەرەوە. ئەو دورگەیە ڤێلای زۆری لێبوو، هی ئەو فەرمانبەرانە بوون کە بە هۆی کارەکانیانەوە نەیان دەتوانی لە پترسبۆرگ دووربکەونەوە..

* – ..”گوێگرتن لە مۆسیقا..”: لە پاڤلۆفسک هۆڵێکی گەورە بە تەنیشت ویسگاکەوە هەبوو، باخێکی گشتی تیا بوو.هۆڵ و کۆشکەکە سەر بە موڵکەکانی دۆکی گەورە قەستنەتین بوو.بەلام هۆڵەکە و کۆشکەکە بۆ جەماوەری خەڵک کراوە بوون و هاوینان ئاهەنگ و کەرنەڤاڵی مۆزیکی سەفۆنیایی گەورە و بە ناوبانگی تیا سازدەکرا..

* – ..”لەواقیعی رووسیاوە هەڵێنجرابێت و لە کەسی ترەوەوەریان نەگرتبێ..”دۆستۆیفسکی لە نامەیەکیا(١٨٧٠/٤/٥) بۆ ن.ن.ستراخۆف، بۆچوونێکی وای لەمە؟ لۆمۆنۆسف و پوشکین نووسیوە، نکۆڵی لە هەقی تۆلستۆی دەکات کە بەوان بەراورد بکرێت.

* – ”فامۆسۆف..”: کاراکتەرێکی شانۆنامە کۆمیدییەکەی گاریبویدوفە (ئەقڵی زۆر، نەگبەتییە)

**فەسڵی دووەم**

میـرزادە، لـەپڕ بـە تاسـەیەکی سـەیرەوە لـە یـەڤگینی پـاڤلوفیچ نزیـک بووەوە، دەستی گرت و بە پەرۆشەوە گوتی:

- یەڤگینی بالوفیچ، من وێڕای هەموو شتێک، حورمـەتت دەگرم، باوەڕبکە بە پیاوێکی زۆر پاک و ئابڕومەندت دەزانم، دڵنیات دەکەم کە..

یـەڤگینی پـاڤلوفیچ، بـە ڕادەیـەک سـەری لـەم هەڵوێسـتەی میـرزادە سووڕما، کە شەقاوێک کشایە دواوە، پێکەنینێکی سـەیر گرتبووی، ئەگـەر بە تـۆبزی جـڵەوی خـۆی نـەگرتبا، لـە قاقـای پێکـەنینی دەدا، بـەڵام کـە لـە میـرزادەورد بـووەوە، بـۆی دەر کەوت کـە میـرزادە، وەزعـی تەواو نییـە، هەنگێ گوتی:

- دەتوانم گرێوبکەم کە ئەمـەت مەبەست نەبوو، دەتویست شتێکی دیکە بڵێیت، لەوە دەچێ ویستبێتت ئەو قسانە بە یـەکێکی دی بڵێی نـەک بە مـن!... ئەوە چییە، چیتە؟ نەخۆشیت؟

- لەوەیـە، دوور نییـە. بـە ڕاسـتی سـەلماندت زیرەکـی، زۆر ورد و بەدیقەتی، کاتێ گوتت، لەوەیەویستبم ئەو قسانە بە یـەکێکی دی بڵێم نـەک بەتۆ.

میرزادە، ئەو قسەیەی بەدەم بزەیەکی تایبـەتیەوە، بگرە بـەدەم بزەیـەکی

کۆمیدییەوە کرد. ئەوسا، بە گەرمی لەسەر ڕۆیشت و گوتی:

- ڕەفتاری پێرێی خۆمم بیرمەخەوە! . لەوساوە، مەگەر هەر خۆم بزانم چەند شەرمەزار و تەریق و خەجاڵەتم... هەمووی خەتای من بوو، دەزانم هەڵە، هەڵەی من بوو.

- بەڵام... تۆ چیت کردووە، چ خەتاو گوناحێکی گەورە و ترسناکت کردووە؟

- یەگڤینی پاڤلوفیچ، هەستدەکەم تۆ لە هەمووان پتر پەرۆشی منیت. کە قسان دەکەی سوور دەبێتەوە، ئەمە خۆی لەخۆیدا نیشانەی دڵسۆزی و دڵپاکیتە، من هەر ئێستا دەڕۆم. باوەڕبکە کە هەر ئێستا دەڕۆم.

لیزا ڤیتا پروکوفیڤنا، بە پەرۆشەوە لە کولیای پرسی:

- چییەتی؟ بەتەمای چییە؟ کە فێیەکەی بۆ دێت، بەو شێوەیە دەست پێ دەکات؟

- گوێ مەدەیە لیزا ڤیتا پروکوفیڤنا، خەمت نەبێ، فێیەکم بۆ نە هاتووە، دەڕۆم، دوای تۆزێکی دی دەڕۆم. من دەزانم کە... تەبیعەت نامرادی کردووم. من بیست و چوار دانە ساڵە نەخۆشم، لە ڕۆژی لەدیکبوونمەوە تا تەمەنی بیست و چوار ساڵی، هەر نەخۆش بووم، خێرم لەخۆ نەدیووە. ئەم قسانەشم وەکو قسەی نەخۆشێک لێوەبگرن. هەر ئێستا دەڕۆم، دڵنیابە کە هەنوکە دەڕۆم. خۆ نەخۆشی عەیب نییە، پێویست بە تەریق بوونەوە ناکات، وانییە؟ بەڵام من لەنێو کۆمەڵگەدا جێم نییە، زیادەم. ئەم قسەیەم لە غرووڕەوە نییە. من لە ماوەی ئەم سێ ڕۆژەدا، زۆرم بیرکردەوە، گەیشتمە ئەو قەناعەتەی کە لەسەرمە، لە یەکەمین دەرفەتدا، ڕاستگۆیانە و ئابڕومەندانە، بۆچوون و بیرکردنەوەی خۆمت پێ ڕابگەیەنم. هەندێ بیری تایبەتی، بیری بەرز هەن، پێویست ناکا باسیان بکەم، چونکە دەزانم هەمووتان پێم پێدەکەنن، گاڵتەم پێدەکەن... میرزادە "س.." تۆزێ لەمەوپێش، ئاماژەی بۆ ئەوە کرد، کە هیچ ڕەفتارێکم لە بێ جایی بەدەر نییە، میانڕەوی نازانم. زمانم کۆڵەوارە، ناتوانێ بیرەکانم بگەیەنێت، بۆیە بەو زمانە بایەخی خۆیان لە دەست دەدەن. بۆیە مافی ئەوەم نییە... ئەمە جگە لەوەی کە من

کەسێکی زۆر هەستیارم.. زۆر دوو دڵ و بەگومانم. ڕاستە... من دڵنیام کە لەم ماڵەدا کەس نایەوێ نارەحەتم بکات و بێ ئەندازەیش خۆشەویستم، بەڵام دەزانم "دڵنیام" کە بیست و چوار ساڵ نەخۆشی باندۆرو کاریگەریی خۆی هەیە، بیست و چوار ساڵ گاڵتە نییە. بۆیە مەحاڵە خەڵکی هەندێ جار.. گاڵتەم پێنەکەن، پێم ڕانەبوێرن... تۆش پێت وانییە؟

میرزادە، بەدەم ئەو قسەیەوە، وەکو ئەوەی چاوەڕوانی وەڵامێک یان بڕیارێک بێت، چاوێکی بە ئامادەبووواندا گێڕا. هەر هەموویان سەریان لەم هەڵچوونە کوتوپڕ و نەخۆشانەیەی میرزادە سووڕ ما، کەس چاوەڕوانی ئەم هەڵچوونەی لێ نەدەکرد و هەر پێویستیش بەو هەڵچوونە نەبوو، کە ڕووداوێکی سەیری لێ کەوتەوە ئەویش ئەوە بوو ئاگلایا لەپڕ هاواری کرد. لە میرزادەی پرسی:

- بۆچی ئەم قسانە لێرە دەکەی؟ بۆچی ئەم قسانە بۆ ئەوانە دەکەیت؟ بۆ هەموویان؟

ئاگلایا، یەجگار تووڕە بوو، گڕ لە چاوانی دەبووەوە. میرزادەوەکو لاڵ لەبەردەمیا وەستا و لەپڕ ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا. ئاگلایا هاواری کرد:

- لێرەدا، کەس شایستەی ئەو قسانەی تۆ نییە! کەسیان ناکەنە پەنجە تووتەی تۆ، نە لە ڕووی فیکرەوە نە لە ڕووی دڵ و دەروونەوە! تۆ لە هەر هەموویان نەجیب تر و ئابڕومەند تری. تۆ لە هەموویان ڕەسەنتر و میهرەبانتر و زیرەکتریت! لێرەدا خەڵکانی وا هەن، شایانی ئەوە نین، ئەو دەستەسڕەت بۆ هەڵگرنەوە کە هەنوکە لە دەست بەر بووە خوارەوە... ئیدی بۆچی خۆت دەشکێنیتەوە و خۆت لەوان بە بچووکتر دەزانی؟ بۆچی غەدر لە خۆت دەکەی؟ ئەم خۆشکێنی یەت لەپای چییە؟

لیزا ڤیتا پروکوفیڤنا، بە توندی دەستی دان بەیەکدا و هاواری کرد:

- خودایا! کێ تەسەوری شتی وای دەکرد؟

کولیا، بە شادییەوە هاواری کرد:

- بژی! سوارچاکی لات! ..

ئاگلایا گوتی:

- بێدەنگ بە!

ئەوسا، بەو پەڕی تووڕەیی و بەدوور لە هەر نەزاکەت و ئەتەکێتێک، بەتوندی و زبری بە دایکی گوت:

- کێ حەدی هەیە لێرە، لە ماڵی تۆدا سووکایەتیم پێ بکات؟ بۆچی هەمووتان، یەک بە یەکتان عەزابی ڕۆحم دەدەن؟ میرزادە بۆچی هەر هەموویان سێ دانە ڕۆژە لە سەرِ تۆ سەردەکەنە سەرم زوخاوەزگم دەکەن؟ من هەرگیز شوو بەتۆ ناکەم! ئەو خەیاڵە لە مێشکی خۆت دەر بکە! لەبیرت نەچێ ها! ئاخر چ کچێک شوو بە گەپجارێکی وەکو تۆ دەکات؟ بڕۆ لە ئاوێنەدا تەماشای خۆت بکە، بزانە چ سەروسیمایەکت هەیە! ئاخر بۆچی بە ناوی شووکردنی من بە تۆ، سەردەکەنە سەرم، زووخاوە زگم دەکەن؟ هەڵبەتە دەبێ تۆ هۆی ئەمە بزانیت! دیارە تۆ هاودەستیانی، لە پیلانەکەیاندا شەریکی!

ئادیلا، بە ترسەوە کەوتە مینگە مینگ:

- کەس، جارێ لە جاران سەری نەکردووەتە سەری!

ئەلکسندرا ئیڤانۆڤناش هەڵدایە:

- کەس، تەنانەت شتی وای بە بیریشا نەهاتووە. کەس تاقە قسەیەکی پێ نەگووتووە!

لیزا ڤیتا پروکوفیڤنا کە لە حیرساندا دەلەرزی، ڕووی کردە ئامادەبووان و گوتی:

- کێ سەری کردۆتە سەری؟ کەی سەرکراوەتە سەری؟ کێ حەدی هەیە قسەی وای پێ بڵێ؟ چییە، وڕێنە دەکات؟

ئاگلایا، بەدەم کوڵی گریانەوە، گریانێ کە دڵی دێنایە ژان، بەرسڤی دایەوە.

- هەر هەموویان قسەی وایان پێگوتم! هەر هەموویان، دوابە یەکیان، ئەوە سێ دانە ڕۆژە مێشکی سەریان بردووم.

ئەوسا گریا ئەمما گریان، جۆشی گریانی دانەدەمرکایەوە، خۆی بەسەر کورسییەکەدا داو دەستەسرەکەی بەدەموچاویەوە گرت

- ئاخر، ئەو تا ئێستا خوازبێنی..

میرزادە گوتی:

- ئاگلایا ئیڤانوڤنا، من هەرگیز خوازبێنی تۆم نەکردووە.

لیزا ڤیتا پروکوفیڤنا، لەناکاودا بەسەرسامی و تورەیی گوتی:

- چی ی ی؟ یانی چی؟

باوەڕی بەگوێی خۆی نەدەکرد. میرزادە، بە دوو دڵی کەوتە مینگە مینگ:

- مەبەستم.. مەبەستم... دەیویست... دەمویست بۆ ئاگلایای روونبکەمەوە.. دەمویست بە شنازییەوە بۆی شرۆڤە بکەم کە من نیازم نەبوو... بە خوازبێنی ئەو مشەرەف ببم... تەنانەت لە ئاییندەشدا!... بە راستی من لەمەدا بێخەتام، هیچ گلەیەکم لەسەر نییە! من هەرگیز بەتەمای ئەوە نەبووم رۆژێ لە رۆژان خوازبێنی تۆ بکەم، تەنانەت شتی وام بە خەیاڵ و بە بیریشدا نەهاتووە! لەمە دڵنیابە! دیارە دەبێ کەسێکی بەدخوا، دڵرەش، ئەم فیتنەییەی لە بەینماندا کرد بێت! هیچ نیگەران مەبەو خەیاڵت ئاسوودەبێ!

بەدەم ئەو قسانەوە لە ئاگلایا نزیک بووەوە. ئاگلایا دەسەسرەکەی لەسەر چاوی لادا، نیگایەکی سەروسیمای پەرێشانی میرزادەی کرد. سیمای ترسناکی ئەوی خوێندەوە، لە مانای قسەکانی گەیشت، بە دەنگی بەرز بە روویا پێکەنی. پێکەنینێکی ئەوەندە بەرز و تەوسئامێز بوو، کە ئادیلایدی خوشکیشی گرتەوە. بەهەشتاو بەرە و لای خوشکەکەی چوو، باوەشی پێدا کرد، هەر دوو دەستی لە قەدی ئالآند و گوێ بە گوێی ئەو کەوتە پێکەنین. میرزادە کە بەو حاڵەوە دیتنی، یەکسەر بزەی کەوتە سەر لێوان، رووی گەشایەوە، لە رووی ئاسودەییەوە گوتی:

- ئۆ... سوپاس بۆ خوا... زۆر شوکر خدایا! ..

ئەلکسندراش خۆی پێنەگیرا، ئەویش بە کوڵ و لەناخی دڵەوە کەوتە پێکەنین، ئەم سێ خوشکە بە جۆرێ پێدەکەنین لە تۆ وایە جۆشی پێکەنینیان هەرگیز دانامرکێتەوە.

لیزا ڤیتا پروکوفیڤنا کەوتە پرتاندن:

– ئەمانە شێتن، هەرسێکیان شێتن! لە سەرەتاوە بنیادەم شێت دەکەن و پاشان...

پێکەنینەکە سیرایەتی کرد بۆ میرزادە "س.." ش، بۆ "یەڤگینی باڤلوفیچ"ش، تەنانەت بۆ کولیاش کە جڵەوی خۆی بۆ نەدەگیرا، میرزادە کە ئەوانی بەو حاڵەوە بینی، ئەویش گوێ بە گوێی وان کەوتە پێکەنین!

ئادیلاید گوتی:

– وەرن با بچینە گەڕان و پیاسە! دەی با هەمووان بێن، با میرزادەش بێت، میرزادە بۆچی دەتەوی خۆتمان لێ جیابکەیتەوە؟ میرزادە چەند مەحبوبە! وانیە ئاگلایا؟ دایکە بەلای تۆشەوەوانییە؟ من دەبێ ماچی بکەم، لە ئامێزی بگرم... چونکە پیاوانە و بە ڕاشکاوی هەموو شتێکی بۆ ئاگلایا ڕوون کردەوە. پێویستە ماچی بکەم. دایکە، دایکە گیان، ڕێم دەدەی میرزادە ماچ بکەم؟ ئاگلایا بە یارمەتیت، ڕێم بدە با "میرزادەکەت" ماچ بکەم!

ئەو کیژە، عەیارە، دوای ئەو قسانە بەهەشتاو چوو بۆلای میرزادە و قسەکەی خۆی هێنایەدی و تەختی ناوچەوانی ڕامووسی. میرزادە، دەستی گرت، هێندە بە توندی گوشی، لەزگ بوو ئادیلاید لە تاوا بقیژێنێ. میرزادە کە بەوپەڕی شادمانی تەماشای دەکرد، لەناکاودا، دەستی کیژەی بۆ دەمی بەرز کردەوە و سێ کەڕەتی ماچ کرد.

ئاگلایا گوتی:

– دەی جەماعەت با بڕۆین! میرزادە تۆ دەگەڵ من دەبیت. دایکە ڕێگە بەو خوازگارە دەدەی کە تۆزێ لە مەپێش بە من ڕازی نەبوو، ڕەفزی کردم؟ میرزادە تۆ بۆ هەتا هەتایە منت ڕەفز نەکردووە؟ نا، نا، پیاو ئاوا قۆڵ بە قۆڵی خانمدا ناکات! چما نازانی چۆن دەستی خانمێک بگریت؟ ئاوها.. ئێستا باشە، دەی با بڕۆین، با بەدوو قۆڵی پێش بکەوین. حەز دەکەی دوو بە دوو پێش ئەوانی دی بکەوین، بۆ خۆمان ڕاز و نیاز بکەین؟

ئاگلایا، لە پەستاو بێ بڕانەوە قسانی دەکرد و ناو بە ناویش قاقایەکی لێدەدا.

لیزا ڤیتا پروکوفیڤنا، کە خۆیشی نەیدەزانی بۆچی دڵی خۆشە، لە دڵی خۆیدا دەیگوت و دەیگوتەوە: "شوکر بۆ خوا، لە خودا بە زیادبێ! "

میرزادە "س.." لە دڵی خۆیدا گوتی: "بە ڕاستی ئەمانە خەڵکێکی سەیرن" لەوەتای هاتووچۆی ماڵی یەپانچینی دەکرد، ڕەنگە بۆ سەدەمین جار ئەم قسەیەی دووبارە کردبێتەوە، بەڵام.. بەو حاڵەشیانەوە هەر خۆشی دەویستن! بەڵام هێشتا بەتەواوەتی دەگەڵ میرزادەدا نەکرابووەوە. کاتێ دەستیان بە پیاسە دەستە جەمیەکە کرد، میرزادە "س.." کەمێک نارەحەت و برێک خەمبار دەینواند.

یەڤگینی پافلوفیچ، لە هەموویان بەکەیفتر دیار بوو. بەدرێژایی رێگا و لە باخەکەشدا هەر قسەی خۆشی بۆ ئەلکسندرا و ئادیلاید دەکرد، نوکتەی بۆ دەوتن، هەوڵی دەدا بێتاقەت نەبن، بەڵام کیژەکان بە جۆرێ بە نوکتە و جەفەنگەکانی پێدەکەنین، کەوتە گومانی ئەوەی کە لەوەیە گوێ لە قسەکانی نەگرن، ئەو بیرە لەناکاوا، خۆبەخۆ خستیە پێکەنین (ئیدی بە تەبیعەت وابوو). جووتە خوشک، شادو بەکەیف و تەڕدەماخ، دەیانڕوانییە خوشکە چکۆلەکەیان کە دەگەڵ میرزادەدا لە پێشی پێشەوە رێیان دەکرد. دیار بوو کە لە ئاگلایا نەدەگەیشتن، لێیان بووبوو بە مەتەڵۆک و لەگەز، هەرچیان دەکرد بۆیان هەڵنەدەهات و نەدەهات. میرزادە "س.." قسەی بۆ لیزا ڤیتا پروکوفیڤنا دەکرد، دەیویست بە قسە و باسی بێسەروبەر مژولی بکات و بێتاقەت نەبێت، بەڵام بەپێچەوانەوە، زیاتر بێتاقەتی دەکرد، پەشێو و پەرێشان دیار بوو، وەڵامەکانی بێسەروبەر بوون، هەندێ جار هەر وەڵامیشی نەدەدایەوە.

بەڵام مەتەڵۆک و لەگەزەکەی ئەو شەوەی ئاگلایا بەوەندە کۆتایی نەهات، بەڵام دوا بەشی ئەم مەتۆڵەکە، بە شی میرزادە بوو، تایبەت بوو بە میرزادە. تازە سەد شەقاوێک لە ڤێلاکە دوورکەوتبوونەوە کە ئاگلایا، بە ئەسپایی بە گوێی هاوڕێ بێدەنگەکەیدا، چپاند و گوتی:

- تەماشای لای ڕاست بکە!

میرزادە تەماشای لای ڕاستی کرد.





- بەوردی تەماشا بکە، ئەو تەختە دەبینی، هۆوەی ناو باخەکە، ئەوەی نزیکی ئەو سێ درەختە گەورەیە: ئەو تەختە کەسکە؟

میرزادە، بەرسڤی دایەوە کە بەڵێ دەیبینێ، ئاگلایا پرسی:

- ئەو شوێنەت بەدڵە؟ هەندێ جار، بەیانیانی زوو، نزیکی سەعات حەوت، کاتێ هەمووان لە غوڕابی خەودان، من بە تەنیا دێم بۆ ئێرە و دەچم لەوێندەر بە تاقی تەنیا دادەنیشم.

میرزادە، لەبن لێوانەوە گوتی کە شوێنێکی جوانە.

ئاگلایا گوتی:

- دەی هەنوکە کەمێک لاکەوە! نامەوێ قۆڵم لە قۆڵی تۆدا بێ، بەڵام نا، دەستم بگریت باشترە، بەڵام یەک قسەی دی نەکەی.دەخوازم دەگەڵ خەیاڵەکانی خۆمدا بژیم.

ئەلهەقی ئەم داوایە، زیادە بوو، چونکە لەگێن بوو شازادە، بەبێ ئەوەی ئەویش بڵێ، بەدرێژایی پیاسەکەیان، تاقە قسەیەکیش نەکات.

کاتێ ئاگلایا باسی تەختەکەی دەکرد، دڵی میرزادە بە توندی کەوتە لێدان، وەک بڵێی شتێکی غەریبی بە مێشکا هات، بەڵام دوای ڕامانێکی کەم، بە هەستێکی شەرمنانەوە ئەو شتە غەریبەی لە مێشکی خۆی وەدەرنا.

خەڵکی دەزانن، یان زۆربەی خەڵکی پێیان وایە ئەو جەماوەرەی کە لە ڕۆژانی ناوەڕاستی هەفتەدا ڕوودەکەنە باخ و سەیرانگاکانی پاڤلوفسک "دەستەبژێرترن" لەو خەڵکانەی کە لە ڕۆژانی یەک شەممە و بۆنە و جەژنەکاندا، بەلێشا و لە شارەوە، لەپتر سپۆرگەوە بۆ ئێرە دێن. هەرچەندە ئەو جلانەی لەو ڕۆژانەدا خەڵکەکە لەبەری دەکەن، جلکی ڕۆژانی یەک شەممان نییە، بەڵام جلوبەرگیان، بەتایبەتی هی ئافرەتان، لە هی یەک شەممانیش جوانترە. عادەت وایە خەڵکانی بژاردە بۆ گوێگرتن لە موزیک ڕوویان دەکردە ئێرە. خەڵکی لە دەوری ئۆرکستراکە کۆدەبوونەوە و ئەم ئۆرکسترایەش، کە لە هەموو ئەو ئۆرکسترایانەی دیکە، کە باخە گشتیەکانی لای خۆماندا کۆنسێرتیان پێشکەش دەکرد، باشتر بوو، تازەترین بەرهەمی خۆی پێشکەش دەکرد.





هەرچەندە جەوێکی خانەوادەیی و خۆمانی ساز دەبوو، بەڵام خەڵکەکە، زۆر بە ئەدەبەوە ڕەفتاریان دەکرد، ئەتەکێتی جڤاکیان ڕەچاو دەکرد. زۆربەی خەڵکەکە زیاتر بۆ دیدەنی دۆست و ئاشنایانی خۆیان ڕوودەکەنە ئەوێندەر. گروپێکیش بە ڕاستی بۆ لەزەت وەرگرتن لە مۆزیک ڕوو لەوێندەر دەکەن. شەڕ و ئاژاوە زۆر دەگمەنە، هەرچەندە، ناو بە ناو، بە درێژایی هەفتە، تەنانەت لە ڕۆژانی غەیرەز ڕۆژانی یەک شەممەش، شەڕو ڕەفتاری دزێو، دەبینرێت، ئیدی ئەو شتانەش هەر دەبێت.

ئەو ئێوارەیە، ڕۆژەکەی ڕۆژێکی خۆشبوو. هەوایەکی خۆشی هەبوو، سەیرانگەکە زۆر قەرەباڵغ بوو، کورسییەکانی دەوروبەر و نزیکی شوێنی ئۆرکستراکە، هەموو گیرابوون، بۆیە جەماعەتەکەی لەمەڕ خۆمان، تۆزێ دوورتر، لە نزیکی دەرگای چەپی چوونە دەرەوە لە باخەکە، جێگەیان گرت. قەرەباڵغی خەڵکەکە و ئاواز و مۆسیقاکە، کەمێک خەمی لیزا ڤیتا پروکوفیڤنایان ڕەواندەوە، کیژەکانی دڵیان خۆش بوو، کەمێک بە ڕووی خەڵکەکدا کرانەوە، لە دوورەوە، بە نیگای چاو و بە ئاماژەی سەر سڵاویان بۆ دۆست و ئاشنایان دەنارد. کیژەکان، تەمەشای جلوبەرگی خەڵکەکەیان دەکرد، سەرنجی شتە سەیر و نەشازەکانیان دەدا. بەدەم بزەی تەوسامێزەوە باسیان دەکردن. "یەڤگینی پاڤلوفیچ"ش بەدەرزەن سڵاوی بە سەر دۆستەکانیا دەبەخشیەوە و سەری ڕێزی بۆ دادەنەواندن، ئاگلایا و میرزادە کە هێشتا شان بەشانی یەکدی ڕێیان دەکرد، سەرنجی کۆمەڵێک خەڵکیان ڕاکێشا، بەرەبەرە کۆمەڵێک گەنجی ئاشنا، لە دەوری دایک و کچەکانی خڕبوونەوە. دوان سیانێکیان هەژدەر، هەژدەر قسانیان دەکرد. ئەمانە هەموو دۆست و بنازۆی یەڤگینی پاڤلوفیچ بوون، یەکێکیان ئەفسەرێکی گەنجی قۆزی خۆش گفت و لفت و پڕ جۆش و چالاک و چەلەنگ بوو. زوو بە زوو دەگەڵ ئاگلایادا کەوتە قسان و دەیویست بە هەر شێوەیەک بووە سەرنجی کیژێ ڕابکێشێت. ئاگلایا زۆر بەکەیف و بە دەماخ بوو، بەدرێژایی ئەو ماوەیە شاد و دڵخۆش، بە ڕووی کورەیا پێدەکەنی. یەڤگینی پاڤلوفیچ داوای لە میرزادە کرد کە دەگەڵ ئەو کوڕەدا

تەعاروف بکەن. میرزادە، وەکو پێویست لە هۆی ئەم داوایە نەدەگەیی، بەڵام تەعاروفەکە کرا. هەر دووکیان سەریان بۆ یەکتری دانەواند و تەوقەیان کرد. برادەرەکەی یەڤگینی پاڤلوفیچ، پرسیارێکی لە میرزادە کرد کە وەڵامی نەدایەوە، یان بە گوتەیەکی دی لەجیاتیی وەڵام مینگە مینگێکی نامەفهوومی کرد و هیچی دی. ئەفسەری لاو سەیرێکی میرزادەی کرد و ئەوسا ڕوانییە یەڤگینی پاڤلوفیچ و ئەوسا تێگەیشت کە بۆچی برادەرەکەی بە میرزادەی ناساندووە. بزەیەکی کاڵی بۆ کرد و جارێکی دی ڕووی کردەوە بەلای ئاگلایادا. تە نیا یەڤگینی باڤلوفیچ. هەستی کرد کە ئاگلایا لەودەمەدا، لەپڕ سوور هەڵگەڕاوە.

بەڵام میرزادە، تەنانەت هەستی بەوانەش نەکرد کە قسانیان دەگەڵ ئاگلایادا دەکرد، مەراییان دەکرد و خۆیان لێی نزیک دەکردەوە. بگرە جارجار، بۆ چەند ساتێک، بەتەواوەتی لەبیری دەچووەوە کە دەگەڵ ئاگلایادایە. هەندێ جار، لە کانگای دڵەوە حەزیدەکرد لەوێندەر بڕوات، خۆی بە یەکجارەکی ون بکات. تەنانەت حەزیدەکرد پەنا بەرێتە بەر پەناگەیەکی تاریک تاریک و بەتاقی تەنیا دەگەڵ هزر و خەیاڵەکانی خۆیدا بژی و کەس بە جێگاکەی نەزانێت. یان بەلای کەمەوە خۆزیای دەخواست کە هەنوکە لە ماڵەکەی خۆیدا، لە بالکۆنەکەدا بێ، بەمەرجێ کەس، نە لیبدیف و نە منداڵەکانی ئاگایان لێی نەبێت و لەوێ نەبن. خۆزیای دەخواست، لەوێندەر بێت، خۆی بەسەر تەختە خەوەکەیدا بدات، سەری لە سەرینەکەی بچەقینێ، ئەگەر ئەوەی بۆ بڕەخسایە، شەوێک و دوو ڕۆژ بەو دەقەوە دەمایەوە و هەڵنەدەستا. لە هەندێ ساتی دیکەدا، بە باڵی خەیاڵ دەفڕی بۆ سەرچیا و کۆجاڕان، بە تایبەتی بۆ ئەو شوێنەی کە مەڵبەندی یادگارییە ئازیزەکانی بوو، بۆ سەر چیای ئەلب، کە کاتێ لە سویسرا بوو، بۆ گەڕان و پیاسە دەچووە ئەوێ. پیاو لەوێندەرەوە، لە ترۆپکی چیاوە، لە دووری دوورەوە، لە قووڵایی دۆڵاندا، گوند دەبینێ، قەڵبەزە و وردە تاڤگانی بەفراوی دەبینێ کە لە بڵندابییەوە دادەڕژێن، هەوری سپی دەبینێ، لەوێوە کۆنە قەڵاو کۆشکێکی چۆڵ دەبینێ. چەندی حەزدەکرد، ئا ئێستا

لەوێندەر بوایە، تەنیا بیری لە یەک شت بکردایەتەوە، بە درێژایی تەمەنی، ئەگەر هەزار سالیش بایە، هەر بیری لەیەک شت بکردایەتەوە! چش با هەنوو ئەوانەی دەوروبەری فەرامۆشیان بکردایە، بەیەکجارەکی لەبیری خۆیان ببردایەتەوە. بگرە، ئەمە زەروریشە. ئاخر چ دەبوو ئەمانەی هەر نە ناسیبا، هەر هەموو ئەم دیاردە و بەسەرهاتانە جگە لە خەون هیچی دی نەبوایەن! خۆ زۆر باشتر دەبوو! چما خەون و واقیع هەر یەک شت نین؟

ئەوسا میرزادە، لەپڕ دەیڕوانییە ئاگلایا، نیگای بۆ ماوەی پێنج دەقیقە بە سیمای کیژێوە دەگیرسایەوە، بەلام نۆرین و نیگایەکی غەریب، نامۆ: لە تۆ وایە دەڕوانێتە شتێک کە دوو قۆناغێک لەوەوە دوورە، یان وەکو ئەوەی بڕوانێتەوێنەی ئاگلایا نەک، خودی ئاگلایا.

ئاگلایا. لەپڕ قسە و پێکەنینی دەگەڵ ئەوانەی دەوروبەریا بڕی و پرسی:

– میرزادە، بۆچی بەو جۆرە تێم دەڕوانی؟ دەترسم. هەست دەکەم کە گەرەکتە دەست بێنی و قامکان بەڕوومەتمدا بێنی. یەڤگینی پاڤلوفیچ تۆ چ دەڵێی؟ ڕوانینەکەی لەوە ناچێت؟

میرزادە کە گوێی لەو قسانە بوو، پێدەچوو باوەڕ نەکات کە ئەمە ئاگلایایە و ئەو دەدوێنێ. بەهەرحاڵ، لەوە دەچوو بە نیوەچڵی لە مانای قسەکانی گەیی بێت، بۆ ساتێک لە فکران ڕاچوو. بەتاقە وشەیەکیش وەلامی نەدایەوە، بەلام کە بینی ئاگلایا و ئەوانەی دەوروبەری پێدەکەنن، ئەویش گوێ بە گوێی ئەوان دەستی بە پێکەنین کرد. هەنگێ دەنگی پێکەنینی دەسەجەمی بەرز بووەوە، بەلام ئەو ئەفسەرەی کە بەتەبیعەت ڕووخۆش و دەم بەپێکەنین بوو، بە قاقا پێدەکەنی. ئاگلایا، لەپڕ، تووڕەبوو، لەبن لێوانەوە گوتی:

– گەمشەگ!

لیزا ڤیتا پروکوفیڤنا، کە لەدڵی خۆیدا بەردی بە بادەکرد، لەبن لێوانەوە گوتی:

– خودای میهرەبان! چۆن بەم ڕازی دەبێ کە... چی شێت بووە؟

ئەلکسندرا! بەدڵنیایی و متمانەوە، بە گوێی دایکیا چپاند:

– ئەمە سوعبەتە، گاڵتەیە. ئەمە دووبارەکردنەوەی هەمان ئەو ڕابواردن و شۆخیەی ئەو ڕۆژەیە کە دەربارەی "سوارچاکی لات"دەیکرد. لەوە زیاتر هیچی دی نییە. بە شێوازی خۆی تەشەری لێدەدا، بەڵام ئەم جارەیان زێدەڕۆیی تیاکردووە، پێویستە جڵەوی بگرین. دایکە! بینیت تۆزێ لەمە پێش چ نمایشێکی دەکرد، چۆن کەوتبووە سیما گۆڕکێ، چۆن ئێمەی دەترساند تا بۆخۆی ڕابوێرێ.

قسەکانی ئەلکسندرا، کەمێک ئارامیان بە گیانی لیزاڤیتا بەخشی و لەبن لێوانەوە گوتی:

– خوا بەوە ڕەحمی کردووە، سەروکاری دەگەڵ گەمژەیەکی وەکو ئەمەدایە.

میرزادە گوێی لێ بوو کە پێی دەڵێن گەمژە، سەری سووڕمابوو، نەک لەوەی کە ناویان نابوو گەمژەڵ، چونکە دەست بەجێ ئەو تەوهینەی لە بیرکرد. سەری لەوە سووڕما بوو، کە لە ناو خەڵکەکەدا، لە نزیکی ئەو شوێنەی کە خۆی لێی دانیشتبوو لە لایەکەوە (نەیدەتوانی بەوردی نەشوێنەکە و نەسەمتی لایەکە دیاری بکات) سێبەری تیژ تێپەڕی کەسێکی بینی، کەسێکی ڕەنگزەردی، قژ لوولی، لێو بەخەندەی، نیگا ئاشنای ئاشنای، بینی. ئیدی ئەم کەس و سیمایە بەلەز هات و خێرا تێپەڕی، زۆر لەوە دەچوو ئەمە زادەی خەیاڵی خۆی بووبێت. ئەوەی لەم خەو و خەیاڵەدا لە بیری مابووەوە، بریتی بوو لە بزەیەکی تەوسامێز، دوو چاو، بوینباخێکی کەسکی ئاچووخی پیاوێک کە بیەوێ کەشخەو شیکپۆش بنوێنێ، ئەو پیاوە بەلەز دەر کەوت و خێرا ون بوو. میرزادە تیا مابوو، نەیدەزانی، کە ئەو پیاوە لەنێو ئاپۆڕای خەڵکەکەدا ون بوو، یان لەنێو بەباخ و سەیرانگەکەدا دیارنەما. دوای تۆزێک میرزادە، نیگەران و خەمین و خەمبار، لەناکاوا کەوتە ڕوانینی دەوروبەری خۆی. ئەگەری ئەوە هەبوو کە دەرکەوتنی یەکەمین کەسی تیژ تێپەڕ، زەمینە خۆشکەر بووبێ بۆ دەرکەوتنی کەسێکی دی. ئەمە نەک هەر ئەگەر بوو. بەڵکو گومانیشی تیا نەبوو. باشە چۆن

کاتێ بەرە و سەیرانگەکە چوون، ئەگەری ڕوودانی ئەم دیدارەی لە بەرچاو نەگرتبوو؟ بەڵام ئەو چونکە لە بارێکی دەروونی نالەبارا بوو، هەنگێ نەیدەزانی بۆ کوێ دەڕوات. خۆ ئەگەر کەمێک ئارامتربوایە، هەستی دەکرد، کە ئاگلایا نزیکەی چارەکە سەعاتێک بوو، ناو بەناو بە نیگەرانی دەیڕوانییە دەوروبەری خۆی، وەکو ئەوەی چاو لە شتێک یان کەسێک بگێڕێت. تا نیگەرانی و شپرزەیەکەی میرزادە لە زیادی دەدا، ئاگلایاش پتر دەپەشۆکا، هەر جارێ میرزادە ئاوڕی پاشەوەی دابـاوە، ئاگلایاش هەمان کاری ئەوی دەکرد، بەڵام زۆری پێنەچوو، کە هۆی ئەم ترس و دڵەڕاوکێیە ڕوون بووەوە. لەپڕێکا، گروپێک کە ژمارەیان بەلای کەمەوە دوازدە کەس دەبوو، ڕێک لەو دەرگـایەوە، کە میرزادە و جەماعەتەکەی یەپانچین، لە نزیکی دانیشتبوون، خۆیان بەژوورا کرد. سێ ژن لەپێش ئەم گرووپەوە ڕێیان دەکرد، جوانی دوانیان لە ئەقڵا نەبوو، بە ڕاستی جوا نیەکی ئەفسوناوی بوو، بۆیە هیچ سەیر نەبوو، ئەم هەموو دڵدارەیان دوا بکەون، بەڵام ئەو دڵدارانە، وەکو خودی ژنەکان، قەد و قەڵافەت و سەروسیمایەکی تایبەتیان هەبوو، زۆر جیاوازتر بوون لەو ئاپۆڕایەی لە دەوری ئۆرکستراکە کۆبووبوونەوە. هەرکەوەژوور کەوتن، زۆربەی هەرە زۆری خەڵکەکە هەستیان بەو حاڵەیان کرد، بەڵام زۆربەی خەڵکەکەوایان نواند، کە هەستیان پێنەکردوون، تەنیا ژمارەیەک گەنج نەبێت کە بەدەم بزە و پێکەنینەوە، بە دەنگی نزم، باری سەرنجی خۆیان دەربڕی، بەڵام مەحاڵ بوو پیاو بتوانێ سەرنجیان نەدات، چونکە بەخۆیان بەو مەبەستە هاتبوون کە سەرنجی خەڵکی ڕابکێشن، بە دەنگی بەرز قسانیان دەکرد، بە قاقا پێدەکەنین. دیار بوو هەندێکیان سەرمەست بوون. وێڕای ئەوەی زۆربەیان خۆشپۆش و تەرپۆش و پۆشتە و پەرداخ بوون، بەڵام هی واشیان تیا بوو بە جلوبەرگ و سەروسیما و ڕەفتار و ئەتواری سەیروسەمەرە، مایەی سەرنجی خەڵکی بوون، دەموچاویان لە دوورەوە سوور دەچووەوە. ئەم گروپە چەند کەسێکی سوپاییانش تێدابوو، هەروەها خەڵکی بە تەمەنیشیان تێدابوو. هەندێکیان جلی زۆر جوانی دوا مۆدیان لە بەربوو، موستیلەی

گەورەیان لە قامکان بوو، سەری قۆڵی کراسەکانیان بە دوگمەی نگین ئاسا ڕازابووەوە. کڵاو قژیان لەسەر نابوو، ڕدێن و سمێڵی شەوە ئاسایان بۆ خۆ دروستکردبوو. هەرچەندە، ڕەفتاریان سەنگین بوو، بەڵام سەروسیمایان ترسناک بوو، لەو خەڵکانە بوون، کە خەڵکی، بەتایبەتی خەڵکی سەر بەچینی ئەرستۆکرات، سڵیان لێدەکردن، وەکو چۆن خەڵکی خۆ لە تاعوون و پەتا دەپارێزن، بەو ئاوایە خۆیان لێدەپاراستن. هەڵبەتە لە باخ و سەیرانگاکانی دەوروبەری شارەکانی وڵاتی ئێمەدا، شوێنی زۆر ئەمین هەبوو، کە لە ڕووی خۆشڕەفتاری و ڕەچاوکردنی دابی چڤاکیەوە، بەناوبانگ بوون، بەڵام وێڕای ئەوەش سلۆکترین و بە پارێزترین خەڵک، ناتوانێ زەمانەتی ئەوە بکات، کە لەپڕ تووشی بەڵایەکی ناگەهان نابێت، بەردێک لە سەربانی ماڵەکەی تەنیشتیەوە ناکەوێتە خوارێ و بەسەر ئەو ناکەوێت. لە زگ بوو ئەم بەڵایە، ئەم بەردە بەسەر ئەو کۆمەڵە بژاردەیەدا بێت، بکەوێت کە لە دەوری ئۆرکسترایەکە خڕبووبوونەوە.

باخی سەیرانگەکەی پافلوفسک سێ پلە بەرزتر بوو لە سەکۆی ئۆرکسترایەکەوە، بۆ گەیشتن بە سەکۆیەکە دەبوایە سێ پلە دابەزیت. گرووپی ناقبری بەدوو دڵی لە سەر ئەم پلانەوەستان، تیا مابوون دابەزن یان نا، بەڵام یەکێک لە خانمەکان ملی نا، بێپەروا دابەزی، لەو هەمووە، تەنیا دوو پیاو زاتیان کرد دووی بکەون: یەکێکیان پیاوێکی خاکی، بێ فیزی، ناقساڵ بوو، بەڵام ڕەفتاری بێ سەروبەری ئەوەی دەنواند کە کەسێکی بێ ئەسڵ و فەسڵ و گومناو بێ، نە کەس بیناسێت و نە کەس بناسێت. دووەمیان زۆر شڕوشەپرێو و بێ نموود بوو. جگە لەم دووانە، چ کەسێکی دی شوێن ئەم خانمە ئە توار غەریبە نەکەوت. ئەم خانمە کاتێ بە پلەکاندا هاتەخوارێ، لە خۆی نەگرت هەر ئاوڕی پاشەوەش بداتەوە، دەتگوت: هیچ گوێی لەوەنیە کە کەسی بەدواوە بێت یان نا. بێپەروا پێدەکەنی و بە دەنگی بەرز قسانی دەکرد. جلو بەرگێکی گرانبەها و یەجگار جوانی لە بەردا بوو، نیشانەی زەوق و سەلیقەیەکی یەجگار بەرز بوو، عەیبی گەرە گەورەی جلوبەرگەکەی ئەوە بوو کە یەجگار سەرنج ڕاکێش

بوو. ئەم ژنە بە بەردەم سەکۆی ئۆرکستراکە و سازڤانەکاندا تێپەڕی و بەرە و شەقامەکە بە ڕێکەوت، کە گالیسکەیەکی یەجگار کەشخەو گەورە و نایاب لە قەراغ جادەکەوەستابوو چاوەڕێی ئەوی دەکرد.

میرزادە سێ دانە مانگی خشت بوو نەی دیتبوو. لەوەتای بۆ پترسپۆرگ گەڕابوەوە، هەر بەنیاز بوو سەری بدات و بچێتە دیدەنی، بەڵام وادیار بوو لە بەر هۆیەکی پەنهان، یان گومان و ترسێکی پەنهان، ئەو سەردانەی هەر نەکردبوو. دەکرێت بڵێین بەلای کەمەوە نەیدەتوانی تەسەوری ئەوە بکات کە دیتنی دووبارەی ئەو ژنە چ هەستێکی لەلا دروست دەکات. هەرچەندە، بە جۆرە ترس و سڵکردنەوەیەکەوە هەوڵی ئەوەی دابوو، بە خەیاڵ ئەو دیدارە لای خۆی بەرجەستە بکات. تەنیا یەک شتی لەلا عەیان و ڕوون بوو، ئەویش ئەوە بوو کە ئەو دیدارە زۆر دژوار و بەسوێ دەبێت. چەند جارێک لەماوەی شەش مانگی ڕابردوودا، ئەو هەستەی وەبیر خۆ هێنایەوە کە یەکەم دیتنی، وێنەیەکی ئەو ژنە لە دڵ و دەروونیا دروستی کرد. تا ماوەیەکی زۆر جگە لەوێنەی ئەو دەموچاوە، هیچی تری نەدەبینی، هەستی بە ئازارێکی دەروونی بەترەف دەکرد. ئەو یەک مانگەی کە لەشارۆچکەدا بەسەری برد و هەموو ڕۆژێک ئەو ژنەی دەبینی، دوو دڵی و ترسێکی وەهای خستبووە دڵەوە، کە حەزی نەدەکرد بیر لەو ڕابردووە نزیکەش بکاتەوە. شتێکی لە دەموچاوی ئەو ژنەدا دەبینی کە ڕوحی ئازار دەدا، ئازار ئەمما ئازار. لە گفتوگۆیەکیا دەگەڵ ڕوگوژیندا، ئەم هەستەی خۆی بە "بەزەییەکی بێ پایان" وەسف کردبوو، ئەمە زۆر ڕاست بوو. ئەم دەموچاوە، تەنانەت لەوێنەکەشدا، بەزەییەکی ڕاستەقینەی لەناخی دڵیا دەهاروژاند. ئەم هەستی بەزەییە بە ئازارە، دەرهەق بەم گووراوە، هەرگیز لە دڵی میرزادە بە ئێستاشەوە دەرنەچوو و نەچوو، نەک هەر دەرنەچوو ڕۆژ بە ڕۆژ لە زیادیشە. دڵی بەو وەسف و شرۆڤەیە خۆش نەبوو کە بۆ ڕۆگوژینی کردبوو، ئێستا لەگەڵ دەرکەوتنی لەناکاوی ئەو ژنەدا، پەی بەوە برد کە ئەو وەسفەی بۆ ڕوکوژینی کردبوو، لە شتێکی کەمە، شتێکی نوقسانە. ئەویش مەگەر وشە و زاراوەیەک پڕی

بکاتەوە کە سەدی سەد گوزارشت لە دڵەڕاوکێیەکەی، بەڵێ لە دڵە ڕاوکێیەکەی بکات! بەڵێ ئا ئێستا لەم ساتەدا زۆر بە چاکی هەستی بەم دڵە ڕاوکێیە دەکرد. بە بۆچوون و لێکدانەوەی خۆی، دڵنیا بوو کە ئەم ژنە شێتە. ئەوە بێننە بەرچاوی خۆتان کە ئەگەر پیاوێک لەم دنیایەدا ژنێکی لە هەر شتێکی دیکە خۆشتر بوێت یان وا هەست بکات تووشی ئەشقێکی لەو بابەتە. ببێت و ئەوسا دلبەرەکەی خۆی بەکۆت و زنجیرەوە، لەپشت شیشبەندی زندانەوە ببینێ و تەمەشا بکات پاسەوانێک دەستی داوەتە قامچی و بەربووەتەویژەی، دەبێ ئەو کابرایە هەست بەچی بکات! میرزادە لە هەمان باری نالەباری هاڕوژاوی دەروونیدا بوو.

ئاگلایا، ڕووی کردە میرزادە، چاوی بڕییە چاوانی، دەستی ڕاکێشا و بەچپە پرسی:

– چیتە؟

میرزادە، ئاوڕی لێدایەوە، قەدەرێک لێی وردبووەوە، ئەوسا پرشنگێکی نامەفهومی لە چاوە ڕەشەکانیا بەدی کرد. هەوڵی دا بەدەمیەوە بگرژێتەوە، بەڵام زوو بە زوو فەرامۆشی کردو، دووبارە نیگای بۆلای ڕاست گواستەوە، دیسان خەون و خەیاڵێکی تازە بردییەوە.

لەوساتەدا ناستاسیا فیلوڤنا، بە نزیکی ڕیزی ئافرەتەکاندا تێپەڕی. یەڤگینی پاڤلوفیچ، خەریک بوو حیکایەتێکی بۆ ئەلکسندرا ئیڤانوڤنا دەگێڕایەوە، دیار بوو حیکایەتێکی خۆش و کۆمیدییە، چونکە زۆر بە ئاو و تاو و گەرموگوڕی دەیگێڕایەوە. ئەوسا میرزادە بیری کەوتەوە کە ئاگلایا هەنگێ بە ئەسپایی گوتویەتی: "ئا... چ توحفەیە..." هەرچەندە زوو زمانی خۆی گرت و قسەکەی تەواونەکرد، بەڵام تازە کار لەکار ترازا بوو. ئەوەی گوتی هەموو شتێک بوو.

ناستاسیا فیلیپوڤنا، بە جۆرێ ڕێیدەکرد و تێدەپەڕی وەکو ئەوەی کەس نەبینێ، لێ لەناکاوا ئاوڕی لای ئەوانی دایەوە، وای نواند کە بە ڕێکەوت یەڤگینی پاڤلوفیچی لەوی دیتبێ، چاوەڕوانی شتی وا نە بووبێ، لەپڕ وەستا و هاواری کرد:

- بەهـ بەهـ.. ئاغا لێرەیە! جاری وایە دەبێ بە ئەستێرەی سیوەیل و بە سەد قاسیدانیش نادۆزرێتەوە، جاری واش هەیە لەشوێنی وادا دەبینرێ کەوێنا ناکرێت.. وام وێنا دەکرد لەوێندەر بیت... لە ماڵی مامت!...

یەڤگینی پاڤلوفیچ سوورهەڵگەڕا، نیگایەکی تورەی ناستاسیا فیلیپوفنای کرد و هەنگێ ڕووی وەرگێڕا.

- چییە؟ چما هێشتا نەتزانیوە؟ سەیرە، هێشتا هەواڵەکەی نەبیستووە! شتی وا دەبێ؟ بەڵێ، مامت خۆی ڕزگارکرد! خۆی کوشت! ئەم بەیانیە گوللەیەکی بەخۆیەوە ناو خۆی کوشت! تۆزێ لەمەپێش بیستم، سەعات دوو. نیوەی خەڵکی شار بە هەواڵەکەیان زانیوە. دەڵێن سێ سەدوپەنجا هەزار ڕۆبڵی لە خەزێنەی دەوڵەت دزیوە. هەندێک دەڵێن پێنج سەد هەزار ڕۆبڵە. وام وێنا دەکرد سەروەت و سامانێکی زۆرت بۆ بەجێ دێڵێت! بەڵام وا دیارە ئەو پیرەمێرە هەرزە داوێن پیس و فاسقە گسکی لێداوە! دەی بەدووعا، "هیوای سەرکەوتنت بۆ دەخوازم." بە ڕاست، نارۆی بۆ شار؟ پێویستە بڕۆیت. بە ڕاستی زیرەکیت کرد کە لە کاتی خۆیدا ئستیقالەت کرد. بەشی خۆت لێزانی! ئەوە من چ دەڵێم؟ بێگومان تۆ هەموو شتێکت زانیوە، ڕەنگە لەدوێنێوە پێت زانی بێ...

هەڵبەتە، مەبەست و ئامانجێکی تایبەتی لەپشت پەردەی ئەم شێوازە ڕەق و زبر و گۆساخەوە پەنهان بوو. ناستا سیافیلیوڤنا دەویست، بۆ مەبەستی خۆی، ئەوە بنوێنێ کە گوایە دڵسۆزی و دۆستایەتییەکی نزیک و خۆمانی لەنێوان ئەو و یەڤگینیدا هەیە، ئیدی بەو شێوازە، تیری خۆی هاویشت و نیشانەی ئەنگاوت.. کارێکی وەهای کرد هیچ گومانێک لە سەر ئەو دۆستایەتییە، هەرچەند درۆینە بوو، نەمێنێ. یەڤگینی پاڤلوفیچ، لە هەوەڵەوەوای بۆ دەچوو ئەگەر ئەم تانەوتەشەرە بە هەند نەگرێ، خۆی لێنەکات بە خاوەن و وابنوێنێ، کە باکی بەو ژنە و تەشەرەکانی نییە، دەتوانێ لەو قەیران و تەنگانەیە دەرباز بێت، بەڵام قسەکانی ناستاسیا فیلیپوڤنا، تووشی شۆکیان کرد، کە هەواڵی مەرگی مامی زانی، ڕەنگی بوو بە زەعفەرانی زەرد، ئاوڕی بۆ لای ئەو ژنە گۆساخە دایەوە. لیزا ڤیتا





پروکوفیڤناش ڕێک لەو دەمەدا، وەرچەرخا، ئاماژەیەکی بۆ هاوڕێکانی کرد و بەلەزو بە نیمچە ڕاکردن لەو ناوە ڕۆیشت. میرزادە هایم و حەیران لە جێی خۆی نەجوولا. یەڤگینی پاڤلوفیچ، ڕەق ڕاوەستابوو، پەشێو پەرێشان نەیدەتوانی بەسەر خۆیدا زاڵ بێت. ماڵباتی یەپانچین، هێشتا بیست شەقاوێکیان نەبڕیبوو کە فەرتەنەیەکی ترسناک قەوما.

ئەفسەرەکەی، دۆستی دڵسۆزی یەڤگینی باڤلوفیچ، ئەوەی کە ئاگلایای بە قسەوە گرتبوو، زۆر توڕە بوو، خوای نەما، بە دەنگی نیمچە بەرز گوتی:

- ئێمە لێرە پێویستمان بە قامچییەکە، مەگەر قامچی ئەم هەرزە ژنە بێدەنگ بکات. شەرعی مار بە دار. (دیار بوو کە ئاگای لە کەین و بەین و نهێنییەکانی یەڤگینی باڤلوفیچ هەبوو(.

ناستاسیا فیلیپوڤنا کە گوێی لەو قسەیەی کابرای ئەفسەر بوو، چاوی پەڕیە تۆقی سەری، بەپەلە بۆی گەڕایەوە. کوڕێکی گەنج، کە بێ خەبەر و ئاگا دوو هەنگاوێک لەولاوە دانیشتبوو کوڵەدار حەیزەرانێکی بەدەستەوە بوو، ناستاسیا فیلیوڤنا، بێ ئەوەی بیناسێت، بە تەکانێ خۆی گەیاندێ، دارەکە لە دەستی ڕاپسکاند و تا هێز لە بازوویدا بوو کێشای بەسەر و چاوی یارۆی ئەفسەردا، هەر هەموو ئەم کارانە لەچاو تروکانێکا ڕوویان دا.

یارۆی ئەفسەر، بە خۆی نەوەستا، هێرشی بۆ برد. هیچ یەکێک لە داشدارەکانی ناستاسیا فیلیپوڤنا، لەو ناوە نەمان. یەکەمیان، کە پیاوە ناقساڵەکەبوو، کەس نەیزانی کێوە چوو، دووەمیان، کە گەنجێکی سەرمەست بوو، لەپەنایەکەوەوەستابوو، پڕ بەراز پێدەکەنی، هەڵبەتە گومان لەوەدا نەبوو کە دوای دەقیقەیەک پۆلیس دەگەیشتە ئەوێندەر، بەڵام ئەگەر لەماوەی ئەو دەقیقەیەدا، لە شوێنێکی چاوەڕوان نەکراوەوە، کەسێک فریای ناستاسیا فیلیپوڤنا نەکەوتبا، بێگومان وەزعی شڕ دەبوو: میرزادە کە دوو هەنگاوێک لەو لاترەوەوەستابوو، بەلەز فریاکەوت و لەپشتەوە هەر دوو دەستی یارۆی ئەفسەری گرت. کابرای ئەفسەر خۆی لە چنگی دەرهێنا و یەکێکی ئەوتۆی کێشا بەسەر سینگی میرزادەدا، کە سێ شەقاو لەولاترەوە

کەوت بەسەر کورسییەکدا. دوو داشداری دیکەی ناستاسیا فیلیپوڤنا هاتبوونە پێشەوە. یەکێکیان کابرای بوکسباز بوو، ئەو وتار نووسەی کە خوێنەران بە خۆیان دەیناسن، کە سەردەمانێ ئەندامی هەمیشەیی گروپە شەقاوەگەریەکەی ڕۆگوژین بوو. لە کابرای ئەفسەر چووە پێشەوە و بە متمانەوە گوتی:

- من ناوم کیللەرە، لیوتنانی خانەنشینم! جەنابی کاپتن ئەگەر شەڕی پیاوانەت دەوێ و بە نیازی دەست بکەیتەوە، واز لەو ژنە بێنە، من لەجیاتی ئەو، وەکو بەرگریکارێک لە جیندەری ناسک، دەخزمەتودام و لە بواری بوکسبازی ئینگلیزیدا، زۆر کارامەم. جەنابی کاپتن دەڵەکم مەدە! من زۆرم پێناخۆشە کە ئەو سووکایەتییە ناخۆشەت پێکرا، بەڵام ناتوانم ڕێگەت بدەم بە بەرچاوی خەڵکیەوە، بە بۆکسان بەربیتە ژنێک. جا ئەگەر دەتەوێ وەکو پیاوێکی پیاوانە، بە ڕێز و حورمەت، مەسەلەکە بەشێوازێکی دی چارەسەر بکەیت، ئەوا... دیارە لە مەبەستم دەگەیت، جەنابی کاپتن.

کاپتن، کەوەخۆهاتبووەوە، قسەکانی کیللەری بەهەند وەرنەگرت. فەرامۆشی کرد.

ڕێک لەو کاتەدا، ڕۆکوژین، لەنێو ئاپۆرای خەڵکەکەوە هات، بەپەلە قۆڵی ناستاسیا فیلیوڤنای گرت و وەپێش خۆی دا. "ڕوگوژین"ش شپرزە و پەشێو دیار بوو، ڕەنگی سپی بووبوو ودەلەرزی. وێڕای ئەوەش، لە کاتێکا کە ناستاسیای وەپێش دابوو، خۆی گەیاندە بەردەم یارۆی ئەفسەر، پڕ بەزار لە قاقای پێکەنینی دا، بە زمانێکی بازاڕی و سەرکەوتووانە گوتی:

- ئۆخەیش! ئەمەت دەویست! دەبخۆ دەی! دەموقەپۆزی خوێناویت لێجوانە! ئۆخەیش!

یارۆی ئەفسەر کە بەتەواوەتی وەخۆهاتبووەوە و زانی سەروکاری دەگەڵ چ کەسانێکە، دەستەسڕەکەی گرت بەدەم و لووتیەوە و ئاوڕی لای میرزادەی دایەوە و زۆر بە ئەدەبەوە گوتی:

- وابزانم جەنابت میرزادە میشکینی؟

میرزادە، لە کاتێکا دەستە لە ڕزۆکەکانی بۆ درێژ دەکرد، بە دەنگێکی

پچڕ پچڕی لەرزۆک گوتی:

- ئەم ژنە شێتە! ئەقڵی تەواونییە! دڵنیات دەکەم شێتە!

یارۆی ئەفسەر گوتی:

- بێگومان جەنابت لە من باشتری دەزانیت، بەڵام حەزمدەکرد جەنابت بناسم و ناوت بزانم.

ئەوسا، سەرێکی بۆ دانەواند و ڕۆیشت. پۆلیس دوای پێنج سانیەیەک گە یبەجێ، بەڵام هەموو ئەکتەران و تەمەشاڤانانی شانۆیی و نمایشەکە ڕۆیشتبوون. هەموو ڕووداوەکە، لە سیری تا پیازی، لە دوو دەقیقە زیاتری نەخایاند بوو. هەندێ لە جەماوەرەکە هەستابوون و ڕۆیشتبوون. ئەوانی دی جێگاکانیان گۆڕی بوو. هەندێک دیمەنەکەیان پێخۆش بووبوو. هەندێکی دی بەجۆشوخرۆشەوە باسیان دەکرد. بە کورتیەکەی مەسەلەکە، وەکو هەر مەسەلەیەکی تری لەو جۆرە، بە شێوەیەکی ئاسایی کۆتایی پێهات و، ئۆرکستراکە دەستی بە کاری خۆی کردەوە.

میرزادە، کەوتە دوای ماڵباتی یەپانچین. ئەگەر ئەوسای کە یارۆی ئەفسەر کێشای بە سەر سینگیا و بەسەر کورسییەکەدا کەوت، تەماشایەکی لای ڕاستی کردبا، یان بیری بوایە تەماشایەکی سەمتی ڕاست بکات، دەیتوانی ئاگلایا بدینێ کە چۆن لە دووریی بیست شەقاوێکەوە، وێڕای ئەوەی کە دایک و خوشکەکانی زۆر دوور کەوتبوونەوە و لە دوورەوە گازیان دەکرد، وەستابوو و تەماشای دیمەنەکەی دەکرد. میرزادە "س.." بەلەز خۆی گەیاندێ، قەناعەتی پێ کرد کە بەپەلە بڕوات و لەو ناوە نەمێنێ. ئیدی خۆی گەیاندبووە دایک و خوشکەکانی. وەکو پاشان دایکی دەیگێڕایەوە ئەوەندە بە تووڕەیی و شپرزەیی گەیشتبووەوە لای ئەوان کە پێنەدەچوو گوێی لە دەنگیان بێت، بەڵام هەر دوای دوو دەقیقە، کاتێ گەیینەوە ناو باخەکە، وەکو خووە هەمیشەیەکەی، بە خەمساردییەوە گوتی:

-حەزم دەکرد بزانم ئەم نمایشە کۆمیدییە چۆن تەواو دەبێت!

## فەسڵی سێیەم

ئەو قەوماوەی سەیرانگەکە، دایک و کچەکانی زۆر ترساند، تووشی دڵەڕاوکەیەکی زۆری کردبوون. لیزاڤیتا پروکوفیڤنا، بەدەم نیگەرانی و دڵەڕاوکەوە، کچەکانی لە سەیرانگاکەوە تا ماڵ بە نیمچە ڕاکردن بردبووەوە. بە بۆچوون و مەزەندەی ئەو، زۆر شت لە میانەی ئەو پێشهاتەوە کەشف بوو، پەردەی لەسەر لاچوو، تەنانەت، وێڕای پەرێشانی و پەشێویشی، هەندێ وێناو گریمانە و قەناعەتی ڕۆشن و دیاری لە زەیندا بەرجەستە بوو. هەموویان گەیشتبوونە ئەو قەناعەتەی کە قەوماوێکی نا ئاسایی ڕووی دابوو، خۆشبەختانە نهێنییەکی گەورە لە حاڵی کەشف بووندا بوو. یەڤگینی پاڤلوفیچ، وێڕای ئەو هەموو پاکانەیەی کاتی خۆی میرزادە "س.." بۆی کردبوو، "دەمامکەکەی لاکەوت" و "حەقیقەتی دەر کەوت" و "پەیوەندیی دەگەڵ ئەو هەرزە ژنەدا" بەتەواوەتی ئاشکرا بوو. ئەوە قەناعەت و بۆچوونی لیزاڤیتا و دوو کیژە گەورەکەشی بوو، بەڵام ئەم ئەنجامگیرییە، نەک هیچ گرێیەکی نەکردەوە، بەڵکو هێندەی دی مەسەلەکانی ئاڵۆسکاند. ئەگەرچی جووتە کیژ، لە ناخی خۆیاندا، لە شپرزەبوون و هەڵاتنە بە پەلەکەی دایکیان پەست و بێزار بوون، بەڵام نەیاندەویست لە

گەرمەی شپرزە بوونەکەیدا و هەر لە هەوەڵەوە، هێندەی دی بیترسێنن و ئەزیەتی بدەن. هەستیان دەکرد، لەوەیە خوشکە چکۆلەکەیان، ئاگلایا ئیڤانۆڤنا، لەوانیش و لە دایکیانیش زیاتر ئاگای لەم مەسەلەیە بێت، ئەوەی ئەو لەم بارەیەوە دەیزانێ، ئەوان، شتاقیان نەیزانن.

میرزادە "س.." کە ڕەش داگەڕا بوو، چووبووە ژێری و زۆر خەمین دیار بوو. لیزاڤیتا پروکوفیڤنا، لە ڕێگەی گەڕانەوەدا، بە درێژایی ڕێگاکە تاقە قسەیەکی دەگەڵ نەکردبوو، ئەویش بە هیچ جۆرێ هەستی بەو بێدەنگییەی لیزاڤیتا نەکردبوو.

ئادیلاید، بە مەبەستی قسەلێدەرهێنان بەدەم ڕێوە، چەند جارێک لێی پرسی: "ئەم مامەت کێ بوو؟ لە پتر سپۆرگ چی ڕووی داوە؟" ئەویش بە پەستی و خەمینی بەوەڵامێکی نامەفهوم لە کۆڵ خۆی کردبووەوە. گوایە شتێک هەیە دەبێ تاقیبی بکات و، هەمووی درۆ و دەلەسە و دەنگۆی بێ بنجوبناوانە. ئیدی "ئادیلاید"ش لەسەری نەڕۆیشتبوو، گوتبووی: "وایە بێگومان". ئاگلایا یەجگار ئارام بوو. بە درێژایی ڕێگا ئەوەندەی گوتبوو کە زۆر خێرا ڕێ دەکەن. جارێکیش ئاوڕی پاشەوەی دابووەوە، میرزادەی بینیبوو کە بە هانکە هانگ دوایان کەوتووە و گەرەکیەتی بیانگاتێ. بزەیەکی تەوسامێزی بۆ کردبوو هیچ ئاوڕێکی دیکەی لێ نەدابووەوە. ئەنجام لە نزیکی ماڵەوە، تووشی ئیڤان فیدروفیچ بوون، کە تازە لە پترسپۆرگ هاتبووەوە و بەرەو پیری ئەوان دەچوو. پێش هەموو شتێک لە یەڤگینی پاڤلوڤیچی پرسی، بەڵام هاوسەرەکەی بێ ئەوەی وەڵامی بداتەوە یان تەماشاشی بکات، پەشێو و پەرێشان، بەلایا ڕەت بوو، یەکسەر، بەسیمای کیژەکانی و میرزادە "س"دا بۆی دەر کەوت کە فەرتەنەیەک ڕووی داوە، بەڵام سیمای خۆیشی، تەنانەت بەرلەوەی ئەوەش بزانێت، نیگەرانییەکی زۆر زەق و نائاسایی پێوە دیار بوو. جەنەڕاڵ، لەپڕ قۆڵی میرزادە "س.."ی گرت، لەبەردەم ڤێلاکەدا ڕای گرت و چەند سرتەسرتێکی بە گوێدا چپاند. کاتێ بۆ بالکۆنەکە (بانیژە، هەیوان، بەربێلایی) سەرکەوتن تا لەوێندەرەوە بچن بۆ ژوورەکەی لیزا ڤیتا پروکوفیڤنا، بە سیمایاندا دیار بوو، کە

هەواڵیکی یەجگار ناخۆشیان پێیە.

بەرەبەرە هەموو ئەندامانی خێزانەکە لە نهۆمەکەی لیزا ڤیتا پروکوفیڤنادا کۆبوونەوە، تەنیا میرزادە بەتاقی تەنیا لە بالکۆنەدا مابووەوە، لە سووچێکا وەکو ئەوەی چاوەڕوانی شتێک بێ، دانیشتبوو، بەڵام بە خۆیشی نەیدەزانی لەوێ چاوەڕوانی چییە، وێڕای ئەو هەموو پەشێویەی ئەو ماڵەی گرتبووەوە، هەرگیز ئەوەی بە بیرا نەهات هەستێت و بڕوات. لەوە دەچوو هەموو دنیا گەردوونی لەبیر چووبێت و ئامادە بێت دوو ساڵی تەواو لە هەر شوێنێکی دابنەن، دانیشێت و کەم و زۆر جووڵەی بۆنەکات. ناو بە ناو، لە قاتی سەرەوە، دەنگی گەنگەشە و مشتومڕێکی نائاسایی دەهاتە گوێ. میرزادە نەیدەزانی لەکەیەوە لەو سووچەدا دانیشتووە، بەڵام ئێوارە داهات، دنیا بەرەبەرە تاریک دەبوو، بەڵام ئاگلایا لەناکاوا هاتە بالکۆنەکە. هەرچەندە ئارام دیار بوو، بەڵام ڕەنگی کەمێک تێکچووبوو. کاتێ میرزادەی بینی لەوێ لە سووچێکا دانیشتووە، کە هەڵبەتەوێنای شتی وای نەدەکرد، بزەیەکی سەرسامی کەوتە سەر لێوانی. لێی نزیک بووەوە و پرسیی:

- ئەوە چدەکەی لێرە؟

میرزادە، شپرزە و سەرگەردان، مینگە مینگێکی بۆ کرد و لەسەر کورسییەکەی هەستا، بەڵام کاتێ ئاگلایا لە نزیکییەوە دانیشت، ئەویش لە جێگەکەی خۆی دانیشتەوە. ئاگلایا، بەپەلە، بەڵام بەوردی ڕوانییە سەروچاوی میرزادە، ئەوسا چاوی لەو گواستەوە. لە پەنجەرەکەوە بەبێ ئەوەی بڕوانێتە خاڵێکی تایبەتی، نیگای هەڵفڕاند، دووبارە کەوتەوە تەماشاکردنی میرزادە. میرزادە لە دڵی خۆیدا گوتی: "لەوەدەچێ بیەوێ لە قاقا بدات؟ نا، ئەگەر نیازی وای هەبا، پێدەکەنی و ئەولاتریش!

ئاگلایا، دوای بێدەنگییەکی کەم گوتی:

- حەز لە چای دەکەی؟ ئەگەر دەتەوێ با بڵێم بۆت بێنن.

- نا... نازانم...

- چۆن نازانی، یانی نازانی چای دەخۆی یان نا؟ ئا.. باش بوو بیرم

کەوتەوە: ئەگەر کەسێک داوای مەیدانداریت، یانی دوئێلت لێ بکات، چی دەکەی؟ دەمێ بوو دەمویست ئەم پرسیارەت لێ بکەم.

- کێ بەتەمای شتی وایە... کەس داوای دوئێل لە من ناکات!

- بەڵێ، بەڵام گریمان کەسێک داوای شتی وای لێ کردیت، ئایا زۆر دەترسیت؟

- پێم وایە دەترسم... زۆریش دەترسم.

- بە ڕاست؟ کەواتە بێزاتی؟

میرزادە، دوای بیرکردنەوەیەکی کەم، بەدەم بزەیەکەوە گوتی:

- نا.. نا، ڕەنگە بێزات "جبان" نەبم. بێزات کەسێکە کە لە ترسا ڕابکات، بەڵام کەسێک بترسێت و ڕانەکات بێزات نییە.

ئاگلایا پرسی:

- یانی تۆ ڕاناکەیت؟

میرزادە، کە بەو پرسیارانە کەوتە پێکەنین، گوتی:

- لە گینە ڕا نەکەم.

ئاگلایا، بە نیمچە تورەیەکەوە گوتی:

- من، هەرچەندە ئافرەتم، بەڵام ڕاناکەم. پێدەچێ پێم ڕابوێرێ، گاڵتەم پێبکەیت،خۆت گران دەگریت، تا بایەخ و سەرنجی بەرانبەر بۆ خۆت ڕاکێشیت. باشە پێم بڵێ: مەرجە لە دوئێلدا، هەر لە دووری دوانزە شەقاوی و هەندێ جار لە دووریی دە شەقاوییەوە، تیرەندازی بکرێت؟ خۆ ئەگەر ئەمە وابێت، بێگومان کوشتن و برینداربوونی لێ دەکەوێتەوە!

- پێم وایە لە دوئێلدا، بەدەگمەن حەریفەکەت دەنگێوی.

- بەدەگمەن؟ خۆ پوشکین نەک هەر ئەنگێوار، بەڵکو کوژراش.

- ڕەنگە ڕێکەوت بووبێ.

- نا، ئەم دوئێلە شەڕی مان و نەمان بوو ئەویش کوژرا!

- بێگومان، ئەو فیشەکە شوێنێکی نزمتر لەو شوێنەی گرتووە کە دانتیس نیشانەی لێگرتووەتەوە، کە نیشانەی لە سینگ یان سەری گرتووەتەوە. دەنا کەس گوللە بە شوێنی کاری و کوشندەوە نانێت. بۆیە کوژرانەکەی

پوشکین یان ڕێکەوت بووە یان هەڵەیەک لە نیشانە گرتنەوەکەدا ڕووی داوە. من ئەم قسەیەم لە خەڵکانی شارەزا بیستووە*.

- من جارێک ئەمەم لە سەربازێک پرسی، دەیگوت بەگوێرەی یاسای تیرەندازی، دەبێ نیشانە لە ناوقەد بگیرێتەوە و دەقی دەستورەکەش دەڵێت: نیشانە لە "ناو قەدی" بگرەوە، تەقە بکە! یانی نابێت نیشانە لە سینگ و لەسەر بگیرێتەوە. بەڵکو دەبێ لە ناو قەد بگیرێتەوە. پاشان لەو بارەیەوە قسەم دەگەڵ ئەفسەرێکدا کرد کە ئەویش هەمان شتی دووپات کردەوە.

- دروستە، ئەم یاسایە، بۆ دوورە تەقەیە.

- باشە تۆ تیرەندازی بەڵەدی؟

- بەعەمراتم تاقە فیشەکێکم نە تەقاندووە.

- یانی نازانی دەمانچە چۆن پڕ دەکرێت؟

- نازانم، شێوازەکەی دەزانم، بەلام قەت هەوڵم نەداوە بۆ خۆم، تاقیبکەمەوە، بیجەڕبێنم. دەمانچەیەک پڕ بکەم.

- مانای وایە نایزانیت، چونکە ئەمە مەشق و ڕاهێنانی گەرەکە! دەیسا گوێ بگرە و هەرچیت پێ دەڵێم لەبەری بکە! یەکەم دەبێ باروت بکڕیت، باروتی تایبەتی دەمانچە. نابێ باروتەکە نمدار بێت، بەڵکو دەبێ زۆر وشک بێ، نەرم و وردبێ. تاقیبی ئەم جۆرە باروتە بکە، نەکەی باروتی تۆپ و مەترەلۆز بکڕیت. سەبارەت بە فیشەک لەوە دەچێ دەبێ پیاو خۆی دروستی بکات، یانی دای بگرێتەوە. باشە تۆ دەمانچەت هەیە؟

میرزادە، بەدەم پێکەنینێکی کوت وپڕەوە گوتی:

- نەخێر، پێویستم پێی نییە!

- ئاهـ.. دەتەماشا! لە بیرت نەچێ دەمانچەیەکی باشیش بکڕە! دانەیەکی ئینگلیزی یان فەرەنسی بکڕە، گوایە دەمانچەی فەرەنسی و ئینگلیزی باشترین دەمانچەن. دوای ئەوە کەمێک بارووت، پڕ بە موستیلەیەکی درومان یان دوو موستیلان بکڕە. ئەوسا باروتەکە بڕێژە ناو لوولەی دەمانچەکەوە، ئەگەر بارووتەکە زۆر بێ باشترە، با زۆربێ نەک کەم. ئەوسا لوولەکە لبادئاخن بکە (وا دیارە ئەم لبادە زۆر پێویستە، نازانم

بۆچی). چی زۆرە لباد زۆرە، لە هەموو شوێنێ دەست دەکەوێ، بۆ نموونە دەتوانی لە دۆشەکەڵەیەکی دەر بێنی، یان لەو تیلماسکانەی کە لە درزی دەرگا دەدرێن تا سەرما نەیەتە ژوورەوە. دوای ئەوەی حەشوەکەی تێدەپەستیت ئەوجا فیشەکەکە دادەنەیت، تێگەیشتی؟ بیرت نەچێت یەکەم جار باروتەکە یان فیشەکەکە، دەنا فیشەکەکە ناتەقێنێ.. بەچی پێدەکەنی؟ دەمەوێ ڕۆژی چەند جارێک مەشقی تیراندازی بکەیت و فێر بێت چۆن نیشان بانگێوی. بە قسەم دەکەی؟

میرزادە هێشتا هەر پێدەکەنی. ئاگلایا لە ڕقا پێی بە عاردیدا دەکوتا. میرزادە سەری لەم هەموو مکوڕی و پێداگری و جدیەتەی ئاگلایا سووڕما بوو. هەستێکی گۆنگ، هانی دەدا، کە هەندێ پرسیاری دەربارەی شتانێکی جدیتر، لە دەمانچە و دەمانچە پڕکردنی، لێ بکات، بەڵام لە بیری چووەوە. تەنیا ئەوەی لە هزر و بیرا بوو کە ئاگلایا بە تاقی تەنیا لە هەنبەری دانیشتووە و ئەو تەماشای دەکرد، نوقمی تەماشاکردنی بوو. لەودەمەدا بەلایەوە گرینگ نەبوو کە ئاگلایا باسی چ شتێک دەکات. ئەنجام ئیڤان فیدروفیچ لە قاتی سەرەوە هاتە خوارێ و خۆی بە بالکۆنەکەدا کرد. خەریکی دەرچوون بوو. ڕەش داگەڕا بوو، گرژومۆن و سەرقاڵ دیار بوو. هەرچەندە میرزادە نیازی نەبوو بۆ هیچ کوێیەک بڕوات، جەنەڕاڵ کە ئەوی بینی لێی پرسی:

– ئاهـ.. ئەمە تۆی لیون نیکولایوفیچ؟ بەتەمای بۆ کوێ بڕۆیت؟ کوا لەگەڵ من وەرە دەمەوێ قسەیەکت لەگەڵ بکەم...

ئاگلایا، تەوقەی لەگەڵ میرزادەدا کرد و گوتی:

– بە ئومێدی دیدار میرزادە!

بالکۆنەکە، بە ڕادەیەک تاریک بووبوو کە میرزادە نەیتوانی لەو کاتەدا بە باشی سەروسیمای کیژێ بدینێ، دوای دەقیقەیەک، کە میرزادە و جەنەڕاڵ، لە ڤێلاکە وەدەرکەتن، میرزادە لەناکاودا سوور بووەوە، بە توندی دەستی ڕاستی خۆی گرمۆڵە کرد و بەتوندی گوشی.

بەڕێکەوت جەنەڕاڵ، بە هەمان ڕێگەی میرزادەدا دەڕۆیشت، واتە





ڕێگەیان یەک بوو. هەرچەندە کات درەنگ بوو، بەڵام ئیڤان فیدروفیچ، پەلەی بوو بە مەبەستی ئەنجامدانی قەواڵەی کارێک دەچوو بۆلای کەسێک، بەڵام بەدەم ڕێوە، بەپەلە پەل و بە شپرزەیی قسەی بۆ میرزادە دەکرد. زوو زوو ناوی لیزا ڤیتا پروکوفیڤنای دەبرد. ئەگەر لەو کاتەدا میرزادە، هەندێ زیاتر هۆشی بەخۆبوایە، هەستی دەکرد کە ئیڤان فیدروفیچ گەرەکیەتی دای بپشکنێ و قسە و زانیاری لێ دەربێنێ، بەڵام بەبێ ئەوەی بتوانێ ئەسڵی مەبەستەکەی بخاتە ڕوو. میرزادە، لەشەرماندا بە ڕادەیە پەشۆکا بوو کە گوێی لە هەوەڵی قسەکانی جەنەڕاڵ هەر نەبوو، بۆیە کاتێ جەنەڕاڵ، لەبەردەمیا ڕەق ڕاوەستا و پرسیارێکی گۆنگی لێ کرد، ناچار بوو دان بەوەدا بنێت کە هیچ شتێک حاڵی نەبووە.

جەنەڕاڵ، شانەکانی هەڵتەکاند وگوتی:

- بە ڕاستی ئێوە سەیرن، هەمووتان خەڵکی عەجیبن، لە هەموو ڕوویەکەوە سەیرن. من پێت دەڵێم سەر لەم هەموو خوتە و بۆڵە و نیگەرانییانەی لیزا ڤیتا پروکوفیڤنا دەرناکەم، دەڵێی پیرەژنی دۆڕژاوە، هەمیشە تورەیە، نیگەرانە، دەگری، فرمێسک دەرێژی، دەڵێت، حەیامان چووە، ئابڕوومان تکاوە، ناومان زڕاوە، ئاخر کێ ئەمەی بەسەر هێناوین؟ چۆن و بۆچی و کەی ئەمەمان بەسەر هاتووە؟ من دان بەوەدا دەنەم کە کەموکوڕیم هەیە، هەڵەم زۆرە، بەڵام خۆ پیاو دەتوانێ لە ڕێگەی پۆلیسەوە ئازار و ئەزیەتی ئەو ژنە بێ ئەقڵ و بەرەڵڵایە (کە هەموو کارەکانی هەرزەکارانە و ناپەسەندە) ڕزگار ببێت. پۆلیس دەتوانێت سنوورێکی بۆ دابنێت. من بەتەمام لەمڕۆوە بچم بۆلای کەسێک و لەم بارەیەوە کارێک بکەم. دەشێت لەڕێگەی هەندێ پەیوەندییانەوە، دەشێت هەموو شتێک بە هێمنی و، تەنانەت مدارا و میهرەبانی، بێ هیچ هەراو هەنگامە و قیل و قاڵێک چارەسەر بکرێت. من دان بەوەشدا دەنێم کە ئاییندە هەڵگری زۆر ڕووداوە، زۆر شت هەیە پێویستی بە ڕوونکردنەوەیە، دەبێ ڕوون ببێتەوە. گریمان پیلانێک لەئارادایە، بەڵام من لە تۆ دەپرسم، ئەگەر لێرە کەس هیچی لەبارەوە نەبیستبێ، لەوێ کەس هیچی لە بارەوە نەزانێ، ئەگەر من

نەمبیستبێ، ئەگەر تۆ هیچت نەبیستبێ، نەکەسی سێیەم، نە چوارەم و نە پێنچەمیش شتاڤیان هیچیان نەبیستبێ، من لە تۆ دەپرسم: دەبێ کێ پێی بزانێ، کێ بیستبێتی؟ تۆ ئەمە بەچی دەزانی و چۆنی لیکدەدەیتەوە، جگە لەوەی خەیاڵێکی ڕووت بێ، خەیاڵێک کە فرێ بە واقیعەوە نییە، هیچ بوونێکی دەرەکی نییە، شتێکەوەکو هەیڤە شەو یان شەبەنگی تاپۆ یان؟

میرزادە، لەپڕ هەموو ڕووداوەکانی ئەو ڕۆژەی وەبیر هاتنەوە، بەدەم داخ و کەسەرێکی پر سوێوە، لەبن لێوانەوە گوتی:

- ئەو ژنە شێتە!

- ئەگەر مەبەستت ئەو ژنەیە، منیش هەمان بیرکردنەوەی تۆم دەربارەی هەبووەو، بە پێویستم نەزانیوە، بیری خۆمانی پێوە مژول بکەین و بۆ تاقە شەوێکیش خەو لەخۆ حەرام بکەین، بەڵام هەنوکە هەستدەکەم بیرکردنەوەی ئەوان دروست ترە، لە ڕاستیەوە نزیکترە و پێم وا نییە شێت بێت. ڕاستە ئەم ژنە پەتیارە و پەتەڕییە، بەڵام زۆر بە فێڵ و دەهۆیە، شێت نییە. ڕەفتارە ناشرینەکەی ئەمڕۆی دەگەڵ کاپتون ئەلکسیفیچدا بەڵگەیەکی ئاشکرایە. وەکو پەتیارەیەکی خوێڕی ڕەفتاری کرد. ئەگەر زۆر خاتری بگرین دەکرێ بڵێین ڕەفتاری بابایەکی یەسوعی فێڵباز بوو بۆ ئەوەی بگات بە مەبەست و ئامانجێکی تایبەتی.

- کام (کاپیتون ئەلکسیفیچ)ـە؟

- ئاهـ. لێون نیکولایوفیچ! چما گوێت لێ نەدەگرتم! من لە سەرەتاوە قسەکەم بە کاپیتون ئەلکسیفیچ دەستی پێ کرد. ئەو مەسەلەیە بە جۆرێ کاری تێ کردووم کە ئێستاش دەست و لاقم دەلەرزن. هەر لەبەر ئەو مەسەلەیە، ئەوەندە درەنگ لە شار گەڕامەوە. کاپیتون ئەلکسیفیچ ڕادومسکی، مامی یەڤگینی پاڤلوفیچ... میرزادە بەسەرسامی گوتی:

- ئێ؟

- ئەمڕۆ بەیانی زوو، سەعات حەوت، فیشەکێکی ناوە بەسەری خۆیەوە و خۆی کوشتووە. پیرەمێردێکی بەڕێزی هەفتاساڵەی ئەبیکۆری بوو. وەکو ئەو ژنە دەیگوت: پارەیەکی مۆڵی دەوڵەتی دزیبوو!





- باشە ئەوەی لەکوێ...

- لەکوێ زانیوە؟ ها ها ها... هەر کە سەروکەللەی لەم شارە پەیدا بوو، گروپێکی تەواوی ئاشقان لە دەوری خڕبوونەوە. دەزانی چ خەڵکانێک هاتوچۆی دەکەن، خەڵکانێک هەن ملی خۆیان بۆ مەرحەبایەکی ئەو دەشکێنن! ڕەنگە یەکێک لەوانەی کە لە پترسپۆرگەوە بۆلای هاتوون، ئەو هەواڵەیان پێگەیاندبێ، چونکە هەواڵەکە لە سەرانسەری پترسبۆرگدا بلاو بووەتەوە، نیوەی خەڵکی "باڤلوفسک"ش زانیویانە، بەلام وەکو بۆیان گێڕامەوە، زۆر شەیتانانە باسی ئیستقالەکەی یەڤگینی پاڤلوفیچی کردبوو، یانی باسی ئەوەی کردبوو کە کاتێکی زۆر گونجاو و لە باری بۆ ئیستیقالەکەی هەڵبژاردووە! ئەم قسەیە ئاماژەیەکی ئەهریمەنانەیە بۆ تۆ! نا، نا، ئەم کارانە لە ڕووی شێتییەوە نییە. هەڵبەتە من هەرگیز لەو باوەڕەدا نیم کە یەڤگینی پاڤلوفیچ، پێشوەختە پێشبینیی ئەم کارەساتەی کردبێت، یانی زانیبێتی فلان ڕۆژ و فیسار سەعات ئەم کارەساتی ڕوو دەدات، بەلام دوورنیە، دوورا و دوور بۆنێکی کردبێت. ئێستاش لە بیرمە کە میرزادە "س.."و من و هەمووومان قەناعەتی تەواومان بەوە کردبوو کە مامی میرات و کەلەپووریکی زۆری بۆ جێ دێڵێ و حیسابێکی زۆرم لەسەر ئەوە کردبوو. ها! بە ڕاستی کارەساتە، کارەسات ئەمما کارەسات! بەهەرحاڵ حەز دەکەم لە قسەکەم بگەی: من یەڤگینی پاڤلوفیچ بە هیچ شتێک تۆمەتبار ناکەم، تۆ شایەتی ئەم قسەیەی من بە، بەلام مەسەلەکە سووکە گومانێکی تیایە. ئاشکرایە کە میرزادە"س.." زۆر شپرزەیە، مەسەلەکە زۆر گرنگ و ئالۆزە، لەڕادەبەدەر غەریبە! ..

- بەلام چ گومانێک لە ڕەفتاری یەڤگینی پاڤلوفیچدا هەیە؟

- هیچ، هیچ گومانێک نییە! زۆر پیاوانە ڕەفتاری کردووە. تاقە گەردێک بە ڕەفتاریەوە بەدی ناکرێت. من هیچ شتێکم لەو بارەیەوە نەگوتووە. من سەروەت و سامانەکەی خۆی بە ڕەوا و حەلاڵ دەزانم، بەلام ئەمە بەگوێی لیزاڤیتا پروکوفیتڤنادا ناچێت. هەر نایەوێ گوێی لە ناویشی بێت... ئێستا ڤیروسیا لە هەموو ئەمانە. کێشەکەمان، ئەم ئاژاوەیەی ماڵەوەیە، یانی ئەم

کێشــە خێزانیــەی خۆمانــە.. یــانی... نــازانم نــاوی بنــێم چــی! .. جــا لێــون نیکولایوفیچ، تۆ کە بە ڕاستی دۆستی ڕاستەقینەی خانەوادەی ئێمـەیت، بۆیـە مـن بـە مـەحرەمت دەزانـم و دڵـی خۆمـت بـۆ دەکـەمەوە: ماوەیـەکی کەمـە بیستوومانە (هەرچەندە شتەکە هێشتا ئەسـەح نیە) گوایە یـەڤگینی پاڤلوفیچ مانگێک لەمـەپێش خـوازبێنیی لـە ئاگلایا کـردووە و وا دیـارە ئاگلایا جـوابی کردووە!

میرزادە، هاواری کرد:

– مەحاڵە! باوەڕ ناکەم!

جەنەڕاڵ، هایم وحەیران، لە جێی خۆی چەقی و گوتی:

– باشـە تـۆ هـیچ شـتێک لـەم بـارەیەوە دەزانـی؟ دۆسـتی ئـازیز بمبـورە، ڕەنگە من نابەجایێم کردبێت کە ئەم باسەم کردەوە، بـەڵام بۆیـە ئەمـەم کرد چونکە تۆ... چونکە تۆ کەسێکی من باوەڕم بە پاکی و بێگـەردیت هەیـە.. وتـم لەوەیە سووسـەی شتێکی کرد بێت، بە پاکی خۆی شتێکی زانی بێ.. تۆ هـیچ شتێک لەم بارەیەوە دەزانی؟

میرزادە، بەدەم مینگە مینگەوە گوتی:

– من هیچ شتێک دەربارەی یەڤگینی پاڤلوفیچ نازانم.

– منیش! منیش هـیچ شـتێک نـازانم... بـەڵام دۆسـتی ئـازیز، وا دیـارە هـەر هەموویان، قسـەیان کردووەتە یەک و دەیانەوێ من لەبن بێنن، زندە بـەچاڵم بکەن. هـیچ ئاگایـان لـە حـاڵی مـن نییـە، نـازانن، پیـاو تەحـەمولی ئەمـە ناکـات. هەر بەینی خۆمان بێ گیرۆدە و گرفتاری وەزعێکی زۆر خـراپ بـووم! ئەوە بزانە کە من وەکو کوڕێکی خۆم ئەم قسانەت دەگـەڵ دەکـەم. لـە هەمووشـت خراتر ئەوەیـە ئاگلایا گاڵتـە بـە دایکی دەکـات، قەشـمەری پـێ دەکـات، بـەڵام مەسـەلەی جوابکردنەکـەی یـەڤگینی پـاڤلوفیچ لەلایـەن ئەوەوە، یـان ئەو خوازگاریەی کە ڕەنگە لـە بـە ینیاندا بـووبێ، هـەمووی گومـان و مەزەندەی خوشکەکەیەتی، کـە ڕەنگـە مەزەنـدەی دروسـت بـن، بـەڵام ئاگلایـا مرۆڤێکـی ئەوەنـدە خۆسـەر و کەللـە ڕەقـە، هێنـدە ئـەتوار غـەریب و هەڵەشـەیە کەوێنـا ناکرێت، ڕاستە هەموو جۆرە خەسڵەتێکی باشی تیایە، خانـەدانی پێوە دیـارە،

زۆر بە سۆز و دڵپاک و بیرچاکە، ئەمە ڕاستە، بەڵام بە چی دەچیَ! گاڵتەی بە هەموو شتێک دێ. تابڵێی واز وازی و دەم دەمی مجێزە، هەر دەمەی لەسەر خەیاڵێکە، تۆزێ لەمەپێش مەگەر هەر من بزانم چۆن بە ڕووی دایکیا هەڵشاخی، چۆن بەئاشکرا کەوتە گاڵتەپێکردنی، کەسی نەبوارد، نە خوشکەکانی، نە میرزادە "س..". سەبارەت بە من هەر مەپرسە. من بەدەگمەن لە تەوس و توانجی ئەو دەخەلسم. کەچی من، بە خۆت دەزانی، وێرای ئەوەش هەر خۆشمدەوێ. پێم وایە ئەم شەیتانە هەر لەبەر ئەمەیە کە زۆر ڕمموودەی منە، زۆری خۆش دەوێم، مەبەستم ئەوەیە لەوانی دی خۆشتر دەوێم. من دڵنیام ئەمڕۆکە، فرسەتی هێناوە و بە تۆشی رابواردووە، چونکە تۆزێ لەمەپێش بینیمن کە دوای ئەو فەرتەنەیەی قاتی سەرەوە، پێکەوە سەرگەرمی قسان بوون و بە جۆرێ لەلای تۆوە ڕۆنیشتبوو، وەکو ئەوەی هیچ شتێک ڕووی نەدابێت.

میرزادە، سوور هەڵگەڕا، مشتی خۆی توند گوشی، بەڵام ورتەی لێوە نەهات.

جەنەڕاڵ، لەپڕ، بەجۆشوخرۆشەوە گوتی:

– گیانەکەم، لیون نیکولایوفیچی ئازیز! .. من و، تەنانەت لیزا ڤیتا پروکوڤیفناش (هەرچەندە لێت کەوتووەتە تەقە و لە عەلەییت دەڕوات و لە سۆنگەی تۆوە، هەمان ڕەفتار دەگەڵ منیشدا دەکات، نازانم بۆ!) هەر دووکمان، خۆشمان دەوێی، ئێمە سەیری ڕواڵەت ناکەین، بەدڵ خۆشمان دەوێی، ڕێزی تایبەتیت هەیە، بەڵام دۆستی ئازیز باوەڕبکە، هەڵبەتە باوەڕدەکەی، سەرمان سوورِ ما کاتێ ئەم کچۆڵە شەیتانە بەکاوەخۆ، بەوپەڕی خوێنساردی، بە شێوەیەکی تەوسامێز هەڵی دایە و گوتی (کە لەوێندەر، لەبەردەم دایکیا ڕەق ڕاوەستابوو، پەست و بێزار، گاڵتەی بە هەموو پرسیارەکانمان دەهات، بەتایبەتی ئەو پرسیارانەی کە من لێم دەکرد.، چونکە من بە ناخێرم گەوج گەوج، بەو خەیاڵەی کە سەرگەڤاری ماڵم و دەبێ زمانێکی توند و جیددی بەکاربەرم! بەڵێ بەو ئاوایە قسەم کرد! ئیدی بۆخۆم ئەو گەوجیەتییەم کرد). بەڵێ هەڵی دایەوشتیکی گوت بە





خەیاڵی کەسدا نەدەهات، بەوپەڕی خوێنساردی، بە شێوەیەکی تەوسامێز گوتی: "ئەو ژنە شێتە".. (دەقا و دەق ئەو وشەیەی بەکار برد، سەرم سووڕما کە تۆش هەمان ڕستە و وشەکەی ئەوت بەکاربرد)... - باشە چۆن تا ئێستا هەستتان نەکردووە؟ - ئەو "ژنە شێتە" داویە لەکەللەی کە بەهەر نرخێ بووە کارێکی وابکات من و میرزادە ببین بە هاوسەر، بۆیە گەرەکیەتی پێی یەڤگینی پاڤلوفیچ لە ماڵی ئێمە ببڕێت." تەنیا ئەوەندەی گوت. هەنگێ بێ ئەوەی هیچی دی بڵێت، لە قاقای پێکەنینی دا، لە کاتێکا ئێمە حایر مابووین، ڕۆیشت و شریق دەرگاکەی لەدوای خۆیەوە دا بەیەکا. دوایی بۆیان گێڕاینەوە کە عەسری ئەمڕۆ، بەینی تۆ و ئەو کەمێک تێکچووە، و... و... گوێ بگرە دۆستی ئازیزم، تۆ کەسێکی دڵناسک و تۆرینۆک نیت، ئەوەندی من بتناسم پیاوێکی بەسەربر و حەوسەڵە و بەردەباریت، بەڵام زویر مەبە ئەگەر من بەدەمی خۆم پێت بڵێم کە دەسی دەسیت پێ دەکات، پێت ڕادەبوێرێت. باوەڕبکە پێت ڕادەبوێرێ! ئەم ئاکارەی زۆر منداڵانەیە، ئیدی هەق نییە لێی زویر بیت، یان گلەیی لێبکەیت، یان لێی بگریت و ڕقی لێ هەڵبگریت. ئیدی ئەوەیە کە هەیە. خەیاڵت بۆ هیچ شتێکی خراپ نەچێت. هەر بۆ خۆشی و بۆ کات بەسەربردن، وەکو چۆن بە ئێمە ڕادەبوێرێ بەو ئاوایە بە تۆش ڕادەبوێرێ. دەیسا خواحافیز! بە خۆت هەست و سۆزی ئێمە بەرانبەر بە خۆت دەزانیت. ئەم هەستانە ڕەگوڕیشەیان لە قووڵی دایە، جێگیرن، هیچ شتێک نایان گۆڕێت... من دەبێ لەم ڕێگایەوە. بڕۆم.. لەژیانما بەدەگمەن وەکو ئەمڕۆ پەست بووم. ئەمەش خێر و بێری ژیانی هاوینەوار!

میرزادە، بە تاقی تەنیا لەچوار ڕیانەکەدا مایەوە، تەمەشایەکی دەوروبەری خۆی کرد، بەلەز لە شەقامێک پەڕییەوە، خۆی گەیاندە بەرپەنجەرەی ڕووناکیی ڤێلایەک، ئەو پارچە کاغەزەی، کە بە درێژایی ماوەی گفتوگۆیەکەیان دەگەڵ ئیڤان فیدروفیچدا، لە مشتی ڕاستیا گوشی بووی، کردەوە و ئەم پەیامەی تیا خوێندەوە: "سبەی بەیانی، سەعات حەوت لە باخەکەدا، لای کورسیە کەسکەکە چاوەڕوانت دەکەم. لێبڕاوم،

سەبارەت بەمەسەلەیەکی گرینگ، کە ڕاستەوخۆ پەیوەندی بەتۆوە هەیە، قسان بکەم". "تێبینی: هیوادارم ئەم نامەیە پیشانی کەس نەدەیت. بە ڕاستی کاتێ ئەم تێبینییەم نووسی کە ئەم نامەیە پیشانی کەس نەدەیت هەستم بە جۆرە عەزابیکی ویژدان دەکرد، بەڵام ئەگەر هەندێ ورد بیر لە مەسەلەکە بکەینەوە، دەبینین تۆ مستەهەقی ئەوەیت. کە ئەم تێبینییەم زیاد کرد و تەبعی پووچ و کۆمیدی تۆم بیرکەوتەوە، لە شەرمەزاریدا سوور بوومەوە. تێبینی دووەم: مەبەستم لە هەمان کورسییە کە ئەمڕۆ نیشانم دایت. بە شەرمەزارییەوە ناچار بووم ئەم تێبینییەش زیاد بکەم."

وادیار بوو، ئەم نامەیە، پێش هاتنی ئاگلایا بۆ بالکۆنەکە، بەپەلە نووسرابوو و بەبێ موبالاتی قەد و نوشت کرابوو.

میرزادە، بە نیگەرانی و هەڵچوونێکی ترسامێزەوە، جارێکی دی نامەکەی لەنێو دەستیا گرمۆڵە کرد، وەکو دزێک، کەسێک غافڵگیری کردبێت، هەراسان لە بەر پەنجەرە ڕووناکەکە دوور کەوتەوە، بەڵام لەناکاوا خۆی لەبەردەم ئەو پیاوەدا بینییەوە کە دوای کەوتبوو. ئەو پیاوە گوتی:

– میرزادە، ئەوە من بووم لە دووت دەهاتم.

میرزادە، بەسەرسامی گوتی:

– ئەمە تۆی کیللەر؟

– لێت دەگەڕام. لە دەوروبەری ڤێلاکەیماڵی یەپانچین وەستابووم و چاوەڕوانم دەکردیت. بە خۆت دەزانی نەمدەتوانی بێمە ژوورەوە. کە لەگەڵ جەنەڕاڵدا وەدەر کەوتیت و کەوتنەڕێ، هەنگاو بە هەنگاو، دوورا و دوور لە دواتانەوە دەهاتم. میرزادە هەر ئەمرێکت هەیە، من دەخزمە تودام. ئامادەی هەر فیداکاریەکم، تەنانەت ئەگەر پێویست بکات ئامادەم لەپێناوی تۆدا خۆم بەکوشت بدەم.

– بەڵام... بۆچی؟

– چونکە گومان لەوەدا نییە کە دوئێلێکت لە پێشە! ئەو یارۆیە، لیوتنان مۆلوفستۆڤ، من دەیناسم... هەڵبەتە ناسینی شەخسی نا... سووکایەتی پێ

قەبووڵ ناکرێت، هەڵبەتە خەڵکی وەکو من و ڕوکوژین هەر بە بە شەریش نازانیٚ، بە چەکل و چەورەمان دەزانیٚ، ڕەنگە نە هەقیشی نەبێت، کەواتە تۆ تاقە کەسیت کە بتوانیٚ داخی دڵی خۆیت پیٚ بڕێژیت. میرزادە بیستوومە تاقیبی کردوویت. بۆیە دڵنیام کە سبەینیٚ یەکێک لە هاوڕێکانی دێتە دیدەنیت، ئەگەر حاڵی حازر لە ماڵەکەی خۆتا چاوەڕێت نەبێت! جا ئەگەر شەرەفی ئەوە بە من ببەخشیت کە بمکەی بە شایەتی خۆت، ئامادەم لەپێناوی تۆدا بکەومە زیندان. بۆیە دوات کەوتبووم تا ئەمەت پێبڵێم. میرزادە لەناکاودا، لە قاقای پێکەنینی دا، کیللەر حەپەسا، میرزادە بەدەم قاقاوە گوتی:

- یانی تۆش هاتویت باسی دوئیلم لەگەڵ بکەی؟

پێکەنینەکەی میرزادە گەیشتە ئاستێک ناچار بوو دەست بە سینگ و ورگیەوە بگرێت. لیٚ کیللەر کە بەو هەموو تاسە و پەرۆشیەوە، هاتبوو بە میرزادە بڵیٚ بیکات بە شایەتی خۆی، هەستی دەکرد، ئەم هەموو پێکەنینەی میرزادە، جۆرە سووکایەتییەکە بۆ ئەو.

- ئاخر میرزادە، لە بیرت نەچیٚ تۆ ئەو ئێوارەیە دەسیت گرت؟ هیچ پیاوێکی ڕەند و مەرد ئەم سووکایەتییە قەبووڵ ناکات، نەخازما بە بەرچاوی خەڵکییەوە بێت.

میرزادە کە هێشتا هەر پێدەکەنی، گوتی:

- خۆ ئەویش تا هێزی تیا بوو بۆکسێکی بە سینگما کێشا. هیچ پێویست بە دوئیل و شەڕ ناکات، داوای لێبووردنی لیٚ دەکەم، تەوازۆی بۆ دێنمەوەوهەموو شتێک دەبڕێتەوە و تەواو. خۆ ئەگەر دوئێل پێویست بێت، ئەوسا دەیکەین! با پەنا بەرێتە بەر چەک، من لە خوام دەویٚ. ها ها! من ئێستا دەزانم چۆن دەمانچە پڕبکەم وفیشەک دابگرمەوە. تۆزی لەمەپێش فێربووم چۆن دەمانچە دابگرمەوە، پڕبکەم. تۆ شتی وا دەزانیت کیللەر؟ یەکەم جار بارووت دەکرێت، بارووتی دەمانچە، کە نمدار نەبێت، زبر نەبێت وەکو ئەوەی لە داگرتنەوەی تۆپدا بەکاردێت. ئەوسا لوولەی دەمانچەکە پڕ دەکەیت لە بارووت، بە لباد دەیئاخنی، دەتوانی لباد لە هەر ڕایەخێک یان

ئەڵقەڕێزی هەر دەرگایەک دەربێنی. ئەوجا فیشەکەکەی تێدەخەیت. ئاگات لێبێ پێش باروتەکە، فیشەکەکەی تێنەخەیت، چونکە لەو حاڵەدا فیشەکەکە ناتەقێ ها! تێگەیشتی کیللەر؟ ئەمە خۆی لە خۆیدا سۆنگەیەکی جوان نییە کیللەر گیان؟ ئاه کیللەر دەزانی ئامادەم هەر ئێستا باوەشت بکەم و ماچت بکەم؟ ها، ها، ها! چۆن بەو کوتوپڕە خۆت گەیاندێ و ڕێک لە بەردەمیا قوت بوویتەوە؟ هەر کاتێ دەرفەتت بوو، وەرە لای من شامپانیا بخۆرەوە! دەزانی یەک دەرزەن شامپانیام لەژێر خانەکەی لیبدیفدا هەیە؟ لیبدیف بە ڕێکەوت دەستی کەوتبوو و پێرێ بۆی باسکردم و هەموویم لێکڕی. دەمەوێ هەموو دۆستانم دەعوەت بکەم و شەڤرۆنکێکی گەرم ساز بکەم! بڵێ بزانم بەتەمای ئەمشەو بخەوی؟

- هەڵبەتەوەکو هەر شەوێکی دی میرزادە.

- کەوتە هیوای خەونێن خۆشت بۆ دەخوازم! ها، ها!...

میرزادە، لە جادەکە پەڕییەوە، خۆی بە باخ و سەیرانگەکەدا کرد و لەچاو ون بوو. کیللەری بەسەرسامی و پەرێشانی و نائومێدی جێ هێشت. کیللەر، پێشتر هەرگیز میرزادەی بەو بارە دەروونیە سەیرەوە نەبینیبوو، بە هیچ جۆرێ وێنای نەدەکرد بەو حاڵەوە بیبینێ!

کیللەر لە دڵی خۆیدا گوتی: "ڕەنگە تەواو نەبێت، پێدەچێ تای لێهاتبێ، وڕێنە بکات، چونکە بە خۆی پیاوێکی تورەیە و ئەم ڕووداوانەش کاریان تێکردووە، بەڵام بە هیچ جۆرێک ناترسێت! خودایا! خەڵکانی وەکو ئەو ترسیان لە مەزەبا نییە. کیللەر لە فکران ڕاچوو: "ئم... شامپانیا! پێشنیازێکی خۆشە! دوانزە قاپ، دەرزەنێکی تەواو! ئازووقەیەکی زۆر باشە. مەرج دەکەم کە لیبدیف ئەمەی لە یەکێک لەو کەسانەوەوەرگرتووە کە بە ڕەهن پارەیان لێقەرزکردووە. ئم.. ئەلهەقی ئەم میرزادەیە بنیادەمێکی باشە. من ئەم جۆرە بەشەرانەم بەدڵن، بە ڕاستی ڕاستی خۆشم دەوێن. بەهەرحاڵ، ئێستا وەختێ بیرکردنەوە و کات بە فیرۆدان نییە... شامپانیا، وەخت و ناوەختی بۆ نییە، دەرفەتە و هەڵکەوتووە، دەبێ بقۆزرێتەوە"...

هەڵبەتە میرزادە، بە ڕاستی بێ حاڵ بوو، تای لێهاتبوو. ماوەیەکی زۆر بە سەیرانگا تاریکەکەدا سووڕایەوە، کە شنگ و تاقەتی لەبەر بڕا، خۆی لە





ڕاڕەوێکی نێوان تەختەکە و دارێکی گەورەی بە تەمەندا دیتەوە، ماوەی نێوان تەختەکە و دارەکە هەر سەد شەقاوێک دەبوو، هەستی کرد کە سی چل جار بەو ڕاڕەوەدا هاتبوو و چووبوو. بەڵام، ئەگەر خۆشی کوشتبا، بیری نەدەکەوتەوە لەماوەیەدا کە بەلای کەمەوە سەعاتێکی خایاندبوو، بیری لەچی کردووەتەوە، بەڵام لەپڕ بیرێکی بە مێشکا هات کە هێنایە پێکەنین، هەرچەندە بیرەکە مایەی پێکەنین نەبوو، کەچی نەیدەتوانی جڵەوی خۆی بگرێت. هەموو شتێک دەیهێنایە پێکەنین. ئەو بیرەی بە مێشکا هات کە لەگینە کیللەر تاقە کەس نەبێ کە خەیاڵی دوێنێی بە مێشکا هاتبێ. بەم پێوەدانگە دەشێت ئەو دەرس و دەورەی لە بارەی دەمانچە و پڕکردن و داگرتنەوەی دەمانچەوە پێی گوترا، زادەی ڕێکەوت نەبوو بێت. بەدەم ئەو خەیاڵ و ئەندێشانەوە، بیرێکی دیکەی بە مێشکا هات، لەپڕ وەستا و لە دڵی خۆیدا گوتی: "سەیرە! کاتێ من لە بالکۆنەکە ڕۆیشتبووم و، ئەو لە قاتی سەرێ ڕا هاتە خوارێ و منی لە بالکۆنەکەدا بینی، زۆری پێ سەیر بوو. پێکەنی... باسی چای لەگەڵا کردم، بەڵام نامەکەی بەدەستەوە بوو. ئەمە خۆی لەخۆیدا بەڵگەی بێ چەند و چوونی ئەوە بوو کە سوور دەیزانی من لەوێم، لە بالکۆنەکەم. ئیدی ئەو سەرسامیەی لەپای چی بوو؟ ها، ها، ها!..."
نامەکەی لە بەرگی دەرهێنا و ماچی کرد، لێ خێرا وەستاو دووبارە لە فکران ڕاچوو، دوای دەقیقەیەک بە خەمبارییەکی پڕ سوێوە لە دڵی خۆیدا گوتی: "شتێکی سەیرە، بە ڕاستی زۆر سەیرە! " میرزادە، هەمیشە لە گەرمەی شادمانیدا، بێ ئەوەی بەخۆیشی بزانێ بۆ، هەستی بە دڵتەنگی دەکرد!

بەدیقەت ڕوانییە دەورورووبەری خۆی، حایر مابوو بۆچی هاتوەتە ئەم شوێنە. هەستی بە ماندوویەتییەکی زۆر کرد، بەرە و لای تەختەکە ڕۆیشت و لە سەری ڕۆنیشت. بێدەنگییەکی مەند باڵی بەسەر دەڤەرەکەدا کێشا بوو. کۆڕی مۆزیک تەوا بووبوو، باخەکە چۆڵ و هۆڵ بوو، لەوە نەدەچوو کەسی تیامابێت. بەو پێیە دەبوایە سەعات بەلای کەمەوە یازدە و نیو بێت. شەوێکی ئارام، نمداری ڕووناک بوو. لە شەوە تایبەتییەکانی هەوەڵی هەیڤی حوزەیرانی پترسبۆرگ بوو، بەڵام ئەو ڕاڕەوەی ئەوی تیابوو، بە هۆی





چڕی درەختەکانی ناو باخەکەوە، تاریکی تاریک بوو. ئەگەر لەو دەمەدا کەسێک پێی گوتبا ئاشق بووە، ئاشقێکی شێت و شەیدا، هەڵبەتە، خۆی لە گێلی دەدا، نەک هەر نکوڵی لێ دەکرد، بەڵکو تووڕەش دەبوو. خۆ ئەگەر زیاتر لە سەری ڕۆیشتبا و بیگوتبا ئەو نامە چکۆلەیەی ئاگلایا بۆی نووسیوە، نامەی دڵدارییە، نامەی داوای دیداری ئەڤینداریییە، سوور دەبووەوە و لێی دەڕەنجا و دوور نەبوو داوای دوئێلی لێ بکات. دیارە لەم خەیاڵەیدا زۆر ڕاستگۆ بوو، چونکە هەرگیز، ڕۆژێ لە ڕۆژان، بۆ تاقە جارێکیش ئەوەی بە خەیاڵدا نەهاتووە کە ئەم کیژە حەزی لێ بکات، یان ئەم حەز لەو بکات. تەنانەت ئەگەر بەخەیاڵیش شتی وای بەمێشکا هاتبا لە خۆی تەریق دەبووەوە، هەستی بە شەرمەزاری دەکرد: پێی وابوو ئەگەری ئەوەی کە کیژۆڵەیەک "حەز لە پیاوێکی وەکو ئەو بکات." حاڵەتێکی غەریبە، شتێکی نەشازە. ئەوپەڕەکەی دەکرێ ناوی هەوەسی ڕەوتەنی کیژێکی لێ بنێی کە میرزادە ئەمەی بە کارێکی زۆر ئاسایی دەزانی، قەناعەتی وابوو نابێ بە شتی وا بهاروووژێت و خۆی لێ بکات بە خاوەن. میرزادە بە خەمی شتی واوە نەبوو. خەم و خەیاڵی ئەو شتێکی دیکە بوو، زۆر لەمە جیاواز بوو. میرزادە، قەناعەتی تەواوی بەو قسەیەی جەنەڕاڵ بوو، کە بەدەم هەڵچوونەوە و بەپەلەو بەدەم ڕێوە، پێی گوتبوو کە ئاگلایا بە هەمووان، بە تایبەتی بە میرزادە، ڕادەبوێرێ. هەڵبەتە ئەو قسەیەی نە لەدڵ گرت و نە پێشی زویر بوو، نە ئەزیەتی پێ خوارد، بەپێچەوانەوە بە لایەوە ئاسایی بوو. شتی سەرەکی بەلای میرزادەوە ئەوە بوو کە سبەی بەیانی، سەعات حەوت، ئاگلایا. لەسەر ئەم تەختە کەسکە، لەتەنیشت خۆیەوە دەبینێ، بەدەم تەماشاکردنیەوە، گوێی لێدەگرێ کە چۆن باسی داگرتنەوە و پڕکردنی دەمانچەی بۆ دەکات. لەوەی زیاتر هیچی تری نەدەویست. یەک دوو جار لە دڵی خۆیدا بیری لەوە کردەوە کە ئاخۆ ئاگلایا نیازی وایە باسی چی لەگەڵدا بکات، دەبێ ئەو مەسەلە گرینگەی کە ئاگلایا گوتی پەیوەندی ڕاستەوخۆی بە ژیانی ئەمەوە هەیە چ بێ؟. هەرچەندە هیچ گومانی لە حەقیقەتی ئەو "مەسەلە گرنگە" نەبوو، کە لەپێناویا ئەم ژوان و ژوانگەیەی بۆ دانرابوو، بەڵام هەنوکە کەمتر بیری لێدەکردەوە، ڕاستت دەوێ حەزی

نەدەکرد بە ئاستەمیش بیری لێ بکاتەوە. مێشکی خۆی پێوە مژول بکات.

لەپڕ دەنگی خشە خشی پێیان بەسەر زیخی ڕاڕەوی نێوان درەختەکانەوە، میرزادەی وەئاگا هێنا و کردیە کارێک کە سەر هەڵبڕێ. پیاوێک، کە دەموچاوی لە تاریکییەکەدا بە جوانی نەدەبینرا، بەرەبەرە هاتە بەرەوە و لە لای ئەوەوە و لەسەر تەختەکە ڕۆنیشت. میرزادە خۆی لێ بردە پێشەوە، تەواو لێی ورد بووەوە، دەموچاوی زەرد هەڵگەڕاوی ڕوگوژینی ناسییەوە.

ڕوگوژین، لەبن لێوانەوە. بەدەم دانە چیرێوە گوتی:

- دەمزانی لەم ناوە دەسووڕێیتەوە، باش بوو زوو دۆزیمیتەوە.

ئەمە یەکەم دیداری ئەو جووتە بوو لە پاش دوا دیداریان لە ڕاڕەوی ئوتێلەکەدا. ئەم دەرکەوتنە کوتوپڕەی ڕۆگوژین کە نە لەخەیاڵا بوو و نە لە بیرا، میرزادەی بە جۆرێ حەپەساند، کە تا ماوەیەک بەنج بوو، هەستێکی هەڤدژ چنگی نایە دڵ و دەروونی، ڕوگوژین هەستی کرد کە چوونەکەی چ کارێکی لە میرزادە کرد. ئەگەر چی لە سەرەتاوە هەندی شپرزە دیار بوو وبە جۆرە خۆنوێنییەکی عەمدییەوە قسەی دەکرد، بەڵام میرزادە زوو پەی بەوە برد کە نە شپرزەیی لەئارادایە و نە هیچ، ئەگەر ڕەفتار و گوفتاری هەندی ناهەنجار و ناقۆڵا دەنوێنێ، ئەمە تەنیا ڕواڵەتە، دەنا هیچ گۆڕانێک لە جەوهەر و ناخی ئەم پیاوەدا ڕووی نە دابوو.

میرزادە، هەر بۆ ئەوەی قسەیەک بکات، لە ڕوگوژینی پرسی:

- چۆنت دۆزیمەوە... چۆن زانیت لێرەم؟

- کیللەر پێی گوتم: "چووە بۆ باخەکە". "چووبووم بۆ ماڵەکەت"، لە دڵی خۆدا گوتم: باشتر. بە مەرامی خۆم گەیشتم.

میرزادە، بە نیگەرانییەوە پرسیی:

- مەبەستت چییە کە دەڵێی: "بە مەرامی خۆم گەیشتم".

ڕوگوژین، تیزخەنێکی بۆ کرد، بەڵام خۆی لە وەڵامی پرسیارەکە دزییەوە و گوتی:

- لیون نیگولایوفیچ، کاغەزەکەم پێگەیشت. پێشنیازەکەت بێسوودە، پێویست ناکات خۆت ئەزیەت بدەی. واز بهێنە با مەسەلەکە بەو دەقەوە

بمێنێ. من قاسیدی ئەوم، لە لایەن ئەوەوە هاتووم بۆ لات. دەیەوێ بتبینێ. شتێکی بە لەز هەیە حەز دەکات پێتی بڵێت. حاڵی حازر، ئەمشەو چاوەڕوانت دەکات.

- سبەی دەچم بۆلای. ئێستا یەکسەر بۆ ماڵ دەگەڕێمەوە. تۆ... دێی لەگەڵما؟

- بۆچی لەگەڵتا بێم؟ من هەموو شتێکم پێگوتی. خواحافیز.

میرزادە، بەنەرمی پرسیی:

- نایەی؟

- تۆ پیاوێکی سەیری لیون نیکولایوفیچ. پیاو سەری لێت سووڕدەمێنێ.

ڕوگوژین، بەدەم ئەو قسەیەوە، تیزخەنێکی بۆ کرد.

میرزادە، بە گەرمی، بەڵام گەرمییەکی خەمین گوتی:

- بۆچی، ئەم قسەیە چییە؟ ئەم دوژمنایەتییەی تۆ بەرانبەر بەمن چییە؟ بۆچی ئەم هەموو ڕقەت لێ هەڵگرتووم؟ خۆ بۆت دەر کەوت هەرچی گومان و مەزەندەت هەیە بێبنجوبناوان بوون. من دڵنیابووم کە تۆ دڵت لە من پاک نەبووەتەوە، دەزانی بۆ؟ چونکە تۆ دەستت لێ کردمەوە، ویستت بمکوژیت. ئەمە خۆی لە خۆیدا نیشانەی ئەوەیە کە دڵت پاک نەبووەتەوە، بەڵام سەبارەت بە من، باوەڕبکە تەنیا یەک ڕوگوژین دەناسم ئەویش ئەو بارفیون ڕوگوژینەیە کە ڕۆژەکە خاچەکەم دەگەڵی گۆڕییەوە و پەیمانی برایەتیمان بەست. ئەو نامەیەی دوێنێ بۆم ناردیت، بۆ ئەوە بوو هەموو ئەو خەیاڵاتە لە سەری خۆت دەر بکەیت و جارێکی دی باسی نەکەیت. بۆچی خۆتم لێ دوور دەگریت؟ بۆچی دەست دەشاریتەوە؟ باوەڕ بکە، من هەر هەموو ئەو شتەی کە جاری پێشوو لە بەینماندا ڕووی دا، بە جۆرە شێتی و بزڕکاندنێک دەزانم. من ئاگام لەوە هەیە کە ئەو ڕۆژە لە چ حاڵێکا بوویت. ڕێک وەکو ئەوەی ئەو حاڵە بە سەر خۆم هاتبێ بەو ئاوایە ئاگام لە حاڵی ئەو ڕۆژەی تۆ هەیە. ئەو خەیاڵاتەی کە ئەو ڕۆژە دابووی لەسەرت، ئەسڵ و ئەساسی نەبوو. ئیدی لەسەر چی ئەم دوژمنایەتییە بکەین؟

ڕوگوژین، بەدەم تیزخەنێکەوە، لە وەڵامی گوتە گەرموگوڕ و ڕاستەکانی میرزادەدا گوتی:





– باشە دڵی تۆ جێی دژمنایەتیی تیا دەبێتەوە؟

بە ڕاستی ڕوگوژین، لە میرزادە دوورکەوتەوە، چەند شەقاوێک لە دووریی ئەو وەستا. بە ڕاستی هەر دوو دەستی لە پشتیەوە شاردبووەوە. هەنگێ بە کورتی لەسەری ڕۆیشت و گوتی:

– لیون نیکولایوفیچ، زۆر زەحمەتە لە ئێستا بە دواوە هاتوو چۆت بکەم، مەحاڵە بتوانم بێمە ماڵەکەت.

– یانی تا ئەم ڕادەیە ڕقت لێمە؟

– خۆشم ناوێی لیون نیکولایوفیچ، ئیدی بۆچی بێمە ماڵەکەت؟ تۆ وەکو منداڵ وایت. کە ورکت لە گەمەیەک گرت دەبێ یەکسەر بەدەستی بێنی. قسە ناچێ بە مێشکتدا. ئەوەی ئێستا دەیڵێیت، تەنیا دووبارەکردنەوەی ئەو شتانەیە کە لە نامەکەی دوێنێدا نووسیووتن، تۆ پێت وایە باوەڕت پێناکەم؟ با، باوەڕ بە هەموو وشەیەکت دەکەم. من دەزانم کە تۆ ڕۆژێ لە ڕۆژان فریوت نەداوم و فریویشم نادەیت. وێڕای ئەمەش خۆشم ناوێی. تۆ بۆت نووسیوم هەموو ڕابردووم لە مێشکی خۆیدا سڕیوەتەوە، تەنیا ئەو ڕوگوژینە دەناسیت کە خاچەکەت دەگەڵی گۆڕیوەتەوە نەک ئەو ڕوگژینەی کە چەقۆی لێ دەر هێنایت، بەڵام تۆ چوزانی من چیم لە دڵ و لە ناخدایە؟ (بەدەم ئەو قسەیەوە دووبارە کەوتەوە تەوسکەن ). ڕەنگە من لەو ڕۆژەوە تا نهوو زەڕەیەک لەو کارەی خۆم پەشیمان نەبووبم، کەچی تۆ برایانە گەردنی منت ئازا کردووە، گەردن ئازادی خۆت بۆ من ناردووە. ڕەنگە من ئێوارەی ئەو ڕۆژە، بیروخەیاڵێکی دیکەم هەبووبێ،...

– ئەو بیرەت فەرامۆش کرد.

میرزادە بەو قسەیە ڕستەکەی بۆ تەواوکرد و هەڵی دایە:

– دەزانم! بەڵام دەتوانم گرێوت دەگەڵ بکەم کە یەکسەر چوویت سواری قیتاری پاڤلوفسک بوویت و بۆ ئێرە هاتیت، تا بە بیانووی گوێگرتن لە موزیک و کۆنسێرت، لە ناو خەڵکەکەوە بکەوێتە تاقیب و چاودێری، ڕێک وەکو ئەم کارەی کە ئەمڕۆ کردووتە. پێت وایە من ئەمەم پێ سەیرە؟! خۆ ئەگەر هەموو فیکر و، خەیاڵ و نیاز و مەبەستێکت تەنیا ئەمە نەبوایە، لە گین بوو، زۆر لە گین بوو کە چەقۆ لە من دەرنەیەنی.... ئەو ڕۆژە، هەر لە





بەیانییەوە کە تەماشام دەکردیت دەترسام، دەمزانی کەتێک هەردەکەی، دەزانی لە چ حاڵ و بارێکابوویت؟ یانی ئەو ڕۆژەی کە خاچەکانمان گۆڕییەوە، لە ناخی خۆما جۆرە گومانێکم لێ کردیت، بۆچی دوای گۆڕینەوەی خاچەکان، بۆچی یەکسەر بۆلای دایکە پیرەکەت بردم؟ وات خەیاڵ دەکرد، ئەم کارە دەستت دەبەستێتەوە؟ نا، مەحاڵە خەیاڵی وات کردبێت، شتی وات بە مێشکا هاتبێ. تۆش هەمان حاڵی منت هەبووە، هەر دووکمان هەمان هەستمان هەبووە. هەر دووکمان گومانمان لە یەکدی هەبووە. ئەگەر تۆ قەستی گیانت نەکردبام، (باش بوو خوا بەخێری گێڕا) ئێستا بە چ چاوێک سەیری منت دەکرد؟ بەهەرحاڵ من لە تۆ بەگومان بووم، یانی گوناحمان بەشەریکی (ڕووت گرژ مەکە، بۆچی پێدەکەنی؟ گاڵتەت پێم نەیەت). دەڵێی پەشیمان نەبوویتەوە! باشە. هەڵبەتە ئەگەر بشتویسبا ژێوان ببیتەوە، نە تدەتوانی ژێوان ببیتەوە، چونکە لە ناخی دڵتەوە ڕقت لەمنە. تە نانەت ئەگەر لە ئاستی تۆدا وەکو فریشتەش پاک و بێ گوناهبام، هەر چاوت پێمدا هەڵنەدەهات، تا ئەو کاتەی وا خەیاڵ بکەیت کە منی خۆشدەوێ نەک تۆ، هەر خۆشت لێم نایەت، ئەمە غیرەیە، نیشانەی حەسوودییە. پارفیون، دەزانی ئەم هەفتەیە گەیشتمە چ قەناعتێک؟ حەز دەکەم پێتی بڵێم: دەزانی، حاڵی حازر تۆی لە هەر کەسێکی دیکە خۆشتر دەوێ. خۆشەویستییەکی ئەوتۆیە تا زیاتر ئەزیەتت بدات زیاتر خۆشی دەوێی، ڕمووەدەت دەبێت. هەڵبەتە هەرگیز نایەت بەرە و ڕوو ئەمەت پێ بڵێ، بەدەمی خۆی ئەمەت پێ ناڵێ، بەڵام پیاو دەبێ بە خۆی پەی بەمە بەرێت. بۆچی سەرباری هەموو شتێک قەبووڵی کردووە شوو بە تۆ بکات؟ ڕۆژێ دێ بە خۆی ئەمەت پێ دەڵێ. هەندێ ژن هەن، حەز دەکەن پیاو بەو جۆرە خۆشی بوێن، یانی پیاوەکە مەجبوور بکەن، ئەویش یەکێکە لەو ژنانە. دەزانی ژن کە دەکەوێتە عەزابدانی پیاو، سووک و چرووکی دەکات، دەیکات بە قەشمەر و گەپجاڕ، دەیکات و هەر بە خەیاڵیشیا نایەت، ویژدانی چی و عەزابی ویژدانی چی؟ کە دەتبینێ، لە دڵی خۆیدا دەڵێت. "ئێستا گیانی دەگەیەنمە کونە کەپووی، عەزابێکی وای دەدەم، سەد خۆزگەی بەمردن، بەڵام پاشان، تۆڵەی بۆ دەکەمەوە، بە ئەشقی خۆم زندووی دەکەمەوە..."





ڕوگوژین، تا کۆتایی گوێی لەو قسانەی میرزادە گرت، ئەوجا کەوتە پێکەنین و پرسیی:

- باشە میرزادە تۆ بە خۆت تووشی ژنی وابوویت؟ هەندی شتی وام لەبارەتەوە بیستووە، ئایا ڕاستە؟

میرزادە، لەپڕ ڕوانییە ڕۆگوژین، پەشێو و پەرێشان گوتی:

- چی؟ چیت لەبارەمەوە بیستووە؟

ڕوگوژین، هەر پێدەکەنی. ئەو قسانەی میرزادە، نەک هەر وروژاندی، بەڵکو لەزەتیشی پێبەخشی. ئەو گەرموگوڕی و ڕووخۆشی و خۆش مجێزیەی میرزادە نەک هەر زۆری کارتێکرد بەڵکو جۆرە سووکنایییەکیشی پێ بەخشی.

ڕوگوژین گوتی:

- نەک هەر بیستوومە، بەڵکو بەم قسانەی ئێستاتدا گەیشتوومەتە ئەو قەناعەتەی کە ڕاستی ڕاستە، ئاخر تۆ کەی جاریێ لە جاران بەم ڕاشکاوی و ڕوونیەی ئێستا قسەت کردووە؟ دەڵێی پیاوێکی دی چووەتە کلێشەتەوە و بە زمانی تۆوە قسان دەکات. ئەگەر شتێکی وام لەبارەتەوە نە بیستایە، بەم نیوەشەوە نەدەهاتم بۆ ئێرە، بۆ ئەم باخە.

- پارفیون سیمیونۆفیچ، لە مەبەستت ناگەم.

- ئەوەی ڕاستی بێ دەمێکە بۆی باس کردووم، ئەمڕۆکە کاتێ بەچاوی خۆم دیتم، کە لەتەنیشت ئەو کیژە گەنجەوە دانیشتوویت و گوێ لە موزیک دەگریت، ئیدی لە قسەکانی ئەو دڵنیا بووم و هیچ گومانێکم لە دروستی قسەکانی نەما. دوێنێ و ئەمڕۆ سوێندی بۆ خواردم کە تۆ ئاشق و دێوانەی ئاگلایا یەپانچین بوویت. ئەمە نە بەلای منەوە گرینگە و نە هیچ پەیوەندییەکی بە منەوە هەیە، بەڵام ئەوەی گرینگە ئەمەیە کە ئەگەر تۆش ناستاسیا فیلیپوڤنات خۆش نەوێ، ئەو هێشتا هەر دڵبەستەی تۆیە. دەزانی لێبڕاوە بە هەر نرخێ بووە ئەو کیژەت بۆ بخوازێت؟ سوێندی خواردووە کە ئەم کارە بکات! ها، ها! پێی گوتم: " تا ئەم کارە سەر نەگرێت، شووت پێناکەم. هەر کاتێ ئەوان چوون بۆ کلێسا ئێمەش دەچین ". بە ڕاستی نازانم نیازی چییە و مەبەستی لەم قسانە چییە: یان بێ ئەندازە خۆشی

ـەوێی یان... بەڵام ئەگەر خۆشی بوێی، چۆن قەبووڵ دەکات کەسێکی دی بخوازێت، نەخاسما بەخۆیشی هەوڵت بۆ بدات؟... ئەوەش دەڵێت: "من خۆشیی ئەوم دەوێ، حەز دەکەم بە خۆشی بیدینم". بەم پێیە پێم وایە ماناى وایە کە خۆشی دەوێ.

میرزادە، کە بە خەمێنی گوێی بۆ قسەکانی ڕوگوژین شل کردبوو، بە کەسەرەوە گوتی:

- من چ بە قسە و چ بە نووسین، پێم گوتوویت کە ئەو ئافرەتە، ئاقڵ نییە، ئەقڵی پڕ نییە..

- بەندەناس هەر خوایە، لەوەیە هەڵە بیت!... ئەمڕۆ کاتێ لە ئاهەنگی موزیک، لە باخەکە گەڕاینەوە بۆ ماڵەوە، ڕۆژی مارەبڕینەکەی دیاری کرد. گوتی: "سێ هەفتەی دی ڕەنگە زووتریش زەماوەند دەکەین". لەبەردەم ئیکۆنەکەی حەزرەتی عیسادا سوێندی بۆ خواردم و ئیکۆنەکەی ماچ کرد. بۆیە هەنووکە هەموو شتێک وەستاوەتە سەر تۆ میرزادە. ها، ها!...

- ئەمە هەمووی یاوەگۆییە (وڕاوە، وڕێنە)! ئەوەی تۆ بۆ من پێشبینی دەکەیت هەرگیز نایە تەدی! سبەی دێم و دەتبینم...

ڕوگوژین، بە ناڕەزاییەوە گوتی:

- بە چیا دەڵێی شێتە، ئەقڵی تەواو نییە؟ بۆچی بەلای هەموو کەسێکەوە ئاقڵە، تەنیا بەلای تۆوە تەواو نییە؟ ئەگەر شێت بوایە چۆن دەیتوانی نامە بۆ ئەوێندەر بنێرێت؟ ئەگەر شێت بوایە بە نامەکانیا دەیانزانی، لە نامەکانیا ڕەنگی دەدایەوە و دەر دەکەوت.

میرزادە، بەشپرزەیی پرسیی:

- کام نامانەت مەبەستە؟

- نامە بۆ "ئەو" دەنێرێت، ئەویش نامەکانی دەخوێنێتەوە. مەگەر نازانی؟ کەواتە دوایی دەزانی. بێگومان پێتی نیشان دەدات.

میرزادە هاواری کرد:

- مەحاڵە، شتی وا مەحاڵە!

- تاهو تاهو! لیون نیکولایوفیچ، ئەوەندەی من بزانم و تێبگەم هێشتا زۆرت ماوە، تازە لە هەوەڵی ڕێگادایت. کەمێک چاوەڕوان بکە: هەنگێ

هەستی جاسووسی و تاقیب و تاقیبکاریت لا دروست دەبێت و شەو و ڕۆژ گوێ هەڵدەخەیت هەر هەنگاوێک بنرێت دەیزانیت، ئەگەر...

میرزادە هاواری کرد:

- بەسە! بیبڕەوە، چیتریش باسی ئەمە بۆ من مەکە، گوێ بگرە پارفیون: ڕێک بەر لەوەی تۆ بێیت، لێرە پیاسەم دەکرد، لەخوت و چۆڕایی، بێ ئەوەی بزانم بۆچی! لەپڕ دەستم بە پێکەنین کرد. بیرم کەوتەوە کە سبەینێ ڕێکەوتیساڵیادی لەدایکبوونمە. ئێستاش نزیکی نیوەشەوە. پیاوی باش بە، لەگەڵما وەرە با پێکەوە ئەمشەو ڕۆژ بکەینەوە. لە ماڵەوە کەمێک شەراب شک دەبەم، بۆ خۆ دەمێکیش تەڕدەکەین و تۆ ئارەزووی ئەو شتانەم بۆ بکە کە خۆم ناتوانم لەم ساتەدا ئارەزووی بکەم. حەز دەکەم تەنیا تۆ ئەو دووعا و ئارەزووەم بۆ بکەیت نەک کەسێکی دی. منیش ئارەزووی ئەوپەڕی بەختەوەریت بۆ دەکەم. ئەگەر بەتەمانیت لەگەڵما بێی، بێنە خاچەکەم بدەوە! کوا بۆم بگێڕەوە. ئاخر تۆ ڕۆژی دوای ئەو ڕووداوە بۆت نەناردمەوە. هێشتاش لە ملتە؟ ڕوگوژین بەرسڤی دایەوە:

- بەڵێ.

- کەواتە لەگەڵم وەرە! نامەوێ بە تەنیا، بە بێ تۆ ساڵ تازە بکەمەوە، چونکە سەبارەت بەمن ژیانێکی نوێ دەست پێ دەکات! پارفیون، چما نازانی ژیانی تازەی من لەمڕۆوە دەستی پێ کردووە؟

- ئێستا بۆم دەر کەوت و دەزانم کە دەستی پێ کردووە. بەویش(ناستاسیا) دەڵێم. لیون نیکولایوفیچ، تۆ ئەمڕۆ خۆت نیت، نیکولایوفیچەکەی جاران نیت.

پەراوێز:

* - "ئەم قسەیەم لە خەڵکانی شارەزا بیستووە.." پوشکین لە دوئێلەکەیدا، دەگەڵ دانیتس، لە ١٨٣٧/٢/ک٢٧دا برینـدار بوو، ڕۆژی ٢٩/ک١٨٣٧/٢، سەعات دووی دوانیوەڕۆ کۆچی دوایی کرد، گوللەی ڕەقیبەکەی هەناوی دیوادەر کرد.

**فەسڵی چوارەم**

کاتێ میرزادە، هاوڕێ دەگەڵ ڕوگوژیندا، لە ماڵەکەی خۆی نزیک بووەوە، سەیری کرد بالکۆنەکەی لە خەڵکیدا جمەی دەهات، بالکۆنی چی، چراخانێک بوو دەتگوت ڕۆژی نیوەڕۆیە. ئیدی هەراو هوریا و کەیف و شادی، قاقای پێکەنین و، گەنگەشە و قسان بە دەنگی بەرز، سەعاتە ڕێیەک دەڕۆیشت. لە دوورەوە دیار بوو کە ئەو حەشاماتە مژولی شەوبێری و ئاهەنگێرانن. کاتێ میرزادە بۆ بالکۆنەکە سەرکەوت، تەمەشای کرد مەزەندەکەی ڕاست دەرچوو، بینی هەموو میوانەکان شامپانیا دەخۆنەوە و دیار بوو، دەمێ بوو دەستیان بە خواردنەوە کردبوو، چونکە زۆربەی زۆریان شاد و بەکەیف و سەرمەست بوون و لەحاڵی نەشەدا بوون. میوانەکان، گشتیان ئاشنا و ناسیاوی میرزادە بوون، بەڵام سەیر ئەوە بوو هەموویان لە یەک کاتدا، وەکو ئەوەی بە فەرمی دەعوەت کرابن، کۆبووبوونەوە، لە کاتێکا میرزادە هیچ کەسێکی دەعوەت نەکردبوو، بە خۆیشی بەڕێکەوت و تۆزێ لەوەپێش، بیری کەوتبووەوە کە ئەمشەو ساڵیادی لەدایکبوونیەتی.

ڕوگوژین، لەکاتێکا، دوابەدوای میرزادە، بۆ بالکۆنەکە سەر دەکەوت، لەبن لێوانەوە گوتی:

- هەبێ و نەبێ، دەبێ لای یەکێک گوتبێت دەعوەتی شامپانیا دەکەیت، بۆیە ئەم هەموو خەڵکە بەم جۆرە هێرشیان بۆ ئێرە هێناوە.

ئەوسا، وەک بڵێی دوا ئەزموونی خۆی وەبیر هاتبێتەوە، بە جۆرە بەدخوایەکەوە گوتی:

- ئێمە ئەمانە دەناسین! هەر ئەوەندە فیکەیەکت بۆ لێدان ئیدی...

حەشاماتەکە، بەدەم هاواری شادی و خۆشییەوە لە دەوری میرزادە خڕ بوونەوە، هەرایەک بوو کەس بەکەس نەبوو، هەندێ لە میوانەکان کردبوویان بە ڕۆژی حەشر، دەنگە دەنگ و هەراوزەنایان دەگەیشتە بنی دنیا، هەندێکی دیکەیان زۆر هێورتر بوون. لێ هەر کە زانییان ئەو ڕۆژەساڵیادی لەدایکبوونی ئەوە، هەموو بە جارێ لێی نزیکبوونەوە و یەک بە یەک، زۆر بەگەرمی پیرۆزبایییان لێ کرد. میرزادە سەری لە هاتن و ئامادەبوونی هەندێ کەس سووڕ مابوو، بۆ نموونە یەکێک لەوانە بورودوفسکی بوو، بەڵام ئەوەی کە یەجگار سەرسامی کردبوو، بوونی یەڤگینی پاڤلوفیچ بوو لەناو ئەو حەشاماتەدا. ئەوەندەی بەلاوە سەیر بوو خەریک بوو باوەڕی بە چاوی خۆی نەدەکرد، بە دیتنی ئەو بەجارێ سەراسیمە بوو.

لەم کاتەدا، لیبدیف کە دەموچاوی سوور سوور بووبووەوە و نیمچە مەست بوو، بە خۆ و هەگبەیەک وەڵامی ئامادەوە بەلەز هات، تا مەسەلەکە ڕوون بکاتەوە. بە قسە بێسەرو بەرەکانیا ئەوە دەر کەوت کە ئەو خەڵکە، بێ هیچ نەخشەیەکی پێشوەختە، بە شێوەیەکی ئاسایی و بگرە بەڕێکەوت لەوێ خڕ بوو بونەوە. یەکەم کەس کە چووبوو هیپولیت بووبوو. حاڵی زۆر باشتر بووبوو، بڕیاری دابوو تا میرزادە دەگەڕێتەوە بۆ خۆی لە بالکۆنەکەدا، لەسەر تەختێک پاڵ بکەوێ. دوای ئەو لیبدیف هاتبوو، هەر کە خۆی کردبوو بە بالکۆنەکەی میرزادەدا، ئیدی هەموو خێزانەکەی، واتە کیژەکانی و جەنەڕاڵ ئیڤولگین، دوای کەوتبوون. بوردوفسکی، هیپولیتی هێنابوو، بە خۆیشی لەوێ مابووەوە. گانیا و پتیتسن کە بەڕێکەوت بەوێدا ڕەت دەبن خۆیان بەژوورا کردبوو. دوای ئەوان کیللەر هاتبوو وڕایگەیاند

بوو کە ساڵرۆژی لەدایکبوونی میرزادەیە و داوای شامپانیای کردبوو. یەڤگینی پاڤلوفیچ نزیکەی نیو سەعاتێک لەوەپێش گەیشتبوو. کولیا، پێی ناگرتبوو کە پێویستە بە بۆنەی ساڵرۆژی لەدایکبوونی میرزادەوە شامپانیا پێشکەش بکرێ و ئاهەنگ و شەوبێری بێتە گێڕان. ئیدی لیبدیف کە خوا خوای شتێکی وای بووبوو، بەلەز چووبوو مەی و شەرابی هێنابوو.

لیبدیف، خێرا خێرا بە میرزادەی دەگوت:

- ئەمە شەراب و مەیی خۆمە، لەسەر حیسابی منە، لە کیسەی منە ها، لەسەرم بوو بەبۆنەی ساڵرۆژی لەدایکبوونتەوە ئاهەنگ بگێڕم و پیرۆزبایت لێ بکەم. هەڵبەتە شێوێکی هەژارانەش پێشکەش دەکەین، شێوێکی سووک. کیژەکەم خەریکە شێو ئامادە دەکات. ئا... میرزادە... خوزیا دەتزانی موناقەشەی چیمان دەکرد ئەم پرسیارەی (هاملێت)ت لەبیرە: " یا هەموو شتێک یان هیچ شتێک "؟ ئەمە بابەتێکی مۆدێرنە، زۆر مۆدێرنە، بابەتی ڕۆژە! پرسیار و وەڵام... بۆ ئاگاداری جەنابت ئاغای (تیرنتییف) لە کەماڵی ئیسراحەتدایە، کەیفی قنجە، ژیانی لێدەچۆڕێ.. نایەوێ بخەوێ! ئەگەر بڵێی تەنیا یەک جورعە شامپانیای خواردووەتەوە و ئەزیەتی نادات... میرزادە، وەرە پێشەوە و ئەم گەنگەشەیەمان بۆ یەک لایی بکەوە! هەموو ئامادەبووان چاوەڕوانی تۆن، هەموو چاوەڕوانی دەمی موبارەکی تۆن کە بە بەردەباری و دووربینی خۆت، ئەم مەسەلەیە ڕوون بکەیتەوە...

میرزادە، هەستی بە نیگای ناسک و شیرین و پڕ میهر و مەحەبەتی ڤیرا لیبدیف کرد، کە بەلەز دڕی بەخەڵکەکە دەدا و بەرە و لای ئەم دەهات. ئەم کیژە یەکەم کەس بوو کە میرزادە تەوقەی دەگەڵ کرد، کیژی تاین لە شەرماندا سوور بووبووەوە، پیرۆزبایی لێ کرد و ئارەزووی ژیانێکی خۆشی " لەمڕۆ بەدواوە " بۆ کرد. ئەوسا بەهەشتاو بۆ موبەقەکە گەڕایەوە، کە خەریک بوو ژەمە خۆراکێکی سووکی ئامادە دەکرد، بەڵام تەنانەت پێش هاتنەوەی میرزادەش، جار جار کە بۆ ساتێ دەستی لە کاری موبەق بەتاڵ دەبوو، دەرفەتی دێناو دەهاتە بالکۆنەکە، تا گوێ لەو باس و گەنگەشە

گەرموگوڕ و دووورودرێژانەی نێوان ئامادەبووان، بەتایبەتی کە خواردنەوە سەری گەرم کردبوون، بگرێت. ئەو گەنگەشانەی کە زیاتر دەربارەی بابەتی تەجریدی وشک و قورسی ئەوتۆ بوون کە ئەو سەری لێدەر نەدەکردن. خوشکە چکۆلەکەی لە ژوورەکەی تەنیشتەوە، بەزاری بە شەوە، لەسەر سندوقێک، بە دانیشتنەوە خەوی لێکەوتبوو، بەڵام توریژگەکەی، کوڕی لیبدیف، لە نزیکی کولیا و هیپولیتەوە، جێی خۆی کردبووەوە و بە سیمایا دیار بوو کە ئامادەیە دە دانە سەعاتان، بەبێ جووڵە لەوێندەر دانیشێت و گوێ لەو گەنگەشە و قسانەی بگرێت.

میرزادە، پاش ئەوەی تەوقەی دەگەڵ ڤیردا کرد، بەرەو پیری هیپولیت چوو تا تەوقە دەگەڵ ئەویش دا بکات. هیپولیت، بە میرزادەی گوت:

– بە تاسەوە چاوەڕوانم دەکردیت، زۆر خۆشحاڵم کە ئەوەندە بە کەیف و خۆشحاڵی.

– لەکوێ دەزانی کە من " بەکەیف و خۆشحاڵم "؟

– بە دەموچاوتا دیارە. بڕۆ بەخێرهاتنی ئەوانە بکە و خێرا وەرەوە لەلای ئێمە دابنیشە.

هیپولیت، تاسەمەندی خۆی بۆ دووپات کردەوە و گوتی:

– بەتاسەوە چاوەڕوانم دەکردیت، بیرم دەکردیت!

کە میرزادە لێی پرسی، ئایا ئەم شەونخونی و مانەوەیە تا ئەم درەنگانە، بۆ نەخۆشییەکەی خراپ نییە، بەرسڤی دایەوە کە خۆیشی سەری لەمە سووڕماوە، هەست دەکات قەت وەکو ئەمشەو تەندروستی خۆش نەبووە. سێ ڕۆژ لەمەپێش لە ڕەخی مردنێ بوو، کەچی ئێستا سیحەتی زۆر باشە.

بورودوفسکی لەپڕ هەستایە سەرپێیان و بە پرتە پرت گوتی: "هەروا هاتووە و لەگەڵ "هیپولیتدا هاتووە". بەدیتنی میرزادە خۆشحاڵە و ئەوجا لەسەری ڕۆیی کە لە نامەکەیدا: "بێهودە گۆیی و هەرزە گۆیی" کردووە، بەڵام بە ڕاستی خۆشحاڵە کە ئێستا.. لێ قسەکەی تەواو نەکرد، بەگەرمی دەستی میرزادەی گوشی. ئەوجا لە جێی خۆی دانیشتەوە.

میرزادە کە لە بەخێرهاتنی هەموان بووەوە، بەرە و لای یەڤگینی باڤلوفیچ چوو. یەڤگینی خێرا باسکی میرزادەی گرت و بەئەسپایی بە گوێیدا چپاند:

- دەمویست، سەبارەت بە مەسەلەیەکی گرینگ دوو قسەت دەگەڵ بکەم... تەنیا دوو قسە، بە یارمەتیت با دەقیقەیەک بچینە لاوە.

دەنگێکی دیکە، بەگوێیەکەی تری میرزادەیدا چپاند: "بە یارمەتیت دەقیقەیەک"، دەستێکی دیکە بازووەکەی تری گرت، میرزادە کە ئاوڕی دایەوەو، پیاوێکی قژبژی، دەموچاو سوورەی، نێوچەوان پانی، خەنۆلی بینی، بە جارێ سەری سووڕ ما، بەڵام خێرا ناسییەوە: فردیش چینکۆ بوو، کە هەر خوا دەیزانی لەکوێوە سەری هەڵدابوو.

فردیش چینکۆ لە میرزادەی پرسیی:

- فردیش چینگۆت لەبیر ماوە؟

کیللەر، بەهەشتاو چوو بۆلایان و گوتی:

- تۆبەی کردووە. پەشیمانە. لە سووچێکا خۆی مات دابوو چونکە ڕووی نەدەهات تۆ بدینێ. پەشیمانە. هەست بە گوناح دەکات.

- بۆچی؟ مەگەر چی کردووە؟

- میرزادە، من کە ئێستا بینیم، یەکسەر هێنام بۆ ئێرە. لە برادەرە هەرە باشەکانمە، بەڵام تۆبەی کردووە.

میرزادە، بۆ ئەوەی زوو ڕزگاری بێ لێی ان، تەوقەی دەگەڵ هەر دووکیاندا کرد و گوتی:

- بەخێرهاتن، بە دیدارتان خۆشحاڵم! فەرموون بچن لەنێو خەڵکەکەدا جێگا بۆ خۆ بگرن.

میرزادە، پەلەی بوو کە بە تەنیا قسان دەگەڵ یەڤگینی پاڤیلوفیچدا بکات.

یەڤگینی پاڤلوفیچ گوتی:

- ماڵەکەت زۆر خۆشە، پیاو لێرەدا دڵی دەکرێتەوە. نیو سەعاتێک چاوەڕوانم کردیت، خۆشم لێگوزەرا. جا برادەری ئازیز با بێمە سەر

مەسەلەکە. هەموو شتێکم دەگەڵ گورمیشیفدا تەرتیپ کردووە، بۆیە هاتووم تا لەو ڕووەوە دڵنیات بکەم و خەیاڵت ڕەحەت بێ. هیچ نیگەران مەبە. زۆر ئاقڵانە ڕەفتاری کرد، ڕێک بەو شێوەیەی چاوەڕوانی لێدەکرا، چونکە ئەوەندەی من بزانم، خەتاکە لەو بوو، ئەو هەڵە بوو.

- ئەم کورمیشیفە دەکاتە کێ؟

- عەجایەب... ئەو پیاوەی کە لە باخەکەدا، لەپشتەوە هەر دوو دەستیت گرت. ئەوەندە تورە بوو، بەتەما بوو بۆ سبەینێ شایەدەکانیت بۆلا بنێرێ تا داوای دوئێلت لێبکەن.

- بە ڕاست.. کە کارێکی گەوجانەیە!...

- بە ڕاستی گەوجانەیە... هەڵبەتە ئاقیبەتێکی خراپی دەبوو... ئیدی دەڵێی چی، لە وڵاتی ئێمەدا ئەم جۆرە خەڵکەش...

- یەڤگینی پاڤلوفیچ، هەر بۆ ئەمە هاتووی یان ئیش و مەبەستێکی دیکەشت هەیە؟

یەڤگینی پاڤلوفیچ، بەدەم پێکەنینەوە، وەڵامی دایەوە:

- هەڵبەتە ئیشێکی دیکەشم هەیە. میرزادەی ئازیز، سبەی بەیانی زوو، دەڕۆم بۆ پترسبۆرگ، تا لەڕێوڕەسمی کفن و دفنی ئەو داماوەدا، مەبەستم ماممە، بەشداری بکەم. دەزانی هەموو قسە و باسەکان ڕاست دەرچوون، هەموو خەڵکی پێیان زانیبوو تەنیا من نەبێت. تەسەور بکە، هەواڵەکە بە جۆرێ گێژی کردم، بە ڕادەیەک سەرقاڵی کردم، نەمپەرژا بچمە دیدەنی ئەوانیش (ماڵباتی یەپانچین) هەڵبەتە سبەینێش دەستم ناگا بچمە دیدەنیان، چونکە دەبێ لە پترسبۆرگ بمێنمەوە. تێدەگەی؟ ڕەنگە تا سێ ڕۆژی دی لە پترسبۆرگ نەگەڕێمەوە. بە کورتییەکەی وەزع و حاڵم شەپرێوە. نامەوێ شتەکە گەورە بکەمەوە، بەڵام وێڕای ئەوەش حەزم کرد بەرلەوەی سەفەر بکەم، بەو پەڕی ڕاشکاوی و ڕاستگۆییەوە، بێ ئەوەی کات بەفیڕۆ بدەم چەند قسەیەکی تایبەتیت لەگەڵدا بکەم. ئەگەر ڕێم بدەیت، تا کۆتایی ئاهەنگەکە لێرە دەمێنمەوە. ئەمە جگە لەوەی هیچ شوێنێکی دی شک نابەم کە بۆی بڕۆم، ئەوەندەش پەرێشان و نیگەرانم کە مەحاڵە بتوانم ئەمشەو

بخەوم. هەرچەندە ئەم داوایەی من لە تۆ جوان نییە و زۆر قورسە، بەڵام بە ڕاشکاوی دەیڵێم کە من بە ئومێدی دۆستایەتی تۆ هاتووم میرزادە گیان. تۆ پیاوێکی بێوێنەی، یانی لە هیچ هەلۆیستێکدا درۆ ناکەیت، ڕەنگە بە عەمراتت درۆ نەکەیت. من سەبارەت بە مەسەلەیەکی تایبەتی پێویستم بە دۆستێکی ڕاستگۆ، گیانی بە گیانی و ئامۆژگارێکی ئەمین هەیە، چونکە حاڵی حازر لەو پەڕی تەنگانە و بەدبەختی دام...

دیسان دەستی بە پێکەنین کردەوە.

میرزادە، بۆ دەمێک لە فکران ڕاچوو، گوتی:

– کێشە ئەوەیە، تۆ دەتەوێ تا میوانەکان دەڕۆن، هەر چاوەڕوان بکەیت، بەڵام مەگەر هەر خوا بزانێ ئەوانە کەی دەڕۆن! باشە ئەگەر ئێستا بەدوو قۆڵی بڕۆین بۆ باخی گشتی باشتر نییە؟ با ئەوان چاوەڕوان بکەن، قەیدی نییە پاشان من تەوازۆیان لێدەخوازم.

– نا، نا، حەزناکەم، هەست بکەن کە دەمەوێ دەربارەی شتێکی تایبەتی قسانت دەگەڵ بکەم، چونکە خەڵکانێکیان تیایە، زۆریان مەبەستە بە پەیوەندییەکانی نێوانمان بزانن، بەوەت نەزانیوە میرزادە؟ باشتر وایە کە پەیوەندی ئێمە لە هەموو کاتێکا، لە شێنەیی و لە تەنگانەدا کە زۆر دۆستانەیە و هیچ ڕەمز و ڕازێک لە گۆڕێ نییە، هەر وابمێنێ، حاڵی بوویت؟ دوو سەعاتێکی دی هەموویان دەڕۆن. هەنگێ بیست دەقیقەیەک، ئەوپەڕی نیوسەعاتێک لەوەختت دەگرم...

– ببورە، ببورە! من دەخزمەتودام، بە تۆ خۆشحاڵم. پێویست بەو ڕوونکردنەوەیە ناکات. سوپاسی هەستی برایانەت سەبارەت بە دۆستایەتی نێوانمان، دەکەم. ببورە کە ئەمڕۆکە حەواسم زۆر پەرتە، دەزانی حاڵی حازر ناتوانم تەرکیز لەسەر هیچ شتێک بکەم؟

یەڤگینی پاڤلوفیچ، بەدەم سووکە بزەیەکەوە، بە ئەسپایی گوتی:

– ئاگام لێیە! پێتەوە دیارە!

یەڤگینی پاڤلوفیچ، ئەو شەوە زۆر ئاسودە و خۆشمجێز دیار بوو.

میرزادە، بە شپرزەیی پرسی:

- ئاگات لەچییە؟

یەڤگینی پاڤیلوفیچ، کە خۆی لە وەڵامی ڕاستەوخۆی ئەو پرسیارە دەدزییەوە و هێشتا هەر بزەی لەسەر لێوان بوو، لە سەر قسەکەی خۆی ڕۆیشت:

- میرزادە گیان، ئایا گومانی ئەوەم لێ ناکەیت کە ئەم هاتنەی من تەنیا بۆ ئەوە بێت فریوت بدەم و هەندێ زانیاری و قسانت لێ دەربهێنم، ها؟

میرزادە، دوای سووکە هەڵوەستەیەک، دەستی بە پێکەنین کرد و گوتی:

- گومانم لەوە نییە کە هاتوویت تا قسەم لێدەربێنی، ڕەنگە لە دڵی خۆیشتدا گرێوت لەسەر ساویلکەیی من بێت، بەڵام ڕاستت گەرەکە لێت ناترسم. باوەڕدەکەیت لەم کات و ساتەدا ئەم شتەم بەلاوە گرینگ نییە؟ ئەوجاش... چونکە پێش هەموو شتێک قەناعەتم وایە کە تۆ پیاوێکی زۆر باشیت، هەر چۆنێ بێ، لە ئەنجامدا دەگەین بە یەک و دەبین بە دۆست و برادەر! یەڤگینی پاڤیلوفیچ من تۆم زۆر چووەتە دڵەوە، چونکە تۆ... بە ڕای من... پیاوێکی زۆر بەڕێز و سەنگینی!...

یەڤگینی پاڤلوفیچ گوتی:

- من تەنیا ئەوەندە دەڵێم کە بە ناسینی تۆ زۆر خۆشحاڵم. فەرموو بە سەلامەتیی تۆ پێکێ دەخۆمەوە. بە ڕاستی بەم دیدارەت زۆر شادم...

لێرەدا قسەکەی خۆی بڕی و لەپڕ و بێ هیچ پێشەکییەک گوتی:

- ئەم برادەرە... هیپولیت هاتووە لای تۆ بژی؟

- بەڵێ.

- باوەڕ ناکەم بەم زووانە بمرێت، وانییە؟

- بۆ ئەمە دەپرسیت؟

- هەروا، بۆ هیچ! نیوسەعاتێکم دەگەڵدا بەسەر برد...

هیپولیت، بە درێژایی ئەو ماوەیەی کە ئەو دووە سەرگەرمی گفتوگۆ بوون، چاوەڕێی میرزادەی دەکرد، نە چاوی لە میرزادە دەگواستەوە نە لە یەڤگینی پاڤیلوفیچ. کە بەرەو مێزەکە گەڕانەوە، ئۆخژنێکی گەرم لە دڵ و

دەروونی گەڕا. نیگەران بوو، تەواو هەڵچووبوو. تنۆکە ئارەقەی سەر هەنیەی، وەکو مرواری دەدرەوشایەوە. چاوە درەوشاوەکانی جۆرە ترسێکی کۆنگی لە پەستا و بێ برانەوەیان پێوە دیار بوو، نیگای جۆرە بیقەرارییەکی نامەفهوومی دەنواند، لێکدا لێکدا لە شتێکەوە بۆ شتێکی دی، لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی دی دەگواستەوە. لە سەر هیچ شوێنێک نەدەگیرسایەوە. هەرچەند تا ئەو کاتە بەشدارییەکی جیددی لە گفتوگۆ و گەنگەشە گەرمەکانی دەوروبەری خۆی کردبوو، بەڵام ئەم گەرموگوڕییە، زیاتر وڕاوەگۆیی بوو، قسەکانی هەڤدژ و بێ سەرو بەر بوون. بیرکردنەوە و هزرینی پچڕ پچڕ بوو، تەوس و بێ موبالاتی و خەمساردی بە زمانییەوە دیار بوو. ڕستەکانی تەواو نەدەکرد، جاری وا هەبوو لە گەرمەی ئەو گفتوگۆ و گەنگەشەیەدا کە خۆی دەقیقەیەک لەوەپێش کردبوویەوە و وروژاندبووی دەوەستا، بە نیوەچڵی وازی لێ دێنا و نەدەگەڕایەوە سەری. میرزادە کە زانی، ئەو شەوە ڕێگەی (هیپولیت)یان داوە دوو پێکی گەورەی شامپانیا بخواتەوە، زۆری پێناخۆش بوو. ئەو پێکەی کە لەسەر مێزەکە، لەبەردەمیا دانرابوو وتۆزێکی لێ خواردبووەوە، پێکی سێیەم بوو، بەڵام میرزادە دوایی بە مەی زانی بوو، لەوساتەدا هەستی پێنەکردبوو.

هیپولیت هاواری کرد:

- دەزانی زۆر خۆشحاڵم کە ساڵیادی لەدایکبوونت کەوتووەتە ئەم ڕۆژە تایبەتیەوە؟

- بۆچی؟

- ئێستا دەیزانی بۆچی. تۆ جارێ خێرا وەرە لێرە لەسەر مێزەکە دابنیشە، چونکە ئەم هەموو خەڵکە - ئەم دۆستانە لەبەر خاتری تۆ لێرە خڕ بوونەوتەوە... پێشبینیم دەکرد خەڵکێکی زۆر بێن، ئەمە یەکەم جارە لە ژیانما پێشبینیم ڕاست دەرچووبێ! حەیفێ، خۆزیا پێشتر دەمزانی کە ئەمڕۆ ساڵڕۆژی لەدایکبوونی تۆیە، تا بەلای کەمەوە دیارییەکم بۆ هێنابای.. ها، ها! کێ ناڵێ نەمهێناوە و ئێستا لە گیرفانما نییە؟ ئەرێ زۆری ماوە بۆ بەیانی؟

پتیشن، تەماشایەکی سەعاتەکەی خۆی کرد و گوتی:

- نزیکەی دوو سەعاتێکی ماوە بەیان بدات.

یەکێک لەو بەینەدا هەڵی دایە:

- چمان داوە لە بەیان. لەکاتێکا کە بشێت بە بێ بەیان بخوێنین، بۆچی چاوەڕوانی بەیان بین؟*

- بۆچی؟ چونکە من گەرەکمە هەتاو بدینم. میرزادە بۆم هەیە بە سەلامەتی خۆر، بە خۆشیی خۆر پێکێ بخۆمەوە؟ تۆ چ دەڵێی؟

هیپولیت. بێ مدارا قسانی دەکرد، ڕووی دەمی لە هەموان بوو، لە تۆ وایە فەرماندەیەکە و فەرمان دەر دەکات، هەرچەند لەوە نەدەچوو بە خۆی بەوە بزانێ و هەستی پێ بکات.

- بە کەیفی خۆت! با بخوێنەوە! بەڵام هیپولیت تۆ دەبێ کەمێک بێدەنگ بی، پێویستت بە ئیسراحەتە، وانییە؟

- میرزادە تۆ هەمیشە ئامۆژگاریم دەکەیت کە دەبێ بڕۆم بنووم، لەلەیەک چۆن مامەڵە لەتەک منداڵدا دەکات، بەو ئاوایە مامەڵەم لەتەکدا دەکەیت. هەر کە هەتاو هەڵهات و ئاسمانی پرشنگ باران کرد (ئەرێ ئەم بەیتە شیعرە هی کێیە کە دەڵێت: "هەتاو ئاسمانی نقومی پرشنگان کرد."؟* بە یتێکی بێمانایە، بەڵام جوانە) هەنگێ من دەچمە جێوە و دەنووم. لیبدیف ئایا هەتاو سەرچاوەی ژیانە؟ ئەم دوو وشەیە: "سەرچاوەی ژیان"، لە مکاشەفاتەکەی قەدیس یوحەنادا چ مانایەک دەگەنن؟ میرزادە تۆ هیچت دەربارەی (هەسارەی ئەفسنتین)* بیستووە؟

- ئەوەی من بیستوومە گوایە بەپێی ڕاڤەی لیبدیف ئەم هەسارەی ئەفسنتینە دەکاتە تۆڕی هێڵی ئاسنی ئەوروپا.

لیبدیف، لە جێی خۆی ڕاپەڕی، وەکو ئەوەی بیەوێ، خەڵکەکە، کە دەستیان بە پێکەنین کردبوو، لە پێکەنین ڕابگرێت، بە هەر دوو دەست کەوتە ئاماژە و هاواری کرد:

- نا.. نا... وانیە... تکایە یارمەتیم بدەن با! ..

ئەوسا، لەپڕ ئاوڕی لە میرزادە دایەوە و گوتی:




- ئەم برادەرانە... ئەمانە هەموویان... کاتێ هەندێ مەسەلە دێتە پێشێ... هیچیان لەم باشتر نین...

بەدەم ئەو قسەیەوە دوو جار تەقەی لە مێزەکە هەستان، ئەم کارە نەک هەر بێدەنگی نەکردن، بەڵکو زیاتر هێنانیە پێکەنین. لیبدیف، ئەگەرچی، ئەمشەویش وەکو هەموو شەوانی دیکە بوو، بەڵام ئەمشەو بە هۆی ئەو گەنگەشە دورودرێژە زانستییەوە کە کردی، لە جاران بەجۆشوخرۆشتر بوو. لەم حاڵەتانەدا، زۆر ڕەق و بێپەردە ڕەفتاری دەگەڵ حەریفانی خۆیدا دەکرد.

- بەڕێزینە ئەمە جوان نییە! هەمووی نیو سەعاتێ لەمەپێش، ڕێکەوتین هەر یەکێکمان دەستی بەقسان کرد، نابێ کەس قسەکەی پێ ببڕێت یان پێی پێبکەنێ، ڕێگە بە هەر کەسێک بدەین بە کەماڵی ئازادی بیروبۆچوونی خۆی دەربڕێت. دوای ئەوە خوانەناسانیش، بۆیان هەیە بەوپەڕی ئازادی ئیرادی خۆیان بگرن. جەنەڕاڵیشمان بە سەرۆک و بەڕێوەبەری گفتوگۆیەکان هەڵبژارد. ئیدی ئەمە چییە دەستتان داوەتێ؟ بەم کارەتان، دەتوانن شیرازەی بیری هەر کەسێک، چەند بیروبۆچوونەکەشی بەرز و قووڵ بێت بپچڕن و بپەشۆکێت!...

هەموو بە یەک دەنگ هاواریان کرد:

- قسە بکە، قسە بکە! کەس قسەت پێنابڕێت!

- قسە بکە، بەڵام درێژدادڕی و هەرزەبێژی مەکە!

یەکێک هەڵی دایە و پرسیی:

- ئەم هەسارەی ئەفسنتینە چییە؟

جەنەڕاڵ ئیڤۆلگین، وەکو سەرۆک و بەڕێوەبری کوڕەکان، بەو پەڕی هەیبەت و سامەوە چوو لەسەر کورسییەکەی پێشووی دانیشت و گوتی:

- هیچ شتێک لەم بارەیەوە نازانم!

ئەوسا کیللەر، لە جێی خۆیەوە، لەسەر کورسییەکەی کەوتە جموجۆڵ، بە شادییەوە، لەبن لێوانەوە گوتی:

- میرزادە، من یەجگار حەزم لەم گەنگەشە و مشتومڕانەیە، بە مەرجێ

زانستییانە بن!

ئەوجا، لەپڕ، بە شێوەیەکی چاوەڕواننەکراو، ئاوڕێکی لە یەڤگینی پاڤلوفیچ، کە لە نزیکیەوە دانیشتبوو، دایەوە و گوتی:

– بابەتی، زانستی سیاسی. ئەو شتانەم زۆر پێ خۆشن کە لە ڕۆژنامەماندا دەربارەی گەنگەشە و مشتومڕەکانی ناو ئەنجوومەنی نوێنەرانی بەریتانی، بڵاو دەکرێنەوە. هەڵبەتە مەبەستم کرۆک و جەوهەری گەنگەشە و مشتومڕەکان نییە (چونکە بە خۆت دەزانی من بابایەکی سیاسەتوان نیم). بەڵکو مەبەستم ڕەفتار و شێوازی گەنگەشەکەیانەوەکو خەڵکانی سیاسەتوان، بۆ نموونە کە یەکێکیان دەڵێت: "ئەو ڤیکۆنتەی بەرانبەرم.."، "ئەو ئیریلەی هاوڕای منە.."، یان "ئەو موخالیفە بەڕێزەی من، کە بە پێشنیازەکەی، ئەورووپای سەرسام کرد.." هەڵبەتە هەموو ئەم دەستەواژە و قسانە، جوانن. ئەم گیانی پەرلەمانتارییەی لە لای گەلێکی ئازاد هەیە، دڵم خۆش دەکات، بە ڕاستی ئەفسوونم دەکات! زۆری لەزەت لێ دەبینم میرزادە! من لە ناخی خۆدا، خۆڕسک هەموو کاتێ هەر هونەرمەند بووم، باوەڕ بکە یەڤگینی پاڤلوفیچ!

گانیا، لەشوێنی خۆیەوە، بە زمانێکی هێرشامێزەوە هاواری کرد:

– یانی بە قسەکانی تۆ تۆڕی هێڵی ئاسن، بەڵایەکی گەورەیە، مایەی فەوت و فەنای تیرەی بەشەرە. زەهرێکە و بەسەر زەویدا باریوە. "سەرچاوەکانی" ژیان دەلەوتێنێ؟

گاڤریلا ئاردا لیونوفیچ، ئەو شەوە، زۆر شەنگوڵ بوو، لە بەرچاوی میرزادە فرە تەڕدەماخ و خۆش مجێز بوو، هەستی بە جۆرە سەرکەوتنێک دەکرد. پرسیارەکەشی لە ڕووی سوعبەت و شۆخییەوە بوو، هەر بۆ تووڕەکردن و هاروژاندنی لیبدیف بوو، کەچی زۆری نەبرد خۆی گەرم بوو.

لیبدیف، بەتووڕەییەکی ئاوێتە بە جۆشوخرۆش، بەرسڤی دایەوە:

– نا، نا، خەتا لە هێڵی ئاسن نییە، ئەو هێڵانە خۆ بەخۆ سەرچاوەکانی ژیانیان پێ ناڵەوتێ، پێ پیس نابێ. بەڵکو بەڵا گەورەکە، ئەم گیانی ئەکادیمیە پراکتیکییە یە کە لەم سێ سەدەیەی دوایدا، زۆر زاڵ بووە و

هەڵکشاوە!

یەڤگینی پاڤلوفیچ پرسی:

- باشە ئەم بەڵایە مسۆگەرە یان هەر ئەگەرە؟ خۆ دەبێ مەبەستەکە بەوردی بزانین.

لیبدیف، بەجیددی بەرسڤی دایەوە:

- حەتمیە! مسۆگەرە!

پتیتسن بە زەردەخەوە گوتی:

- لیبدیف، زیادمەڕۆ، تۆ بە ڕۆژەوە، بەیانییان گەشبینتر و خێرخوازتریت.

لیبدیف، ڕووی تێکرد و گوتی:

- دروستە، بەڵام شەوان ڕاشکاوترم، دڵسۆزترم، ڕاستگۆترم، سادەتر و بێ ڕیاتر و شەریفترم. هەر بۆیەش لە ئیراد و ڕەخنەکانتان بێ منەتم، لە دەحکە و گەنگەشەتان بێپەروام. دەرەقەتی ئێوەی خوانەناس دێم: ئاخر ئێوە چۆن دەتوانن دنیا ڕزگاربکەن؟ ئاخر ئێوە، ئەهلی زانست، تەکنەلۆژیا، لایەنگرانی سیستمی هاوبەشی، ئەنجوومەن و سەندیکای کرێکاران و ئەو شتانە، چۆن دەتوانن بیخەنە سەر ڕێگەی ڕاست و دروست؟ ئاخر بەچی جیهان ڕزگاردەکەن؟ بە سلفە و وامان؟ وام چییە؟ وام و قەرزوقۆڵە بەرەو کوێتان دەبات؟

یەڤگینی پاڤلوفیچ گوتی:

- وا دیارە تۆ زۆر بە خەمی ئەم مەسەلانەوەی!

- بە ڕای من، هەر کەسێک خەمی ئەم مەسەلانەی نەبێ و بایەخیان نەداتێ، کەسێکی خوێڕیلەی بێقیمەتە! بەڵێت ئەزبەنی!

پتیتسن گوتی:

- وام و سلفە بەلای کەمەوە، دەبێتە هۆی هەڤبەستەگی جیهانی و هاوسەنگی بەرژەوەندییان.

- تەنیا ئەوە و بەس! بناغەی بنەڕەتی ئەخلاقی ئەم بۆچوونەی تۆ لەسەر بنەمای ڕازیکردنی خۆپەرستیی فەردی و پاراوکردنی پێویستییە

مەترياليیەکانە. يانی ئاشتی جيهانی و شادمانی دەستە جەمی لەسەر بنەما و پرەنسيپێن پێویستی. قوربانِ ئەوەندەی من لەم قسانەی تۆ تێگەیشتم، مەبەستت هەر ئەوەیە، وا نییە؟

گانيا کەوردەوردە گەرم دەبوو، بە ليبديفی گوت:

- پێم وايە لە سەدەکانی داهاتوودا، پێويستيە هاوبەشەکانی تيرەی بەشەر بە ژيان، خواردن و، خواردنەوە و باوەڕ هێنانی تەواو و زانستييانە بەوەی کە ئەم پێداويستييانە، بە بێ هاوکاريی گشتی و ڕەچاوکردنی هەڤبەستەکی بەرژەوەندیی گشتی پاراو نابێت، دەبێت بە پشتيوانە و "سەرچاوەی ژيان"ی هەموو تيرەی بەشەر.

- زەرورەت و پێويستی خواردن و خواردنەوە، بە مانايەکی دی تەنيا دەکاتە غەريزەی مانەوە...

- چما ئەم غەريزەيە کەمە؟ ئەم غەريزەيە هەر چۆنێ بێ، يەکێکە لە ياسا مرۆڤانيە سروشتيەکان.

يەڤگينی پاڤلوفيچ لەناکاو بەسەرسامی هەڵی دايە:

- بە قسەی کێ وايە؟ ڕاستە ياسايە، بەڵام ياسايەکە هەر بە ئەندازەی ياسای وێرانکردن (تدمير) و (خود وێرانی) سروشتيیە. چما ياسای مانەوە، تاقە ياسای ئاسايی و سروشتيیە کە مرۆڤ بەڕێوە بەرێت؟

هيپوليت، بەتوندی ئاوڕی لای يەڤگينی پاڤلوفيچی دايەوە، بە کونجکاوی و گۆساخانە لێی ڕوانی و هاواری کرد:

- هێی! هێی!

بەڵام کە بينيی پێدەکەنێ، خۆشی کەوتە پێکەنين و سيخورمەيەکی بە کۆلياوە، کە لە تەنيشتيەوە دانيشتبوو، ژەند و لێی پرسی کە سەعات چەندە، تەنانەت بەبێ سەبری سەعاتە زيوەکەی لە دەستی کوڕە ڕاکێشا و بە پەرۆشەوە ڕوانيیە ميلەکانی. ئەوسا بێگوێدان بە هيچ شتێک، خەمسارد و بێموبالات يەک تەختە لەسەر تەختەکە لێی ڕاکشا و هەر دوو دەستی نانە ژێر سەری و چاوی بڕينە ميچ و ساپيتەکە. هەر دوای نيو دەقيقەيەک، هەستايەوە و قيت لە جێی خۆی دانيشتەوە و گوێی بۆ هەرزە گۆيەکانی





ـیدیف، کە گەیشتبووە هەرەتی جۆشوخرۆش، هەڵخست.

لیبدیف، کە زۆر بە توندی بەرپەرچی رایەوەهەم ئامێزەکەی یەڤگینی ـقلوفیچی دەدایەوە، گوتی:

- ئەم راو بۆچوونەی تۆ، هەرچەندە تەوسامێز و چەواشەکارانەیە، تۆ ـزیاتر مەبەستت ئەوە بوو، کە ئاوری گەنگەشە کە خۆشتر بکەیت، بەڵام ـبۆچوونێکی راست و دروستە. جا پیاوێکی بە گومانی وەکو تۆ، رۆڵەی چینی ئەرستوکرات، بابایەکی ئەفسەری هێزی سوارە(بەهەرحاڵ ـبەهرەمەند) بە خۆیشی نازانێت، ئەم بۆچوونە چەند قووڵ و دروستە! بەڵێ ـقوربان! یاسای (خود وێرانی) و (خود پارێزی) لە بوونی مرۆڤدا بە هەمان ـئەندازە هەن، کاریگەرییان لەسەر مرۆڤ یەکسانە. شەیتان هەر دووکیان ـبەکار دێنێ تا لەو رێگەیەوە حوکمی بەشەریەت بکات. پێدەکەنن؟ باوەرتان ـبە هەبوونی شەیتان نییە؟ بێباوەری بە هەبوونی شەیتان، فکرێکی ـفەرەنسییە، فیکرێکی گەوجانەی بێمانایە، دەزانن شەیتان کێیە؟ ناوی ـدەزانن؟ ئێوە، تەنانەت بێ ئەوەی ناویشی بزانن، بە چاولێکەری ڤولیتر، بە ـسم و کلک و شاخەکانی، کە هەر هەمووی خەلقی خەیاڵی خۆتانە، ـپێدەکەنن، گاڵتەی پێدەکەن. لەکاتێکدا گیانی ئەهریمەنی، روحی شەیتانی، گیانێکی زۆر بەهێزی ترسناکە، نە ئەو شاخ و باڵەو، نە ئەو سم و دومەی ـهەیە کە ئێوەوێنای دەکەن، بەڵام ئێستا باسەکەمان، باسی گیانی ئەهریمەنی ـو شەرانی نییە...

هیپولیت، لەپڕ گرژ بوو، دایە قاقای پێکەنین و هاواری کرد:

- بە چ مەحکوم، گیانی شەیتانی باسی ئێستامان نییە؟

لیبدیف دووپاتی کردەوە:

- پرسیارێکی بەجێیە! بەڵام من دووپاتی دەکەمەوە کە باسی ئێستامان نییە. مەسەلە ئەمەیە کە بزانین ئایا پەرەسەندن "سەرچاوەکانی ژیانی" لاواز نەکردووە؟

کولیا، هەڵی دایە و پرسی:

- مەبەستت تۆری هێڵی ئاسنە؟

- کوڕی باش، تۆ گەنجی، گەنج. من تەنیا هێڵی ئاسنم مەبەست نییە، بەڵکو ئەو ڕەوت و ڕێڕەو و ڕێبازە گشتییەم مەبەستە، کە دەشێت هێڵی ئاسن بە نموونەیەک یان بە بەرجەستەکردنێکی هونەری ئەو ڕێبازە بژمێرین. حاڵی حازر\خەڵکی زۆر مژولن، دێن، دەچن. دەڕۆن، هاواردەکەن، قەرەباڵغی دەکەن، پێ هەڵدەگرن، بەو ناوەوە کە کار بۆ خۆشی و خۆشگوزەرانی تیرەی بەشەر دەکەن! سەیر دەکەی هزرڤانێکی گۆشەگیر و تەریک لەولاوە قوت دەبێتەوە، شین بۆ بەشەر دەگێڕێت و دەڵێت: "بەشەری ئەمڕۆ یەجگار سەرقاڵ و جەنجاڵە، لە تەکنەلۆژیا و سنعەتدا نقوم بووە، شێت و شەیدای پارە پەیداکردن بووە، بەڵام هەر هەمووی لەسەر حیسابی هێوری دەروونی و ئاسودەیی ڕۆحییە."

کاتێ دەزانی لەو لاوە هزرڤانێکی دیکە لێی دێتە دەست و بە کەشوفشێکەوە بە هزرڤانی یەکەم دەڵێت: "لە گینەوابێ" بەڵام تەق و تریقی ئەو ڤیتارانەی کە نان و ئازووقە بۆ جەماوەری ڕەش و ڕوت و برسیانی خەڵک دەگوازنەوە، ڕەنگە زۆر لە هێوری دەروون و ئاسوودەیی ڕۆح باشتر و پێویست تر بێت! " بەڵام من، لیبدیفی ناچیز، باوەڕم بەو ڤیتارانە نییە کە گوایە نان بۆ برسییان دەگوازنەوە! چونکە ئەگەر فکرێکی ئەخلاقی – ڕۆحی بەڕێوەیان نەبات لەوەیە، وەکو پێشتریش ئەمەمان دیتووە، ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی لە نانخواردن بێبەش بکەن...

یەکێک لەنێو خەڵکەکەوە هەڵی دایە!

- ئاخر ڤیتار چۆن دەتوانێ، خەڵکی لە نان بێبەش بکات؟..

لیبدیف، بێ ئەوەی خۆی لەو پرسیارە بکات بە خاوەن، قسەکەی خۆی دووبارە کردووە:

- ئەمە پێشتریش بینراوە. بۆ نمونە مالتوسی بەشەر دۆست بێتە بەرچاو. هەر کەسێک چەندیش بەشەر دۆست بێ، ئەگەر ئەو بناغە ئەخلاقیەی لەسەری ڕاوەستاوە، سست و فشەڵ بێت و کەسێکی خۆپەسەند و لەخۆ ڕازی بێت، هەر بەشەر خۆرە. ئەگەر غروور و کبریای هەر یەکێک لەو بەشەر دۆستە زۆر و زەبەندانە بریندار بکەی، ئامادەیە لە ڤیناو لە





تۆڵەی خۆیدا هەر چوار نکالی دنیا بسووتێنێ!... ئەگەر ڕاستت دەوێ و بۆ ئەوەی هەق پێشێل نەکەم، هەر یەکێک لە ئێمە بگری، خۆم لەپێشی پێشەوە، هەمان کار دەکات. من کە لەهیچەوە دیار نیم هەمان کار دەکەم، ڕەنگە من یەکەم کەس بم کە چیلکە و دار بەرم بۆ ئەوەی ئاگرەکە بکرێتەوە، پاشان هەڵێت... بەڵام دووبارەی دەکەمەوە کە مەسەلەکەی ئێمە ئەمە نییە!

- ئەدی کامەیە؟

- تۆش هەر زمانی نائومێدی و ڕەشبینی دەزانی!

- مەسەلەکان، وەکو ئەم حیکایەتە کۆنەیە کە ناچارم بیگێڕمەوە. لەم سەردەمەدا و لەم وڵاتەی ئێمەدا، کە هیوادارم ئێوەش بەئەندازەی من و وەکو من خۆشتان بوێ... من یەک لەباری خۆم، بەڕێزان ئامادەم دوا دڵۆپی خوێنی خۆمی لەپێناودا بەخت بکەم...

- زۆر درێژەی مەدەیە، بڵێ بزانین چیتر؟

- بەڵێ... لەم وڵاتەی ئێمەدا، ڕێک وەکو هەموو ئەورووپا، هەرچارەکە سەدەیەک جارێ ئەگەر لێم نەبێ بە درۆ، خەڵکی تووشی قات و قڕی و برسێتی و گرانی دەبێت... من زۆر پێ لەسەر دروستی و نادروستی ژمارەکە داناگرم، بەڵام ئەم جۆرە قات و قڕیانە تا ڕادەیەک کەمە.

- تا ڕادەیەک؟ لەچاو چیدا؟

- لەچاو سەدەی دوازدە و هەر دوو سەدەی پێش و پاش سەدەی دوازدەدا، چونکە بە گوتەی مێژوونووسان، ئەو سەردەمانە، گرانی گەورە و ئیقلیمگیر، هەر دوو ساڵ یان سێ ساڵ جارێک، بەرۆکی تیرەی بەشەری دەگرت. وەکو دەگێڕدرێتەوە، بەشەر، لەو وەزع و حاڵانەدا، گۆشتی بەشەریشی خواردووە، بەڵام بە دزییەوە. یەکێک لە مشە خۆرانی ئەو سەردەمە، کە گەیشتووەتە تەمەنی پیری، بە خواستی خۆی، بێ ئەوەی کەمترین گوشاری بخرێتە سەر، گێڕاویەتەوە، کە لە ژیانی درێژی کڵۆڵی و داماویی خۆیدا، بەدزییەوە شەست ڕەبەن و شەش منداڵی کوشتووە و خواردوونی، دیارە ژمارەی منداڵەکان لەچاو ژمارەی ئەو ڕەبەنانەی کە خواردوونی، زۆر کەم بوون، وادیارە، جگە لە ڕەبەنان، ئەو کارەی دەگەڵ

هیچ کەسێکی گەورەی دیدا نەکردووە.

بەڕێوەبەری کۆڕ، جەنەڕاڵ بەخۆی، بە تووڕەییەوە هاواری کرد:

- مەحاڵە، شتی وانییە! بە ڕێزینە من زۆر جار دەگەڵ ئەم پیاوەدا باسی ئەم جۆرە بابەتە دەکەم، بەڵام زۆربەی کات درۆی وا شاخدار دەکات پیاو لەرزی لێدێ. شتی وا دەڵێت، زەڕەیەک ڕاستی تێدا نییە!

- جەنەڕاڵ، ئابلوقەکەی قارس* بێنەوە یاد! ئێوەش بە ڕێزینە، دڵنیابن کە حیکایەتەکەم، حیکایەتێکی واقیعی و ڕاستەقینەیە. حەز دەکەم ئەوەش بڵێم، من باوەڕم بەوە هەیە کەواقیع باملکەچی یاسائێن جێگر و نەگۆڕیش بێت، هەمیشەوا دێتە بەرچاو کە لە حەقیقەت و ڕاستی دوورە. هەندێ جار ڕووداوێک چەند واقیعی تر بێت، ئەوەندە نا حەقیقی تر دەنوێنێ.

ئامادەبووان، بەدەم پێکەنینەوە پرسیان:

- ئاخر چۆن دەشێت کەسێک بەو ئاسانیە شەست ڕەبەن بخوات.

- هەڵبەتە، ئاشکرایە کە هەموویانی بە کەڕەتێک و لە یەک جێدا نەخواردوۆە. ڕەنگە بە درێژایی پازدە - بیست ساڵێک ئەوجا خواردبنی. دیارە لەم حاڵەتەدا مەسەلەکە زۆر ڕوون و ئاشکرا و ئاساییە...

- سروشتیشە؟

لیبدیف، بە عینادی بابەیەکی خۆ بە زانازان بەرسڤی دایەوە:

- بەڵێ سروشتیشە!

ئەوسا لەسەر ڕۆیشت و گوتی:

- ئەمە جگە لەوەی کە ڕەبەنی کاتۆلیک بە تەبیعەت، کەسێکی سوێرە قسە و فزوڵییە، بۆیە زۆر بەئاسانی فریو دەدرێ، کە بۆ جەنگەڵێک یان هەر شوێنێکی دیکەی دوور و تەریک ببرێت و بەو دەرد و مەرەدە ببرێت کە باسم کرد. هەڵبەتە من نکۆڵی لەوە ناکەم کە ژمارەی ڕەبەنە خوراوەکان، ئەگەر یارۆی پیاوخۆر، چەند نەوسن و پڕ خۆریش بووبێ، هەر یەجگار زۆرە.

میرزادە، لەناکاو هەڵی دایە:

- بەڕێزینە، لەوەیە ئەمە ڕاست بێت.





میرزادە تا ئەو کاتە، ورتەی لێوە نە هاتبوو، بە بێدەنگی، بێ ئەوەی خۆ لـە گفتوگـۆ و گەنگەشـە و مشـتومڕەکان هـەڵقورتێنێ، گـوێی لـە قسـە و باسـەکان گرتبـوو، زۆر جـار گـوێ بـەگوێی ئامـادەبووان، لـە کانگـای دڵەوە پێکەنیی بوو. دیار بوو کە بەو هەموو بەزم و ڕەزم و شـادی و هـەراو زەنا و تەنانـەت بادەنۆشـی لـەڕادە بـەدەری میوانـەکان زۆر خۆشـحاڵە، دەشـیا بـە درێژایـی شـەوبێرییەکە زار هەڵنەیـەنێ، بـەڵام لـەناکاوا لێبڕا قسـەیەک بکـات، ئەوەندە بەجیددی و سـەنگینی دەسـتی بـە قسـان کـرد کـە هـەموو میوانـەکان بە کونجکاوی و سەرسامی کەوتنە تەمەشاکردنی!

- بەڕێزینـە مـن گەرەکمـە ئەوەتـان عەرزبکـەم، کـە لەو زەمـان و ڕۆژگارانەدا گرانی و قات و قڕی و برسێتی زۆر دووبـارە بـووەتەوە. منیش هەرچەنـدە شـارەزای مێـژوو نـیم، بـەڵام شـتم لەمـەڕ ئەو قاتوقڕییانـە بیستووەو، پێدەچێ شتەکە ڕاست بێ و وابووبێ. کاتی خۆی کە چووبوومە کۆجاڕەکـانی سویسـرا، سـەرم لـە شـوێنەواری کۆشـک و قـەڵا کۆنـە فیوداڵیـەکانی ئەو وڵاتـە سـووڕما، هـەر کۆشـک و قـەڵا بـوو بەقـەد پـاڵ و بەرزایی چیاکانەوە گیرسابووەوە، هـی وایـان هـەبوو بـە بـەرزی پتر لـە نیو فەرسـەقەوە بـوو (یـانی ئـەگـەر بـە ماڵاتـە ڕێدا بـۆی سـەرکەوتبای چەنـدین فەرسەخ دەبوو). هەمووتان دەزانن کۆشک و قەڵا دەکاتە چی و چییـە: یانی قەسرێکی بەردینی یەجگار گەورە. دروستکردنی ئەم قەڵایـە کاری دەوێ نـە گاڵتـە، کارێک کـە ناچێتـە ئـەقڵەوە. هەڵبەتـە هـەر هـەمووی بـەڕەنجی شـان و ئارەقـەی نێوچەوانی ئەو هـەژار و نەدارانـە کرابـوو کـە ڕەعیـەت و مسـکێن بووبـوون. ئەو دامـاوانەوێڕای ئەو کـارە قورسـەش، دەبوایـە جۆرەهـا بـاج و سەرانە بدەن و خـەرجی پیاوانی کڵێسـاش بکێشـن. ئیدی چۆن توانیویـانە و لەکوێ کاتیان هەبووە، نان و قووتی ڕۆژانـەیان پەیدا بکـەن و زەوی بکێڵـێن و داچێنن؟ دیارە لەو سەردەم و ڕۆژگارەدا ژمارەیان لەوە کـەمتر بـووە، لـە عۆیـەی ئەو هـەموو کـارو ئەرکـە بـێن، زۆربـەیان لەبرسـا دەمـرن، چونکـە هیچیان نەبووە بیخۆن. تەنانـەت هەندێ جـار لـەخۆم دەپرسـی، باشـە چۆنـە هـەر هـەموویان نـەمردوون، تـاقوبڕ نـەبوون، چـۆن بەرگـەیان گرتـووە و

توانیویانە بەو شێوەیە هەڵکەن و بمێنن؟ جا کە لیبدیف باسی ئەوە دەکات کە لەو زەمانەدا جاری وا هەبووە هەندێ خەڵکی گۆشتی بەشەریان خواردووە، ڕاست دەکات. لێی بە درۆ مەگرن، بەڵام من نازانم بۆچی ئەو ڕەبەنانەی تێهەڵکێشی ئەم مەسەلەیە کرد و چ مەبەستێکی هەیە.

گاڤریلا ئاردالیونوفیچ گوتی:

– لە گینە مەبەستی ئەوەبێ بڵێت کە لەسەدەی دوازدەدا، تەنیا ڕەبەنان گۆشتیان خوراوە، چونکە هەر ئەوان ناسک و دابەستە ئاسا قوت و قەڵە و بوون.

لیبدیف هاواری کرد و گوتی:

– ئەمە سەرنجێکی زۆر زۆر دروستە! چونکە یارۆی پیاوخۆر، جگە لە پیاوانی ئایینی دەستی بۆ تاقە یەک کەسی ئاسایی نەبردووە! بەڵام شەست دانە ڕەبەنی دێرنشینی خوارد بوو. ئەم قەوماوە یەجگار دزێو و کرێتە، دەلالەتی مێژوویی و بایەخی ئاماری خۆی هەیە. ئەمە قەوماوێکە، کە پیاوی زیرەک دەتوانێ لە میانەیەوە، وێنایەکی دروستی ڕابردوو بکات، زۆر بەوردی، ئەوە دەسەلمێنێ کە پیاوانی کڵێسا لەوزەمان و ڕۆژگارەدا، لایەنی کەم شەست هێندەی خەڵکی دیکە تێر و خۆش گوزەران بوون و ڕەنگە شەست هێندەی خەڵکەکانی دی قوت و قەڵە و بووبن.

گوێگران، بەدەم قاقای پێکەنینەوە هاواریان کرد:

– زۆرە لیبدیف، زۆرە!

میرزادە، لە سەر قسەکەی خۆی ڕۆیشت:

– ڕاستە ئەمە دەلالەتی مێژوویی خۆی هەیە، بەڵام تۆ دەتەوێ چ ئەنجامگیریەک بکەیت؟

میرزادە زۆر بەجدی، بە زمانێکی خاڵی لە هەر تانەوتەشەرێک لە لیبدیف، قسەی دەکرد، ئەو لیبدیفەی کە هەموو ئامادەبووان پێیان ڕادەبوارد، جیاوازی قسەکانی میرزادە دەگەڵ ئەوانی دیکەدا، خۆبەخۆ هاماجێکی کۆمیدی و پێکەنیناوی ئەوتۆی دروست کردبوو، کە ئەگەر میرزادە پتر لەسەری ڕۆیشتبا بەخۆیشی دەبوو بە گەپجاڕی ئامادەبووان،





بەلام میرزادە بە خۆی هەستی بەمە نەدەکرد. یەڤگینی پاڤلوفیچ، لەپشت میرزادەوە سەری هێناو بەگوێی میرزادەیدا چپاند:

- ئەریَ هەست ناکەی ئەم پیاوە تێکچووە؟ تۆزێ لەمەپێش یەکێک لەمانەی ئێرە پێی گوتم کە ئەم پیاوە نیازی وایە بچێتە تاقیکردنەوەی پارێزەرییەوە و بەتەمایە ببێت بە پارێزەر، بۆیە لاسایی کردنەوەی گەنگەشە و موافەعەی دانیشتن و کۆڕی دادڤانی، مێشکی تێکداوە. من چاوەڕوانی نمایشێکی کۆمیدی، ئەو جۆرە گەنگەشانەی لێ دەکەم!

لیبدیف، بە دەنگێکی ڕەسا لەسەر قسەکەی خۆی ڕۆیشت:

- دەمەوێ بگەمە ئەنجامیگرییەکی گرینگ، بەلام با پێش هەر شتێک ڕەوش و حاڵەتی سایکۆلوژی و دادڤانی ئەم تاوانبارە شی بکەینەوە. وا دیارە ئەم تاوانبارە یان(ئەگەر حەز دەکەن با ناوی بنەین موەکیلی من) هەرچەند هیچ خواردن و سەرچاوەیەکی دیکەی خواردنی شک نەبردووە، بە درێژایی ماوەی ئەو ژیانە غەریبەی، چەندین جار پەشیمانی خۆی دەربڕیوە، ئارەزوی تۆبەی کردووە کە چیتر گۆشتی پیاوانی کڵێسا نەخوات. ئەم خاڵە بە ئاشکرا لە پێچوپەنای ڕوداوەکانەوە دیارە. وەک دەگوترێ ئەم پیاوە تەنیا پێنچ شەش منداڵی خواردووە. ڕاستە ئەم ژمارەیە لەچاو خۆیا یەجگار کەم و ناچیزە، بەلام لە ڕوویەکی دیکەوە دەلالەتێکی گەورەی لە خۆگرتووە. بێگومان ئەم موەکیلەی من تووشی چەندین نۆرە عەزابی ویژدان بووە(چونکە پیاوێکی بەدینی، بەویژدان بووە، کە دەتوانم ئەمە بە بەڵگە بسەلمێنم). جا بۆ ئەوەی بەپێی توانا گوناحی سەر شانی خۆی سووک بکات، شەش دانە جار هەوڵی داوە، هەر بۆ تاقیکردنەوە، لەجیاتی گۆشتی ڕەبەنێن دێرنشین، گۆشتی خەڵکی ئاسایی بخوات. نکۆڵی لەوەش ناکرێت کە ئەم کارەی هەر هەوڵ و ئەزموونێک بووە، خۆ ئەگەر ئەمەی هەر بۆ ئەوە بووبێ، جۆری خواردنەکەی بگۆڕێت، ئەوا شەش نەفەر ژمارەیەکی ناچیزە، زۆر نییە! بۆچی تەنیا شەش منداڵی خواردووە، نەیکردووە بە سێ؟ (نیوەیان لە پیاوانی ئایین بن و نیوەکەی تریان لە خەڵکی ئاسایی بن؟) بەلام ئەگەر مەسەلەکە هەر هەوڵ یان ئەزموون

بووبێ، تەنیا لە ترسی سووکایەتی بە ئایین و کڵێسا بووبێ، جۆرە پەشیمانی و گەڕانەوە و تۆبەیەک بووبێ، ئەوا خواردنی ئەو شەش نەفەرە جۆرە ماقوولیەتێکی تیایە، بگرە زۆریش ماقووڵ و پەسەندە، چونکە ئەو شەش هەوڵە بۆ ڕزگاربوون لە عەزابی ویژدان، ڕووبەڕووی شکست بووبووەوە. یەکەم بە باوەڕی من چونکە منداڵ زۆر بچووکە - برسێتی پیاو ناشکێنێ – ئەگەر موەکیلەکەی من لە ماوەی بەشەرخۆریەکەیدا، هەر منداڵی خواردبا، ڕەبەنانی نەخواردبا، ئەوا دەبووایە سێ ئەوەندە و بگرە پێنج ئەوەندەی ژمارەی ڕەبەنەکان منداڵی خواردبا. بەم پێودانگە، تاوانەکەی لە ڕووی چلۆنایەتیەوە سووک دەبوو، بەڵام لە ڕووی چەندایەتیەوە قورس دەبوو. جا بەڕێزینە ئێوە سەرنج بدەن بزانن من کە بەم جۆرە بێز لە مەسەلەکە دەکەمەوە و بەو جۆرە تاوتۆێی دەکەم، تا ئەو بارە دەروونی و سایکولۆژییە بدۆزمەوە کە تاوانبارێکی سەدەی دوازدەی تیا ژیاوە، بەڵام من، کە خەڵکی سەدەی نۆزدەم، ڕەنگە بە جۆرێکی دی بیر لە مەسەلەکە بکەمەوە، ئەمە بیرکردنەوەی من نەبێت. بۆیە ئەمەتان عەرز دەکەم بەڕێزینە، تا گاڵتەم پێنەکەن و نەمکەن بە گەپجاڕی خۆتان، بەڵام جەنەڕاڵ، تۆ یەکەم لە تامت دەرکردووە. دوەم (بە ڕای شەخسی من) گۆشتی منداڵ، ئەو بەها خۆراکیەی تیانیە کە تێرت بکات، ڕەنگە زۆریش نەرمە لیقە و ناخۆش بێت، یانی نەک هەر برسێتی ناشکێنێ، بەڵکو تووشی عەزابی ویژدانیشت دەکات.

" جا بەڕێزینە، هەنوکە دێینەسەر ئەنجام و ئەنجامگیری ئەم ڕووداوە، کە چارەسەری یەکێک لە کێشە هەرە گەورەکانی ئەو زەمان و ڕۆژگارە و ئێستای ئێمەشی لە خۆگرتووە. ئەم تاوانبارە، لە ئەنجامدا خۆی لەلای ڕەبەنان و ئەهلی کڵێسا و ئایین خەبەری لە خۆی دا خۆی ڕادەستی حکومەت و دەسەڵات کرد. جا لێرەدا پرسیار ئەمەیە ئاخۆ دەبێ لەو زەمانەدا چ ئەشکەنجە و عەزابێکی لەبەردەم بووبێ: ڕاکێشان بە گالیسکە، فرێدانە ئاگرەوە! باشە بۆچی خۆی خەبەری لە خۆی داوە، دانی بە تاوانەکەیدا ناوە؟ باشە دوای ئەوەی شەست کەسی خوارد، بۆچی ئیدی تا





مردن ئەم ڕاز و نهێنییەی نەپارست؟ باشە بۆچی تۆبەی نەکرد و بیری ئەوە نەکردەوەوەکو خواناسێک دنیای تەرک نەکرد و کونجی خەڵوەتی نەگرت؟ بۆچی وەکو ڕەبەنێک لە دێرێکدا سەری خۆی کز نەکرد؟ کلیلی ڕازەکە لە مەدایە! هەڵبەتە دەبێ هێزێکی بالاتر، بەهێزتر لە هێزی ئەشکەنجەن و ئاگر، بە هێزتر لەو عادەتەی بەدرێژایی بیست دانە ساڵ خووی پێگرتبوو، لە ئارادا بووبێ! . کەواتە بیر و هێزێک هەبووە بالاتر و بەهێزتر، لە هەر کارەسات و قاتوقڕی و برسێتی و ئەشکەنجە و وشکە ساڵی و تاعون و گەڕی وگولیەک و ئەم هەموو دۆزەخە، بیر و هێزێک کە دڵانی ئاوەدان و ئاڕاستە کردووە، کە سەرچاوەکانی ژیانی پیتاندووە و دەوڵەمەند کردووە! دەیسا نموونەیەک، تاقە نموونەیەکم لەو جۆرە بیر و هێزە، لەم سەردەمەی خۆماندا، لە سەردەمی وێرانی و هێڵی ئاسندا... کە هەق بوو بڵێم: "سەردەمی کەشتیانی هەڵمی وهێڵی ئاسندا* ... نیشانبدەن. ڕاستە من مەستم، بەڵام ڕاستی دەڵێم. دەیسا لەم سەردەمەی خۆماندا، تاقە بیرێکم نیشان بدەن، کە بەقەد نیوەی ئەو فکرەی لەو زەمانەدا کاری لە بەشەر کردووە، کار لە خەڵکی ئەم سەردەمەی ئێمە بکات! ئەوسا هەقی خۆتانە بڵێن کە لەم "هەسارەیەدا" لە سایەی خێر و بەرەکەتی ئەم تۆڕەدا کە لە دەس و پێی بەشەر ئالاوە، سەرچاوەکانی ژیان نەیانداوەتە کزی، وشک نەبوون! تکایە دەوڵەمەندی، خۆشگوزەرانی، کەمبوونەوەی قاتوقڕی و برسێتی، خێرایی قیتار و ئەم شتانەم بۆ مەکەن بە نموونە! ڕاستە سەروەت و سامان زۆر بووە، بەڵام بیر و هێز کەمتر بووە! حاڵی حازر هیچ بیرو هێزێک نییە تیرەی بەشەر یەکبخات، پەیوەندییە بەشەریەکان پتەو بکات! بەڵێ، ئێمە هەموومان، یەک بە یەکمان لەوێرانی و گەندەڵیدا نقوم بووین، تا بیناقاقامان لە گەندەڵی ڕۆچووە!... بەڵام وابزانم ئیدی بەسە! کاتی ئەوە هاتووە، سکێ تێر بکەین، کاتی ئەوە هاتووە ئەو سیڤەی بۆ میوانەکانمان ئامادە کردووە بێنین، وانیە میرزادەی بەڕێز؟

لیبدیف، خەریک بوو بەو هەموو درێژدادڕی و هەرزەگۆییەی خۆی، هەندێک لە میوانەکانی بێزار دەکرد(دەبێ ئەوەش بگوترێ کە ئامادەبووان





بەدرێژایی ئەو ماوەیە، لێکدا لێکدا قاپی مەشروبیان هەڵدەپچڕی) بەڵام کە بەو شێوە کوت وپڕ و چاوەڕوان نەکراوە کۆتایی بە قسەکانی هێناو، باسی شێوی هێنایە گۆڕێ، هەموویانی هێور و کەوی کردنەوە. بە خۆی ئەم کۆتاییەی بە "فێڵێکی جوانی، پارێزەرێکی زیرەک بۆ گۆڕینی سەمتی بابەتێک" وەسف کرد. هەموو بە جارێ لە قاقای شادیان دا، گشت میوانەکان گەشانەوە و چالاکی و چەڵەنگییەکی زیاتریان تێکەوت. هەموو لەسەر مێزەکە هەستان، بە بالکۆنەکەدا کەوتنە هاتووچۆ تا بای باڵێک بدەن و سرێ پێیان دەر بکەن و مەستی بەریان بدات. تەنیا کیللەر نەبێت کە لە قسەکانی لیبیدف زۆر پەست و بێزار بوو. لەشوێنی خۆیەوە و بە دانیشتنەوە میوانەکانی یەک بەیەک ڕادەگرت و بە دەنگی بەرز پێی دەگوتن:

– ئەم کابرایە زۆر کۆنەپەرستە، هێرش دەکاتە سەر سەردەمی شارستانیەت و پێشکەوتن، ستاییشی سەدەی دوازدەیەم دەکات، ئەمە هەر هەمووی خۆنواندنە، درۆ و دەلەسەیە، دەنا ئەم لیبدیفە زەڕەیەک دڵپاکی و دەستپاکی لەمەزەبدا نییە. من دەپرسم ئەم خانووەی بەچی و چۆن پێکەوە ناوە؟

جەنەڕاڵ، کە لەو بەرەوە، لەبەردەم گروپێکی دیکەی ئامادەبووانـدا وەستابوو، ڕووی کردە پتیتسن کە بە ڕێکەوت لەناو ئەو گروپەدا وەستابوو، بەدەم داخستنی دوگمەی چاکەتەکەیەوە گوتی:

– من تەنیا یەک ڕاڤەکاری ڕاستەقینەی خەون و مکاشەفاتەکانی قەدیس یوحەنام دەناسی، ئەویش گریگور سیمیونوفیچ بور – مستروڤی ڕەحمەتی بوو. قسەکانی هێندە ئاگرین و پڕ جۆشوخرۆش بوو، دەتگوت ئاگرن و لەدڵی بنیادەم بەردەبن. لەپێشا داوای بوردنی لە ئامادەبووان دەکرد. ئەوجا چاویلکەکەی لەچاو دەکرد، کتێبێکی کۆنی ئەستوری، بەرگ ڕەشی دەکردەوە. ڕدێنێکی درێژی ماش و برنجی بەردابووەوە، پیاوێکی زۆر خێرومەند و دروستکار بوو، لەبری ئەم خێرەومەندییە دوو میداڵی وەرگرتبوو، لە بەرۆکی دابوون، هێندەی دی بەسام و هەیبەت بووبوو. تا





حەزبکەی دەماوەر و زارو زبان جیددی بوو. جەنەڕاڵان، سەری ڕێزیان بۆ ـادەنواند، ئافرەتان کە گوێیان لە دەمو دووی دەبوو، دەبورانەوە. کەچی ئەم برادەرە بەوە کۆتایی بە قسەکانی دێنێ کە مژدەی شێوێکی سارد و سڕ بە میوانەکان بدات! ئەو لەکوێ و ئەم لەکوێ! پتیتسن کە بەدەم بزەوە گوێی بۆ قسەکانی جەنەڕاڵ هەڵخستبوو، لەوە دەچوو بۆ کڵاوەکەی بگەڕێت تا هەڵی گرێت و بڕوات، بەڵام نەیدەتوانی بڕیاری یەکجارەکی بدات. گانیاش، لەناکاودا و، تەنانەت پێش ئەوەی ئەوانی دیکە لەسەر مێزەکە هەستن، دەستی لە خواردنەوە هەڵگرت و پەرداخەکەی دوور خستەوەو، تەمێکی خەمناکی نیشتە سەر سیمای. کە هەموو میوانەکان لەسەر مێزەکە هەستان، ئەو چوو بۆلای ڕوگوژین و لەتەنیشت ئەوەوە دانیشت. ئەگەر یەکێک بەو حاڵەوە دیتبانی، وای وێنا دەکرد هێندە ڕێکن موو بە بەینیانەوە ناچێت. ڕوگوژین، کە لە سەرەتاوە چەند جارێک هەستابوو کە بە هێمنی فیزماڵکی بداتێ و بڕوات. هەنوکە کڕوکپ لێی دانیشتبوو، سەری داخستبوو و لە فکران ڕاچووبوو، لە تۆ وایە بیریچووەتەوە کە بڕوات. بە درێژایی ئەو شەوە، دڵۆپێ مەی نەخواردەوە، بە تەواوەتی لە دەریای بیرکردنەوەدا نقوم بووبوو، ناو بە ناو سەرێکی هەڵدەبڕی، بەوردی دیقەتی یەک بە یەکی ئامادەبووانی دەدا. لەوە دەچوو چاوەڕوانی شتێکی زۆر گرینگ بێ، هەڵبەتە گرینگ بۆ خۆی، بۆیە لێبڕابوو جارێ بە موەقەت ڕۆیشتنەکەی دوابخات. میرزادە، تەنیا دوو-سێ پێکی خوارد بووەوە، کەمێک مەست و هەندێک کەیفی قنج بوو. کە لەسەر مێزەکە هەستا، نیگای لە نیگای یەڤگینی پاڤلوفیچ هەڵنەگوت، یەکسەر بیری کەوتەوە کە گفتوگۆیەکیان لە بە ینابوو دەبوایە تەواوی بکەن، بزەیەکی دۆستانەی بە ڕووی دا دا. یەڤگینی پاڤلوفیچ، سەرێکی بۆ لەقاند و بە ئاماژەی سەر هیپولیتی پێ نیشان دا کە لەسەر تەختەکە لێی ڕاکشابوو، لە غوڕابی خەودا بوو. یەڤگینی پاڤلوفیچ کە لەودەمەدا. بە ڕق و بەدخواییەکی ئاشکراوە دیقەتی دەدا، گوتی:

- میرزادە، بڵێ بۆچی ئەم هەتیوەت داڵدەداوە و خۆی کردووە بە بار





بەسەر تۆوە؟

میرزادە، واقی لەم پرسیارەوڕما.

یەڤگینی پاڤلوفیچ. لەسەری ڕۆیشت و گوتی:

- گریو دەکەم کە پیلانێکی لەژێر سەردایە!

میرزادە گوتی:

- یەڤگینی پاڤلوفیچ، ئەوەندەی من دیقەتم داوە یان بەلای کەمەوە هەستم پێ کردووە، ئەمڕۆکە زیاد لە پێویست بەوەوە گرتووتە، وایە؟

- بە خۆت دەزانی، من لەم ڕەوشە تایبەتییەی خۆما، بەبێ ئەویش، کێشە و دەردەسەری دنیام هەیە، سەرم لەوە سوورماوە لەجیاتیی بیر لە دەردەسەریەکانی خۆم بکەمەوە، نەمتوانیوە لە هەوەڵی شەوێوە تا ئێستا چاوم لە چارەی دزێوی ئەو بگوازمەوە و بیرێک لە خۆم بکەمەوە.

- چارەی زۆر جوانەو...

یەڤگینی پاڤلوفیچ، قۆڵی میرزادەی ڕاکێشا و هاواری کرد:

- سەیری کە، تەماشا، بڕوانە ئەوێندەر!

میرزادە، دووبارە، بە سەرسامی ڕوانییە یەڤگینی پاڤلوفیچ.

پەراوێز:

* - "چمان داوە لە بەیان..": ئەم دیمەنە لە ماوەی "شەوە سپییەکاندا" لە پترسبۆرگ ڕوو دەدات.

* - "هەتاو ئاسمانی نقومی..": یادی بێتە شیعرێکە لە فاوستەکەی گۆتەدا هاتووە.

* - "ئابلوقەی قارس...": ئابلوقەی قارس لە کاتی شەڕی ١٨٤٥-١٨٥٥دا، بەوە تەواو بوو، کە قەڵاکە ڕادەستی جەنەراڵ مورافییڤ بوو لە ٦/ت٢/ ١٨٥٥دا، چونکە گەمارۆ دراوان، ئازووقە و تەقەمەنییان هیچ نەما.

* - "سەردەمی کەشتیانی هەڵمی و هێڵی ئاسن..": ڕەنگە ئەم جۆکە پەیوەندییەکی فۆنەتیکی بە وشەی ڕووسی بوروک و (مانای چروکی وقەڵبییە) و وشەی بوروکهود (مانای کەشتیی هەڵمییە) هەبێ، کە تەرجەمە ناکرێن.

## فەسڵی پێنجەم

هیپولیت، کە لە ئاخروئۆخریی وتارەکەی لیبدیفدا یەکسەر خەوی لێکەوتبوو، هەنوکە لەپڕ، وەکو ئەوەی یەکێک دەرزییەکی پێدا کردبێت، لەخەو ڕاپەڕی، ڕاجفری، دانیشت و، خۆی دا بەسەر ئانیشکێکیدا، بە جۆرە نیگەرانییەکەوە ڕوانییە دەوروبەری خۆی و ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا. کە ئەوانەی دەوروبەری خۆی بینی، جۆرە خەمێک دایگرت، بەڵام کە بەتەواوەتی وەخۆهاتەوە و بەهۆش هاتەوە، ئەو خەمە گۆڕا بۆ جۆرە ترسێک، دەستی میرزادەی گرت و بە خەمینی گوتی:

- چدییە؟ دەڕۆن؟ تەواو؟ هەموو شتێک بڕایەوە؟ هەتاو هەڵهات؟ توخوا سەعات چەندە! خەوم پێیا کەوت. زۆر خەوتم؟

ئەم ڕستەیەی دوایی، بە جۆرە نائومێدییەکی ئەوتۆوە گوت، لە تۆ وایە دەرفەتێکی ئەوتۆی لەدەست چووە، کە سەراپای ژیان و چارەنووسی پێوە بەندبووە.

یەڤگینی پافلوڤیچ وەڵامی دایەوە:

- حەوت هەشت دەقیقەیەک بوو نووستبووی.

هیپولیت، بە تامەزرۆییەوە تەماشای کرد، بۆ چەند ساتێک لە فکران ڕاچوو، ئەوسا گوتی:

- ئا... بەس!... کەواتە من.

هەناسـەیەکی ئاسـودەیی هەڵکێشـا، وەکـو ئەوەی بـارێکی قـورس لـە سەرشـانی لاچووبێـت. بـۆی دەر کەوت کـە "هـەموو شـتێک تەواو نـەبووە". هێشتا بەیانی نەداوە، هەتاو هەڵنەهاتووە. میوانەکان نەڕۆیشتوون، بـەڵکو بۆ شـێو خـواردن هەسـتاون، ئەوەی تەواو بـووە و بـڕواتەوە، چەنەبازیەکـەی لیبـدیفە و بـەس. بزەیـەکی بـۆ کـرد، دوو پەڵـەی سـوور وەکـو نیشـانەی نەخۆشی سیل کەوتنە سەر کوڵمەکانی. هەنگێ بە تەوسەوە گوتی:

– یـەڤگینی پـافلوڤیچ، وا دیـارە تـۆ دەقیقـە بـە دەقیقـە ژماردووتـە کـە مـن چەند خەوتووم! بە درێژایی ئەمشەو، ئەوەندەی ئاگام لێبوو، چاوت لە من نەگواستەوە..

ئەوسـا، چـارەی دا بـە یـەکا. برۆکـانی وێکهێنـانەوە، بـە جووڵـەی سـەر، ئامـاژەی بـۆ ئەو شـوێنە کـرد کـە پـارفیون سـیمیونوفیچ لەسـەر خوانەکـە دانیشتبوو، بەچپە گوتی:

– ئاهـ ئەوە ڕوگوژینە! ئێستا خەوم پێوەی دەبینی...

ئەوسـا، وازی لـەم بابەتـە هێنـا، چـووە سـەر بابـەتێکی دیکە و لەسـەری ڕۆیشت و گوتی:

– ئا... بەڵێ، ئەرێ خەتیبەکـەمان کێوە چوو؟ کوا لیبدیف؟ لـە خوتبەکـەی بـووەوە؟ باسـی چـی دەکـرد؟ میـرزادە ڕاسـتە کـە تـۆ ڕۆژێ لـە ڕۆژان گوتووتە لەوەیە "جوانی" دنیا ڕزگاربکات؟

ئەوسـا هـەموو ئامـادەبوانی بـە شـایەد گـرت و گـوتی: "جەماعـەت ئێـوە بەشایەد بن کە میرزادە دەڵێت جوانی دنیـا ڕزگاردەکات! بـەڵام مـن دەڵێم ئەگەر میـرزادە بووبێ بـە خـاوەنی ئـەم هـەموو گەشـبینییە، ئـەم هزرو بیرە جوانـە، ئەمـە خـۆی لەخۆیدا نیشـانەی ئەوەیـە کـە ئاشـق بـووە! بـە ڕێزینـە میرزادە ئاشقە. هەر کە هاتە ژوورەوە هەستم پێکرد! میـرزادە شـەرم مەکە، بـا بـەزەییم پێتـا نەیـەتەوە! . چ جـوا نیـەک دنیـا ڕزگاردەکـات؟ کولیـا ئـەم شتانەی بۆ گێڕامەوە.. ئایا تۆ فەڵەیـەکی ئیمانداریت؟ کولیـا دەڵێت کـە خـۆت بە فەڵەیەکی ئیماندار دەزانیت.

میـرزادە، قـەدەرێ لێـی ورد بـووەوە و هـیچ بەرسـڤێکی نـەدایەوە.

هیپولیت، لەناکاودا، بە زمانێکی زبر، وەکو ئەم سەرنجەی بیرچووبێت، گوتی:

– وەڵامم نادەیتەوە؟ لات وایە زۆرم خۆش دەویێ؟

– نا، لام وا نییە. دەزانم کە خۆشت ناوێم.

– چۆن؟ تەنانەت دوای ڕووداوەکەی دوێنێش؟ خۆ دوێنێ دڵسۆزانە ڕەفتارم دەگەڵ کردیت.

– دوێنێش دەمزانی کە خۆشت ناوێم.

– مەبەستت ئەوەیە کە گوایە حەسوودیت پێ دەبەم، بەغیلیت پێدەم؟ تۆ هەمیشە گومانی ئەوەت لێ کردووم، هەنوکەش هەمان گومانم لێ دەکەیت، بەلام... باشە من بۆچی باسی ئەمەت دەگەڵ دەکەم؟ حەزم لە شامپانیایە. کیللەر، تۆزێ شامپانیام بۆ تێ بکە! بۆم تێدەکەی؟

میرزادە، پەرداخەکەی لەبەردەمی لابرد وگوتی:

– هیپولیت بەسە، زۆرت خواردووەتەوە. نایەڵم لەوەی پتر بخۆیتەوە...

هیپولیت، ملی دا، بەدەم حەواس پەرتیەوە گوتی:

– هەق بە تۆیە، ڕاست دەکەی... ئەگەر زیاتر بخۆمەوە لەوەیە دوایی بڵێن من... بەلام گوێم لەوە نییە چ دەڵێن، بە قەد نووکی دەرزیەک بەلامەوە گرینگ نییە چ دەڵێن!... وا نییە؟ بۆ خۆ چ دەڵێن با بیڵێن، بە کەیفی دڵی خۆیان، وانیە میرزادە؟ چ زەرەرێک لەوە دەکەین کە خەڵکی "پاشان" چ دەڵێن؟... کێ لە ئێمە لە بیری ئەوەدایە کە دوایی، سبەی چ ڕوو دەدات؟... بەهەرحاڵ من تازە لەخەو بێدار بوومەتەوە. چ خەونێکی سەیرم دەبینی! ئێستا دیسان بیرم کەوتەوە. میرزادە، هیوادارم تۆ خەونی وا نەبینیت. هەرچەندە لەوەشە بە ڕاستی خۆشم نەوێی. بەهەرحاڵ، ئەگەر کەسێک کەسێکی خۆش نەویست، مەرج نییە زەرەری ئەو کەسەی بوێ، وانییە؟ بەلام ئەم هەموو پرسیارەم لەپای چییە؟ کوا دەستتم بدەیە با بەگەرمی بیگوشم. بەڵێ، ئە ئاوها... ئەوەتا تۆ وێڕای هەموو شتێک دەستت هێناوە، کەواتە ئەرخایەنیت کە دڵسۆزانە، ڕاستگۆیانە دەیگوشم... زۆر باشە، لەوەی پتر ناخۆمەوە سەعات چەندە؟ بەلام پێویست ناکات پێم بڵێن سەعات

چەندە. بە خۆم دەیزانم! کاتی هاتووە. ئەوە چییە؟ دەڵێی لەو گۆشەیەدا شێو دادەنەن؟ کەواتە ئەم مێزە چۆڵە؟ زۆر باشە... بەڕێزینە من... بەڵام هیچ کەسێک لەو خەڵکە گوێ ناگرێت... میرزادە من گەرەکمە وتارێک بخوێنمەوە. ڕاستە شێوەکە گرینگترە، بەڵام...

هیپولیت، بەدەم ئەو قسەیەوە، کوتوپڕ، بە شێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو، زەرفێکی ئیداری کە مۆرێکی گەورەی سووری پێوە بوو، لە بەرکی دەرهێنا و لەسەر مێزەکە، لەبەردەم خۆی دانا.

ئەم ڕەفتارە کوتوپڕە، کارێکی زۆری لە میوانەکان کرد کە خۆیان "ئامادە دەکرد" بۆ... نەک بۆ خوێندنەوە. یەڤگینی پاڤلوفیچ، ڕاپەڕی و لەسەر کورسییەکەی خۆی هەستا: گانیا بەلەز لە مێزەکە نزیک بووەوە. "ڕوگوژین"ش بەرە و مێزەکە چوو، بەڵام بە تووڕەیی و بێزارییەکی ئاشکراوەوەک بڵێی دەیزانی چ ڕوودەدات. لیبدیف کە لە مێزەکەوە نزیک بوو، بە نیگایەکی پرسیار ئامێزەوە نزیکتر بووەوە بە جۆرێ چاوی بڕییە زەرفەکە، وەک بڵێی بیەوێ مەزەندە لە زەرفەکە بدات و بزانێ چی تیایە. میرزادە، بە دڵتەنگی پرسی:

- ئەمە چییە؟

هیپولیت گوتی:

- هەر کە خۆر هەڵهات، دەگەڵ یەکەم گزنگی خۆردا، میرزادە وەکو قەولم داوە دەنووم. بەچاوی خۆشت دەیبینی، ئەگەر وانەبوو، گلەییم لێبکە!

ئەوجا بە پەستی چاوێکی بە هەموو ئامادەبووانداگێڕا و وەکو ئەوەی گشتیان بدوێنێ گوتی:

- بەڵام... بەڵام... یانی ئێوە لاتان وایە ناتوانم ئەم زەرفە بکەمەوە؟

میرزادە. هەستی کرد، هیپولیت سەراپا دەلەرزێت. بە ناوی هەموانەوە گوتی:

- هیچ کەسێک لە ئێمە بیری لە شتی وا نەکردووەتەوە.. بۆچی وا بیر دەکەیەوە؟ ئەدی ئەم خەیاڵە سەیرە چییە کە دەتەوێ وتارمان بۆ بخوێنیتەوە؟ چ خێرتە هیپۆلیت؟

ئەوانەی دەوروبەریشی کەوتنە پرسیار:

- خێرە؟ چییەتی؟

هەموو لە دەوری هیپولیت خڕبوونەوە، هەندێکیان هێشتا پارووەکانیان ــە زارادا بوو. زەرفەکە و مۆرە سوورەکەی سەری، وەکو موگناتیس، میوانەکانی ڕاکێشابوو.

هیپولیت ڕووی کردە میرزادە و گوتی:

- میرزادە، من دوێنێ بە خۆم ئەمەم نووسی، یەکسەر دوای ئەوەی بیرام کە بێم و لێرە بژیم، دەستم بە نووسینی کرد. یەک شەو و ڕۆژی تەواو خەریکی نووسینی بووم، ئەم بەیانیە تەواوم کرد. دەمە و بەیانی خەوێکم بینی...

میرزادە، بەشەرمێکەوە قسەکەی پێبڕی:

- ئەگەر ئەم خوێندنەوەیە بخەیتە سبەینێ باشتر نییە؟

هیپولیت، بەدەم پێکەنینێکی گرژ و تەوسامێزەوە بەرسڤی دایەوە:

- سبەینێ "کات بەسەر دەچێ، زەمان ئاخر دەبێ". بەهەرحاڵ خەمت نەبێ، مەترسە خوێندنەوەی ئەم وتارە هەر چل دەقیقەیەک، ئەوپەڕەکەی سەعاتێک دەبات. تەماشا بزانە میوانەکان چۆن خڕبوونەتەوە و چەندیان بەلاوە مەبەستە. تەماشا چۆن هەموو، یەک، بە یەک خڕبوونەتەوە و چاویان بڕیوەتە مۆری سەر زەرفەکە. ئەگەر وتارەکەم بەو جۆرە لە زەرفێکی مۆرکراو دانەنابا، بەو شێوەیە سەرنجی ڕانەدەکێشان، گیانی فزولیەت و لاپرەسەنی بێدار نەدەکردنەوە. ها ها! ئەوەیە ئەفسوونی ڕاز و نهێنییان!... ئەوسا بەدەم پێکەنینە تایبەتییەکەی خۆیەوە، چاوە پرشنگدارەکانی بە ئامادەبوواندا گێڕا و گوتی:

- بەڕێزینە زەرفەکە بکەمەوە یان نا؟ ڕازێک! نهێنی یەک! میرزادە لەبیرت ماوە کێ گوتی کە "ئیدی کات بەسەر دەچێ، دەبێ بە ئاخر زەمان"؟ ئەو فریشتە گەورە بە هێزەی کە خەون و مکاشەفاتەکەی یوحەنا باسی دەکات.

یەڤگینی پاڤلوفیچ، بە نیگەرانی و ڕووگرژیەکی ئەوتۆوە کە یەکسەر سەرنجی ئامادەبووانی ڕاکێشا، گوتی:

- باشتر وایە نەیخوێنیتەوە!

میرزادەش، دەستی خستە سە زەرفەکە و گوتی:

- مەیخوێنەوە!

یەکێک لەولاوە هەڵی دایە:

- چی؟ ئێستا دەیخوێنیتەوە؟ وەختی خوێندنەوە نییە! گەرەکمانە شێو بخۆین.

یەکێکی دی پرسی:

- وتارە؟ بۆ گۆڤارە؟

کەسی سێیەم گوتی:

- ڕەنگە بابەتێکی ناخۆشیش بێ.

ئەوانی دی پرسیان:

- جارێ مەسەلەکە چییە، بابەتەکە دەربارەی چییە؟ پێدەچوو، ڕەفتارە ترسامێزەکەی میرزادە، (هیپولیت)یشی نیگەران کردبێت! بۆیە بەدەم بزەیەکی کاڵەوە کە نیشتبووە سەر لێوە شینەکانی، بە جۆرە ترسێکەوە، بە ئەسپایی بە میرزادەی گوت:

- یانی نەیخوێنمەوە؟..

ئەوسا نیگایەکی هەر هەموویانی کرد و بەدیقەت ڕوانییە سەروچاویان. هەستی دەکرد، پێویستی بەوەیە گرێی دڵی خۆی بکاتەوە. بەئەسپایی دووبارەی کردەوە:

- یانی، ئێستا نەیخوێنمەوە؟

دووبارە ئاوڕی لە میرزادە دایەوە و پرسی:

- چییە... دەترسیت؟

میرزادە، بەدەم ڕەنگ بزرکانەوە بەرشڤی دایەوە:

- لەچی دەترسم؟

هیپولیت، لەپڕ، وەکو ئەوەی کارەبا لێی دابێت، لە جێی خۆیەوە ڕاپەڕی و هاواری کرد:

- کێ دراوێکی بیست کوپێکی پێیە؟ ئەگەر هەر دراوێکی دیکەش بێ،





قەیدی نییە، دەبێت.

لیبدیف بەلەز پارچە دراوێکی دەر هێنا و گوتی:

- فەرمووا!

لیبدیف، وای بەخەیاڵدا هات کە ڕەنگە یارۆ شێت بووبێ. هیپولیت، یەکسەر هاواری کرد:

- ڤیرا لوکیانوڤنا! وەرە ئەم دراوە بگرە، لە سەر مێزەکە هەڵی دە، ئەوسا بروانە ئاخۆ بە شێرا کەوتووەتەوە یان بە خەتا. ئەگەر شێر بێت دەیخوێنمەوە!

ڤیرا، بە ترس و دوودڵیەوە، ڕوانییە پارچە دراوەکە، ئەوجا ڕوانییە هیپولیت و پاشان تەماشای بابی کرد، ئەوجا سەری بردە دواوە، گوایە نابێ دراوەکە بدینێ، خوا بەختەکی دراوەکەی هەڵدایە سەر مێزەکە و خوا و ڕاسان بە شێرا کەوتەوە.

هیپولیت، وەکو ئەوەی ئەم تیروپشکە، بە جارێ ڕوخاندبێتی، لەبن لێوانەوە گوتی:

- دەبێ بیخوێنمەوە.

ئەگەر فرمانی خنکاندنی خۆیشی بیستبا هەر ئەوەندە، ڕەنگی دەبزرکا و دەپەشۆکا.

دوای ساتێک بێدەنگی، بەدەم هەڵ لەرزینەوە گوتی:

- ئاخر یانی چی؟

هیپولیت، کە بە هەمان ئارەزووەوە کە گرێی دڵی بکاتەوە، تەمەشای ئامادەبوانی دەکرد و بە زمان حاڵی نیگا لێیان دەپاڕایەوە گوێی لێبگرن، پرسی:

- ئایا بە ڕاستی، تیروپشکی مەرگی خۆمم ڕاکێشاوە؟ ماقوولە؟ ئەوسا لەناکاودا، بە حیرەتێکی ڕاستگۆیانەوە. ڕووی کردە میرزادە و هاواری کرد:

- ئەمە یەکێکە لە حاڵەتە دەروونییە سەیرەکان میرزادە!

لەکاتێکا کە زیاتر وەخۆ دەهاتەوە و پتر دەبوژایەوە، دووبارە گوتیەوە:

- میرزادە، ئەمە حاڵەتێکی دەگمەنە. لە بیرت نەچێ، لای خۆت تۆماری





بکـە، مـادامێکی، وەکـو بیسـتوومە، خـەریکی کـۆکردنەوەی زانیـاری و بەڵگەنامانی لەسەر حوکمی ئیعدام... وایان بۆ گێڕاومـەتەوە، هاهـا!... هـەموو شتێک پووچە!

بەدەم ئەو قسانەوە، لەسەر تەختەکە دانیشت، هـەر دوو ئانیشکی دادایـە سـەر مێزەکـە، سـەری لـەنێو هـەر دوو دەسـتی نـا. پـاش کـەمێک لـەناکاوا سەری هەڵبڕی و لەسـەری ڕۆیشت:

- نـەک هـەر پووچـە، بگرە مایـەی شەرمەزاریشـە! جا مـن هـەقم چییـە، چ زەرەرێکم کردووە، مایەی شەرمەزارییە یان نا، بەجار بەجەهەنەم! ..

ئەوسا، وەکو یەکێک ملی بۆ قەرارێکی کوتوپڕ دابێت، گوتی:

- بەڕێزینـە، بەڕێزینـە... مـن زەرفەکـەم دەکـەمەوە،و... و... کەسـیش ناچـار ناکەم کە گوێ بگرێت!

لـە شـپرزەییدا، هـەر دوو دەسـتی دەلـەرزین، بـە دەسـتانی لـەرزۆک زەرفەکـەی هـەڵپچڕی، چەنـد پـەڕە کاغـەزێکی نامەنووسـینی، نووسـراو بـە خەتێکی سـفت و وردی دەرهێنـا، لەسـەر مێزەکە، لەبـەردەم خۆیـدا دایـنان و ڕێکی خستن. هەندێ لە ئامادەبوان، بە ڕووگرژی کەوتنە پرتاندن:

- ئەمانە چییە؟ دەیەوەێ چیمان بۆ بخوێنێتەوە؟

ئەوانـی دی بێـدەنگ بـوون، بـەڵام هـەموو لـە جێـی خـۆ دانیشـتن و بـە چـاوانی کونجکـاوەوە تەمەشـای ئەویـان دەکـرد. لەوە دەچـوو بەتـەمابن گوێیـان لــە شــتێکی نائاســایی ببێــت. ڤیــرا لەپشــت کورســییەکەی باوکیەوەوەسـتابوو، بـە ڕادەیـەک دەترسـا کـە بـەری فرمێسـکی خـۆی بـۆ نەدەگیرا. شپرزەیی کولیاش چیوای لەو کەمتر نەبوو، بەڵام لیبدیف کە تـازە دانیشـتبوو لـەناکاوا هەسـتا، چەنـد مـۆمێکی داگیرسـاوی لـە هیپولیـت نزیـک کردەوە، تا بتوانێ وتارەکەی بە باشی بخوێنێتەوە.

هیپولیت گوتی:

- بەڕێزینە، ئەمە.. هەنوکە بەخۆتان دەزانن کە مەسەلەکە چییە..

ئەوسا یەکسـەر، بێ هیچ پێشەکییەک دەستی بە خوێندنەوە کرد:

"ڕوونکردنەوەیەکی پێویست". دەستپێک: "دوای مـن خـوای دەکرد، تۆفـان

هەڵدەسا"*، بەڵام زوو بە زوو وەکو یەکێک لەپڕ چزەی لێهەستێ بە خۆی گوت: ئۆف... چۆن ئەم دروشمە گەوجانەیەم کردووە بە دەستپێکی وتارەکەم؟.

ئەوسا ڕوی کردە ئامادەبووان و گوتی:

- بەڕێزینە گوێ بگرن! .. دڵنیاتان دەکەم کە لەگینە هەر هەموو ئەم بابەتە، لەدوا حیسابدا، پووچ و بێبایەخ بێت، لە کۆمەڵە تورەهاتێک زێدەتر هیچی دی نەبێت!... تەنیا چەند بیرەوەریەکە و بە خەیاڵما هاتووە و بە پەیڤ و قەڵەمم سپاردوە... ئەگەر بەتەمای ئەوەن کە شتێکی نهێنی یان... یاساغ و قەدەغەی تیابێ، یانی...

گانیا، قسەکەی پێبڕی و گوتی:

- باشتر وایە بێ پێشەکیی و مێشەکی بیخوێنیتەوە...

یەکێکی دی گوتی:

- خەریکە پێچە بەدەورمان دەگەڵ دەکات.

ڕوگوژین کە تا ئەو کاتە متەقی لەخۆ بڕیبوو، هەڵی دایە:

- ئەمە ئەوپەڕی هەرزەگۆیی و چەنەبازیە!

هیپولیت، لەناکاوا تەمەشایەکی کرد، هەر کە نیگایان لێکدی هەڵەنگوت. ڕۆژگوژین، ژارخەنێکی تاڵی بە ڕوویا داو، بە ئەسپایی ئەم گوتە سەیروسەمەرانەی پێگوت:

- کوڕۆ، واهی بەرخورد دەگەڵ ئەم مەسەلەیەدا ناکرێت..

هەڵبەتە هیچ کەسێک لە مانای ئەو قسانەی ڕوگوژین نەگەیی، بەڵام وێڕای ئەوەش کارێکی ئەوەندە سەیری کردە سەر ئامادەبووان، لە تۆ وایە بیرێکی هاوشێوەی لە مێشکی هەموویاندا هاڕوژاند، بەڵام ئەو ڕستەیە کارێکی ترسناکی کردە سەر هیپولیت، کارێکی ئەوتۆ کە یەکسەر کەوتە لەرزین، لەرزینێکی هێندە بە هێز کە میزادە باوەشی بۆ گرتەوە، تا بیگرێتەوە و نەیەڵێ بکەوێت، ئەگەر نەحەپەسابا و دەنگی لە ئەوکیا نەگیرابا، بێگومان هاواری دەکرد. یەک دەقیقەی تەواو زاری چووە کلیلەو نەیتوانی تاقە وشەیەک بدرکێنێ. چاوی لە ڕوگوژین نەدەگواستەوە و زۆر

بە زەحمەت هەناسەی دەدا. سەرەنجام، بە هانکە هانک و بەزەحمەتێکی زۆر گوتی:

- کەواتە تۆ... بوویت... تۆ بوویت کە...

ڕوگوژین، بەسەرسامی پرسی:

- من بووم کە چی؟ چیم دەکرد و لەکوێ بووم؟

بەڵام هیپۆلیت، سووری سوور بووبووەوە، بە ڕقێکی شێتانە و کوتوپڕەوە، وەکو هۆڤیەکی دڕندە هاواری کرد:

- کەواتە "تۆ" بوویت کە هەفتەی ڕابردوو، دوای سەعات یەکی شەو، دوای ئەو ڕۆژەی کە سەرم دایت، هاتبوویتەماڵەکەم. ئەوە "تۆ" بوویت! ئیعتراف بکە: تۆ بوویت یان نا؟

- هەفتەی ڕابردوو؟ شەوێ؟ ئەوە تێکچوویت کوڕۆ؟

" کوڕۆ" دیسان، نزیکەی دەقیقەیەک بێدەنگ بوو، ئەوجا کەڵەموستی نایە سەر تەوێڵی و بە ئاشکرا دیار بوو کە دەیوسیت شتێک وەبیر خۆی بێنێتەوە، بەڵام لەپڕ بزەیەکی کاڵ، نیشتە سەر لێوی، جۆرە دوو دڵیەک ئاوێتە بە فێڵ و سەرکەوتن، لەودیو ئەو بزەیەوە سەرەتاتکێ ی بوو. ئەنجام بە ئەسپایی، بەڵام بە باوەڕو قەناعەتی تەواوەوە، گوتی:

- تۆ! "تۆ" هاتیت بۆ ژوورەکەم، یەک سەعاتی تەواو بگرە زیاتر لە سەعاتێک، لەسەر کورسییەکی نزیکی پەنجەرەکە، بێ ئەوەی متەقت لێوەبێت، دانیشتیت: لەنێوان سەعات دوازدە و دووی پاش نیوەشە و بوو. پاشان هەستایت و پێش سەعات سێ ڕۆیشتی... بەڵێ، خۆتی خۆت بوویت! بۆچی دەتوویست بمترسێنی؟ بۆچی بۆ عەزابدانی من هاتبوویت؟ من هۆی ئەمە نازانم... بەڵام تۆ بوویت!

لەناکاوا، گڕی ڕقێکی بێپایان، لەچاوانیەوە پرشنگی دا، بەڵام هێشتا ترسەکەی نەڕەوی بووەوە و دەلەرزی، گوتی:

- بەڕێزینە، هەر ئێستا هەموو شتێکتان بۆ دەردەکەوێ... من... من... گوێ بگرن...

ئەوسا بەلەز کەوتە ڕێکخستنەوەی کاغەزەکانی بەردەمی، کە لە شوێنی

خۆیان جوولا بوون. کاغەزەکان بە دەستە لە ڕزۆکەکەیەوە، دەلەرزین، ماوەیەکی پێچوو تا ڕێکی خستنەوە.

ڕوگوژین، بەدەم ورتەورتێکی گۆنگەوە، لەبن لێوانەوە گوتی:

- ئەمە یان شێت بووە یان وڕاوە دەکات...

ئەنجام خوێندنەوە دەستی پێ کرد. نووسەری وتارەکە، کە لە بیری کەسدا نەبوو وتار بنووسێت، لە پێنج دەقیقەی یەکەما، زۆر شپرزە بوو، قسەکانی پچڕ پچڕ و بێ سەروبەر بوون، لەبەر هانکە هانک بەجوانی بۆی نەدەخوێنرایەوە، بەڵام بەرەبەرە دەنگی باش بوو، هێور بووەوە، توانی ماناو مەبەستی ئەو بابەتە بگەیەنێت کە دەی خوێندەوە. تەنیا جار جارێک کۆکەیەکی توند دەیگرت و خوێندنەوەکەی پێدەبڕی. کە گەیشتە نیوەی وتارەکە دەنگی تەواو کەرخ بوو. سات بە ساتیش پتر جۆشی دەسەند و گەرم تر دەبوو، گوێ بە گوێی ئەوەش، هەستی هاوخەمی گوێگرەکانی بەرزتر دەبووەوە.

ئەمەش دەقی تەواوی وتارەکەیە

" ڕوونکردنەوەیەکی پێویست"

"کە من مردم، خوای دەکرد لافاو هەڵدەستا "

" دوێنێ بەیانی میرزادە هات بۆ لام پێشنیازی بۆ کردم کە بێم و، لەلای ئەو و، لە ڤێلاکەی ئەودا بژیم. دەمزانی کە بە ڕاستێتی و سوورە لەسەر ئەمە. دڵنیا بووم کە بێپەردە پێم دەڵێت "ئەگەر لێرە، لە ناو خەڵکی و دارودرەختاندا بمرم باشترە "، بەڵام ئەمڕۆ وشەی "بمرم"ی بەکار نەهێنا، بەڵکو "بژیم"ی بەکارهێنا، بەهەرحاڵ بۆ یەکێکی وەکو من هەر دوو حاڵەتەکە هەر یەکە. لێم پرسی مەبەستی لەوشەی "دارو درەختان" چییە کە ئەوەندە دووپاتی دەکاتەوە و سەرمی پێ دەیەشێنێ. زۆرم پێ سەیر بوو کە وەڵامی دامەوە گوایە خۆم ئەو ئێوارەیە گوتبووم بۆیە بۆ پاڤلوفسک هاتووم تا بۆ دواجار دارو درەختان بدینم، بەڵام کاتێ پێم گوت، بۆ من هیچ فەرقێک ناکات چ لەژێر درەختاندا بمرم چ بەدەم تەماشاکردنی ئەو دیوارە خشتەی بەرانبەر پەنجەرەکەمەوە بمرم، ئەوپەڕەکەی وا دوو





هەفتەی دی ژیام، کە دوو هەفتە ئەم هەموو شەڕەشەق و زەحمەتە ناهێنێ یەکسەر هاتە سەر بۆچوونەکەی من و باوەڕی بە قسەکەم هێنا. بەهەرحاڵ، ئەو قەناعەت و باوەڕی وابوو کە سەوزایی و هەوای پاک، بۆ سەلامەتی بەدەنی من زۆر باشە، بە ڕادەیەک باشە لە گینە خەونە ئاجڕو باجڕەکانم، ئالۆزییە دەروونیەکانم کەمتر و سووکتر بکاتەوە و لەوەیە ئارامیەکم پێ ببەخشن. هەمدیس بەرپەرچم دایەوە و بەدەم پێکەنینەوە پێم گوت کە وەکو بابایەکی مەتریالیست قسان دەکات. ئەویش بەدەم بزە باوە هەمیشەیەکەی خۆیەوەوەلامی دامەوە کە هەمیشە کەسێکی مەتریالیست مەزەب بووە. هەڵبەتە بە حوکمی ئەوەی پیاوێک بوو درۆی لە مەزەبا نەبوو، لە ملت دابا درۆی نەدەکرد، ئەو قسەیەی مانای خۆی هەبوو، هەر وا بە هەوەنتە ئەو قسەیەی بە بادا نەدابوو. بزەیەکی زۆر جوان و دڵگیری هەبوو. زۆر بەوردی تەمەشام کرد. نازانم ئێستا خۆشم دەوێ یان ڕقم لێیەتی. هەنوکە دەرفەتی ئەوەم نییە سەری خۆم بەوەلامی ئەو پرسیارەوە بیەشێنم، بەلام ئەوەندە دەزانم گێچی ئەو ڕقەی کە لە ماوەی پێنج مانگی ڕابردوودا، بەرانبەر بەو هەمبوو بە ئاشکرا لەم مانگەی دواییدا، هاتبووە خوارەوە کێ دەزانێ، لەوەیە من هەر بۆ دیتنی ئەو بۆپاڤلوفسک هاتبم؟ بەلام بۆچی ژوورەکەی خۆم جێ هێشتووە؟ کەسێک کە بە مەرگ مەحکوم بێ، نابێ شوێنی خۆی بەجێ بێڵێ. جا ئەگەر من بڕیاری خۆم نەدابا، ئەگەر (بەپێچەوانەوە) ملم بۆ ئەو بیرۆکەیە دابا کە چاوەڕوانی دوا نەفەسی خۆم بکەم، چاوەڕوانی مەرگی خۆم بکەم، بێگومان هەنگێ، بە هیچ نرخێ لە ژوورەکەی خۆم وەدەر نەدەکەوتم و بەوە قایل نەدەبووم لەسەر قسەی وی بێم لێرە، لەلای ئەو، لە پاڤلوفسک "بمرم."

"من دەبێ پەلە بکەم، تا ئەم "ڕوونکردنەوەیە" بەر لە ئەنگوتنی بەیان تەواو بکەم. چونکەوانەبێ، کاتی دووبارە خوێندنەوە و ڕاستکردنەوە و بژارکردنیم نابێت. سبەینێ کاتێ بۆ میرزادە و دوو سێ شایەدی دیکەم، خوێندەوە کە هیوادارم لە دەڤ وی پەیدایان بکەم، هەنگێ پێیدا دەچمەوە. جا بەو پێودانگەی کە تاقە وشەیەکی درۆ نانووسم، تەنیا حەقیقەتی خاڵیسە

ـ بالآ و ڕەها دەنووسم، زۆرم بەلاوە گرینگە، کاتێ بۆیان دەخوێنمەوە بزانم چ هەستێکم لا دروست دەبێ، هەست بەچی دەکەم. من هەڵە بووم، نەدەبوو ئەم وشانە: "حەقیقەتی بالآ و ڕەها" بنووسم، چونکە بەبێ ئەو وشانەش، ژیانێکی دوو هەفتەیی ئەوە نایەنێ درۆی لەپێناودا بکرێت، چونکە دوو هەفتە زننەگی هیچ مانایەک ناگەیەنێ. باشترین بەڵگەش بۆ ئەوەی کە من جگە لە حەقیقەت هیچی دی نانووسم ئەوەیە: "پەراوێز – هەلبەتە نابێ ئەوە لە بیربکەم: کێ دەڵێت من لەم دەمەدا شێت نیم، یان لە هەندێ دەماندا شێت نیم؟ وەکو بیستوومە، ئەوانەی نەخۆشی سیلیان هەیە، کە دەگەنە دوا قۆناغی نەخۆشییەکەیان، لە هەندێ ساتدا تێکدەچن، تووشی شێتبوونی کاتی دەبن. پێویستە سبەینێ کاتێ ئەم وتارە دەخوێنمەوە، لە سیمای گوێگرەکاندا بۆ وەلامی ئەم پرسیار و مەسەلەیە بگەڕێم. ئەمە مەسەلەیەکە دەبێ بەوپەڕی وردی و دروستی وەلام بدرێتەوە چونکە بەبێ ئەمە پیاو هیچی بۆ ناکرێت".

" پێم وایە شتێکی زۆر تورەهاتم نووسیوە، بەلام وەکو گوتم ماوەم نییە راستی بکەمەوە، پێیدابچمەوە. ئەمە جگە لەوەی بەڵێنم بە خۆم دابوو کە تاقە یەک وشەی ئەم نووسینە نەگۆڕم و دەستکاریی نەکەم، ئەگەر هەست بکەم هەر پێنج دێڕ و جارێک خۆم بەدرۆ خستووەتەوە، دژی خۆم وەستاومەتەوە. دەمەوێ سبەینێ، لە کاتی خوێندنەوەی ئەم وتارەدا، لە لۆژیکی هزرینی خۆم دڵنیابیم کە ئاخۆ درست بوون یان نا. تێبگەم کە ئەو بیرانەی لە زەرفی ئەم شەس مانگەدا و لەم ژوورەدا پێیانەوە خەریک بووم حەقیقەتی ڕەها بووە یان وڕاوەی بێ بنجوبناوان.

"ئەگەر دوو مانگ لەمەپێش ناچاربام وەکو هەنوکە ژورەکەم بەجی بێڵم، مالاوایی لە دیوارەکەی مالی مایر بکەم، دلنیام کە خەفەتم دەخوارد، بەلام حالی حازر، وێڕای ئەوەی دەبێ ئەم ژووره و ئەم دیواره بۆ "هەتا هەتایە! " بەجێ بێڵم، هەست بە هیچ ناکەم. ئەمە مانای وایە، بە هەموو بوونمەوە ئەو قەناعەتەم لا چێبووه کە ژیانی دوو هەفتە ئەوە نایەنی پیاو خەفەتی بۆ بخوات و پێویست بەوە ناکات لەو ماوەیەدا خۆی بە هیچ هەست و

سۆزێک بسپێرێت و دڵی خۆی پێخۆش بکات. لەوە دەچێت حاڵی حازر ئەو قەناعەتە تێکڕای هەستەکانمی کۆنترۆڵ کردبێت، بەڵام ئاخۆ ئەمە دروستە؟ ئەمە ڕاستە کە سروشتی من بە تەواوەتی ڕام بووە؟ ئەگەر لەم ساتەدا بیانخستبامە بەر ئەشکەنجە بێگومان هاوارم دەکرد، نەمدەگوت پێویست ناکات هاوار بکەم و هەست بە ئازار بکەم چونکە تەنیا دوو هەفتەم لە ژیاندا ماوە.

"بەڵام ئاخۆ ڕاستە من تەنیا دوو هەفتەم لە ژیاندا ماوە؟ ئەوەی کە ئەوسا لە پاڤلوفسک گێڕامەوە درۆ بوو: "ب.. ن"* نە هیچی بە من گوتبوو، نە دیتبوومی، بەڵام نزیکەی دوو هەفتەیەک لەمەپێش، خوێندکارێکی کۆلیجی پزیشکییان هێنایە سەرم، نێوی کیسلورودوف بوو. ئەمە گەنجێکی مەتریالیستی مەزەبی، خوا نەناسی، نەهلیستیە، هەر لەبەر ئەوەش بوو ناردم بەشوێنیدا. من پێویستم بە کەسێک بوو ڕاستیم وەکو خۆی، بە ڕاشکاوی، بێ هیچ مدارا و پێچ و دەورانێ، بێ هیچ خاترانەیەک، ڕاستە و ڕاست پێ بڵێ، ئەو ئەم کارەی دەگەڵ کردم. نەک هەر بە ڕاشکاوی و بێ هیچ پێچوپەنایەک، بەڵکو بە کەماڵی ئارەزوو و لەزەتەوە، "لەزەتێک کە بە ڕای من لە سنوری خۆی دەرچووبوو) پێی گوتم. بێباک و بێ پەروا پێی گوتم کە تەنیا یەک مانگی دی دەژیم، ڕەنگە ئەگەر زروفی لەبارم بۆ بڕەخسێت تۆزێ زیاتر لە مانگێکی دی بژیم، بەڵام ئەگەری ئەوەش هەیە زۆر زووتر لە مانگێکی دی بمرم. بە بۆچوونی ئەو دەشێت کت وپڕ، بە مەرگی مجافات، بۆ نمونە سبەینێ بمرم. ئەم جۆرە پێشهاتانە زۆرن. بۆ نموونە پێری ئافرەتێکی گەنج کە نەخۆشی سیلی دەبێت، کە لە گەڕەکی کولومنا دا، ژیانێکی وەکو ژیانی من دەباتە سەر، خۆی ئامادە دەکات کە بچێ بۆ بازاڕ تای ئازووقە و خواردەمەنی بۆ خۆی بکڕێت، لەناکاوا هەست بە ماندووبوون دەکات، لەسەر تەختێک ڕادەکشێت، تا پشوو بدات، دوو جار دەم دەدا بە یەکاو دەستبەجێ دەمرێت، جا ئەم کیسلوردوفە هەر هەموو ئەوەی بەوپەڕی بێباکی و بێ هیچ مدارایەک بۆ دەگێڕامەوە، وەکو ئەوەی شانازیم پێوە بکات کە منیش وەکو ئەو پیاوێکی خوا نەناسم و زۆر

لـە خـەمی ژیانـدا نـیم و مـەرگ بـە هـیچ نـازانم. بەهـەرحاڵ، ئەوەی سـاغ بووبووەوە و گومانی تیا نەمابوو. ئەمە بوو کە تەنیا یەک مانگم لە ژیانا مـابوو! هەڵبەتـە قەناعـەتی تەواوم بەوە هـەبوو کـە بـە هەڵـەدا نـەچووبوو. "ئەوەی بـەلامەوە سـەیر بـوو، میـرزادە چـۆنی زانـی بـوو کـە مـن "خەونـی ناخۆش" دەبینم، لە گەرمەی خەوا مۆتـەکان سـواری سـەرم دەبن. بەئاشـکرا پێـی گـوتم کـە لـە پاڤلوفسـکدا "خەوە ناخۆشـەکانم" دەگـۆڕێن. باشـە بـۆچی باسـی خەونـی کـرد؟ بـەڵێ، ئـەم پیاوەیـان پزیشـکە، یـان بـە ڕاسـتی کەسـێکی زۆر بە هۆش و بلیمەتە و دەتوانێ پێشبینی زۆر شـتان بکـات. (بـەڵام وێـڕای هـەموو ئەمـەش گومـان لەوەدا نییـە کـە بابایـەکی گێلۆکەیـە). ئەلهـەقی مـن بەماوەیـەکی زۆر کـەم، پـێش ئەوەی ئەو بێـت، خەوێکـی کـورتی سـەیرم بینیبوو (یـەکێک بـوو لەو جۆرە خەونانـەی کـە ئێسـتا سـەدانیان لێ دەبینـم!) نزیکەی سەعاتێک بەر لە هاتنی ئەو خەوتبووم، خەونم دەبینی، لەو خەوەدا لە ژوورێک بـووم، ژوورەکـەی خـۆم نـەبوو. لـە ژوورەکـەی خـۆم بـەرینتر و بەرزتر بوو، پۆشتە و پەرداخ تر بوو، ڕووناک تـریش بـوو، کـەل و پەلەکـەی نـاوی بریتـی بـوو لـە: دۆلابێکـی جلوبـەرگان، کۆمەدییـەکی چەکمەجـەدار، کورسـییەک، تەختـە خەوێکـی پـان و بـەرز، کـە سـەرجێیەکی ئاوریشـمی کەسکی بەسـەرا درابـوو. لـەم ژوورەدا بـووم. لـەپڕ چـاوم بـە زینـدەوەرێکی ترسـناک کەوت بـە عـەمراتم شـتی وام نـەبینیبوو. زینـدەوەرێکی ئاسـایی نەبوو. لـە دووپشـک دەچـوو، دووپشـکیش نـەبوو. لـە دووپشـک ناشـرینتر و ترسناکتر بوو، پیاو دڵی لێی تێکەڵدەهات. جا چونکە ئـەم جـۆرە زیندەوەرە لە واقیعدا نـەبوو و ئـەم یەکـە "بەتایبـەتی" لـەلای مـن پەیـدابووبوو، گومـانی ئەوەم کـرد کـە دەبێ ئەمـە ڕازێکـی تیـا بێـت! لـەم زینـدەوەر ورد بـوومەوە، جـۆرە خشـۆکێکی بۆڕەقنـە بـوو، لـە قـاوغێکی ڕەقـی وەکـو قـاوغی کیسـەڵدا بوو. درێژییەکەی نزیکـەی بیسـت سـانتیمەترێک بـوو، ئەسـتووری سـەری بـە قەد دوو قامکان دەبوو، بـەڵام بـەدەنی تـا بـۆ لای کلکییـەوە دەهـات باریـک و بـاریکتر دەبـوو، ئەسـتووری کلکـی هـەر نیـو سـانتیمەتر دەبـوو. بـە پێـنج سانتیمەترێک لە خوار سەریەوە لـە هـەر لایـەکی بـەدەنیەوە قاچێـک ڕوا بـوو

کە درێژی هەر یەکێکیان دە سانتیمەتر دەبوو، بە گۆشەیەکی چل و پێنج نمرەیی دەکرانەوە. کە لەسەرێ ڕا تەمەشات دەکرد لە لقێکی سێ چوکڵە دەچوو. سەریم بە جوانی نەدەبینی، لێ دوو شاخی زۆر چکۆلەم بە سەریەوە بینی کە لەدوو دەرزی کورتی ئەستوور دەچوون، ئەوانیش بۆڕەقنە بوون. لە کۆتایی کلکی و کۆتایی هەر لاقێکیشیا دوو شاخی هاوشێوەی ئەوانەی سەری هەبوون. یانی کۆی شاخەکان دەیکردە هەشت دانە. ئەم زیندەوەرە لەسەر هەر دوو لاق و بە یارمەتی کلکی بە خێرایی بەژوورەکەدا دەسووڕایەوە و غاری دەدا، وێڕای ئەوەی لە قاوغێکی ڕەق و ئەستووردا بوو، ئازای بەدەنی و بەتایبەتی کلکی وەکو مار دەجووڵایەوە. دیمەنێکی ترسناک بوو. زۆر دەترسام ئەم زیندەوەرە پێمەوە بدات، بیستبووم کە گوایە ژەهراوییە، بەڵام ئەوەی لە هەموو شتێک پتر ئازاری دەدام، ئەوە بوو کە بزانم کێ و بە چ نیاز و مەبەستێک بۆ ژوورەکەی منی ناردووە و چ ڕاز و نهێنییەکی تیایە، ئەم زیندەوەرە، دەچوو لەژێر کۆمەدیە چەکمەجەدارەکە و دۆڵابی جلەکانەوە خۆی ون دەکرد. دەخزییە کونوکەلەبەری ژوورەکەوە. لەسەر کورسییەک، لاقم لەژێر خۆدا قانگڵە کرد و لێی دانیشتم. زیندەوەرەکە بە غار وەناو ژوورەکە کەوت، لە شوێنێکی نزیکی کورسییەکەی ژێر مندا، خۆی شاردەوە. بە ترسەوە ڕوانیمە دەوروبەر، من کە لە سەر هەر دوو ئەژنۆیانم دانیشتبووم، خوا خوام بوو بە کورسییەکەدا هەڵنەگەڕێت. من لەو ترسەدا بووم کە لەناکاوا، لە پشتەوە، لە نزیکی سەرمەوە، گوێم لە خشە خشێک بوو. ئاوڕی پشتەوەم دایەوە، سەیرم کرد زیندەوەرە خشۆکەکە خەریکە بە دیوارەکەدا هەڵدەگەڕێت. گەیشتبووە ئاستی سەرم، کلکی لە قژم دەخشی و بەخێراییەکی باوەڕنەکردەنی کلکی دەجووڵاند. خێرا بازم دایە خوارێ و ڕەق ڕاوەستام، زیندەوەرەکەون بوو، لە هیچ شوێنێکەوە دیار نەما. نەدەوێرام پاڵ بکەوم، نەبادا بە خشکەیی خۆی بە ژێر سەرینەکەمدا بکات. ئەوسا دایکم و ژنێکی دەستە خوشکی خۆی کە من نەمدەناسی خۆیان بە ژووردا کرد. کەوتنە هەوڵی ئەوەی زیندەوەرەکە بگرن یان دەری بکەن. زۆر لە من هێورتر





ـوون، هیچ ترسێکیان پێوە دیار نەبوو، بەڵام هیچ شتێک لە مەسەلەکە حاڵی ـەبوون. زیندەوەرە، نەگریسەکە پەیدابووەوە. ئەم جارەیان زۆر بە خاوی ـەجووڵا، پێدەچوو ئۆینێکی لەژێر سەردا بێت. کە بە ئەسپایی بە دەوری ژوورەکەدا، بەرە و سەمتی دەرگاکە دەجووڵا، لە جاران ناشیرینتر و قێزەونتر بوو. وەکو جاری یەکەم سەرانسەری ژوورەکەی بەرە و لای ـەرگاکە بڕی. ڕێک لەو کاتەدا دایکم دەرگاکەی کردەوە، دیڵە سەگێکمان ـەبوو بە نێوی نورما، دیڵە سەگەکەی بانگ کرد. نورما دیڵە سەگێکی ـەلامی ڕەشی تیسکنی تووکلوول بوو، لە ڕەگەزی نیوفاوندلاند بوو، کە پێنج ساڵێک دەبوو تۆپی بوو. سەگەکە خۆی وەژووریدا کرد، لەبەردەم خشۆکەکەدا ڕەق ڕاوەستا، دەتگوت لە ترسانا قەڵەمی دەست و پێی شکاوە. خشۆکەکەش لە جێی خۆی وەستا، بەڵام هەر دوو لاق و کلکی بە عاردیدا دەدا. لێم بە درۆ نەبێت، حەیوانات هیچ جۆرە ترسێکی غەیبیان لەلا نیە و هەستی پێناکەن، بەڵام بە نۆڕینی من لەو ساتەدا، ترسەکەی نۆرما شتێکی زۆر غەریبی تیا بوو، لەوە دەچوو سەگەکەش وەکو من، هەستی بەوە دەکرد کە دەرکەوتنی ئەو زیندەوەرە، بە دومە(شووم)و ڕەنگە کارەساتێکی لێبکەوێتەوە. سەگەکە، بە ئەسپایی کەوتە پاشەکشە، خشۆکەکە، بە پارێزەوە بەرەو سەگەکە دەچوو، لەوە دەچوو بیەوێ قرسەتی لێبینێ و، پەلاماری بدات و، پێوەی بدات و وەزەنی خۆی بکات، بەڵام نۆرما، وێڕای ئەوەی سەراپای لە ترسا دەلەرزی، زۆر بەڕقەوە تەماشای خشۆکەکەی دەکرد. بەرەبەرە دەمی کردەوە، دانە تیژە و کەڵبە ترسناکەکانی دەرکەوتن، چنگە سوورە گەورەکانی کردەوە، خۆی دانووساند، زاتی وەبەرخۆی نا، لەپڕ پەلاماری خشۆکەکەی دا، بە دوو کەڕەت خستیە بەینی دانەکانیەوە. خشۆکەکە، هەوڵێکی زۆری دا خۆی دەرباز بکات، بەڵام قاوغە ڕەق و سەختەکەی لەژێر دانی نۆرمادا، لەت و پەت بوو، کلکی و لاقەکانی، بەدەم نۆرماوە ئاوێزان بوون و بەلەز و بە شێوەیەکی ترسناک دەجووڵان. لەپڕ نۆرما قروسکەیەکی دڵتەزێنی بۆ کرد. خشۆکەکە، بە زمانیەوە دابوو. نۆرما بەدەم قورسکاندنەوە و لە تاو ئازاری

زمانی، زاری کردەوە، خشۆکەکە بە نیمچە مردووی هێشتا لە دەمی سەگەکەدا هەر لە قەفرتێی بوو، لینجاوێکی سپی خەستی وەکو هی قالۆچەیەکی پێشێل کراوی لێ دەتکێتە سەر زاری سەگەکە... ڕێک لەو دەمەدا بێدار بوومەوە و میرزادەوەژوور کەوت٭.

هیپولیت، لێرەدا، بە نیمچە خەجاڵەتیەکەوە، خوێندنەوەکەی بڕی و گوتی:

- بەڕێزینە، من کاتم نەبوو بەوتارەکەمدا بچمەوە، پێم وایە هەندێ شتم تێهەڵکیش کردووە، کە هەم زیادەن و هەم هیچ سوودێکیان نییە، بە خۆم هەست بەمە دەکەم!... ئەم خەونە...

گانیا، بەلەز هەڵی دایە:

- ڕاست دەکەیت، وایە.

- من دان بەوەدا دەنەم، کە زۆربەی، شتی زۆر خودی و شەخسین.. مەبەستم ئەمەیە کە: کۆمەڵە هەست و سۆزێکن تەنیا پەیوەندیان بە شەخسی منەوە هەیە...

هیپولیت، بەدەم ئەو قسانەوە، شەکەت و ماندوو، بەدەسە سڕەکەی ئارەقەی سەر هەنیەی دەسڕی.

لیبدیف، بە دەنگێکی زیقن گوتی:

- بەڵێ، بەڕێز! تۆ لەڕادەبەدەر خۆتت خۆشدەوێ! لە باسکردنی خۆت تێر نابیت!

- بەڕێزینە، دووبارەی دەکەمەوە کە کەس ناچارناکەم گوێم لێبگرێت، ئەوانەی تاقەتیان چووە دەتوانن بڕۆن...

ڕوگوژین، بە دەنگێکی نزمی ئەوتۆ کە بەئاستەم دەبیسترا و نەدەبیسترا، پرتە پرتێکی کرد:

- خەریکە، خەڵکی لە ماڵی کەسێکی دی، دەردەکات!

فردیش چینکۆ، کە تا ئەو کاتەورتەی لێوە نە هاتبوو، بە شێوەیەکی چاوەڕوان نەکرا و هەڵی دایە و گوتی:

- دەڵێی چی هەموو هەستین و بە کۆمەڵ بڕۆین؟

هیپولیت، یەکسەر چاوی داخست و دەستی دایە نووسراوەکەی. لێ خێرا، دیسان سەری هەڵبڕی و چاوە پرشنگدارەکانی بڕییە فردیش چینکۆ، گوناکانی سور هەڵگەڕابوون، گوتی:

- تۆ، هیچ منت خۆش ناوێ.

هەندێک لە قاقای پێکەنینیان دا، بەڵام زۆربە نەبوون. هیپولیت سووری سوور بووەوە.

میرزادە گوتی:

- هیپولیت، کاغەزەکانت کۆ بکەوە و بیدە من. بڕۆ بۆ خۆت بنوو، لێرە، لە ژوورەکەی من بنووە. پێش ئەوەی بنووین، تێر پێکەوە قسان دەکەین، پاشان سبەینێ دەست بە قسان دەکەینەوە، بە مەرجێ نەگەڕێیتەوە سەر ئەم کاغەزانە، باشە، ڕازیت؟

هیپولیت، بە سەرسامی تەمەشایەکی کرد و پرسی:

- شتی وا دەبێت؟

بەدەم نۆبە تێیەکی دیکەوە، لەسەری ڕۆیشت و هاواری کرد:

- بەڕێزینە، ئەوەی بۆم خوێندنەوە، بەشێکی بێ بایەخی لامسەریی چیرۆکەکەم بوو، بەشێک کە نەمتوانی وەکو پێویست بیگێڕمەوە. چیتر قسەکەی خۆم نابڕم، ئەوەی دەیەوێ با گوێ بگرێت و ئەوەی نایەوێ، کەیفی خۆیەتی...

بەدەم ئەو قسەیەوە، بەپەلە قومێ ئاوی لە سوارحیەک خواردەوە، هەر زوو ئانیشکی دادانە سەرمێزکە تا دەموچاوی خۆی لە بینەران وەشێرێت، بە مکووڕی دەست بە خوێندنەوە بکاتەوە. زوو بە زوو شەرمەکەی ڕەوییەوە و درێژەی بە خوێندنەوە دا:

"ئەم بیرەی کە ژیانی چەند هەفتەیەک ئەوە نایەنێ پیاو خۆی بۆ ماندوو بکات، نزیکەی مانگێکە مێشکی مژول کردووم، یانی لەوساوە کە زانیم هەر چوار هەفتەیەکم لە دنیادا ماوە، بەڵام تەنیا سێ ڕۆژە بەتەواوەتی بەسەرما زاڵ بووە، یانی لەو ئێوارەیەوە کە لە پاڤلوفسک گەڕامەوە.

"ئەوەی ڕاستی بێ، ئەو ڕۆژەی کە لە باڵکۆنەکەی میرزادەدا بووم، ئەم

بیرەم بە مێشکدا هات و هەر ئەو کاتە لێبڕام بۆ دواجار ژیان تاقیبکەمەوە. هەستم دەکرد، دەمەویٚ خەڵکی و دارو درەختان بدینم (دان بەوەدا دەنەم کە ئەم قسەیەم کرد) زۆر بەگەرمی کەوتمە داکۆکی لە بوردوفسکی "دۆستم"، بە خەیاڵی خاوی خۆم وامدەزانی هەموو ئامادەبووان، باوەشم بۆ دەگرنەوە، دەست لە ملم دەکەن، داوای بوردنم لێدەکەن و منیش داوای بوردن لەوان دەکەم، بە کورتیەکەی لە ئەنجاما بوو بە گەپچاڕ و داستانی سەر زاران. ئەوە بوو لەماوەی ئەو چەند سەعاتەدا ئەو "قەناعەتە تەواوەم" لە دەروونی خۆمدا بۆ کەشف بوو. جا ئێستا لەخۆم دەپرسم چۆن توانیم شەش دانە مانگی ڕەبەق بەبیٚ ئەو "قەناعەتە! " بژیم! سوور دەمزانی دەردە باریکەمە، دەردەکەم، دەردێکی بیٚ دەرمانە، بە ئومێدی ئەوە نەبووم چاک ببمەوە، خۆم هەڵنەدخەڵەتاند و بە حاڵی بیٚ حاڵی خۆمم دەزانی، کەچی تا زیاتر بە حاڵی شەپرێوی خۆمم دەزانی، پتر تامەزرۆی ژیان دەبووم. زیاتر باوەشم بە ژیاندا دەکرد، دەمویست بە هەر نرخیٚ بووە نەمرم و درێژە بە ژیان بدەم. هەڵبەتە نکۆڵی لەوە ناکەم کە لە گینە ئەوساکە گلەیی زۆرم لە قەدەری ستەمکار و نابینا هەبوو بێت، کە بەبیٚ هۆ، نازانم بۆچی قەراری دابوو، وەکو مشکێک بم پلیشێنێتەوە، بەلاّم بۆچی هەر بە گلەیی و توڕەیەکەوە نەوەستاوم؟ بۆچی وێڕای ئەوەی دەمزانی تازە درەنگە، هەر کارێک بۆ من بێهودەیە، دەستم بە ژیان کرد؟ بۆچی ملم بەو هەوڵەوە نا، لەکاتێکا دەمزانی، هیچ بەروبوومێک نادات؟ بۆچی بڕیاری ئەو تاقیکردنەوە تازەیەم دا، لەکاتێکا دەمزانی هیچ شتێک بۆ تاقیکردنەوە نەماوە؟ ئیدی وام لێهات نەمدەتوانی کتێبێکیش بخوێنمەوە، ناچار دەستبەرداری خوێندنەوەش بووم. خوێندنەوە و فێربوون، بۆ کەسێک تەنیا شەش مانگی لەژیاندا مابیٚ، بەکەڵکی چی دیٚ، بۆچی باشە؟ زۆر جار ئەو بیرو بۆچوونەوای لێدەکردم، ئەو کتێبەی کە دەستم بە خوێندنەوەی کردبوو، تووڕ بدەم.

"بەڵیٚ، دیوارەکەی ماڵی مایر، زۆر چیرۆکی منی لایە، دەتوانیٚ بە دوورودرێژی هەموو ئەو شتانە بگێڕێتەوە، زۆر شتم لە سەری تۆمار کردووە. تاقە خاڵێک لەسەر ئەم دیوارە پیسە نییە، کە ئەزبەرم نەکردبێت،

لە خەیاڵدان و یادگەمدا، بەرجەستە نەبووبێ. ئەو دیوارە نەگریسە! کەچی وێڕای ئەوەش، هێشتا لە هەموو دارو درەختانی پاڨلوفسک بەلامەوە دڵگیرترە، یان ئەگەر بەم جۆرە هەموو شتەکانم لەبەرچاو نەکەوتبا، دەبوا دڵگیرتر بێت!

"ئێستا، بیرم دەکەوێتەوە، چەند بە تامەزرۆیی و بە چ کونجکاوییەکەوە پەیگیری ژیانی "ئەوان"م دەکرد. پێشتر قەت ڕۆژێ لە ڕۆژان، هەستم بەو جۆرە فزولیەتە نەکردبوو. هەندێ جار، کاتێ نەخۆشییەکەم کەسیرەی کردبووم، نەم دەتوانی بچمە دەرەوە، زۆر بێتاقی و بگرە تووڕەیی گەڕانەوەی کولیام دەکرد. وام لێهاتبوو تووشی گومان بووبووم، شتەکانم لە ڕادە بە دەر ورد دەکردەوە، دوای هەر قسە و قسەلۆکێکی هیچ دەکوتم، تا لە بنجوبناوانم نەکردبایە، سووکناییم نەدەهات. ڕێک وەکو ئەوانەم لێهاتبوو کە بانگەشە و قسە و قسەلۆک و درۆ و دەلەسە و بوختانان بڵاودەکەنەوە. بۆ نموونە لەوە نەدەگەیشتم بۆچی ئەو خەڵکە ساغ و سەلامەتەی کە ژیانیان لێدەچۆڕێت، بە هەموو چالاکی و چەلەنگیەکی حەیاتی خۆیانەوە ناتوانن دەوڵەمەند ببن (ئەلهەقی تا ئێستاش سەر لەمە دەرناکەم). پیاوێکی دەسکورتی بەلەنگازم دەناسی، وەکو بیستم پاشان لە برسان مرد. لە بیرمە کە ئەم هەواڵە نەک هەر زۆر تووڕەی کردم، بەڵکو دەهری کردم، لەدین دەرمی کرد. وام لێهاتبوو، ئەگەر ئەم نەگبەتە زندوو ببوایەتەوە، ڕەنگە بە دەستی خۆم بمکوشتایە.

"هەندێ جار، حاڵم باشتر دەبوو، دەمتوانی بچمە دەرەوە، وەکو هەر کەسێک بۆ خۆم لە کوچە و کۆڵان، جادە و بانان بگەڕێم، بەلام دەرەوە و جادە و بانم بە جۆرێ لە بەرچاو کەوتبوون، بە کەماڵی ویستی خۆم بە ڕۆژەوە کونجی ماڵەوەم دەگرت و نەدەچوومە دەرەوە، هەرچەندەوەکو هەر کەسێکی ساغ و سەلامەت دەمتوانی بچمە دەرێ. نەمدەتوانی ئەو خەڵکە جەنجاڵ و، شلۆق و، ڕەنگ و ڕووسیسەڵە و چرچەڵەو، سیما خەماوی و سست و نا ئومێدە بدینم، کە وەکو خێزەرەی مێرولە، نیگەران و پەرێشان، لە پەستا و بێ بڕانەوە، بەسەر شۆستەکاندا، بە لاما دەهاتن و





دەچوون، نازانم بۆچی ئەوەندە خەمبار و گرژ و مۆن، ئەوەندە نیگەران و پەریشان، هێندە ڕکونی و چارەگران و خوێنتاڵ بوون (چونکە ڕقوکینەیان بە شیرەوە مژتبوو؟) باشە ئەمانە کە هەر یەکێکیان نزیکەی شەست دانە ساڵ تەمەنیان لە پێشە، کێ لەم کلۆلی و داماوییەیان بەرپرسە، خەتای کێیە کە عەزرەتیان تاوێ ژیانی ئاسوودە و خۆشە؟ نازانن بۆ خۆبژین؟ ئەدی زارنتسین، کە لە کاتێکا دەیتوانی شەست دانە ساڵ بژی، بۆچی قایل بوو بەو ئاسانیە لە برسانا بمرێت؟ لە هەر کەسێک دەپرسیت، جلە شڕو شەپڕێوەکانی، دەستە زبر و شەقارەکانیت نیشان دەدات، تورە دەبێت و گلەیی دەکات: " فەرموو ئێمەوەکو کەر کاردەکەین، ڕەنج دەدەین، ئارەق دەڕێژین، بار دەبەین، وەکو سەگی پێ سووتاو دێین و دەچین، کەچی نانمان بە دۆمان ناگات، کلۆلی و داماوی خۆمان داوە بەکۆڵا و بە سکێ تێر و بە دە برسین! خەڵکانێکیش هەن، نە ماندوو دەبن، نە کار دەکەن، نە خۆ دەڕەنجێنن و دەوڵەمەند و پارە داریشن! (قەوانە هەمیشەیەکەیە!) یەکێک لەو هەرزە بێژە لاتانە، کە لە "بنەماڵەیەکی ڕەسەنیشە" ئیڤان فومیچ سوریکوفە، کە هەر لەو بینایەی لای خۆمان، لە قاتی سەرەوەی ئێمە دادەنیشێت، جلەکانی هەمیشە لە ئانیشکەوە دڕاون و کون بوون، جلوبەرگەکەی تاقە دوگمەیەکی پێوە نییە، ئەمە لەبەیانیەوە تا ئێواری، کار بۆ خەڵکی دەکات، دێت، دەڕوات، هەزار و یەک ئیش دەکات، ئاو بوەستێ ئەو ناوەستێ، هەر کارێکی پێ بسپێرن دەیکات، جا وەرن دەمی تاقیبکەنەوە، یەکسەر دەڵێت: "هەژارە، دەستکورت و نەبووە کلۆڵ و بەلەنگازە، ژنەکەی لەدەست دا و مرد، چونکە پارەی نەبوو دەواو دەرمانی بۆ بکڕێت، کیژە چکۆڵەکەی ئەم زستانە لە سەرما ڕەق بووەوە و مرد، کچە گەورەکەی لەبرسا بووە بە "قاپاتمەی پیاوێک".. هەمیشە هەر دەکوڕوزێتەوە و دەناڵێ و دەگری و گلەیی دەکات. من نە ئەوسا و نە ئێستا هەرگیز بەزەییم بەو جۆرە کەر پیاوانەدا نە هاتووەتەوە... بە شانازی و سەربەرزیەوە ئەو قسەیە دەکەم! باشە ئەم کابرایە بۆچی نەبووە بە ڕۆچیڵدێک؟ خەتای کێیە کە وەکو ڕۆچیڵد نەبووە بە ملیونێر، یان خاوەنی

چیایەک لە دنیاری ئیمراتوری* نییە. یان خاوەنی چیایەک لە لیرەی زێڕی ناپیلونی نییە، چیایەک بە ڕزتر لەو چیایە بەفرینانەی کە ڕووسەکان لە کەرەنقالّی ئاخر و ئۆخری سالّدا دروستی دەکەن؟ خۆ ژیان دەکاتە پارە، مادامێکی دەژی و تاقەتی هەیە، دەبێ پارەی هەبێت، ئاخر کە خۆی لەمە نەگات، خەتای خەلّکی چییە؟

ئاخ... ئێستا هەموو شتەکان لەبەر چاوم وەکو یەکە، هەموو شتێکم بەلاوە پەشمە، نامپەرژێتە سەر تورەبوون، کاتی توورەبوونم نییە، بەلّام ئەوسا، وەکو پێشتریش گوتومە، لە داخا، گازم لە بالیفەکەم دەگرت، تورە نەبووم، لە ڕقا لێفەکەم دەدڕی، ئاهـ.. ئەوسا چ خەون و خەیالّێکم هەبوو، چ ئاوات و ئارەزوویەکم هەبوو! پڕ بەدڵ حەزم دەکرد، مەمنوون بووم بەو تەمەنەوە، بە تەمەنی هەژدە سالّیەوە، ترۆ بکرێم، وێلّی کوچە و کۆلّان، سەرجادە و بانان بم، ڕووت و ڕەجالّ، برسی، بێ کەسوکار، بێ دۆست و ئاشنا، بێ کاروکاسبی، بێ مالّ و ئەنوا، بێ تاقە دۆستێک لە شارێکی گەورەدا، برسی وەدەرکراو، تێهەلّدرا و ڕاونرا و (هەر هەموو ئەمە قەیدی نەدەکرد! ..) بە مەرجی ساغ و سەلامەت بام، نەخۆش نەبام... هەنگێ پێم نیشان دەدان.. باشە لەو حالّەدا دەمتوانی چیان نیشان بدەم؟

ئۆف... ئێوە بە ڕاستی وا تەسەوردەکەن، کە من نازانم بەم ئیعترافە، بەم ڕوونکردنەوەیەی کە بۆ ئێوەی دەخوێنمەوە، چەند خۆم شکاندووەتەوە؟ کێ هەیە لەم حالّەدا من بە گەنجێکی خەشیمی ساویلکە، بێ ئاگا لە ژین و ژیان نەزانێ وگالّتەی پێم نەیەت! بەلّام ئەوانە غافلّن لەوەی تەمەنی من هەژدە سالّی ئاسایی نییە، ئەو ڕەنج و ئازارەی من لەم شەش مانگەدا کێشاومە بارتەقای پەنجا سالّ دەرد و ڕەنج بووە، هی ئەوە بووە پیاو سەری پاک سپی ببێت! لێگەڕێ با ڕابوێرن، گالّتەم پێبکەن، با هەر هەموو ئەم شتانە بە حیکایەتی خەیالّی بزانن! لە ڕاستیشدا هەر هەمووی حیکایەت بوون و بۆ خۆمم گێڕا ونەتەوە و شەوانم پێ بەسەر بردوون و هەنوکە هەموویانم لەبیرە..

بەلّام ئاخۆ پێویست دەکات، ئێستا کە سەردەمی حیکایەت و خەیالّات،





کە تەنانـەت بۆ منیش بـە سـەرچووە، دووبـارە بیـانگێڕمەوە؟ ئـەم خەیاڵاتـە کـاتێ بـوون بەمایـەی دڵخۆشـی و لـەزەتی مـن کـە بـۆم دەرکەوت، تەنانـەت خوێندنەوە و فێربوونی ڕێزمانی زمانی یونـانیش کـە بووبـوو بـە خولیام، بۆ من ناکاتە هیچ و بێ مانا و بێهودەیە، لە دڵی خۆدا دەمگوت، ناگەمـە قۆنـاغی شیکردنەوەی ڕستە، دەمرم، کە گەیشتمە ئەو قەناعەتە، یەکسەر لـە لاپـەڕەی یەکەمەوەوازم هێنا و کتێبەکەم فڕێ دایە ژێر مێزەکە. ئێستاش کتێبەکـە هـەر لەوێ کەوتـووە، چونکـە بـە ماتریونـای کارەکـەرمانم گوتبـوو کـە هـەڵی نـەگرێتەوە و هـەقی بەسـەرەوە نـەبێت. "ئەوانـەی کـە ئـەم وتـارە "ڕونکردنەوەیـە"ی منیـان دەکەوێتـە بەردەسـت و سـەبر و حەوسـەڵەی ئەوەیان دەبێت تا کۆتایی بیخوێننەوە، لەوەیە بـە شـێتم لـە قەڵـەم بدەن، یان بە قوتابیـەکی قۆنـاغی ناوەندیم بزانن، یان وا تەسـەوربکەن کـە پیاوێک بـم مـەحکوم بـە خەنەقانـدن و بـە ڕاسـتی پێـی وابـێ هـەر ئەو قـەدری ژیـان دەزانێت و هـەرچی بەشـەری دی هـەن، گوێ بە ژیان نادەن و بە خـوت و خـۆڕایی و، شـێتانە ژیـان و تەمـەنی خۆیـان بـە فیـڕۆ دەدەن و شـتاقیان شایسـتەی ژیـان نـین! جـا مـن لێـرەدا ڕای دەگەیـەنم ئەو خوێنـەرەی وا تەسـەور بکـات و بۆچـوونی وابـێ، زۆر هەڵـەیە و سـەرچیخ چـووە، چونکـە بۆچوونەکانم هیچ پەیوەندییەکیان بەوەوە نییە کە مەحکومم بـە مـەرگ! بچن لەوانـە بپرسـن، لـە هـەموویان بپرسـن، شـتاقیان مەپـەڕێنن، لـە سـەرپاکیان بپرسـن. تـەنیا ئەوەیـان لـێ بپرسـن، چـۆن لـە شـادی دەگـەن، چ وێنایـەکیان لەهەنبـەر شـادی و شـادمانی هەیـە؟ ئاهــ. باوەڕبکـەن کـە کریسـتۆفەر کۆڵـۆمبس، هەسـتی بـە شـادمانی دەکـرد، بـەڵام نـەک دوای دۆزینـەوەی ئـەمریکا، بـەڵکو ئەو کاتانـەی کە لـە هەوڵـی دۆزینەوەی ئـەمریکادا بـوو، ئەو کاتەی کە لـە دۆزینەوەی نزیـک بووبـووەوە. دڵنیـابن، کە لوتکـەی شـادمانی ئەو سـێ ڕۆژ، پێش دۆزینەوەی دنیـای نوێ بـوو. یـانی ئەو کاتانـە بـوو کـە هاوڕێکـانی، دەریاوانـەکانی هـاوڕێی تووشـی نـا ئومێدی بـوون و لێـی یـاخی بوون و دەیانویست ڕێ و ڕێ بۆ ئەورووپا بگەڕێنەوە. مەبەست و ئامانجـە سـەرەکیەکە دنیای تـازە نـەبوو، ئەمـە مەسـەلەیەکی زۆر گرینـگ نـەبوو، خۆ



## گەمژە

کاتێ کۆلۆمبس مرد، ئەمریکای بە تەواوی نەدیتبوو، ئەوەی ڕاستی بێ نەیزانی بوو چ کەشفێکی کردووە. مەسەلەی هەرە گرینگ ژیانە، هەر ژیانە و بەس... گرینگ گەڕانی بەردەوام و هەمیشەییە لە ژیان، هەوڵی هەمیشەییە بۆ ژیان، نەک کەشف و دۆزینەوەی ژیان! بەلام ئەم بێ سەروبەرانە. بەچ دەچن؟ دەترسم ئەم شتانەی کە دەیڵێم هێندە جەڵەبی و بازاڕی بن، کە خوێنەر وابزانێ هی قوتابیەکی ناوەندی تەمەڵە، کە داوای لێکراوە دارشتنێ دەربارەی "هەڵهاتنی هەتاو" بنووسێت. یان بڵێن کەویستوومە گوزارشت لە شتێک بکەم، بەلام بە هەموو توانا و ئارەزوویەکمەوە نەمتوانیوە، ئەوەی لە دڵمدایە "شرۆڤە" بکەم. بەهەرحاڵ وێڕای ئەوەش بە پێویستی دەزانم ئەوە بڵێم کە هەر بیرێکی مرۆڤانی ڕەسەن و بلیمەتانە، هەر ڕایەکی تازە و هەر ڕایەکی جیددی کە لە مێشکی مرۆڤدا چەکەرە دەکات. هەر شتێکی لەو بابەتە، هەمیشە بایی ئەوەی تیا دەمێنێتەوە کە بۆ کەسانی دی نەگوێزرێتەوە، ئەگەر پیاو چەندین کتێب بۆ شەرح و شرۆڤەشی تەرخان بکات سی و پێنج دانە ساڵ خەریکی مانا لێکدانەوەی بێت. هەمیشە شتێک هەر دەمێنێتەوە کە نایەوێ بە هیچ جۆرێک لە مێشکت بێتە دەرەوە و بۆ هەتا هەتایە هەر لەگەڵ تۆدا دەمێنێتەوە. دەمریت و ناتوانی بۆ کەسێکی دیکەی بگێڕیتەوە یان بگوازیتەوە، لەوەشە ئەو شتەی کە لە دەربڕین نایەت، کرۆک و جەوهەری بیرەکەت بێت. جا منیش ئەگەر نەمتوانی بێ ئەو هەستەتان لا دروست بکەم کە لە ماوەی ئەو شەش مانگەدا، چ ئازارێکم چەشتووە، بەلای کەمەوە لەوە دەگەن کە بە چ بەهایەک گەیشتوومەتە ئەم "قەناعەتە یەکجارەکیە"ی کە ئێستا پێی گەیشتووم. ئیدی لەبەر هۆیەکی تایبەت کە خۆم دەیزانم چییە، دەبوایە ئەو خاڵەتان لەم "ڕونکردنەوەیە"دا بۆ شرۆڤە بکەم. بەهەرحاڵ، وا دێمەوە سەر چیرۆکەکەم.

پەراوێز:

* - "دوای من خوای دەکرد، تۆفان هەڵدەستا.."! ئەمە لە دەقە ئەسڵەکەدا بە فەرەنسییە.

* - "ب... ن"! بە مەزەندە، دەبێ مەبەست لە دکتۆر "پوتکین"ی دکتۆری تایبەتی ئەلکسندری دووەم بێت.

* - "دنیاری ئیمپراتۆری..." دراوێکی زێڕە کە بەهای هەر دانەیەکی دە ڕۆبڵە.

## فەسلی شەشەم

نامەویٚ درۆ بکەم. لە زەرفی ئەم شەش مانگەدا ژیان و واریقاتە کانی ژیان، بە جۆریٚ کەمەندکێش و مژولیان کردم و بەگەڵ خۆیان خستم کە مەرگم لە بیرچووەوە، یان وای لیٚ کردم بیر لە مردن نەکەمەوە و تەنانەت دەست بە هەندیٚ کاران بکەم. جا هەنوکە، لەم بۆنەیەدا، چەند وشەیەک لەمەڕ ژیانی ئەوسام دەڵێم: من هەشت مانگێک لەمەپێش کە زۆر نەخۆش بووم، هاتوچۆم دەگەڵ هەموو دۆست و برادەرەکانی جارانم بڕی، چونکە هەمیشە کرژ و مۆن، پەست و خەمین و بێتاقەت و حەواس بووم، هاوڕێکانم بەئاسانی و زوو فەرامۆشیان کردم. بەهەرحاڵ ئەگەر ئەو گرژی و مۆنەیەشم نەبوایە هەر لەگین بوو فەرامۆشم بکەن، بەلاّم وەزع و حاڵم لە ماڵەوە، لەنێو کەسوکاریشدا هەر خراپ بوو، هەمیشە تەریک و گۆشە گیربووم. نزیکەی پێنج دانە مانگ دەرگام لەسەرخۆم داخست و، هاتوچۆی ژوورەکانی دیکەم نەدەکرد. بیٚ چەند و چوون، هەر داوایەکم جێبەجیٚ دەکرا، کەس ڕێی بە خۆی نەدەدا بێتە ژوورەکەم، جگە لە کاتی گسکدان و خاوێن کردنەوەی ژوورەکەم یان هێنانی نان و خواردن. دایکم بەترس و لەرزەوە داواکانی جێبەجیٚ دەکردم، هەندیٚ جار کە ڕێم دابا بێتە ژوورەکەم زاتی نەدەکرد نە بگری نە فرمێسک بڕێژیٚ، هەناسەی لەبەرخۆی دەبڕی. هەمیشە لە منداڵەکانی دەدا، تا هەراو زەنا نەکەن و

بێزار و بێتاقەتم نەکەن. وێڕای ئەوەش زۆر جار گلەییم دەکرد کە بە هەراو زەنایان بێزارم دەکەن. هەڵبەتە من دەزانم هەنوکە لە دڵی خۆیاندا چەندیان خۆش دەویم! پێم وایە زۆریش ئەزیەتی هاوڕێم "کولیای ئەمەکدار"م داوە (ئاخر ئەو ناوەم لێ ناوە). ئەویش لەم دواییانەدا تۆڵەی خۆی کردەوە و ئەزیەتی دام: هەڵبەتە ئەوەش لە دیاردە ئاسایی و سروشتییەکانە: مرۆڤ بۆ عەزابدانی یەکدی دروست بوون. لەگەڵ ئەوەشدا ئەنجام هەستم کرد زۆرم مدارا دەکات، چاوپۆشی لە بێزاری و بێمجێزیی من دەکات، وەکو یەکێک لە خۆی گرتبێ، لە ڕووی بەزەییەوە خزمەتی نەخۆشێک بکات. هەڵبەتە ئەمەم لە بەرگران بوو. هەستم دەکرد بڕیاری داوە لە ڕووی (تەوازوعی مەسیحییانەوە) کە میرزادە باوەڕی پێی بوو، لاسایی میرزادە بکاتەوە. هەڵبەتە ئەمەم بەلاوە هەندێ سەخیف و کۆمیدی بوو. دیارە گەنجێکی خوێن گەرمی وا ئاساییە چاو لە خەڵکانی دی بکات و لاساییان بکاتەوە، هەندێ جار دەهاتە سەر ئەو باوەڕەی کە کاتی ئەوە هاتووە، مێشکی خۆی بخاتە کار و کەسێتی سەربە خۆی خۆی بدۆزێتەوە و هەبێت. ئەلهەقی زۆرم خۆشدەوێ. (سوریکوف)شم، ئەو پیاوەی لە قاتی سەرەوەی ئێمەدا دەژیا و لە بە یانیەوە تا ئێواری وەکو سەگی پێ سووتاو لە دووی کاری ئەم و ئەو بوو، بەڵێ (سوریکوف)شم ئەزیەت داوە. هەمیشە دەمویست تێی بگەیەنم کە بێنەوایی و کڵۆڵی ئەو هەمووی خەتای خۆیەتی، ئەوەندەم سەرکردە سەری تا ئاقیبەت ڕەوییەوە و ڕەڤی و جارێکی دی دەرگای لێنەکردمەوە. کەسێکی زۆر بێ نەفسە، تا بڵێی خۆشکێنە (سەرنج: دەڵێن تەوازع و خۆشکێنی هێزێکی یەجگار گەورەیە، دەبێ ئەمە لە میرزادە بپرسم، چونکە ئەوە قسەی ئەوە.) کاتێ لە مانگی ئازاردا سەرکەوتمە سەرێ بۆ لایان تا بزانم کوڕە چکۆلەکەیان چۆن لەسەرما "ڕەق بووبووەوە" کە چاوم بە جەندەکی کوڕەکە کەوت، بێ ویستی خۆم بزەیەکم هاتێ و، کەوتمە سەرکۆنەی سوریکوفی بەلەنگاز کە مەرگی منداڵەکە لە ئەستۆی ئەوە، خەتای ئەوە "ئەو تاوانبارە." کابرای بەلەنگاز، لێوی کەوتنە لەرزین و تەتەڵە، بە دەستێک شانی گرتم و بە

دەستەکەی تری دەرگای چوونە دەرەوەی نیشاندام، زۆر بە نەرمی و هێمنی، بە ئەسپایی و نیمچە چپەوە گوتی: " قوربان فەرموو بۆ دەرەوە! ".
ڕۆیشتم. هەڵبەتە دەبێ ئەوەش بڵێم کە زۆر دڵخۆش بووم، لەو کاتەدا بە کارەکەی خۆم دڵخۆش بووم. تەنانەت دوای ئەوەی دەریشی کردم، هەر دڵخۆش بووم، بەڵام پاشان، بۆ ماوەیەکی زۆر هەر کاتێ قسەکانی ئەوم بیردەکەوتنەوە، هەستێکی زۆر ناخۆش، بە سوێ دای دەگرتم، لە هەستی بەزەییەکی ناپەسەند دەرهەق بە ئەو دەچوو. بە ڕاستی حەزم نەدەکرد ئەو هەستەم لا دروست ببێت. ئەم پیاوە توڕەبوونی لە مەزەبدا نەبوو، نە یدەزانی توڕە بێت، تەنانەت سووکایەتیشی پێ کرابا، هەر خۆی شلۆێ نەدەکرد(من هەستم دەکرد بەو کارەم، سووکایەتیم پێکرد، هەرچەندە هیچ نیاز و مەبەستێکی سووکایەتی کردنم نەبوو). تەنانەت لەو هەڵوێستەشدا ئەم کابرایە هەر تووڕە نەبوو. لەرزین و تەتەڵەی لێوەکانی لە توڕەییدا نەبوو، دەتوانم سوێند بخۆم کە لە توڕەییدا نەبوو!... باسکی گرتم و زۆر پیاوانە، بێ هیچ توڕەبوونێک، بەوپەڕی ویقارەوە گوتی: " قوربان فەرموو بۆ دەرەوە! " ئەو ڕستەیەی هێندە بەویقار و سەنگینییەوەوت کە دەگەڵ سەروسیمای شڕو شەپڕێوی ئەودا تێکی نەدەکردەوە (ئەلهەقی ئەمە مایەی پێکەنین بوو.) بەڵام هیچ ڕقوکینەیەکی پێوە دیار نەبوو. ڕەنگە لە دڵی خۆیدا تۆزێک لێم بێزار بووبێ و هیچی تر. دوای ئەوە دوو-سێ جار لەسەر قالدرمەکان تووشی بووم، خێرا سەری بۆ دادەنەواندم و سڵاوی لێدەکردم، کە جاران قەت ئەم کارەی نەدەکرد، بەڵام وەکو جاران لەگەڵما نەدەوەستا، بەڵکو بەلەزو، نیگەران، شەرمەزار بەلاما تێدەپەڕی. جا ئەگەر هەندێک لێشم پەست بووبێت، بەشێوازی خۆی لێم پەست بوو، جۆرە پەستی و بێزارییەکی "ملکەچانە"! لەوە دەچوو لەبەر ئەوە کڵاوەکەیم بۆ دابگرێت و سەرم بۆ دابنەوێنێ، چونکە کوڕی ئەو ژنە بووم کە قەرزی دەدایێ: دایمەی خوا قەرزاری دایکم بوو، قەتیش قەرزەکەی بۆ نەدەدرایەوە. پێدەچوو لەبەر ئەمە مەرحەبام بکات. بەهەرحاڵ لێبڕام باسی ئەوەی دەگەڵ بکەم، دڵنیا بووم هەر باسی ئەوەی دەگەڵدا بکەمەوە، دە دەقیقە نابات، دێت





بۆلام و عوزورخواییم لێ دەکات، بەڵام دوایی بیرم لێکردەوە و گەیمە ئەو قەناعەتەی وازی لێبێنم زۆر باشترە.

"لەو ماوەیەدا، یانی لە دەوروبەری نیوەی هەیڤی ئازاردا، کە منداڵەکەی سوریکوف لەسەرما ڕەق هەڵاتبوو، مردبوو، کوتوپڕ حاڵم زۆر باشتر بوو، ئەم باشبوونە دوو هەفتەیەکی خایاند. زۆر جار دەوروبەری ڕۆژئاوا، لە ماڵ دەچوومە دەرێ. من زۆر حەزم لە ئێواران و شەوانی مانگی ئازارە، کە کزە سەرما دەست پێ دەکات وچرای شەقامەکان دادەگیرسێن. هەندێ جار بە پیاسە دوور دوور دەکەوتمەوە. جارێکیان کە بە شەقامی شستی لوڤوچنی دا پیاسەم دەکرد، دنیا تاریک بوو تارمایی زەلامێک بەلاما تێپەڕی، پێدەچوو کەسێکی شایستە بێت، بەڵام نەمدەتوانی بە ڕوونی سەروسیمای بدینم. پریاسکەیەکی بەدەستەوە بوو کە لە کاغەزێکەوە پێچرابوو، شرە پاڵتۆیەکی کۆنی لەبەر بوو کە جگە لە شرپەکەی، بۆ ئەو وەرزە ساردەی ساڵیش یەجگار تەنک بوو. کە گەیشتە نزیکی یەکێک لە چراغازیەکانی شەقامەکە، دیتم شتێک لە گیرفانی کەوت. خێرا ڕامکرد و هەڵمگرتەوە، باش بوو زوو فریاکەوتم و هەڵمگرتەوە، چونکە کابرایەکی دیکە کە پاڵتۆیەکی درێژی لەبەربوو، بەهەشتاو خۆی تاو دەدا بیگاتێ و هەڵی گرێتەوە، بەڵام کە شتەکەی بە دەستی منەوە بینی هیچی نەگوت، سەیرێکی دەستی کردم و بە کرێ بەڕێی خۆیدا ڕۆیشت. ئەم شتە جانتایەکی دەستی مۆدێل کۆنی، چەرمی عەرەبی بوو. پڕ بوو لە کاغەز و ماغەز، ئەوەندە پڕ بوو، هەڵئاوسا بوو، هەر کە تەمەشام کرد، یەکسەر مەزەندەم بۆ ئەوە چوو کە جگە لە پارە هەموو شتێکی دیکەی تیایە، خۆیشم نازانم بۆچی و چۆن ئەو مەزەندەیەم لا دروست بوو. ئەو کابرایەی کە جانتاکەی لێکەوتبوو، چل شەقاوێک کەوتبووە پێش منەوە. زوو بە زوو لەنێو ئاپۆرای خەڵکەکەدا لێم ون بوو. بە ڕاکردن و بە بانگە بانگ دووی کەوتم، بەڵام چونکە هەر ئەوەندەم پێ دەکرا هاوار بکەم و بڵێم "ئەهای!" هەر ئاوڕیشی نەدایەوە. لەناکاوا، بەدەستی چەپا پێچی کردەوەو، خۆی بە ئەپارتمانێکی نیشتەمەنیدا کرد. کە بە غاردان بەرە و





ئەوێندەر پەل بوومەوە ئەوەندە تاریک بوو چاو چای نەدەبینی، هیچم بەدی نەکرد. ئەپارتمانەکە یەکێک بوو لەو بینا هەرە گەورانەی کە پارەدارو و خاوەن مەسڵەحەتان بۆ کرێ دروستی دەکەن و دەیکەن بە شووقەی بچووک بچووک. ئەپارتمانی وایان تیایە کە هەریەکەیان سەد ماڵ دەگرێت. کاتێ لە دەروازەی ساختمانەکەوەژوورکەوتم، وام هاتە بەرچاو کە کەسێک لە سیلەی ئەوپەڕی سەمتی دەستەڕاستی حەوشەی ساختمانەکەوە، دیارە کە دوور دەکەوێتەوە، هەرچەندە لە تاریکییەکەدا باش بۆم جیانەدەکرایەوە. بە غاردان خۆم گەیاندە ئەو گۆشەیە، سەیرم کرد دەرگایەکی چکۆلەی لێیە کە بە سەر قاڵدرمەیەکی باریکی پیس و تاریکدا دەکرێتەوە. گوێم لە دەنگی پێی کەسێک بوو کە بەهەشتاو سەردەکەوت. بەلەز بەو ئومێدەی تا دەگاتە بەر دەرگاو دەرگای لێدەکەنەوە بیگەمێ، دوای کەوتم. هەر واش دەرچوو. پلەکانی قاڵدرمەکە نزم بوون، بەڵام هێندە زۆر بوون لە کۆتایی نەدەهاتن. بۆیە بە تەواوەتی هانکە هانکم پێکەوت. لەو کاتەدا گوێم لە دەنگی کرانەوە و داخرانی دەرگایەک بوو لە قاتی پێنجەم. کە گوێم لەو دەنگە بوو هێشتا لە سەرەتای قاڵدرمەکەی قاتی خوارترەوە بووم. دوای چەند دەقیقەیەک گەیشتمە قاتی پێنجەم، لەبەر دەرگا نەفەسێکم تازە کردەوە و لە زەنگی دەرگام دا، ژنێکی ئاسایی دەرگای کردەوە کە لە موبەقێکی زۆر چکۆلەدا مژولی داگیرساندنی سەماوەر بوو، بە بێدەنگی گوێی لە پرسیار و قسەکانم گرت، کە هەڵبەتە یەک وشەم لێ حاڵی نەبوو، هەر بەو بێدەنگییە دەرگای ژوورێکی تەنیشتەوەی بۆ کردمەوە و وەژووری خستم. ژووری چی قنگە جنۆکەیەک بوو لەو گۆڕە، ژوورێک بوو زۆر بچووک و تا بڵێی نزم، کەلوپەلێکی یەجگار کەمی تیا بوو، جگە لە شتی زۆر پێویست، هیچی دیکەی تیا نەبوو.

"تەختە خەوێکی گەورەیان لەپشت پەردەکەوە دانابوو، پیاوێکی لەسەر پاڵکەوتبوو کە ژنەکە بە "تەرنتیچ" بانگی کرد، بەمەزەندی من مەست بوو. پاشماوەی مۆمێک، کە بەدەم توانەوەوە دەتگوت فرمێسکان دەڕێژێ، لە مۆمدانێکی ئاسندا و لە نزیکی قاپێکی بەتاڵی ڤۆدگاوە لەسەر مێزێک

دانرابوو. پیاوە بۆڵە بۆڵێکی لێوە هات و بێ ئەوەی هەستێ بە دەست ئاماژەی بۆ ژوورێکی تەنیشت کرد. ژنە ڕۆیشت. هیچ چارێکم نەما جگە لەوەی دەرگا بکەمەوە. وام کرد و چوومە ناو ژوورەکەوە.

"ئەم ژوورە، لە ژوورەکەی دیکەش بچووکتر بوو، بەڵام ئەوەندە شلۆق و قەرەباڵغ بوو، جێی جووڵانی نەبوو. تەنانەت نەمدەزانی چۆن بجووڵێمەوە. تەختە خەوێکی باریکی یەک نەفەری لە سووچێکیا دانرابوو، تەقریبەن هەموو ژوورەکەی گرتبووەوە. شتەکانی دیکەی ناو ژوورەکەی بریتی بوون لە سێ دانە کورسی سادە، کە نشیمەنگاکانیان لە کۆنیدا سوا بوون، شڕە و پڕەی دنیایان لەسەر کەڵەکرابوون. مێزێکی قەبەی موبەقان لەبەردەم تەختێکی کۆندا کە بەمشەمایەک داپۆشرابوو، دانرا بوو. هەموو ئەم شتانە ئەوەندە لە یەکترەوە نزیک بوون، تەقریبەن نووسابوون بەیەکەوە. پیاو نەیدەزانی چۆن بە بەینیاندا ڕەت ببێت. مۆمێکی تواوە، لە شەمدانێکی ئاسنی وەکو ئەوەی ژووری یەکەم، لەسەر مێزەکە دەسووتا. ساوایەکی لاواز، کە بە دەنگیا لەوە دەچوو تەمەنی لە سێ هەفتە پتر نەبێ، لەسەر تەختەخەوەکە دانرابوو هەر واقەواقی بوو، ژنێکی نەخۆشی ڕەنگ و ڕوو سیسەڵە و چرچەڵە، کە گەنج دیار بوو، بەلایەوە بوو، خەریک بوو قوماتی دەکرد. ئەم ژنە جلێکی زۆر سادە و هەرزان بەهای لەبەرابوو، لەوە دەچوو تازە لە زەیستانی هەستابێتەوە، بەڵام منداڵەکە بەدەم واقەواقەوە چاوەڕوانی مەمکی دایکە لە ڕووی لاوازەکەی بوو. منداڵێکی دیکە، کچێک بوو نزیکەی سێ ساڵان، لەسەر تەختەکە و لەژێر شڕە پاڵتۆیەکی، پێم وایە پاڵتۆیەکی پیاوانە بوو، نووستبوو. لە نزیکی مێزەکەوە پیاوێک، کە چاکەت و پانتۆڵێکی شڕی تاڵکێشی لەبەرابوو وەستابوو. (کابرا پاڵتۆکەی داکەند بوو ولەسەر تەختە خەوەکە دای نابوو) خەریک بوو ئەو پریاسکەیەی دەکردەوە کە لە کاغەزێکی شینەوە پێچرابوو. دەستەوارەیەک نانی جۆو دوو پارچە سوسیسی تێدا بوو. قۆرییەک چای پڕ بەسەر مێزەکەوە بوو لەگەڵ چەند گوێچکە نانێکی جۆدا. جانتایەکی کراوە و دوو بوخچەی پڕ لە جلوبەرگیش خزێنرابوونە ژێر تەختە خەوەکەوە.





خۆلاسە، هەراجە بازارێک بوو لەو گۆڕە! هەر لە یەکەم نیگاوە هەستم کرد ئەم ژن و پیاوە خەڵکانی بەڕێز و بە حورمەتن، بەلام هەژاری و دەستکورتی ڕۆژی گەیاندوون بەم ڕۆژە و بە ناچاری لەم هەراجە بازارەدا هەڵبکەون و لەگەڵیا رابێن و نەک هەر گوێی نەدەنێ و خۆی لێنەکەن بە خاوەن، بەڵکو جۆرە لەزەتێکی تۆڵە ئامێزیش لە زیادبوونی ڕۆژانەی ئەو پەشێوی و جەنجاڵیە ببینن، کە نازانم چۆنی لێک بدەمەوە!

کاتێ چوومە ژوورەوە، دیار بوو کابرا تۆزێ پێش من گەیشتبووە ماڵەوە، خەریک بوو ئەو خۆراکەی کە لە بازاڕ کڕی بووی، لە کاغەزەکە دەردێنا، بە هەڵچوون و شپرزەیی و پەلە پەل قسەی بۆ ژنەکەی دەکرد. ژنەش هێشتا لە قوماتکردنی ساواکەی نەبووبووە. ژنە بەدەم نەرمە گریانەوە فرمێسکی هەڵدەڕشت. پێدەچوو پیاوەکەی خەبەر و هەواڵی ناخۆشی هێنابێتەوە پیاوەکە لە کەسێکی باش و بە حورمەت دەچوو. تەمەنی لە دەوروبەری بیست و هەشت ساڵیدا بوو، گەنم ڕەنگێکی، ڕەقەڵە بوو، ڕدێنێکی ڕەش بەملاو بەولای لاجانگەکانیا هاتبووە خوارێ، بەلام چەناگەی پاک تاشی بوو. نیگای خەمناک و سیمای گرژ و مۆن بوو، جۆرە غرورێکی نەخۆشانە، بە ڕوویەوە دیار بوو، کە پێدەچوو لەو کەسانە بێ کە زوو هەڵدەچن و تورە دەبن. چوونەکەی من وەزع و حاڵێکی غەریبی دروست کرد.

خەڵکانێک هەن لەزەت لە تورەبوونی خۆیان وەر دەگرن، بەتایبەتی کە هەڵچوون توورەبوونەکەیان دەگاتە لوتکە و لەچاو تروکانێکدا دەیان گرێت، پێم وایە لەم جۆرە ساتانەدا ئازار و سووکایەتییان پێ خۆشترە لە ڕێز و حورمەت، بەلام ئەو خەڵکە توندە تەبیعەتانە، کە لە کاتی توورەیدا دۆودۆشاو تێکەڵ دەکەن، هەر ئەوەندەیان زەحمەتە کە بەخۆبێنەوە، ئیدی هەست بە ئازاری پەشیمانی دەکەن، هەڵبەتە ئەگەر خەڵکانێکی ئاقڵ و هۆشیاری ئەوتۆ بن، پەی بەوە بەرن کە هەڵچوون و توورەبوونەکەیان دە هێندەی تورەبوونی ئاسایی بووە، لەوە زۆر زیاتر بووە کە ئەقڵ قەبووڵی بکات.

" کابرا بۆ ساتێک بەسەرسامی چاوی تێ بڕیم، سیمای ژنەکەی ترسێکی زەوقی پێوە دیار بوو، لەوە دەچوو، چوونی مرۆڤێک بۆ ژوورەکەیان بویەرێکی ترسناک و باوەڕنەکردەنی بێت! بەڵام بەرلەوەی فریابکەوم دوو قسان بکەم، بە جۆرە هیسترپایەکی ڕق ئامێزەوە شاڵاوی بۆ هێنام. لەوە دەچوو زۆری لەبەر گران بێت کە پیاوێکی پۆشتە و پەرداخ بەو جۆرە، لە خۆڕا و بێ هیچ پرسیارێک خۆی بە ماڵە پەرپوتەکەیدا بکات و بە کەیفی دڵی خۆی چاو بە هەموو سووچ و کەلەبەرێکیا بگێڕێت، کە ئەو خۆی شەرمی لەم حاڵ و گوزەران و ماوایەی خۆی دەکرد. بێگومان ئەم درەفەتە، کە زەمینەی بۆ خۆشکردبوو داخی دڵی خۆی بەسەر کەسێکی دیدا برێژێ، بۆ ئەوێک کە خۆی لەخۆیدا لە بیانوو بوو، دەرفەتێکی زێڕینی لە زەتبەخش بوو، گەیشتمە ئەو قەناعەتەی لە گینە هەر ساتێ ئەقڵی بیبڕێ بکەوێتە لێدانم. وەکو ژنێک کە تووشی هیستریا بووبێت بەو ئاوایە ڕەنگی سپی هەڵگەڕا، ژنەکەی کە بەو حاڵەوە دیتی زۆر ترسا.

"کابرا کە لە تووڕەییدا دەلەرزی و دەمەڵاڵکێی پێکەوتبوو، هاواری کرد:

- بە چ هەقێ بەو جۆرە هاتوویتە ژوورەوە! بۆ دەرەوە دەی!

بەڵام لەپڕ چاوی بە جانتاکەی خۆی کەوت کە بەدەست منەوە بوو.

بەو پەڕی ئارامی و هێوری گوتم (بەهەرحاڵ لە کاتی وادا پیاو پێویستە هەندێک هێور و لەسەر خۆ بێ):

"- پێم وایە ئەم جانتایە لە تۆ کەوت.

" کابرا ماوەیەک بە واقی وڕەوە لەبەردەممدا وەستا، گێژ و کاس سەری لە مەسەلەکە دەر نەدەکرد. ئەوجا بەلەز دەستی بە گیرفانیا کرد، دەمی داچەقاند، کێشای بە تەوێڵی خۆیدا و گوتی:

"- دۆزیتەوە؟ لەکوێ دۆزیتەوە؟

"بە چەند وشەیەکی کورت و جیددی بۆم باس کرد کە چۆن جانتاکەی لێکەوتووە و خێرا هەڵم گرتووەتەوە، بە غاردان دووی کەوتووم و بێهودە بانگم کردووە، چۆن تا بەر قاڵدرمەکان هاتووم و ئیدی لەوێندەرەوە لەو تاریکییەدا بە کوێرە کوێر و بە مەزەندە بە دوایدا هاتووم.

ڕوو لە ژنەکەی هاواری کرد:

- خودایا، ئەمە هەموو شتیکی منە، هەموو کاغەز و بەڵگەکانمە، دار و حاری من لەم جانتایەدایە!

لەسەری ڕۆیشت و گوتی:

- برادەری ئازیز!... دەزانی چ چاکەیەکت دەگەڵم کردووە؟ ئەگەر شیر حەلاڵێکی وەکو تۆ نەبوایە، تۆ ئەم کاغەزانەمت نەدۆزیبایەوە، تیا حچووم!...

لەو کاتەدا دەسکی دەرگاکەم گرتبوو، تا بەبێ هیچ وەڵامێک وەدەرکەوم د بڕۆم بەڵام هەستم کرد هەناسەم بە تەواوی سوار بووە، کۆکەیەکی کوتوپڕی ئەوتۆ گرتمی کە بەزەحمەت خۆم بە پێوە دەگرت! سەیرم کرد کابرا خۆی شپرزە کردووە و بە هەر چوارنکالی ژوورەکەدا چاو دەگێڕێت : کورسییەکی بەتاڵ بۆ من پەیدا بکات. ئەنجام شڕوشیتاڵی سەر یەکێک لە کورسییەکانی هەڵڕشتە ناوەندی ژوورەکە. کورسییەکەی بۆ من هێنا، کۆمەکی کردم تا لەسەر کورسییەکە دابنیشم. کۆکەکەم نزیکەی سێ حقیقەی دی درێژەی کێشا. کە کۆکەکە بەری دام و وەخۆهاتمەوە سەیرم کرد کابرا لەسەر کورسییەکی دیکە، لەتەنیشت منەوە دانیشتووە و زەق زەق تەمەشام دەکات، دیار بوو کورسییەکەی خۆیشی بە هەمان شێوەی کورسییەکەی من چۆڵ کردبوو، یانی شڕوپڕەکەی سەری هەڵڕشتبووە ـوەندی ژوورەکە. بە زمانێکی حەکیمانە گوتی:

- پێدەچێ تۆ... نەخۆش بیت! من... من حەکیمم. (وشەی پزیشکی بەکار نەبرد).

بەدەم ئەو قسانەوە دەستی بۆ ژوورەکە ڕاکێشا، وەکو ئەوەی ئەرەزایی لەو وەزع و حاڵە ناڵەبارەی خۆی دەربڕێت، بڵێت ڕووی نەبوونی ڕەش بێت. لە سەری ڕۆیشت:

- دەبینم کە تۆ...

بەکورتی و بەدەم هەستانەوە گوتم:

- من نەخۆشی سیلمە...

"ئەویش بەلەز لە جێی خۆی هەستا. گوتی:

- ڕەنگە موبالەغە بکەیت... ئەگەر فریای خۆت بکەوی و نەخۆشییەکەت چارەسەر بکەیت...

"هێشتا زۆر شپرزە و نیگەران بوو، هەرچیی دەکرد وەخۆ نەدەهاتەوە. جانتاکەش بە دەستی چەپیەوە بوو.

"دیسان قسەکەم پێبڕی. دەسکی دەرگاکەم با دا و گوتم:

- خەمی منت نەبێ... هەفتەی پێشوو دکتۆر "ب... ین" معایەنەی کردم. چارەنووسی من ڕوونە، (دیسان ناچار ناوی "ب... ین"م برد) تازە کارم کراوە. ببورە!

ویستم دەرگا بکەمەوە و وەدەربکەوم و دکتۆری سوپاسگوزار و خەجاڵەت و شەرمەزار بەجێ بێڵم، کە ئەو کۆکە نەگریسە دیسان زۆری بۆ هێنام. کابرای دکتۆر دیسان زۆری لێ کردم کە دانیشم و پشوو بدەم. هەنگێ ئاوڕێکی لە ژنەکەی دایەوە. داوای لێ کرد کە سوپاسم بکات، ئەلهەقی ئەویش بێ ئەوەی لە جێی خۆی بجووڵێ، سوپاسێکی گەرموگوڕی کردم، بەڵام بەدەم سوپاسکردنەوە، گۆنا سیسەڵەکانی هێندەی دی زەرد هەڵگەڕان. ناچار دانیشتم، بەڵام سیمام هاواری دەکرد کە خەمی ئەوەمە ببمە بارگرانی بەسەریانەوە (کە کارێکی دروست بوو). هەستم کرد پەشیمانی، دکتۆر ئازار دەدات. کەوتە قسان، قسەی پچڕ پچڕ، هەر ساتە و قسەیەکی دەکرد:

"- ئەگەر من... ماڵت ئاوا بێت، مەمنوونی تۆم، لە چاکەت دەرناچم... شەرمەزاری تۆم... بێ مرۆتیم کرد دەربارەت... من... بە خۆت دەبینی(بە ئاماژەی دەست ژوورەکەی نیشان دام)... بەچاوی خۆت دەبینی کە من چ وەزع و حاڵێکم هەیە...

"گوتم:

"- هەمو شتێک دیارە. وا دیارە تۆ کارەکەت لەدەست داوە و هاتوویت بۆ پایتەخت تا سکاڵای حاڵی خۆت بکەیت و کارو فەرمانێکی دیکەوەربگریت، وانییە؟

- بەسەرسامی پرسی:

- چۆن... لەکوێ دەزانی؟

بەدەم پێکەنینەوە گوتم:

- بەسەروسیماتا دیارە. خەڵکانێکی زۆر بەو ئومێدانەوە دێن بۆ ئێرە، لە شارا دەسورێنەوە و ئیدی بەو جۆرە ڕۆژ بە ڕۆژ ژیان بەڕێ دەکەن...

لەناکاوا بە گەرمی کەوتە قسان، کاتێ سەربهووردی خۆی بۆ دەگێڕامەوە، لێوەکانی تەتەڵەیان دەکرد. ئەلهەقی گلەیی و سکاڵاکانی زۆریان کارتێکردم. نزیکەی سەعاتێک لە تەکیا مامەوە.. بەسەرهاتەکەی ئاسایی بوو. لە شارۆچکەیەکدا دکتۆری فەرمی دەوڵەت بووبوو، بەڵام بە هۆی پیلانێکەوە کە ناوی ژنەکەشیان تێوە گلاندبوو، لێکەوتبوو. ئیدی ئەویش بەخۆیدا شکابووەوە، غیرەتی قەبووڵی نەکردبوو و سەبری سوابوو وتووڕەبووبوو. ئیدی گۆڕانکارییەک لە دەستەی کارگێڕی کارمەندان و فەرمانبەرانی شارۆچکەکە بە قازانجی نەیارەکانی کرابوو. پێگەی لاواز بووبوو و نەیارەکانی لێی کەوتبوونە تەقە و پیلان و داویان بۆ نابووەوە و سکاڵایان لەسەر تۆمار کردبوو. لە کارەکەی دەر کرابوو، دوا پولی خۆی خەرج کردبوو وهاتبوو بۆ پترسبۆرگ تا سکاڵای حاڵی خۆی بکات و بێتاوانی خۆی بسەلمێنێ و بە مەسەلەکەیدا بچنەوە. ئیدی ماوەیەکی زۆر بەدەم چاوەڕوانی دادگای کارگێڕییەوە لە پترسبۆرگ مابووەوە. کە دادگا پێکهێنرا بوو، داواکەی ڕەفز کرابوو، ئەوسا کۆمەڵێک وەعد و بەڵێنی درۆیان پێدابوو، دەستیان پێ کردبوو. دوای ئەوە داوایان لێکردبوو، کە سکاڵا نامەیەک بنووسێت و سکاڵانامەکەشیان ڕەفز کردبوو، ئەوجا گوتبوویان، پاڕانەوە نامەیەک بنووسێت... هتد. خۆڵاسە، چوار پێنج مانگان ئەو سەرەگێژکە بێهوودەییەیان پێ کردبوو، هەرچیی پاشەکەوت کردبوو. خەرجی کردبوو تەنانەت جلوبەرگی ژنەکەشی خستبووە بارمتەوە. ئیدی لەو ماوەیەدا کوڕێکیان بووبوو! و... و... گوتی: "ئەمڕۆکە پاڕانەوە نامەکەشمیان بە یەکجارەکی ڕەفز کرد. هیچم بەدەستەوە نەماوە، نان لەماڵەکەماندا نییە.. ژنەکەشم تازە لە زەیستانی هەستاوەتەوە و

منداڵانی شیرەخۆری بە بەرەوەیە. من... من...

"لەناکاو هەستایە سەر پێیان، ڕووی وەرگێڕا. ژنەکەی لە سووچێکدا دەگریا و منداڵەکەش دووبارە دەستی بە واقە قاق کرد. دەفتەرچەی بیرەوەرییەکانم لە بەرکم دەر هێنا و چەند وشەیەکم تیا تۆمار کرد. کە نوسینەکەم تەواوکرد و هەستام، سەیرم کرد لە بەردەمما چەقیوە و بەکونجکاوی و نیگەرانی، تەمەشام دەکات. پێم گوت:

"ناو و بەسەرهاتەکەتم نووسیوە: ئەو شوێنەی کارت تیا دەکرد، ناوی فەرمانداری شارۆچکەکە، بەروار و ڕۆژ و مانگ. برادەرێکم هەیە بەناوی باخموتوف، هاودەورەی قوتابخانە بووین، ئەمە مامێکی هەیە بە ناوی پتروس ماتفیوفیچ باخموتوف کە ڕاوێژکاری دەوڵەتە و بەرێوەبەری بەشە...

"کابرای دکتۆر، بەدەم نیمچە لەرزینێکەوە هاواری کرد:

"- پتروس ماتفیوفیچ باخموتوف؟... هەموو کارەکەم لەدەستی ئەودایە! ..

"ئەلهەقی، هەموو سەربهووردی ئەم دکتۆرە و کۆتاییە خۆشەکەی کە من بە ڕێکەوتێکی خەیاڵ ئاسا ڕۆڵم تیای هەبوو، لە چیرۆکێک دەچێت کە بەگوێرەی نەخشەیەکی دیاریکراو داڕێژرابێت. "داوام لەو دوو بەلەنگازە کرد کە هیچ هیوایەکیان بە قسەکانی من نەبێت، چونکە منیش بە خۆم خوێنکارێکی داماوی ئامادەییم(بەئانقەست خۆم وەکو خوێندکارێکی ئامادەیی بێچارە نیشان دا، دەنا لەمێژ بوو خوێندنم تەواو کردبوو و هەنوکە خوێنکار نەبووم). لە سەری ڕۆیشتم و گوتم پێویست ناکات ناوی خۆمتان پێ بڵێم، ئەمەیان گرینگ نییە، بەڵام من بە زووترین کات دەڕۆم بۆ گەڕەکی ڤاسیلیڤۆسکی ئوستروف تا باخموتوفی برادەرم بدینم. من دڵنیام کە مامی، واتا ڕاوێژکارە دەوڵەتییەکە، کە پیاوێکی پیرە و ژنی نەهێناوە و منداڵی نییە، برازایەکەی خۆی یەجگار خۆش دەوێ، چونکە بە دوا بەرەی بنەماڵەکەیانی دەزانێ. بەو پێودانگە ڕەنگە ئەو برادەری من، لە بەرخارتی من لەلای مامی شەفاعەتێکیان بۆ بکات و لە ڕێگەی ئەوەوە شتێکتان بۆ بکات.

"دکتۆر، وەکو یەکێک تایەکی گەرمی لێهاتبێت، بە چاوانی ئەبڵەق و لێوە لەرزێوە هاواری کرد:

"خۆزگە دەمتوانی ڕووبەڕوو جەنابیان بدینم و وەزع و حاڵی خۆمی بۆ بگێڕمەوە! یانی تەنیا ئەو شەرەفەی پێدەبەخشیم و منەتباری دەکردم!

"بەڵێ دەقاودەق وای گوت: "تەنیا ئەو شەرەفەی پێدەبەخشیم و منەتباری دەکردم..." ئەوسا جارێکی دی دووبارەم کردەوە کە مەرج نییە ئەم هەوڵە سەربگرێت، ڕەنگە هەموو هەوڵەکانمان بە فیڕۆ بڕوات. ئەوجا پێم ڕاگەیاندن کە ئەگەر سبەی بەیانی نەهاتمەوە بۆ لایان، مانای وایە هەوڵەکانم سەری نەگرتووە و نابێ بەتەمای من بن. تا ماوم ئەوەم لەبیر ناچێت، کە بەچ خاکەساری و منەتباریەکەوە بەڕێیان کردم. ئیدی یەکسەر سواری گالیسکە بووم و بڕۆ بۆ فاسیلیڤوسکی ئوستروف.

"ئەوەی ڕاستی بێ بەدرێژایی سالانی قوتابخانە من و باخموتوف دوژمن بووین، هەموو ڕقمان لێی بوو بە ئورستۆکراتیمان دەزانی، یان بەلای کەمەوە من بە بەچکە ئورستوکراتم دەزانی. هەمیشە پۆشتە و پەرداخ و شیکپۆش بوو، بە گالیسکەی تایبەتی خۆیان بۆ قوتابخانە دەهات لووتبەرز و لەخۆبایی نەبوو، بەڵکو برادەرێکی دڵسۆز، ڕووخۆش و نوکتەباز و حازر وەڵام بوو. هەرچەند زیرەکێکی ئەوتۆی نەبوو، بەلام هەمیشە لە یەکەمەکانی پۆل بوو. من قەت ڕۆژێ لە ڕۆژان لە هیچ وانەیەکدا یەکەم دەر نەچووم. هەموو هاوڕێکانی خۆشیان دەویست تەنیا من نەبێت. لەماوەی سالانی قوتابخانەماندا، زۆر جار هەوڵی دەدا خۆیم لێ بێنێتە پێشێ، بەلام من هەموو جارێ بەگرژییەوە ڕووم لێی وەر دەگێڕا و ڕووم نەدەدایە.

"نزیکەی ساڵێک بوو نەمدیتبوو. ئێستا لە زانستگە بوو. کە من دوای سەعات هەشتی شەوێ چوومە ماڵەکەی (هەڵبەتە یەکسەری و بێ پرس خۆم بە ماڵەکەیدا نەکرد، بەڵکو دەرگاوان و خزمەتکاران چوونی منیان پێ ڕاگەیاند) لە سەرەتاوە بەسەرسامی و هەندێک بە ساردی پێشوازی کردم، بەلام زۆری نەبرد ڕووی گەشایەوە و بەدەم تەمەشاکردنی منەوە، زۆر

خۆمانە لە قاقای پێکەنینی دا:

-"خێرە، وا منت بیر کەوتووەتەوە و هاتوویت بۆلام؟

"وەکو هەمیشە، بە زبازێکی بێپەروا، بەڵام دوور لە هەر سووکایەتی و تەشەرێک قسانی دەکرد. ئەوە یەکێک بوو لەو خەسڵەتانەی کە من هەم زۆرم بەدڵ بوو، هەم بە هۆیەوە ڕقم لێی بوو. بەشپرزەیی پرسیی:

- خێرە، چیتە؟ نەخۆش دیاریت!

"کۆکە، تەرزەکوتی دایگرتمەوە. بەسەر کورسییەکدا کەوتم و بە هەزار حاڵ هەناسەم وەبەر هاتەوە."

گوتم:

"- هیچ نییە. نەخۆشی سیلمە. هاتووم ئیشێکم تێت کەوتووە.

"بەسەرسامی لە جێی خۆی دانیشت، منیش سەربهووردی یارۆی پزیشکم لە سیری تا پیازی بۆ گێڕایەوە. پێم گوت کە ڕەنگە لەڕێگەی مامیەوە، کە زۆری خۆش دەویست، بتوانێ کارێک بۆ ئەم پیاوە بکات، گوتی:

- بۆی دەکەم، دڵنیا بە بۆی دەکەم! لە سبەینێ زووتر نییە لە لای مامم بۆی تێ دەکەوم. تەنانەت بەخۆشیشەوە هەوڵی بۆ دەدەم. ئەلهەقی تۆش بە شێوازێکی شیرین و خۆش گێڕاتەوە، بەڵام چی منی بیر خستیتەوە و لێبڕایت کە بێی ڕوو لە من بنەی تیرنتییف گیان؟

"- هەموو شتێک وەستاوەتە سەر مامت، باخموتوف خۆت چاک بیرتە ئەوسا من و تۆ دوژمن بووین، بەڵام من چونکە دەمارت دەناسم، دەزانم کەسێکی مەردو ڕەند، ئەسڵزادە و ڕەسەنیت، بۆیە بیرم لەوە دەکردەوە، کە مەحاڵە دەست بە ڕووی تەنانەت دوژمنیشەوە بنەیت.

"ئەو ڕستەیەم بە جۆرە تەشەرێکەوە گوت. بەدەم قاقای پێکەنینەوە گوتی:

"- ناپلیونش هەمان قسەی بە ئینگلیزەکان گوت! "و کە بینیی من زۆر بە جیددی و بە سەنگینی خەریکە لە سەر کورسییەکە هەڵدەستم، لەسەری ڕۆیشت و گوتی:

"هەرچیم لەدەست بێ دریغی ناکەم! پەیگیری دەکەم. ئەگەر بکرێت، هەر ئیستا دەڕۆم بۆلای مامم!

" هەڵبەتە مەسەلەکە بە شێوەیەکی ئەوەندە باش چارەسەر بوو کە لە تەسەوری کەسدا نەبوو. لە زەرفی مانگ و نیوێکدا دکتۆرەکەمان، لە شارۆچکەیەکی دیکە دامەزرا، تەنانەت کرێی گوێزانەوە و کۆمەکی دارایشی درایێ. پێم وایە باخموتوف، بە زۆر دکتۆری هێنابووە ڕەدا کە سلفەیەکی بە قەرز لێوەر بگرێت. زوو زوو سەری دکتۆری دەدا(بەڵام من بەئانقەست پێم لێ بڕی. تەنانەت ئەگەر دکتۆریش بە ڕێکەوت سەری دابام زۆر بە ساردوسرِی پێشوازیم دەکرد). بە درێژایی ئەو شەش هەفتەیە تەنیا دوو جار (باخموتوف)م بینی، جاری سێیەم وەختێ بینیمەوە، کە بەبۆنەی سەفەری دکتۆرەوە ئاهەنگێکی شێو وشامپانیای ساز کردبوو. ژنەکەی دکتۆر، بەشداری شیڤەکەی کرد، بەڵام زۆر زوو جێی هێشتین، تا بچێ بەلای منداڵەکەیەوە. ئەم ئاهەنگە لە سەرەتاکانی مانگی پێنجدا بوو. ئێوارەیەکی زۆر جوان و دڵگیر بوو، گۆی هەتاو خەریک بوو لە کەنداو ئاوا دەبوو. باخموتوف لەگەڕانەوەدا تا ماڵەوەی گەیاندمەوە. بە پیاسە بەسەر پردی نیکولایوفیچدا تێپەڕین، هەر دووکمان بڕێک مەست و سەرخۆش بووین. باسی ئەوەی بۆ کردم، کە زۆر بە ئەنجامی کارەکەی دکتۆر خۆشحاڵ بووە. سوپاسی منی کرد و باسی ئەوەی کرد کە چەند خۆشحاڵ بووە بەوەی کە ئەو کاری خێرەی کردووە و گوتی هەمووی لە چاوی من دەزانێت و، دڵنیای کردم کە هەموو ئەم کارەی لەبەر خاتری من کردووە. ئەوجا لەسەری ڕۆیشت و گوتی ئەو خەڵکە زۆرەی کە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا پێیان وایە کاری خێری فەردی هیچ فایدەیەکی نییە، هەڵەن و سەرچیخ چوون. منیش قەریحەی قسەکردنم کرابووەوە ئەمما کرانەوە، دەمویست بیروبۆچوونی خۆم دەر برم. دەستم بە قسان کرد و گوتم:

"هەر کەسێک خۆی بۆ چاکە کاری و خێری فەردی تەرخان بکات، دژی تەبیعەتی مرۆڤ دەوەستێتەوە و کەرامەتی شەخسیی ئەو کەسە دەڕوشێنێ کە چاکەکەی دەگەڵدا دەکات، بەڵام "چاکە کاری کۆمەڵایەتی" و





مەسەلەی ئازادیی فەردی، دوو شتی سەربەخۆن، هیچیان ئەویتریان ناسڕنەوە، یانی هەڤدژ نین. کاری خێر و چاکەکاری فەردی هەر دەمێنێ، چونکە ئەمە پێویستییەکی بەشەری زیندووە، پراکتیزە کردنی دەسەڵاتی ڕاستەوخۆی کەسێکە بەسەر کەسێکی ترەوە. کاتی خۆی پیرە جەنەڕاڵێک (کارمەندی پایەبەرز) لە مۆسکۆ هەبوو، مەبەستم "ڕاوێژکاری دەوڵەتە" شۆرەت و لەقەبێکی ئەڵمانیی هەبوو. ئەم پیاوە کردبووی بە عادەتی هەمیشەیی خۆی کە سەردانی زندان و زیندانیان بکات. وای لێهاتبوو، هەر دەستە زندانیەکی مەحکوم کە ئامادە دەکران، هەواڵەی سیبریا بکرێن، پێشوەختە دەیانزانی ئەم پیرەمێردە چاکەکارە لە " گردی کێشان"* سەریان دەدات. ئەم پیاوە، ئەو کاری خێرەی بەوپەڕی جیددی و خێرخوازی ئەنجام دەدا. دەهات و بەڕێز بە سەری دەکردنەوە، لەبەردەم یەک بە یەکیاندا دەوێستا، لێی دەپرسین، لە پێویستییەکانیانی دەپرسی، نەوەعزی ئەخلاقی بۆ دەدان و نە ئامۆژگاری دەکردن، بە یەک چاوی تەماشای دەکردن، هەر هەموویانی بە "برادەرانی من" گاز دەکرد. عادەتی وابوو پارەیان بەسەردا ببەخشێتەوە و کەلوپەلی پێویستیان بۆ بنێرێت: گۆرەوی، جلوبەرگ و ئەم جۆرەشتانە، هەندێ جار نامیلکەی بچووک بچووکی ئایینیشی بۆ دەهێنان، دەیدان بەوانەی خوێنەواریان هەبوو، چونکە دڵنیابوو کە لە ڕێگای سیبریادا دەیخوێننەوە و ناوەڕۆکەکەی بۆ ئەوانەی دی کە نەخوێندەوار بوون، دەگێڕنەوە... بەدەگمەن پرسیاری تاوانەکانیانی دەکرد، بەڵام ئەگەر زندانیەک بەخواستی خۆی بیوستایە تاوان و خەتایەکەی خۆی بۆ بگێڕێتەوە، بەدڵ و گیان گوێی لێدەگرت. جیاوازی لەنێوان زندانیەکاندا نەدەکرد، بە یەک چاو سەیری دەکردن و بە یەکسانی ڕەفتاری دەگەڵ هەموویان دەکرد. بە شێوەیەک دەیدواندن لە تۆ وایە برای خۆین. ئەنجام زندانیەکان بەچاوی بابی خۆیان تەمەشایان دەکرد. ئەگەر زندانیەکی ژنی دیتبا کە منداڵێکی بە باوەشەوە با، خێرا دەچوو بەلایەوە. منداڵەکەی دەلاواند و چەقەنەی بۆ لێ دەدا تا بیهێنێتە پێکەنین. ساڵەهای ساڵ، لەسەر ئەم کاری خێرە بەردەوام بوو تامرد. وای لێ هات لە هەموو ڕووسیا و لە





سەرانسەری سیبریادا، بە تایبەتی لەنێو زندانەکاندا، ناو و شۆرەتی پەیدا کرد. پیاوێک، کە مدەتێک لە سیبریا بووبوو، بۆی گێڕامەوە کە چۆن تلرەقترین تاوانبار یادی بە خێری ئەم جەنەڕاڵەیان دەکردەوە، هەرچەندە بەدەگمەن پتر لە بیست کوپێکی بە هەر زندانیەک دەدا. ڕاستە ئەو زندانیانە نە زۆر بەرێز و منەتباری و گەرموگوڕییەوە و نە بە جیددی باسی جەنەڕاڵیان نەدەکرد. دوای بیست دانە ساڵ یەکێک لەم "نەگبەتانەی" کە دوازدە کەس و شەش منداڵی تەنیا بۆ کەیفی دڵی خۆی بە کێردان کوشتبوو (دەڵێن گوایە ئەو جۆرە کەسانەش هەن) ناوبەناو هەناسەیەکی هەڵدەکێشا و دەیگوت: " تۆ بڵێی ئەو جەنەڕاڵە خێرخوازە، ئەو پیاوە باشە چیی لێ هاتبێ؟ بڵێی مابێ یان مردبێت؟!..." کابرای زیندانی، بێ هیچ هۆ یان بۆنەیەکی دیاریکراو، ئەو یادەوەرییەی بە مێشکا دەهات. ڕەنگە بە درێژایی بیست دانە ساڵ تاقە جارێک ئەوەی بە بیردا هاتبووبێ، لەوەشە دوا بە دوای ئەوە بزەیەکی تیژ تێپەڕیشی بۆ کردبێت، هەر ئەوەندە و بەس! بەڵام کێ دەیزانی کە ئەو "پیرەمێرە چاکە کارە" تۆوێکی وای لە دەروونی ئەو کابرایەدا داچاندووە کە بۆ هەتا هەتایە بمێنێ و، کابرای زندانی بۆ ماوەی بیست دانە ساڵ لەیادگە و خەیاڵدانی خۆیدا بیپارێزێت و هەڵی بگرێت؟ باشە باخموتوف، تۆ دەزانی ئەم هەڤبەندیە لەنێوان مرۆڤێک و مرۆڤێکی تردا، چ باندۆر و کاریگەرییەکی لەسەر مرۆڤی دووەم، واتە خێرپێکراوەکە، دەبێت؟ لەم مەسەلەیەدا، عومرێک لەئارادایە، دنیایەک ڕاز و نهێنی لە ئارادان، کە لە مەودای دید و بینینی ئێمە بەدەرن، نایانبینین. باشترین و بە تواناترین شەترەنجباز، دووربین ترین شەترەنجباز، ئەوپەڕەکەی پێشبینی چەند حەرەکەتێکی دواتری، هەڤڕکەکەی دەکات. دەگێڕنەوە گوایە شەترەنجبازێکی فەرەنسی هەبووە دەیتوانی پێشوەختە نەخشەی دە جووڵە بکێشێت، ئیدی ئەمە بووە بە داستانی سەر زاران و وەکو پەرجوویەک هاتووەتە گێڕانەوە. جا لەم مەسەلەیەدا کە ئێمە باسی دەکەین، یەک دنیا جووڵە هەن، یەک دنیا نەخشە و کارو کاردانەوە هەن کە ئێمە نەدەیان بینین و نەدەیانزانین! جا تۆ کە تۆوێک دادەچێنی، کە "خێرو چاکەیەک"

دەکەیت، بە هەر مەبەست و شێوەیەک بێت، بە شێک لە کەسێتی خۆت دەبەخشیت و بەشێک لە کەسێتیی بەرامبەرەکەت بۆ خۆت ڕادەکێشیت و وەر دەگریت. ئیدی هەڤبەندیەک دەکەوێتە نێوانتانەوە. یەک تۆز لەمە ورد ببیتەوە، کەمێک بەدیقەت تەمەشای بکەیت و زەینی بدەیتێ، شتێکت بۆ کەشف دەبێت و دەر دەکەوێت کە قەت بەبیرتا نە هاتبێت. دیارە لە ئەنجامدا وات لێ دێت، کە ئەم خێرەوەمەندی و ئاکامی ئەم خێرەومەندی و چاکە کاریەی خۆت، بە زانست بزانیت، زانستێک کە بە سەر سەراپای ژیانتا زاڵ بێت و هەموو ژیانت بگرێتەوە، هەنگێ هەموو بیرەکانت، گشت ئەو تووانەی دات چاندووە و لە گینە هەر بیریشت نەمابێ، ڕەگوڕیشە دەهاوێت، چەکەرە و شکۆفە دەکات و تەرز دەهاوێ. ئەوەی لە تۆی وەرگرتووە، بۆ خەڵکانی دیکەی دەگوازێتەوە. هەنگێ چوزانی چ دەوڕێکت لە دیاریکردنی چارەنووسی ئاییندەی تیرەی بەشەردا دەبێت؟ جا ئەگەر توانیت بە زەبری زانیاریی خۆت و بە هۆی تەرخانکردنی تەمەنێک بۆ ئەو جۆرە چاکەکاری و خێرەومەندیە، بگەیتە ئاستێکی باڵای ئەوتۆ کە بتوانی تۆوێکی بەبرشت داچێنی و بیر و ئەندێشەیەکی کاراو بەهێز لە دنیادا بڵاو بکەیتەوە، هەنگێ... هتد، بەو جۆرە، ئەو ڕۆژە زۆرم قسان کرد.

"باخموتوف، وەکو یەکێک گلەییەکی زۆر لە کەسی سێیەم بکات، هاواری کرد:

"- دوای ئەوەوادەزانی ژیانت لێ قەدەغەیە!

"لەو کاتەدا، ئانیشکمان دادابووە سەر محەجەرەی پردەکە. تەمەشای ڕووباری نیڤامان دەکرد، زیاتر خۆم بەسەر محەجەرەکەدا دانەواندەوە و گوتم:

"- دەزانی چ بیرێکم بە مێشکا هات؟

"باخموتوف، بە نیمچە ترسێکەوە هاواری کرد:

"- خۆت هەڵبدەیتە ئاوەکەوە؟

"پێدەچوو، ئەم خەیاڵەی لە سیمامدا خوێندبێتەوە.

"گوتم:

- نا، من حاڵی حازر بەم جۆرە بیردەکەمەوە. من هەنوکە دوو-سێ، ئەو پەڕی چوار مانگم لەژیانا ماوە، بەڵام کاتێ بۆ نموونە تەنیا دوو مانگم لە دنیادا بمێنێ و بە کەماڵی ئارەزوو حەز بکەم کارێکی خێر بکەم کە پێویستی بە هەوڵ و تەقەلایەکی زۆر بێت، وا بخوازێت سەر بەم کون و بەو کوندا بکەم، بێم و بچم، زەحمەتێکی زۆر بکێشم، وەکو ئەوەی بۆ مەسەلەکەی دکتۆرەکەی لەمەڕ خۆمانم کێشا. هەنگێ ناچارم لەبەر کەمی دەرفەت، دەستبەرداری ئەم کارەخێرە ببم و بیر لە کارێکی خێری دیکە بکەمەوە، کارێکی بچووک کە باری بەرم و لە توانای خۆمدا بێت. (ئەمە حاڵێکا ئەگەر کەڵکەڵەی کاری چاک زۆرم بۆ بێنێ و بەرۆکم بەر نەدات!) بیرۆکەیەکی خۆشە، وانییە؟" باخموتوفی بەلەنگاز، زۆر نیگەرانی من بوو. گەیاندمیەوە بەر دەرگای ماڵەوە. ئەوەندەی هۆش بەخۆوە بوو کە بە پێویستی نەزانی دڵخۆشیم بداتەوە، بەدرێژایی ئەو ماوەیەورتەی لێوە نەهات. لە کاتی خواحافیزیدا تەوقەیەکی گەرموگوڕی دەگەڵ کردم و داوای لێ کردم کە ڕێی بدەم سەرم بدات. وەڵامم دایەوە کە ئەگەر بۆ "دڵدانەوە و دڵنەوایی" من دێت (هەڵبەتە، هاتنەکەی، با بە خۆیشی نەیڵێت، زیاتر بۆ دڵدانەوە و دڵنەوایی من بوو) ئەوا هەموو جارێک مەرگی نزیکی خۆمم بیردەخاتەوە. شانەکانی هەڵتەکاند، بەڵام دروستیی قسەکانی سەلماندم. هێندە بەخۆشی و گەرموگوڕی لێکدی جیا بووینەوە، کە قەت وێنام نەدەکرد.

"لە ماوەی ئەو ئێوارە و شەوەدا، تۆوی "دوا باوەڕ و قەناعەتی" خۆم داچاند. بە تاسەمەندی و تامەزرۆیی کەوتمە تاوتوێکردنی ئەم بیرە تازەیە، زۆر بە گەرمی کەوتمە ڕاڤە و شیکردنەوەی، لە هەموو ڕوویەکەوە کەوتمە هەڵسەنگاندنی (ئەو شەوە تا بەیانی نەخەوتم). تا زیاتر لێی قووڵ دەبوومەوە، تا قووڵتر لێی ڕادەمام و هەڵگێڕ و وەرگێڕم دەکرد پتر ترسم لێدەنیشت. ئاقیبەت ترسێکی گەورە سەراپای گرتم، تا چەندین ڕۆژ. بە ڕۆکی زەینی بەر نەدام. هەندێ جار کە ئەو ترسەم بیر دەکەوتەوە، ترسێکی تازەتر بەنجی دەکردم، لە جێی خۆ وشکی دەکردم. لە ئەنجامی

شیکردنەوەی ئەم ترسەوە بگەمە ئەو ئەنجامگیرییەی کە "دوا باوەڕ و قەناعەتەکەم" بە جۆرێ لە دڵ و دەروونمدا ڕیشاژۆ بووە، ڕەگی داکوتاوە کە هەر دەبێ بمگەیەنێتە ئەنجامێک، بەڵام هەرچیم دەکرد و دەکۆشا، زاتی ئەوەم نەبوو قەرار لەسەر ئەو ئەنجامە بدەم و پراکتیزەی بکەم. دوای سێ هەفتە، ئەو هەموو ترس و دڵەڕاوکێ و دوودڵی و نیگەرانییە ڕەوییەوە، زاتم وەبەر هاتەوە، بەڵام ئەوە دوای ڕەوشێکی زۆر سەیر و غەریب ڕووی دا.

"من لێرەدا، لەم شرۆڤە و ڕونکردنەوەیەدا ئاماژەم بە هەموو کەسەکان و بە ڕوارەکان داوە، ڕەنگە دواتر پێویستم پێیان نەبێ، بەڵام بۆ "ئێستا" (ڕەنگە تەنیا بۆ ئەم ساتە بە پێویستی بزانم) چونکە حەز دەکەم هەموو ئەو کەسانەی گەرەکیانە داوەری دەربارەی کارەکەم بکەن، زنجیرەی لۆژێکی ئەو ڕووداو و بویەرانە بزانن و ببینن کە ئەم "دوا باوەڕو قەناعەتەی" منیان خولقاندووە و لێکەوتووەتەوە.

"گوتم زاتی ئەوەم پەیدا کردوە تا ئەو "دوا قەناعەتەی"خۆم پراکتیزە بکەم، پێم وایە نەک لە ڕێگەی لێکدانەوەیەکی لۆژیکیەوە، بەڵکو بە هۆی شۆکێکی چاوەڕوان نەکراوەوە، ئەو زاتەم پەیداکردەوە، بە هۆی ڕووداوێکی نائاساییەوە کە هیچ پەیوەندییەکی بە ڕێڕەوی مەسەلەکەوە نەبوو.

"دە ڕۆژێک لەمەپێش، ڕوگوژین بۆ کارێکی تایبەتی خۆی، سەری دام کە لێرەدا دەرفەتی باسکردنی نییە. من پێشتر هەرگیز ڕوگوژینم نەبینیبوو، بەڵام زۆر شتم دەربارەی بیستوو. هەر هەموو ئەو زانیاریانەم دایە کە پێویستی بوون، ئیدی زۆر نەمایەوە و ڕۆیشت. تەنیا بۆ ئەو مەبەستە هاتبوو، دەکرا پەیوەندی نێوانمان لەم سنوورەدا بوەستێ و ببڕێتەوە، بەڵام کابرا بە ڕاستی زۆر سەرنجی ڕاکێشابووم، بە درێژایی ئەو ڕۆژە کۆمەڵێک هزرو بیری غەریب لە خەیاڵ و لە بیرم ئالان، هزر و بیرێکی ئەوتۆ کە هەراسانیان کردم، بۆیە لێبڕام بۆ سبەینێ سەرێکی بدەم. هەڵبەتە. ڕوگوژین نەک هەر بەدیتنم خۆشحاڵ نەبوو، بەڵکو بە نەزاکەتەوە تێی





گەیاندم کە حەز ناکات دۆستایەتیمان بەردەوام بێت. وێڕای ئەوەش سەعاتێکم لەکن وی بردە سەر کە پێم وایە هەم لەو وهەم لە منیش خۆشگوزەرا. هەڤدژی نێوانمان کاریگەریی خۆی هەبوو، هەم ئەو هەستی پێ دەکرد و هەم منیش. ڕۆژانی تەمەنی من دابوویانە کەمی و لە ئاخروئۆخردا بوون، ئەو ژیان و سەلامەتیی لێ هەڵدەقوولا، بۆ هەواو هەوەسی ئەو ساتە دەژیا کە تیای بوو، "دوا قەناعەت و ئەنجامگیری"، یان ژمارە و ئەو شتانەی بەلاوە گرینگ نەبوو و هەر گوێی نەدەدایە.. هەر شتێک پەیوەندیی بە... بە... کەیف و ڕابواردن و شێتاتیی خۆیەوە نەبوایە گوێی نەدەدایە.. هیوادارم ئاغای ڕوگوژین بمبورێت لە بەکارهێنانی ئەو وشانە، کە خۆی لەخۆیدا نیشانەی ئەوەیە کە من نووسەرێکی بێ توانام و نەمتوانیوە بە جوانی گوزارشت لە بیرو بۆچوونی خۆم بکەم. من کە "ڕوگوژین"م بینی، هەرچەندە هیچ لوتفێکی نەنواند، بەلام هەستم کرد پیاوێکی زیرەکە، دەتوانێ لە زۆر شتان بگات، هەرچەندە گوێی بەو شاتانە نەدەدا کە ڕاستەوخۆ پەیوەندییان بەوەوە نەبوو. هەڵبەتە سەبارەت بە "دوا قەناعەتی" خۆم هیچم لەگەڵیا باس نەکرد، بەلام هەستم کرد بە خۆی لە میانەی قسەکانمەوە پەی پێبردووە. ئەم پیاوە زۆر بێدەنگ بوو، تا حەزبکەی بێدەنگ و کەمدوو. لەدڵی خۆدا گوتم پێدەچێ وێڕای ناکۆکی و هەڤدژی و دووریمان لە یەکدی، زۆر لە "دوا قەناعەتی" منەوە دوور نەبێت، وەکو فەرەنسییەکان دەڵێن کۆتاییە دوورەکان یەک دەگرنەوە. (ئەو دەستەواژە فەرەنسیەم بۆ کرد بە ڕووسی). زۆر بە قێز و بێزەوەوەلامی دایەوە. ئەوجا هەستا چوو بە خۆی کلاوەکەمی بۆ هێنام، بە درۆوەوای نواند کە پێی وایە من خۆم بۆ ڕۆیشتن ئامادە دەکەم. ئیدی بەو بیانووەی کە لە ڕووی ئەدەب و نەزاکەتەوە بەڕێم دەکات، لە ماڵە شوومەکەی وەدەری نام. سەرم لەم ماڵەی ئەم سووڕ مابوو: دەتوگوت گۆڕە، بەلام پێدەچوو، خۆی زۆری بە دڵ بێت، هۆیەکەشی زەق و دیار بوو: ژیانی ڕوگوژین، هێندە جەنجاڵ و شلۆق و بە ئاژاوە بوو، کە فریای ئەوە نەدەکەوت بیر لە ماڵێکی خۆشتر و دڵگیرتر بکاتەوە.

"ئەو دیدارەی ڕوگوژین زۆری ماندوو کردم. ئەلهەقی هەر لە بەیانی زووەوە بێتاقەت و لەش بەبار بووم. کە شەو داهات زۆر شەکەت و ماندوو وبێتاقەت بووم، لەسەر جێگاکەم ڕاکشام. هەندێ جار تایەکی توندم لێدەهات و دەکەوتمەوڕێنە. کولیا تا سەعات یازدە لەلام مایەوە. بەهەرحاڵ هەموو ئەم قسانەم لە بیرن کە کردنی، ئەو بابەتانەشم لە بیرن کە قسەمان لێکردن، بەڵام هەر کە پێڵوەکانم قورس دەبوون و بەئاستەم چاوم دەچووە خەو، یەکسەر وێنەی (ئیڤان فومیچ سوریکوف)م دەهاتە خەو، لە خەوەکەمدا بووبوو بە ملیونێر، بەدەست پارەوپوولەوە خەریک مابوو، نەیدەزانی چیی لێ بکات، بیری لەوە دەکردەوە چۆن و لەکوێی دابنێ تا دەستی دزانی نەگاتێ. ئەنجام بڕیاری دەدا کە لە چاڵیان بنێت، بەڵام من ئامۆژگاریم دەکرد کە بە خۆڕایی ئەو هەموو زێڕە لە چاڵ نەنێت، بەڵکو بیانتوێنێتەوە و تابوتێکی زێڕی چکۆلەی بۆ منداڵەکەی، ئەو منداڵەی لە سەرما ڕەق بووەوە و مرد، لێدروست بکات. ئەوسا قەبری منداڵەکە هەڵبداتەوە و جەندەکەکەی لە تابووتە زێڕەکە بنێت. سۆریکوف، زۆر بە مەمنوونی و بەدەم فرمێسکی منەتباری و پێزانیەوە، ئەو قەشمەربازیەی منی قبووڵ کرد و کەوتە جێبەجێکردنی، منیش بە نەفرەت و بێزارییەوە، بە تەشەرەوە، کە فایدەی نییە ئەم پیاوە نابێ بە بەشەر، تفێکم ڕۆکردە سەر زەوی و ڕۆیشتم. کاتێ بە تەواوەتی وەخۆهاتمەوە، کۆلیا بۆی گێڕامەوە کە من هەرگیز نەخەوتبووم و بە درێژایی ئەو ماوەیە باسی "سوریکوف"م بۆ کردبوو. چەند جارێک نیگەرانی یەکی زۆر تووش دایگرتم، بۆیە کولیا بەو پەڕی پەشێوی و پەرێشانی جێی هێشتم. کاتێ لە دوای ڕۆیشتنی ئەو هەستام تا دەرگاکە بە کلیل دابخەم ڕێک لەو کاتەدا و کوتوپڕ، ئەو تابلۆیەم بیر کەوتەوە کە ئەو ڕۆژە لە ماڵی ڕوگوژین، بە سەرووی دەرگای یەکێک لە ژووره هەرە تاریک و ناخۆشەکانی ماڵەکەیەوە، دیتبووم. کاتێ بەلای ئەم تابلۆیەدا ڕەتوبووین، بە خۆی نیشانی دام، لێم بە درۆ نەبێ نزیکەی پێنج دەقیقەیەک لەبەردەم تابلۆکەدا وەستام، لە باری هونەرییەوە هیچی تیا نەبوو، بەڵام خستیمە گێژاوی نیگەرانییەکی توندەوە.





"تابلۆکە، ڕەنگدانەوەی ئەو ساتە بوو کە تازە مەسیحیان لە خاچەکە هێنابووە خوارەوە، لێم بە درۆنەبێ، شێوەکار و نیگار کێشەکان، خوویان بەوە گرتووە، کاتێ کەوێنەی مەسیح دەکێشن، چ بەسەر خاچەکەوە بێ و چ لە خاچەکە هێنرابێتە خوارەوە، دەموچاوی لەڕادەبەدەر گەش و ڕووناکی ڕووناک دەکێشن، تەنانەت لە ترسناکترین ساتی عەزابدا، هەر ئەو جوانیە بەرجەستە دەکەن و دەیپارێزن، بەڵام ئەو تابلۆیەی کە لای ڕوگوژین دیتم، ئەو جوانیەی تیا نەبوو. وێنەی پیاوێکە، کە گوزارشت لە هەر هەموو ئەو ئازار و عەزابە ترسناک و بێپایانانە دەکات کە مەسیح تەنانەت پێش لە خاچدانەکەشی چەشتوونی، لە تابلۆکەدا شوێنەواری زامەکانی، شوێنەواری ئەشکەنجەدانی لە لایەن پاسەوانەکانییەوە، شوێنەواری تێهەڵدانی لەلایەن خەڵکەوە لەو کاتانەدا کە لەژێر باری قورسی خاچەکەیدا دوولۆ کوماببووەوە و بەدەم لەتردانەوە دەکەوت، شوێنەواری عەزابی لە خاچدانەکەی (کە بە حسابی من بەلای کەمەوە دەبێ شەش سەعاتی خایاندبێ) هەر هەمووی پێوە دیار بوو. بە ڕاستی دەموچاوی پیاوێک بوو کە "تازە" لە خاچەکە هێنرابووە خوارەوە، هێشتا هاڵاوی ژیانی لێهەڵدەستا. هێشتا غوباری مەرگی لێ نە نیشتبوو. سیمای مردووەکە. لەوە دەچوو هێشتا هەر عەزاب بکێشێت. (بە ڕاستی هونەمەندەکە هونەرمەندانە مامەڵەی لەتەک ئەو خاڵەدا کردبوو). بەهەرحاڵ، تابلۆکە گوزارشتێکی بێ چەندو چوون بوو، لە دەموچاوی هەر کەسێک کە عەزابێکی وەکو ئەو عەزابەی کێشا بێت. من دەزانم کە کڵێسای مەسیحیەت، لە سەدەکانی سەرەتاوە، باوەڕی وابوو کە مەسیح ڕەنجی کێشاوە. عەزابی چەشتووە، ڕەنج و عەزابی مەسیح، شتێکی ڕەمزی نەبووە، بەڵکو شتێکی واقیعی بووە، بۆیە لە خاچدانەکەی و کاتێ بەسەر خاچەکەوە بووە، هەر هەمووی بێ چەندو چوون سروشتی بووە، جا لەم تابلۆیەدا، دەموچاوەکە، تەواو شێوابوو، بە هۆی لێدان و جەزرەبەوە، تەواو ئاوسا بوو، یەکپارچە ڕوشان و برین و زامی تەڕ و ترسناک بوو، چاوەکانی ئەبڵەق، کرابوونەوە. سپێنەی چاوەکانی وەکو شووشە دەبریسکانەوە و مەرگیان دەنواند، بەڵام سەیر ئەوەیە کە دیمەنی ئەم پیاوە عەزابدیدەیە، ئەم پرسیارە سەیرە دەوروژێنێ:

باشــە ئەگــەر هــەموو موریــدەکانی، هــەموو یــارانی و، گشــت ئەو ژنانــەی باوەڕیان پێهێنابوو وهەنوکە لەپای خاچەکەیدا وەستابوون، ئەگەر ئەوانـەی باوەڕیــان پێهێنــابوو ودەیانپەرســت، ئەگــەر هــەر هــەموو ئەوانــە بــەچاوی خۆیـان ئەو جەنازەیـەیان بەو شـێوەیە دیتبـوو (هەڵبتـە دەبێ جەنازەکە بەو شێوەیە بـووبێ کەوەسـفمان کرد). کە ئـەم دیمەنـەیان بـەچاوی خۆ دیتبوو، چـۆن توانیبوویـان باوەڕبکـەن کـە ئـەم شـەهیدە دەتوانێـت دووبـارە زنـدوو ببێتەوە و هەستێتەوە؟ ئەمە دەکاتە کارێک، پیاو بیەوێ و نـە یەوێ، لـە دڵـی خۆیدا بڵێت: باشـە ئەگـەر مـەرگ بـەم ڕادەیـە ترسـناک بـێ، ئەگـەر یاسـا و ڕێسای تەبیعەت ئەوەندە بەهێز و نـەگۆڕ بێت، چۆن دەکرێ بـە سـەریا زاڵ بـی، سـەربکەوی؟ تەبیعـەتێک کـە "ئەو" دەرەقـەتی نـەهات و پێـی نەوەسـتا، ئەوێک کە تا لە ژیانا بوو، سروشتی ڕام کرد، خستیە ژێر فرمـانی خـۆیەوە و کە هاواری کرد: " تولـەیتا ڕابـە"* کچۆڵـەی تـاین یەکسـەر هەسـتایەوە. کـە گـوتی: "ئـەی ئـەلیعازر وەرە دەرێ"* مـردووە کـە دەسـتبەجێ لـە گۆڕەکـەی هاتـە دەرەوە. لـە کاتێکا پیـاو کـە لـەم تابلۆیـە ڕادەمێنـێ، ورد دەبێتەوە، وای دێتە بەرچاو کە تەبیعەت دڕندەیەکی هۆڤی، زەبەلاحی، دڵڕەشی، کینـە لـەدڵی کەڕو کاسـە. یـان بـە گوتەیـەکی دی، دەشـێت تەبیعـەت بـە ئـامێرێکی نۆبـاوی مۆدرێنی دێو ئاسا بشوبهێنرێ، با ئەم شوبهاندنە نائاسـاییش بێـت، ئـامێرێکی دێو ئاسای زەبەلاح، کەڕی بێ هەسـت، کەودەنـی نـەفام، کـە" بوونـەوەرێکی" گەورە و هێزای هاوڕێ بێ و قووتی دابێت، "بوونەوەرێک" کە بـە تـاقی تـەنیا هەموو تەبیعەت و یاساکانی تەبیعـەت بێنـێ و دوور نـەبێ هـەموو گـەردوون و دنیا تەنیا لەبەر خاتری ئەو بوونەوەرە دروست کرابێت!

"بــە نــۆڕینی مــن، ئەو تابلۆیــە زیــاتر ئەو هێــزە گۆنــگ و ســتەمکارە هەمیشـەییەی بەرجەسـتە دەکرد، کـە هـەر هـەموو شـتەکان فەرمانبـەرداری ئەون. ئەوانەی کە لە دەوری جەنازەکە بوون(کە شـتاقیان لـە تابلۆکـەدا دەر نـەکەوتبوون) بێگومـان کـە لـەناکاوا، هـەرچی خۆزیـا و ئـاوات و ئامانجێکیـان هەبووە، هەرەسی هێناوە، تەنانەت باوەڕ و ئیمانیشیان لـەزگ بـووە هـەرەس بێنـێ، هەسـتیان بـە کـول وکۆڤـانێکی بێ پایـان کـردووە، تووشـی شـۆکێکی ترسـناک بـوون. دیـارە بـە ترسـێکی سـەراپا گیـرەوە بڵاوەیـان لێکـردووە،




هەرچەندە هەر یەکەیان، لە ناخی خۆیدا بیرۆکەیەکی گەورەی هەژێنەری ئەوتۆی هەڵگرتووە، کە قەتاو قەت، لە دەروونی نەسرەدرێتەوە. بەشەر کە تەمەشای ئەم تابلۆیە دەکات، یەکسەر و خۆ بە خۆ ئەم پرسیارەی بە مێشکا دێت: باشە ئەگەر ئەو (کوڕی خوایە" بیتوانیبا بەر لە خاچدانەکەی، وێنەی خۆی بدینێ ئایا بەو شێوەیە بە خاچەکەدا سەر دەکەوت، ئایا بەو شێوەیەی کە مرد، گیانی دەسپارد؟

دوای ڕۆیشتنی کولیا، هەر هەموو ئەو بیر و خەیاڵاتە، بۆ ماوەی سەعاتێک سەعات و نیوێک، لە مێشک و زەینم ئالان، بە پچڕ پچڕی و هەندێ جار لە شێوەی خەیاڵات و وڕاوە و وێنەێن تەڵخ و تاریکدا، لە مێشکمدا شەپۆلیان دەدا. بگرە هەندێ جار بەرجەستە دەبوون، شێوەیان پەیدا دەکرد. باشە ئەگەر شتێک بوونێکی واقیعی نەبێ، شێوەیەکی دیاری نەبێت، خەیاڵ دەتوانێ شێوەیەکی دیاریکراوی پێ ببەخشێت؟ وێڕای ئەوەش لە هەندی ساتی ئاگاییدا، وام خەیاڵ دەکرد کە ئەو هێزە بێ کوتاییە، ئەو بوونەوەرە لاڵ و کەڕ و بێباکە، لە بەرچاوما، مەتریاڵیانە و بە شێوەیەکی سەیری لەوەسف نە هاتوو، بەرجەستە دەبێت. بیرم دێت کەسێک کە مۆمێکی بەدەستەوە بوو، دەستی گرتم و جاڵجاڵۆکەیەکی زەلامی قێزەونی نیشاندام و لێکدا لێکدا بۆی دووپات دەکردمەوە کە ئەم جاڵجاڵۆکە زەلامە، هەمان ئەو بوونەوەرو هێزە تاریک و کۆنگ و کەڕولاڵەیە کە توانا بە هەموو شتەو، گاڵتەی بە تووڕەبوونەکەی من دەهات.

"شەوان، هەمیشە لە ژوورەکەمدا چرایەک لەژێر ئیکۆنەکەدا دەسووتێ، هەرچەندە ڕووناکییەکی کەم و لەرزۆکی هەیە، بەڵام شتی لەبەر دەبینرێت، یانی زۆر لێی بچێتە پێشەوە دەتوانێ شتیشی لە بەر بخوێنێتەوە. لێم نەبێ بە درۆ، کات کەمێک لە نیوەشەو بووری بوو. بۆ چرکەیەکیش نەخەوتبووم، بە چاوانی کراوەوە ڕاکشابووم. من لەو حاڵەدا بووم کە لەپڕ دەرگای ژوورەکەم خرایە سەر گازی پشت و ڕوگوژین وەژوور کەوت. "

هاتە ژوورەوە و دەرگاکەی داخستەوە، بە بێدەنگی سەیری کردم و بە ماتەمات خۆی گەیاندە ئەو کورسیەی سووچی ژوورەکە کە لای چرای ژێر

ئیکۆنەکـە دانرابـوو. سـەرم سـوورمابوو، چـاوەڕوانم دەکـرد تـا بـزانم چیدەکات. ئانیشکی دادایە سەر مێزێکی چکۆلە، بە بێدەنگی چاوانی بڕینە من. دوو سێ چرکە بەو شێوەیە تێپەڕی. لە بیرمە کە بە کرۆکپییەکەی قـەڵس و تـووڕە بـووم. بـۆچی قسـەی نـەدەکرد؟ هەڵبەتـە هاتنەکـەیم بەو درەنگە شەوە، پێ سـەیر بوو، بەڵام زۆریشـم بـەلاوە سـەیر نـەبوو، چونکە دەمزانی: هەرچەندە ئەو بەیانیە بە تەواوەتی وبە ڕوونی باسی فکرەکەی خۆمم بۆ نەکردبوو، بەڵام دیار بوو بۆی چووبوو و پەی پێ بردبوو. بۆیە، ئەو بیرە ئەوەی دێنا، کە بێت قسـە و گفتوگۆی زیاتری لەبارەوە بکات، با کـات درەنگـیش بێـت. ئیـدی گەیشـتمە ئەو قەناعەتـەی کـە ڕەنگـە بـۆ ئەو مەبەسـتە هاتبێت. بـەیانی ئەو ڕۆژە بـە ناتـەبایی لێکدی جیـا بووبـووینەوە، تەنانەت ئەوەشم لەبیرە کە یەک دوو جار بە تەوسەوە تەمەشـای کردبووم. ئێستا هەمان تەوس و توانجم لە نیگایدا دەبینی و ئەمـەم زۆر لـە بـەر گران بـوو. هەڵبەتـە لـە هەوەڵەوە زەڕەیـەک گومـانم لەوە نـەبوو کـە ئەمـە خـودی ڕوگوژینـە، نـە بەخەیاڵـە، نـە خەونە و نەواهیمـە. شـتی وام هـەرگیز بـە بیردا نەهات.

"لـەم حاڵـەدا بـوو، کـە ڕوگـوژین بـە هـەمان ژارخـەنەوە دانیشـتبوو. بـە تـووڕەیی لەسـەر جێگاکـەم گیـنگڵم دا، ئانیشـکم لەسـەر سـەرینەکەم دادا، بڕیـارم دا منـیش وەکـو ئەو بـم، ئەگـەر تـا بـەیانیش دانیشـێت، بێدەنگ بـبم. نـازانم بـۆچی دەمویسـت ئەو، سـەری قسـان دابمـەزرێنێ. وا بـزانم نزیکـەی بیست دەقیقەیەک بەو شێوەیە تێپەڕی. لـەپڕ تروسـکەیەک، بروسـکە ئاسـا بـە مێشکمدا هات: تۆ بڵێی ئەمە ڕوگوژین نەبێت، هەر تارمایی و شـەبەنگێک بـێ و هیچی تر؟

"من بە عـەمراتم نـە لـە کـاتی نەخۆشـییەکەمدا و نـە لـە پێشـتر شـەبەنگ و تارماییـانم نـەدیتبوو، بـەڵام هەمیشـە، لـە منداڵیمەوە تـاکو هەنووکە، یـانی تـا ئـەم دواییانـە، هەرچەنـدە قـەت بـاوەڕم بـە ڕۆح و شـەبەنگان نـەبوو، پێم وا بوو، ئەگەر هەر کـاتێ، بـۆ تاقـە جـارێکیش، شـەبەنگێک یـان تارمایـەک بدینم، ئەوا دەستبەجێ دەمرم، بەڵام کاتێ ئەم بیرەم بە مێشکا هات کـە ڕەنگـە ئـەم کەسە ڕوگوژین نەبێت و تەنیا تارمایەک بێت و بـەس، هێنـدەی لـە یـادم بێت

هەستم بە هیچ ترسێک نەکرد، بەڵکو تووڕە بووم. سەیرە، هەرگیز وەڵامی ئەم پرسیارەم بەلاوە گرینگ نەبوو کە: ئایا ئەمەی لە بەردەمما دەیبینم خودی ڕوگوژینە یان تاپۆو تارماییە؟ نەک هەر نیگەران نەبووم، بەڵکو بەلامەوە ئاسایی بوو. پێم وایە ئەو ساتە بیرم لە شتێکی دی دەکردەوە، بۆ نموونە زیاتر حەزم دەکرد بزانم بۆچی ڕوگوژین، پاڵتۆ و قاتی سپیی لەبەر کردووە و بۆینباخی سپیی بەستووە. کەچی بەیانی کاتێ لە ماڵی خۆیدا دیتم بە ڕۆب و بیجامە و نەعلەوە بوو. لە دڵی خۆدا گوتم: باشە ئەگەر ئەمە تارماییە و من لێی ناترسم، بۆچی هەڵنەستم و نەچم بەلایەوە تاقی بکەمەوە و لێی دڵنیا ببم؟ تۆ بڵێی بترسم و زات و غیرەتی ئەوەم نەبێت؟ بەڵام هەر کە هەستم کرد دەترسم، هەستم کرد سەراپام بەنج بوو، تەزوویەک بە مۆرەغەی پشتما داچۆڕا، زرانیەکانم کەوتنە لەرزین. وەکو بڵێی ڕوگوژین پەی بە ترسەکەم برد، ڕێک لە هەمان ساتدا، ئانیشکی لەسەر مێزە چکۆلەکە هەڵگرت و هەستایە سەرپێ، زاری وەکو یەکێک بیەوێ پێبکەنێت، کرایەوە. چاوانی لە دوڕ چاوانم بڕی. ئەم حاڵەتە بە جۆرێ قەڵس و تووڕەی کردم، دەمویست هەستم و پەلاماری بدەم، بەڵام چونکە بەڵێنم بەخۆدا بوو کە من دەست پێشکەر نەبم و ئەم بێدەنگییە نەشکێنم، لە جێی خۆم نەجووڵام، زیاتریش لەبەر ئەوە لە جێی خۆ نەجووڵام، چونکە هێشتا دڵنیا نەبووم کە ئەمە ڕوگوژینە و تاپۆو تارمایی نییە.

ئەلهەقی نازانم ئەم دیمەنە چەندی خایاند. ئەوەشم وەبیرنایەتەوە کە ئاخۆ ناو بە ناو چاوم چووەتە خەو یان نا. ئەنجام ڕوگوژین هەستاو ڕێک وەکو ئەو کاتەی هاتە ژوورێ، زۆر بەوریایی و هێمنی کەوتە ڕوانینم، بەڵام ئەم جارەیان ڕوانینەکەی بێ ژارخەنەکەی پێشووی بوو. بە ئەسپایی، لەسەر نووکی پێیان، بەرە و دەرگاکە چوو، دەرگاکەی کردەوە، وە دەر کەوت و دەرگاکەی لە داوی خۆیەوە داخست. من لە جێگاکەم نەهاتمە دەرێ، نازانم تاکەی بەو حاڵەوە مامەوە، بە چاوانی ئەبڵەق، لە گێژاوی بیر و خەیاڵاتی گۆنگ بێ بندا مامەوە، بیر و خەیاڵاتەکەم چ بوو؟ مەگەر هەر خوا بزانێ بیرم لە چی کردووەتەوە! بیریشم نایەت چۆن خەوم لێکەوتووە.

"بەیانی، دوای سەعات نۆ، کاتێ گوێم لە لێدانی دەرگا بوو، لە خەو ڕابووم. لە ماڵی ئێمەدا عادەتە کە ئەگەر دوای سەعات نۆ بە خۆم هەڵنەستم و نان و بەرچایی داوانەکەم، ماتریونای کارەکەرمان بێت و لەدەرگا بدات و هەڵم بستێنێ. کاتێ دەرگام لە ماتریونا کردەوە، یەکسەر ئەمەم بە بیرا هات کە: باشە خۆ ئەم دەرگایە داخرابوو، ئەدی ڕوگوژین چۆن توانیویەتی بێتە ژوورەوە؟ کە زیاتر بیرم کردەوە، دڵنیابووم کە مەحاڵە ڕوگوژین توانیبێتی بێتە ژوورەکەی منەوە، چونکە ئێمە هەموو دەرگاکانمان بە شەوان لە ناوەوە بە کلیل دادەخەین. "تێکڕای ئەم ڕووداوەی کە بەو وردی و دووروودرێژییەی بۆم باسکردن، کردیە کارێک کە من "بڕیاری" یەکجارەکی خۆم بدەم. یانی بەم پێودانگە "دواقەرار و قەناعەتی" من زادەی لۆژیک یان قەناعەتی لۆژیکی نەبوو، بەڵکو زادەی هەست و سۆزی بێزاری بوو. من ناتوانم درێژە بەم ژیانە سەیر و غەریب و سەخت و دژوار و بێ وەفایە بدەم. ئەم تاپۆیە سووکایەتی پێکردووم. من ناتوانم ملکەچ و گوێڕایەڵی هێزێکی گۆنگ و بەتەمومژ بم کە لەشێوەی جاڵجاڵۆکەیەکی زەلامدا خۆی بنوێنێ. من تەنیا ئەو کاتە. لەو تاریکە شەوەدا، کە هەستم کرد گەیشتوومەتە دوا قەرار و دوا قەناعەتی بنجڕ، کەمێک هەستم بە ئاسودەیی کرد، بەڵام ئەم قۆناغە تەنیا قۆناغی یەکەم بوو، دەبوایە لە قۆناغی دووەمدا بچم بۆ پاڤلوڤسک، قۆناغی دووەم لەوێندەر بەرمە سەر، بەڵام پێشتر ئەمەم بە تێروتەسەلی باس کردووە.".

پەراوێز:

* - "گردی کێشکان..": گردێکی بچووکە کە کەوتووەتە باشووری ڕۆژهەڵاتی دەرەوەی مۆسکۆ. ناپلیۆن و گەورە ئەفسەرەکانی، ڕۆژی ١٨١٢/٩/١١، لەوێندەرەوە سەیری ناو شاریان کرد. بێگارە زندانییان، بەر لەوەی ڕەوانەی سیبریا بکرێن، لەوێندەر کۆ دەکرانەوە. ئەم گردە حاڵی حازر سەیرانگە و مەیدانی وەرزشە، پێی یەژن "گردی لینین."

* - "تولەیتا ڕابە.." ئینجلی مورقوس، سورەتی پێنجەم، ٤١

* - "ئەی ئەلیعازر وەرە دەرێ": ئینجلی یوحەنا، سورەتی یازدە، ٤٣.

## فەسڵی حەوتەم

"دەمانچەیەکی چکۆلەی گیرفانم هەبوو، هەر بە منداڵی ئەم دەمانچەیەم دەست کەوتبوو، یانی لەو تەمەنە سەیرەدا کە منداڵ دەکەوێتە ژێر کاریگەریی حیکایەتێن قارەمانبازی و ڕێگری و دوئێل و دوئێلبازی و دەمانچە سوارکردن لە یەکتری و، حەز دەکات لاسایی ئەو شتانە بکاتەوە. بە منداڵی خەوم بەوەوە دەبینی کە یەکێک داوای دوئێلم لێ بکات و بێباک و نە ترس و ورە بەرز لەهەنبەر خەنیمەکەمدا بوەستم. نزیکەی مانگێک دەبێ کە ئەو دەمانچەیەم تاقیکردەوە و هەر لەجانتاو کیفەکەی خۆیدا دوو قەوان و قوتوویەکی چکۆلەی پڕ لە بارووتم دۆزیەوە کە بەشی داگرتنەوەی دوو سێ فیشەکی دەکرد. دەمانچەیەکی زۆر خراپە، تەقە دەکاو ناکات، زۆر کەم بوردە، ئەوپەڕی پازدە شەقاوێک دەڕوات و ناڕوات. بەڵام، ئەگەر ڕاستەوخۆ بنرێت بە کەللەی سەرەوە، مێشکی بەرانبەرەکەت دەپژێنێ و کاسەی سەری داغان دەکات.

"بڕیارم دا، کە سپێدە، لە پاڤلوفسک، بۆ ئەوەی کەس لە ڤێلاکە بێزار نەبێ، بەخشکەیی خۆم بگەیەنمە ناو باخ و سەیرانگاکە و خۆم بگوژم. هەڵبەتە لەو نامە و ڕوونکردنەوەیەی کە لە دوای مردنی خۆم بەجێی دێڵم، هەموو شتێک بە ڕادەی پێویست و زیاتریش بۆ پۆلیس ڕوون دەکەمەوە، تا لە لێکۆڵینەوەی خۆیاندا تووشی سەرەگێژێکی نەبن. دیارە هەوادارانی دەروونناسی و هەر کەسێکی دی کە ئەو مەسەلەیەی بەلاوە مەبەست

دەبێ، دەتوانن لە ڕێگەی شیکردنەوەی ئەو ڕوونکردنەوە و نامەیەوە بگەنە ئەنجامگیری دڵخوازی خۆیان، بەڵام حەزناکەم نووسراوەکەم بە هیچ جۆرێ بێتە بڵاوبوونەوە لە ڕۆژنامە و بڵاڤۆکاندا. تکا لە میرزادە دەکەم کە نوسخەیەک لەو نامەیە لای خۆی هەڵگرێت و بپارێزێت و نوسخەکەی دیکەشی بگەیەنێتە دەست ئاگلایا ئیڤانوڤنا یەپانچینا. ئەمە حەزو ئارەزووی منە، وەسیێتیشم ئەمەیە کە ئێسکە پەیکەرەکەم بدرێ بە ئەکادیمیای پزیشکی تا بۆ ئەزموونی زانستی سوودی لێوەربگرن.

"کەس بۆی نییە داوەریم دەرهەق بکات و دەزانم هەنوکە کە لە دەرێی دەسەڵاتی هەر دادگایەکم. تۆزێ لەمە پێش بیرۆکەیەکی سەیرم بە مێشکدا هات. لە دڵی خۆدا کە دەمگوت: چۆنە لەپڕ بێ بە سەرما و کەسێک بکوژم یان چەند کەس لە یەک شوێندا سەر ببڕم، یان هەر تاوانێکی زۆر ترسناک و دزێو بکەم کە ببێ بە داستانی سەرزاران و وەکو ترسناکترین تاوانی دنیا بگێڕدرێتەوە. دەبێ دادگا چەند شپرزە بکەم، لە کاتێکا من تەنیا دوو هەفتە یان سێ هەفتەم لە دنیادا ماوە، کە نە پرس وجۆ و نە ئەشکەنجەی بەدەنی داد بدەن؟ ئەگەر ئەمە بکەم بۆ خۆم بێ خەم و خەیاڵ، سەر ڕەحەت و دڵ ئاسوودە، لە نەخۆشخانەکانی ئەواندا، لەژێر چاودێری دکتۆراندا، گەرموگوڕتر و ئارامترم لە ماڵەکەی خۆم دەمرم. نازانم ئەو کەسانەی کە هەمان حاڵەتی منیان هەیە، بۆچی ئەگەر بۆ فشە و سوعبەتیش بووە، ئەو جۆرە بیرو خەیاڵاتەیان بە مێشکدا نایەت. دوورنیە بە مێشکیانیشدا هاتبێ، خۆ لە خەڵکی قۆشمە و شۆخیبازمان کەم نییە.

"هەرچەندە من ئەو مافە بە کەس نادەم کە داوەریم دەرهەق بکات، بەڵام وێڕای ئەمەش، زۆر چاک دەزانم، کاتێ بووم بە جەستەیەکی کرۆکپ، ساردوسڕیش، خەڵکی هەر داوەری خۆیان دەکەن. بۆیە نامەوێ، بە بێ وەڵام، وەڵامێکی ئازاد، دوور لە هەر گوشار و ناچاریەک بڕۆم، نەک بۆ ئەوەی پاکانە بۆ خۆم بکەم، نا، نا! من پێویستم بەوە نییە داوای بوردن لە هیچ کەسێک بکەم، بەڵکو تەنیا لەبەرخۆم و حەزی خۆم، وەڵام دەدەمەوە، چونکە لە زەت لەمە دەبینم.





"فەرموون ئێوە و ئەم بیرۆکە غەریبە: کێ و بەچ هەقێ دەتوانێت و بۆی هەیە، لە ماوەی ئەم دوو یان سێ هەفتەیەدا ئازادی ڕەفتارم لێقەدەغە بکات؟ پرسوجۆم دەگەڵ بکات؟ ئەمە کاری چ دادگایەکە؟ چ دادگایەک ئەو مافەی هەیە؟ ئاخر سوودی ئەمە چییە کە من نەک هەر حوکمی خنکاندن و مەرگ بدرێم، بەڵکو ناچار بکرێم ئەو ماوە کەمەی پێش جێبەجێکردنی ئیعدامەکەش، بەوپەڕی ئاقڵی و ملکەچی و گوێڕایەڵی بەرمە سەر؟ ئایا کەس سوود لەمەوەر دەگرێت؟ ئایا ئەمە هیچ خزمەتێکی مەسەلە ئەخلاقییەکان دەکات؟ وەختێ ئەم قسەیەم قەبووڵ بوو کە ئەگەر نەخۆش نەبام، ساغ و سەلامەتبام و چاوەڕوانی ئەوەبام ڕۆژێک بێت "کە خێروبێرێکم بۆ برای مرۆڤم ببێت"... هەنگێ دەکرا، بەگوێرەی پێوەرە ئەخلاقیە باوەکان، لەبەر ئەوەی بەبێ پرس و ڕاوێژ ژیانی خۆم بە فیڕۆ داوە، یان لەسەر هەر خەتاو تاوانێکی دیکەی لەو بابەتە سەرکۆنە بکرامایە یان لێپێچینەوەم دەگەڵ بکرایە!... بەڵام ئێستا، کە حوکمی ئیعدامەکەم ڕاگەیەنراوە و هەموو شتێک بڕاوەتەوە، دەکرێت بەچی تۆمەتبار بکرێم؟ یان چ گلەیەکم لێدێتە کردن؟ ئاخر ئەمە چ ئەخلاقێکە کە تۆ نەک ژیانت، بەڵکو دوا هەناسەکانت وان لە غەرغەرەی مەرگا و لە ئان و ساتدایە دوا زەرەی ڕوحت دەربچێت، گوێت لێبێ میرزادە بە بەڵگە و بۆچوونە مەسیحیانەکانی خۆی بەوە دڵخۆشیت بداتەوە کە مردنت لە ژیان باشترە؟ (ئەو مەسیحیانەی وەکو ئەون، هەمیشە دەگەنە ئەو قەناعەتە و دڵیانش پێی خۆشە!). یانی کە باسی "دارو درەختانی بافلوفسک" دەکەن، دەیانەوێ بڵێن چی، ئایا دەیانەوێ دوا سەعاتەکانی ژیانم ئارامتر بگوزەرێن؟ باشە ئەمانە لەوە ناگەن کە من تا زیاتر خۆم فەرامۆش بکەم و دڵ بەم دوا فریوەی ژیان و خۆشەویستییە خۆش بکەم و خۆمی پێوە هەڵواسم، کە دەیانەوێ لەو ڕێگەیەوە دیوارەکەی ماڵی مایر و هەموو ئەو شتانەی کە بەو هەموو ڕاشکاوی و سادەییەوە لە سەری تۆمار کراوە، لەبەر چاوم ون بکەن، نازانن من بەوە هێندەی دی دەردم زیاد دەکات؟ باشە سروشتی جوان و باخی گشتی پافلوفسک بەمن چی، هەڵاتن و ئاوابوونی ڕۆژ، ئاسمانی شین

و دەموچاوی پاراوتان بەمن چی، کە من تاقە کەس بم کە لەم ئاهەنگ و زیافەتەدا زیاد بم؟ ئاخر ئەم هەموو ژنە و ئەم جوانیانە بەمن چی، لەکاتێکا من ناچاربم هەموو ساتێک هەست بەوە بکەم کە تەنانەت ئەو مێشە چکۆلەیەی کە لەبەر تیشکی هەتاوا، بە دەوری منا گیزە گیزیەتی، هەقی هەیە لەم ئاهەنگ و زیافەتەدا بەشداری بکات، شوێنەکەی خۆی دەزانێ، دڵی بەشوێنەکەی خۆشە و پێی شادە، بەڵام هەر من بە تاقی تەنیا ناشاد و بێزراوم. تەنیا من وەکو سپڵی لا ورگ زیادم و بەس -کە تا هەنوکە تەنیا ترسنۆکی خۆم، وای کردبوو کە پەی بەم حەقیقەتە نەبەم!

"من دەزانم میرزادە و هەموو ئەوانەی دی دەیانەوێ من دەستبەرداری ئەم دەربڕین و دەستەواژە "پڕ ڕقانە" ببم، دەزانم حەز دەکەن گوێیان لێم بێ، بە ناوی سەرکەوتنی ئەخلاقەوە، ئەم کۆپلە شیعرە کلاسیکییەی میلوڤی بخوێنم:

خۆزیا، دۆستانێکی زۆر
لەوانەی گوێیان لە ئاستی ماڵاوایی
من دەخەواند
جوانی پیرۆزی تۆیان دەبینی
تەمەندرێژ بن، بریا کە
دەمردن، فرمێسکیان بۆ دەهاتە ڕشتن
خۆزیا دەستانی دۆست
چاوی لێک دەنان

"بەڵام ئەی سادە و ساکارینە باوەڕ بکەن، باوەڕ بکەن کە ئەم کۆپلە شیعرە دڵخۆشکەرەیە، ئەم هەموو دووعای خێرەی لەم شیعرە فەرەنسیەدا دەی بینن، ژێرا و ژێر هێندە ژەهراوییە، هێندەی بوغزو کینەی ئەفسووناوی لەخۆ گرتووە، بوغزوکینەیەکی ئەوتۆ کە لەزەت لە ڕکونی خۆی دەبینێ. بوغز و کینەیەک کە شاعیر بەخۆیشی گومڕا بووە و سەری لێ تێک چووە و ڕقوکینەکەی لێ بووە بە فرمێسکی مێریڤانی و ڕوندکی سۆزداری. هەڵبەتە شاعیرەکە بەو خەیاڵ و قەناعەتەوە مردووە. ڕەحمەتی





خوای لێبێ! ئەوە بزانن کەوەختێ مرۆڤ هەست بەوە دەکات کە هیچ نییە، کـە دەسەوەسـتان و بێتوانایـە، ئەمـە، خـەم و پـەژارە و قـار و خەفـەت و نەگبەتی و شەرمەزارییەکی زۆری لە دڵ و دەروونـدا چێدەکات، بـەڵام ئەمـە سنووری خۆی هەیە، کە مرۆڤ دایە تانی بێعاری و ئەو سـنوورەی بەزانـد، هەنگێ لەزەت لەو شەرمەزاریە دەبینێ.

"دروسـتە زەلیلـی و ملکـەچی بـەم چـەمک و مانایـە هێزێکـی گەورەیـە. مـن دان بەمـەدا دەنـەم، بـەڵام نـەک بەو چـەمک و مانایـەی کـە ئـایین و مـەزەب قەبووڵیەتی.

"ئاهـ.. ئایین! من ئەگەری ژیانی ئەبـەدیم قەبووڵـە، ڕەنگـە هەمیشـەش هـەر قەبووڵم بـووبێ. گریمـان هەسـت و ویژدانـی بەشـەری مەشـخەڵێکە، ویسـتی هێزێکـی بـاڵا هـەڵی گیرسـاندووە و ئـەم هێـزە لـە ڕێگـەی سەرانسـەری بوونەوەرانەوە خـۆی دەنوێنێت و دەڵێت: "مـن هـەم" حـەز دەکـەم بـاوەڕش بەوە بێنم کـە ئـەم هێزە باڵایـە هـەر خـۆی لـەناکاوا فـەرمانی ئـەم هەسـت و ویژدانە دەدات کە دەمودەست بکوژێتەوە، هەڵبەتـە لەبـەر هۆیـەکی گۆنـگ و نادیـار، هۆیـەک لەسـەڕووی شـرۆڤە و ڕاڤەوە. بـا وا بـێ، مـن دان بەمـەدا دەنەم، بەڵام ئەم پرسیارە ئەبەدی و هەمیشەییە هـەر دەمێنـێ: ئـەم کارانـە چ پێویستییەکیان بـە کەساسـی و ملکـەچی و گوێڕایـەڵی مـن هەیـە؟ هـەر ئەوە بەس نییە بخورێم، بێ ئەوەی ناچار بکرێم ستاییشی (بخۆرەکەم) بکەم، بـە شـان و باڵیـا هەڵبـدەم؟ باشـە ئەگـەر مـن نـەمەوێ دوو هەفتـەی دی چاوەڕوانی مەرگی خۆم بکەم، سەبر نەکەم، کەسێک هەیە لەو دنیا باڵایـەدا کە بەم کارەی من زەرەر بکات یان ئازارێکی پێبگات؟ نـەخێر، باوەڕناکـەم! گریمـان (هەڵبەتـە ئـەم گریمانەیـە لـە ڕاسـتییەوە نزیکتـرە) لـەناوچوون و زەواڵـی ژیـان و گیـانی نـاچیزی مـن، کـە ژیـان و گیـانی گەردیلەیەکـە، بـۆ ڕاگرتنی هاوسەنگی گەردوون و بوونەوەران، بۆ کەمکردن یـان زیادکردنی شتێکی دیاریکراو، بۆ دروست کردنی هەڤدژی و جۆرە ناتەبایـەک پێویسـتە، وەکـو چـۆن پێویسـتە ژیـان و گیـانی ملیۆنـان بـوونەوەر ڕۆژانـە بکرێتـە قوربانی بۆ ئەوەی دنیا بمێنێ و بەردەوام بێ (هەرچەنـدە ئـەم بیرۆکەیـە، لـە

خودی خۆیدا، لە بنەڕەتدا بیرۆکەیەکی بوردن ئامێز نییە). با واز لەمە بێنین. گریمان ئەگەر بەشەر یەکتریان نەخواردبا، ئەم دنیایە بینا نەدەکرا، هەرچەندە من هیچ شتێک لەم بینایە نازانم، بەڵام ئەوەی من دەیزانم ئەمەیە: ئەگەر من بۆ ئەوە هاتبمە دنیاوە تا بزانم کە "هەم" خەتای منە کە ئەم دنیایە، ئەم گەردوونە بە لنگەوقووچی دروست کراوە، هەر دەبێ بەم شێوە و ڕەوشەش بێت و مەحاڵە بشێت بە شێوەیەکی دی بێ؟ ئاخر کێ لەمەدا خەتای من دەگرێت و بە چ بەڵگەیەک دەتوانێ خەتام بگرێت؟ دەیسا بە خۆتان بیر لەمە بکەنەوە، تا دەتوانن بیری لێبکەنەوە، هەر هەموو ئەمە لە تەسەورکردن نایەت، هەر هەمووی یەکپارچە زوڵم و بێدادیە.

"من، قەت ڕۆژێ لە ڕۆژان، نەمتوانیوەوێنای ئەوە بکەم، هەرچەند لە دڵی خۆمدا ئارەزووم کردووە، کە ئەو دنیا و پەسەلان و مەشیەتی خوایی و خودا نەبن. من زیاتر دەگەڵ ئەوەدام کە هەموو ئەوانە هەن، بەڵام هیچ شتێک نە لەمەڕ ژیانی ئەو دنیا دەزانین و نە دەربارەی ئەو یاسایانەی ئەو دنیا بەڕێوە دەبەن. باشە ئەگەر دەرککردنی ئەم شتە ئەوەندە سەخت و دژوار بێت و بگرە مەحاڵ بێت، ئایا من گوناح و خەتام چییە لە شتێک نەگەم کە لە تەسەور نەیەت؟ ڕاستە هەموو هەر دەڵێن – بە میرزادەشەوە – ئێمە تەنیا ملکەچی و گوێڕایەڵی و ئیتاعەتی بێ چەند و چوونمان لەسەرە و بێگومان لەو دونیا پاداشتی گوێڕایەڵی خۆم وەر دەگرم. دیارە ئەوەش دەڵێن کە ئێمە لەبەر ئەوەی لە مەشیەت و ویستی خوایی تێناگەین، بۆیە لە ڕووی بێ توانایی و نا ئومێدی خۆمانەوە بە کەمی دەگرین، بەڵام دووبارەی دەکەمەوە ئەگەر ئەم ویست و مەشیەتە، لە دەرککردن نەیەت، قابیلی تێگەیشتن و وێناکردن نەبێت، بە چ هەقێ گلەیی لە کەسێک بکرێت کە تێی ناگات، کە توانای تێگەیشتنی ئەو ویست و مەشیەتەی نییە، لە کاتێکا ئەو تێ نەگەیشتنەی بەسەرا سەپێنرابێت، لێی کرابێ بە یاسایەکی لە گۆڕاننەهاتوو؟ ئەگەر مەسەلەکە وا بێ، چۆن دەشێت من بە تاوانی ئەوەی توانای تێگەیشتنی ویست و یاساکانی مەشیەتی خواییم نییە مەحکوم بکرێم؟ نا، هەر وازی لێ بێنە، بەردێکی بخە سەر و تەواو، باشتر وایە

کارم بە کاری ئایین و مەزەبەوە نەبێت.

"بەسە، بەهەرحاڵ! تا من ئەم چەند دێڕە تەواو دەکەم، هەتاویش هەڵدێت، نەکەوێتە تەشقی ئاسمانان و هێزی بێ سنوور و، بێ شوماری خۆی بەسەر سەراپای دنیادا بڵاودەکاتەوە! با ئەمەویستی خوابێ! من لەو کاتەدا کە دەڕوانمە ئەم سەرچاوەی هێز و ژیانە، سەرچاوەی ئەم ژیانەی کە هیچ ئومێدێکم پێی نەماوە و چیتر نامەوێ، دەمرم! ئەگەر لەدایکبوونم بەدەست خۆم بایە، بەویستی خۆم بایە، هەرگیز قەبووڵم نەدەکرد بێمە ناو ئەم گاڵتە بازاڕە بێ تامەوە، بەڵام خۆ، هێشتا توانای مردنم هەیە، هەرچەندە ئەم توانایەش ڕوو لە کەمیە و هەرچەند ڕۆژێکی کەمی ژیانم بەدەستەوە ماوە. ئەمە توانایەکی گەورەی دەوێ نەک یاخی بوونێکی گەورە.

"دوا سەرنج: هەڵبەتە لەبەر ئەوە نامرم کە توانای ئەوەم نەبووە بەرگەی ئەم سێ هەفتە ژیانە بگرم. با توانام هەبووە و ئەولاتریش، خۆ ئەگەر بمویستبا دەمتوانی هەر بەوە دڵنەوایی خۆم بکەم کە هەستم بەو سووکایەتییە کردبوو کە پێم کرابوو، بەڵام خۆ من یارۆی شاعیری فەرەنسی نیم و بەو جۆرە دڵنەواییەش قایل نیم، شتێکی دیکەش هەیە: کە تەبیعەت و سروشت، تەنیا دەرفەتی سێ هەفتە ژیانی لە بەردەمما هێشتووەتەوە، بە جۆرێ مەیدان و ماوەکەی لێتەنگ و سنووردار کردووم، ڕەنگە تاقە کارێک کە بتوانم لەو ماوە کەمەدا بە کەماڵی ئازادی و ویستی خۆم دەستی پێ بکەم و بە ئەنجام بگەیەنم هەر خۆکوژی بێ. باشە بۆچی ئەم دوا دەرفەتە نەقۆزمەوە و "کارێک"نەکەم؟ ڕەنگە هەندێ جار، نارەزایی کارێکی بچووک نەبێت و بایەخی خۆی هەبێت.

هیپولیت، ئەنجام لە خوێندنەوەی (ڕونکردنەوەکە)ی خۆی بووەوە و وەستا.

کاتێ کەسێکی توونده تەبیعەت، لە توڕەییدا دەهری دەبێ وئاگای لە خۆی نامێنێ، دەداتە تانی ڕاشکاوی و بێباکییەکی ئەوتۆ کە گاڵتەی بە هەموو دوودڵی و ترسێک دێت و کەمترین حیساب بۆ ئەو شتانە ناکات و نەک هەر ئامادەی هەر شەڕو فەرتەنەیەک دەبێت، بەڵکو شەڕ بە داروبەرد

دەفرۆشێت و لەزەت و خۆشییشی لێ دەبینێ. پەلاماری خەڵکی دەدات و جۆرە ئامادەییەکی گۆنگ و لە هەمان کاتدا بنجبڕیشی لەلایە، هەر دوای ئەوە بە یەک دەقیقە، لە بەرزترین بورجەوە خۆی هەڵبداتە خوارەوە و بەمە خۆی لە هەر کێشە و دەرهاویشتەیەکی ئیحتیمالی ئەو ڕەفتارەی بدزێتەوە و بپەڕێنێتەوە. دیارە ئەم حاڵەتە بە زۆری جۆرە داهێزران و بێتاقەتی و لاوازی و سستییەکی بەدەنی پێش دەکەوێ. ئەو بارگرژییەی کە هیپۆلیتی تیا بوو، حاڵی حازر گەیشتبووە ئەو قۆناغە. جەستەی ئەم هەرزەکارە تەمەن هەژدە ساڵە، کە نەخۆشی چروساندبوویەوە و کەسیرەی کردبوو، وەکو گەڵایەک لە دار بەر بووبێتەوە، لاواز و لەرزۆک دەینواند، بەڵام هەر کە تەمەشای گوێگرەکانی کرد (هەڵبەتە بۆ یەکەم جار لەماوەی یەک سەعاتی ڕابردوودا) یەکسەر نیگاو زەردەخەنەکەی تەژی نەفرەت، لەخۆبایی بوون و بێزاریەکی تەوسامێز بوون. پەلەی بوو کە نەفرەت و بێزاریی خۆی لە هەر هەموویان بگەیەنێت، بەڵام گوێگرەکانیش لەلای خۆیانەوە زۆر قەڵس و تووڕە بوون. بەدەم خوتە و بۆڵەی تورەییەوە لەسەر مێزەکە هەستان. ماندوویەتی و مەستی و پەستی و دەمارگرژی هێندەی دی ڕەوشەکەی شلۆق کرد و زیافەت و ئاهەنگەکەی شێواند.

هیپولیت، بە جۆرێ لەسەر کورسییەکەی ڕاپەڕی و هەستا، وەکو ئەوەی یەکێک بەتوبزی هەڵی ستاندبێ. کە ترۆپکی هەتاوگرتووی درەختەکانی بینی، وەکو ئەوەی پەرجوویەک ڕووی دا بێت، پیشانی میرزادەی دا و هاواری کرد:

- هەتاو هەڵهات! هەتاو دەر کەوت!

فردیش چینکو گوتی:

- چییە، وات دەزانی هەڵنایەت؟

گانیا، پەست و بێموبالات، کڵاوەکەی هەڵگرت و کێشمانێکی خۆی دا و بەدەم باوێشکدانەوە گوتی:

- ڕۆژێکی گەرمی ناخۆشی دیکەمان لە ڕێیە، جا وەرە یەک مانگی تەواو، لەم گەرمایەدا هەڵکە! پتیتسن چ دەڵێی بڕۆین یا بمێنین؟

هیپۆلیت، سەرسام و وڕ و کاس گوێی بۆ ئەو قسانە گرتبوو. لەناکاوا ڕەنگی بە تەواوەتی زەرد هەڵگەڕا، ڕەنگی مردووی لێ نیشت، سەراپای کەوتە لەرزین، بەدەم تەمەشاکردنی گانیاوە گوتی:

- تۆ بۆیە ئەم بێموبالاتییە دەنوێنی تا سووکایەتی بە من بکەیت! بە ڕاستی پیاوێکی سووکی!

فردیش چینکو گوتی:

- ئەم زیادەڕۆییە چییە، بۆچی وا زمانت لێ بەرەڵا کردووە؟ نە شەرمێ، نە سڵکردنەوەیەک!

گانیا گوتی:

- بە ڕاستی گەنجێکی گەوجە!

هیپولیت کەمێک وەخۆهاتەوە، جڵەوی خۆی گرت، بەدەم لەرزینەوە کەوتە قسان، قسەکانی پچڕ پچڕ بوون:

- بەڕێزینە، ڕەنگە بێزارم کردبن، هەقی خۆتانە لێم توورەبن، بەداخەوەم کە بە خوێندنەوەی ئەم وڕێنەیە بێزارم کردن (بەدەم ئەو قسەیەوە دەستنووسەکەیان نیشان دەدات)، بەڵام لەلایەکی ترەوە بەداخەوەم کە وەکو پێویست بێزارم نەکردن و سەرم نە یەشاندن. (بەدەم بزەیەکی گێلانەوە ئەو قسەیەی کرد). لەپڕ ڕوو دەکاتە یەڤگینی پاڤلوفیچ و دەڵێت: یەڤگینی تۆ بڵێ، نارەحەتم کردن یان نا؟

یەڤگینی پاڤلوفیچ بەرسڤی دایەوە:

- وتارەکەت بڕێک درێژ بوو، بەڵام... بەهەرحاڵ...

هیپولیت، کە هێشتا دەلەرزی گوتی:

- ڕەئی خۆت بە تەواوی بڵێ، درۆ مەکە! بەلای کەمەوە بۆ تاقە جارێک لە ژیانتا درۆ مەکە...

یەڤگینی پاڤلوفیچ، بە قێز و بێزەوە ڕووی لێوەرگێڕا و گوتی:

- بەلای منەوە و بۆ من هیچ گرینگ نییە... تکات لێ دەکەم وازم لێبێنە.

پتیتسن چوو بۆلای میرزادە و گوتی:

- شەو بەخێر میرزادە.

ڤیرا بەلەزو هەراسان بەرە و هیپولیت ڕۆیشت و تەنانەت دەستێکیشی گرت و هاواری کرد:

- ئەوە ئێوە چ دەکەن؟ دەتانەوێ خۆی بکوژێت! ئێوە تەمەشای بکەن! بیرتان چوو کە گوتی دەگەڵ هەڵاتنی خۆردا خۆی دەکوژێت؟ دەتانەوێ چ بکەن؟

چەند دەنگێک بەرز بووەوە، یەکێک لەوانە دەنگی گانیا بوو:

- نا، خۆی ناکوژێت!

کولیاش کە دەستی هیپولیتی گرتبوو، هاواری کرد:

- بەڕێزینە، بەڕێزینە، ئاخر تەمەشای بکەن! میرزادە، میرزادە، بۆ وا بێخەم وەستاوی؟

ڤیرا و کولیا و کیللەر و بوردوفسکی، دەوری هیپولیتیان دابوو، بە هەر چواریان، دەستیان گرتبوو.

بوردوفسکی، کە پێدەچوو مەستی مەست بێ و ئاگای لە خۆی نەبێ، بەدەم مینگە مینگەوە گوتی:

- هەقی خۆیەتی، هەرچییەک بکات نەهەقی نییە!...

لیبدیف، لە میرزادە نزیک بووەوە و گوتی:

- بمبوورە میرزادە، تۆ ئەمرت بە چییە، بەنیازی چیت؟

لیبدیف، مەست و تا ڕادەی کۆساخی تووڕە بوو.

میرزادە لێی پرسی:

- چ ئەمرێکت مەبەستە؟

- قوربان، بە یارمەتیت! من خاوەنی ئەم ماڵەم. تکایە ئەم قسەیەم لێمەگرە و حەزناکەم لە ڕووی جەنابتا بێ ئەدەبی بکەم!... هەڵبەتە دەزانم ئەم ماڵە هی تۆشە... بەڵام حەزناکەم ئەم جۆرە کێشانە لە ماڵی مندا ڕووبدا... نەخێر... نامەوێ!...

جەنەڕاڵ ئیڤولگین، لەناکاوا، بە متمانەوە و بە جۆرە تورەیی و بێزاریەک گوتی:

- خەمتان نەبێ خۆی ناکوژێت، چ نییە کەرێتی گرتوویەتی!

فردیش چینکو، هەڵی دایە و گوتی:

- ئافەرین، دەمخۆش جەنەڕاڵ!

لیبدیف گوتی:

- منیش دەزانم خۆی ناکوژێت جەنەڕاڵ... جەنەڕاڵی بەڕێزی من... بەڵام وێڕای ئەوەش... بە خۆت دەزانی من خاوەنی ئەم ماڵەم.

پتیتسن، پاش ئەوەی دووعاخوازی لە میرزادە کرد، دەستی بەرە و لای هیپولیت درێژ کرد و لەپڕ گوتی:

- ئەرێ ئاغای تیرنتییف، تۆ لە وتارەکەتا وا بزانم باسی ئێسکە پەیکەری خۆت کرد و گوتت وەسیێتت ئەوەیە پێشکەش بکرێت بە ئەکادیمیای پزیشکی، وانەبوو؟ مەبەستت لە ئێسکە پەیکەری خۆتە؟ یانی ئێسقانەکانت؟

- بەڵێ، ئێسقانەکانم...

- ڕاستە. بۆیە پرسیارم کرد، گوتم نەبا بەدحاڵیبوونێک ڕوو بدات و وەسیێتەکەت بە هەڵە ڕاڤە بکرێت، چونکە وەکو بیستوومە، پێشتر شتی وا ڕووی داوە.

میرزادە، یەکسەر هەڵی دایە و گوتی:

- بۆچی تورەی دەکەی؟

فردیش چینکۆ گوتی:

- هێناتە گریان!

هەڵبەتە هیپۆلیت بە هیچ جۆرێ نەدەگریا. ویستی خۆی ڕاپسکێنێ، بەڵام ئەو چوار کەسەی دەوریان دابوو، یەکسەر دەستیان گرت. ئیدی سەدای پێکەنین بەرز بووەوە.

ڕوگوژین گوتی:

- مەبەستی ئەوە بوو دەستی بگرن. هەربۆیەش وتارەکەی خوێندەوە. خواحافیز میرزادە. دەمێکە دانیشتووین، ئێسقانەکانمان هاتوونەتە ژان.

یەڤگینی پاڤلوفیچ بەدەم پێکەنینەوە گوتی:

- تیرنتیف، ئەگەر من لە جێی تۆبام و بە ڕاستی نیازی خۆکوژیم هەبا، دوای ئەم هەموو تەشەر و ڕیشخەنە خوت و خۆڕاییە، ئەگەر هەر بۆ

لووتشکاندنی ئەوانیش بووە، لەو کارەم ژێوان دەبوومەوە!

هیپولیت، لە قسەکەی وی زۆر تووڕە بوو، لەزگ بوو پەلاماری بدات، بە تورەیی گوتی:

- زۆریان پێ خۆشە خۆم بکوژم!

یەڤگینی پاڤلوفیچ گوتی:

- بۆیە پەستن چونکە لە دیتنی ئەم سیناریۆیە مەحرووم بوون!

- یانی تۆش لەو باوەڕەدایت، کە بەچاوی خۆیان نای بینن؟

یەڤگینی پاڤلوفیچ، بە زمانێکی هێدی و نەرم، وەکو ئەوەی داکۆکی لەو بکات، گوتی:

- من هەرگیز نامەوێ هانت بدەم. بە پێچەوانەوە، من باوەڕم وایە کە دەتوانیت و زۆریش نزیکە خۆت بکوژیت، بەڵام ئومێدم وایە بە خۆت بوەستی و هەڵنەچیت...

هیپولیت، کە تەمەشای یەڤگینی باڤلوفیچی دەکرد، لەپڕ بە زمانێکی پڕ لە متمانەی کوتوپڕ، وەکو ئەوەی شیرەت و ڕاوێژ بە دۆستێکی نزیک بکات، گوتی:

- ئێستا تێدەگەم، چ هەڵەیەکم کرد کە ئەو وتارەم بۆ خوێندنەوە!

یەڤگینی پاڤلوفیچ، بەرسڤی دایەوە:

- وەزع و ڕەوشێکی سەیرت هەیە!... بە ڕاستی نازانم چ ئامۆژگارییەکت بکەم و چ ڕێیەکت پێ نیشان بدەم! هیپولیت، کرۆکپ، چاوانی لاسار و پڕ ترسی لە دوڕ چاوانی وی بڕی. لەوە دەچوو، ناوبەناو هۆشی بە خۆی نەمێنێ و نەزانێ لە دەوروبەری چ باسە.

لیبدیف گوتی:

- نا... بە یارمەتی ئێوە بەڕێزینە، بە یارمەتیتان! سەرنج بدەن بزانن چ دەڵێت: "ئەگەر حەز دەکەن، بۆ ئەوەی کەس نارەحەت نەکەم، دەچم لە باخەکەدا خۆم دەکوژم." وا دەزانێ ئەگەر چەند هەنگاوێک لێرە دورکەوتەوە و چوو لە باخەکەدا، کە دوو-سێ شەقاوێک لێرەوە دوورە، خۆی کوشت، کێشە و سەریەشە بۆ کەس دروست ناکات؟

میرزادە. هەڵدایە و گوتی:

- بەڕێزینە...

لی لیبدیف، بە توڕەیی قسەکەی پێبڕی:

- نا، نا، بە یارمەتیی خۆت میرزادەی گرانقەدر! تۆ بە خۆت دەزانی، ئەمە گاڵتە نییە، بەلای کەمەوە نیوەی میوانەکانت لەو باوەڕەدان، دوای ئەوەی گوییان لەو قسانەی بوو، ئەگەر لەبەر پاراستنی ئابڕووی خۆیشی بووە، خۆی دەکوژێت، جا من بەو حوکمەی کە خاوەنی ئەمماڵەم، بە شایەدی ئەم میوانانە داوای یارمەتیت لێ دەکەم، تکایە فریام بکەوە!

- چ بکەین لیبدیف؟ من ئامادەم یارمەتیت بدەم.

- دەیسا با پێت بڵێم دەبێ چ بکەین: (دەبێ ئەو دەمانچەیەمان، کە بە بەرچاوی هەموومانەوە، پێوەی دەفشێ، بە فیشەکەکانیەوە، بداتێ. ئەگەر ئەم کارە بکات، قایل دەبم، لەبەر ئەوەی نەخۆشە، لەژێر چاودێری خۆمدا، ئەمشەو لێرە ڕۆژ بکاتەوە، بەو مەرجەی سبەینێ بۆ کوێ دەڕوات، بڕوات. ببوورە میرزادە کە ئەم قسەیە دەکەم! ئەگەر چەکەکەی ڕادەستی ئێمە نەکات، هەنگی من باڵێکی و جەنەڕاڵ باڵەکەی تری، دەگرین و خەبەری پۆلیسی لێدەدەین، تا پۆلیس بەخۆیان چاری ئەم مەسەلەیە بکەن، هەڵبەتە جەنابی فردیش چینکۆ، وەکو دۆستێک، دەچێت خەبەری پۆلیس دەدات.

دوا بەدوای ئەو قسانە، ژاوە ژاوێک بەرپابوو. لیبدیف کە بە تەواوەتی تینی بۆ هاتبوو، تەواو شوڵی لێ هەڵکێشا و هەموو شەرم و شکۆیەکی وەلانا. فردیش چینکۆ، خۆی ئامادە دەکرد کە بۆلای پۆلیس بڕوات، گانیا، سوور بوو لەسەر ئەوەی کە هیپولیت خۆی ناکوژێت. لێ یەڤگینی پاڤلوڤیچ، بێدەنگ بوو.

هیپولیت، بەئەسپایی لە میرزادەی پرسی:

- میرزادە، قەت ڕێکەوتووە، لە سەر بورجی زەنگی کڵێساوە خۆت هەڵدابێتە خوارەوە؟

میرزادە، ساکارانە بەرسڤی دایەوە:

- ن... نا!

هیپولیت، کە چاوەکانی دەبریسکانەوە، بە جۆرێ میرزادەی دەدواند وەک بڵێی چاوەنۆڕی، وەڵام بێت، بۆیە دیسان بەگوێیدا چپاند:

"دەزانی، من چاوەڕوانی ئەم هەموو نەفرەت و بێزاریە نەبووم؟ ئەوجا، لەپڕ، ڕووی کردە ئامادەبوان و هاواری کرد:

- بەسە! من هەڵەم... لە هەر کەسێکی دی هەڵەترم! لیبدیف فەرموو ئەمە کلیلەکەیە (بەدەم ئەو قسەیەوە، ئەڵقەیەکی پۆلایینی لە جزدانەکەی دەرهێنا کە سێ چوار کلیلی بچووکی پێوە کرابوو). مەبەستم ئەم کلیلەیە.. یانی کلیلی پێش ئەخیر.. کولیا پێتی نیشان دەدات... کولیا! کوا کولیا(بەدەم ئەو بانگەوە، زەق زەق دەیڕوانییە کولیا و نەی دەبینی). ئا.. بەڵێ... ئەو نیشانتی دەدات. ئەو تۆزێ لەمەپێش لە پێچانەوەی چانتاکەمدا یارمەتی دام. کولیا لەگەڵیا برۆ.

جانتاکەم لە ژوورەکەی میرزادە، لەژێر مێزەکەدایە...

جانتاکە بکەوە، لە بنی جانتاکەدا، سەندوقێکی چکۆلە هەیە، کە دەمانچەکە و قوتووە باروتەکەی تیایە. کولیا بە خۆی تۆزێ لەمەپێش جانتاکەی بۆ پێچامەوە. جەنابی لیبدیف، کولیا هەموو شتێکت نیشان دەدات، بەڵام بەومەرجەی کە سبەی بە یانی هەستام و بەرەو پترسبۆرگ وەڕێ کەوتم، دەمانچەکەم بدەیتەوە، گوێت لێیە؟ من ئەم کارە لەبەر خاتری میرزادە دەکەم، نەک لەبەر خاتری تۆ لیبدیف. لیبیدیف، بەدەم وەرگرتنی کلیلەکانەوە گوتی:

- وا باشە! باشتر!

بەدەم ژارخەنێکەوە، کلیل بە دەست، بەهەشتاو بۆ ژوورەکەی تەنیشت تاوی دا. کولیا وەکو ئەوەی بیەوێ ناڕەزایی دەربڕێت، لە جێی خۆی وەستا، لێ لیبدیف، لە باسکی نەوی و بە ڕاکێشان بەگەڵ خۆی خست.

هیپولیت دەیڕوانییە میوانەکان کە پێدەکەنین. میرزادە هەستی کرد هیپولیت، خەریکە دانەچۆقەی پێدەکەوێ، وەکو ئەوەی تایەکی توندی لێهاتبێ.

هیپولیت دووبارە و بەوپەڕی تورەیی بە گوێی میرزادەیا چپاند:

کە هیپولیت گەیشتە سەر بالکۆنەکە، ڕەق ڕاوەستا، سوراحییەکەی بە دەستی چەپی گرتبوو، دەستی ڕاستی لە گیرفانی پاڵتۆکەیدا بوو، پاشان کیللەر گێڕایەوە کە هیپولیت لەو کاتەشدا کە قسەی دەگەڵ میرزادەدا دەکرد و بە دەستی چەپ شان و یەخەی گرتبوو، ئەو دەستەی هەر لە گیرفانی پاڵتۆکەیدا بووبوو، ئەم دیمەنە گومانی لای ئەو دروست کردبوو. بەهەرحاڵ ئەو گومانە، جۆرە ترسێکی لای کیللەر دروست کردبوو، دوای هیپولیت کەوتبوو، بەڵام لە کاتی خۆیدا فریای نەکەوتبوو. تەنیا شتێکی بریقەداری بە دەستی ڕاستیەوە بینیبوو، پاشان لوولەی دەمانچەیەکی چکۆلەی بەسەر لاجانگیەوە بینیبوو. بەلەز غاری دابوو کە دەستی بگرێت، بەڵام هیپولیت، دەستی بە ماشەی (پەلەپیتکە) دەمانچەکەوە نا، چرکەیەکی وشک و تیژی لێ هەستا، بەڵام پیرە فیشەک کوێرەکی کرد و نەتەقی. کیللەر پەلاماری هیپولیتی دا، باوەشی پێدا کرد، هیپولیت وەک بڵێی بورابێتەوە، لە بەردەستیا کەوت، ڕەنگە بە ڕاستی وای زانیبێ کە خۆی کوشتووە. دەمانچەکە بە دەستی کیللەرەوە بوو. (هیپولیت)یان لەسەر کورسییەک دانیشاند و هەموو ئامادەبووان بە غەڵبەغەڵب و بەدەم گفتوگۆ و پرسیار و وەڵامەوە لێی خڕبوونەوە. هەموو گوێیان لە چرکەی ماشەکە بووبوو، کەچی هیپولیت، ساغ و سەلامەت، زرک و زندوو، تەنانەت هیچ شوێنێکیشی نە ڕوشابوو. هیپولیت، بێ ئەوەی بزانێ چ باسە، وڕوکاس، دانیشتبوو و مات و حایر دەیڕوانییە دەوروبەری خۆی. ڕێک لەو کاتەدا کولیا و لیبدیف. بەهەشتاو گەڕانەوە.

ئامادەبوان لێرە و لەوێ دەیانپرسی:

- چروکی کرد؟ نەتەقی؟

هەندێکی دی بەگومان بوون:

- ڕەنگە، فیشەکی لەبەر نەبووبێ!

کیللەر، کە دەمانچەکەی تاقی دەکردەوە، گوتی:

- فیشەکی لەبەرە و ئەولاتریش، بەڵام...

- ئەی چۆن کوێرەکی کرد و نەتەقی؟

کیللەر گوتی:

- تەرەقەی لەسەر نییە.

زۆر زەحمەتە پیاو بتوانێ، دیمەنە خەمناکەکەی دوای ئەمەوەسف بکات. ئەو ترس و دڵە ڕاوکێیەی لە هەوەڵەوە بەسەر هەمووانداا زاڵ بوو، زۆری نەبرد کە گۆڕاو بوو بە شادی و پێکەنین. ژمارەیەک لەخۆشیاندا کردیان بە هەراو هەنگامەیەک ئەو پەڕی دیار نەبێت، دیار بوو زۆریان کەیف بەم وەزعە دەهات و بە دەرفەتیان دەزانی بۆ ڕابواردن و تانەوتەشەران. هیپولیت، بەدەم هەنسکهەڵدانەوە دەگریا، دەست و بازووەکانی تێکدەئالاند، دەستەکانی هەڵدەگلۆفتن. دەتگوت تووشی جۆرە شێتایەتیک بووە. دەگەیشتە هەر کەسێک تەنانەت (فردیش چیکۆ)ش، باوەشی پێدا دەکرد و سوێندی بۆ دەخوارد کە "بیری چووە تەرەقەکەی بۆ دابنێت، بە ڕێکەوت بیری چووە" دەنا هەموو تەرەقەکان، کە شەش دانەن ئەوەتان لە گیرفانی ئێلەکەکەیدان. (بەدەم ئەو قسانەوە بە یەک بە یەکیانی نیشان دەدات) لە ترسی ئەوەی، ئەگەر لە دەمانچەکەدا بێ، نەبا بە ڕێکەوت لە گیرفانیا بتەقێت، لە جێیەکی تری داناوە، بەو حیسابەی هەر کاتێ بیەوێ تەرقەکە دابنێ، بەئاسانی ئەو کارەی پێدەکرێت، ئیدی بە ڕێکەوت بیری چووبوو! هیپولیت جارێ پەنای بۆ میرزادە و جارێ بۆ یەڤگینی پاڤلوفیچ دەبرد، لە کیللەر دەپاڕایەوە کە دەمانچەکەی بدەنەوە تا بتوانێ "ئابڕووی خۆی بکڕێتەوە"... چونکە ئیدی "بۆ هەتا هەتایە ئابڕووی چووە!"

ئەوسا لە هۆش خۆی چوو و کەوتە سەر ئەرزەکە. یەکسەر بۆ ژووری کارەکەی میرزادەیان گوستەوە. لیبدیف کەوەخۆ هاتبووەوە و مەستی بە تەواوەتی بەری دابوو، یەکسەر ناردی بە شوێن پزیشکدا، خۆی و کچەکەی و کوڕەکەی و بۆردوفسکی و جەنەڕاڵ، بەدیار نەخۆشەکەوە مانەوە.

کاتێ هیپولیت بەبێ هۆشی، بۆ ژوورەکەی میرزادە برا، کیللەر لە ناوەندی ژوورەکەدا وەستا، ڕوو لە هەمووان، بە زمانێکی ڕوون و ڕەوان، بێپێچوپەنا و ڕاستەوخۆ گوتی:

- بەڕێزینە، هەر کەسێک، جارێکی دی، لە حوزوری مندا باسی ئەوە بکات کە هیپولیت، بەئانقەست تەرەقەکەی دا نەناوە، هەر کەسێک بڵێ کە ئەم گەنجە بەدبەختە، تەنیا ویستویەتی سیناریۆیەکی کۆمیدی پێشکەش بکات، عاجزی دەکەم ها!...

کەس وەڵامی نەدایەوە. ئیدی میوانەکان بەلەز و بەرەبەرە بڵاوەیان لێ کرد. پتیتسن و گانیا و ڕوگوژین، پێکەوە ڕۆیشتن.

قەرار بوو یەڤگینی پاڤلوفیچ، دوای ئەوەی ئاهەنگەکە چۆڵ بوو و خەڵکەکە ڕۆیشتن، بە دوو قۆڵی دەگەڵ میرزادەدا قسە بکات، کەچی خەریک بوو بەبێ ئەو گفتوگۆیە دەڕۆیشت. میرزادە ئەوەی پێ سەیر بوو، بۆیە پرسی:

- باشە قەرار نەبوو دوای ڕۆیشتنی خەڵکەکە قسەم دەگەڵ بکەی؟

یەڤگینی پاڤلوفیچ، لەپڕ دانیشت و میرزادەشی لەتەنیشت خۆیەوە دانیشاند و گوتی:

- با، بەڵام ئێستا ڕام گۆڕیوە، چونکە کەمێک نارەحەتم، دەزانم تۆش نارەحەتی. بیر وحەواسم پەرتە. ئەمە جگە لەوەی کە ئەو مەسەلەیەی کە دەمەوێ دەگەڵتا باسی بکەم، هەم بۆ من و هەم بۆ تۆش زۆر هەستیار و گرینگە. میرزادە من دەمویست و دەمەوێ، لە ژیانما، لە هەموو ژیانما، بۆ تاقە جارێک، کارێکی ئابڕوومەندانە بکەم، کارێکی خاڵی لە هەر مەبەستێکی شاراوە و پەنامەیەکی، دوور لە هەر شێلەوبێلەیەک (فێڵ و تەڵەکە)! هەست دەکەم، ئێستا، لەم ساتەدا، ئەو کارەم پێناکرێت، ڕەنگە تۆش هەمان حاڵەتی منت هەبێ... جا با... با... ئەو مەسەلەیە بخەینە کاتێکی دی. لە گینە ئەگەر بیخەنە دوو سێ ڕۆژی دی، کە من بە نیازم ئەو دوو سێ ڕۆژە لە پترسبۆرگ بەرمە سەر، مەسەلەکان بۆ هەر دووکمان زیاتر ڕوون ببێتەوە.

یەڤگینی پاڤلوفیچ، دوای ئەو قسانە، دووبارە لە سەر کورسییەکەی هەستا، هیچ مەعلووم نەبوو بۆچی پێشتر دانیشت بوو. میرزادە هەستی کرد کە یەڤگینی گرژ و پەست و تورەیە، نیگای ڕێک بە پێچەوانەی سەعاتێ لەمەپێش، دژمنانەیە. لەپڕ لە میرزادەی پرسی:

- دەتەوێ بچی بۆلای نەخۆشەکە؟

میرزادە بەرسڤی دایەوە:

- بەڵێ... بۆی پەرۆشم!

- خەمت نەبێ، هیچ مەترسە! لە گینە تا شەش هەفتەی دیکەش بژی، دوور نییە لێرە، چاکیش ببێتەوە، بەڵام باشترین شت بۆ تۆ ئەمەیە کە سبەینێ جانتاکەی بدەیتەوە دەستی وبە ڕێی بکەی.

- ڕەنگە منیش، بە بێدەنگی خۆم، بیئەوەی پێ بحەسم هانم دابێت... ڕەنگەوای هەست کردبێت، کە منیش گومانم لەوە بووبێ کە بە ڕاستی نیازی خۆکوژی هەبووبێت. تۆ چ دەڵێی یەڤگینی پاڤلوفیچ؟

- نا، هەرگیز! تۆ لە پیاوەتی و دڵپاکی خۆتە کە ئەوەندە بە خەمییەوەیت! من پێشتر بیستبووم، بەڵام هەرگیز بە چاوی خۆم نەم دیتبوو، کە هەندێ جار ئینسان تەنیا بۆ ئەوە خۆی دەکوژێت کە سەرنجی خەڵکی ڕاکێشێت و ستاییشی بکەن، یان لە داخی ئەوە خۆی دەکوژێت کە کەس گوێی ناداتێ و ستاییشی ناکات. هەروەها قەت باوەڕم نەدەکرد کەسێک هەبێت، بەو زەقیە دان بە لاوازی و بێ دەسەڵاتی خۆیدا بنێت؟ بەهەرحاڵ باشترین شت بۆتۆ ئەوەیە کە لە سبەینێ زووتر نییە، بەڕێ بکەویت و خۆت لە شەڕی ڕزگار بکەیت!

- پێتوایە، جارێکی دیکەش هەوڵی خۆکوژی بدات؟

- نا، جارێ نا... بەڵام دەبێ ئاگات لەم "لاسینیرە" رووسیە بێت! چونکە ئەم جۆرە کەسە ناچیز و پەرپووت و بێ سەبر و بەغیل و حەسوودانە، کە هیچ مەفەڕێکیان نەما پەنا دەبەنە بەر هەر تاوانێک، تاوان و ئاو خواردنەوەیان لەلا وەکو یەکە!

- یانی، لە بابەتی لاسینیرە؟

- لەجەوهەرا بەڵێ، هەرچەند ڕەنگە بەپێی زروف جیابێ. بۆیە من هیچ بە دووری نازانم. ئەم کوڕە، دە دوازدە کەس بەجارێ " هەر بۆ خۆشی و فشە بە هەمان شێواز بکوژێت کە لە "وتارەکەیدا" باسی کرد. بە ڕاستی لەو قسانەی دەترسم و ناچارم شەوێ نەخەوم.

- لەوەدەچێ شتەکە زیاد لە پێویست گەورە بکەیتەوە.
- میرزادە تۆ سەیری ها! یانی باوەڕ ناکەیت، ئەم کوڕە لە دەستی بێ دەکەس بەجارێ بکوژێت؟
- دەترسم، وەڵامی ئەم پرسیارەت بدەمەوە. پرسیارێکی زۆر غەریبە، بەڵام، بەڵام...
یەڤگینی پاڤلوفیچ، بە توڕەیی گوتی:
- زۆر باشە، بەکەیفی دڵی خۆت بکە! بە ڕاستی تۆ پیاوێکی بەجەرگی! بەڵام ئاگات لە خۆ بێ، نەبیت بە یەکێک لە قوربانیەکانی! میرزادە، بە حەواسپەرتی ڕوانییە یەڤگینی پاڤلوفیچ و گوتی:
- نا، پێم وا نییە هیچ کەسێک بکوژێت.
یەڤگینی پاڤلوفیچ، بەدەم ژارخەنێکەوە گوتی:
- دەی بە هیوای دیدار، کاتی ڕۆیشتنە. ئاگات لێ بوو وەسێتی کرد کە نوسخەیەک لە (وتارەکەی) بدەی بە ئاگلایا ئیڤانۆفڤا؟
- بەڵێ، ئاگام لێ بوو... و... ئەمە خستمیە بیرکردنەوەوە.
یەڤگینی پاڤلوفیچ، دووبارە بە ڕیشخەنەوە گوتی:
- من دەبێ بیر لەو دە دوازدە قوربانیە بکەمەوە.
ئەو قسەیەی کرد و ئەوسا ڕۆیشت.
دوای سەعاتێک، لەنێوان سەعات سێ و چواری بەیانیدا، میرزادە چوو بۆ باخەکە. بێهودە هەوڵی دابوو لە ماڵەکەی خۆیدا بخەوێ، بەڵام لەبەر دڵەکوتێی توند خەوی لێنەکەوتبوو. لە ماڵەوە، هەموو شتێک هاتبووەوە تایمی خۆی. یارۆی نەخۆش خەوی لێکەوتبوو، ئەو دکتۆرەی هاتبووە معایەنەی گوتی هیچ مەترسییەکی ڕاستەوخۆی لەسەر نییە. لیبدیف و کولیا و بوردوفسکی لە لای ئەو نوستبوون و بە نۆرە ئێشکیان دەگرت. یانی هیچ مەترسییەک لە ئارادا نەبوو، بەڵام میرزادە، وێڕای ئەوەش، سات بە سات نیگەرانتر دەبوو. وێڵ و سەرگەردان بە ناو باخ و سەیرانگاکەدا دەسووڕایەوە و نیگای وێڵ و خەو زڕاوی بە دەوروبەری خۆیدا دەگێڕا، کە گەیشتە دەوروبەری سەکۆو شانۆی تیپی مۆزیکەکە و، کورسیە چۆڵ و

هۆڵەکان و دەفتەری نۆتەی ئۆرکستراکەی بەسەر ستاندەکانەوە بینی، بە سەرسامی ڕاوەستا، بەخۆیشی نەیزانی بۆ دیمەنی ئەم شوێنەی، زۆر دزێوو ناشرین و قێزەون هاتە بەرچاو! بە ڕێی خۆیدا گەڕایەوە. هەمان ڕێگای گرتەبەر کە دوێنێ دەگەڵ مالّباتی یەپانچیندا، لێوەی هاتبوون بۆ ئاهەنگ و سەیرانگاکە. کە گەیشتە ئاستی تەختە کەسکەکە، ئەو تەختە کەسکەی کە وەکو ژوانگە دیاری کرابوو، لەسەر تەختەکە دانیشت و لەپڕ لە قاقای پێکەنینی دا، دوا بەدوای ئەوە نیگەرانییەکی توند دایگرت و کەوتە گلەیی لە خۆی. دڵی تەنگ بوو، حەزی دەکرد، سەری خۆی هەڵبگرێ و بڕوات، بەڵام نە یدەزانی بۆ کوێ بڕوات، لەپڕ مەلێکی چکۆلە لەسەر درەختەکەی دیار سەریەوە، هەڵی کردە خوێندن، نیگای بە دوای مەلەکەدا، بەرەو لای نێو لقوپۆپی درەختە کرد. مەلەکە لەپڕ لە شەقەی باڵی دا و فڕی. میرزادە یەکسەر ئەو "مێشە چکۆلەیەی بیر کەوتەوە کە لەبەر هەتاوە گەرمەکەدا بە گیزە گیز دەسووڕایەوە" کە هیپولیت لە وتارەکەیدا باسی کردبوو گوایە "شوێنی خۆی لە ناو جۆقەی سروشتدا هەیە و یەکێکە لە بەشدارانی جۆقەکە) و ئەوەی بێگانە و غەوارەبێ و لەو جۆقەیەدا جێی نەبێ و جێی نەبێتەوە، هەر ئەوە، واتا هیپولیتە. ئەم ڕستەیە کە ئەوساش سەرنجی ڕاکێشابوو، هەنوکە لە یادگەیدا زندوو دەبووەوە، ئەمە یادەوەرییەکی کۆنی فەرامۆش بووی، لە ناخیا بێدارکردوە و ڕوون و ئاشکرا لە بەر چاویا بەرجەستە بووەوە.

ئەم یادەوەرییە هی سویسرا بوو، هی یەکەم ساڵ، تۆ بڵێ هی هەوەڵین مانگەکانی ساڵی یەکەمی چارەسەرەکەی بوو لەوێ. هی ئەو کاتانە بوو، کە هێشتا گێل و گەمژەیەکی وەها بوو، کە نەیدەتوانی، بە دروستی و جوانی گوزارشت لەو شتە بکات کە دەیویست، بگرە هەندێ جار تێنەدەگەیی کە چیان لێدەویست یان چییان لێدەپرسی. بە یانیەک کە دنیا ساماڵ و نقومی هەتاو بوو، ڕووی کردە چیاو کۆجاران، ماوەیەکی زۆر بێهودە سووڕایەوە. مێشکی بە ئەندێشەیەکی گۆنگ و ناپایەدارەوە مژول بوو، هەرچی دەکرد ئەو ئەندێشە و خەیاڵەی بۆ نەدەخرایە چوارچێوەیەکی دیاری کراوەوە. کە

دەیڕوانییە سەری، تا چاو هەتەر دەکات ئاسمانی شین و مەنگ بوو. کە دەیڕوانییە ژێر پێی تا خەیاڵ بڕ دەکات دەریاچەیەکی ئەفسووناوی بوو، کە دەیڕوانییە ئاسۆ، یەکپارچە ڕووناکی بوو، ڕووناکییەکی بێسنوور و بێ کۆتایی، ماوەیەکی زۆر بە دڵی خەمناک و پەرێشانەوە، چاوی بڕیە ئەو دیمەنە. ئێستا بیری دەکەوتەوە کە چۆن دەستی بۆ ئەو ئۆقیانووسە ڕووناکییە شینباو و ئارامە بردووە و هۆن هۆن گریا وە و فرمێسکی دنیای ڕشتووە. کە چۆن خۆی بە نامۆ و بێگانە زانیوە و چ ئازارێکی دەروونی چەشتووە، کە نەیتوانیوە، لەم ئاهەنگ و جەژنە بێ پایانەدا، کە لە منداڵییەوە، بە عەزرەتیەوە بووە، تامەزرۆی بووە، بە شداری تیا بکات؟ هەموو ڕۆژێ هەتاوی بەشکۆ، هەڵدەهات، هەموو بەیانیەک پەلکەزێڕینە بە ئاسمانی تاڤگەکانەوە دەردەکەوت. هەموو شەوێ، لوتکەێن بەرزی بەفرگر، لە دووری دوورەوە، لە کۆتایی ئاسمانەوە، بە ڕەنگێکی ئەرخەوانی بە سەر تێکڕای ئەم دیمەنانەدا دەدرەوشایەوە. هەر "مێشێکی چکۆلە، کە بەگێزە گێز لەژێر تیشکی خۆرەتاوی گەرما، بەدەوری ئەودا دەسووڕایەوە، بەشداری لەم پانۆرامایەی تەبیعەتەدا دەکرد: دەیزانی کامە شوێنی ئەوە، شوێنی خۆی خۆش دەویست، دڵی بە شوێنەکەی خۆی خۆش بوو" هەر گیایەکت دەگرت گەشەی دەکرد، نەشونمای دەکرد و بەختەوەر بوو! هەر بوونەوەر و شتێک ڕێگەی خۆی دەزانی، بەدەم گۆرانی و سۆزەوە دەهات و دەچوو! تەنیا ئەو هیچی نەدەزانی، لە هیچ حاڵی نەدەبوو، نە لەبەشەر، نە لە نەغمە و دەنگەکانی تەبیعەت، چونکە بێگانە و غەوارە بوو، لە هەموو شوێنێ هەر غەریب و غەوارە بوو، لە هەموو شوێنێ هەر بێ شوێن و بێزراو بوو. ڕاستە کە ئەو سەردەمە نەیدەتوانی بەم وشانە، بەم ڕوونییە گوزارشت لە هەست و نەستی خۆی بکات و، نەیدەتوانی پرسیارەکەی بەم شێوەیەی ئێستا دابڕێژێت، ئازارێکی کەڕولاڵ سەری ژەنی بووە دڵی، بەڵام ئێستا وای خەیاڵ دەکرد کە هەر هەموو ئەوانەی لەو کاتانەدا، لەو سەردەمەدا، بە هەمان وشە و بە هەمان شێواز گوتبوو. وای وێنا دەکرد کە قسەکانی هیپولیت لە مەڕ "مێشە چکۆلەکە" لە قسە و فرمێسکە خوێنینەکانی ئەوسای

ئەمەوە، وەرگیراون. نازانێ بۆ قەناعەتی تەواوی بەمە هەیە! کە بیر لەمە دەکاتەوە، لە خۆڕا دڵی دەکەوێتە پەلە پەل و توندتر لێدەدات.

لەسەر تەختەکە خەوی لێکەوت، بەڵام نیگەرانی و شپرزەیەکەی لەخەوتنیشدا هەر دەستبەرداری نەبوو. ڕێک بەر لەوەی بە تەواوەتی خەوی لێبکەوێت، قسەکەی یەڤگینی پاڤلوڤیچی بیر کەوتەوە کە دوورنیە هیپولیت، دە دوازدە کەس بە کەرەتێ بکوژێت، گاڵتەی بەو بیرە پوچ و مەحاڵە هات. بێدەنگییەکی پاک و بە شکۆ و مەنگ دەوری دابوو، کە ناو بە ناو خشە خشی گەڵای درەختەکان بەئاستەم دەیشڵەقاند، کە خۆی لە خۆیدا بێدەنگییەکەی دووپات دەکردەوە. میرزادە خەو لە دوای خەوی دەبینی، هەموو خەوەکانیشی ناخۆش و خەماوی بوون، هێندە ترسناک بوون، تە زووی نا ئارامیان بە گیانی دەبەخشی. ئەنجام ژنێکی هاتە خەو، ئەم ژنەی دەناسی، تا سەر مۆخ دەیناسی، بە ناو ناوی دەزانی، دەیتوانی بانگی بکات، بەڵام ئەوەی سەیر بوو، چارە و ڕوخساری ئەم ژنە، هەمان چارە و ڕوخسار نەبوو کە ئەو پێی ڕاهاتبوو. کە بەو شێوە و ڕوخسارە تازەیەوە بینی، زۆری پێناخۆش بوو. ئەم دەموچاوە تازەیە، پەشیمانی و ترسێکی ئەوتۆی پێوە دیار بوو، کە پیاو وای هەست دەکرد ڕەنگە ئەم ژنە تاوانبارێکی یەجگار ترسناک بێت، تازە لە تاوانێکی دزێو بووبێتەوە.

دڵۆپە فرمێسکێکی درشت بەسەر گۆنای زەردی ژنەکەوە دەلەرزی. ژنە بە ئاماژەی دەست گازی کرد، قامکی خستە سەر لێوانی، وەک بڵێی هەڕەشەی لێ بکات کە بە بێدەنگی و بێ چەند و چوون دوای بکەوێ. دڵی داخورپا، هیچ بەڵگە و بیانوویەکی بەدەستەوە نەبوو کە ئەم ژنە بە تاوانبار بزانێت، کەچی وێڕای ئەوەش هەستی دەکرد، شتێکی ترسناک، قەوماوێکی ناخۆش بەڕێوەیەو، شتێک کە ڕێڕەوی سەرانسەری ژیانی دەگۆڕێت. لەوە دەچوو ئەم ژنە بیەوێ، لەو نزیکانە، لە ناو سەیرانگاکەدا شتێکی پێ نیشان بدات. میرزادە هەستا تا دووی بکەوێت، بەڵام سەدای پێکەنینێکی خۆش و پاراو لە نزیکیەوە بەرز بووەوە. لەپڕ هەستی بە دەستێک لەنێو دەستی خۆیدا کرد. دەستەکەی توند گرت، لە خەو ڕاپەڕی. ئاگلایا لەبەردەمیا

وەستابوو، شادو بەکەیف قاقا پێدەکەنی.

پەراوێز:

* - "لاسینیر،پییر-فرانسوا(١٨٠٠-١٨٣٦) لە ناوەڕاستی دەیەی سییەکانی سەدەی نۆزدەدا، بە تۆمەتی زنجیرە تاوانێکی دزێو و دڕندانە، ڕاکێشرایە دادگا.

## فەسڵی هەشتەم

پێدەکەنی، لێ لە هەمان کاتدا پەست و زویریش بوو. بە سەرسامیەکی پڕ لە تورەیی هاواری کرد:

- نوسستووە! ئەوە نوستبوویت؟

میرزادە کە هێشتا بە تەواوەتی بێدار نەبووبووەوە، نیگایەکی کرد، ناسیەوە، بە سەرسامی و لەبن لێوانەوە گوتی:

- ئەمە تۆیت؟ ها... بەڵێ... قەرار بوو لێرە یەکدی بدینین... خەوم لێکەوت!

- دەزانم، بە خۆم بینمیت!

- تۆ خەبەرت کردمەوە؟ جگە لە تۆ کەسی دی بۆ ئێرە نەهات؟ وامزانی ژنێکی دی بۆ ئێرە هاتووە.

- ژنێکی دی؟

میرزادە، ئاقیبەت بە تەواوەتی بێدار بووەوە. بە حەواس پەرتییەوە گوتی:

- دیارە خەون بووە، بەڵام ئەو خەونە سەیرە و لەم کاتەدا! دانیشە.

دەستی ئاگلایای گرت و لەسەر تەختەکە دای نیشاند و بە خۆیشی لەتەنیشتیەوە دانیشت و لە فکران ڕاچوو. ئاگلایا بێدەنگییەکەی نەشکاند، بەڵام بەوردی تەمەشای ئەوی دەکرد. ئەویش تەمەشای ئاگلایای دەکرد. هەندێ جار بە شێوەیەک سەیری دەکرد، لە تۆ وایە نەیدەبینی. دەموچاوی ئاگلایا سوور بووەوە.

میرزادە، بەدەم لەرزینەوە گوتی:

- هیپولیت، دەمانچەیەکی نا بە لاجانگی خۆیەوە.

ئاگلایا، بێ ئەوەی سەرسامیەکی زۆری پێوە دیاربێت پرسی:

- کەی؟ لەلای تۆ؟ وابزانم تا دوێشەویش هەر زندوو بوو وانییە؟

ئەوجا بە هەڵچوونەوە لەسەری ڕۆیشت:

- باشە، دوای ئەو ڕووداوە، چۆن توانیت بێی لێرە بخەوی؟

میرزادە گوتی:

- خۆ نەمردووە. دەمانچەکە چروکی کرد.

میرزادە، لەسەر داوای ئاگلایا، ناچاربوو، ڕووداوەکەی دوێشەو، بە دووروودرێژی بگێڕێتەوە. ئاگلایا زوو زوو پەلەی لێدەکرد، بەردەوام بێت لەسەر گێڕانەوەکەی، ناوبە ناویش، بە هەندێ پرسیاری بێ سەروبەر قسەکەی پێدەبڕی. هەڵبەتە زۆر بەوردی گوێی لەو قسەیە گرت کە یەڤگینی پاڤلوفیچ گوتبووی، تەنانەت چەند جارێک بە میرزادەی دووبارە کردبووەوە. دوای ئەوەی گوێی لە هەموو بەسەرهاتەکە بوو، گوتی:

- ئەوەندە بەسە! دەبێ پەلە بکەین! تەنیا یەک سەعاتمان بە دەستەوەیە، دەبێ سەعات هەشتی تەواو لەماڵەوەبم، تا پەی بەوە نەبەن کە من لێرە لەگەڵ تۆدا بووم. من بە مەبەستێکی تایبەتی بۆ ئێرە هاتووم، چونکە زۆر شت هەن دەبێ پێت بڵێم، بەڵام حیکایەتەکەی تۆ بە ڕاستی هەموو شتێکی بیر بردمەوە. سەبارەت بە هیپولیت، پێم وایە ئاساییە کە دەبوایە دەمانچەکەی نە تەقێت، دەبوایە چروکی کردبا، بە خۆی وای داناوە کە نەتەقێ، چونکە ئەو کوڕە شتی وای لێدەوەشێتەوە. باشە تۆ دڵنیایت کە نیازی خۆکوژی هەبووە و فێڵ و دەهۆیەک لەو کارەدا نەبووە؟ ئەمە سیناریۆ نەبووە؟

- نا، هیچ سیناریۆیەک لە ئارادا نەبوو!

- ئەمەیان زیاتر ڕێی تێدەچێ. باشە ئەو بە نووسین داوای لێنەکردوویت کە ئیعترافنامەکەی (وتارەکەی) بۆ من بێنی؟ بۆچی بۆت نە هێناوم؟

- پێمنەگوتیت نەمردووە؟ پرس بە خۆی دەکەم





– نەپرسی پێ بکە و نە هیچ، بیهێنە و بڕایەوە. من دەزانم پێی خۆش دەبێت. ڕەنگە هەر لە بەرئەوە خۆکوژی کردبێت، تا پاشان من ئیعترافنامەکەی بخوێنمەوە. تکایە لیون نیکولایوفیچ، گاڵتەت بەم قسەیەم نەیەت: ڕەنگە ئەم ڕاڤەیەی من زۆر دروست بێ.

– نەخێر، گاڵتەم پێنایەت، چونکە منیش پێم وایە ڕەنگە ئەم ڕاڤەیە دروست بێ.

ئاگلایا، بەوپەڕی سەرسامی گوتی:

– بە ڕاست، تۆش؟ بە ڕاستی هەمان شتت بە بیردا هاتووە؟

زۆر بە پەلە پەل پرسیای دەکرد و هەندێ جار دەپەشۆکا و بیری دەڕۆیشت و زۆر جار بێ ئەوەی قسەکەی تەواو بکات بێدەنگ دەبوو، جارجار وا دەهاتە بەرچاو کە دەیەوێ میرزادە لە شتێک ئاگادار بکاتەوە. بە گشتی زۆر پەشێوو پەریشان بوو، هەرچەندە جۆرە متمانە و بێپەروایەک بە نیگایەوە دیار بوو، لێ پێدەچوو لە ناخا هەندێک بترسێت.

لەوسەری تەختەکە دانیشتوبوو، جلێکی سادە و ئاسایی لەبەر بوو، بەڵام تا بڵێی جوان بوو لێی دەهات. زۆر جار تە زووی پێدا دەهات و سوور هەڵدەگەڕا. زۆری پێ سەیر بوو کە میرزادەش پێی وا بوو، هیپولیت بۆیە ویستوویەتی خۆی بکوژێت تا ئەو (ئاگلایا) ئیعترافنامەکەی بخوێنێتەوە.

میرزادە بەدەم شرۆڤەوە گوتی:

– هەڵبەتە، سەرباری تۆ، حەزی دەکرد هەر هەموو ئێمەش ستاییشی بکەین.

– ستاییش؟ چۆن؟

– مەبەستم.... نازانم چۆنت تێبگەیەنم؟ هەڵبەتە گوزارشت کردن لەم حاڵەتە یەجگار قورسە. بێگومان حەزی دەکرد، هەموو خەڵکی لە دەوری خڕببنەوە، ڕێز و خۆشەویستی و قەدرزانی خۆیانی بۆ دەرببڕن، تکای لێبکەن، بکەونە خاک وپای کە خۆی نەکوژێت. زۆر لە گینە تۆی لە هەموو کەسێک پتر لە هزر و زەینا بووبێ، چونکە لەو ساتە هەستیارەدا بە ناو،

ناوی تۆی برد... هەرچەندە لەوەشە بە خۆیشی نەیزانی بێ کە تۆ لە زەین و هزریدا هەیت، نەی زانیبێ کە بیر لە تۆ دەکاتەوە...

- من لەمە تێناگەم یانی چی بیر لە من دەکاتەوە، بێ ئەوەی بە خۆیشی زانیبێتی بیر لە من دەکاتەوە؟! با، با، تێگەیشتم! پێم وایە تێگەیشتم! دەزانی من کاتێ کچۆڵەیەکی سێزدە ساڵان بووم، سێ جار کەوتمە بیری ئەوەی ژەهر بخۆم و هەموو شتێک لە نامەیەکدا بنووسم و بۆ داک و بابمی بەجێ بێڵم؟ ئیدی خۆمم دێنایە بەرچاو کە چۆن لە تابوتێکا ڕاکشاوم و چۆن هەموو کەسوکار دەوریان داوم و بەدیارمەوە دەگرین و گلەیی و گازندە لە خۆ دەکەن کە ئەوەندە دەرهەق بە من کەمتەرخەم و بێ موبالات بوون..

ئەوسا برۆکانی وێکهێنانەوە و بە گرژی و پەستی لە سەری ڕۆیشت.

- بۆچی دیسان پێدەکەنی؟ باشە تۆ کاتێ بە تەنیا دەبیت و بە ناو خەون و خەیاڵان دەکەوی چۆن بیر لە خۆت دەکەیەوە؟ قابیلە خۆت بە مارشاڵێک بێتە بەرچاو کە بە گژ ناپلیۆندا دەچێتەوە؟

میرزادە بەدەم پێکەنینەوە بەرسڤی دایەوە:

- باوەڕ دەکەی خۆم لێدەبێ بە مارشاڵ، بە تایبەتی کە لە خەوابم و خەون ببینم، بەلام ناچمە شەڕی ناپلیۆن، بەڵکو دەچمە شەڕی نەمساویەکان.

- من گاڵتەت دەگەڵ ناکەم جەنابی لیون نیکولایوفیچ. گەرەکمە بە خۆم هیپولیت ببینم، تکایە ئەوەی پێ بڵێ. سەبارەت بە تۆش، پێم وایە تۆ تەواو هەڵەیت، چونکە بیرو بۆچوونت دەربارەی هیپولیت، زۆر نا دروست و ناپەسەندە. تۆ هیچ لێبوردەیی و سۆز و دلۆڤانیەکت تیا نییە. جگە لە حەقیقەت هیچ شتێکی دیکە نابینی، یانی زاڵمیت.

میرزادە، تاوێک لە فکران ڕاچوو و پاشان گوتی:

- پێم وایە تۆ لەم داوەریەتدا دەرهەق بە من زاڵمیت، بێ لوتفی و بێ مروەتی دەکەی، چونکە من هیچ شتێکی خراپ لە جۆری بیرکردنەوەکەی ویدا نابینم، بەلامەوە ئاساییە ئەگەر ئەو بیرەی بە مێشکا هاتبێ، چونکە هەموو کەسێک ئەو جۆرە بیرکردنەوەیەی لەلا هەیە. ئەمە جگە لەوەی کە

لە گینە بە هیچ جۆرێ بیری وای نەکردبێتەوە. بەڵکو تەنیا خەیاڵێکی ڕەوتەنی بووبێ، بە مێشکیا هاتبێت! ویستبێتی، بۆ دواجار لە خەڵکی نزیک ببێتەوە، ڕێز و حورمەتیان بۆ خۆی ڕاکێشێت. دیارە ئەمە خۆی لە خۆیدا هەست و سۆزێکی زۆر باشە، بەڵام ئەمە بۆ ئەو نەلوا. هۆیەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ نەخۆشییەکەی و بۆ.. نازانم چیترا!... ئیدی دنیا بە دڵی هەموو کەس نابێت، بۆ هەندێ کەس دەلوێت و بە هەموو ئاواتێک دەگەن و بۆ هەندێکی تریش نایەتە بار و گومڕا دەبن و هەرچی دەکەن و دەکۆشن، هیچ بە هیچ ناکەن...

ئاگلایا گوتی:

- پێم وایە تۆ لە دەستەی دووەمیانیت و ئەو قسەیە دەقاودەق خۆت دەگرێتەوە!

میرزادە، بێ ئەوەی هیچ گومانێک لە نیازی پرسیارەکەی ئاگلایا بکات، بەرسڤی دایەوە:

- بەڵێ.

- بەهەرحاڵ من لەجیاتی تۆبام نەدەنوستم، بەڵام وا دیارە تۆ گوێی نادەیتێ و لە هەر شوێنێ خەوت بۆ هات دەنووی. هەق نییە شتی وا لە تۆ بوەشێتەوە.

- ئاخر شەوێ کەم و زۆر نە خەوتم. دوای پیاسە و گەڕانێکی زۆر ئەوجا چووم بۆ شوێنی مۆسیقاکە...

- مۆسیقای چی؟

- ئەو شوێنەی کە دوێنێ شەو مۆسیقایان تیا لێ دەدا، دوای ئەوە هاتم بۆ ئێرە، دانیشتم، ماوەیەکی زۆر بیرم کردەوە، ئەوسا خەو بردمیەوە.

- بە ڕاست؟ ئەم بیانووە بە قازانجی تۆیە نەک بە زیان... بەڵام بۆچی چوویت بۆ شوێنێ مۆسیقاکە؟

- نازانم... ئیدی وا ڕێکەوت...

- گرینگ نییە، پاشان باسی دەکەین. تۆ هەمیشە قسەم پێدەبڕیت. من هەقم چییە بۆ شوێنی مۆسیقاکە ڕۆیشتوی یان نا؟ بڵێ بزانم ئەو ژنەی لە

خەوەکەتدا بینیت کێ بوو؟

- ئەوە بوو... ئەوە بوو... تۆ خۆت دیتووتە...

- تێگەیشتم... دەزانم، دەزانم کێ دەڵێی... تۆ زۆر... بەڵام چ خەوێکت پێوە دیت؟ بە چ شێوەیەک هاتە خەوت؟

لەپڕ بە جۆرە تووڕەیەک لە سەری ڕۆیشت:

- بەهەرحاڵ، نامەوێ هیچ لەم بارەیەوە بزانم. تۆ بەردەوام قسەم پێدەبڕیت، قسەکەم پێ مەبڕە...

ئاگلایا بۆ ساتێک لە قسان وەستا، وەک بڵێی بیەوێ نەفەس تازە بکاتەوە، یان تووڕەیەکەی بخواتەوە و کۆنترۆڵی بکات. ئەوسا بە نیمچە تووڕەیەکەوە گوتی:

- بە کورتی، من داوام لێ کردیت کە بێی بۆ ئێرە و یەکتر ببینین تا داوات لێ بکەم کە ببیت بە دۆست و برادەرم... چییە، بۆچی بەو جۆرە تەمەشام دەکەی؟

بە ڕاستی میرزادە، لەو دەمەدا زۆر بەدیقەت و سەرنجەوە تەمەشای دەکرد، چونکە دەیبینی سات بە سات پتر هەڵدەچێت و سوور دەبێتەوە. لەم جۆرە حاڵەتانەدا. زیاتر سور دەبوەوە، بە چاوە گراویەکانیا دەردەکەوت کە، پتر لە خۆی تووڕە دەبێت. ئیدی عادەتی وابوو، دوای یەک دوو دەقیقە، قارو غەزەبی خۆی بەسەر بەرانبەرەکەیدا، چ تاوانبار بوایە و چ بێتاوان، هەڵدەڕشت. پەلپ و بیانووی بە بەرانبەرەکەی دەگرت، شەڕی پێدەفرۆشت. جا چونکە خۆی دەناسی و بە تەبیعەت کەمێک دوورەپەرێز و بڕێک شەرمنۆک بوو، بەدەگمەن خۆی لە قسە و باسان هەڵدەقورتاند، لە خوشکەکانی دیکەی کەمدووتر بوو. بگرە یەکێک لە عەیبەکانی ئەوە بوو کە زۆر بێدەنگ بوو. جا هەر کاتێ، لە هەلومەرجێکی هەستیاری وەکو ئێستایدا، ناچار بوایە قسان بکات، بە فڕناخی و لووتبەرزییەکی ئاشکراو بە جۆرە بێ مابالاتیەکی بێباکانەوە قسەی دەکرد. بە خۆی پێشوەختە، هەستی دەکرد کەی سوور دەبێتەوە. چاوانی لە دوڕ چاوانی میرزادە بڕی و بە لەخۆبایی بوونەوە پرسی:

– چییە، ناشێ نەتەوێ پێشنیازەکەم قەبووڵ بکەیت؟

میرزادە، نیگەران و سەراسیمە، بە شەرمەوە گوتی:

– بەپێچەوانەوە، دەمەوێ، بەڵام... بەڵام بێفایدەیە، هیچ سوودێکی نییە... هەرگیز لەو باوەڕەدا نەبووم ئەم پێشنیازە بکەیت، یان پێویست بەم پێشنیازە هەبێت.

– ئەدی بەتەمای چ بوویت؟ بۆچی داوام لێ کردیت بۆ ئێرە بێی؟ چ بیرێکت لە مێشکایە؟ یان تۆش کەمێک بە گەوجم دەزانی، وەکو چۆن لە ماڵەوە هەمووان بە گەوجم دەزانن؟

– هەرگیز بەمەم نەزانیوە کە لە ماڵەوە بە گەوجت دەزانن. من... من، بە گەوجت نازانم، بەو چاوە سەیرت ناکەم.

– بەوچاوە سەیرم ناکەیت؟ بەش بەحاڵی خۆت زیرەکی، تۆش لە پەناوە و زیرەکانە هەمان قسەی ئەوان دەکەیتەوە!

میرزادە لەسەری ڕۆیشت و گوتی:

– بە نۆڕینی من، تۆ هەندێ جار زۆریش هۆشن و زیرەکی، بۆ نموونە تۆزێ لەمەپێش، قسەیەکی زۆر پڕ مانات کرد: " تۆ جگە لە هەقیقەت هیچ شتێکی دی نابینی، کەواتە زاڵمیت." من ئەم سەرنجە لای خۆم تۆمار دەکەم و لێی ورد دەبمەوە.

ئاگلایا، لەپڕ لە خۆشیاندا سوور بووەوە، زۆر بەئاسانی، بێ ڕیاو ڕاستگۆیانە ئەم جۆرە گۆڕانە کوتوپڕانەی بە سەردا دەهات. میرزادەش خۆشحاڵ بووبوو، بەدەم تەمەشاکردنی ئاگلایاوە، بە دڵ و بە کوڵ پێدەکەنی. ئاگلایا، هاتەوە قسان و گوتی:

– گوی بگرە. من دەمێکە چاوەڕوانم کە هەموو شتێکت بۆ بگێڕمەوە، لە هەمو شتێکت ئاگادار بکەم. لەو کاتەوە کە لەوێندەرەوە نامەکەت بۆ ناردبووم چاوەڕوانم، بگرە لەپێشتریشەوە... دوێ شەو تەنیا نیوەی ئەو شتانەم بۆ گێڕایەوە کە حەزم دەکرد پێتی بڵێم و لێی ئاگادار بیت. جا من تۆ بە شەریف ترین و ڕاستگۆترین مرۆڤ دەزانم. زۆر شەریفتر و ڕاستگۆتر لە هەر کەسێکی دی. جا ئەوانەی کە دەڵێن مێشکت... یانی

هەندێ جار لە ڕووی دەروونیەوە... گوایە مێشکت تەواونیە، نەخۆشە، نابەجایی دەکەن، بێ مروەتیە. من قەناعەتی تەواوم بەم قسەیەی خۆم هەیە و گەنگەشەم لەگەڵ هەمووانـدا کردووە. جا ئەگەر هەندێ جار جۆرە نەخۆشییەکیش لە ئەقڵ و مێشکی تۆدا سەرهەڵبدا (ببورە کەوا دەڵێم، من هیچ مەبەستێکی خراپم نییە) ئەوا زەین و زیرەکی بنەڕەتی تۆ، لە هی یەک بە یەکی ئەوانە زیاتر و باشترە، زەین و زیرەکی تۆ زیرەکیەکە کە ئەوان بە خەونیش شتی وا بەخۆوە نابینن، چونکە دوو جۆرە زەین و زیرەکی هەیە! زیرەکیەکی بنەڕەتی و زیرەکییەکی لاوەکی... وانییە؟

میرزادە، بە دەنگێکی نزم، کە بەئاستەم دەبیسترا، بە شەرمێکەوە گوتی:

- ڕەنگەوابێ، ڕەنگە قسەی تۆبێ.

دڵی بە شێوەیەکی سەیر کەوتە لێدان و پەلەپەل.

ئاگلایا، لەسەر قسەکەی ڕۆیشت و بە زمانێکی پڕشکۆ گوتی:

- دەمزانی کە لێم دەگەیت. میرزادە (س...) و یەڤگینی پاڤلوفیچ، هیچ شتێک لەمەڕ ئەم دوو زیرەکییە نازانن، ئەلکسندراش تێی ناگات. دەزانی دایکە لەمە دەگات؟

میرزادە گوتی:

- تۆ زۆر لە لیزاڤیتا پرۆکۆفیڤنا دەچیت.

ئاگلایا بەسەرسامی پرسی:

- چۆن؟ بە ڕاست؟

- بەڵێ بە ڕاستی لەو دەچیت.

ئاگلایا، بۆ ساتێک لە فکران ڕاچوو و گوتی:

- سوپاست دەکەم، زۆرم پێ خۆشە کە لە"دایکە" دەچم.

ئاگلایا ئەوسا، بێ ئەوەی بزانێت کە پرسیارەکەی چەند ساویلکانەیە پرسیی:

- پێم وایە تۆ زۆر ڕێزی دەگریت، وانییە؟

- بێگومان. زۆر خۆشحاڵم کە یەکسەر پەیت بەم ڕاستیە برد.

- منیش خۆشحاڵم، چونکە دەبینم هەندێ جار... گاڵتەی پێدەکەن، بەلام

گوێ بگرە، من دوای بیرکردنەوەیەکی زۆر ئەوسا تۆم هەڵبژاردووە. نامەوێ لە ماڵەوە گاڵتەم پێ بکەن یان وەکو کیژۆڵەیەکی سەرشێت مامەڵەم لە تەکدا بکەن. نامەوێ سەربکەنە سەرم و تورەم بکەن... من لەپڕ لە هەموو ئەم شتانە حاڵی بووم، (یەڤگینی پاڤلوفیچ )م ڕەفزکرد، چونکە نامەوێ هەموو خەمێکیان بێتە سەر بەشوودانی من! دەمەوێ... دەمەوێ... بەڵێ... دەمەوێ سەری خۆم هەڵگرم و لە ماڵ هەڵبێم! تۆم بۆ ئەوە هەڵبژاردووە کە لەم کارەمدا یارمەتیم بدەیت.

میرزادە، بە سەرسامی پرسی:

- لە ماڵ هەڵدێی؟

ئاگلایا، لە تورەییدا گڕی گرت و گوتی:

- بەڵێ، بەڵێ، بەڵێ هەڵاتن لە ماڵەوە... نامەوێ لەمەدوا، نامەوێ لەمەدوا، کە هەمیشە لە شەرما سور ببمەوە. نە لەبەردەم ئەواندا و نە لەبەردەم میرزادە "س.."دا و نە لەبەردەم یەڤگینی پاڤلوفیچ داو نە لەبەردەم هیچ کەسێکدا سوور ببمەوە. بۆ ئەمە پەنام وەبەر تۆ هێناوە. من دەتوانم لەگەڵ تۆدا بە کەماڵی ئارەزوو، باسی هەموو شتێک، هەموو شتێک بکەم، تە نانەت باسی شتی نهێنیش بکەم، بەڵام تۆش نابێت، لای خۆتەوە، جارێ لە جاران هیچ شتێکم لێبشاریتەوە. دەومەوێ کەسێک هەبێت، کە بتوانم بەلای کەمەوە باسی هەموو شتێکی دەگەڵدا بکەم، ڕێک وەکو ئەوەی قسە دەگەڵ خۆما بکەم. ئەمانە لە خۆڕا و کوتوپڕ کەوتوونەتە مقۆ مقۆی ئەوەی کە من چاوەڕوان و ئاشقی تۆم. ئەم مەسەلەیە پێش هاتنی تۆ بۆ ئێرە دەستی پێ کردووە، ئەگەرچی نامەکەی تۆشم نیشان نەداون و ئێستا هەر هەموویان ئەم ئاوازە لێ دەدەن. جا من دەمەوێ بوێر و ئازا، لە هیچ شتێک نەترسم. نامەوێ دەگەڵیاندا بچم بۆ ئاهەنگێن سەما و هەڵپەڕکێ. دەمەوێ کەسێکی بە سوود بم. زۆر لەمێژە کەڵکەڵەی هەڵاتنم لە سەردایە. بیست دانە ساڵە حەپسیان کردووم و ئێستاش هەموو هۆش و بیرێکیان هاتووەتە سەر ئەوەی بە شووم بدەن. هێشتا منداڵ بووم، تەمەنم چواردە ساڵان بوو کە خەونم بە هەڵاتنەوە دەبینی. یانی هێشتا کچۆڵەیەکی نەفام بووم. ئێستاش

هەموو شتێکم ئامادە کردووە و چاوەڕوانی تۆ بووم کە باسی ژیانی هەندەرانم بۆ بکەیت. من لە ژیانما کلێسایەکی گوتیکم نەبینیوە. دەمەوێ بڕۆم بۆ ڕۆما، سەردانی هەموو بنکە و دامودەزگا زانستیەکان بکەم. گەرەکمە لە پاریس بخوێنم. لە پارەوە کار بۆ ئەمە دەکەم و حازر و ئامادەم. ژمارەیەک کتێبی زۆرم خوێندووەتەوە، لەوانە هەموو کتێبە قەدەغەکان. ئەلکسندراو ئادیلاید، بۆیان هەیە بە ئارەزووی خۆیان هەر کتێبێک بخوێننەوە، بەڵام من بۆم نییە، هەمیشە، دوور و نزیک چاودێریم دەکەن. نامەوێ دەگەڵ خوشکەکانمدا بە شەڕ بێم، بەڵام لەمێژە بەداک و بابم گوتووە نیازم وایە ژیانی کۆمەڵایەتی خۆم لە ڕەگ و ڕیشەوە بگۆڕم. لێبڕاوم کاری مامۆستایەتی و دەرس گوتنەوە بکەم، بۆ ئەمەش چاوم لە پشتیوانیی تۆیە، چونکە تۆ ڕۆژێ پێت گوتم کە مندالّت خۆشدەوێ. پێت وایە ئێمە بتوانین بە دوو قۆڵی، ئەگەر ئێستاش نەبێ، لە ئاییندەدا کاری پەروەردەیی بکەین؟ ئێمە دەتوانین پێکەوە، بە دوو قۆڵی کارێکی بەسوود بکەین. من نامەوێ، بۆ هەمیشە تەنیا کچە جەنەڕاڵێک بم و تەواو... باشە بڵێ بزانم ئایا تۆ پیاوێکی زانیار و ڕۆشنبیریت؟

– نەخێر، هەرگیز...

– حەیفێ، چونکەوامدەزانی... بەڵام بۆچی وام مەزەندە دەبرد؟ بەهەرحاڵ گرینگ نییە، تۆ هەر نەبێ ڕێنوێنیم دەکەیت، چونکە من تۆم هەڵبژاردووە.

– ئاگلایا ئیڤانوڤنا، شتی وا مەحاڵە، ئەم بیرانە پووچن.

ئاگلایا، تووڕە بوو، گڕ لە چاوانی دەبووەوە، هاواری کرد:

– دەمەوێ، دەمەوێ لە ماڵ هەڵێم! ئەگەر تۆ ڕازی نەبێت، شوو بە گاڤریلا ئاردالیونوفیچ دەکەم. من نامەوێ کەسوکارەکەم بەو چاوە سەیرم بکەن کە کچێکی بەدسروشت و شەڕەنگێز و نازانم چی و چیم؟

میرزادە، نیوە ئاخێزێکی بۆ کرد و هاواری کرد:

– تۆ ئەقڵت لە جێیە؟ ئاخر تۆ چیت پێگوتراوە و کێ پێی گوتوویت؟

– هەموو کەسوکارەکەم: دایکم، خوشکەکانم، باوکم، میرزادە"س..."
تەنانەت کولیا ڤیزەونەکەی لەمەڕ تۆش! ئەگەر ڕووبەڕووش پێم نەڵێن، لە

ناخی خۆیاندا وا بیر دەکەنەوە. ئەمەم بە هەموویان گوتووە، ڕووبەڕوو پێم گوتوون. دایکم لە حەژمەتاندا، نەخۆش کەوت، یەک ڕۆژی تەواو نەخۆش بوو. ڕۆژی دوایی ئەلکسندرا و باوکم، بە دوو قۆڵی سەرزەنشتیان کردم، گوتیان بە خۆمیش نازانم چ دەڵێم، نازانم مانای ئەم قسە قۆڕانەم چییە. زۆر بە توندی وەڵامم دانەوە کە ئێستا هەموو شتێک دەزانم و مانای گشت وشەیەکیش دەزانم، گوتم خۆ منداڵ نیم، من دوو ساڵ لەمەپێش دوو ڕۆمانی (پول دی کوک)م خوێندەوەتەوە. بەئانقەست خوێندمنەوە تا پەی بە هەموو شتێک ببەم و، هەموو شتێک بزانم. کە دایکم گوێی لەو قسەیە بوو، لەزگ بوو ببورێتەوە.

بیرێکی سەیر بە مێشکی میرزادەدا هات. بەوردی ڕوانییە ئاگلایا و زەردەخەنەیەکی بۆ کرد. باوەڕی نەدەکرد کە ئەمە هەمان ئەو کیژە لەخۆباییە بێت، کە کاتی خۆی بەو هەموو کەشوفشەوە نامەکەی " گاڤیلا ئاردا لیونوفیچ"ی بۆ خوێندبووەوە. هەرچی سەری دێنا و سەری دەبرد، تێنەدەگەیی چۆن کیژێکی خشیکی، جوانی، وا بەرزەفڕی، لووتبەرز، دەتوانێ وا منداڵانە بیر بکاتەوە، کیژێک کە ڕەنگە تا ئێستاش مانای ئەو وشانە نەزانێت کە بەکاریان دەبات.

میرزادە لێی پرسی:

- ئاگلا ئیڤانوڤنا، تۆ هەموو ژیانت هەر لەماڵەوە بردۆتە سەر؟... یانی نەچوویتە قوتابخانە، لە بەشی ناوخۆیی نەژیاویت؟

- نا، بە عەمراتم بۆ هیچ کوێ نەچووم. هەمیشە لەچوار دیواری ماڵەوە بووم، یانی لە قەفەزا بووم و چاوەڕوانم یەکسەر لە قەفەزی ماڵەوە بۆ پەردەی بووکێنی بگوازرێمەوە. بۆچی پێدەکەنی، ئەم ڕیشخەنەت لە پای چییە؟ هەست دەکەم تۆش گاڵتەت پێم دێت و تای ئەوان دەگریت...

ئاگلایا بەدەم ئەو قسانەوە، بڕۆی وێک هێنایەوە و بە نیمچە هەڕەشەیەکەوە لە سەری ڕۆیشت و گوتی:

- تورەم مەکە. من بە خۆیشم نازانم چ شتێک لە ناخما دەگوزەرێ.

ئەوجا بە تورەیی لەسەری ڕۆیشت:

- من دڵنیام تۆ بەو قەناعەتەوە بۆ ئێرە هاتوویت کە گوایە من حەزم لێکردوویت و ئەم ژوانگەیەم بۆ دیاری کردوویت.

میرزادە، زۆر ساویلکانە و بەوپەڕی هەڵچوونەوە گوتی:

- ئەلهەقی دوێنێ لەمە دەترسام، بەڵام ئەمڕۆ دڵنیام کە تۆ...

ئاگلایا کە لەپڕ لێوی کەوتبووە تەتەڵە، هاواری کرد:

-چی؟ لەوە دەترسایت کە من.. حەدت چییە وا خەیاڵ بکەی کە من... پەنا بە خوا! ڕەنگە گومانی ئەوەت کردبێت کە من بۆیە بۆ ئێرەم بانگ کردبێت تا بتخەمە داوەوە و بێن بە سەرا و غافڵگیرمان بکەن و تۆ ناچاریت بمخوازیت...

- ئاگلایا ئیڤانۆڤنا! شەرمە بۆ تۆ، عەیب ناکەی قسەی وا دەکەی! ئاخر چۆن دەشێت ئەم جۆرە بیرە ناپاکە، بە دڵی پاک و بێگەردی تۆدا بێت؟ ئامادەم مەرج و گرێو بکەم کە تۆ باوەڕت بە تاقە وشەیەکی ئەو قسانەی خۆت نییە... باوەڕبکە تۆ بە خۆتیش نازانی چ دەڵێیت و مانای ئەو قسانە چییە!...

ئاگلایا، گرژ و پەست، مات و بێدەنگ، چاوی داخستبوو و دەتگوت، شەرمەزار و خەجاڵەتی ئەو قسەیەیە کە ئێستا کردبووی. ئەوجا لەبن لێوانەوە گوتی:

- نا، نەخێر شەرم ناکەم! شەرم لە چی بکەم! باشە تۆ چوزانی دڵی من پاک و بێگەردە؟ کەوایە بە چ جورئەتێکەوە، نامەی دڵداریت بۆ ناردووم؟

- نامەی دڵداری؟ نامەکەم، نامەکەی من، نامەی دڵداری بوو؟ بە پێچەوانەوە، نامەیەکی پڕ لە ڕێز و حورمەت بوو، هەڵقوولاوی ناخی دڵم بوو، زادەی بە سوێترین ساتی ژیانم بوو. من لەو کاتەدا، وەکو پرشنگی ڕووناکی و نورێک تەمەشای تۆم دەکرد... من...

ئاگلایا، لەپڕ قسەکەی پێبڕی، ئەم جارەیان بە زمانێکی جیاوازتر لە زمانی پێشووی، بە زمانێک کە بۆنی پەشیمانی و بگرە ترسی لێدەهات گوتی:

- باشە... باشە... بەسە!...

بە بێ ئەوەی ڕاستەوخۆ تەمەشای میرزادە بکات، تەنانەت بەلای ئەوا دانەویەوەوەکو ئەوەی بیەوێ دەست بخاتە سەر شانی و بەجوانترین شێواز داوای لێ بکات کە لیی زویر نەبێت، بەوپەڕی شەرمەزاری و نیگەرانیەوە گوتی:

- باشە... باشە، من دەزانم کە قسەکەم زۆر گەوجانە بوو. من ئەمەم تەنیا بۆ تاقیکردنەوەی تۆ کرد، بەردێکی بخە سەرو وای دابنێ گوێت لە هیچ نەبووە. بمبورە کە دڵم یەشاندیت. تکایە مەڕوانە دەموچاوم. تەمەشای دووربکە. بە خۆت تۆزێ لەمەپێش گوتت بیرێکی ناپاکە: من بەئانقەست ئەوەم گوت تا بتتەزێنم، بتجوولێنم. هەندێ جار لە قسەی دڵی خۆم دەترسم. نامەوێ بیکەم، کەچی کاتێک دەزانی خۆ بە خۆ لە دەمم دەردەچێت. تۆ ئێستا گوتت ئەو نامەیە زادەی بە سوێترین ساتی ژیانت بووە.

دووبارە چاوانی داخستنەوە و بە دەنگێکی نزم گوتی:

- من دەزانم مەبەستت چ ساتێکە!

- خۆزی هەموو شتێکت دەزانی!

ئاگلایا، دووبارە هەڵچووەوە و لەسەر قسەکەی ڕۆیشت:

- هەموو شتێک دەزانم، لەو کاتانەدا ئەو ژنە ناوزڕاوە بەدکارەی کە دەگەڵیا هەڵهاتی، یەک مانگی تەواو بوو، دەگەڵ تۆداو لەماڵەکەی تۆدا دەژیا...

کاتێ ئاگلایا، ئەو قسانەی کرد، لەجیاتیی سوور ببێتەوە، ئەم جارەیان ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا. بەدەم ئەو قسانەوەوەک بڵێی ئاگای لە خۆی نەبێت، بەلەز هەستایە سەرپێیان، بەڵام زوو بە خۆی هاتەوە و دانیشتەوە. تا ماوەیەکی زۆر لێوی کەوتە تەتەڵە، دەقیقەیەک بە بێدەنگی بوری. میرزادە سەری لەم هەڵچوونە کوتوپڕە سووڕ ما، نە چاوەڕوانی شتی وای دەکرد و نە دەیزانی هۆیەکەی چییە.

ئاگلایا، لەپڕ و بێپەر وا گوتی:

- من، بە هیچ جۆرێ تۆم خۆش ناوێ! بە قەد نووکە دەرزیەکیش خۆشم

ناوێی!

میرزادەوەڵامی نەدایەوە. دەقیقەیەکی دیکەش بە بێدەنگی تێپەڕی.

ئاگلایـا، کـە سـەری داخسـتبوو، بـە پەلـە، بـەڵام بـە دەنگێکـی زۆر نـزم گوتی:

- من (گاڤریلا ئاردالیونوفیچ)م خۆشدەوێ.

میرزادە، لەبن لێوانەوە و بە ئەسپایی بەرسڤی دایەوە:

- ڕاست ناکەیت. وا نییە.

- یـانی مـن درۆ دەکـەم؟ ڕاسـتە و ئەولاتـریش، وایە و زیـاتریش. پێـرێ، لەسەر ئەم تەختە بەڵێنم دایە.

میـرزادە، ڕاچڵـەکی، بـۆ سـاتێک خـەیاڵی ڕۆیشـت. ئەوجـا بـە شـێوەیەکی بنجبڕ گوتی:

- وانیە. ئەمە بوختانە و بەخۆتیا دەکەیت.

- وەی کـە بـە ئـەدەب و تـەربیتی! حـەز دەکـەم ئەوە بزانیـت کـا گـاڤریلا ئـاردالیونوفیچ زۆر گـۆڕاوە، زۆر بـاش بـووە. منـی لـە گیـانی خـۆی خۆشـتر دەوێ. بە بەرچاوی منەوە دەسـتی خـۆی لەسـەر ئاگرەکە ڕاگـرت و سـووتا، تەنیا بۆ ئەوەی خۆشـەویستی خۆیم بۆ بسـەلمێنێ.

- دەستی خۆی سووتاند؟ لە سەر ئاگرەکە؟

- بـەڵێ، دەسـتی لەسـەر ئاگرەکـە ڕاگـرت! بـاوەڕ دەکـەی یـان نـا کـەیفی خۆتە، بەلامەوە گرینگ نییە!

میـرزادە بێـدەنگ بـوو. ئاگلایـا لەوە نـەدەچوو گاڵتـە بکـات. زۆر تـووڕە بوو.

- سـەیرە! ئەگـەر لێرە بـووبێ، دەبـێ مـۆمێکی دەگـەڵ خـۆی هێنـابێ، مـن لەوە زیاتر بیرم بۆ هیچی تر ناچێت..ئاگر لێرە چی دەکات...

- بـەڵێ، مـۆمێکی هێنـابوو. سـەیرەکـەی لـە چیدایـە؟ یـانی ئەمـە ناچێتـە ئەقڵەوە، نا ماقووڵە؟

- مۆمێکی تەواو یان نیوە مۆمێکی ناو مۆمدانێک؟

- بـەڵێ... نـا... نیـوە مـۆم، قونـە مـۆم.. مـۆمی تەواو، چ فـەرقێک دەکـات.

دەکرێت وازم لێبێنی! ئەگەر پێت خۆشە، با ئەوەشت پێبڵێم کە شقارتەشی دەگەڵ خۆیدا هێنابوو. مۆمەکەی هەڵکرد و نیودانە سەعات قامکی لەسەر گڕەکەی ڕاگرت. یانی ئەمە مەحاڵە ناچێتە ئەقڵەوە؟

– ئاخر دوێنێ دیتم، شوێنەواری سووتان بە قامکەکانیەوە دیار نەبوو.

ئاگلایا، وەکو منداڵێک لە قاقای پێکەنینی دا. ئەوجا بەخێرایی ئاوڕی لە میرزادە دایەوە، سیمای متمانەیەکی چوون متمانەی منداڵی پێوە دیار بوو. هێشتاش بزەیەک بە سەر لێویەوە سەمای دەکرد. گوتی:

– دەزانی بۆچی ئەم درۆیەم هەڵبەست؟ چونکە ئەوەندەی من سەرنجم داوە، ئەگەر کەسێک بیەوێ، ماقووڵیەت بە درۆیەکی خۆی ببەخشێت و، خەڵکی باوەڕی پێبکەن باشترین ڕێگە ئەوەیە کەوەستایانە و بە شێوەیەکی داهێنەرانە، شاخ و باڵێکی ناباو، نائاسایی، دەگمەن و نەبیستراو لە درۆیەکەی بنێت، هەنگێ ڕاستتر و باوەڕکردەنی تر دێتە بەرچاو لێ فێڵەکەی من سەری نەگرت، چونکە نەمزانی چۆن ترش و خوێی بکەم...

ئاگلایا، لەپڕ نێوچەوانی گرژبوو، وەکو ئەوەی بیرەوەرییەکی وەبیرهاتبێتەوە. هەنگێ بەویقار و بگرە بە خەمینییەوە چاوی بڕییە میرزادە و لەسەر قسەکەی ڕۆیشت و گوتی:

– بیرتە ڕۆژێک قەسیدەی "سوارچاکی لات"م بۆ خوێندنەوە، مەبەستم ئەوە بوو هەم ستاییشت بکەم و هەم ڕەفتارەکانت لە قاو بدەم و ئەزیەتت بدەم و هەم پێتی نیشان بدەم کە ئاگام لە هەموو شتێکە....

– ئاگلایا گیان تۆ زۆرم غەدر لێدەکەیت.. هەروەها غەدر لەو ئافرەتە بەلەنگاز و کەساس و بەدبەختە دەکەیت، کە تۆزێ لەمەپێش بەو وشە کرێت و دزێوانەوەسفت کرد...

– بۆیە بەو ڕاشکاویە، بەو وشانە گوزارشتم لە بۆچوونی خۆم کرد، چونکە هەموو شتێک دەزانم، ئاگام لە هەموو شتێکە، هەموو شتێک! دەزانم تۆ شەش مانگ لەمەپێش، بە شایەتی چەندین کەس و بەئاشکرا داوات لێ کرد شووت پێ بکات. قسەکەم پێ مەبڕە. وەکو بە خۆت دەبینی من تەنیا ڕووداوان دەگێڕمەوە، هیچ بۆچوونێکی خۆم دەرنابڕم. پاشان ڕەدووی

ڕوگـوژین کەوت و ڕۆیشـت. دوای ئەمـە ماوەیـەک لـە گونـدێک یـان شاروچکەیەکدا دەگەڵ تۆدا ژیا. پاشان تۆشی فرۆشت و بەگەڵ پیاوێکی دیکە کەوت. (لێرەدا ڕوخساری ئاگلایا سووری سوور بووەوە). پاشان گەڕایەوە بۆلای ڕوگوژین کە نەک هەر خۆشی دەویَ، بەڵکو شێت و شەیدایەتی، لە گیانی خۆیی خۆشتر دەویَ! ئێستاش تۆ کە بەش بەحاڵی خۆت زیرەک و لێزانی، لەوەتای زانیوتە بۆ پترسبۆرگ گەڕاوەتەوە، بە غاردان بۆ ئێرە دووی کەوتوویت و مۆزە مۆزتە بە دەوریا. دوێشە و بە هانایەوە چوویت و بەرگریت لێ کرد و ئێستاش خەوت پێوە دەبینی... ئێستا بۆت دەر کەوت کە من هەموو شتێک دەزانم، ئاگام لە گشت شتێکە؟ تۆ لە بەرخاتری ئەو، بەڵێ لەبەرخاتری ئەو بۆ ئێرە هاتوویتەوە، وانییە؟

میرزادە کە خەمین و خەمبار، چاوی بڕیبووە عاردی و لە فکران ڕاچووبوو، بێ ئەوەی ئاگای لە نیگای ئاگرینی ئاگلایا بێ کە بڕیبوویە ئەو، بە ئە سپایی گوتی:

- بەڵێ لەبەر خاتری ئەوە، لەپێناوی ئەوە، بەڵام تەنیا بۆ ئەوەی بزانم کە... من باوەڕناکەم بتوانێت دەگەڵ ڕوگوژیندا بەختەوەر ببێت، هەرچەندە.. من نازانم دەتوانم چ کۆمەکێکی بکەم، بەڵام وا هاتووم و ئامادەم...

تەزوویەکی پێدا هات و تەمەشایەکی ئاگلایای کرد. ئاگلایا گوێی لێدەگرێت و جۆرە نەفرەت و بێزاریەک نیشتبووە سەر سیمای، ئاقیبەت هاتە قسان و گوتی:

- ئەگەر، بێ ئەوەی بزانی بۆچی هاتوویت، هاتبیت، مانای وایە دەبێ زۆرت خۆش بوێت.

میرزادە بەرسڤی دایەوە و گوتی:

- نا، نا، خۆشم ناوێ! خۆزگە دەتزانی کاتێ ئەو ڕۆژانەم بیر دەکەنەوە کە دەگەڵ ئەودا گوزەراندم، تووشی چ ترس و نیگەرانییەک دەبم! مەگەر هەر خوا بزانێ چیم بەسەر هات!

بەدەم ئەو قسانەوە، تەزوویەکی ناخۆش بەسەراپایدا هات.

ئاگلایا گوتی:

- هەموو شتێکم بۆ بگێڕەوە.

- ئەو بەسەرهاتە هیچ شتێکی تیا نییە کە نەکرێت بۆتی بگێڕمەوە. خۆیشم بە تەواوەتی نازانم بۆچی دەمویست بۆ تۆی بگێڕمەوە، تەنیا بۆ تۆ. ڕەنگە هۆیەکەی ئەمە بێ کە بە ڕاستی و لە کانگای دڵەوە خۆشم دەوێی. ئەم ژنە نەگبەتە، قەناعەتی تەواوی بەوەیە کە سووکترین و گەندەڵترین بوونەوەری سەر ڕووی زەوییە. تکایە لۆمەی مەکە، تانەوتەشەری لێمەدە، بەرد بارانی مەکە! ئەو هەر دەرەقەتی خۆی دێت، بە خۆی، خۆی بە کەسێکی ناوزڕا و دەزانێت و مەگەر هەر خوا بزانێ، چ عەزابێک دەکێشێت! ئاخر خودایا دەبێ ئەم بەسە زمانە گوناحی چی بێ؟ هەندێ جار کە دێت بە سەریا هاوار دەکات و دەڵێت هیچ تاوان و گوناحێکی نییە، بەڵکو قوربانی دەستی خەڵکی دییە، قوربانی دەستی پیاوێکی نامەرد، خوێڕی و شەڕواڵ پیسە، بەڵام ئەوەش بزانە، هەرچەندە ئەو شتانەش دەڵێت، بەڵام خۆی یەکەم کەسە کە باوەڕ بە قسەکانی ناکات، بەڵکو بە پێچەوانەوە، لە ناخی خۆیدا، تەنیا خۆی بە خەتابار دەزانێ... گلەیی لە کەسی دی ناکات. کاتێ من دەمویست ئەم تاریکی و ڕەشبینیەی لەلا بڕەوێنمەوە، دووچاری دەرد و ئازار و ناڕەحەتیەکی ئەوتۆ بوو، کە هەرگیز بیرم ناچێتەوە، کە ئەو ڕۆژە ترسناکانەم بیر دەکەوێتەوە، دڵم خوێن دەدەڵێنێ. باوەڕناکەم جارێکی دی، هەرگیز ئەو زامەی دڵم سارێژببێتەوە. لای من نەحەوایەوە، هەڵهات، دەزانی بۆ هەڵهات؟ تەنیا لەبەر ئەوە هەڵهات، تا بۆ منی بسەلمێنێ، تەنیا بۆ من، کە ژنێکی سووک و هەڵە و هەرزەیە. جا ناخۆشترین شت ئەوە بوو کە بە خۆیشی نەیدەزانی، ئەم کارە لەبەر ئەوە دەکات کە بۆ منی، تەنیا بۆ منی بسەلمێنێ، بۆیەوای دەزانی لەژێر گوشارێکی دەروونی هەوسارپچڕیودایە و دەبێ کارێکی دزێوی، ناپەسەندی، حەیابەرەی ئەوتۆ بکات، کە بتوانێ بەگژ خۆیدا بچێت و بە خۆی بڵێت: " ئەمەش کارێکی دیکەی حەیابەرە، کەواتە تۆ مرۆڤێکی هەڵە و هەرزە و سووک و بێ ئابڕوویت! " ئۆف، ئاگلایا ئیڤانوڤنا، ڕەنگە تۆ لەمە نەگەیت! ڕەنگە شەرمەزاری هەمیشەیی ویژدان، سەرچاوەیەکی

ترسناک و نائاسایی لەزەت بێت. لەزەتی جۆرە تۆڵە سەندنەوەیەک، تۆڵە سەندنەوە لە کەسێکی دی. ئەو ژنە ئاوایە! هەندێ جار دەمتوانی وای لێ بکەم کە لەو تاریکستانەی دەوروبەریدا، تروسکەی ڕووناکییش ببینێ، بەڵام هەر زوو تووڕە دەبوو، یاخی دەبوو، دەگەیشتە ڕادەیەک کە بەوە تاوانباری دەکردم کە خۆم لەو بە زیاتر دەزانم (کە هەڵبەتە شتی وا هەرگیز لە مێشک و ویژدانی مندا نەبووە ). ئەنجام کە داوام لێ کرد شووم پێ بکات، لە وەڵامدا، بێ هیچ پێچوپەنایەک، ڕاستە و ڕاست گوتی کە سواڵی میهرەبانی، بەزەیی، کۆمەک و یارمەتی لە کەس ناکات و ناشیەوێ کەس "هەڵی بگرێتەوە" و بیخاتە ژێر باڵی خۆی. خۆ تۆ دوێنێ بە چاوی خۆت بینیت. پێت وایە دەگەڵ ئەو جۆرە خەڵکەدا خۆشحاڵە، پێت وایە ئەو فەزیحەت و ڕیسواییەی پێ خۆشە.. ئەم ژینگە و ناوەندەی بەدڵە؟ خۆزگە دەتزانی چەند خوێنەوارە؟ چەند پڕ ئەقڵ و ئاوەزە! زۆر جار سەرم لێی سووڕدەما!

– تۆ کە لەوێندەر بوو، وەکو چۆن ئێستا وەعزی من دادەدەی، بەو ئاوایەوەعزت دەدا؟ ئامۆژگاریت دەکرد؟

میرزادە، بێ ئەوەی هەست بە ماناو بە شێوازی پرسیارەکەی ئەو بکات، لەسەر قسەکانی خۆی ڕۆیشت:

– نا، زیاتر بێدەنگ دەبووم، هیچی نەدەگوت. زۆر جار دەمویست قسەی دەگەڵ بکەم، بەڵام هیچم پێ نەبوو، پێی بڵێم. دەزانی هەندێ جار باشترین هەڵوێست بێدەنگییە؟ ئا... بەڵێ... من خۆشم دەویست.. زۆرم خۆش دەویست... بە دڵ و بەگیان خۆشم دەویست... بەڵام پاشان... پاشان هەستی بە هەموو شتێک کرد.

• – هەستی بەچی کرد؟

– هەستی بەوەکرد کە من بەزەییم پێیدا دێتەوە. دڵم بە حاڵی دەسووتێ.. خۆشمناوێ!

– تۆ چوزانی؟ ڕەنگە حەزی لەو یارۆیە... لەو موڵکدارە کردبێت کە ڕەدووی کەوت؟

- نا، من هەموو شتێک دەزانم. حەزی لێنەکردبوو، تەنیا پێی ڕادەبوارد.
- باشە، قەت بە تۆی ڕابواردووە؟
- نا! پێی ڕانەبواردووم. مەگەر هەندێ جار، لە کاتی تووڕەییدا. کە تووڕە دەبوو، زۆر لێم بێزار دەبوو، دەی بوغزاندم، پێی ڕادەبواردم! لەو کاتانەدا، یانی لە تووڕەییدا بە گلەیی و گازندەی سەرزەنشتامێز دایدەگرتمەوە. تەرزەکوتی دەکردم، بە ڕاستی ماندوی دەکردم، ئازاری دەدام، هەڵبەتە بەخۆیشی زۆری ئازار دەچەشت! بەڵام دواتر... هەر باسی مەکە... ئەو شتانەم بیر مەخەوە!

میرزادە، بەدەم ئەو قسانەوە، دەموچاوی لەنێو هەر دوو لەپی نا.

ئاگلایا پرسی:

- دەزانی زۆربەی ڕۆژان نامە بۆ من دەنووسێت؟

میرزادە. پەشێوو پەرێشان هاواری کرد:

- کەواتە ڕاستە؟ بیستبووم نامەت بۆ دەنێرێت، بەڵام باوەڕم نە دەکرد.

ئاگلایا، بە جۆرە ترسێکەوە پرسی:

- لە کێت بیستووە؟
- دوێنێ ڕوگوژین گوتی، بەڵام ڕاستەوخۆ نا.
- دوێنێ؟ دوێنێ دانی بە یانی؟ سەعات چەند؟ پێش دەستپێکی کۆنسێرتەکە یان دوای؟
- دوای کۆنسیرتەکە بوو، دوای سەعات یازدەی شەو.
- ئا، ئەگەر ڕوگوژین باسی کردبێت، قەیدێ ناکات.. دەزانی لەو نامانەدا باسی چم بۆ دەکات؟
- تەسەوری هەموو شتێک دەکەم، پێم سەیر نییە باسی هەر شتێک بکات. شێتە!
- هەندێ لە نامەکانیم پێیە (ئاگلایا، سێ نامەی پێچراوەی لە بەرکی دەرهێنا و فڕێی دایە بەردەم میرزادە ). یەک هەفتەی تەواوە، تکام لێدەکا، لێم دەپاڕێتەوە، هانمدەدات کە شوو بە تۆ بکەم. بەڵێ... زیرەکە، ئەگەر شێتیش بێ هەر زیرەکە. تۆ نە هەقت نییە کە دەڵێی زۆر لە من زیرەکترە.

لە نامەکانیا دەڵێت کە منی زۆر بەدڵە، هەموو ڕۆژێ هەوڵدەدا، ئەگەر لە دووریشەوە بووە بمدینێ. لە نامەکانیا دەڵێت کە منت خۆشدەوێ و ئەو لەمە دڵنیایە و زۆر لەمێژە پەی بەمە بردووەو، گوایە کاتێ بە دوو قۆڵی لەولابوون، باسی منت بۆ کردووە و ئێستاش بەختەوەری تۆی دەوێ، حەز دەکات بە شادی و بەختەوەری بتبینێ و باوەڕی وایە تەنیا من دەتوانم بەختەوەرت بکەم!... نامەکانی زۆر گەرموگوڕ و پڕجۆشن، ئینشایەکی سەیری هەیە... زۆر سەیر. تا ئێستا نامەکانیم بە کەس نیشان نەداوە. چاوەڕوانی تۆ بووم. تۆ دەزانی ئەم قسانەی ئەو چ دەگەیەنن؟ مانای قسەکانی چییە؟

میرزادە، بەدەم لێوە لەرزێوە گوتی:

- مانای شێتاتیە. نیشانەی ئەوەیە کە ئەقڵی پارسەنگی دەوێ.

ئاگلایا پرسی:

- ناشێ بۆی بگریت؟

میرزادە، تەمەشای ئاگلایای کرد و گوتی:

- نا، ئاگلایا، ناگریم!

- بە ڕای تۆ من تەگبیرم چییە، چی بکەم؟ چ ئامۆژگارییەکم دەکەی؟ من ناتوانم لەوەی پتر ئەم جۆرە نامانەوەربگرم.

میرزادە گوتی:

- وازی لێ بێنە، تکات لێ دەکەم! تۆ لەم تاریکستانەدا چت پێ دەکرێت؟ ئەم نامە نەعلەتییانە بە چ کەڵکێکی تۆ دێن؟ من هەموو هەوڵێکی خۆم دەخەمە کار کە لە ئێستا بە دواوە نامەت بۆ نە نووسێت!

ئاگلایا، هاواری کرد:

- ئەگەر بتوانیت کاری وا بکەی، مانای وایە پیاوێکی نەک دڵڕەق بەڵکو بێدڵیت. چما نازانی کە ئەو منی خۆش ناوێ، بەڵکو ئاشق و شەیدای تۆیە و بەس؟ تۆ خۆشت دەوێ! چۆن توانیوتە پەی بە هەموو ڕاز و نهێنییەکی ببەیت، بەڵام هەست بەمە نەکەیت؟ دەزانی ئەم نامانە نیشانەی چین؟ نیشانەی بە غیلی و غیرەن، نا، نیشانەی شتێکی گەورەتر، خراتر لە غیرە و

بەغیلی ڕووتن!... یانی، تۆ پێتوایە، وەکو لە نامەکانیا دیارە، بە ڕاستی شوو بە ڕوگوژین دەکات؟ نا، ئەگەر ئێمە زەماوەند بکەین، بۆ ڕۆژی دوایی خۆی دەکوژێت!

میرزادە، دڵی داخورپا و تەزوویەکی بە سەراپادا هات. بە سەرسامی ڕوانییە ئاگلایا. کە بینی ئەم کچۆڵەیە، ماوەیەکە بووە بە سەرەژنێکی تەواو، هەستی بە سەرسامیەکی لەڕادەبەدەر کرد. گوتی:

- ئاگلایا، خودا شایەدە، ئامادەم گیانی خۆم لەپێناوی ئاسوودەیی دەروونی و بەختەوەری ئەودا بەختبکەم، بەڵام ناتوانم لەمڕۆ بەدواوە خۆشم بویَ، بەخۆیشی ئەمە دەزانێت.

- دەی زۆر باشە... دەیسا خۆت فیدای ئەو بکە مادامێکی ئامادەگی ئەو کارەت تیایە! تۆ خێرەومەند و مرۆڤدۆستێکی گەورەیت. بە "ئاگلایا"ش بانگم مەکە، (چەند جارێک ئەمەت دووبارە کردەوە، "ئاگلایا"ی ڕووت! )... تۆ لەسەرتە ژیانی بۆ بگێڕیتەوە، بیهێنیتەوە ناو ژیان. تۆ ناچاریت ئەمە بکەیت. لە سەرەتە جارێکی دی دەگەڵ ئەودا برۆیت، بە گەڵی بکەویت تا ئارامی و ئاسوودەیی بە دڵ و دەروونی ببەخشیت. هەرچییەک بیَ، تۆ خۆشت دەویَ!

- من ناتوانم بەم شێوەیە خۆم بەخت بکەم، هەرچەندە ئەو نیازەم لە بیر و لە خەیاڵا بوو، ڕەنگە هێشتاش لە دڵی خۆما، ئامادەی ئەم کارەبم! ، بەڵام وەکو ڕۆژی ڕووناک لەلام عەیانە کە دەگەڵ مندا هەڵناکات و ئەگەر دەگەڵ مندا بمێنێتەوە دەفەوتیَ و تیا دەچێت!... هەر لەبەر ئەوەشە دەمەویَ لێی دوور بکەومەوە. قەرار بوو ئەمڕۆ سەعات حەوت بیدینم، بەڵام ڕەنگە نەچم بۆلای. غرور و غیرەی ئەو ڕۆژیَ لە ڕۆژان لەسەر ئەم خۆشەویستیە، نام بەخشێت، ئەمەش خۆی لە خۆیدا دەبێتە مایەی ماڵوێرانی و خێر لەخۆ نەدیتنی هەر دووکمان ئەگەر پێکەوە بمێنین! دیارە ئەمە سروشتی نییە، هەرچەندە هەموو شتێکی ئێرە پێچەوانەی سروشتە. تۆ دەڵێیت کە ئەو منی خوشدەویَ، بەڵام خۆشەویستی وایە؟ دوای ئەو هەموو کێشە و سەریەشەیە دەکریَ ئەمە بە خۆشەویستی دابنریَ؟ نا، ئەمە

خۆشەویستی نییە، بەڵکو شتێکی دیکەیە!

ئاگلایا، بە ترسێکی کوت و پڕەوە گوتی:

- بۆ وا ڕەنگت زەرد بوو!

- هیچ نییە.. تێر خەو نەبووم. هەست بە سستی و لاوازی دەکەم. دروستە. ئاگلایا ئێمە ئەوسا باسمان کردوویت...

- کەواتە ڕاستە؟ یانی بە ڕاستی "دەربارەی من" قسەت دەگەڵی کردووە؟ باشە تۆ کە لە ژیانتا یەک جار منت دیتووە، چۆن توانیت بەو یەک جارە حەزم لێبکەی؟

-نازانم. ڕەنگە بە هۆی ئەو بۆشایی و تاریکییەوە بووبێ کە ئەوسا تێم ئاڵابوو، لەو تاریکییەوە هەستم بە ئەفسوونی هەڵهاتنی سپێدەیەکی تازە کرد، نیمچە خەونێکم بینی. ئیدی نازانم بۆچی مەلی تەرەی بیرم، یەکسەر لەسەر تۆ گیرسایەوە. من درۆم لەگەڵتا نەکردووە کە لە نامەکەما بۆم نوسیوویت، نازانم چۆن ئەمە ڕووی دا، چونکە ئەوە تەنیا خەونێک بوو، لە گەرمەی ئەو دڵەڕاوکێ و ترسە کە ئەو کاتانە تێم ئاڵابوو، پەنام بۆی هێنا... پاشان کەوتمە لێکدانەوەی... نیازم وابوو تا سێ دانەساڵی دی بۆ ئێرە نەیەمەوە...

- کەواتە لەبەر خاتری ئەوە بۆ ئێرە هاتیتەوە؟

دەنگی ئاگلایا، بەدەم ئەو قسانەوە دەلەرزی.

- بەڵێ، لەبەرخاتری ئەو.

بێدەنگییەکی دوو دەقیقەیی خەمناک باڵی بەسەر هەر دووکیاندا کێشا، هەنگێ ئاگلایا لە جێی خۆی هەستا. بە دەنگێکی لەرزۆک گوتی:

- تۆ کە خۆت دەڵێیت، ئەگەر ڕاست دەکەیت و باوەڕت وایە کە... کە ئەم ژنە، ئەم دۆستەی تۆ ئەقڵی پارسەنگی دەوێ، تەواو نییە، دەبێ ئەوە بزانێت کە ڕەفتاری شێتانەی وی کەم و زۆر پەیوەندی بە منەوە نییە. لیون نیکولایوفیچ تکادەکەم ئەم سێ نامەیە لە من وەربگرە و لەجیاتیی من بیدەوە بە سەروچاویا!

ئەوسا ئاگلایا هاواری کرد:

- پێی بڵێ نەخەڵەتابێ جارێکی دی نامە بۆ من بنووسێت، ئەگەر تاقە دێڕێکیشم بۆ بنووسێت، ئەوا بە باوکم دەڵێم و بە خۆی دەزانێت کە چۆنی لە شێتخانە دەپەستێت...

میرزادە، ڕاچڵەکی، بە شپرزەیی ڕوانییە ئەم هەڵچوونە کوتوپڕ و چاوەڕوان نەکراوەی ئاگلایا. لە یەکێک دەچوو لەپڕ تەنکە تەمێک بەرچاوی گرتبێت، ئەوسا بە ئەسپایی گوتی:

- نا، نا، شتی وا لە تۆ ناوەشێتەوە، دڵ و دەروونی تۆ و شتی وایان نەگووتوە.. نا.. باوەڕناکەم بە ڕاستت نییە!

ئاگلایا کە بە تەواوەتی جڵەوی خۆی لە دەست دابوو گوتی:

- با، ڕاستە، بە ڕاستمە و ئەولاتریش.

دەنگێکی سڵ و شپرزە لە نزیکەوە، بەرز بووەوە:

- چی ڕاستە؟ باسی چ ڕاستیەک دەکەیت؟

لیزاڤیتا پروکوفیڤنا، لە بەردەمیاندا ڕاوەستابوو. ئاگلایا، ڕووی کردە دایکی و گوتی:

- باسی ئەو ڕاستیە دەکەم کە من لێبڕاوم شوو بە گاڤریلا ئاردالیونوفیچ بکەم، من خۆشم دەوێ و سبەینێ، ماڵ بەجێدێڵم و ڕەدووی دەکەوم. گوێت لێبوو؟ ئێستا دڵت داکەوت؟ ئەوەندەت بەسە؟

بە غار بەرە و ماڵ پەل بووەوە.

لیزاڤیتا پروکوفیڤنا میرزادەی ڕاگرت و گوتی:

- نا، دۆستی ئازیز، نابێ جارێ بڕۆیت، بە ئەرک نەبێ، هەموو شتێکم بۆ بگێڕەوە. ئاهـ... خودایا ئەم عەزابە چییە! باوەڕبکە شەوێ تا بەیانی بۆ ساتێک چاوم نە چووەتە خەو.

میرزادە، دوای کەوت.

## فەسڵی نۆیەم

لیزا ڤیتا پروکوفیڤنا، کە گەییەوە ماڵێ، لە یەکم ژووردا وەستا. نە یدەتوانی تاقە یەک هەنگاوی دی بنێ، هیلاک و ماندوو، خۆی بەسەر (کەرەویتەیەک)دا دا، هێندە پەرێشان بوو کە بیری چوو، خوڵکی میرزادە بکات دانیشێت. ئەم ژووره، هۆڵی میوان بوو، هۆڵێکی گەوره و بەرین بوو، مێزێکی بازنەیی لە ناوەڕاستیا بوو، موغەیرییەکی تیا بوو. گوڵێکی زۆر لە قەراخ پەنجەرەکانیا بوو. لە کۆتایی هۆڵەکەدا، دەرگایەکی چکۆلەی شووشەدار هەبوو، کە بە سەر باخچەکەدا دەکرایەوە. ئادیلاید و ئەلکسندرا، دوای تۆزێک پەیدا بوون، هەر دووکیان، بە سەر و سیمای پرسا و حیرەت ئامێزەوە دەیان ڕوانییە میرزادە و دایکیان.

ئەم کچانە، کە دەهاتنە هاوینەوار، دەوروبەری سەعات نۆ لەخەو ڕادەبوون، بەڵام ئاگلایا، دوو سێ ڕۆژ بوو زووتر لە خەو ڕادەبوو و دەچوو لە باخچەکەدا پیاسەی دەکرد، هەڵبەتە نەک لە سەعات حەوتا، بەڵکو لە سەعات هەشت و بگرە درەنگ تریش.

لیزا ڤیتا پروکوفیڤنا کە لەبەر ناڕەحەتی و دڵتەنگی خۆی شەوێ تا بەیانی بۆ ساتێکیش خەو نەچووە بووە چاوی، سەعات هەشت بەو حیسابەی کە ئاگلایا هەستاوە، هەستا تا بڕوات بۆ باخەکە بەو خەیاڵەی

ئاگلایا لەوێندەر بدینێ، بەڵام ئاگلایای نە لە باخەکەدا و نە لە ژووری نوستنەکەیدا نەبینی. بە تەواوەتی شپرزە بوو، هەر دوو کچەکەی تری هەستاندن. دوای سۆراخ و تاقیب، لە خزمەتکارەکەیان زانی کە ئاگلایا دوای سەعات شەش لە خەو هەستاوە و چووە بۆ باخەکە.

کچەکان، بەم هەواو هەوەسە تازەیەی خوشکەکەیان پێکەنین. دایکیان ئاگادارکردەوە کە نەچێت بە دوای ئاگلایادا، چونکە لەوەیە ئێستا بە خۆی و کتێبێکەوە لەسەر ئەو تەختە کەسکە دانیشتبێ، کە سێ ڕۆژ لەمەپێش باسی کرد و خەریک بوو بە گژ میرزادە "س.."دا بچێت لەسەر ئەوەی گوتبووی کە هیچ جوا نیەکی تایبەتی لەو شوێنەدا کە تەختە کەسکەکەی لێیە نابینێ.

لیزا ڤیتا پروکوفیڤنا، کە چووبوو بەسەرا و کچەکەی و میرزادەی پێکەوە بینیبوو وگوێی لە قسە غەریب و عەجیبەکانی ئاگلایا بووبوو، هەستی بە نیگەرانی و ترسێکی زۆر کردبوو، هەڵبەتە نە هەقیشی نەبوو. دوایی میرزادەی دەگەڵ خۆیدا بۆ ماڵەوە هێنابووەوە، تا ڕادەیەک لە کارەکەی خۆی و ئەنجامی کارەکەی خۆی ترسابوو: " ئاخر بۆچی نابێت ئاگلایا لە باخەکەدا میرزادە بدینێ و قسەی دەگەڵدا بکات، با ئەم دیدارە بەگوێرەی مەوعیدی پێشوەختەش بووبێت؟."

ئەنجام زاتی وەبەرخۆی ناو گوتی:

– میرزادە گیان، دڵ لە دڵ نەدەی وابزانی بۆیە بۆ ئێرەم هێناویت تا پرسوجۆت دەگەڵ بکەم، لێپێچینەوەت دەگەڵ بکەم...حەزم دەکرد، دوای ئەو ڕووداوەی دوێشەو، تا ماوەیەکی زۆر نە تبینم.

لێرەدا، بۆ ساتێک لە قسان وەستا. میرزادە، خێرا، بەوپەڕی متمانەوە، گوتی:

– بەڵام پێم وایە، حەزت دەکرد بزانی کە چۆن ئەمڕۆکە من و ئاگلایا ئیڤانوڤنا یەکمان گرتبوو؟..

لیزاڤیتا پروکوفیڤنا، بە جۆرە هەڵچوونێکەوە بەرشقی دایەوە:

– هەڵبەتە حەز دەکەم بزانم. من لە ڕاستی ناترسم. نە ئیهانەی کەس

دەکەم و نەکاری واشم کردووە...

- هەڵبەتە... ئارەزووی زانینی ئەو شتە هیچ ئیهانەیەکی تیا نییە. تۆ هەقی خۆتەوەکو دایکێک ئەوە بزانیت. من و ئاگلایا ئیڤانوڤنا، ئەمڕۆکە سەعات حەوتی تەواو لای تەختە کەسکەکە یەکمان بینی، هەڵبەتە لەسەر داوای ئاگلایا خۆی. دوێنێ شەو نامەیەکی دابومێ، لە نامەکەدا گوتبووی کە حەز دەکات بمدێنێ و دەربارەی مەسەلەیەکی گرینگ قسەم دەگەڵ بکات. ئەوە بوو یەکمان بینی و یەک دانە سەعاتی خشت پێکەوە باسی کۆمەڵێک شتمان کرد کە پەیوەندیان تەنیا بە خودی خۆیەوە هەبوو. ئەمە هەموو شتەکە بوو.

لیزا ڤیتا پروکوفیڤنا، بەویقاری تەواوەوە گوتی:

- ڕاست دەکەی هەموو شتەکە بوو، زەڕەیەک گومانم لەوە نییە کە ئەمە هەموو شتەکە بووە.

ئاگلایا لەناکاوا خۆی بە ژوورا کرد و گوتی:

- دەمخۆش میرزادە، لە ناخی دڵەوە سوپاست دەکەم کە دەزانیت من ئەهلی درۆ و بوختانان نیم. دایکە ئێستا دڵت ئیسراحەتی کرد، خەیاڵت ئاسوودە بوو یان هێشتا پرسوجۆیەکەت تەواو نەبووە؟

لیزا ڤیتا پروکوفیڤنا، بە هەڵچوونەوە گوتی:

- تۆ بە خۆت دەزانی، تا ئێستا ڕۆژێ لە ڕۆژان چاوم لێ سوور نەکردویتەوە... قەت لەسەر هیچ شتێک تەریقم نەکردویتەوە... هەرچەندە ڕەنگ بوو لەزەت لە کاری وا ببینی..

ئەوجا ئاوڕی لە میرزادە دایەوە و گوتی:

- خوا حافیزت بێ میرزادە! ببورە کە ئەزیەتم دایت. هیوادارم ئەرخایەن بیت، کە من بە هیچ جۆرێ بەرانبەر بە تۆ نەگۆڕاوم، ڕێز و حورمەتم بۆ تۆ نەگۆڕە، هەر میرزادەکەی جارانیت.

میرزادە، بەلەز بە ڕاست و چەپدا سەری ڕێزی بۆ دایکی کیژێ دانەواند و بێ ئەوەی تاقە وشەیەکی لەزار بێتەدەرێ ڕۆیشت. ئالکسندرا و ئادیلایدا، بەدەم زەردەخەنەوە، کەوتنە چپەدوو.

لیزا ڤیتا پروکوفیڤنا، خێسەیەکی تورەی لێکردن.

ئادیلاید بەدەم پێکەنینەوە گوتی:

– دایکە، هۆی پێکەنینەکەی ئێمە تەنیا ئەمە بوو، کە میرزادە بەو هەموو وێڵ و ماریفەتەوە سەری ڕێزی بۆ دانەواندیت! هەندێ جار ئەوەندەوشکە لە بەشەر ناچێت، کەچی ئێستا ئەوەندە ڕووخۆش و بەوێڵ و نەزاکەت بوو، یەڤگینی پاڤلوڤیچی بە شاگرد ڕانەدەگرت.

لیزا ڤیتا پروکوفیڤنا، بە کورتی گوتی:

– وێڵ و نەزاکەت و، هەست ناسکی، سەنگینی و بەڕێزی، دڵ بە مرۆڤ دەبەخشێت نەک مامۆستایانی ڕەقس و سەما.

بێ ئەوەی، نیو نیگایەکی ئاگلایا بکات، چوو بۆ ژوورەکەی خۆی لە قاتی سەرەوە.

کاتێ میرزادە، لە دەوروبەری سەعات نۆدا گەیپەوە ماڵەکەی خۆی، ڤیرا لوکیانوڤاو کارەکەرەکەی لە بالکۆنەکەدا بینی کە دوای میوانی و ئاهەنگە جەنجاڵ و شلۆقەکەی دوێشەو، بالکۆنەکەیان پاک کردبووەوە و جوان گسکیان دابوو. ڤیرا، بە ڕوویەکی خۆشەوە گوتی:

– شوکر بۆ خوا! پێش هاتنەوەی تۆ لەکار بووینەوە.

– بەیانی باش، سەرم دێشێت، تێر خەو نەبووم. حەز دەکەم چاوێ گەرم بکەم.

– دەتەوێ، لێرە، لە بالکۆنەکە، وەکو دوێنێ، بخەوی؟ زۆر باشە، نایەڵم کەس خەبەرت بکاتەوە. باوکەش چووەتە دەرەوە.

کارەکەرەکە لە ژوورەکە وەدەر کەوت. ڤیراش دەیویست دوا بە دوای ئەو بڕوات، بەڵام لە نیوەی ڕێ گەڕایەوە، بە خەمینی لە میرزادە نزیک بووەوە گوتی:

– میرزادە، بە زەیەکت بەمەدا... بەم کلۆڵەدا بێتەوە. ئەمڕۆ دەری مەکە.

میرزادە گوتی:

– نە نیازی دەرکردنیم هەبووە و نە دەری دەکەم. تا ئێستا چی کردووە، با هەر ئەو ئیشە بکات.

- حاڵی حازر هیچ کارێک ناکات... دەگەڵیا سەختگیر مەبە!
- نا گیانە نا، کاری وا چۆن دەکەم؟
- جگە لەوە.. گاڵتەشی پێمەکە... گرینگ ئەمەیە.
- هیچ خەمت نەبێ، شتی وا ناکەم.

ڤیرا کە دەمووچاوی سوور بووبووەوە گوتی:

- خەجاڵەتم کە ئەم قسانە بە پیاوێکی وەکو تۆ دەڵێم.

بەدەم پێکەنینەوە، نیوە پێچێکی بۆلای دەرگاکەوە کردەوە و لە سەری ڕۆیشت:

- هەرچەندە شەکەت و ماندوویت، بەڵام لەم ساتەدا چاوەکانت میهر و مەحەبەتیان لێدەبارێ، چەند شادن...

میرزادە، بە گەرمی پرسی:

- بە ڕاست، وایە؟

بەدەم ئەو قسەیەوە، بە کوڵ پێکەنی.

لێ ڤیرا، کە لە سادەیی و ساکاری و ڕاشکاویدا لە منداڵ دەچوو. لەپڕ شەرمێکی ئەوتۆ دایگرت، دەموچاوی سوور سوور هەڵگەڕا و، بەدەم پێکەنینەوە لە ژوورەکە وەدەر کەوت.

میرزادە، لەبەرخۆیەوە گوتی: "چەند کچێکی ڕەزا شیرینە..." ئەوسا، هەر زوو فەرامۆشی کرد. خۆی گەیاندە سووچێکی بالکۆنەکە کە تەختە خەوێک و مێزێکی چکۆلەی لێبوو. لەبەردەم مێزە چکۆلەکەدا ڕۆنیشت و دەموچاوی لەنێو هەر دوو دەستی نا، نزیکەی دە دەقیقەیەک بەو حاڵەوە مایەوە.

ئەوجا، شپرزە و نیگەران، دەستی بە گیرفانیا کرد، سێ نامەی دەرهێنا.

لێ دیسان دەرگا کرایەوە، کولیا پەیدا بوو. میرزادە بە هاتنی وی، خۆشحاڵ بوو، چونکە دەرفەتی بۆ ڕەخسا، نامەکان بخاتەوە گیرفانی و جارێ نەیان خوێنێتەوە. کولیا، لە سەر تەختە خەوەکە دانیشت و وەکو عادەتی هەمیشەیی خۆی، یەکسەر چووە ناو باسەکەیەوە:

- چ وەزعێک بوو! ئێستا ڕات بەرانبەر هیپولیت چییە؟ بەچ چاوێ سەیری دەکەیت؟ پۆتی شکاندیت؟

- پۆتی من؟ بۆچی پۆتی من دەشکێت؟... بەڵام کولیا من زۆر ماندووم، حەزیش ناکەم بچینەوە سەر ئەو باسە ناخۆشە. ئێستا حاڵی چۆنە؟

- خەوتووە. باوەڕناکەم تا دوو سەعاتی دیکەش خەبەری ببێتەوە؟ من دەزانم تۆ شەوێ لە ماڵەوە نەخەوتیت، بە پیاسە چووی بۆ باخەکە، لەوێندەر پیاسەت دەکرد. نە هەقت نەبوو، چونکە دیار بوو زۆر نیگەران و پەرێشانی.. دیارە ئەمە ئاساییە، زۆریش ئاساییە!

- چۆنت زانی چووم بۆ باخەکە و لە ماڵەوە نەخەوتووم؟

- ئێستا ڤیرا پێی گوتم. دەیویست نەیەڵێ بێمە ژوورەوە تا بخەویت، بەڵام خۆم پێنەگیرا، ویستم ئەگەر بۆ دەقیقەیەکیش بووە بتبینم! من ئا ئێستا دوو سەعات ئێشکەکەی خۆم بەدیار نەخۆشەکەوە تەواو کرد. ئێستا نۆرەی کۆستیا لیبدیفە، بەڵام بوردوفسکی ڕۆیشت، بەهەرحاڵ بنوو میرزادە، بە هیوای شەوێکی... نا ڕۆژێکی خۆش! بەڵام... دەزانی میرزادە من سەرم سووڕماوە؟!

- ئاساییە، بە تایبەتی دوای ئەو هەموو...

- نا میرزادە، نا. من سەرم لە ئیعترافنامەکە (وتارەکە) سووڕماوە. بە تایبەتی ئەو بەشەی کە باسی ویستی خوایی و ژیانی ئاخیرەت دەکات. بە ڕاستی بیرۆکەیەکی سەیر و گەورەی لەخۆگرتووە!...

میرزادە، بە میهر و سۆزەوە ڕوانییە کولیا. دیار بوو کولیا تەنیا بۆ ئەوە هاتبوو تا دەگەڵ میرزادەدا باسی ئەو بیرۆکە سەیر و گەورەیە بکات.

کولیا گوتی:

- بەڵام جەوهەری شتەکە، کرۆکی شتەکە لە خودی فکرەکەدا نییە، بەڵکو لە کۆی مەسەلەکەدایە، بەڵکو لەو هەلومەرجەدایە کە ئەم بیرە لە سایەیدا چەکەرەی کردووە. خۆ ئەگەر (ڤولیتر) یان ڕوسو یان پرودون ئەمەیان نووسیبا. دەمخوێندەوە و بەم ڕادەیەش پێم سەیر نەدەبوو، بەڵام ئەم قسەیە بۆ کەسێک کە دڵنیا بێت، تەنیا دە دەقیقە ژیانی لە سەر ئەم دنیایە مابێت، بە ڕاستی نیشانەی ئەوپەڕی گەورەیی، ورە بەرزی و سەرفرازیە! نیشانەی ئەوپەڕی سەربەخۆیی و کەرامەتی فەردیە! ئەوپەڕی بوێری و

جوامێریە... نیشانەی توانایەکی هەرە مەزنی ڕوحی و دەروونییە! بۆیە ئەوانەی کە دەڵێن بەئانقەست تەرەقەکەی دانە نابوو لە بچووکی و بێ مانایی و سەخیفیانە! بەڵام دەزانی دوێنێ هیپولیت هەموومانی فریودا، کڵاوی کردینە سەر. بەشی خۆی فێڵبازە. من جانتاکەم بۆ نەپێچابووەوە، قەت ڕۆژێ لە ڕۆژان دەمانچەکەیم نەبینیبوو. بە خۆی هەموو شتێکی پێچابووەوە. بۆیە پێم سەیر بوو کە ئەو قسەیەی کرد. ڤیرا دەڵێت گوایە تۆ لێبڕاوی لێرە، لە لای خۆت جێی بکەیتەوە. من دڵنیات دەکەم کە ئەم کارە هیچ مەترسییەکی تێدا نییە، بە تایبەتی کە ئێمە بەردەوام چاودێری دەکەین و بە نیونەخت غافڵی ناکەین.

– شەوێ کێ بە دیارییەوە مایەوە؟

– کوستیا لبیدیف و بورودوفسکی و من. کیللەر تۆزێ مایەوە و دوایی چوو بۆ ماڵی لیبدیف تا کەمێک بخەوێ، چونکە لە لای ئێمە شوێن نەبوو تا لێی بخەوێ. فردیش چینکوش هەر لەوێ، لە ماڵی لیبدیف خەوت، بەڵام سەعات حەوت ڕۆیشت. جەنەڕاڵیش، کە هەمیشە لە ماڵی لیبدیفە، ئەویش ئێستا ڕۆیشت... وابزانم لیبدیف بەتەمایە دوای کەمێکی دی بێت بۆلات. لە دووی تۆ دەگەڕا (نازانم بۆ!) دوو جار لێی پرسیت. دەتەوێ بخەوی؟ باشە ئەگەر هات ڕێی بدەین بێتە ژوورەوە یان بڵێین چاوەڕوان بکات؟ منیش دەمەوێ بڕۆم بنووم. ئا... بیرم کەوتەوە... دەمویست شتێکت بۆ بگێڕمەوە، تۆزێ لەمەبەر شتێکی سەیرم لە جەنەڕاڵ بینی. بوردوفسکی، تۆزێک پێش سەعات شەش، نا سەعات شەشی ڕێک، بێداری کردمەوە، تا نۆرە ئێشکی خۆم بەدیار هیپولیتەوە بگرم. کات کەمێک لە شەش لای دابوو. بۆ دەقیقەیەک چوومە دەرەوە. لەپڕ تووشم بوو بە تووشی جەنەڕاڵەوە، بە ڕادەیەک مەست و سەرخۆش بوو کە نەیناسیمەوە، لە بەردەممدا وەکو سنگ چەقی. کە تۆزێک وەخۆهاتەوە، پرسی: " ها! نەخۆشەکە چۆنە؟ هاتووم هەواڵی بپرسم! ". هەرچیم دەزانی پێم گوت. ئیدی بەدەم قسانەوە گوتی: " ئەمانە هەمووی بەجێی خۆی! ئەلهەقی من بۆیە لە خەو هەستاوم و هاتووم بۆ ئێرە تا ئاگاداری بکەمەوە کە فردیش چینکو جێی باوەڕنیە و

هی ئەوە نییە هەموو قسەیەکی لا بکرێت، بەڵگەم هەیە. بۆیە دەبێ سڵی لێبکەیتەوە." گوێت لێیە میرزادە؟

– تۆ بڵێی وابێ؟ بەهەرحاڵ... بۆ ئێمە هیچ فەرقێک ناکات. نە پەیوەندی بە ئێمەوەیە و نە کێشەی ئێمەیە.

– دروستە! خۆ ئێمە نە کۆمەڵەیەکی نهێنین و نە لە "ماسۆنیانی ئازادین"! تە نانەت پێم سەیرە کە جەنەراڵ بەو شەوە هاتبوو، تا ئەو قسەیەم پێ بڵێت.

– گوتت فردیش چینکۆ ڕۆیشتووە؟

– سەعات حەوت، لێرە ڕۆیشت. پێش ئەوەی بڕوات، کاتێ من بە دیار نەخۆشەکەوە بووم، هات بۆ لام و گوتی شەوێ لەلای ڤلگین دەمێنێتەوە (ئەم ڤلگینە بابایەکی مەی ئالوودەی هەمیشە مەستی بە ناوبانگە ). دەی! من دەڕۆم! ئەوەش لوکیان تیموفیچە... لوکیان، میرزادە دەیەوێ بخەوێ، ڕێک بگەڕێوە!

لیبدیف کە تازە هاتبووە ژوورەوە، بەوپەڕی ویقارەوە سڵاوی کرد و گوتی:

– تەنیا یەک دەقیقە میرزادەی بەڕێز. بە ڕای من مەسەلەکە، مەسەلەیەکی گرینگە.

لیبدیف، بە ئەسپایی ئەو قسانەی کرد، لەوە دەچوو هاتبێ بۆ باسی مەسەلەیەکی ترسناک. تازە بۆ ماڵ گەڕابووەوە، هێشتا نەچووبوو بۆ ژوورەکەی خۆی، شەپقەکەی هێشتا بەدەستەوە بوو. جۆرە خەم و پەژارەیەک بە سیمایەوە دیار بوو. میرزادە خوڵکی کرد کە دانیشێت.

– بیستم دوو جار سۆراخت کردووم، لەوە دەچێت هێشتا نیگەرانی فەرتەنە و قەوماوەکەی دوێ شەویت؟

– مەبەستت ئەو گەنجەی دوێشەوە میرزادە؟ نا، نا، دوێنێ تا ڕادەیەک حەواسم پەرت بوو، بەڵام ئەمڕۆ وانیم، بە هیچ جۆرێ نامەوێ عینادی و سەرسەختیت دەگەڵدا بکەم...

– عینا... چیت گوت؟

- گوتم: عینادی. ئەمەش وشەیەکی فەرەنسیە کە وەکو زۆر وشەی دیکەی فەرەنسی کە هاتووەنەتە ناو زمانی ڕووسیەوە و بوون بە بە شێک لە زمانەکەمان، بەلاّم من زۆر گوێی نادەمێ.

میرزادە بەدەم نەرمە بزەیەکەوە گوتی:

- لیبدیف خێرە، وا ئەمڕۆ بەم هەموو ویقار وهەیبەت و جدیەتە قسان دەکەیت؟ قسەکانت دەگێڕی، دەبێژی، ئەوجا دەیوێژی!

لیبدیف، ڕووی کردە کولیا و بە زمانێکی پڕ میهر و سۆز، بە دەنگێکی هەستیاری لەرزۆک گوتی:

- نیکولای ئاردالیونوفیچ! دەمەوێ شتێکی تایبەتی بە میرزادە بلّێم...

- زۆر چاکە... تێگەیشتم!... شتەکە پەیوەندی بە منەوە نییە! خوداحافیز میرزادە.

کولیا بەدەم ئەو قسەیەوە یەکسەر ڕۆیشت.

لیبدیف، بەدەم نیگاکردنی کۆلیاوە کە دوور دەکەوتەوە گوتی:

- ئەم کوڕیژگەیەم خۆشدەوێ، بە ڕاستی زیرەکە، زوو لەشت دەگات، زیتەڵ و وریایە، هەرچەند هەندێ منجڕو سەرسەختە. جەنابی میرزادەی مەزن، من تووشی نەگبەتی ونسیبەتێکی گەورە بووم، ئەمشەو بوو یان ئەم بەرە بەیانە.. زۆر لە کاتەکەی دلّنیا نیم.

- خێرە، چ ڕووی داوە؟

لیبدیف، بەدەم بزەیەکی تالّەوە گوتی:

- میرزادەی مەزن، چوارسەد دانە ڕۆبلّ لە گیرفانی ناوەوەی پالّتۆکەمدا نەماوە. ڕووتیان کردوومەتەوە!

- چوارسەد ڕۆبلّت گوم کردووە؟ حەیفێ...

- بە تایبەتی بۆ پیاوێکی بێنەوای هەژار کە ئابڕومەندانە بە ڕەنجی شانی خۆی بژی.

- بەلّێ، بەلّێ. باشە ئەمە چۆن ڕووی دا؟

- ئەوەش خێر و بێری مەینۆشی. جا میرزادە من لە دوای خوا تۆ شک دەبەم، پەنام هەوەلّ بۆ خوا و دواتر بۆ تۆ هێناوە. دوێنێ سەعات پێنجی





ئێوارێ، کابرایەکی قەرزار ئەو چوارسەد ڕۆبڵەی بۆ هێنابوومەوە و بە قیتار بۆ ئێرە گەڕامەوە. کیفی ئەوراقەکانم لە گیرفانما بوو. کە جلکە فەرمیەکانم داکەند و چاکەت و پانتۆڵم لەبەرکرد، پارەکەم نایە گیرفانم تا پێم بێ، قەرار بوو شەوێ، بیدەم بە کابرایەکی بزنسمان کە داوای لێکردبووم. چاوەڕوانی هاتنی ئەو پیاوە بووم...

– لیبدیف، کەواتە ڕاستە تۆ لە ڕۆژنامانددا بڵاوت کردۆتەوە کە قەرز بە ڕەهنی شتی زێڕ یان زیو دەدەیت؟

– قوربان ئەوە لە ڕێگای بابایەکی بزنسمانەوە کراوە، بە ناو و ئەدرەسی منەوە بڵاو نەکراوەتەوە. بە خۆت دەزانی من سەرمایەیەکی ناچیزم هەیە، ڕەشە خێزانێکم بە ملەوەیە، پێم وایە تۆش بەوە قایلی کە (سووتێکی) کەم و پیاوانە....

– بە لێ، بەڵێ! من تەنیا بۆ دڵنیایی خۆم ئەو پرسیارەم کرد!... ببورە کە قسەکەم پێبڕیت.

..–ئیدی ئەو بزنسمانەی کە چاوەڕێم دەکرد نەهات. ئەوە بوو ئەو کوڕێژگە داماوەیان بۆ ئێرە هێنا. من لەدوای شێو وەزعم زۆر باش بوو، بە کەیف و بە دەماخ. ئیدی میوانەکانمان هاتن. تۆزێ چایمان خواردەوە... ئیدی لە خۆشیا لە پێستی خۆم نەدەهێوریم. ئەوسا، کیللەر درەنگانێ هات و پێی گوتین کە ئەمڕۆ ساڵیادی لەدایکبوونی جەنابتە و ئەمرت فەرمووە، بەو بۆنەیەوە میوانەکان دەعوەتی شامپانیا بکرێن. جا من میرزادەی ئازیز و بەڕێز دڵێکم هەیە ئەگەر نەڵێم زۆر بە سۆز و میهرەبانە، دەتوانم بە شانازیەوە بڵێم ئەمەکدار و بەوەفا و نمەکناسە (پێم وایە جەنابت هەستت بەوە کردووە و شاییستەی ئەوە هەم هەستی پێبکەی) جا لەو پێودانگەوە، هەستم کرد لەسەرمە، لەم بۆنە گرینگ و بەنرخەدا و، بۆ ئەوەی عەرزی تەبریک و تەهنیەت بە جەنابت بکەم، جلە ئاساییە شڕەکانم دابکەنم و جلە فەرمی و ڕەسمیەکانم، کە دوای گەیشتنەوەم بۆ ماڵەوە، دامکەند بوو، لەبەر بکەم و لە جەژن و ئاهەنگی ساڵیادی لەدایکبوونی جەنابتا خۆمی پێوە ڕابێنم. ئەو کارەم کرد میرزادە. جا ئەگەر ملاحەزەت فەرمووبێ، بە

درێژایی ئاهەنگەکە جلکی فەرمیم (یونیفۆرم) لەبەر بوو، بەڵام کە جلەکانم گۆڕی، کیفەکەم لە گیرفانی چاکەتەکەمدا لە بیرچوو. ڕاستیان گوتووە کە خوا بیەوێ کەسێک نابووت بکات، لە پێشا ئەقڵی لێدەسەنێتەوە. کە ئەم بەیانیە، سەعات حەوت و نیو، لە خەو ڕابووم، یەکسەر شێت ئاسا، بەرە و چاکەتەکەم غارم دا. سەیرم کرد گیرفان بە تاڵ و حەتاڵ، نە کیفەکەی تیا ماوە و نە پارە.

– ئاهـ. کە ئیزعاجە!

لیبدیف، بە جۆرە ڕوپامایەکەوە گوتی:

– ڕێک وایە، وشەی ئیزعاج پڕ بە پێستییەتی… تۆ بە سەلیقەی جوانی خۆت، ڕێک بەو وشەیە، نیشانەت ئەنگاوت.

میرزادە، کەمێک لە فکران ڕاچوو و ئەوسا گوتی:

– بەهەرحاڵ، باشە لەم بارەیەوە چ بکرێ؟ مەسەلەکە مەسەلەیەکی جدیە!

– ڕاست دەفەرمووی، جدیە، میرازدە ئەم جارەش ڕێک لە ناوەندی نیشانەت دا. گونجاوترین وشەت بۆ پەیداکرد…

– ئاهـ بەسە لوکیان تیموفیوفیچ! نیشانەی چی و ئەنگاوتنی چی! چمان داوە لەوشە و وشەی گونجاو! کێشەکە، کێشەی وشە و زاراوە نییە. کەی ئەوە شتە! . باشە تۆ پێت وانیە کیفەکە لە گیرفانت کەوتبێ و لەبەر سەرخۆشی ئاگات لێ نە بووبێ؟

– لە گینە. سەرخۆشی وەکو جەنابت دەفەرمووی، هەموو شتێکی لێدەوەشێتەوە، بەڵام تۆ خۆت داوەربە! ئەگەر لە کاتی گۆڕینی جلەکانم، لێم کەوتبا، دەبوا لە هەمان شوێن، لە ژوورەکەدا بوایە… ئەدی ئەو کیفە کێوە چوو؟

– تۆ بڵێی نەتخستبێتە چەکمەجەی مێزێکەوە؟

– هەرچەند زۆر چاک لەبیرمە کە نە خستمە هیچ شوێنێکەوە و نە هیچ چەکمەجەیەکیشم کردەوە، بەڵام وێڕای ئەوەش هەموو شوێنێکی بۆ گەڕام، نییە و نییە.

– گەنجینە چکۆلەکەش گەڕایت؟

- یەکەم کار کە کردم ئەوە بوو، ئەم بەیانیە لەجیاتیی جاریٚ چەند جاریٚ گەڕام... جەنابی میرزادەی پایە بەرز ئاخر بە چ ئەقڵیٚ من کیف لەویٚ دادەنێم؟

- لیبدیف، باوەڕبکە زۆرم پێناخۆشە. یانی تۆ بڵێی یەکێک لە ژوورەوە دۆزیبێتیەوە و هەڵی گرتبیٚ؟

- یان لە گیرفانمی دەرهێنابیٚ! ئەم دوو مەزندەیە زیاتر هیچی تر هەڵناگرێت.

- بە ڕاستی زۆر ناخۆشە! باشە تۆ بڵێی کیٚ ئەم کارەی کردبێت؟ پرسیارەکە ئەوەیە!

- بێگومان. بە ڕاستی جەنابت، میرزادەی مەزن و پایە بەرز، وشە و بیرۆکەی وا دەدۆزیتەوە ڕێک پڕ بە پێستی واقیعەکەیە... بە ڕاستی شتی وا هەر لە خۆت دیٚ..

- ئاه.. لوکیان تیموفیوفیچ... بەس پێم ڕابوێرە! ئەم هەموو تانەوتەشەرە بەسە!

لیبدیف، دەستی بەرزکردنەوە و گوتی:

- ڕابواردن، تانەوتەشەر؟

- دەی... دەی.. گویٚ مەدەیە.. زویر نابم... من بیر لە شتی تر دەکەمەوە.. من دەترسم گومان لە خەڵکانێک بکرێت. تۆ گومانت لە کێیە؟

- ئەمە پرسیارێکی زۆر قورسە!... دژوارە! ناتوانم گومان لە کارەکەرەکەمان بکەم، بە درێژایی ئەو ماوەیە هەر لە موبەقەکە بوو. خۆ ناشکریٚ گومان لە منداڵەکانی خۆیشم بکەم...

- بێگومان.

- کەواتە بەم پێودانگە دەبیٚ یەکێک لە میوانەکان ئەم کارەی کردبێت.

- باشە شتی وا دەبێت؟

- من دەزانم شتی وا نابێت و لە مەحاڵ مەحاڵترە! بەڵام مەزەندەش هەر بۆ ئەوە دەچێت، بەڵام وێڕای ئەوەش، قەناعەتی تەواوم وایە ئەگەر مەسەلەی دزی لە ئارادابیٚ، ئەو دزیە لە گەرمەی ئاهەنگ و شەوبێریەکەدا،

یانی لەو کاتانەدا کە هەموو میوانەکان کۆبوون، ڕووی نەداوە، بەڵکو لە درەنگی شەودا، یان لە بەرە بەیاندا ڕووی داوە، ئەوەی ئەو کارەی کردووە، یەکێک بووە لەوانەی کە لێرە ماونەتەوە.

– ئاهـ.. پەنا بەخوا!...

– هەڵبەتە بوردوفسکی و نیکولای ئاردولیانوفیچ لەم گومانە دەبوێرم، چونکە ئەوان هیچیان نەهاتوونەتە ژوورەکەی من.

– بێگومان، منیش هەمان ڕەئیم هەیە، تە نانەت ئەگەر هاتبنە ژوورەکەشت! کێی دیکە شەوێ لەلای تۆ مایەوە؟

– بە منەوە چوار کەس بووین، لە دوو ژووری یەک لە ناو یەکا خەوتین: جەنەڕاڵ، کیللەر، ئاغای فردیش چینکۆ و خۆم. دیارە دەبێ ئەمە کاری یەکێک لەو چوار کەسە بووبێ!

– مەبەستت ئەوەیە کە یەکێک لەو سێ کەسە بووبێ، بەڵام کامیان؟

– من بۆیە خۆم دەگەڵ ئەواندا حیساب کرد، تا ئینساف و عەدالەتێک لە مەسەلەکەدا ڕەچاو بکەم. هەڵبەتە میرزادە گیان جەنابت باوەڕ دەفەرموویت کە مەحاڵە من دزی لە خۆم بکەم، هەرچەندە لەم دنیایەدا شتی وا بووە و بیستراویشە...

میرزادە، تاقەتی چوو، سەبری سوا، هاواری کرد:

– ئاهـ. لیبدیف، ئەم هەموو چەنەبازی و درێژدادڕییە چییە؟ وەرە سەر ئەسڵی مەبەست و بڕایەوە، ئەم هەموو پێچە بە دەورەیە بۆ؟

– زۆر باشە دەمێنێتەوە سێ نەفەر. با یەکەم جار لە ئاغای کیللەرەوە دەست پێبکەین، ئەم پیاوە جێی متمانە نییە، مەینۆشێکی ئالوودەیە، هەندێ جار بە لیبڕاڵ حیساب دەکرێت، یانی شەریکی گیرفانی خەڵکیە. وەکو تەبیعەت زیاتر لە سوارچاکی سەردەمانی کۆن دەچێت تا لە لیبڕاڵێکی مۆدێرنی هاوچەرخ بچێت. نیوەی یەکەمی شەوەکەی دەگەڵ ئێمەدا لە ژووری نەخۆشەکە و بە دیار ئەوەوە بەسەر برد، پاشان درەنگانێک بە بیانووی ئەوەی ناتوانێ لەسەر عاردی بنووێت، ڕۆیشت.

– ئایا گومانت لەوە؟

- گومانم لێی بوو. کاتێ دوای سەعات حەوت وەکو شێت لە ناو جێگاکەم ڕاپەریم و کێشام بەسەری خۆمدا، یەکسەر چووم جەنەڕاڵم، کە لە غوڕابی خەودا بوو، بێدار کردەوە. کە سەیرمان کرد فردیش چینکۆ، کە خۆی لە خۆیدا جێی گومان بوو، لە جێگاکەیدا نەماوە و ڕۆییوە، زۆرمان پێ سەیر بوو، ئەمە خۆی لە خۆیدا کردیە کارێک لێی بکەوینە گومانەوە. بە دوو قۆڵی لێبڕاین کیللەر کە وەکو جەنازە لێی کەوتبوو بپشکنین. هەموو گیرفانەکانی گەڕاین، تاقە قرۆشکێکی پێ نەبوو، تەنانەت هەر هەموو گیرفانەکانیشی کون بوون. تاقە گیرفانێکی ساغی نەبوو. لە یەکێک لە گیرفانەکانیا، دەستەسرێکی کەتانی شینی خانە خانەمان دۆزییەوە، کە پیاو بێزی نەدەهات بە مەقاشیش هەڵی گرێت. نامەیەکی دڵداریشمان دۆزییەوە کە کارەکەرێک بۆی ناردبوو وبە هەڕەشەوە داوای پارەی لێدەکرد. هەروەها چەند لاپەڕەیەکێشمان لەو وتارەی کە خوێندیەوە و بە خۆت گوێت لێ بوو، لەلای دۆزییەوە. ئیدی جەنەڕاڵ دڵنیا بوو کە کیللەر بێتاوانە و ئاگای لە مەحموودی بێ زەواد نییە. بۆ ئەوەی بە تەواوەتی خەیاڵمان ڕەحەت بێ و ئەرخایەن بین، ئەو داماوەمان لە خەو هەستاند، هەڵبەتە بە زەحمەتێکی زۆر توانیمان خەبەری بکەینەوە. کە مەسەلەکەمان بۆ باسکرد، تەقەی سەری دەهات، بە تەواوەتی نە یدەزانی باسی چیدەکەین: لە بەردەمماندا دەمی داچەقاند بوو، هێشتا مەست بوو، سەروسیمای نەک هەر بێگەردی و پاکی، بەڵکو گەوجاتی لێدەباری. کەواتە ئەو نییە!

میرزادە، هەناسەیەکی ئۆخەی هەڵکێشا و گوتی:

- ئۆخەی... کە خۆشحاڵم! زۆر لەو دەترسام! خەمی ئەوم بوو!

لیبدیف. چاوی بڕییە میرزادە و بە ئەسپایی گوتی:

- خەمی ئەوت بوو؟ بۆچی لەو دەترسایت؟

میرزادە، بەلەز گوتی:

- نا، نا... هەروا، بێ بیرکردنەوە هات بەدەمما و گوتم ترسم لەوە. تکایە لیبدیف، ئەم قسەیەم بۆ کەس نەگێڕیتەوە.

- میرزادە، میرزادە! دڵنیابە قسەکانت لە دڵما دەمێنن — لە کانگای دڵما

نێژراون! لەگەڵ خۆما دەیانبەمە گڵەوە.

لیبدیف، بەدەم ئەو قسانەوە، لێکدا لێکدا کڵاوەکەی دەنایە سەر سینگی خۆی.

میرزادە لێی پرسی:

– زۆر باشە! کەواتە دەبێ فردیش چینکۆ بووبێ، ها؟

لیبدیف، چاوی بڕییە میرزادە و بە دەنگی نزم گوتی:

– ئەدی جگە لەو گومان لە کێی دی بکەم؟

– بەڵێ... بەڵێ... لە کێی دی؟ بەڵام بەڵگەت چییە؟

– بەڵگەم هەیە. یەکەم ڕۆیشتنی وی لە سەعات حەوت یان پێش سەعات حەوتی بەیانی.

– دەزانم: کولیا پێی گوتم کە گوایە فردیش چینکو چووەتە لای کولیا و پێی گوتووە، دەڕوات بۆ لای....برادەری، ناوەکەیم بیرچووەتەوەو، باقی شەوەکە لەوێندەر، لای ئەو دۆستەی دەباتە سەر.

– لە ماڵی ڤیلگین. کەواتە نیکولای ئاردالیونوفیچ ئەوەی بۆ گێڕاویتەوە؟.

– بە هیچ جۆرێ ناوی دزی نەهێنا.

– نایزانێ، چونکە جارێ شتەکەم شاردووەتەوە. کەواتە چووە بۆ ماڵی ڤیلگین: ئاساییە مەینۆش و ئالوودان پەنا بەرنە لای یەکدی، وەک دەڵێن تەیری گول ئاشق بە داری زەقنەبووتە ئیدی بەلایانەوە گرینگ نییە ئەم کارە لەوەخت و ناوەختا بکەن وانییە؟ بەڵام لێرەدا سەرەداوێک پەیدا دەبێت کە دەشێت پەیگیری بکرێ. فردیش چینکۆ کە ڕۆیشتووە، ناونیشانێکی بەدەستەوە داوە. جا میرزادە ئێستا گوێ بگرە و بزانە من چی دەڵێم. فردیش چینکۆ بۆچی وای کردووە؟ بۆچی بە تایبەتی چووە بۆ لای نیکولای ئاردالیونوفیچ، هەرچەندە لەسەر ڕێگای نەبووە، تا پێی بڵێ "شە و لەلای فیلگین بە سەردەبات "؟ کێ هەقی بە سەرەوە هەبووە، کێ ویستویەتی بزانێ کە بۆ کوێ دەڕوات، بۆلای ڤیلگین یان بۆ شوێنێکی دی؟ بۆ ئەم جارەی لە خۆی داو؟ نا، نا، ئەم ماستە موویەکی تیایە. فێڵێک لەم مەسەلەیەدا هەیە! ئەمە فێڵی بابایەکی دزە! یانی ویستوویەتی بڵێ: " من





ئەوەتام، ڕێ گومکێ لە کەس ناکەم، ئیدی چۆن دەشێت گومانی دزیم لێ بکرێت؟ دز بە کەس دەڵێت کێوە دەچێ؟ شوێن و مەکانی خۆی بە کەس دەڵێت؟ ئەمە ئەوپەڕی زیرەکیە، بۆ ئەوەیە هەموو گومانێک لە سەر خۆی لابەرێ. ئەمە ناشتنی جێ پێیە لە لمەلانا... حاڵی عەرزم هەی میرزادەی پایە بەرز؟

- بەڵێ، بەڵێ گوێم لێتە، حاڵی هەم، بەڵام ئەمە بەڵگەیەکی زۆر لاوازە.

- دەی فەرموو بەڵگەیەکی دی. ئەو ناونیشانەی فردیش چینکۆ جێی هێشتووە درۆیە. هەر دوای سەعاتێک، یانی سەری سەعات هەشت، خۆم گەیاندە بەر ماڵی ڤیلگین و لە دەرگام دا. کابرا لەم نزیکانە لە "شەقامی پێنج"دا دەژی. بە ڕێکەوت دەیناسیم. فردیش چینکۆم لەوێندەر نەبینی، بەڵام توانیم بەهەر زەحمەتێ بووە هەندێ شتم لە کارەکەری ماڵەکە کە گوێی گرانە دەست بکەوێ، گوایە سەعاتێ لەوەپێش کابرایەک چووە، هێندە بە توندی لە زەنگی داوە، زەنگەکە شکاوە، بەڵام کارەکەرەکە دەرگای لێنەکردووەتەوە، ئیدی یان لەبەر ئەوە بووە نەیویستووە ڤیلگین لە خەو هەستێنێ، یان حەزی نەکردووە خۆی بڕەنجێنێ و لە جێگا بێتە دەرەوە. ئەمە شتێکی ئاشکرایە و چەند و چوون هەڵناگرێت.

- ئەمە هەموو بەڵگەکانتە؟ ئەمە کەمە، بەس نییە.

لیبدیف، بەدەم زەردەخەنەیەکی فێڵاوی و، بە دەنگێکی گریان ئامێز و، بە جۆرە نائومێدیەکەوە گوتی:

- ئاخر میرزادە گیان پێم ناڵێی گومان لەکێ بکەم؟

میرزادە، قەدەرێک لە فکران ڕاچوو، ئەوجا بە نیگەرانی و خەمینی گوتی:

- پێویستە جارێکی دی بە وردی ژوورەکان و چەکمەجەکانت بگەڕێی.

لیبدیف، بەوپەڕی خەمباری و بێ دەسەڵاتی، هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و گوتی:

- گەڕام!

میرزادە، بە تووڕەیی دەستی بە مێزەکەدا کێشاو گوتی:

- ئۆها ئاخر بۆ جلەکانت گۆڕی؟

لیبدیف گوتی:

- ئەم پرسیارە، لە کۆمیدیایەکی کۆنەوەوەرگیراوە، بەڵام میرزادەی دلۆڤان، هەستدەکەم زۆر بۆ من پەرۆشی، دڵت بە حاڵم دەسووتێ! من شایستەی ئەوە نیم، مەبەستم ئەوەیە دەبینم هەر بۆ من بەخەمەوە نیت، بەڵکو بە خەمی یارۆی تاوانباریشەوەیت... پەرۆشی ئەو فردیش چینکۆ خویڕییەشی، وانییە؟ میرزادە، بە حەواسپەرتی و بێزارییەوە قسەکەی پێبڕی:

- بەڵێ... بە ڕاستی... پەستت کردم. باشە تۆ کە ئەوەندە دڵنیایت کە فردیش چینکۆ دزیەکەی لێکردویت، بەتەمای چیبکەیت؟

لیبدیف، بەدەم لاڵانەوە و پاڕانەوەوە، خۆی بادەدا و گوتی:

- ئاخر میرزادەی بەڕێز، من نایلێم تۆ بیڵێ، دەبێ لەو زیاتر گومان لە کێ بکەم؟ مەحاڵە بیرم بۆ هیچ کەسێکی دی بچێ، کە ئەمە خۆی لە خۆیدا گومانەکە لە فردیش چینکۆ زیاتر دەکات، ئەمەش بەڵگەیەکی دیکەیە، کە هەبێ و نەبێ کاری ئەوە! ئاخر جگە لەو دەبێ کاری کێ بێ؟ خۆ ناکرێ گومان لە بۆردوفسکی بکەم، هەر خۆت قەبووڵ ناکەیت، ها، ها؟!

- واز لەم قسە قۆڕانە بێنە!

- یان لە جەنەڕاڵ، ها، ها؟

میرزادە، بە نیمچە تووڕەبوونێکەوە، لەسەر جێگاکەی، خۆی وەرگێڕا و بە بێتاقەتی گوتی:

- ئەمەشیان بێ مانایە!

- هەڵبەتە بێ مانایە! ها. ها. ها! ئەم جەنەڕاڵە پیاوێکی سەیرە! شتێکی زۆر سەیرم لێبینی، زۆرم بە زەیی پێداهاتەوە. بە دووقۆڵی، هەر دوو پەست و خەمبار، چووین بۆ ماڵی ڤیلگین.. تا سۆراخی فردیش چینکۆ بکەین... حەز دەکەم ئەوەشت پێ بڵێم کاتێ بە دزیەکەم زانی یەکسەر چووم جەنەڕاڵم خەبەرکردەوە، زۆر لە من پتر پێی ناخۆش بوو، سیمای گۆڕا، ڕەنگی سوور هەڵگەڕا، زەرد هەڵگەڕا. ئەوجا بە ڕادەیەک پەست و

تووڕە بوو کە هەرگیز وێنام نەدەکرد. بە ڕاستی پیاوێکی دڵپاکە، ڕاستە هەندێک درۆزنە، سەری لە درۆیان دەخورێت، بەڵام تا بڵێی بە سۆز و پاک و بێ غەلوغەشە، هێندە ساویلکە و بێگەردە پیاو ناچارە ئەوپەڕی متمانەی پێ بکات، برۆ سەری پێ بسپێرە. میرزادە پێم وایە پێشتریش پێم گوتوویت کە نەک هەر بەدڵمە، بەڵکو لە کانگای دڵەوە خۆشم دەوێ. لەپڕ لە ناوەڕاستی شەقامەکەدا وەستا، دوگمەی چاکەتەکەی کردەوە، سینگی بۆ والاکردم و گوتی: "وەرە بمپشکنە! تۆ کیللەرت پشکنی، ئەدی بۆ منیش ناپشکنی، خۆ من لەو زیاتر نیم؟ هەق وایە هەمان کار دەگەڵ منیشدا بکەی، با ئەویش دڵی لە خۆی دانەمێنێ! " بەدەم ئەو قسانەوە هەر چوار پەلی دەلەرزین، تەنانەت ڕەنگی بە جۆری زەرد هەڵگەڕابوو، پیاو لێی دەترسا. بە پێکەنینەوە پێم گوت: " گوێ بگرە جەنەڕاڵ، ئەگەر کەسێکی دی قسەی وای دەربارەی تۆ بکردایە، من بە دەستی خۆم سەری خۆم دەبڕی و دەمخستە سەر سینیەکی گەورە و دەمبردە بەردەم ئەو کەسانەی کە گومانیان لە تۆ هەبووە و پێمدەگوتن: ئەم سەرە دەبینن؟ ئامادەم گرێو لەسەر ئەم سەرە بکەم کە جەنەڕاڵ، پیاوی درۆ نییە و لە ملی بدەی درۆ ناکات. من ئامادەم لەپێناوی ئەوا خۆم بخەمە ئاگرەوە. من ئامادەم تا ئەم ڕادەیە و بەم شێوەیە پاکانە بۆ تۆ بکەم! ."

ئیدی لەو سەر جادەیە، بە بەرچاوی خەڵکەوە باوەشی پێدا کردم و ما بە سەرما بگری و فرمێسک بڕێژێ، هێندە بە توندی بە خۆوەی گوشیم کۆکە کۆکم پێکەوت و خەریک بوو دەخنکام. گوتی: " تۆ تاقە برادەری تەنگانەی ئەم ڕۆژگارە ڕەشەی کە تێی کەوتووم" بە ڕاستی پیاوێکی هەستیار و بەسۆزە! ئیدی دەرفەتی هێناو بەدەم ڕێوە بە سەرهاتێکی بۆ گێڕامەوە کە لە گەنجیدا بە سەر خۆی هاتبوو، گوتی لە گەنجیدا، گومانی ئەوەی لێکرابوو کە پێنج سەد هەزار ڕۆبڵی دزیوە. بۆ ڕۆژی دوایی سەیری کردبوو خانوویەک گڕی گرتووە و خەریکە نێڵە نێڵ دەسووتێ، ڕێک خۆی بە ئاگرەکەدا دابوو و ئەو کۆنتەی، کە بە دزی پێنج سەد هەزار ڕۆبڵەکە تاوانباری کردبوو، لە ئاگرەکە دەرباز دەکات، هەروەها نینا




ئەلکسندروفناشی، کە ئەو سەردەمە هێشتا کیژ بوو و شووی نەکردبوو، دەرباز کردبوو. ئیدی کۆنت، باوەشی پێدا کردبوو و ئەملا و ئەولای ماچ کردبوو، ئیدی جەنەڕاڵ دوای ئەو ڕووداوە دەگەڵ نینا ئەلکسندروفنادا زەماوەند دەکات. ئەو قاسەیەش کە پارەکەی تیا دەبێ، لەنێو دار و پەردووی ماڵە سووتاوەکەدا دەدۆزرێتەوە. ئەم قاسەیە، پۆڵا بوو، دەستکردی ئینگلیز بوو، کۆدی نهێنی خۆی هەبوو، بە ڕێکەوت کەوتبووە ژێر ئەرزی ژورەکەوە (کەس نەیدەزانی چۆن! ) ئەگەر ئەو ئاگرە نەبوایە هەرگیز نە دەدۆزرایەوە. دیارە هەر هەموو ئەو حیکایەتە درۆ بوو، بەڵام کە ناوی ئەلکسندروڤنای برد ڕوندک زاییە چاوانی. نینا ئەلکسندروفنا بە ڕاستی ئافرەتێکی سەلار و سەنگین و بەڕێز و بەحورمەتە، هەرچەندە حەز لە چارەی من ناکات.

- یەکتر نا ناسن؟

- زۆر کەم، بەڵام پڕ بەدڵ حەز دەکەم بیناسم، تا بەلای کەمەوە پاکانەی خۆمی لەلا بکەم. نینا ئەلکسندروفنا، بۆیە ڕقی لە منە، چونکە پێی وایە من مێردەکەی بۆ بادەنۆشی هاندەدەم. لە کاتێکا من نەک هانی نادەم، بەڵکو لە هاوڕێی خراپیش دەی پارێزم. ئەمە جگە لەوەی هاوڕێمە، هەر بەینی خۆمانیش بێ، بەتەما نیم قەت دەستبەرداری ببم، بۆ کوێ بڕوات، دەگەڵی دەڕۆم، چونکە ئەو پیاوە تەنیا بە خۆشەویستی کۆنترۆڵ دەکرێت، گرینگ ئەوەیە هەست و سۆزی کۆنترۆڵ بکەی. حاڵی حازر وازی لە ماشقەکەی، لە بێوەژنەکەی کاپتن هێناوە، هەرچەندە ژێرا و ژێر خەریکە بۆی شێت دەبێت و سوێی دەبێتەوە. بگرە هەندێ جار کە بیری لێ دەکاتەوە، داخی وای بۆ هەڵدەکێشێت کە بۆکرۆزی دەگاتە ئاسمان، بە تایبەتی کە بەیانیان لە خەو هەڵدەستێ و پێڵاوەکانی لەپێ دەکات. نازانم بۆچی ڕێک لەو کاتەدا بەوجۆرە هەراسان دەبێت و دەهاڕوژێ. کێشەکەی ئەوەیە تاقە قروشێک شک نابات و ناشتوانێ بەبێ پارە بۆلای ئەو ژنە بڕوات، سەگی پێوە دەنێت. میرزادە، تا نها داوای پارەی لە تۆ نەکردووە؟

- نەخێر، داوای هیچی لێنەکردووم.

- شەرم دەکات. بەتەمایە داوای پارەت لێ بکات. لە لای من گوتی بە نیازە ڕووت لێبنێ و داوای پارەت لێ بکات، بەڵام زات ناکات، چونکە زۆر نییە قەرزت داوەتێ. بۆیە پێی وایە چیتر قەرزی نادەیتێ. ئەم نهێنییەی لەلای من وەکو دۆستێک درکاندووە.

- ئەی تۆ. پارەی نادەیتێ؟

- میرزادە، میرزادەی بەڕێز! من نەک پارە و پوول، ئامادەم سەریشم لەپێناوی ئەم پیاوەدا بدەم... هەڵبەتە سەرم نا، چونکە موبالەغەیە، بەڵام ئامادەم ئەگەر پێویست بکا، لەجیاتیی ئەو دەرد، کۆکە ڕەشە، پەسیو بگرم، چونکە من بە پیاوێکی ڕەسەن و ئەسڵزادەی دەزانم کە لێکەوتووە. ئەمە بۆچوونی منە دەربارەی ئەو. جا مەسەلەکەی ئەو هەر پارە نییە...

- کەواتە پارەی دەدەیتێ!

- نەخێر، یەک پولیشی نادەمێ، بە خۆیشی دەزانێت کە پارەی نادەمێ. بۆیەش پارەی نادەمێ تا بێتەوە سەر ڕێگای ڕاست و دروست. لەوەی پتر نەخزێ. حاڵی حازر بەوەوە گرتوویەتی کە دەگەڵما بێت بۆ پترسبۆرگ، بەتەمام بۆ تاقیبکردنی فردیش چینکۆ بڕۆم بۆ پترسبۆرگ، چونکە باوەڕم وایە کە ئێستا لەوێیە. جا جەنەڕاڵ، دەڵێی لەسەر ئاو و ئاگرە، خوا خوایەتی ساتێ زووتر بەڕێ بکەوین، بەڵام من قەناعەتم وایە هەر کە گەیشتە پترسبۆرگ پولێکم پێوە دەنێت و دەچێت بۆ لای ماشقەکەی، بێوەژنەکەی کاپتن. هەر بەینی خۆمان بێ، بەئانقەست ڕێگەی دەدەم کە بڕوات، چونکە بڕیارمان داوە هەر کە گەیشتینە پایتەخت لێکدی جودا ببینەوە، بۆ ئەوەی دەرفەتێکی زیاتری دۆزینەوەی (فردیش چینکۆ)مان بۆ بڕەخسێت. بۆیە ڕێی دەدەم بۆ خۆی بڕوات، پاشان لەناکاوا، وەکو ئەجەلی مۆلەق، لە ماڵی بێوەژنەکەی کاپتندا، دەدەم بە سەریاو لە قافا دەیگرم، بۆیەش ئەمە دەکەم تا لە خۆی تەریق ببێتەوە و بیری بخەمەوە کە خاوەن ماڵ و منداڵە، لە سەرێتی چ وەکو سەرگەڤار و چ وەکو مرۆڤ شەرمی بە خۆی بێت و ڕێز و حورمەتی خۆی بگرێت.

میرزادە، بە دەنگێکی نزم و پڕ لە پەرێشانی و نیگەرانی گوتی:





– لیبدیف، تو ئەو خوایە دابنیشە، فەرتەنە و هەراو هەنگامە مە نێوە!...

– نا، نا، تەنیا دەمەوێ کەمێک لە خۆی تەریق بێتەوە و بزانم دەموچاوی چۆن دەگۆڕێت، چونکە بە سیما و سەرو چاودا زۆرشت دەردەکەوێ، بە تایبەتی بۆ کەسێکی وەکو ئەو! میرزادەی بەڕێز، هەرچەندە من بە خۆم خەمم کەم نییە و بەد بەختی و نسیبەتەکەم بچووک نییە، ناتوانم بیر لەو و لە چاککردنی ئەخلاقی ئەو نەکەمەوە. من تکایەکم لە خزمەتی جەنەبتا هەیە جەنابی میرزادەی ڕێزدار، لێتی ناشارمەوە هەر بۆ ئەوەش هاتوومەتە خزمەتی جەنابت. تۆ ئاشنایەتیت دەگەڵ ماڵباتی جەنەڕاڵدا هەیە و تەنانەت لە ماڵی واندا ژیاوی، خۆزگە میرزادەی مەزن. لەم کارەمدا ئاسانکاریت بۆ دەکردم، تەنیا لە بەرخاتری جەنەڕاڵ و لەپێناوی چاکەی ئەودا..

لیبدیف، بەدەم ئەو قسانەوە، وەکو یەکێک بپاڕێتەوە هەردو دەستی بەپاڵ یەکەوە پان کردەوە.

میرزادە گوتی:

– مەسەلە چییە؟ یانی یارمەتی چیت بدەم؟ لیبدیف، خۆزگە لە نیاز و مەبەستت دەگەیشتم و دەمزانی چیت لە خەیاڵایا و بەتەمای چیت... باوەڕبکە، دڵنیابە بە تەواوەتی لە مەبەستت حاڵی نابم.

– تەنیا ئەم باوەڕە هانیدام کە پەنا بێنمە بەر جەنابت کە ڕەنگە بتوانین لە ڕێگای ئەلکسندروڤناوە کارێک بکەین کە جەنابی جەنەڕاڵ بگەڕێنینەوە باوەشی خێزانەکەی و لە ماڵەکەی خۆیدا چاودێرییەکی مکوم و باشی بکەین. مخابن کە من ئاشنایەتیم دەگەڵیاندا نییە... ئەمە جگە لەوەی کە (نیکولای ئاردالیونوفیچ)ش کە تۆی زۆر خۆشدەوێ و هەرماوە بتپەرستێت، بە هەموو جۆشوخرۆشێکی گەنجایەتی خۆیەوە تۆ و خاتری تۆی دەوێت، لە گینە بتوانێ یارمەتیمان بدات...

– نا، نا!... بەتەمای نینا ئەلکسندروڤنا لەم کارەوە بگلێنین؟ پەنا بەخوا! تە نانەت کولیاش لەم کارەوە ناگلێنین... بەلآم... لیبدیف، لەوە دەچێ هێشتا پەیم بە نیاز و مەبەستەکەت نەبردبێت. لە مەبەستت حاڵی نەبووبم.

لیبدیف، لەسەر کورسییەکەی هەستاو هاواری کرد:

- حاڵی بوونی ناویَ!... ئەوەی ئەم پیاوە پێویستیەتی تەنیا میهرەبانی و لێکحاڵی بوونە! ئەوە دەواو دەرمانی ئەم نەخۆشەمانە. میرزادە ڕێگەم دەدەی بە نەخۆشی حەساو بکەم؟

- ئەمە دڵپاکی و، زیرەکی و هوشیاری تۆ دەگەیەنێت.

- جا من دەمەویَ بۆچوونەکەی خۆم لەبەر ڕۆشنایی نموونەیەک ڕوون بکەمەوە کە لە ئەزموونی پراکتیکییەوەوەرم گرتووە. تۆ بە خۆت دەزانیت کە ئەم پیاوەی تۆ چ بە شەریکە. خاڵی هەرە لاوازی وی ئەوەیە کە زۆر ڕموودەی بێوەژنەکەی کاپتنە، کە ئەویش بەبیَ پارە، ڕیَ بە جەنەڕاڵ نادات و بۆی نایەتە ڕەدا. جا من گەرەکمە ئەمڕۆ بچم بەسەرا و بە تاوانەکەوە و لە قافا بیگرم، هەڵبەتە تەنیا لە بەر قازانجی خۆی ئەمە دەکەم، چونکە بە ڕاستی خێری ئەوم دەویَ. تە نانەت ئەگەر وای دابنەین کە تەنیا مەسەلەی ئەم بێوەژنەی بە دواوە نییە، بەڵکو تاوانی دیکەشی بەدواوە بیَ و کاری بیَ ئابڕوانە و نەنگینشی کرد بێت (هەرچەندە بە هیچ جۆریَ کاری وای پێناکرێت و لیَ ناوەشێتەوە) من دەڵێم، تە نانەت لە حاڵی واشدا، دەتوانین لە ڕێگای دلۆڤانی و میهرەبانیەوە چاکی بکەین، بیهێنینەوە سەر ڕێگا، چونکە زۆر هەست ناسکە و میهرەبان و دڵپاکە! قسەی دەم و دڵی یەکە! باوەڕبکە ناتوانیَ هیچ نهێنییەک لە پێنج ڕۆژ پتر لە دڵی خۆیدا هەڵگرێت، دوای پێنج ڕۆژ بە خۆی دێت، بەدەم فرمێسک ڕشتنەوە گرێی دڵی خۆیت بۆ دەکاتەوە، بە تایبەتی ئەگەر بە دلۆڤانی و میهرەبانی و ڕووخۆشی بیدوێنین و بەرخودی دەگەڵ بکەین. بە تایبەتی ئەگەر ئێوە، تۆ و ئەندامانی خێزانەکەی بتوانن، بە بەردەوامی چاودێری کارو ڕەفتارەکانی بکەن میرزادەی دڵپاک!

ئەوسا، لیبدیف، وەکو ئەوەی لەپڕ سروشی بۆ هاتبیَ، لە سەر کورسییەکەی ڕاپەڕی و گوتی:

- هەڵبەتە من سوور نیم لە سەر ئەوەی کە ئەم کارە هەر دەبیَ بکرێت... من ئێستاش ئامادەم لەپێناوی ئەودا خۆم بەخت بکەم... هەڵبەتە تۆ لە من باشتر دەزانی ئەم فسق و فجور و مەینۆشی و بێوەژ نبازیەی ئەو دەستی

داوەتێ، لەوەیە شتی زۆر خراتری لێبکەوێتەوە..

میرزادە بەدەم هەستانەوە گوتی:

- بێگومان، من حەز دەکەم لەم ڕووەوە یارمەتیت بدەم، بەڵام لیبدیف لێتی ناشارمەوە کە ترسێکی گەورەم لە دڵدایە، هەست بە نیگەرانی دەکەم. حەز دەکەم ڕێک و ڕەوان پێم بڵێی، بزانم وەکو خۆت گوتت، ئایا هێشتا هەر گومانت لە ئاغای فردیش چینکۆیە؟

لیبدیف، دیسان، بەدەم بزەیەکی شیرینەوە، دەستەکانی لێکدی هەڵسوون و گوتی:

- ئەگەر گومانم لەو نەبێ، گومانم لە کێ بێ میرزادەی دڵسۆز و ڕاستگۆ؟ کێی تر هەیە کە گومانی لێ بکرێ؟

میرزادە، برۆکانی وێکهێنانەوە و لە جێی خۆی هەستا. ئەوسا گوتی:

- لوکیان تیموفیوفیچ، گومانی هەڵە لەم جۆرە مەسەلانەدا یەجگار قەباحەتە. ئەم فردیش چینکۆیە... نامەوێ لە عەلەیی ئەو بدوێم... بەڵام ئەم فردیش چینکۆیە... کێ دەزانێ؟ کێ دەتوانێ بڵێ: لەوەیە ئیشی ئەو بێت!... مەبەستم ئەمەیە کە ڕەنگە ئەم کارە پتر لەو بوەشێتەوە تا لە هەر کەسێکی دی.

لیبدیف، سەراپای بووبوو بە چاو و گوێ. میرزادە، کە بە نیگەرانی و پەستی بە ژوورەکەدا دەهات و دەچوو، هەوڵی دەدا خۆی لە تەمەشاکردنی لیبدیف بپارێزێ، گوتی:

- ئەوەندەی من بیستوومە، ئەم ئاغای فردیش چینکۆیە، سەرباری هەموو شتێکی، یەکێکە لەو پیاوانەی کە دەبێ سڵی لێ بکرێ و نابێ هەموو قسەیەکی لەلا بکرێت. تێگەیشتی؟ من بۆیە ئەمەت بۆ دەگێڕمەوە کە ڕەنگە ئەو کارە زیاتر لەو بوەشێتەوە تا لە کەسێکی دی. کە ئەمەشت بۆ دەگێڕمەوە بۆ ئەوەیە کە بە هەڵەدا نەچی، تێگەیشتی؟

لیبدیف، زۆر بە پەرۆشەوە پرسی:

- کێ ئەمەی دەربارەی ئاغای فردیش چینکۆ بۆ گێڕاویتەوە؟ لە کێت

بیستووە؟

– یەکێک لە لاوە دای بە گوێما، هەرچەندە من باوەڕناکەم... (زۆرم پێناخۆشە کە ناچار بووم ئەو قسەیەت بۆ بگێڕمەوە، من دڵنیات دەکەم کە بەش بەحاڵی خۆم باوەڕم بەو قسەیە نیە) یەکێکە لە قسەلۆکە بێبنجوبناوانەکان.... پەح... کە کەرێتیم کرد ئەو قسەیەم گێڕایەوە!...

لیبدیف، بەدەم هەڵچوونەوە گوتی:

– میرزادە، ئەمە هەواڵێکی زۆر گرینگە، بە تایبەتی لەم کاتەدا و بۆ ئەم کاتە. نەک لە بارەی ئاغای فردیش چینکۆوە، بەڵکو لە ڕووی سەرچاوەکەیەوە..

لیبدیف، بەدەم ئەو قسەیەوە، بە ناو ژوورەکەدا کەوتە شانبەشانی میرزادە و دەیوست هەنگاو بە هەنگاو دەگەڵیا بڕوات... گوتی:

– تەمەشا میرزادە، هەنوکە نۆرەی منە شتێک بە تۆ بڵێم: ئەم بەیانیە، کاتێ ئێمە بە دوو قۆڵی، من و جەنەراڵ، دەچووین بۆ ماڵی ڤیلگین، جەنەراڵ دوای گێڕانەوەی حیکایەتی ئاگرکەوتنەوەکە، بەدەم جۆشوخرۆشی تورەییەوە، لەپڕ کەوتە باسی ئاغای فردیش چینکۆ، هەمان ئەم شتەی گێڕایەوە، بەڵام ئەوەندە بە بێ سەروبەری و ئاڵۆزی و ناشیانە گێڕایەوە، ناچاربووم چەند پرسیارێکی لێ بکەم. لە وەڵامەکانیا ئەوەم بۆ دەر کەوت کە تێکڕای مەسەلەکان وەهمن و زادەی خەیاڵ و خەیاڵدانی بەپیتی خۆین. بۆیەش درۆ دەکات، چونکە ناتوانێ نهێنی دڵی خۆی بپارێزێت و ئەوەی لە دڵیدایە دەری نە بڕێت. جا لێرەدا من ئەم پرسیارە لە جەنابت دەکەم و خۆت دەکەم بە داوەر: باشە ئەگەر جەنەراڵ درۆی کردبێت کە من دڵنیام لەمە، ئەدی چۆن هەمان درۆی ئەو بەر گوێی تۆش کەوتووە؟ میرزادە تۆ بە خۆت دەزانی، درۆ بۆ جەنەراڵ وەکو ئاوخواردنەوەوایە. درۆکەی ئەو زادەی ئەو ساتە بوو، سروش و ئیلهامی ئەو ساتە بوو، کێ ئەم درۆیەی گەیاندە تۆ؟ ئەمە خاڵێکی گرینگە... و دەشێت بگوترێ...

– کولیا ئەو قسەیەی بۆ من گێڕایەوە، قسەکەشی لە بابی بیستبوو، لە بەینی سەعات شەش و حەوتا کە کەس نازانێ بۆ لەو کاتەدا لە

مەدەخەلەکە هاتبووە دەرەوە.

میرزادە، حاڵ و حیکایەتەکەی، لە سیر تا پیازی، بۆ لیبدیف گێڕایەوە.

لیبدیف، کە لە خۆشیان، دەستەکانی هەڵدەگلۆفی و لە دڵی خۆیدا و بە بێدەنگی، گوتی:

- ئۆیف… ئەمە یەکێکە لەو شتانەی کە دەشێت پێی بگوترێ سەرەداو… من بۆ شتێکی وا دەگەڕام!… مانای وایە جەنابی با سەعادەتیان نزیکەی سەعات شەش خەوی ئارامی خۆی زڕاندووە تا بڕوات کوڕە ئازیزەکەی بێدار بکاتەوە و پێی بڵێ کە دۆستایەتی و هاوڕێتی فردیش چینکۆ باش نییە و پیاو تووشی گێچەڵ و گۆبەنان دەکات! پەح لە ترسناکی فردیش چینکۆ و لە دڵسۆزی باوکایەتی جەنابی با سەعادەتیان! ها، ها، ها!…

میرزادە، بە ناڕەحەتییەکی لە ڕادە بەدەرەوە گوتی:

- گوێ بگرە لیبدیف، گوێ بگرە: پێویستە زۆر بە ئاقڵی کار بکەین. فەرتەنە و هەراو هەنگامە مەنەوە! لیبدیف تکات لێ دەکەم… پیاوی چاک بە… ئەگەر ئاقڵانە کار بکەیت، بەڵێنت دەدەمێ کە یارمەتیت دەدەم، بەڵام بە مەرجێ کەس هیچ شتێک نەزانێ!

لیبدیف، بە هەڵچوونێکی ڕاستەقینەوە گوتی:

- خەمت نەبێ میرزادەی دڵپاک و دڵسۆز و مەردو ڕەند، لەم ڕووەوە ئەرخایەن بە، خەیاڵت ئاسوودە بێت کە مەگەر گڵ ئەم قسانەم لە زار ببیستێ! بە دوو قۆڵی، بە بێدەنگی، بێ خشپە کار دەکەین. میرزادەی پایەبەرز من ئامادەم خوێنی خۆم بدەم. ڕەنگە من لە ڕووی دەروونی و لە ناخا بچووک بم، بەڵام لە هەر کەسێک بپرسیت، تە نانەت لە کەسێکی بودەڵە و بێ شەرەفیش، چ جای لە کەسێکی بچووک بپرسیت، حەز دەکات دەگەڵ کێدا کار بکات؟ دەگەڵ بێ ئابڕوو وخوێڕی و بێبارێکی وەکو خۆیدا یان دەگەڵ کەسێکی نەفس بەرزی، دڵپاکی، دڵسۆزی وەکو تۆدا؟ هەڵبەتە لەوەڵاما دەڵێت دەگەڵ کەسێتی دووەمدا! جا سەرکەوتنی چاکە و گەورەیی لەمەدایە! بە خوات دەسپێرم میرزادەی بە ڕێزو حورمەت، پێکەوە و بە شێنەیی کاردەکەین.. بەکاوەخۆ و بە بێدەنگی!

## فەسڵی دەیەم

میرزادە ئاقیبەت لەوە حاڵی بوو کە بۆچی هەر جارێ دەستی بۆ ئەو سێ نامەیە دەبرد، ئازای دەتەزی، بۆچی حەزی دەکرد، خوێندنەوەیان بۆ شەوێ دوابخات. بەیانی بێ ئەوەی خۆی یەکلایی بکاتەوە و بوێرێ هیچ یەکێک لەو سێ نامەیە بکاتەوە، لە سەر تەختەکەی پاڵکەوت، خەوێکی قورس و ناخۆشی لێکەوت، خەونێکی ناخۆشی دیکەی بینی، لەو خەونەیدا هەمان (ئافرەتی تاوانبار)ی بینییەوە. بە دیاریەوەوەستا، بەدەم تەمەشاکردنیەوە فرمێسک بەسەر برژانگە درێژەکانیەوە دەدرەوشایەوە. دیسان داوای لێدەکرد کە دوای بکەوێت. وەکو دوێنێ شەو بە یادی سیمای خەمینی ئەو ژنەوە لە خەو ڕابووبوو، ویستبووی دوای بکەوێ، بەڵام نەی توانیبوو، پێی ڕێی دانەگرتبوو، ئەنجام بە نیمچە نائومێدیەکەوە نامەکان دەکاتەوە و دەکەوێتە خوێندنەوەیان. نامەکانیش لە جۆرە خەونێک دەچوون. پیاو هەندێ جار خەونی سەیر و نا ئاسایی دەبینێ، خەونی باوەڕنەکردەنی. کە خەبەری دەبێتەوە بە ڕوونی خەونەکەی دێتەوە یاد و سەری سووڕدەمێنێ. بیرت دەکەوێتەوە کە بۆ ماوەیەکی زۆر لە لایەن کۆمەڵێک پیاوکوژو شەقاوەوە دەورە درابووی، کە بەوپەڕی لێزانی و فێڵبازییەوە، نیازی خۆیان لێدەشاردیتەوە و دۆستانە ڕەفتاریان دەگەڵ دەکردیت، لە کاتێکا چەکەکانیان لەسەر پێ بوو و تەنیا چاوەڕوانی ئاماژەیەک بوون، کە پڕت بدەنێ و لەنێوت بەرن، بەڵام لە بیرتە کە بە

درێژایی خەونەکە بۆ تاقە ساتێکیش لە خۆت بیئاگا نەبوویت، هەوڵت دەدا بەوپەڕی وریایی هەڵی ان بخەڵەتێنی، خۆتیان لێبدزیتەوە، بەر چاویان نەکەوی، بەڵام دوایی بۆت دەردەکەوت کە بە فێڵەکەتیان زانیوە، بەئانقەست وا دەنوێنن کە بە پەناگاکەت نازانن، نەهگێ پەنات دەبردە بەر فێڵێکی دی، تا گومڕایان بکەیت. هەر هەموو ئەمانەت بە ڕوونی لە بیرن و دێنەوە بیرت، بەڵام چۆن ئەقڵت، لەو ماوەیەدا ئەو هەموو وەهم و خەیاڵە تورەهاتانەی ئەو خەونەی قەبووڵ دەکرد؟ یەکێک لە بکوژەکان، بە بەرچاوتەوە دەبێ بە ژن، پاشان هەر ئەم ژنە بە بەرچاوی خۆتەوە دەبێ بە کورتیلەیەکی قەمووری ڕەزا گرانی قێزەون، کەچی تۆ، یەکسەر هەر هەموو ئەمە، بە شێوەیەکی ئاسایی، بێ چەندوچوون، بێ هیچ سەرسامیەک، لە کاتێکا وەکو واقیع قەبووڵ دەکەی، کە هۆش و زەین و ئەقڵت، لە ترۆپکی کارکردنی خۆیدایەولە هەموو شتێک دەگات، زنجیرەی ڕووداوەکان و لۆژیکی کارو بارەکان تێدەگات و درک دەکات؟

یان بۆچی کاتێ لەخەو بێدار دەبیتەوە و دەگەڕێیتەوە ناو ژیانی واقیعی، زۆربەی کات و هەندێ جار زۆر بە جیددی وا هەست دەکەیت لەگەزو مەتەڵۆکێکی ئاسێ و لە حەل نەهاتووت لە خەوەکەدا لێ بەجێماوە؟ هەڵبەتە پێکەنینت بە بێ مانایی و مەحاڵی خەوەکەت دێت، کەچی لە هەمان کاتدا وا هەست دەکەیت بیرێکی واقیعی تەواو... بیرێک کە بە شێکە لە ژیانی ڕاستەقینەت، بیرێک کە بە ڕاستی بوونی هەیە و هەمیشە لە دڵ و نیهادتدا هەبووە، ئاوێتەی ئەم وەهم و خەیاڵات و خەونە ئاجر و باجرەیە. ئیدی وەکو ئەوەی خەونەکەت بووبێ بەسەرچاوەیەکی سروش و ئیلهام شتێکی تازەی بۆ کەشف کردبیت کە چاوەڕوانی بوویت! کاریگەریی ئەمەت چ بە باری خۆشیا و چ بەباری ناخۆشیدا بە زەقی پێوە دیارە، کەچی ناتوانی لێی تێبگەیت، یان بزانی سڕی ئەمە چییە! میرزادە، پاش خوێندنەوەی نامەکان لە حاڵەتێکی فیکری لەو جۆرەدا بوو، بەڵام تە نانەت پێش کردنەوەی نامەکانیش، هەستی دەکرد ئەم نامانە بارێکی قورسن بە سەر شانیەوە، لە خەوێکی قورس و مۆتەکەیەکی بە ئازار دەچن. ئەو

شەوە، کە لەو دەوروبەرە، سەرگەردان و تەنیا دەسووڕایەوە (هەندێ جار نەیدەزانی کێوە دەچێت) لە خۆی پرسی باشە ئەم "ژنە" چۆن توانیوویەتی لەخۆیەوە نامە بۆ ئەم "کیژە" بنووسێت، چۆن توانیویەتی سەبارەت "بەم مەوزوعە" شتی بۆ بنووسێت، چۆن ئەم بیرە شێتانەیەی بە مێشکدا هاتبوو؟ ئیدی ئەم بیر و خەیاڵە جۆرەواقیعیەتێکی پەیدا کردبوو، ئەوەی میرزادەی لە هەموو شتێک پتر سەرسام دەکرد، ئەوە بوو کە بەدەم خوێندنەوەی نامەکانەوە، جۆرە قەناعەتێکی لا دروست بووبوو کە ئەم خەونە لە گینە، ئاساییە. بەڵێ ڕاستە کە ئەمە خەونە. مۆتەکە و کابووسە، شێتایەتییە، بەڵام بۆ نەگبەتی جۆرەواقیعیەتێکی بە ژان و سوێ و باوەڕنەکردەنی تێدا بوو، کە هەر هەموو ئەو خەون و مۆتەکە و شێتایەتییەی دەسڕییەوە و جۆرە ڕەوایەتییەکی پێدەبەخشی.

میرزادە، دوای خوێندنەوەی نامەکان، چەندین سەعات هایم و حەیران، بیری لە ناوەڕۆکیان دەکردەوە. هەرجارەی بەشێکی ئەو نامانەی وەبیر خۆ دێنایەوە، لە زەینی خۆیدا دەوری دەکردنەوە، وردی دەکردنەوە، وەردی دەدانەوە، لێیان ڕادەما. هەندێ جار دەگەیشتە حاڵەتێک کە لە دڵی خۆیدا بڵێ پێشتر ئاگای لە هەموو ئەم شتانە هەبووە، پێشبینی کردوون. هەندێ جار وای وێنا دەکرد، کاتی خۆی، لە ڕابردوویەکی دوورا ئەم نامانەی خوێندووەتەوە، ئیدی لەوساوە،هەر داخ و کەسەرێکی چەشتووە، هەر پەشێوی و پەرێشانیەک بەرۆکی گرتووە، هەر ترس و ناخۆشیەکی بەسەر هاتووە. هەر هەمووی لەم نامانەدا، کە گوایە زۆر لەمێژبوو خوێندبوونیەوە، تۆمار کراون.

یەکەمین نامە بەم جۆرە دەستی پێ دەکرد:

"کاتێ ئەم نامەیە دەکەیتەوە، یەکەم جار تەمەشای ئیمزای پاینی نامەکە بکە. ئەم ئیمزایە هەموو شتێکت پێ دەڵێت و گشت شتێکت، بۆ ڕوون دەکاتەوە و تێت دەگەیەنێت، بۆیە پێویست ناکات ناوی خۆمت پێ بڵێم یان هیچ شتێکت بۆ ڕوون بکەمەوە یان شەرم لەم کارەی خۆم بکەم. ئەگەر من بە ئاستەمێکیش لە ئاست و پایەی تۆدابام، هەقی خۆت بوو ئەم پڕکێشی و

گوساخی و ڕوو قایمیەی من بە تەوهین بزانی، بەلام من لەکوێ و تۆ لەکوێ؟ ئێمە دوو خاڵی ڕێک پێچەوانەی یەکترین، من لەچاو تۆدا هێندە بچووکم، کە ئەگەر بشمەوێ، لە کەرامەتت بدەم و سووکایەتیت پێ بکەم، هەر ناتوانم."

لە پەرەگرافێکی دیکەدا دەڵێت:

"ئەم قسانەم بە زادەی جۆشوخرۆشی مێشکێکی نەخۆش نەزانیت. ئاخر چبکەم من تۆ بە نموونە و خودی کەماڵ دەزانم! تۆم دیتووە و هەموو ڕۆژ دەتبینم، من حەددی وەسف کردنی تۆم نییە. وەکو گوتم تۆ بە کەماڵی ڕووت وخاڵیسە دەزانم، ئەم قەناعەتەم زادەی ئەقڵ و بیرکردنەوە نییە، بەڵکو زادەی باوەڕێکی سادەیە، بەلام گوناحێکم دەربارەت کردووە: ئەم گوناحەش ئەوەیە کە خۆشم دەوێی. کەماڵ، بابەتی ئەشق نییە، ناشێت ببێ بە بابەتی ئەشق و خۆشەویستی، ئەوەندە بەسە بزانیت ئەمە کەماڵە و تەواو. تۆش پێت وانییە؟ کەچی وێڕای ئەوەش خۆشم دەوێی، هەرچەندە ئەشق خەڵکی یەکسان دەکات، بەلام نیگەران مەبە، دڵ لە دڵ مەدە: من تەنانەت لە ناخی ناخیشما، لە نهێنی ترین هزرینی خۆمیشا، ڕێ بە خۆ نادەم خۆم بە هاوتای تۆ بژمێرم، قەت ڕۆژێ لە ڕۆژان خۆم دەگەڵتا بەراورد نەکردووە. گوتم "نیگەران مەبە، دڵ لە دڵ مەدە" تۆ بڵێی دڵم بێت نیگەرانت بکەم؟ ئەگەر شتی وا ڕوو بدات، ئامادەم ئەو خاکە ماچ بکەم کە پێی پێدا دەنێت. من قەتاو قەت خۆم بە هاوتای تۆ نازانم. بڕوانە ئیمزایەکەی پاینی نامەکە، کچی باش لەزێکە بڕوانە ئیمزایەکە! "

ئەم ژنە لە نامەکەی دیدا نووسیبووی:

"بەهەرحاڵ، هەستدەکەم من خەریکم ئێوە، هەر دووکتان یەکدەخم بەبێ ئەوەی ڕۆژێ لە ڕۆژان لە تۆ بپرسم: کچی باش ئایا تۆ ئەو پیاوەت خۆشدەوێ؟ ئەو، کە لە ژیانیا تۆی نەدیتبوو، لەگەڵ یەکەم دیدارا ئاشقت بوو. بوویت بە " نوور و ڕووناکی" و خەیاڵدانیت کرد بە چراخان. ئەمە دەقی قسەکانی خۆیەتی، ئەمەم لە زاری خۆیەوە بیست، بەلام بەبێ ئەو قسانەش دەمزانی کە تۆ ڕووناکی ژیانی ئەویت. من یەک مانگی تەواو

دەگەڵیا ژیاوم، لەو ماوەیەدا بۆم دەر کەوت کە تۆش خۆشت دەوێ. بە بۆچوونی من، ئێوە، تۆ و ئەو یەکێکن نەک دووان."

لە درێژەی نامەکەدا دەڵێت:

"یانی چی؟ دوێنێ کە بە لاتاندا ڕەت بووم هەستم کرد سوور بوویتەوە، بۆچی؟ نا، مەحاڵە، شتی وا نابێ، دەبێ من بە هەڵەوام وێنا کردبێ. تۆ ئەگەر بۆ قێزەونترین جندەخانەش بەرن، سووکترین ڕیسواییت نیشان بدەن، نابێ سوور ببیتەوە: نابێ گوێ بە هیچ ئیهانەیەک بدەیت. ڕەنگە هەموو خەڵکێکی سووک و ڕیسوا ببوغزێنی، بەڵام نەک لەبەر ئەوەی خۆت ڕقت لێی انە، یانی لە ڕوانگەی ڕقی شەخسیەوە نایان بوغزێنی، بەڵکو لە ڕووی بەزەییەوە بە خەڵکی، بەو خەڵکەی ئەوانە سووکایەتیان پێدەکەن، چونکە تۆ، کەس ڕایەی نییە کەرامەتت، هەستت بروشێنێ و بریندار بکات. دەزانی من هەست دەکەم تۆ دەبێ خۆشت بوێم؟ تۆ لە دید و نۆڕینی منەوە نەک لە نۆڕینی ئەوەوە: گیانێکی لە ڕووناکی. دیارە فریشتە ناتوانێ بوغزن بێ، ڕقی لە کەس بێت، بەڵکو مەحکومە بە خۆشەویستی و بەس. زۆر جار لە خۆم پرسیوە ئایا کەس هەیە بتوانێ هەر هەموو هاوڕەگەزانی بەشەری خۆی، بێ ئەوەی کەس ببوێرێ، خۆش بوێ؟ هەڵبەتە: نەو. شتی وا لە ئارادا نییە! و شتی وا نە ئاساییە و نە سروشتیە. بەشەردۆستی و خۆشەویستی مرۆڤایەتی، قسەیەکی ڕووتە، مرۆڤ لە میانەیەوە تەنیا خۆی خۆش دەوێ. جا ئەگەر ئەم جۆرە خۆشەویستیە بۆ ئێمەمانان مەحاڵ بێت، ئەوا بۆ تۆ شتێکی دییە، هیچ مەحاڵ نییە. ئاخر چۆن دەبێ هەموو تیرەی بە شەرت خۆش نەوێت، مادامێکی لە سەرووی بەشەرەوەیت، کەس نەگاتە ئاستی تۆ و لە هەر ئیهانەیەک بالاتر بیت! تەنیا تۆ دەتوانی بە دوور لە هەر خۆپەرستیەک خەڵکت خۆش بوێت. تەنیا تۆ دەتوانی خۆشەویستی بکەیت، نەک لەپێناوی خۆتا بەڵکو لەپێناوی ئەو کەسەدا کە خۆشت دەوێ. ئاهـ... چەندم لە دڵ گران دەبێت، ئەگەر هەست بکەم یان بزانم بە هۆی منەوە هەست بە شەرمەزاری یان توڕەیی بکەیت! ئەگەر شتی وەها ڕووبدات، دەکاتە تیاچوونی تۆ، چونکە لەو حاڵەتەدا دێیتە خوارەوە بۆ ئاستی من!...

"دوێنێ دوای ئەوەی بینیمیت، چوومەوە بۆ ماڵێ و وێنەیەکی تایبەتیم لەبەرچاوی خۆما بەرجەستە کرد. نیگارکێشان، تێکڕا، هەمیشە مەسیح بەگوێرەی حیکایەتەکانی ئینجیل، وێنە دەکێشن، بەڵام ئەگەر من لەجیاتیی ئەوان بام، یان قەرار بوایە من وێنەی مەسیح بکێشم بە جۆرێکی دی دەمکێشا: بە تەنیا دەمکێشا و (ئاخر مورید و یاوەرەکانی هەندێ جار بە تەنیا بەجێیان دەهێشت) تەنیا یەک منداڵی چکۆلەم لەلایەوە دادەنا. کە لەنزیکیەوە یاری بکات و وا بنوێنێ کە بە زمانی منداڵانەی خۆی شتێکی بۆ گێڕاوەتەوە و مەسیح بە دڵ گوێی لێگرتووە و هەنوکە لەگژ فکران ڕاچووە و هێشتا دەستی بەسەر قژی زەرد و ڕووناکی منداڵەکەوەیە و لە بیری چووە دەستی لابدات. نیگای بڕیوەتە دوور، ئاسۆ. بیرێکی بێ پایان، بە ئەندازەی بێ پایانی گەردوون، لە چاوانیا ڕەنگی داوەتەوە و سیمای نوقمی خەمە. منداڵەکە کڕوکپ، ئانیشکی داداوەتە سەر زرانی مەسیح، لا ڕوومەتی خستوەتە سەر لەپە چکۆلەکەی خۆی و سەری بەرزکردوەتەوەو، بە هەمان شێوەی کە هەندێ جار منداڵانی چکۆلە تەمەشا دەکەن، بەو ئاوایە دەڕوانێتە مەسیح. هەتا و بەرە و کەل دەڕوات... ئەمە ئەو وێنەیەیە کە دەشیا من بیکێشم! تۆ کەسێکی بێگەردی و، کەماڵی تۆ لە پاکی و بێگەردیتایە. ئاه... تەنیا ئەمەت لە بیر بێت! ئاخر ئەشقی من، سۆز و ئەڤینی من بۆ تۆ چ بایەخێکی هەیە؟ تۆ ئیدی لەمڕۆ بەدواوە هی منی، هەتا ماوم لە نزیکی تۆ دەبم — من بەم زووانە دەمرم."

ئەو ژنە لە دوا نامەدا نووسیبووی:

"تووبی توخودا، گومانی خراپم لێمەکە! وا نەزانی کە من بە مەبەستی خۆشکێنی نامەت بۆ دەنووسم یان یەکێکم لەوانەی کە لەزەت لە خۆشکێنی دەبینن و خۆیانی پێوە ڕادەنەن. نا. من جۆرە ئارامیەکی پێ پەیدا دەکەم، هەرچەندە زۆر زەحمەتە بتوانم ئەو ئارامیەت بۆ شرۆڤە بکەم، شرۆڤە کردنی تە نانەت بۆ خودی خۆیشم هەر زەحمەتە، هەرچەندە ئەمەش بۆ خۆی و لە خۆیدا بۆ من کێشەیەکە و سەرچاوەی عەزابە، بەڵام ئەوەندە دەزانم، من تە نانەت لە حاڵی غرووری شێتانەشدا! ناتوانم خۆشکێنی بکەم.





یانی خۆشکێنی لە مەزەبی مندا نییە. تەنانەت لە عۆدەی ئەو خۆشکێنییەش نایەم کە لە دڵپاکی و بێگەردییەوە هەڵدەقووڵێت. بە کورتیەکەی نە بەم شێوەیە و نە بەو شێوەیە خۆشکێنی ناکەم.

"بۆچی لێبڕاوم ئێوە بگەیەنمە یەکدی؟ لەبەر ئێوەیە یان لەبەر خۆمە؟ بێگومان لەبەر خۆمە، چونکە لەمێژە بەخۆمم گوتووە کە کلیلی کردنەوەی دەرگا و چارەسەری گشت کێشەکانم لەمەدایە. زانیومە کە ئادیلایدی خوشکت جارێکیان کەوێنەیەکی منی دیتووە، گوتوویەتی، ئینسان دەتوانێ بەم جوانیەوە دنیا بهەژێنێ، شۆڕشێک بەرپا بکات، بەڵام من وازم لە دنیا هێناوە، چاوم لە دنیا پۆشیوە. ڕەنگە گاڵتەت پێم بێ کە ئەم قسەیەت بۆ دەنووسم، چونکە بەجلی ئاڵا و واڵا و سەراپا خشڵەوە دەگەڵ بەرەڵڵا و مەست و سەرخۆشاندا دەمبینی. وانییە؟ تکا دەکەم ئەم شتانە بەهەند مەگرە، چونکە من دەزانم لێبومەتەوە و ژیانم بەرە و نەمانە، من ئەمە چاک دەزانم و لێی بێئاگا نیم. مەگەر هەر خوا بزانێ کێ لە جێی من لە جێی منی ڕاستەقینە، لە دەروونما ئاکنجی بووە. من هەموو ڕۆژێ قەدەر و چارەنووسی خۆم لەو چاوە ترسناکانەدا دەخوێنمەوە کە بەردەوام بڕاونەتە من، تەنانەت ئەو کات و دەمانەش کە لێمەوە دیارنین و لەبەردەممدا نین. ئەم چاوانە بێدەنگن (هەمیشە بێدەنگن) بەڵام من لە ڕازیان بە ئاگام. ماڵەکەی یەکپارچە بێزاری و دڵتەنگیە. ئەم ماڵە ڕاز و نهێنییەکی لە خۆدا حەشارداوە. من دڵنیام کە لە یەکێک لە جەکمەجەکانی خۆیدا کێردێکی حەشارداوە، لە حەریرێکی پێچاوە، ڕێک وەکو ئەو بکوژە مۆسکۆییەی کە ئەویش لە ماڵێکی وەهادا دەگەڵ دایکیا دەژیا و کێردێکی هەبوو لە ئاوریشمیەوە پێچا بوو و ئامادە بوو بۆ برینی هەر گەرویەک، تینووی خوێن بوو. بە درێژایی هەموو ئەو ماوەیەی لە ماڵی ئەواندا بەسەرم برد، هەمیشە بیرم لای ئەوە بوو کە لەوەیە لە شوێنێکی ماڵەکەیاندا، لەژێر عاردیدا، جەنازەیەک شاردرابێتەوە، باوکی لەو شوێنەدا، وەکو ئەو جەنازەیەی کە لە مۆسکۆدا دۆزرایەوە،لە مشەمایەکیەوە پێچابێ و شاردبێتیەوە و وەکو جیدانۆف چواردەوری بە شووشە دەرمانی

دژەبۆگەنی گرتبێت. تە نانەت دەتوانم ئەو شوێنەشت نیشان بدەم کە ڕەنگە جەنازەکەی تیا شاردرابێتەوە. ئەو هەمیشە بێدەنگ و خامۆشە، بەڵام دەزانم ئەوەندەی خۆش دەوێم کە مەحاڵە ئەم خۆشەویستیە نەگۆڕێت و نەبێت بە ڕقوکینە. ئیدی زەماوەندەکەی ئێوە و زەماوەندەکەی ئێمە لە یەک ڕۆژدا دەبێت. لەسەر ئەمە ڕێکەوتووین. من هیچ شتێک لەو ناشارمەوە. ئەوەندەی لێدەترسم لەوەیە لە ترساندا بیکوژم.... بەڵام پێش ئەوەی من بڕیاری تەواو بدەم، ئەو من دەکوژێت... ئا ئێستا کە بینی ئەم شتە دەنووسم، لە قاقای پێکەنینی دا، ئەو پێی وایە من شێت بووم. دەزانی کە نامە بۆ تۆ دەنووسم".

نامەکان، زۆر بیری شیتانەی تری لەم بابەتە بیرانەیان تێدا بوو. یەکێک لە نامەکان، یانی نامەی دووەم کە بەخەتی ورد نووسرا بوو، چوار لاپەڕەی گەورەی خورشیدی گرتبووەوە.

ئەنجام میرزادە لە جەرگەی تاریکی پارک و باخەکە، کە وەکو دوینێ ماوەیەکی زۆر پیاسەی تیا کردبوو، هاتە دەرێ. شەوەکە، لە شەوانی دیکە ڕووناک تر و سافتر دەینواند. لە دڵی خۆیدا گوتی: "تۆ بڵێی هێشتا زووبێ؟" (میرزادە سەعاتەکەی لە بیرچووبوو). بە خەیاڵی خۆی لە دوورەوە دەنگی مۆزیک دەهات. دووبارە لە دڵی خۆیدا گوتی: "ڕەنگە لە سەیرانگاکەوە بێ. بێگومان، ئەوان ئەمشەو بۆ ئەوێندەر نەچوون." بەدەم ئەو قسەیەوە کاتێ وەخۆهاتەوە سەیری کرد لەبەرماڵی یەپانچین وەستاوە. بە خۆی هەستی بەوە کردبوو کە دوور نییە ئەم پیاسەیە بیگەیەنێتە ئەوێ. بەدەم دڵە تەپێوە بە پلەکانی بالکۆنەدا هەڵگەڕا. بالکۆنەکە چۆڵ بوو. کەس نەهاتە پێشوازی. هەڵوەستەیەکی کرد و کەمێک چاوەڕوانی کرد. ئەوجا ئەو دەرگایەی کردەوە کە دەچوو بۆ هۆڵی پێشوازی. لە دڵی خۆیدا گوتی: "ئەم دەرگایە قەت داناخەن". هۆڵەکەش چۆڵ و نیمچە تاریک بوو. میرزادە بە دوو دڵی لە ناوەندی هۆڵەکەدا بە سەرسامی و حەپەساوی وەستا. لەناکاوا دەرگا کرایەوە. ئەلکسندرا ئیڤانۆڤنا، بە خۆی و مۆمێکەوە پەیدا بوو. کیژێ کە چاوی بە میرزادە کەوت بە حەپەساوی وەستا، وەکو ئەوەی بپرسێت کە

خێرە لەوێ وەستاوە! .. هەڵبەتە ئەلکسندرا بە ڕێکەوت لە ژوورێکەوە بۆ ژووریکی دی دەڕۆیشت. هەرگیز وێنای نەدەکرد، هیچ کەسێک بدینێ.

ئەنجام ئەلکسندرا پرسی:

- خێرە هاتووی بۆ ئێرە؟

- هەروا بە ڕێکەوت ڕێم کەوتە ئێرەو...

- دایکە ماندووە و حاڵی باش نییە، هەروەها ئاگلایاش. ئادیلاید چووە بخەوێ، منیش بەتەمام برۆم بخەوم. شەوێ هەر ماڵەوە بووین، نەچووین بۆ ئاهەنگ. باوکە و میرزادە (س...) چوون بۆ پتر سبورگ.

- هاتووم... هاتووم... ئێستا...

- دەزانی ئێستا سەعات چەندە؟

- نا... نازانم.

- دوازدە و نیوە، شەو لە نیوە تێپەڕیوە. ئێمە هەمیشە سەعات یەک دەنووین.

- وامدەزانی سەعات نۆ و نیوە.

ئەلکسندرا بەدەم پێکەنینەوە گوتی:

- باشە، قەیدی نییە! باشە بۆ زووتر نە هاتیت؟ چاوەڕوانت بووین.

میرزادە لە کاتێکا بەرە و دەرگا دەچوو تا بڕوات، لەبن لێوانە گوتی:

- وام دەزانی... وام... دەزانی...

- شەو بەخێر! سبەینێ هەموو بەم مەسەلەیە پێدەکەنن.

میرزادە، بە ڕێگای دەوری باخەکەدا، بەرە و ماڵی خۆی پەل بووەوە. دڵی خێرا خێرا لێی دەدا، بیری پەرت و پەرێشان بوو. هەموو شتێک لەبەر چاویا لە خەون دەچوو. لەپڕ دەقاودەق وەکو یەک دووجاری پێشوو کە لە هەمان خاڵدا لە خەونەکانی خەبەری بووبووەوە، ئێستاش هەمان تاپۆ و شەبەنگ لە بەرانبەریا وەستابوو. هەمان ژن لە سەیرانگەکە هاتە دەرێ و لە بەرانبەریا ڕەق ڕاوەستا، وەکو ئەوەی لەو شوێنەدا چاوەڕوانی ئەو بووبێ. میرزادە، ڕاجفری و لە جێی خۆی وەستا. ژنەکە دەستی گرت و توند توند گوشی: " نا، ئەمە خەون نییە! تاپۆ نییە! " بۆ یەکەم جار، دوای

ئەوەی لێکدی دابڕان، ئەم ژنە لە بەردەمیا، ڕووبەڕووی ئەو وەستابوو. ژنە قسەی بۆ دەکرد و میرزادەش زەق زەق و بە بێدەنگی تەمەشای دەکرد. دڵی، خەریک بوو لە داخا شەقی دەبرد. قەت ڕۆژێ لە ڕۆژان نەیدەتوانی ئەو دیدارە فەرامۆش بکات و هەر جارێ بیری بکەوێتەوە هەمان خەم و پەژارەی لێ تازە دەبێتەوە. ژنە، وەکو شێت لە ناوەڕاستی ڕێگاکەدا، خۆی لەبەر پێیانی هاویشت. میرزادە بە شپرزەیی چووە دواوە. کەچی ژنە ڕێک وەکو دوا خەونی میرزادە، دەیویست دەستی بگرێت و ماچی بکات، فرمێسکی درشت، بە سەر برژانگە درێژەکانیەوە دەدرەوشایەوە. میرزادە، بە ترسەوەولە بن لێوانەوە گوتی:

– ڕابە، ڕابە، خێرا هەستە!

ناستاسیا لێی پرسی:

– ئایا بەختەوەریت؟ خۆشیت؟ کەیفت قنجە؟ بە یەک وشە پێم بڵێ: تۆ ئێستا، ئەمڕۆ، حاڵی حازر بەختەوەری؟ چوویت بۆلای؟ چی پێگوتیت؟

نە لە عاردی هەڵدەستا و نە بە گوێی میرزادەی دەکرد. بەدەم ڕاجفرینەوە لێکدا لێکدا پرسیاری دەکرد، بە لەز قسانی دەکرد، وەکو ئەوەی ڕاونرابێ.. لە سەری ڕۆیشت:

– سبەینێ، لەسەر قسەکەی تۆ، (نەک بەخواستی خۆم) دەڕۆم. سەفەر دەکەم. جارێکی دی هەرگیز دەرناکەومەوە. ئەمە دواجارە کە تۆ دەبینم، بەڵێ دواجار! بە ڕاستی ئەمە دواجارە!

میرزادە، بەوپەڕی خەمینییەوە گوتی:

– ئارامت بێ، ڕابە! هەستە!

ژنە، کە دەستی ئەوی گرتبوو بەو پەڕی تامەزرۆیی و تاسەوە تەمەشای دەکرد، ئەنجام هاتە قسان و گوتی:

– بەدووعا!

بەدەم ئەو قسەیەوە هەستا، بەلەز و، بە نیمچە ڕاکردنەوە دوورکەوتەوە.

میرزادە، ڕوگوژینی بینی کە لەپڕ پەیدابوو، دەستی ناستاسیای گرت و

بەدوو قۆڵی ڕۆیشتن. ڕوگوژین ڕوو لە میرزادە هاواری کرد و گوتی:

– میرزادە چاوەڕوانم بکە، دوای پێنج دەقیقەی دی دەگەڕێمەوە. بە ڕاستی، دوای پێنج دەقیقە گەڕایەوە. میرزادە لە هەمان شوێن چاوەڕوانی بوو.

ڕوگوژین گوتی:

– سواری گالیسکەکەم کرد، گالیسکەکە لە سەعات دەوە، لەوێ، لە سووچێکا چاوەڕوانی دەکرد. قەناعەتی وابوو کە لە هەوەڵی شەوێوە دەگەڵ ئەو کیژەدا بوویت. ئەم قسەیەم پێگوت کە بۆت نوسیبووم، وەکو خۆی و زۆر بەوردی داواکەی تۆم پێڕاگەیاند. لەمڕۆ بە دواوە ئیدی نامەی بۆ نانووسێت – بەڵێنی داوە و لەسەر داوای تۆ سبەینێ پافلوفسک بە جێدێڵێت و سەفەر دەکات. حەزی دەکرد بۆ دواجار بتبینێ، هەرچەندە دەیزانی تۆ حەز ناکەیت، ئیدی لێرە، لە سەر ئەو تەختە دانیشتین و، چاوەڕوانمان کردیت، چونکە دەمانزانی هەر دەبێ لێرەوە بۆ ماڵ بگەڕێیتەوە.

میرزادە لێی پرسی:

–خۆی داوای لێکردبوویت کە لەگەڵیا بێی؟

ڕوگوژین، بەدەم ژار خەنێکەوە گوتی:

– ئەدی بۆ نا، ئەوەی لێرەدا دیتم شتێکی تازە نەبوو. باشە تۆ نامەکانیت نە خوێندووەتەوە؟

میرزادە. لە فکران ڕاچوو، دوای تۆزێک لێی پرسی:

– ئەدی تۆ، نامەکانت خوێندونەتەوە؟

– بە خۆی یەک بە یەک نیشانی داومن.... ئەو بەشەت لە بیرە کە باسی کێردەکە دەکات؟ ها، ها ها! ..

میرزادە، بە داخ و کەسەرەوە دەستەکانی تێک هاڵاندن و گوتی:

– شێتە!

ڕوگوژین، بە دەنگێکی نزم، وەکو ئەوەی خۆی بدوێنێ گوتی.

– کێ دەزانێ؟ لە گینە شێتیش نە بێت.

میرزادە، هیچی نەگوت.

ڕوگوژین گوتی:

- دەیسا خواحافیز! منیش سبەینێ دەچمە سەفەر. گلەیی بەجێ بێڵە!

ئەوسا لەپڕ ئاوڕی دایەوە و گوتی:

- گوێ بگرە برای ئازیز، بۆچی وەڵامی پرسیارەکەیت نەدایەوە: ئایا تۆ بەختەوەری یان نا؟

میرزادە، بە داخ و کەسەرێکی زۆرەوە گوتی:

- نەخێر، نەخێر، نەخێر بەختەوەر نیم!

ڕوگوژین، بەدەم تەوسخەنێکەوە گوتی:

- چوزانم! هەر لەوەمان کەمە بڵێی "بەڵێ!"

بێ هیچ ئاوڕدانەوەیەک، ملی ڕێی گرت و ڕۆیشت.

## بەشی چوارەم

### فەسلی یەکەم

نزیکـــەی هەفتەیـــەک بەســـەر ئەو دیـــدارەی جووتـــە قارەمـــانی چیرۆکەکەمان، لە سەر تەختە کەسکەکە، تێپەڕی بوو.

بەیانی ڕۆژیکی هـەتاوی خۆش، ڤارڤارا ئاردالیونوڤنا پتیتسینا لـە مـاڵ وەدەر کەوتبوو و چووبووە دیدەنی هەندێ لـە دۆست و ئاشناکانی، پاشـان لـە دەوربـەری سـەعات دە و نیـودا، بـە خـەمینی و دڵتـەنگی بـۆ مـاڵ گەڕابووەوە.

کەسانێک هەن، پیاو ناتوانێ بەئاسانی و بەکورتی وەسفێکی ئەوتۆیـان بکات، کە دیارترین خەسڵەت و تایبەتمەندیان بنوێنی و بە دەستەوە بدات. ئەو خەڵکانـە، بـە خـەڵکێن "عەوام و ئاسـایی" نـاودەبرێن، کـە لـە ڕاسـتیا زۆربـەی جـەماوەری خـەڵک پێکدەهێنن، یـانی زۆربـەی کۆمـەڵن. ئـەدیبان، هەوڵدەدەن لە ڕۆمـان و چیرۆکەکانیاندا، نموونـەی کۆمەڵایـەتی هـەڵبژێرن و بـە زمـانی وێنە و هونـەر، ئەو نموونانـە بـە کـامڵترین و جـوانترین شـێوە بەرجەسـتە بکـەن، بـەڵام بەدەگمـەن لـە ژیـانی واقیعیدا تووشـی ئەو جـۆرە نموونانـە دەبین، بـەڵام ئەمـە بەو مانایـە نییـە کە ئەو کاراکتەرانـەی کـە بەو شێوەیەوێنا دەکرێن و دێنەوێنـەگرتن، لـە خـودی واقیـع واقیعـی تـر نـین. بـۆ نموونـە کەسـێتی بۆدکۆلیوسـین،* ڕەنگـە لـە ڕووی تیپیکیـیەوە، هەنـدێ

موبالەغە ئامێز بێت، بەڵام بە هیچ جۆرێ کاراکتەرێکی خەیاڵی و ناواقیعی نییە، گەلێک لەو خەڵکە هوشیار و زیرەکانەی کە (بودکۆلیوسین)ی شا قارەمانی شانۆنامەکەی "گوگول"یان بینیوە، پاشان، لێکچوونێکی بێ ئەندازەیان لەنێوان ئەو قارەمانە و دەیان و سەدان هاوڕێ و دۆستانی خۆیاندا بینیووە! هەڵبەتە ئەو خەڵکە زیرەک و بە سەرنجانە، تە نانەت پێش ئەوەی "گوگول"ش بخوێننەوە، زانیویانە کە هاوڕێکانیان لە بودکولیوسین چوون، بەڵام نەیان زانیوە کە ئەو ناوە پڕ بە پێستی ئەوانە، هەڵبەتە لە ژیانی واقیعیدا بەدەگمەن ڕێکدەکەوێ، کە زاوایەک پێش ئەوەی بووکی بۆ بکەنە پەردەوە، لە پەنجەرەوە هەڵێت. ئەمە زۆر ناواقیعی یە، چونکە ئەم کارە، بە هەر مەبەستێک بکرێت، کارێکی ناپەسەندە و لە هەموو کەسێک ناوەشێتەوە، بەڵام وێڕای ئەوەش زۆر زاوای بەڕێز و بەحورمەت، بە ئاوەزو ویقار هەن کە لە ڕۆژی زەماوەندەکەیاندا، لە ناخی خۆیاندا هەستیان بە هەمان حاڵەتی دەروونی "بودکولیوسین" کردووە. هەڵبەتە هەر مێردیکیش نایەت لە هەر بۆنەیەکدا هاوار بکات و بڵێت:

"خۆت بە خۆتت کرد، دەبخۆ دەردەت بێ جۆرج داندان"* بەڵام وێڕای ئەوەش ملیۆنان و ملیاردان کەڕەت ئەم ئاهۆ ناڵەیە، دوای مانگی هەنگوین یان پێش گواستنەوەی ژنان بە چەند ڕۆژێ، لە کانگا دڵی مێردانی دنیاوە هەستاوە!

هەڵبەتە پێویست بەوە ناکات زۆر بە تانی ئەم مەسەلەیەدا بچین، ئەوەندە بەسە بڵێین کە هەرچەند لە ژیانی واقیعیدا تیپیکبوونی ئەم کاراکتەرانە بەو زەقیە نییە و کەمتر دیارە، بەڵام هەر هەموو ئەم "جورج داندان و بۆدکۆلیوسین"انە لەواقیعدا هەن: هەموو ڕۆژ دەیان بینین، بە بەرچاومانەوە دێن و دەچن، بەڵام بەو تۆخییە نا، بەڵکو بە شێوەیەکی کاڵتر. جا بۆ ئەوەی لە کورتی بیبڕینەوە و کۆتایی بەم بابەتە بێنین تا لێمان نەبووە بەوتارێکی ئەدەبی، دەڵێین ئەو نموونە تەواو عەیارەی (جورج داندان)ی ئافەریدەی مولیرش، لە ژیانی واقیعی بەرچاو دەکەوێ، بەڵام بەدەگمەن.

بەڵام هێشتاش، ئەم پرسیارە هەمیشە بە ڕۆکمان دەگرێت: چیرۆکنووس دەبێ چی بکات و چۆن مامەڵە دەگەڵ ڕەمەکیاندا (خەڵکی عەوام و ئاسایی )دا بکات تا بکەونە بەر سەرنج و دیدی خوێنەران و بێنە ناسین؟ هەڵبەتە مەحاڵە چیرۆکنووس بتوانێ ئەو خەڵکە ڕەش و ڕووت و ئاساییە لە چیرۆک و ڕۆمانەکانیا وەدەربنێ، چونکە ئەو ڕەمەکیانە هەموو کاتێک و لە زۆربەی حاڵاندا دەکەنە تان و پۆی ژیان و بەشێکی حاشا هەڵنەگری لە زنجیرەی ڕووداوەکانی ژیان و بویەرەکانی ڕۆژگار، ئەگەر پەراوێزمان خستن و لە ڕۆمانەکەمان وەدەرنان، ئیدی ڕۆمانەکەواقیعییەتی خۆی لە دەست دەدات و دەگەڵ حەقیقەتدا تێکناکاتەوە. هەڵبەتە پڕکردنی ڕۆمان لە نموونە و کاراکتەرانی سەیروسەمەرە و سوپەر واقیعی و نائاسایی، تەنیا بە مەبەستی سەرنجڕاکێشان، نەک هەر سەرنجی خوێنەر ڕاناکێشێت، بەڵکو باوەڕ و قەناعەتیشی بە ڕۆمانەکە لەق دەبێت. بە بۆچوونی ئێمە، نووسەر لە سەرێتی ئەو خەسڵەت و تایبەتمەندیانە کەشف بکات و بدۆزێتەوە کە مایەی سەرنجن و دەبنە سەرچاوەی ئیلهام تەنانەت لە لای خەڵکی ئاسایی و ڕەمەکیش بۆ نموونە کاتێ خەڵکانی ئاسایی و ڕەمەکی، هەرچی دەکەن و دەکۆشن کە لەواقیعی ڕەمەکایەتی دەرچن، هەر بێفایدەیە و دەگەڕێنەوە سەر باری ڕەمەکایەتییەکەی خۆیان، جا ئەم عەوامانە، بەو حاڵە سیفەتی تیپیکی وەر دەگرن و دەشێت بکرێن بە نموونەی ئەو خەڵکە عەوام و ڕەشوو ڕووتەی کە نایەوێ هەر بەو دەقەوە بمێنێ، بەڵکو دەبێ بە هەر نرخێ بووە خۆیبوون و کەسێتی خۆی پەیدابکات و بەدەست بێنێ، با هیچ ئەوزارێکیشی نەبێت بۆ گەیشتن بەو مەبەست و ئامانجە.

جا هەندێ لە قارەمانان و کاراکتەرانی ئەم چیرۆکەمان، سەر بەو خەڵکە "ڕەمەکی"یان "عەوام و ئاسایی"یانەن، کە هەڵبەتە دان بەوەدا دەنەم کە وەکو پێویست بە خوێنەران نە ناسێنراون. لەوانە: ڤارڤارا ئاردالیونوڤنا پتیتسیناو، پتیتسینی مێردی و، گاڤریلا ئاردالیونوفیچی برای.

لەوە ناخۆشتر نییە کەسێک بۆ نمونە دەوڵەمەند، خانەدان، ئەسڵزادە، قۆز، خوێنەوار، زیرەک و تەنانەت دڵاواش بێ، بەڵام هیچ بەهرە، توانا،

تایبەتمەندی و سیفەتێکی دیاری نەبێت، بیرکردنەوە و بۆچوونی تایبەتی خۆی نەبێت، وەکو "هەر خەڵکێکی دی" بێت: دەوڵەمەندە بەڵام وەکو ڕۆچیلد نییە، ناوێکی بەڕێزە بەڵام بە هیچ شتێک بە ناوبانگ نییە. قۆز و جوانە، بەڵام مایەی سەرنج نییە، کار لەبەرانبەرەکەی ناکات، خوێنەوارێکی باشە، بەڵام ئەم خوێنەوارییە دادی هیچی نادات و نازانێ چۆنی بەکاربێنێ، زیرەکە بەڵام ئامانجی تایبەتی نییە، هزرینی خۆی نییە، کەسێکی دڵپاک و دڵاوایە، بەڵام بە شەخسیەت و نەفس بەرز نییە، ئیدی بەو جۆرە لە هەموو ڕوویەکەوە.

لە دنیادا، خەڵکانی زۆر لەو بابەتە خەڵکە هەن، زۆرتر لەوەی وێنای دەکەین. ئەمانەش وەکو هەموو بەشەر، دوو جۆریان هەیە، دوو دەستەی سەرەکین: دەستەی یەکەمیان کە زۆربەن، ئەوانەن کە هۆشوگۆشێکی دیاریکراو و سنوورداریان هەیە، دەستەی دووەم لە زۆربەکە "زیرەکتر و بەهۆشوگۆشترن". دەستەی یەکەم لە دەستەی دووەم شادو بەختەوەرترن. خەڵکی "ڕەمەکی" ئەقڵیەت سنووردار، زۆر ئاساییە خۆی بە گەورە و ناوازە و ڕەسەن و بێ هاوتا بزانێت و زۆریش لەم بۆچوونەی خۆی دڵنیایە، بۆیە هەمیشە کەیفی بە خۆی دێت و دڵی خۆشە. بۆ نموونە هەندێ لە خانمانی گەنجی ئێمە، هەر کە قژیان بڕی و چاویلکەیەکی شینی تۆخیان لەچاو کرد خۆیان لێدەبێ بە نەهلیستی تەواوعەیار و دەگەنە ئەو قەناعەتەی کە بەو عەینەکەوە بوون بە خاوەنی "بۆچوونی" شەخسی و "باوەڕێن" تایبەتی خۆیان. یان هەندێک پیاو هەر کە زەرەیەک هەستی مرۆڤانیان لە دڵ و دەروونی خۆدا شک برد، ئیدی خێرا خۆیان لێدەگۆڕێ و دەگەنە ئەو قەناعەتەی کە هیچ کەسێکی دی ئەو هەست و سۆزەی ئەوانی نییە و هەر ئەوان کوڕی مەیدان و پێشەنگی کاروانی ڕۆشنگەری و پێش قەرەوڵی پێشکەوتنی مرۆڤایەتین. یان هەندێکی دی هەر کە بە ڕێکەوت لە کەسێکەوە گوێی لە بیرۆکەیەک بوو، یان بە ڕێکەوت لە لاپەڕەی کتێبێکدا بیرۆکەیەکی نیوەچڵی خوێندەوە، ئیدی ئەو "بیرۆکە"یەی لێدەبێ بە هی خۆی و بە هەموو قەناعەتێکەوەوادەزانێ هەڵقووڵاو و زادەی





هـزر و مێشـکی خۆیـەتی. ئەمـە حاڵـەتێکی سـەیرە، دەشـێت بـە زادەی ساویلکەیی و ڕووقایمی ئەو کەسانە دابنرێت. زۆر جار لە ژیانی ڕۆژانـەدا تووشـی ئـەم حاڵەتانـە دەبـین. گۆگـۆڵ، ئـەم حاڵەتـەی، حاڵـەتی کەسـێکی گەوجی ساویلکە، کە بە خوتو خۆڕایی خۆی لێبووە بە ئەرستۆ و، ڕوودار و ڕوو قایم، زەڕەیەک گومانی لە خۆی و گوایە لە بە هرەی خۆی نییە، کـردووە بـە نمـوونە و بـە شـێوەیەکی یـەجگار جـوان و هونەرمەندانـە، لـە کەسـێتی بـەرچاوی "لیوتینـان پروگـوڤ" * دا بەرجەسـتەی کـردووە. ئـەم پیرۆگۆڤە زەڕەیـەک گومـانی لـە بلیمـەتی خـۆی نییـە، نـەک هـەر خـۆی بـە بلیمـەت دەزانـێ، بـەڵکو خـۆی لـە بلیمـەتیش پـێ زیـاترە و خـۆی بـە هـیچ بلیمەتێک ناگۆڕێتەوە. ئەوەندە لە خۆی دڵنیایە، ئەوەندە لە خۆی ڕازیـە، کە هەرگیز ڕێ بە خۆی نادات، کە سووکە گومانێکیش لە بلیمـەتی خـۆی بکات. سـەرەنجام گۆگـۆڵ، نووسـەری مـەزن، ناچـار دەبـێ وەکـو سـزایەک وەژێـر شەلاقانی بخات تا هەستی ئەخلاقی بریندار بووی خوێنـەر سـاڕێژ بکاتەوە، بەڵام کە دەبینێ ئـەم سـزایە کـارێکی ئەوتـۆ لـە قارەمانەکـەی ناکـات و، خێـرا هەڵدەستێتەوە و خۆی دەتەکێنێ و دەسـت بـە خـواردنی پارچەیـەک شـیرینی دەکـات تـا هێـزی وەبـەر بێـتەوە، ئیـدی نووسـەری گەورەش هیچـی بـۆ نـامێنێتەوە تـەنیا ئەوە نـەبێ کـە لـە سەرسـامیدا شـانەکانی هەڵتـەکێنێ و بەو جۆرە ببێ بـە شـەریک شعوری خوێنـەرەکانی. من هەمیشـە خەفـەتی ئەوەم خواردووە کە گۆگۆڵ، ئەو پلەو پایە بچووکـەی بـە پیروگـوڤ داوە، چونکە پیرۆگـۆڤ، بـە ڕادەیـەک لـە خـۆی ڕازیـە، زۆر پێـی ئاسـاییە – بـە خـەیاڵی تەرفیعی بەرەبـەرە و زیـادبوونی نیشـانەکانی سەرشـانی، بەگوێرەی سـاڵانی خزمـەت- بـە خـەیاڵ، خـۆی بـە فەرماندەیـەکی سـوپایی زۆر مـەزن بزانێـت. ئەوە چـیم گـوت؟ بـە خـەیاڵی چـی؟ بـەڵکو وەکـو حەقیقـەتێکی ڕاسـتەقینە باوەڕی پێی هەبوو: ئەوێک کە گەیشتووەتە پلەی جەنەڕاڵی، لـەچی کەمـە، تـا نـەبێ بـە فەرماندەیـەکی مـەزن؟ چمـا ژمـارەی ئەو پیرۆگۆڤانـەی کـە لەو دواییانەدا لە مەیدانی جەنگدا، شکستیان هێناوە و بە زیوون کەمـە؟ چمـا لەو بابەتـە پیرۆگوڤانـە لـە نـاو ئـەدیبان و زانایـان و میـدیاکارانی ئێمـەدا کـەم

هەبوون؟ نەک هەر کەم نەبوون، بەڵکو ئێستاش هەن!...

گـاڤریلا ئـاردالیونوفیچ ئیڤـولگین، کـە یەکێکـە لـە قارەمانـانی ئـەم ڕۆمانەمان، سـەر بەدەستەی دووەمە "ئەوانـەی کە لـە زۆربەکە زیرەکتر و بەهۆشوگۆشترن" بۆیە تینو و تامەزرۆی ئەوە بوو، جۆرە دەنگ و ڕەنگ و پێگەیەکی دیار وبەرچاوی خۆی هەبێت. وەکو پێشتر ئاماژەمان کردێ ئەم دەستەیە، لە دەستەی یەکەم ناشادترن. هۆیەکەشی ئەمەیە کە ئەو مرۆڤە "ڕەمەکیە"یەی جۆرە "زیرەکیەکی" تیایە ئەگەر لە هەندێ هەلومەرجا "یان بە درێژایی تەمەن" لە دڵی خۆدا، خۆ بە بلیمەت و گەورەش بزانێ، ئەوا کرمی گومانێک سـەری ژەندووەتـە نـاخی و لـە نـاوەوە کرمێـی دەکـات و بـەرە و زەلکـاوی نائومێـدی تەواو هـەڵی دەدێـرێ. وەختـێ دان بەوەدا دەنێـت، کـە هەستی غرووری پەنگاوە، غرووری چەپێنرا و لـە نـاوەوە ژاراوی کردووە. دیـارە ئەمـە دەرهـەق بـە خەڵکـە تونـدڕەوەکانی ئـەم دەسـتەیەوایە. ئـەگینا چارەنووسی زۆربەی خەڵکانی سـەر بـەم دەستەیە، بەو شـێوە کارەسـاتاویە کۆتایی نایەت، بەڵام ئەوەندە هەیە کە لەگینە لـە ئاخر و ئۆخری تەمەنیاندا تووشی نەخۆشی بەد هەرسی و جگەر ببن، هەموو عەزابەکەیان دێتە سـەر ئەوە. ئەوانـە، وێـڕای ئەمـەش، بـەرلەوەی کـۆڵ بـدەن و دابمـرکێنەوە، لـە تەمـەنی گـەنجیەوە تـا تەمـەنی خـەملّین و پوختـە بـوون، کـەرێتی لـە دوای کـەرێتی دەکـەن و هانـدەری سەرەکیشـیان بـۆ ئـەم کـەرێتی و گەوجێتییـە، هەوڵـی بـە دەسـتهێنانی ڕەسـەنایەتی و ئـارەزووی دەرکەوتـن و خـود سەلماندنەو، لەپێناوی ئەمەدا زۆر کارو کردەوەی سـەیرو سـەمەرە دەبینین. ڕەنگە پیـاوێکی پیاوانـە، بـە حـەیاو حورمـەت و ئابڕومەنـد، هەنـدێ جـار بـە ناوی ئەساڵەتخوازیەوە لەپێناوی شۆرەت و پێگەی کۆمەڵایەتیدا پەنا وەبەر کارێن زۆر سووک و قێزەون بەرێت. هـەروەها ڕەنگە ڕێبکەوێ کە هەندێ لـەم نەگبـەت و بێ بەختانـە (نـەک هـەر ئابڕوومەند، بەڵکو زۆر دڵاواش بن، سەرپەرشتی کەسوکاری خۆ بکەن، دەستیان پێیانەوە بێ، بە ڕەنجی شـان بەخێویان بکـەن، نـەک هـەر چاویـان لـە کەسـوکاری خۆیـانەوە بێ، بـەڵکو بێگانەش بە خێو بکەن.) تا دوا هەناسە ئارامی ڕوحی و دەروونی بە خۆوە





نەبینن! ئەوانە بەم کارەی خۆیان، کە بەو ڕێکوپێکییە ئەنجامی دەدەن، نە ئارامی دڵ و نە ئاسودەیی ویژدان بەدەست ناهێنن. بەپێچەوانەوە، کە بیر لەم وەزیفە ناسیەی خۆ دەکەنەوە، پشم و غەزەب دایان دەگرێت. ئەو جۆرە پیاوە لە دڵی خۆدا دەڵێت: "ژیانی خۆم لەسەر ئەوە دانا! ئەوە بوو کە دەست و پێی بەستمەوە، نەیهێشت من بارووت دابهێنم یان ئەمریکا کەشف بکەم. ئەگەر ئەو ئەرک و ئیلتزاماتە نەبوایە دوور نەبوو باروت دابهێنم یان ئەمریکا کەشف بکەم. نازانم دەمتوانی چی کەشف بکەم، بەڵام گومانی تیا نییە شتێکم هەر کەشف دەکردا "

ئەوانە بە خۆشیان بە درێژایی تەمەنیان، نازانن چ بە هرەیەکی کەشفکاریان تێدایە و دەبێ چی کەشف بکەن، بەڵام هەمیشە چاوەڕوانی ئەوەن سبەینێ شتێک کەشف بکەن! باروت بێ یان ئەمریکا! بەڵام تاسە و ڕەنجی وان بۆ وەدی هێنانی ئەم کەشفە، هیچی لە هی کەسێکی وەکو کولومب یان گالیلێ کەم نییە.

گاڤریلا ئاردالیونوفیچ، ڕێبواری هەمان ڕێگا بوو لە ڕاستیدا لە سەرەتای ڕێگادا بوو و ساڵانێکی زۆری لەپێش بوو تا خەیاڵ بەو هیواو ئومێدە هەڤدژانەوە لێبدات. هەر لە منداڵی و مێرد منداڵیەوە، زۆری لە دڵ گران بوو کە کەسێکی ڕەمەکی و ئاساییە، هەموو ئاواتێکی ئەوە بوو کە قەناعەت بە خۆی بێنێ گوایە کەسێکی بە شەخسیەت و سەربەخۆ و بە هرەمەندە. گەنجێک بوو بەغیل، پڕ ئارەزوو، تینوو وتامەزرۆی ناو و ناوبانگ. زۆر جار بە هەڵە ئەم تاسەمەندی و ئارەزووە توندەی لێدەبوو بە هێز و توانامەندی و بە هرەداری و ئامادە بوو لەپێناوی ناو و ناوبانگدا، تەنانەت پەنا وەبەر کاری شێتانەش بەرێت، بەڵام کەوەختی کار دەهات و سەردەهاتە سەر ڕاستی، هەمیشە ئەقڵ و زیرەکی ڕێگەی پێدەگرت و نە یدەهێشت بڕیار بدات. ئەمە دووچاری نائومێدییەکی کوشندەی دەکرد. خۆ ئەگەر دەرفەتی بۆ لوابا لەوە بوو لەپێناوی وەدیهێنانی ئەم خەون یان ئەو خەونیا، پەنا وەبەر سووکترین کردەوە بەرێت، بەڵام کە سەر دەهاتە سەر ڕاستی و وەختی بڕیاردان، هەستی ئابڕومەندی لە ناخیا دەوروژا و بە





سەریا زاڵ دەبوو، بەکردەوە دەیسەلماند کە لەوە پیاوتر و ئابڕوومەندترە، پەناوەبەر هەر کارێکی سووک و بچووک بەرێت (لە لایەکی ترەوە، لە ڕاستیدا هەمەیشە ئامادەبوو مل بۆ هەر وردە خوێڕاتیەک بدات). بە چاوی نەفرەت و بێزارییەوە دەیڕوانییە هەژاری و بێنەوایی و داڕوخانی خانەوادەکەیان. خۆی لەوان بە گەورەتر دەزانی. تەنانەت بە لووتبەرزیەوە مامەڵەی لە تەک دایکیشیا دەکرد. هەرچەندە زۆرچاک دەیزانی کە بە هۆی خۆشناوی و سەلاری و سەنگینی دایکییەوە ئەم ژیان و کارەی ئێستای بۆ ڕەخساوە. هەر کە بوو بە کارگەری خانەوادەی یەپانچین، یەکسەر لە دڵی خۆیدا گوتی: "ئەگەر هیچ چارێک نەبێ و، پیاو بیەوێ و نەیەوێ، دەبێ کاری سووک بکات، پێویستە بە تەواوەتی ملی پێوە بنەم، بە مەرجێ سوودێکی منی تیا بێ! " هەڵبەتە هەرگیز بە تەواوەتی ملی بە کاری سووکەوە نەدەنا، بەڵام بۆچی پێشوەختە ئەوەی خستبووە مێشکی خۆیەوە کە دەبێ کاری سووک و نزم بکات؟ هەڵبەتە ئاگلایا کە ڕەفزی کردبوو، ترسێکی خستبووە دڵیەوە، بەڵام گانیا هێشتا هەر چاوی لە کیژێ بوو، بە تەواوەتی دەستی لێنەشۆرد بوو. هەر بەتەما بوو ڕۆژێ لە ڕۆژان، بە ڕێکەوت بەخت ڕووی تێ بکات. هەرچەندە قەت لەو باوەڕەدا نەبوو کە ئاگلایا، دڵی نەرم بێ و جوابێکی بە خێری بداتەوە یان ڕوویەکی خۆشی بداتێ.

پاشان، لەو ماوەیەدا کە بەتەمای ناستاسیا فیلیپوڤنا بوو، لەپڕ گەیشتبووە ئەو قەناعەتەی کە پارە هەموو شتێکە، بەپارە دەگەیە "هەموو شتێک". لەو سەرو بە ندەدا ڕۆژ نەبوو، بە غرووریکی نیگەرانی ئامێزەوە لە خۆی نەپرسێت: "ئەگەر قەرار بێ کاری سووک بکەم، با بەتەواوەتی بیکەم. گۆم تا قووڵ بێ مەلەی خۆشە! " هەمیشە بەوە خۆی هان دەدا کە: "خەڵکی ئاسایی لەم حاڵانەدا، دەترسن، سڵ دەکەنەوە، بەڵام من کۆ لە هیچ ناکەمەوە! " بەڵام کاتێ لە ئاگلایا نائومێد بوو، بە ڕادەیەک ورەی ڕوخا و ئومێد بڕبوو، ئەو پارەیەی، کە ژنێکی شێت و شور دابووویەوە بە سەرو چاویاو بە خۆی لە پیاوێکی لەو شێت تری وەرگرتبوو، هەڵگرت و هێنای

بۆ میرزادە، بەڵام دوای ئەوە هەزار و یەک جنێوی سەر بە کوڵکە و مزری بە خۆی داوە کە بۆ ئەو پارەیەی گەڕاندووەتەوە. هەرچەندە لە ناخی خۆیدا ستاییشی ئەو هەڵوێستەی خۆی دەکرد. ئەم کوڕە بە درێژایی ئەو سێ ڕۆژەی کە میرزادە لە پترسبۆرگ بوو، لە یەکبینە گریاوە، بەڵام لە ماوەی ئەو سێ ڕۆژەدا لە میرزادەش بێزار بوو، ڕقی لێهەڵگرت، چونکە میرزادە کە دیتبووی " ئەو پارە مۆڵەی گێڕایەوە" بە چاوی بەزەییەوە تەمەشای کردبوو، " لەکاتێکا کەم کەس کاری وای لە دەست دێ."

بەڵام لە دڵی خۆیدا دانی بەوەدا دەنا کە هۆی سەرەکی ئەو هەموو پەژارە و نیگەرانییەی، برینداربوونی بەردەوامی غیرەت و کەرامەتیەتی، کە ئەم هەستە زۆری ئازار دەدا. دوای ماوەیەکی زۆر ئەوسا پەی بەوە برد و بۆی دەر کەوت کە دڵبەندی وی بە مرۆڤێکی سەیر و پاک و بێگەرد و بێ ڕیای وەکو ئاگلایا چ ئاقیبەتێکی ترسناکی بۆ ئەو دەبێت. هەنگێ پەشیمانی وەکو مۆرانە دایە دڵ و دەروونی، وازی لە کارەکەی هێنا و لە خەم و پەژارەیەکی قووڵا نقووم بوو.

دەگەڵ دایک و باوکیا، لە ماڵی پتیتسن و بە خەرجی ئەو دەژیا. وێڕای ئەوەش بێزاری و ڕقی خۆی لە پتیتسینی زاوایان نە دەشاردەوە، بەڵام بە قسەشی دەکرد، ئەوەندەی ئەقڵ هەبوو، هەمیشە پرس و ڕاوێژی پێ بکات. ئەوەی لە هەموو شتێک پتر، لە پتیتسنی پەست و تووڕە دەکرد، ئەوە بوو کە پتیتسن تەماحی ئەوەی نەبوو، ببێ بە کەسێکی وەکو ڕوچیلد، یانی ئەو بەرزەفرییەی نەبوو ببێ بە ڕوچیلدێکی دی. " ئەگەر قەرار بێ سووتخۆری بکەی، تا سەر ئێسقان سووتخۆربە، مشتەریەکانت بگوشە، شیلەی ڕوحیان بگرە، خوێنیان بمژە، دایان بدۆشە، وەکو پاشایانی جولەکە بە! "

پتیتسن، پیاوێکی خاکی، بێوەی و لاشەڕ بوو، کە گوێی لەو قسانە دەبوو، تەنیا بزەیەکی بۆ دەکرد و هیچی دی نەدەگوت، بەڵام جارێکیان هەستی کرد زۆر زەرورییە بە ڕاشکاوی قسە دەگەڵ گانیادا بکات و گەنگەشە و گفتوگۆیەکی جیددی دەگەڵ بکات، زۆر بە هێمنی و نەرم و نیانی و نەزاکەتەوە ئەو کارەی کرد. بۆ گانیای ڕونکردەوە و سەلماندی کە

خۆی لە هیچ کارێکی نامەردانە و ناشەریف نادات و، پێویست ناکات گانیا، ئەو "واتا پتیتسن" بە پاشای جولەکە بشوبهێنێ. بەرزی فایدە و سووی پارەش لە ئەستۆی ئەو نییە. هیچ غەلوغەشێک لە مامەڵەی ئەودا نییە و ئەو تەنیا دەوری وەسیت دەبینێ لەم مامەڵەیەدا. ئیدی بە هۆی ئەوەوە کە بابایەکی خۆش مامەڵە و سەر ڕاست و بەوەعدە، لە ناو خەڵکی بەڕێز و ناسراودا بە شۆرەت و ناوبانگێکی باش و فرەی پەیدا کردووە و کارەکەی ڕەواجی پەیدا کردووە و برەوی سەندووە. بەدەم زەردەخەنەوە دەیگوت: "نەدەبم بە ڕۆچیلد و نە پێویستم بەوەیە ببم بە ڕۆچلید، بەڵام ڕەنگە لە شەقامی لیتانیادا ببم بە خاوەنی خانوویەک یان دوان و ئەوەندەم بەسە!" و لە دڵی خۆیدا دەیگوت: "کێ چوزانێ؟ لەوەیە ببم بە خاوەنی سێ خانووش" بەڵام قەت باسی ئەوەی نەدەکرد و وەکو نهێنییەک لە دڵی خۆیدا پاراستبووی. تەبیعەت ئەم جۆرە، خەڵکانەی بە دڵە و یارمەتیان دەدات، بێگومان یارمەتی پتیتسن دەدات، بە بەختی ئەو دەگەڕێت. نەک سێ خانوو بگرە چواریشی پێ دەدات، چونکە هەر لە منداڵیەوە لەوە دڵنیا بووە کە هەرگیز نابێت بە ڕۆچیلد، بەڵام تەبیعەتیش لەوە زیاتری ناداتێ، هەر چوار خانووی دەداتێ و تەواو، هەموو سەروەت و ساماناکەی لە چوار خانوو تێناپەڕێت.

خوشکەکەی گاڤریلا ئاردالیونوفیچ، تەبیعەتێکی جیاوازتری هەبوو، ڕاستە ئەویش ئارەزووی گەورە و بەرزەفڕی خۆی هەبوو، ئارەزووەکانی ئەو ستراتیژی بوون نەک هەنووکەیی و سەرکێشانە و هەوسارپچڕیوو. ڤارڤارا ئاردالیونوفیچ، کەسێکی وریاو بە ئاوەز بوو لە بە ڕێوەبردنی کاروباراندا، کە دەستی بدایەتە کارێک، بە نیوەچڵی بەجێی نەدەهێشت. تا تەواوی نەکردبا وازی لێنەدەهێنا. ئەلهەقی ئەویش یەکێک بوو لەو خەڵکە ڕەمەکی و عەوامانەی کە خەوی بە شۆرەت و دەرکەوتن و خۆنوێنییەوە دەبینی، بەڵام هەر زوو هەستی بەوەکرد کە هیچ بەهرەیەکی داهێنانی تیا نییە، هەڵبەتە زۆریش بەمە خەمبار نە بوو، بە ڕادەیەک کە خەم لە خۆی باربکات و دنیای لێ ببێ بە چەرمی چۆلەکە. کێ دەڵێ ئەوەش خۆی لە

خۆیدا زادەی جۆرە غروور خۆ بەزلزانیەک نەبووە؟ بە عەزمی جەزمەوە یەکەم هەنگاوی عەمەلی خۆی ناو شووی بە پتیتسن کرد، بەلام لەو بۆنەیەدا بە خۆی نەگوت: " کە کاری سووک زەروری بێ، بۆ نەیکەم، بە مەرجێ بمگەیەنێ بە مەرامی خۆم" وەکو گاڤریلا ئاردالیونوفیچی برای کە ئەگەر بکەوتایەتە حاڵەت و هەڵوێستێکی واوە بێگومان ئەوەی دەگوت. "وەکو چۆن لە ڕاستیدا کاتێ وەکو برا گەورە، ڕەزامەندی لە سەر شووکردنی خوشکەکەی بە پتیتسن دا، شتێکی لەو بابەتەی گوت". ئەمە جگە لەوەی ڤارڤارا ئاردالیونوڤنا، وەختێ بڕیاری شووکردنی داو شووی کرد، کە دڵنیا بوو، مێردی ئایندەی پیاوێکە خاکی، خۆشتەبیعەت و سازگار، نیمچە ڕۆشنبیر و هەرگیز کاری ناشەریف و سووکی گەورەی لێناوەشێتەوە، بەلام سەبارەت بە کارێ قۆڕ و تورەهاتی بچووک، گرینگ نییە، لە هەموو شوێنێ هەیە و کێ دەتوانێ لێی دەرباز بێ؟ مەرج نییە پیاو بگاتە بەها باڵا ئایدیالەکان! ڤارڤارا ئاردالیونوڤنا، سەرباری ئەوەش دەیزانی کە شووکردنەکەی پەناگایەک بۆ دایکی، باوک و براکانی فەراهەم دەکات. کە لێقەوماوی و بەد بەختی براکەی بینی، وێڕای ناکۆکی و ناتەبایی پێشووتری خانەوادەییان، لێبڕا یارمەتی بدات. هەندێ جار پتیتسن، هەڵبەتە بە شێوەیەکی دۆستانە، گانیای هان دەدا کە کارو وەزیفەیەکی حکومەتی فەرمی بدۆزێتەوە. هەندێ جار بەسوعبەتەوە پێی دەگوت: "ڕاستە تۆ حەز لە جەنەڕاڵ و پایەی جەنەڕاڵی ناکەی، بەلام تۆ دیقەت بدە، هەر هەموویان لە ئەنجاما دەگەنە پلەو پایەی جەنەڕاڵی. کەسێ نەمرێ بە چاوی خۆت دەیبینی! " گانیا لە دڵی خۆیداو بە تەوسەوە دەیپرسی: "باشە ئەمانە لە خۆیانەوە چوزانن من لە جەنەڕاڵان و ئەو جۆرە کەسانە بێزارم و ڕقم لێی انە؟."

ڤارڤارا ئاردالیونوڤنا، لێبڕا، بۆ ئەوەی کۆمەکی برایەکەی بکات، سنووری چالاکی و کاریگەریەکانی خۆی فراوانتر بکات. بە هەنجەت و بیانووی بیرەوەری سەردەمی منداڵییەوە کەوتە هاتوچۆی ماڵی یەپانچین، چونکە ڤارڤارا و براکەی، هەر دووکیان، بە منداڵی هاوبازی کیژەکانی

یەپانچین بوون. هەڵبەتە پێویستە لێرەدا ئەوە لە بەرچاو بگرین کە ئەگەر مەبەست و ئامانجی هاتوچۆی ڤارڤارا بۆ ماڵی یەپانچین، خەون و خەیاڵێکی نا ئاسایی بوایە، ناچار دەبوو یەکسەر خۆی لەو دارو دەستەیە جیا بکاتەوە کە خۆی بە یەکێک لەوان دەزانی و تێکەڵاویان بووبوو، بەڵام ڤارڤارا دووی خەون و خەیاڵ نە کەوتبوو. بەڵکو هاتوچۆیەکەی بۆ ماڵی یەپانچین بەگوێرەی حیساب و لێکدانەوەیەکی زیرەکانە بوو، بۆ ئەوە بوو تەبیعەت و چۆنیەتی ژیانی ئەم خێزانە بزانێت. ڤارڤارا، زۆر بەوردی زەینی تەبع و تەبیعەت و ڕەفتارو هەڵسووکەوتی ئاگلایای دا، ئەوجا کەوتە هەوڵی ئەوەی ئەو جووتە، برایەکەی و ئاگلایا لە یەکدی نزیک بکاتەوە. پێدەچوو لەم بارەیەوە جۆرە سەرکەوتنێکی بە دەست هێنابێ. لەوەش دەچوو هەڵسەنگاندنی بۆ براکەی هەڵەبێ، چونکە گانیا هەرگیز و بە هیچ شێوەیەک توانای ئەنجامدانی ئەو کارانەی نەبوو، کە ڤارڤارا لێی چاوەڕوان دەکرد.

بەهەرحاڵ، ڤارڤارا لە ماڵی یەپانچیندا، لێزانانە دەوری خۆی دەبینی: چەندین هەفتەی بەسەر برد بێ ئەوەی، کەم و زۆر لەبەردەم ئەواندا ناوی براکەی بێنێ، هەمیشە سەلار و سەنگین، ڕێزی خۆی دەگرت، ڕەفتاری سادە و ئاسایی و خۆیی بوو. ڤارڤارا ئاردالیونوڤنا، ترسی ئەوەی نەبوو، بەویژدانی خۆیدا بچێتەوە، چینەی لێ بکات و هەڵی بداتەوە، چونکە هیچ شتێکی خراپی تیا نەبوو کە مایەی لۆمەکردن و سەرزەنشتی خۆی بێت، ئەمە خۆی لە خۆیدا، هێزێکی مەعنەوی گەورە بوو بۆ وی، تاقە گلەیی لە خۆی ئەوە بوو کە هەندێ جار ڕوکونی و بوغزن بووە. ئەویش غرورو کبریایەکی بریندارو پێشێل کراوی هەبوو، هەندێ جار، بە تایبەتی ئەو کاتانەی لە ماڵی یەپانچین وەدەردەکەوت، ئەو حاڵەتەی بە زەقی لە خۆیدا دەبینی.

وا ئەم جارەش، وەکو گوتمان، خەمبار و پەشێو، بێحەواس و دڵتەنگ، لە ماڵی یەپانچین دەگەڕایەوە و ماکی تەوسێکی تاڵ و ناخۆش، نیشتبووە سەر سیمای.

پتیتسن لە پاڤلوڤسکدا، لە خانوویەکی تەختەی ناشیرین، بەڵام گەورەدا

دەژیا کە کەوتبووە سەر خیابانێکی خاکی، بە تەپوتۆزو، بەو زوانە دەبوو بە موڵکی خۆی، لە ئێستاوە ئامادەبوو بیفرۆشێت. ڤارڤارا ئاردالیونوڤنا، کە بە قاڵدرمەکانی بەردەرگادا سەردەکەوت. گوێی لێ بوو لە قاتی سەرەوە دەنگی غەڵبە غەڵب و هەراو هەنگامەی گەنگەشە و موناقەشەیەکی توند دەهات. یەکسەر دەنگی هەراو زەنای برا گەورەکەی و باوکی خۆی ناسییەوە. کە خۆی بە هۆڵەکەدا کرد، سەیری کرد گانیا بە ناو هۆڵەکەدا دێ و دەچێت، لە تورەییدا ڕەنگی بووە بە جاوی سپی، چیوای نەماوە بکەوێتە ڕنینەوەی قژی خۆی، کە ئەم دیمەنەی بینی، ڕووی گرژ بوو، شەکەت و ماندوو، سەراپا داهێزراو، بێ ئەوەی کڵاوەکەی دابکەنێ، بە سەر تەختێکدا داڕوخا. دەیزانی ئەگەر یەک دوو دەقیقەی دی بەو بێدەنگییەی بمێنێ و لێی نەپرسێت ئەم بەزم و ڕەزمە چییە و بۆچی بەو شێوەیە بە هۆڵەکەدا دێ و دەچێت، بێگومان براکەی لەوێش تورە دەبێت. بۆیە بەلەز پرسی:

- هەمان تاس و حەمامەکەی جارانە؟

گانیا هاواری کرد:

- هەمان تاس و حەمام؟ نەخێر... هەمان تاس و حەمام نییە. ئەمەیان بەزمێکی دیکەیە! پیرەمێرد هار بووە، بە تەواوەتی شێت بووە، دایکە لە یەکبینە دەگری، ئەوەندە گریاوە خەریکە چاوی دێنە دەرەوە. ڤاریا، تۆ کەیفی خۆتە، چی دەڵێی بڵێ، بەڵام من لەم ماڵە دەری دەکەم، فرێی دەدەمە دەرەوە...

وەکو بڵێی لەپڕ بیری کەوتەوە کە ئەم ماڵە ماڵی خۆی نییە و بۆی نییە کەس لە ماڵێک بکاتە دەرێ کە ماڵی خۆی نییە، لە سەری ڕۆیشت:

- یان من دەڕۆم.

ڤاریا لەبن لێوانەوە گوتی:

- پێویستە سەبر و حەوسەڵەت هەبێ.

گانیا گڕی گرت:

- سەبر و حەوسەڵەی چی؟ سەبرو حەوسەڵە لەگەڵ کێدا؟ سەبر و





حەوسەڵە بەرانبەر قوڕیاتەکانیم؟ نا، نا تۆ چی دەڵێی بیڵێ... لە تامی دەرکرد، مەحاڵە، مەحاڵە، شتی وا مەحاڵە! .. تۆ تەمەشا، هەرچی کارو کردەوەی هەیە هەر هەمووی هەڵەیە، خەتا خەتای ئەوە و هێشتا ئەو هاوار دەکات: "من لە دەرگاوە نایەمە ژوورێ... دیوارەکە بروخێنن! "، بەڵام ڤاریا چیتە؟ زۆر گرژ و پەست دیاری!

ڤاریا بە تورەیی بەرسڤی دایەوە:

- گرژ و پەست نیم، وەکو هەمیشەم.

گانیا بە دیقەتێکی زیاتر لێی ڕاماو لەپڕ پرسی:

- لەوێ بوویت؟

- بەڵێ.

- دەقیقەیە سەبرکە! دیسان دادو بێداد بەرزبووەتەوە. چ شەرمەزاریەکە! لەم کاتەشا!

- لەم کاتەشا؟ ئەم کاتە جیاواز نییە لە هیچ کاتێکی دی.

گانیا، بە دیقەتێکی پترەوە، لە خوشکەکەی ورد بووەوە و پرسی:

- هیچیت زانی؟

- هیچ شتێکی چاوەڕوان نەکراوم نە زانی. ئەوەم زانی کە هەموو قسە و باسەکان دروستن. قسەی مێردەکەم لە قسەی هەر دووکتان دروست تر بوو. مەسەلەکە ڕێک بە هەمان شێوە دەرچوو کە ئەو لە سەرەتاوە پێشبینی کردبوو هەنوکە خۆی لەکوێیە؟

- چووەتە دەرێ.

- باشە چی ڕووی داوە؟

- میرزادە، بە فەرمی داخوازی کردووە. شتەکە بڕاوەتەوە. خوشکە گەورەکانی پێیان گوتم. ئاگلایا ڕازی بووە. شتەکە لە کەس ناشارنەوە (پێشتر هەموو شتێک نهێنی بوو) زەماوەندەکەی ئادیلایدش دواخراوە، تا هەر دوو زەماوەندەکە لە یەک ڕۆژدا ئەنجام بدرێن. چەند شاعیرانەیە! بە ڕاستی ئەمە شیعرە! من پێم باشە، لەجیاتی ئەوەی خۆت شپرزە بکەیت و بە خۆڕایی بە هۆڵەکەدا بێیت و بچیت، شیعرێکی پیرۆزبایی بە بۆنەی ئەم

زەماوەندەوە بهۆنیتەوە. ئەم ئێوارەیە "دۆتمیر بیلوکوفسکایا"ش دەگاتە جێ. خــەڵکی دەعــوەت دەکــەن و ئاهــەنگ دەگێــڕن و میــرزادە بــە دۆتمیــر بیلوکوفسکایا دەناسێنن، ئەگەر چی ئاشنایەتیشیان هەیە. پێم وایە لەم بۆنەیەدا، هەواڵی خوازبێنیەکە ڕادەگەیەنن، بەڵام ترسی ئەوەیان هەیە کاتێ میرزادەوەژوور دەکەوێ و چاوی بەو قەرەباڵغی و هەموو میوانە دەکەوێ، شتێک بڕێژێ یان بشکێنێ یان خۆی درێژا و درێژ بکەوێتە سەر عاردی و لە هۆڵەکەدا تەخت بێت: شتی وا لەو دوورنیە. گانیا، زۆر بەوردی گوێی بۆ ڕادێرا، بەڵام خوشکەکەی زۆری پێ سەیر بوو، ئەم هەواڵە ناخۆشە کە دەبوا تووشی شۆکی بکات، بە ڕواڵەت هیچ کارێکی تێنەکرد.

گانیا، دوای سووکە ڕامانێک گوتی:

– بەڵێ... شتەکە دیار بوو...

ئەوسا لە کاتێکدا بە گۆشەی چاو دەیڕوانییە خوشکەکەی، بەدەم بزەیەکی غەریبەوە، بە شێوەیەکی ئارامتر کەوتەوە هاتوچۆ بە هۆڵەکەدا و گوتی:

– ئاوها! کەواتە تەواو، هەموو شتێک بڕایەوە!

ڤاریا گوتی:

– زۆرم پێ خۆشە کە مەسەلەکە بە مجۆرە فەیلەسوفانەوەر دەگریت. بە ڕاستی ئەمەم پێ خۆشە.

– بەڵێ، لەم مەسەلەیە ڕزگار بووین، بەلای کەمەوە تۆ...

– پێم وایە من بەو پەڕی دڵسۆزی و ڕاستگۆیی خزمەتم کردیت، بێ ئەوەی موناقەشەم کردبێت یان بێزارم کردبێت، هەرگیز لێم نەپرسیت، بەتەمای چ خۆشبەختیەکی دەگەڵ ئاگلایادا.

– پێت وایە من.. بەتەمای ئەوە بووم دەگەڵ ئاگلایادا بەختەوەر ببم؟

– بەسە، تکایە لەسەری مەڕۆ. نە دەوری فەیلەسوف ببینە و نە فەلسەفەڕێسی بکە! ئاشکرایە کە بەتەمابووی. تازە ڕۆیشت. خەڵەتاین. لێتی ناشارمەوە کە من قەت ڕۆژێ لە ڕۆژان ئەم مەسەلەیەم بە جیددی نەزانیوە. زیاتر لەبەر خاتری تۆ و پشت بە تەبعی سەیرو غەریبی ئاگلایا،

وەکو "جەڕباندنی بەخت" بە مەسەلەکەوە چووم. دەنا، دەمزانی ڕێژەی سەرنەگرتن و ناکامی ئەم مەسەلەیە بەلای کەمەوە لەسەدی نەوەدە. هەڵبەتە بە ئێستاشەوە حاڵی نەبووم کە تۆ بەتەمای چی بوویت؟

- ئێستا تۆ و مێردەکەت هانم دەدەن کە کارێک، وەزیفەیەک بدۆزمەوە، دەتانەوێ وەزیفەیەکی حکومەتی بدۆزمەوە، ئامۆژگاریم دەکەن کە کۆڵنەدان و سەبر، ویست و ئیرادە زۆر باشە، مرۆڤ دەبێ بەشتی کەمیش ڕازی بێ، لە شتی بچووکەوە دەست پێ بکات و، زۆر ئامۆژگاری تری لەم بابەتە... ئەوەندەتان گوتووەتەوە، هەر هەموویم ئەزبەر کردووە!...

گانیا بەدەم ئەو قسانەوە لە قاقای پێکەنینی دا.

ڤاریا لە دڵی خۆیدا گوتی: "وا دیارە نەخشەیەکی تازەی لە مێشکایە!

گانیا لەپڕ لێی پرسی:

- ئەدی داک و بابی چۆن تەمەشای مەسەلەکەیان دەکرد؟ خۆشحاڵ بوون؟

- نا، لەوە نەدەچوو زۆر خۆشحاڵ بن. بەهەرحاڵ بە خۆت دەتوانی حوکم لەسەر ئەو شتە بدەیت. ئیڤان فیودوروفیچ ڕازیە، بەلام دایکی دوو دڵە، دەترسێت. هەموو دەزانن کە جاران گاڵتەی بەوە دەهات کە میرزادە خوازگاری کیژەکەی بکات و ببێ بە زاوایان.

- مەستم ئەمە نەبوو. ئاشکرایە میرزادە خوازگارێکی گونجاو نییە، خوازگارێکە ئەقڵ نایبڕێ کە ئەمە خوازگار بێت. من مەبەستم وەزع و حاڵی ئێستایە: گەییونەتە کوێ؟ ئایا کیژێ بە فەرمی گفتی داوە؟

- تا ئێستا نەیگوتووە "نا". هەر ئەوەندە و بەس. بەهەرحاڵ لەوەی پتر چاوەڕوانی هیچی دی لەم کیژە ناکرێت. بە خۆت نازانی چەند شەرمن و کەم ڕووە! بە هۆی شەرمنی خۆیەوە چەند کاری سەیر و غەریبی دەکرد! بە منداڵی دوو سێ سەعات خۆی لەوچخانەکەیاندا دەشاردەوە، تەنیا بۆ ئەوەی میوانان نەی بینن، ڕاستە بە جەستە گەورە بووە، ژنێکی گەورە و تەواوە، بەلام ڕەفتار و تەبیعەتی نەگۆڕاوە، هەر منداڵەکەی جارانە. دەزانی هەستدەکەم لەوە دەچێ شتێکی نا ئاسایی لە ئارادا هەبێ، پێناچێت

مەسەلەکە لای کەسیان، تەنانەت لای کیژێش جیددی بێت. دەڵێن لە بە یانیەوە تا ئێواریّ، گاڵتە بە میرزادە دەکات، پێی ڕادەبوێریّ، بۆ ئەوەی هەستی ڕاستەقینەی خۆی بشارێتەوە، بەڵام دڵنیابە کە هەموو ڕۆژیّ دەرفەتێک پەیدا دەکات تا بەدزییەوە شتێکی بە گوێدا بچپێنی، چونکە میرزادە ئەوەندە ڕووی گەش و کەیفی قنجە، لە تۆ وایە بە ئاسماندا دەفڕیّ!... دەڵێن بابایەکی مەخسەرەیە! ئەم قسەیەم لە خۆیان، لە کچەکان بیستووە، ئەوەشم بۆ دەر کەوت کە هەر دوو خوشکە گەورەکە، بە ئاشکرا گاڵتە بە من دەکەن و پێم ڕادەبوێرن.

ئەنجام گانیا، ڕووی گرژبوو، برۆکانی وێکهێنانەوە. لەوە دەچوو ڤاریا بەئانقەست درێژە بەم باسە بدات، تا بیری براکەی کەشف بکات و بخوێنێتەوە، بزانیّ چی لە مێشکایە، بەڵام هات و هاوار و مشتومڕ لە قاتی سەرەوە دەستی پێکردەوە. گانیا، وەکو ئەوەی بۆ کەلێنیّ بگەڕیّ کە ڕقی خۆی لێوە هەڵبڕێژیّ، هاواری کرد و گوتی:

- دەری دەکەم. هەر ئێستا دەچم دەری دەکەم.

- هەنگیّ دەڕوات گازاندەمان لیّ دەکات، گلەیی دەکات، لە هەموو شوێنی حەیاو ئابڕوومان دەبات، ڕێک وەکو دوێنیّ.

گانیا، بە ترسەوە پرسی:

- دوێنیّ؟ یانی چی؟ ئایا... دەشیّ کە...

ڤاریا، خۆی هێور کردەوە و گوتی:

- پەنا بەخوا... یانی تۆ نە تزانیوە؟

گانیا کە لە توڕەیی و شەرمەزاریدا سوور بووبووەوە، هاواری کرد:

- چۆن؟... مەبەستت... یانی بۆ ئەوێندەر چووبوو؟ پەنا بەخوا!... ڤاریا تۆ کە ئێستا لەویّ دێیتەوە، هیچت زانیوە؟ هیچت بیستووە؟ پیرەمێرد بۆ ئەوێندەر چووبوو؟ چووبوو یان نا؟

دوای ئەو قسانە بەلەز بەرە و دەرگا تاوی دا. ڤاریا بەهەشتاو دووی کەوت، هەر دوو دەستی گرت و گوتی:

- چ دەکەی؟ بەتەمای چیت؟ ئەگەر دەری بکەیت، دەڕوات بۆ شوێنی

خراتر، جارمان لێدەدات، سووک و ڕیسوای لای خەڵک و خوامان دەکات!...
- باشە لەوێ چیکردووە؟ چیگوتووە؟
- کچەکان، نەیان توانی قسەکانی ئەو وەکو خۆی بگێڕنەوە، چونکە تێ نەگەیشتبوون مەسەلە چییە. ئەوەندە دەزانم کە ترساندبوونی. هاتبوو ئیڤان فیدوروفیچ ببینێ کە لە ماڵ نەبو بوو. پاشان داوای کردبوو لیزا ڤیتا پروکوفیڤنا بدینێ. هەوەڵ جار تکای لێکردبوو کارێکی بۆ بدۆزێتەوە، لەوەزیفەیەکی دەوڵەتیدا دایبمەزرێنێ، ئەوسا کەوتبووە سکاڵاو گلەیی لە هەمووومان، لە من، لە مێردەکەم، زیاتر لە تۆ.. ئیدی زۆری وتبوو.
گانیا، کە شێت ئاسا، لە حەژمەتاندا، دەلەرزی پرسی:
- نەتزانی گلەیی چی کردووە؟ چی گوتووە؟
- لەکوێ بزانم؟ بەخۆیشی نەیزانیوە چ دەڵێت؟ لەوەشە هەموویان بۆ من نەگێڕابێتەوە.
گانیا، سەری لەنێو هەر دوو دەستی ناو ڕای کرد بۆ بەر یەکێک لە پەنجەرەکان، ڤاریاش لەبەر پەنجەرەیەکی دی دانیشت و لەپڕ گوتی:
- ئەم ئاگلایا، کچێکی مەسخەرەیە! ڕایگرتم و گوتی: "حورمەت و ڕێزی تایبەتیم بە دایک و بابت بگەیەنە. ئەگەر دەرفەتم بۆ ڕەخسا، لە چەند ڕۆژی داهاتوودا سەری بابت دەدەم" ئەو قسانەشی زۆر بەجیددی کرد. بە ڕاستی زۆر سەیرە...
- یانی مەبەستی تانەوتەشەر نەبوو؟ دڵنیایت بە جیددی بوو؟
- نا، سەیرەکە لەمەدایە زۆر بەجیددی بوو، هیچ تانەوتەشەرێک لە ئارادا نەبوو.
- بە حیکایەتەکەی پیرەمێرد نازانێ؟ تۆ دەڵێی چی؟
- نا، هیچ کەسێک لە ماڵی وان، پێی نازانێ. گومان لەوەدا نییە، بەڵام تۆ منت خستە گومانەوە. لەوەیە ئاگلایا بە مەسەلەکەی زانی بێ. ئەگەر بزانێ هەر خۆی دەیزانێ، چونکە کاتێ بەو جدیەتە، سلاوی بۆ بابم نارد، هەر دوو خوشکەکەی زۆریان پێ سەیر بوو. ئاخر بۆچی بە تایبەتی بۆ باوکم؟ خۆ ئەگەر زانیبێتی، هەڵبەتە دەبێ لە میرزادەی بیستبێ. ئەو بۆی

گێڕابێتەوە.

- ئاشکرایە کە کێ بۆی گێڕاوەتەوە! دۆزینەوەی ئەمە کارێکی ئاسانە! نۆبەتی ئەو قەوانەیە، هەر لە مەمان کەم بوو. دز! لە خانەوادەی ئێمەدا! دز و خانەوادەی ئێمە! دزێک کە سەرگەڤاری خانەوادەکەمانە!

ڤاریا، تووڕە بوو، هاواری کرد:

- قسەی قۆڕ مەکە! ئەمە گاڵتەیەکی مەستانە بووە و هیچی دی! بابایەکی مەست، بە بێ هۆشی بۆ خۆی وڕێنەیەکی کردووە و تەواو! ئەمە کاری کێیە؟ لیبدیف و میرزادە... ماشەڵا لەو دوو پیاوە مەزنە، سەڵا لە ئەقڵ و ئاوەزیان! من حیسابی پوشکەیەکیش بۆ قسەی وان ناکەم. کەم و زۆر باوەڕم بەو قسانە نییە!

گانیا، بە پەستی و دڕودۆنگی لەسەری ڕۆیشت:

- بابمان، پیاوێکی دزو مەی خۆرە، من سوالّکەرم، مێردی خوشکەکەم سووتخۆرە. ئیدی ئاگلایا دڵی بەچی خۆش بێ، خۆشی بە چیماندا بچێ: کە خانەوادە و ماڵباتێکی خانەدانین!

- مێردی خوشکەکەت، هەر ئەم سووتخۆرەیە کە...

- من بەخێو دەکات، نانم دەدا، وانییە؟ لە ڕوودامەمێنە، تکایە چیت لە دالّدایە بیڵێ، شەرمی ناوێ!

ڤاریا، جڵەوی زمانی خۆی گرت، کەمێک هێور بووەوە و گوتی:

- بۆچی تووڕە دەبی؟ تۆ هێشتا دەڵێی مەکتەبلیت، هیچ تێناگەیت، وا تەسەوردەکەی ئەم شتانە تۆ لە بەرچاوی ئاگلایا بچووک دەکاتەوە؟ تۆ نازانی ئەو کچە چ بەشەرێکە. چ تەبیعەتێکی هەیە. ئامادەیە دەستبەرداری باشترین خوازگار ببێت و بە مەمنوونیەوە ڕەدووی خوێندکارێک بکەوێ و بە برسێتی و نەداری لە ژێرخانێکا لەگەڵیا بژی! هەموو ئاواتێکی ئەوەیە! تۆ هەرگیز پەی بەوە نابەیت کە ئەگەر بتزانیبا چۆن بە دروستی دەگەڵ ئێمەدا سازابای و قەدری خۆت بگرتبا، چ پلەوپایە و پێگەیەکت لە چاوی ئەودا بۆ خۆ دروست دەکرد. میرزادە بەچی سەرنجی ڕاکێشاوە؟ لە بەر ئەوەی یەکەم، مەمنوونی نەبووە و هەوڵی ڕاوکردنی نەداوە و خۆی قورس

گرتووە، دووەم، لە بەرئەوەی زۆربەی خەڵکی بە گێل و گەمژەی دەزانن، بۆیە لەزەت لەو هەراو هەنگامەیە دەبینێ کە لە خانەوادەکەیاندا بەرپای کردووە. ئاها ئاخر ئێوەی خێڵی پیاوان هەرگیز لەم شتانە حاڵی نابن!

گانیا، بە پەستی کەوتە پرتاندن:

- باشە. کەسێ نەمرێ دەبینین کە ئاخۆ تێدەگەین یان تێناگەین، بەڵام حەزم نەدەکرد، هیچ شتێک ی لەمەڕ مەسەلەکەی پیرەمێرد زانیبا. وام وێنا دەکرد کە میرزادە زمانی خۆی دەگرێت و هیچ شتێک ناگێڕێتەوە. باشە خۆ هەر ئەو لیبدیفی ناچارکرد زمانی خۆی بگرێت و هیچ نەڵێت. من چەندم هەوڵ لەگەڵی دا، ئێستاش قایل نەبوو هیچ شتێکم بۆ بگێڕێتەوە...

- کەواتە، هەمووان، بەبێ ئەوەی ئەو گوتبێتی، بە مەسەلەکەیان زانیوە، بەڵام تازە تەواو، بۆچی ئەمەت کردووە بەخەم؟ بەتەمای چیت؟ ئەگەر ئومێدێکت مابێ، تەنیا ئەوەندەیە کە سیمای ڕەنجاو و خەمینت، لە بەرچاوی ئەودا وەکو شەهیدێک بنوێنێ.

- قسەی وا مەکە، ئەو "ئاگلایا" سەرباری هەموو ڕۆمانسیەتێکی، بێگومان سڵ لە ڕیسوایی دەکاتەوە. هەموو شتێک سنووری خۆی هەیە، هەر بەشەرێکیش سنووری خۆی هەیە و نایبەزێنێ، ئێوەی خێڵی ئافرەت، هەموتان وەکو یەکن.

- ئاگلایا و ترس و سڵکردنەوە؟

ڤاریا بەدەم ئەو قسەیەوە، بە بێزاری ڕوانییە براکەی و لە سەری ڕۆیشت:

- کە بوودەڵە و نەفس نزمی! کەستان لە کەستان باشتر نین. ئێوە هەمووتان وەکو یەکن. دەشێت ئاگلایا مەخسەرە و سەیرو سەمەرە و عەجیب و غەریب بێ، دەشێت، بەڵام لە ڕووی تەبیعەتەوە، لە ڕووی نەفس بەرزییەوە، هەزار هێندەی هەر یەکێک لە ئێمە، نەجیب ترو سەنگینترە!

گانیا، دووبارە، بە خۆ پەسندییەوە، لەبن لێوانەوە گوتی:

- دەی باشە. پێویست ناکا تورە بیت!

ڤاریا، لەسەری ڕۆیشت:

– من خەمی دایکمە، بەزەییم بەودا دێتەوە. دەترسم بەم ڕیسواییەی بابمی زانیبێ. بە ڕاستی خەممە!

گانیا گوتی:

– بێگومان زانیویەتی!

ڤاریا، هەستابوو تا بۆ قاتی سەرەوە، بۆلای نینا ئەلکسندروڤنا بڕوات، بەڵام کە گوێی لەو قسەیەی گانیای برای بوو، بە سەر سامی وەستاو لێی پرسی:

– تۆ بڵێی کێ بۆی گێڕابێتەوە؟

– ڕەنگە هیپولیت بۆی گێڕابێتەوە. بە مەزەندەی من خوا خوای بوو هەر کە بگاتە ماڵی ئێمە، زوو بە زوو ئەو شتەی بۆ دایکمان بگێڕێتەوە.

– باشە بڵێ بزانم ئەو لەکوێی زانیوە؟ خۆ لیبدیف و میرزادە ڕێکەوتبوون بەردێکی بخەنە سەر و بۆ کەسی نەگێڕنەوە، تەنانەت کولیاش ئاگای لێنیە...

– هیپولیت؟ بە خۆی پێی زانیوە. هەستی پێ کردووە، تۆ نازانی ئەم کوڕە چ شەیتانێکە! چ لەزەتێک لە غەیبەت و دووزمانی دەبینێ! مەگەر خوا بزانێ چ کابرایەکی بە بۆنە! لە دووری دوورەوە بۆنی هەر کارێکی دزێو و کرێت، هەر فەزیحەت و ڕیسوایەک دەکات! تۆ باوەڕ دەکەی یان نا، کەیفی خۆتە، بەڵام من قەناعەتی تەواوم هەیە کە جڵەوی ئاگلایا لە دەستی ئەودایە، لەسەر قامکان دەیسووڕێنێ. ئەگەر تا نهوژی وا نەبووبێ، لەمەودوا وا دەبێت. (ڕوگوژین)ش پەیوەندی دەگەڵیا هەیە. نازانم میرزادە چۆن ئەم شتانە نابینێ؟ تۆ نازانی چەند حەز دەکات جەزرەبەیەک لە من بدات، داوێکم بۆ بنێتەوە! لەمێژە زانیومە کە بە دوژمنی خوێنی خۆیم دەزانێ، بەڵام سەر لەوە دەرناکەم، کە کەسێکی وا، ئاخر پێی بە لێواری قەبرەوەیە، چ سوودێک لەمە دەبینێ، چ قازانچێکی پێدەگات؟ تێی ناگەم، بەڵام ئەمەی بۆ ناچێتەسەر، دەبینی چۆن لە ئەنجامدا من بە سەریا سەردەکەوم، دوا قسە، قسەی من دەبێ نەک هی ئەو.

-باشە کە ئەوەندەت ڕق لێیەتی، بۆ هێنات بۆ ئێرە؟ مەسەلەکە ئەوە دێنێ

به گژیا بچی و به سەریا سەربکەوی؟

- من له سەر ئامۆژگاری و قسەی تۆ بۆ ئێرەم هێنا.

-پێموا بوو ڕەنگە بە کەڵکمان بێت. باشە تۆ دەزانی حەزی لە ئاگلایا کردووە و نامەی بۆ نووسیوە؟ چەند جارێک پرسیاری ئەمە لە من کراوە... وەکو دەگێڕدرێتەوە چیوای نەمابوو کە نامە بۆ لیزا ڤیتا پروکوفیڤناش بنووسێت.

گانیا، بەدەم بزەیەکی ناڕەسەنانەوە گوتی:

- ئەمەیان خەتەر نییە، باوەڕیش ناکەم ڕاست بێ، بەڵام لە گینە ئاشقی ئاگلایا بووبێ، هەر چییەک بێ گەنجە! بەڵام مەحاڵە نامەی بێ ئیمزا بۆ ئەو پیرەژنە بنووسێت. بە ڕاستی گەنجێکی هیچ و پوچی جینگنی شەڕاشوی لە خۆڕازی و لەخۆباییە! .. من دڵنیام وای لەو کیژە گەیاندووە کە من گەنجێکی فێڵبازی بە ئۆین و ساختەچیم. من دان بەوەدا دەنەم کە کەرێتی من لەوەدا بوو متمانەم پێکرد، گرێی دڵی خۆم بۆ کردەوە. وام وێنا دەکرد، لە ڕقی میرزادە، لەپێناوی تۆڵە سەندنەوە لە میرزادە، خزمەتی من دەکات. بە ڕاستی کەسێکی بێ بەقایە، ئامانی نییە. ئێستا دەماریم ناسیوە، دەزانم چ بوغزن و بوغز لە زگێکە! بەڵام بۆ مەسەلەی دزیەکە هەبێ و نەبێ لە دایکی، لە بێوەژنەکەی کاپتنەوە، پەی بە دزیەکەی باوکە بردووە. ئاخر باوکە لەپێناوی ئەو ژنەدا پەنای وەبەر ئەو کارە بردووە. هیپولیت، بێ هیچ بۆنەیەک لە خۆیەوە پێی گوتم کە جەنەڕاڵ بەڵێنی چوارسەد ڕۆبڵی بە دایکی داوە. بە خۆی بێ هیچ شەرم و لە ڕووداماڵێک ئەوەی پێگوتم. ئیدی لەوەوە لە هەموو شتێک حاڵی بووم. دیارە ئەمەی بۆ دایکەش گێڕاوەتەوە، لە بەر هیچ نا، تەنیا لە بەرئەوەی سوێ بکاتە دڵی دایکەوە و لەزەت لەو کارەی خۆی بدینێ. خۆزگە دەمزانی بۆچی نامرێت؟ ئەرێ بێزەحمەت پێم نالیی بۆ نامرێت؟ ئەدی قەرار نەبوو لە زەرفی سێ هەفتەدا بمرێت؟ لەوەتای هاتووەتە لای ئێمە قەڵە و بووە! کۆکەکەشی کەم بووەتەوە. دوێنێ ئێواری پێی گوتم، دوو ڕۆژە خوێنی هەڵنەهێناوە.

ڤاریا گوتی:

- کەوایە دەری بکە

گانیا، بە لووتبەرزیەوە بەرسڤی دایەوە:

- ڕقم لێی نییە، بە ڵکو حەزی لێناکەم!

دوای تۆزێک، لەپڕ تورە بوو و هاواری کرد:

- با... ڕقم لێیەتی.. ڕقم لێیەتی و ئەولاتریش! ئامادەم ڕووبەڕوو ئەمەی پێ بڵێم، ئەگەر لە سەرەمەرگیشابێ پێی بڵێم! خۆزگە ئیعترافنامەکەیت دەخوێندەوە! پەنا بەخوا، کە ڕووقایم و گوساخێکی ساویلکەیە! لیوتنان پیروگۆفێکە لەو گۆڕە، نوزدریوفێکە* بەدیوە تراجیدیەکەیا! لەمەش خراتر منداڵە، توڵە سەگێکە لەو گۆڕە! خۆزگە ئەوسا تۆزێکم تێهەڵدەدا تا بمزانیبا پەرچەکرداری چ دەبێ! ئێستا دەیەوێ تۆڵەی ناکامی ئەو ڕۆژەی خۆی لە هەمووان بکاتەوە!...ئەرێ ئەوە چییە، دیسان بەزمەکەیە لەوێ؟ دیسان لە سەرەوە، دادو فریادە! مەسەلە چییە؟ ئەمە کەی تەواو دەبێ، ئەم فەرتەنەیە نەبڕایەوە، بەس نییە؟ ئەمە قەبووڵ ناکەم!

لەو هات و هاوار و بۆڵە بۆڵەدا بوو کە پتیتسن وەژوورکەوت. ڕووی تێکرد و لە سەری ڕۆیشت:

- پتیتسن ئەمە چییە؟ بۆکوێ سەری خۆمان هەڵگرین؟ ئەمە... ئەمە...

هەراو هەنگامەکە بەخێرایی نزیک دەبووەوە. لەپڕ دەرگا بە توندی کرایەوە، جەنابی ئیڤولیگین، کە لە تورەییدا سوور بووبووەوە و چاوی عاردی نەدەبینی وەژوورکەوت و بەرە و پتیتسن چوو کەوتە بۆڵە بۆڵ بە سەریا. پاشان نینا ئەلکسندروفنا، کولیا و، لەدوای ئەوانەوە هیپولیت، دوا بەدوای پیرەمێرد وەژوورکەوتن.

پەراوێز:

* - ..". بودکولیوسین.." قارەمانی کۆمیدیای (زەماوەندی)ی گۆگۆڵە. نموونەی تەبیعەتی نزم و لاواز و، هەڵچوونی خۆسەریە، لە شەوی زەماوەندەکەیدا، لە پەنجەرەکەوە خۆی هەڵدەداتە خوارەوە.

* - "دەبخۆ دەردت بێ جۆرج داندان.." ئەم ڕستەیە لە دەقە ئەسڵەکەدا

بە فەرەنسیە.

* – ..". پیروگـۆف" شـا قارەمـانی چیرۆکێکـە بـە ناونیشـانی "شـەقامی نفسکی."

* – ..". نوزدریوف..." یەکێکە لە قارەمانـە لێبـۆک و کۆمیدی و فشـەکەر و چەنەباز و شەڕانی یەکانی ڕۆمانی "گیانە مردووەکان"ی گۆگۆڵ.

## فەسڵی دووەم

پێنج دانە ڕۆژ بوو کە هیپولیت هاتبووە ماڵی پتیتسن. دیارە بە شێوەیەکی زۆر ئاسایی، بێ هیچ قەرقەشە یان گەنگەشە یان دەمەقاڵێ، یان دووبەرەکیەک لە میرزادە جیابووبووەوە، بە پێچەوانەوە، بەڵکو زۆر دۆستانە لێکدی جیابووبوونەوە. گاڤریلا ئاردالیونوفیچ، کە شەوی ئاهەنگ و شەوبێریەکەی کە پێشتر باسمان کردووە، ئەو هەموو دژمنایەتییەی هیپولیتی کردبوو، دوای ڕووداوەکە بە دوو ڕۆژان چووبوو بۆ ماڵەوە بۆلای. دیارە بە مەبەستێکی تایبەتی خۆی کە لەپڕ بە خەیاڵیا هاتبوو، ئەم سەردانەی کردبوو. هەروەها (ڕوگوژین)یش، کەس نەیدەزانی بۆ، سەری ئەم نەخۆشەی دەدا و هاتوچۆی دەکرد. میرزادە لە سەرەتاوە، لە دڵی خۆیدا وای دانابوو کە ڕۆیشتنی ئەو "گەنجە بێنەوایە" لە نک وی خێرو قازانجی خۆی تیایە، بەڵام هیپولیت وەختێ کە خواحافیزی لە میرزادە کرد پێی ڕاگەیاند کە دەچێت بۆ ماڵی پتیتسن کە لە پیاوەتی خۆی "خوڵکی کردووە و جێی کردووەتەوە". هەرچەندە گانیا خوڵکی کردبوو بۆ ماڵەوە، بەڵام بەئانقەست، کەم و زۆر ناوی گانیای نە هێنابوو، وەک بڵێی بەئانقەست چاکە و پیاوەتیەکەی گانیا بێ منەت بکات و دان بەوەدا نەنێت کە ئەویش خاوەن ماڵە. گانیا هەستی بەمە کرد، ئیدی ئەم سووکایەتییەی لە دڵگرت.

گانیا، کە بەخوشکەکەی گوتبوو، حاڵی نەخۆشەکە ئێستا ڕوو لە باشیە،

ڕاستی کردبوو. بە ڕاستی تەندروستی هیپولیت بەرە و باشی دەچوو، بە ڕەنگ و ڕوویا دیار بوو کە بەرەو باشی دەچێت.

هیپولیت، بەدەم بزەیەکی ژاراوی تەوسامێزەوە، بە کاوەخۆ، لە دوای ئەوانی ترەوە، وەژوور کەوت، سیمای نینا ئەلکسندروفنا، زۆر هەراسان و ترساو دیار بوو (ئەم ژنە لە زەرفی ئەم شەش مانگەی دواییەدا، زۆر گۆڕا بوو، یەجگار لاواز بووبوو. لەوەتای کیژەکەی بەشوو دابوو، بە یەکجاری هاتبووە ماڵی ئەوان. پێدەچوو هەقی بە سەر منداڵەکانیەوە نەبێ و خۆی لە کاروبار-یان هەڵنەقورتێنێ ). کولیا، نیگەران و پەشێو بوو. خۆی گوتەنی سەری لە زۆر شتی ئەم "شێتاتیەی جەنەڕاڵ" دەرنەدەکرد، چونکە بە ڕاستی سەری لە هۆی ڕاستەقینەی ئەم ئاژاوە تازەیەی کە باڵی بەسەر ماڵەکەدا کێشا بوو، دەرنەدەکرد، بەڵام بە چاوی خۆی دەی بینی کە بابی یەجگار توڕەیە، شەڕ بەدارو بەرد دەفرۆشێت، لە هەموو شتێک بە بیانووە. لەناکاوێکا بە ڕادەیەک گۆڕاوە، لە پیاوەکەی جاران ناچێ. ئەوەی کولیای نیگەران دەکرد ئەوە بوو کە پیرەمێرد سێ دانە ڕۆژی تەواو بوو لە خواردنەوە دوورکەوتبووەوە. کولیا دەیزانی کە بابی هاتوچۆی لیبدیف و میرزادەی تەرک کردووە، قسەی لێ دابڕیون، تەنانەت دەگەڵیاندا بە شەڕ هاتووە. کولیا تازە بەخۆو نیو قاپ ڤۆدگاوە، کە بە پارەی خۆی کڕی بووی، گەیشتە ماڵەوە. کاتێ هێشتا هەمووان لە قاتی سەرەوە بوون، بە دایکی، نینا ئەلکسندروفنای گوت:

- دایکە، دڵنیابە، ئەگەر دەمێ تەڕ بکات باشترە. سێ دانە ڕۆژە قەترەی نەخواردوەتەوە. ڕەنگە لەبەر ئەوە مجێزی تێک چووبێت و دڵی تەنگ بووبێت. بۆیە بخواتەوە باشترە. کاتێ لە زندانی قەرزارانیش بوو. من هەر ڤۆدگام بۆ دەبرد.

جەنەڕاڵ، دەرگای خستە سەر گازی پشت، لە ئاستانەی دەرگاکەدا وەستا. بە ئاشکرا لە توڕەییدا دەلەرزی. پڕ بە زار هاواری بەسەر پتیتسنی زاوایدا کرد:

- بەڕێز، ئەگەر بە ڕاستی نیازت وایە پیرمێرێکی بەڕێز، باوکت، یان

باوکی ژنەکەت، فەرق ناکا، ئەو پیاوەی کە دڵسۆزانە خزمەتی تزاری خۆی کردووە، بکەی بە قوربانی ئەم هەتیوە خوا نەناسە، ئەم توتەڵە سەگە. ئەوا من ئیدی لەم ساتەوە، دوو پێم بە ماڵەکەتدا نایەت. ئیدی بۆ خۆت سەرپشک بە، لە ئێستاوە یەکێکمان هەڵبژێرە. یان من یان ئەو... بزمارە.. بەڵێ.. ئەم بزمارە! ئێستا، بە ڕێکەوت ئەم وشەیەم بە بیرا هات... بەڵام ئەم وشەیە پڕ بە پێستی خۆیەتی... بە ڕاستی ئەم هەتیوە بزمارە... چونکە وەکو بزماری ڕاستی خەریکە دڵم کون دەکات... بێ هیچ مدارایەک... ڕێک وەکو بزمار!...

هیپولت، هەڵی دایە و گوتی:

– ئەدی بۆ وەکو ئاچەری کردنەوەی سەری بوتڵان نەبم؟

– نەخێر، ئاچەری بوتڵان نیت، چونکە من بوتڵ نیم جەنەڕاڵم. من هەڵگری نیشانان و میداڵی شەرەفم، بەڵام تۆ سفری پاش فاریزەش نیت.

دووبارە، شێت ئاسا، بە سەر پتیتسندا داباری:

– یا ئەو یان من، بیری خۆت بکەوە و هەر ئێستا قەرار بدە!

کولیا، لەم کاتەدا کورسییەکی هێنا، جەنەڕاڵ، شەکەت و ماندوو، بەئاستەم خۆی بەپێوە دەگرت، خۆی دا بە کۆڵی کورسییەکەدا.

پتیتسن، کەواقی وڕمابوو، لەبن لێوانەوە گوتی:

– ئەگەر کەمێک خەوتبای باشتر نەبوو...

گانیا بە ئەسپایی بە خوشکەکەی گوت:

– هێشتا، ئەو هەڕەشە دەکات...

جەنەڕاڵ، بە جارێ دەهری بوو، هاواری کرد:

– کەمێک بخەوم؟ من مەست نیم بەڕێز، تۆ سووکایەتیم پێدەکەی،جوێنم دەدەیتێ.

لە جێی خۆی هەستاو درێژەی دایە:

– دەبینم هەموو شتێک و هەموو کەسێک لێرە دژایەتیم دەکەن. بەسە، بێزار بووم! من دەڕۆم... بەڵام جەناب ئەوە بزانە کە... پێویستە بزانیت کە...

بەڵام پێش ئەوەی قسەکەی تەواو بکات دایان نیشاندەوە. لێی پاڕانەوە

ئارام بگرێت و خۆی هێور بکاتەوە.

گانیا، پەست و تورە، پەنای وەبەر سووچێک برد. نینا ئەلکسندروفنا. لە حەژمەتاندا دەلەرزی و دەگریا.

هیپولیت، بە تەشەرەوە گوتی:

– ئاخر من چ خراپەیەکم بۆی بووە؟ گلەیی چی هەیە؟

نینا ئەلکسندروفنا، لەپڕ هەڵی دایە و گوتی:

– هیچت نەکردووە؟ هەقە شەرم لە خۆت بکەی، عەیبە عەیب، ئاخر پیاو چۆن دڵی دێ پیرەمێردێکی وا ئەزیەت بدات... بە تایبەتی کەسێک لەوەزع و حاڵی تۆدا بێ!... هەی خۆت بە خۆت بی!...

– وەزع و حاڵم چییەتی خانم؟ من ڕێز و حورمەتی زۆرم بۆ تۆ هەیە، بە تایبەتی بۆ تۆ، بەڵام... جەنەڕاڵ، تەقیەوە:

– بزمارە بزمار، خەریکە جەرگ و دڵم کون دەکات! دەیەوێ بمخاتە ڕیزی خوا نەناسانەوە! گوێ بگرە توڵە باب، حەز دەکەم ئەوە بزانی، وەختێ من غەرقی شانازی و مایەی شانازی بووم، تۆ هێشتا لەدایک نەبووبووی!... تۆ کرمێ بووی بەغیلی دەیخواردیت، کرمێ بوویت بە فوویەک دەبووی بە دوو لەتەوە. مرخە مرخ، کۆکە کۆک، خوا نەناس، بەدەم بوغزەوە دەمریت.... نازانم گانیا بۆچی بۆ ئێرەی هێنایت؟ هەموو هەر دژی منن، لە بێگانەوە بگرە تا دەگاتە کوڕەکەی خۆم...

گانیا هاواری کرد:

– بەسە، ئەم مەزڵوم نوێنییە بەسە! لەوەی پتر ناو زڕاوی لای ئاشناو بێگانەمان مەکە... بەسە تا لە سەرانسەری شارا حەیاو ئابڕوومان نەچووە...

– چی؟ من ناوی تۆ دەزڕێنم؟ حەیای تۆ دەبەم؟ هەی توڵە سەگ؟ نۆبەتی ئەو قەوانەیە. من حەیای تۆ نابەم، بە پێچەوانەوە حەیای تۆ کۆدەکەمەوە، شەرەف و ئابڕوی تۆ بە منەوەیە فەقیر...

جەنەڕاڵ، بەدەم ئەو قسانەوە لە جێی خۆی ڕاپەڕی، هێز نەبوو بتوانێ هێوری بکاتەوە و دای بنیشێنێتەوە. پیاو هەق بڵێ گانیاش سنووری

بەزاندبوو.

گانیا، بە ڕقەوە هاواری کرد:

- ڕووشی دێت باسی شانازی و ئابڕوو بکات!

جەنەڕاڵ، ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا، بە تورەیی بەرە و گانیا چوو و هاواری بە سەرا کرد:

- چیت گوت؟

گانیا، لەپڕ گوتی:

- گوتم، وازبێنە، با دەمم نەکرێتەوە، دەنا...

بەڵام ڕستەکەی تەواو نەکرد.

هەنوکە هەر دووکیان، بە تایبەتی گانیا، بەوپەڕی تورەیی بەرانبەریان لە یەکدی گرتبوو

نینا ئەلکسندروفنا، بەپەلە چوو تا پێش لە کوڕەکەی بگرێت و هاواری کرد:

- گانیا، دەتەوێ چ بکەی؟

ڤاریا، بەوپەڕی پەستی و بێزاری هاواری کرد:

- بە ڕاستی شەرمە بۆ ئێوە.

دایکی هێنایە دواوە و گوتی:

- دایکەوازبێنە، هەقت نەبێ بە سەریانەوە.

گانیا ڕوو لە باوکی، بەوپەڕی تورەیی گوتی:

- من لەبەر خاتری دایکم مدارات دەکەم دەنا..

جەنەڕاڵ، کە لە تورەییدا ئاگای لە خۆ بڕابوو، نەڕاندی:

- بڵێ! بڵێ، شەرم مەکە، بڵێ تا نەفرەتی باب بتگرێ...تا خوای باوکت بتگرێ... بڵێ!...

-پیف: کە لە تووک و نەفرەتی تۆ دەترسم! ئاخر خەتای کێیە کە یەک هەفتە پترە خۆت شێت کردووە؟ ئەمڕۆ سەری هەشتەم ڕۆژە. گوێت لێیە؟ خوام نەماوە، ئاگات لە خۆبی، لەوەی پتر سەر مەکە سەرم، ناچارم مەکە ئەوەی ژێر بەڕەت بۆ بخەمە سەر بەڕە. دوێنێ بۆچی بەلۆژە لۆژ خۆت بۆ

مالّی یەپانچین ڕەکێش کرد؟ هێشتاش دەتەوێ خەلّکی ڕێزی تەمەنت، سەرە سپیەکەت و کەرامەتی باوکایەتیت بگرن؟ وەلّا بابە جوانە!...

کولیا هەلّی دایە:

- بێدەنگ بە گانکا! دەمت داخە گەوجە!

هتپولیت، بە هەمان ڕووقایمیەوە، هەلّی دایە و گوتی:

- ئاخر من چ خراپەیەکم بۆی بووە؟ لەکوێ گالّتەم پێ کردووە؟ بۆچی پێم دەلّێ بزمار، خۆ هەمووتان گوێتان لێبوو؟ من چی بکەم بە خۆی بانگی کردم و باسی کاپیتانێکی بۆ کردم بە ناوی یارۆپیاگوف. من هیچ حەز بە تێکەلّاوی ئێوەمانان ناکەم جەنەڕالّ. بە خۆت دەزانی من هەمیشە خۆم لە تیکەلّاوی ئێوەگەل دوور گرتووە. ئاخر من و کاپیتان یاروپیاگوف کوجا مەرحەبا، چی کۆمان دەکاتەوە! من نایلّێم، خۆت بیلّێ! .. من لە بەرخاتری کاپیتان یارۆپیاگوف و بەسەرهاتی وی نە هاتووم بۆ ئێرە. خۆ کفرم نەکرد، بە ئاشکرا ڕەئی خۆم دەربڕی و گوتم ڕەنگە ئەم کاپیتان یاروپیاگوفە هەر بوونیشی نەبێت. ئیدی تورە بوونێ توورە بوو ئەو سەری دیار نەبێت.

گانیا، گوتی:

- بێگومان وایە! ئەم کاپیتانە قەت ڕۆژێ لە ڕۆژان بوونی نەبووە.

جەنەڕالّ، داچلّەکی، حایرو سەرسام، بە چاوانی لێلّەوە دەیڕوانییە دەوروبەری خۆی. سەری لەم قسە ڕەقانەی کوڕەکەی سوورمابوو، زۆری لە دلّ گران بوو. زمانی لە گۆ کەوت، هەرچی کرد و کۆشا، وشەیەکی بۆ نەهات کە بەرپەرچی بداتەوە. هیپۆلیت کە گوێی لە قسەکەی گانیا بوو لە قاقای پێکەنینی داو گوتی:

- خۆ گوێت لێبوو؟ کوڕەکەی خۆیشت دەلّێت هەرگیز کاپیتانێک بە ناوی (یاروپیاگوف)ەوە نەبووە.

هەنگی پیرەمێرد، هاتە زمان و بە پچڕ پچڕی گوتی:

- من باسی کاپیتون یاروپیاگوفم کردووە، نەک باسی کاپیتان... کاپیتون یاروپیاگوف، ناوی کاپیتۆن بوو. دەنا خۆی کاپیتان نەبوو، بەلّکو لیوتینان

کولۆنێلی خانەنشین بوو... یاروپیاگوف... کاپیتون.

گانیا کە تەواو دەهری بووبوو، گوتی:

- )کاپیتون یاروپیاگوف) ش هەرگیز نەبووە!

جەنەڕاڵ، سوور هەڵگەڕاو، لەبن لێوانەوە گوتی:

- چۆن... بۆ نەبووە؟

پتیتسن و ڤاریا، گوتیان:

- ئاهـ دەبەسە ئیدی!

کولیا، جارێکی دی هاواری کرد:

- گانیا بەسە، دەبیبڕەوە مالاوا!

لەوە دەچوو، جەنەڕاڵ، بە قسەکەی کولیا، کەمێک وەخۆ هاتبێتەوە، لەپڕ نەڕەیەکی هەڕەشە ئامێزی بەسەر گانیادا کرد و پرسی:

- بۆچی نەبووە؟ بۆچی هەرگیز نەبووە؟ مەبەستت چییە؟

- لە بەرئەوەی نەبووە! پیاوی وا هەرگیز نەبووە و تەواو! من پێت دەڵێم نەبووەو، لەوەی پتر لە سەری مەڕۆ.

- ئەوەش کورەکەم. کوڕی خۆم کە من... پەنا بەخوا! دەوەرە دڵت بە کوڕی وا خۆش بێت! .. بە هەموو ئەقڵییەوە دەڵێت یاروپیاکوف، یاروشکا، یاروبیاکوف، لە ئیجادی نەبووە!

هیپولیت، خۆی لە قسەکەی هەڵقوتاند و گوتی:

- دەفەرموون! تۆزێ لەمەپێش کاپیتوشکا* بوو، کەچی ئێستا بە قودرەتی قادر بوو بە یاروشکا!

- من مەبەستم کاپیتوشکایە، کوڕی باش. نەک یاروشکا! مەبەستم کاپیتونە، کاپیتون ئەلکسیوفیچ، مەبەستم کاپیتان... لیوتینان کۆلونیل... (خانەنشین...) مێردی ماریا.. ماریا پتروفناسو.. سو.. مەبەستم دۆست و هاوڕێم سووتوگوفە، کە لە قوتابخانەی سوپاییدا هاو دەورە بووین. کە خوێنم لەپێناویا ڕشتووە... بە جەستەی خۆم دامپۆشی... بەڵام کوژرا. ئیدی بۆچی دەبێ کەسێک نەبێ و نەبووبێ بە ناوی کاپیتوشکا یاروپیاکوف؟!

جەنەڕاڵ، زۆر بە ڕقەوە ئەو قسانەی دەکرد، هەڵچوونەکەی لە ئاقلا

نەبوو، بەڵام پیاو هەستی دەکرد کە هۆی هەڵچوونەکەی ئەم مشتومڕەی ئێستایان نییە، بەڵکو شتێکی دیکەیە، چونکە زۆر جاری دی، چاوپۆشی لە گەنگەشە و مەسەلەێن زۆر تەوهین ئامێز تر لەم مەلابەزێنییەی ئێستا، کە کاپیتون یاروپیاکوف نییە و نەبووە، کردبوو.ئیدی تاوێ بۆڵە بۆڵی دەکرد و بە خۆی بێتاقەت دەبوو و دەچووە قاتی سەرەوە و لێی دەخەوت، بەڵام شەڕی ئەم جارە (بەشەریش بوونەوەرێکی سەیرە!) تەنیا لەبەر ئەوە بوو گومان لە سەر هەبوونی پیاوێک بە ناوی یاروپیاکوف هەبوو! جەنەڕاڵ ئەمەی بە سووکایەتییەکی گەورە دەزانی، بۆیە کردی بەو ڕۆژەی سیا وەحشی تیا کوژرا، ڕەنگی سوور هەڵگەڕا، دەستی بۆ ئاسمان بەرزکردنەوە، هاواری کرد:

- بەسە! بیبڕنەوە! بەر نەفرەتی من بکەون... من لێرە دەڕۆم، ئەم ماڵە بەجێ دێڵم! نیکولای کوا جانتاکەم بێنە... دەرەوە. من دەڕۆم!

بەوپەڕی توڕەیی، بەهەشتاو لە ژوورەکە وەدەر کەوت. نینا ئەلکسندروڤنا، کولیا و پتیتسن بەلەز دوای کەوتن. ڤاریا بە براکەی گوت:

- ئەوە چیت کرد؟ بێگومان ئێستا دەچێتەوە بۆ ئەوێندەر! چەپکە گوڵێکی دیکە بە ئاوا دەدات و هێندەی دی حەیامان دەچێت! کە شەرمە!

گانیا، کە لەداخا هەناسەی تەنگ بووبوو، هاواری کرد:

- جا با دزی نەکردبا!

بەدەم ئەو قسەیەوە، لەپڕ نیگای لە نیگای هیپولیت هەڵەنگوت، تەزوویەکی پێدا هات و هاواری کرد:

- تۆش، بەڕێز، دەبوایە ئەوە بزانی کە لە ماڵی خۆتا نیت، میوانیت، ڕاستە میوان ئازیزە، بەڵام نەدەبوو ئەو پیرەمێردە، کە بە ئاشکرا ئەقڵی تێکچووە، توڕە بکەیت.

) هیپولیت)ش لەزگ بوو بەو قسەیە هەڵبچێ و توڕە ببێ، بەڵام زوو بە سەر خۆیا زاڵ بوو، بە هێمنی وەڵامی دایەوە:

- نا، من لەگەڵتا نیم کە باوکت ئەقڵی تێکچووبێ یان شێت بووبێ، ئەمە بوختانە. بە پێچەوانەوە، هەستدەکەم ئێستا لە جاران ئاقڵترە. باوەڕبکە من

وای دەبینم. باوەڕم پێناکەیت؟ ئیستا زۆر بەوردی گوێ دەگرێت، قسان هەڵدەسەنگێنێ. قسەیەک لە جێی خۆی نەبێ نایکات، بێ مەبەست هیچ قسەیەک ناکات. کە باسی کاپیتوشکای بۆ کردم، مەبەستێکی تایبەتی خۆی هەبوو: تەسەور دەکەی دەیویست. من بێنێتە قسە و باسی...

گانیا توڕە بوو و گوتی:

- کەیفی خۆتە... من نامەوێ بزانم دەیویست باسی چی بۆ بکەی! تکایە چاو و ڕاوم دەگەڵ مەکە جەناب... جا کە هۆی ڕاستەقینەی ئەم حاڵەی ئێستای ئەم پیرەمێردەت دەزانی (کە لە زەرفی ئەم پێنج ڕۆژەی کە لای ئێمە بوویت، ئەوەندەت جاسووسی بەسەرەوە کردووین، بێگومان پەیت بەم حاڵەی بردووە) نە دەبوو ئەم پیرەمێرە داماوە بهاڕوژێنی، نە دەبوو بە گەورەکردنەوەی، دەنگۆیەکی مەستانەی بێ بنجوبناوانی دووکەسی سەرخۆش، بەو ڕادەیە دایکم ئەزیەت بدەیت، دەنگۆیەک کە نە بنجی هەیە نە بناوان، من ئەو قسانە بە پولێکی قەڵب ناکڕم... بەڵام تۆ بەبێ دوو زمانی و جاسووسی هەڵناکەیت، چونکە تۆ... تۆ...

هیپولیت، بەدەم تەوسخەنێکەوە، ڕستەکەی بۆ تەواو کرد:

- چونکە من بزمارم.

گانیا، لە سەری ڕۆیشت و گوتی:

- چونکە مرۆڤێکی موزیرو مەردمازاری. تۆ ئەو کەسەیت کە نیو دانە سەعات ئەو هەموو خەڵکەت عەزاب داو یستت بە سیناریۆی خۆکوژی، بە دەمانچەی بە تاڵ، ئەو خەڵکە بترسێنی و خۆت کرد بە گەپجاڕ! تۆ فشەکەریت، درۆزنی، تۆ ئەوەنیت بتوانی خۆت بکوژی... تۆ تورەکەیەک ڕقوکینەیت بەسەر دوولاقەوە! من لەم ماڵەم حەوانیتەوە، قەڵە و بوویت، بوژایتەوە، کۆکەکەت نەماوە، پەڕیوە... هێشتاش بەو جۆرە چاکەم دەدەیتەوە! تەمەشا بزانە چۆن...

- تکایە ڕێم بدە با دوو کەلیمە قسان بکەم. من لێرە، میوانی ڤارڤارا ئاردالیوڤنام، نەک میوانی تۆ. تۆ هیچ چاکە و پیاوەتیەکت بە سەرمەوە نییە، تۆ خۆتیش میوانی، جەنابی پتیتسن بە خێری خۆ لێرەی حەوانویتەوە.

چوار ڕۆژ لەمەپێش لە دایکم پاڕامەوە کە لە پاڤلوڤسک شوێنێکم بۆ پەیدا بکات و بەخۆیشی بێت لە پاڤلوڤسک ئاکنجی ببێت، چونکە هەستدەکەم ئێرەم پێدەکەوێ و بۆ تەندروستیم باشترە، هەرچەندە نە قەڵە و بووم و نە کۆکەکەشم پەڕیوە. دوێشە و دایکم ئاگاداری کردمەوە کە خانووی تازە ئامادەیە. بۆیە حەزم کرد زوو خەبەرت بدەمێ، وێڕای سوپاسی زۆرم بۆ دایک و خوشکەکەت، ئەمڕۆکە، لە ئەمڕۆ زووتر نییە دەگوازمەوە بۆ هەواری تازەم. ببورە کە قسەکەم پێبڕیت، چونکەوابزانم هێشتا قسەی ترت زۆر پێ مابوون.

گانیا، موچوڕکێکی بە سەراپادا هات و گوتی:

- ئەگەر شتەکە ئاوابێ...

هیپولیت، قسەکەی پێبڕی:

- ئەگەر شتەکە ئاوابێ... ڕێم بدە با دانیشم، ئاخر من نەخۆشم. ئێستا ئامادەم گوێت لێبگرم و هەرچیت لە دڵدایە بیڵێی، بە تایبەتی کە ڕەنگە ئەمە دوا گفتوگۆ و دوا دیداری نێوانمان بێت.

هیپولیت، بەدەم ئەو قسانەوە، بەو پەڕی هێمنی، لە سەر کورسییەکەی جەنەڕاڵ ڕۆنیشت. گانیا، لەدڵی خۆیدا هەستی بە جۆرە شەرمەزارییەک کرد و گوتی:

- باوەڕ بکە، من نەمدەویست بێمە ئەو ئاستەی کە پاکوپیست دەگەڵ بکەم و حیسابت لەگەڵ ببڕێنمەوە و ئەگەر تۆ...

هیپولیت قسەکەی بڕی و گوتی:

- نا، ئەوەندەش خۆت هەڵمەکێشە، ئەوە نیت! منیش لەو ڕۆژەوە کە هاتوومەتە ئێرە، بەڵێنم بە خۆداوە، هەر ڕۆژێ کە لێرە بڕۆم، ڕێک و ڕەوان، هەرچیم لە بیرو خەیاڵێ دەرهەق بە تۆ، بەرە و ڕوو پێتی بڵێم و داخی دڵی خۆمت پێ بڕێژم، جا ئێستا کاتی ئەوە هاتووە، هەڵبەتە دوای ئەوەی تۆ لە قسەکانت دەبیتەوە...

-منیش لای خۆمەوە تکات لێ دەکەم. لەم ژوورە وەدەربکەوی.

-باشتر وایە قسەی خۆت بکەی. دەنا دوایی ژێوان دەبیتەوە کە قسەی

دڵی خۆت نەکرد، لەدڵتا دەبێ بەگریێ!...

ڤاریا گوتی:

- هیپولیت بەسە! زۆر عەیبە. تکایە بیبڕنەوە!

هیپولیت، بەدەم پێکەنینەوە هەستاو گوتی:

- حورمەتی خانمان واجبە، ڤارڤارا ئاردالیونوڤنا، با بەدڵی تۆ بێ، ئامادەم لەبەر خاتری تۆ زۆر بە تانی قساندا نەچم، لە کورتی بیبڕمەوە، چونکە تازە کار لەکار ترازاوە، پێویستە دەگەڵ براکەتدا ڕووبەڕوو هەر چیمان هەیە. بیڵێین و خۆمان ساغ بکەینەوە. تا قسەکانی خۆم نەکەم، ناڕۆم.

گانیا هاواری کرد:

- تۆ کابرایەکی دووزمانیت، تا خراپ وەستابێ چاک بە دەمتا نایەت، بۆیە بەبێ تانەوتەشەر ناژیت، تا قسە دزێوەکانت نەکەی ناتوانی بڕۆیت.

هیپولیت، بە خوێنساردی گوتی:

- دەفەرموو، دیسان لغاوت بەزاند، جڵەوی خۆت لەدەست دا. با پێت بڵێم: ئەگەر قسەی دڵی خۆت نەکەی دوایی ژێوان دەبیتەوە ها. حەزیش دەکەم تۆ یەکەم جار قسەی خۆت بکەیت، من دوای تۆ قسان دەکەم.

گاڤریلا ئاردالیونوفیچ، نیگایەکی نەفرەتباری هیپولیتی کرد و هیچ بەرسڤێکی نەدایەوە.

هیپولیت گوتی:

- ناتەوێ قسە بکەی! فەرموو ئەگەر ڕاست دەکەی تا سەر لەسەر ئەم هەڵوێستەت بەردەوام بە! ئۆباڵی خۆت بە ئەستۆی خۆت. بەهەرحاڵ منیش بەش بەحاڵی خۆم تا پێم بکرێ لە کورتی دەیبڕمەوە. ئەمڕۆکە دوو سێ جار ئەم میوانداریەی ئێرەت بە چاوما کوتایەوە. ئەمە زوڵمە، هەق نییە. تۆ کە خوڵکت کردم بێمە ئێرە و لێرە ئاکنجی بم، بە نیاز بووی ڕاوم بکەی، بمخەیتە داوی خۆتەوە. وات دانابوو کە دژایەتی میرزادە دەکەم و تۆڵەی لێ دەستێنم. هەروەها بیستبووت کە ئاگلایا ئیڤانۆفناش، لوتف و میهرێکی دەرهەقی بەمن نواندووە و ئیعترافنامەکەی خوێندوومەتەوە. ئیدی بە خەیاڵی خاوی خۆت و.. بێ هیچ بەڵگەیەک وات زانیوە ئیدی من خۆم بۆ

خزمەتی مەرام و بەرژەوەندییەکانی تۆ تەرخان دەکەم. بە ئومێدی ئەوە بوویت کە من پشتیوانیت لێ دەکەم. من لەوەی پتر لەسەری ناڕۆم: چاوەڕوانی ئەوەش لە تۆ ناکەم دان بە دروستی و نادروستی ئەم قسانەدا بنەی. ئەوەندە بەسە کە حەواڵە بەویژدانی خۆتت دەکەم. ئێستا یەکتریمان باش ناسی.

ڤاریا هاواری کرد:

- پەنا بەخوا، مێشێ دەکەی بە گامێشێ! ..

گانیا گوتی:

- وەکو پێم گوتبووی: "هەم منداڵە و هەم دوو زمان".

- بە یارمەتیت ڤارڤارا ئاردالیونوڤنا، با قسەکەم تەواو بکەم. هەڵبەتە من ناتوانم میرزادەم خۆشبوێ یان ڕێزی بگرم، بەڵام ئەلهەقی مرۆڤێکی باشە، دڵپاکە، هەرچەندە هەندێ ئەتوار غەریب و برێک مەخسەرەیە... بەهەرحاڵ هیچ هۆیەک لە ئارادا نییە کە من ڕقم لێی بێ و بیبوغزێنم، هەر کاتێ براکەت لە میرزادەی هان دەدام و داوای لێدەکردم دژایەتی بکەم، ورتەم لە خۆدەبڕی، فزەم نەدەکرد. چاوەڕوانی ئەنجام و کۆتایم دەکرد تا پێبکەنم، چونکە دەمزانی ڕۆژێ دێ براکەت خۆی کەشف دەکات و، نیشانە ناپێکی و، کارێ دەکات ئەزی تیا شەرمەزاربم، کە هەر واش دەرچوو. جا ئێستا من ئامادەم بیبەخشم، هەڵبەتە لەبەر خاتری تۆ، ڤارڤارا ئاردا لیونوڤنا، بەڵام پاش ئەوەی بۆت دەر کەوت کە ڕاوکردنی من، ئەوەندەش ئاسان نییە، هەنوکە ئامادەم بۆتی ڕوون بکەمەوە، بۆچی سوور بووم لەسەر ئەوەی براکەت ئیحراج بکەم و ببێ بە قەشمەر جاڕی خەڵک و خوا.. حەز دەکەم ڕێک و ڕەوان پێت بڵێم من ئەم کارەم لە ڕووی ڕق و بوغزەوە کردووە، چونکە دەزانم بەو زووانە دەمرم (هەڵبەتە دەمرم، هەرچەندە بە گوتەی ئێوە قەڵەوتر بووم) هەست دەکەم ئەگەر بتوانم بەلای کەمەوە یەک کەسیشم لە نوێنەرانی ئەو چین و توێژە عەوام و زۆرەی کە بە درێژایی تەمەنم ئەزیەتیان داوم و هەمیشە لێیان بێزار و پەست بووم، کە برا بەڕێز و سەیرو سەمەرەکەی تۆ یەکێکی دیارە لەوانە، ئەزیەت دابێ وکردبم بە

گاڵتەجاڕ و قەشمەر، ئەوا زۆر ئاسانتر و ئاسوودەتر دەچمە بە هەشت. جا گاڤریلا ئاردا لیونوفیچ، من زۆرم ڕق لێتە، بە تایبەتی لە تۆ، ڕەنگە پێت سەیربێ، کە تەنیا لەبەر ئەمە ڕقم لێتە چونکە تۆ نموونەیەکی زەق و ڕوودار و گۆساخ و هەرزە و فشەکەری، خەڵکانی عەوام و ڕەمەکیت، ئەو خەڵکە ڕۆتینبازەی سەر ڕەحەت و دڵ ئاسودە خەمی هیچیان، نییە. جا تۆ یەکێکی لەو ڕەشە خەڵک و بازاڕیە فشەکەر و لە خۆڕازیانە، تۆ نەک ڕۆتینباز، بەڵکو خودی ڕۆتینی! هەرگیز نابی بە خاوەنی بیری تایبەتی خۆت، هەرگیز، تروسکەی ئەساڵەت، ڕۆژێ لە ڕۆژان زەین و هۆشت، ڕوح و دەروونت ڕووناک ناکاتەوە، بەڵام لەهەنبەر ئەوەدا، یەکپارچە بەغیلیت، حەسوودیت سنووری نییە. تۆ قەناعەتی تەواوت هەیە کە گەورەترین بلیمەتی. کەچی وێڕای ئەوەش لە کاتی خەمباریدا، مۆرانەی گومان و غەزەب و بەغیلی دەداتە دڵ و دەروونت. ئاهـ.. هێشتا هەندێ خاڵی ڕەش لە ئاسۆی بینینی خۆتا دەبینی، بەڵام ڕۆژێ دێ، کاتێ دەگەیتە حەماقەتی تەواو، ئەو خاڵە ڕەشانەش ئاوا دەبن و نامێنن، دیارە ئەو ڕۆژە دوور نییە. دیارە تۆ ژیانێکی دوورودرێژ و پڕ پێچ و هەوراز و نشێوی هەمە ڕەنگت لە پێشە و باوەڕناکەم ژیانێکی خۆش بێ، کە ئومێدەوارم خۆش نەبێ. با پێش هەر شتێک ئەوەشت پێ بڵێم کە ناگەیت بەو کیژەی کە دڵت پێوەیەتی.

ڤاریا، هاواری کرد:

– بەسە، لە تامت دەرکرد! دەمت داخە، خوێڕی دەمپیسی جنێوفرۆش!

گانیا ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا بوو، ئازای دەلەرزی، بەڵام خامۆش و بێدەنگ بوو. هیپولیت هەڵوەستەیەکی کرد، بەوردی و خۆشحاڵی ڕوانییە گانیا، زۆری پێخۆش بوو کە بەو شێوەیە پە شۆکابوو. ئەوسا نیگای گواستەوە بۆ ڤاریا، بزەیەکی بۆ کرد، سەرێکی بۆ دانەواند و بە بێدەنگی وەدەر کەوت. گاڤریلا ئاردالیونوفیچ، نەهەقی نەبوو گلەیی لە بەخت و نێوچەوانی خۆی بکات، بە کەسەرەوە بە ژوورەکەدا کەوتە هاتوچۆ.

ڤاریا، تا ماوەیەک زاتی نەکرد هیچ قسەیەکی دەگەڵ بکات، تەنانەت تەماشایەکیشی نەکرد. ئەنجام گانیا چووە بەر پەنجەرەیەک و پشتی کردە

خوشکەکەی. ڤارڤارا بیری لەوە دەکردەوە کە کەس نازانێ چارەنووسی بەشەر بە کوێ دەگات. ئەو پەندە ڕووسیەی بیر کەوتەوە کە دەڵێت: "هەر دار عاسایەک دوو سەری هەیە". ڕێک لەم کاتەدا، دووبارە لەسەرێ ڕا هەراو هەنگامەو، دەنگە دەنگ، بەرز بووەوە.

گانیا، کە هەستی کرد خوشکەکەی لەسەر کورسییەکە هەستا، لەپڕ ئاوڕی لێدایەوە و گوتی:

- دەڕۆیت؟ بوەستە: تەمەشایەکی ئەمە بکە!

بەرە و لای ڤارڤارا چوو، پارچە کاغەزێکی قەدکراوی نامە ئاسای فڕێدایە سەر کورسییەکەی بەردەمی. ڤاریا، بە سەرسامی دەستی هەڵبڕی و گوتی:

- پەنا بە خوا!

نامەکە دەقاودەق حەوت دێڕ بوو، حەوت دێڕی تەواو: "گاڤریلا ئاردالیونوفیچ، من لە نیاز پاکی و دڵسۆزی تۆ بەرانبەر بە خۆم دڵنیام. بۆیە قەرارم داوە، سەبارەت بە بابەتێک کە بۆ من گرینگ و بایەخدارە، پرس و ڕاوێژت پێ بکەم. حەز دەکەم سبەی بەیانی، سەعات حەوت، لای تەختە کەسکەکە. بتبینم. لە ماڵی ئێمەوە نزیکە، ڤاریا ئاردالیونوڤنا، کە دەبێ لەگەڵتابێ، ئەو شوێنە باش پێدەزانێ. ئا. ی."

ڤارڤارا ئاردالیونوڤنا، بە سەرسامی دەستەکانی لێک بڵاوکردنەوە و گوتی:

- بنیادەم سەر لە کاری ئەم کیژە دەرناکات! گانیا، هەرچەندە حەزی نەدەکرد خۆی بنوێنێ و بە زەقی خۆی بە سەرکەوتوو بزانێ، بەڵام نەشی دەتوانی شادمانی خۆی بە تەواوەتی بشارێتەوە، بە تایبەتی دوای ئەو پێشبینییە کوشندەیەی کە هیپولیت بۆی کردبوو. بزەیەکی پڕ غرووری شادمانی سیمای ڕووناک کردبووەوە. ڤاریاش کە خۆشی لێدەباری، گوتی:

- یانی کاتی نەدۆزییەوە ڕۆژی نیشانەکردنەکەی نەبێ! دەیسا ئەگەر دەتوانی هەوڵ بدە بزانە چی دەوێت!...

گانیا پرسی:

– بە ڕای تۆ، دەیەوێ سبەینێ باسی چیم لەگەڵدا بکات؟
– ئەمە گرینگ نییە. گرینگ ئەمەیە دوای شەش دانە مانگ، بۆ یەکەم جارە کە دەیەوێ تۆ بدینێ. گوێ بگرە گانیا، مەسەلەکە چییە و چۆن دەبێ و چۆن دەکەوێتەوە، ئەمە بە جێی خۆی، تۆ دەبێ چاک بزانی کە ئەمە شتێکی "گرینگە" یەجگار گرینگە. وشە دەوری خۆی دەبینێ، ئەم جارە نەپەشۆکێی. قسەی هەڵەق و مەڵەق نەکەی. شەرمیش نەتگرێ. چاوت بکەوە! تۆ بڵێی ئاگلایا پەی بەوە نەبردبێ کە لەم شەش مانگەدا بۆچی ئەوەندە هاتوچۆم کردوون؟ تەسەور دەکەی ئەمرۆکە هیچی دەربارەی ئەم دیدارە بە من نەگوت: بە ئاماژەش ئاماژەی بۆ نەکرد! دەزانی من بە دزی پیرەژنەوە، لە دەرگای پشتەوە چوومە ژوورێ. نەمهێشت پیرەژن پێ بحەسێت، ئەگەر بیزانیبا لەوە بوو دەرم بکات. هەڵبەتە من لەبەر خاتری تۆ ئەم ڕیسکەم کرد. دەمویست بە هەر جۆرێ بووە بزانم کە...

دووبارە، لە قاتی سەرەوە، دەنگی هەراو هەنگامە بەرز بووەوە. ئەوسا، دەنگی پێی چەند کەسێک کە بەهەشتاو لە قاڵدرمەکەوە دەهاتنە خوارەوە، هاتە گوێ.

ڤاریا، پەشێوو پەرێشان، بەتووڕەیی گوتی:
– نابێ ئێستا ڕێ بەم فەرتەنە و ئاژاوەیە بدەین. نابێ هیچ فەزیحەتێک ڕووبدات! برۆ بۆ لای ئاشتی بکەوە و داوای بوردنی لێبکە!

لێ سەرگەڤاری خێزان گەیشتبووە سەر جادەکە. کولیاش کە جانتاکەی بۆ هەڵگرتبوو، لە دووی بوو. نینا ئەلکسندروفنا لە سەر قاڵدرمەکانی بەر دەرگا وەستابوو، لەزگ بوو سەری بە هەنسکانەوە هەڵکەندرێ، کوڵی گریانی لە جۆش نەدەکەوت. ویستبووی دووی جەنەڕاڵ بکەوێ، لێ پتیتسن پێشی گرتبوو و پێی دەگوت:
– لەدووی مەچۆ، شێلگیرتر دەبێ. هیچ شوێنێ نییە بۆی بچێ، لە زەرفی نیو سەعاتێکا دەیگێڕینەوە. من لەم بارەیەوە قسەم دەگەڵ کولیا کردووە. وازی لێ بێنە، با کەمێ شێتبازی بکات.

گانیا، لە یەکێک لە پەنجەرەکانەوە هاواری لێکرد:




- ئەم بەزمە چییە دەستت داوەتێ؟ بۆ وادەکەیت؟ ئاخر بۆکوێ دەڕۆی؟ خۆ هیچ شوێنێکت نییە!

ڤاریاش هاواری کرد:

- باوکە، بگەڕێوە! ئاخر دراوسێکان گوێیان لە دادو فریادمان دەبێ!

جەنەڕاڵ، ڕاوەستا، ئاوڕی پاشەوەی دایەوە، دەستێکی ڕاکێشا و گوتی:

- نەفرەت لەم ماڵە!

گانیا، پەنجەرەکەی توند داخست و کەوتە خوتەخوت:

- دەیەوێ تەمسیل بکات!

دەرودراوسێکان هەموو گوێ قووڵاغ وەستابوون. ڤاریا، بەهەشتاو لە ژوورەکە وەدەر کەوت.

هەر کە ڤاریا، وەدەر کەوت، گانیا نامەکەی لەسەر مێزەکە هەڵگرت، ماچێکی کردو، بە زمان چەقەنەیەکی لێداو لە خۆشیاندا پێی بە عاردی نەدەکەوت.

پەراوێز:

* ..˝ -. یاروشکا..˝ سووکەڵە ناوی (یاروم) کە بە فەرەنسی (جیروم)ی پێ دەگوترێ.

* - ˝کاپیتوشکا..˝: سووکەڵە ناوی (کاپیتون)ە.

**فەسڵی سێیەم**

ئەگەر ئەم فەزیحەت و فەرتەنەیەی کە ژەنەڕاڵ نابوویەوە، لەوەختێکی دیدا بوایە، زۆر بەئاسانی دادەمرکایەوە. خۆ پێشتریش دووچاری ئەم جۆرە سەرهاتانە بووبوو، بەڵام بە شێوەیەکی کەمتر، زیاتر کەسێکی لاشەڕی، هێمنی، بێوەی و دڵپاک بوو، دەیان جار هەوڵی دابوو، خۆی لەم وەزع و ڕەوشە نالەبارەی، کە لەم ساڵانەی دواییدا دووچاری بووبوو وخۆی پێوەگرتبوو، ڕزگار بکات. لەناکاوا بیری دەکەوتەوە کە "سەرگەڤاری خێزانە". دەگەڵ هاوسەرەکەیدا ئاشت دەبووەوە، بەکوڵ دەگریا. تا ڕادەی پەرستن، ڕێزی نینا ئەلکسندروفنای ها وسەری دەگرت، چونکە ئەم ژنە، کڕوکپ، بێ هیچ خوتە و بۆڵەیەک، چاوپۆشی لە کارو کردەوە دزێو و ناشیرینەکانی دەکرد. بەو هەموو بەدکرداری و بەدخودییەوە کە خۆی کردبوو بە مەخسەرە و گەپجاڕ، هێشتا هەر خۆشی دەویست، دەگەڵی میهرەبان بوو، بەڵام هەوڵی پیاوانەی جەنەڕاڵ بۆ تەرککردنی ئەو خووە خراپانەی، زۆری بڕ نە دەکرد. ئەویش لەچاو خۆیا زوو هەڵدەچوو، بەرگەی ژیانی تۆبەکاری و بێکاری ناو ماڵ و منداڵی نەدەگرت و ئیدی دەیدایە تانی سەرکێشی و یاخیگەریتی. ئیدی لەو کاتانەدا هێندە توڕە دەبوو، وەک دەڵێن دۆو دۆشاوی تێکەڵ دەکرد، لە توڕەییدا چاوی





دەپەڕینە تۆقی سەری، زۆر ئاسایی هەر لە هەمان ساتدا ژێوان دەبووەوە، بەڵام چاری خۆی پێنەدەکرا، دەرەقەتی خۆی نەدەهات. ئیدی کە ئەو حاڵانەی لێدەهات، شەڕی بە کەسوکارەکەی دەفرۆشت، زمانی دەکرایەوە، ئەوەی دەیگوت نەی دەگوتەوە، داوای شتی مەحاڵی دەکرد، دەیویست لە رادە بە دەر ڕێزی بگرن، داوای مەحاڵی دەکرد، سەرەنجام لە ماڵ دەبڕا، ون دەبوو، جاری وا هەبوو، بۆ ماوەیەکی زۆر دیار نەدەما. دوو ساڵێک بوو، ئاگای لە ماڵ و منداڵ نەمابوو، مەگەر بە بیستن شتێکی لەمەڕ کاروباری ماڵ ببیستبایە، دەنا بە دیتن ئاگای لە هیچ نەبوو، چونکە بە تەواوەتی دەستی لە کاروباری ماڵ بەڕێوەبردن و خێزانداری هەڵگرتبوو و تاقەتی لەو کارانە چووبوو، بەڵام فەزیحەت و گەندەکاریەکەی ئەم جارەی جەنەڕاڵ ئاسایی نەبوو. دیار بوو شتێک ڕووی دابوو، هەموو پێیان دەزانی، بەڵام کەس زاتی نەدەکرد باسی بکات، گەنگەشەی لەسەر بکات. جەنەڕاڵ، هەمووی سێ ڕۆژ بوو بە "فەرمی" گەڕابووەوە بۆ ناو خێزانەکەی، یانی گەڕابووەوە بۆلای نینا ئەلکسندروڤنا! بەڵام بە پێچەوانەی جارەکانی پێشوویەوە، لەجیاتیی ملکەچی بنوێنێ و پەشیمانی دەرببڕێت، ئەم جارەیان زۆر جینگن، بەدخوو، بە بیانوو، زۆر بڵێ، نیگەران، بێ ئۆقرە و هەڵچووبوو، هەر کەسێکی دەستکەوتبا، بە قسەوە دەیگرت، سەرەتا زۆر بەجیددی سەری باسێکی جیددی دەکردەوە و پاشان هێرشێکی ناڕەوای دەکردە سەر بەرانبەرەکەی. ئەو بابەتانەی باسی دەکردن، هێندە جیاواز و لێکدژ بوون، مەحاڵ بوو گوێگر بزانێ ئەم پیاوە دەیەوێ چ بڵێ، لەوساتەدا چی لە زەین و بیردا دەگوزەرێ، ئەم نیگەرانی و پەرێشانیەی لەپای چییە. هەندێ جاری کەمی لێدەرچێ کە تۆزێک وەخۆدەهاتەوە، هێور دەبووەوە و کەمێک کەیفی سازدەبوو، دەنا زۆربەی کات، بەبێ ئەوەی بەخۆیشی هۆیەکەی بزانێت، توند خوو و حەواسپەرت بوو. لەپڕ سەری حیکایەتێکی دادەمەزراند، بۆ نموونە دەربارەی: ماڵباتی یەپانچین، میرزادە، لیبدیف، ئەوسا لەپڕ بێدەنگ دەبوو، تاقە یەک وشەی دیکەی لە زار نەدەهاتە دەر. کە یەکێک پرسیاری پاشماوەی حیکایەتەکەی لێکردبا، بزەیەکی سارد و بێ

مانای بۆ دەکرد و هیچی تر، لە تۆ وایە هەر پرسیاریشی لێنەکراوە. دوێشە و تـا بـەیانی هـەر ناڵاندوویـەتی، نینـا ئەلکسـندروڤنا، تـا بـەیانی شـەکەت و مانـدوو بـە دیـاریەوە ئێشـک دەگرێـت و زامـەکانی تیمـار دەکـات و شـتی گەرمی لێدەنێ و دەبەستێ. جەنـەڕاڵ، لـە بەرەبەیانـدا، لـەپڕ خەو دەیباتەوە، دوای چوار دانـە سـەعات. بـەدەم مۆتـەکە و کابووسـەوە، پەشێوو پەرێشـان لەخەو هەستابوو و بەوە شکابووەوە کە دەگەڵ هیپولیتدا بەشـەڕ هـاتبوو و "نەفرەتی لەو ماڵە"کردبوو. لە ماوەی ئەم سێ ڕۆژەدا، هەستیان پێ دەکرد، کە زۆر هەستیار و بەد مەجاز بووە، هەمیشە خەمبار و دڵشکا و دیـار بـوو، وەکو یـەکێک لـە کبریـای درابـێ، بە بچووکترین شت ئەزیـەتی دەخـوارد و تـووڕە دەبـوو. کولیـا دایکـی دڵنیـا کـرد کـە ئـەم خـەمینی و بـەد مەجازیـەی (بـابی) دەگـەڕێتەوە بـۆ ئەوەی کـە لـە مـەیخواردنەوە بـڕاوە، ڕەنگـە لەبـەر دووری لە(لیبـدیف)ش بـێ کـە لەو دواییانـەدا زۆر موتـووی بووبـوو و دۆسـتایەتییەکی سـەیری لەگـەڵ گرتبـوو. بەهـەرحاڵ سـێ ڕۆژ لەوەپـێش دەگەڵ لیبدیفدا، بە شـەڕ هـاتبوون. ئیدی جەنـەڕاڵ، بەوپـەڕی تـوڕەیی جێی هێشتبوو. تە نانەت جۆرە دەم بۆڵەیـەکی دەگـەڵ میرزادەشـدا بووبـوو. کولیـا داوای لـە میـرزادە کردبـوو هـۆی ئەو شـەڕەی بـۆ ڕوون بکـاتەوەو، ئاقیبـەت هەستی کرد کـە میـرزادە شـتێکی لێدەشـارێتەوە و نـایەوێ پێـی بڵـێ. ئەگـەر وەکو گانیا بە دڵنیاییەوە تەسـەوری دەکـرد و دەیگـوت گفتوگۆیـەکی تایبـەتی لـەنێوان هیپولیـت و نینـا ئەلکسـندروڤنا ڕووی دابـوو، باشـە عەجایـەب ئـەم کابرا کینەکێش و فیتنەیە کە گانیـا ڕووبـەڕوو پێـی گـوت دووزمانـە، هـەر بۆ خۆشی خۆی، هەر بۆ کەیفی دڵی خۆی ئەم مەسەلەیەی بە کولیـا نـەگوتبوو! دیارە دەبێ هیپولیت ئەو کوڕێژگە بـەد خـواو ڕکونییـە نـەبووبێ کـە گانیـا بۆ خوشـکەکەی بـاس کردبـوو، دەبـێ جـۆرە شـەڕەنگێزی و بـەدخوویی و بـەد نیهادیەکی دیکـەی لـە دڵ و دەروونـدا هـەبووبێ. جا ئەگـەر هیپولیـت شـتێکی بـە نینـا ئەلکسـندروڤنا گـوتبێ، مــەرج نییــە مەبەسـتی ئەوە بـووبێ "دڵـی بڕەنجێنێ"و سوێی بکاتە دڵەوە. با ئەوەش لـە بیر نەکـەین، وەختـێ بمـانەوێ بچینە بنجوبناوانی ئەنگێزەی کارەکانی مرۆڤ و بخوازین هـەڵی بسـەنگێنین،

دەبینین زۆر لەوە ئاڵۆزتر و گۆنگ تره کەوێنای دەکەین. زۆر زەحمەتە بگەینە بنجوبناوانی.. هەندێ جار باشترین کار بۆ حیکایەتخوان و گوتیار(راوی) ئەوەیە، ڕووداوەکان بە ڕووتی و وەکو خۆیان بگێڕێتەوە. جا ئێمە لە ئێستا بە دواوە هەمان ڕێگە و شێواز دەگرینە بەر بۆ گێڕانەوەی ئەم بەڵایەی کە هەنوکە جەنەڕاڵی تێکەوتووە و پێوەی دەناڵێنێ و ژیانی یەکسەر سەراوبن کردووە. ڕاستە ئێمە تا ئێستا لە چیرۆکەکەماندا دریغیمان دەرهەق بەم قارەمانە پلە دووە نەکردووە، بەڵام هەست دەکەین چارمان ناچارە دەبێ لە ئێستا بە دواوە بایەخی زیاتری بدەینێ، جا حاڵ و حیکایەتەکەی بەڕێز بەم جۆرە بوو:

لیبدیف، کە بۆ تاقیبی فردیش چینکۆ، بۆ پترسبۆرگ چووبوو، لە هەمان ڕۆژا، دەگەڵ جەنەڕاڵدا، بۆ پافلوفسک، بۆ ماڵ، گەڕایەوە. هیچ شتێکی تایبەتی بە میرزادە نەگوت. لە هیچ شتێکی ئاگادار نەکردەوە. میرزادەش، لە ڕادەبەر مژول و سەرقاڵ بوو، بە خەمی خۆیدا کەوتبوو، دەنا ئەگەر ئەوەندە سەرقاڵ نەبوایە، هەستی بەوە دەکرد کە لیبدیف هەرچەندە دوو ڕۆژ بوو گەڕابۆوە و هیچ هەواڵێکی بەو نەدابوو، خۆیشی لێ دوور دەگرت و دەدزییەوە. کاتێ میرزادە ئاقیبەت هەستی بەم ساردی و دوورە پەرێزییە کرد، زۆری پێ سەیر بوو، چونکە بیری کەوتەوە کە لە ماوەی ئەو دوو ڕۆژەدا هەرجارێ بە ڕێکەوت لیبدیفی دیتبوو، زۆر بە کەیف و بە دەماخی دیتبوو، هەمیشە دەگەڵ جەنەڕاڵدا دیتبووی. وەکو دوو هاوڕیی گیانی بە گیانی لێکدی جیا نەدەبوونەوە. میرزادە، هەندێ جار. گوێی لێیان دەبوو کە لە قاتی سەرەوە، لە سەر ژوورەکەی ئەوەوە، بەدەم قسانەوە، بەدەم گفتوگۆ و گەنگەشەی گەرموگوڕەوە. شادو بە کەیف، لە قاقای پێکەنینیان دەدا. تەنانەت شەوێکیان، درەنگانێکی درەنگ، دەنگی ئاواز و سترانێکی چاوەڕوان نەکراوی هاتە گوێ، لەو ئاواز و گۆرانیانەی کە سەربازان بەدەم خواردنەوە و سەرخۆشییەوە دەیڵێن، یەکسەر دەنگە گرو گیراوەکەی جەنەڕاڵی ناسییەوە، بەڵام دەنگەکە زوو دایە کزی و پاشان بە یەکجاری نەماو بڕایەوە. ئەوسا گفتوگۆ و گەنگەشەیەکی گەرموگوڕ و پڕ جۆش،

بەڵام بە ئاشکرا مەستانە، دەستی پێ کرد. گفتوگۆیەکە نزیکەی یەک دانە سەعات بەردەوام بوو. کەسێک گوێی گرتبا، بەئاسانی هەستی دەکرد کە جووتە هاوڕێی گیانی بە گیانی نهۆمی سەرەوە، دوای تۆزێک دەستیان لە ملی یەکدی کردو، یەکێکیان دەستی بە گریان کرد. ئەوجا لەپڕ، دەنگی شەڕێکی توند بەرز بووەوە و دوای کەمێک دامرکایەوە.

لەو ماوانەدا کولیا، زۆر خەمبار بوو، بە تەواوەتی چووبووە قاوغەکەی خۆیەوە. میرزادە بە ڕۆژ لە ماڵ نە دەمایەوە، دەچووە دەرەوە، هەندێ جار درەنگە شەوێکی درەنگ دەگەڕایەوە. هەموو جارێ پێیان دەگوت کولیا بە درێژایی ڕۆژەکە تاقیبی کردووە و هەواڵی پرسیوە، بەڵام کولیا کە میرزادەشی دیت، هیچ شتێکی تایبەتی پێ نەبوو بە میرزادەی بڵێ جگە لەوەی گلەیی ئەوە لە جەنەڕاڵ و ڕەفتاو ئەتواری ئێستای جەنەڕاڵ بکات و بڵێ زۆر " لێی پەست و ناڕازیە ". بڵێ "ئەو جووتە، موتووی یەکدی بوون، بە ناو ڕێگاو بانان کەوتوون، لە بارێکی ئەو نزیکانە دەخۆنەوە، لە ناوەندی شەقامەکاندا، دەست لە ملی یەکدی دەکەن، یەکتر ماچ دەکەن، دوای تۆزێ بە بەرچاوی خەڵکییەوە لێیان دەبی بە شەڕ و بە جنێوان یەکدی دادەبێژن، بە یەکدیدا هەڵدەگژێن، ناشتوانن لێکدی جیاببنەوە".

کە میرزادە گوتی ئەوە شتێکی تازە نییە و پێشتریش هەر وا بووە و ئەمە دووبارە کردنەوەی کردەوەکانی پێشوویەتی. کولیا نەیتوانی هیچ پاکانەیەک بۆ ئەم نیگەرانییەی ئێستای خۆی سەبارەت بە بابی بێنێتەوە.

بۆ بەیانی شەوی گۆرانیە سوپایەکە و شەڕەکە، لەکاتێکا میرزادە، لە دەوروبەری سەعات یازدەدا لە ماڵ دەچووە دەرێ، لەناکاوا جەنەڕاڵ لە بەردەمیا قوت بووەوە، یەجگار پەشێو پەرێشان بوو، بە ئەندازەیەک هەڵچووبوو، دەلەرزی

- لیون نیکولایوفیچی بەڕێز، ماوەیەک بوو لە دەرفەتێک دەگەڕام کە بە دیداری جەنابت شەرەفمەند ببم. بەڵێ، دەمێکە، زۆر دەمێکە..

جەنەڕاڵ، بەدەم ئەو قسانەوە لە کاتێکا بە جۆرێ دەستی میرزادەی دەگوشی لەزگ بوو قامکەکانی بشکێنێ، لە سەری ڕۆیشت:

- زۆر زۆر دەمێکە.

میرزادە خولکی کرد کە دانیشێت.

- نا، دانانیشم. تۆ لە سەر دەرچوونی، نامەوێ مەحتەلت بکەم. جارێکی دی دێمەوە. پێم وایە هەقی ئەوەم هەیە پیرۆزبایت لێ بکەم... کە بە ئاواتی دڵی خۆت گەیشتی..

-مەبەستت کام ئاواتە؟

میرزادە شپرزە بوو. وەکو زۆر لەو کەسانەی کە لە هەمان وەزع و حاڵی ئەودان، وایدەزانی هیچ کەسێک، هیچ شتێک ی نەدیتووە و نەزانیوە و و نەبیستووە.

جەنەڕاڵ گوتی:

- دڵنیابە، خەیاڵت ڕەحەت بێ! ئەرخەیان بە! بەتەمانیم هەستی ناسکت بریندار بکەم، خۆم لە هەست و سۆزی ناسک و هەستیاری تۆ هەڵقورتێنم، خۆم بەو حاڵەدا تێپەڕیووم، دەزانم نابێ، کەس وەکو دەڵێن، خۆی لە شتێک هەڵقورتێنێ کە کاری وی نییە، کە پەیوەندی بەوەوە نییە! من هەموو بەیانیەک ئەمە حاڵمە، بەم حاڵەوە دەناڵێنم. میرزادە، پیاو ڕاست بڵێ من بۆ کارێکی دی هاتووم، کارێکی گرینگ، کارێکی زۆر گرینگ میرزادە گیان.

میرزادە، دووبارە خولکی دانیشتنی کردەوە و بە خۆی دانیشت تا ئەویش لە ڕوو دانەمێنێ و چاو لەو بکات.

جەنەڕاڵ گوتی:

- قەیدی نییە، یەک تۆز دادەنیشم.. من بۆ شیرەتێک هاتووم. ئاشکرایە کە من لە ژیانا ئامانجێکی پراکتیکی عەمەلیم نییە، بەڵام چونکە ڕێزی خۆمم لەلایە و حەیام بە خۆمەو، لەگەڵ ڕێزما بۆ ئەو گیانە پراکتیکیەی کە ڕووسیان بە گشتی لێی بێبەشن، گەرەکمە بۆ خۆم و بۆ ژنەکەم و بۆ منداڵەکانم... وەزع و حاڵێک فەراهەم بکەم بتوانین... بە کورتیەکەی، میرزادە هاتووم ڕێنوێنیەکم بکەیت...

میرزادە، زۆر بە گەرمی پیرۆزبایی ئەم نیاز و بڕیارەی لێ کرد. جەنەڕاڵ، قسەکەی پێ بڕی و لە سەری ڕۆیشت:

– ئەمانە هیچ نین. ئەلهەقی من لە دووی شتێکی گرینگترم. بڕیارم داوە گرێی دڵی خۆمت بۆ بکەمەوە لیون نیکولایوفیچ، چونکە تۆ پیاوێکی ساغ و ڕاستگۆیت، باوەڕی تەواوم بە جۆری بیرکردنەوە و نەجابەت و جوامێریت هەیە، چونکە... خۆ سەیرت بە قسەکانم نایەت، وانیە میرزادە؟

میرزادە، ئەگەر زۆریش سەرسام نەبووبێ، ئەوا گەلێک بەوردی و کونجکاوی دەیڕوانییە میوانەکەی، پیرەمێرد، بڕێک ڕەنگ بزرکاو بوو، هەندێ جار لێوی بەئاستەم دەلەرزی، دەستەکانی بە بەردەوامی دەلەرزین، هەمووی چەند دەقیقەیەک بوو ڕۆنیشتبوو، لەم ماوە کورتەدا دوو جار هەستاو دانیشتەوە، بەخۆیشی نەیدەزانی چ دەکات، ئاگای لەم شپرزەییەی خۆی نەبوو. چەند کتێبێک لەسەر مێزەکە بوو، بەدەم قسانەوە یەکێک لە کتێبەکانی هەڵگرت، کردیەوە. تەمەشایەکی ئەو لاپەڕەیەی کرد کە کردبوویەوە، ئەوسا بەلەز کتێبەکەی داخستەوە و لە جێی خۆی دایناییەوە. ئەوجا کتێبێکی دیکەی هەڵگرت، ئەمەیانی نەکردەوە، بەلام بە درێژایی کاتەکە هەر بە دەستی ڕاستیەوە بوو، بەدەم گفتوگۆکەوە، بەردەوام دەیجوولاند.

لەپڕ هاواری کرد:

– بەسە، با بڕۆم، لەوەدەچێ نارەحەتم کردبێت.

–نا، هەرگیز، نارەحەتت نەکردووم... تکادەکەم... قسەکەت تەواو بکە! بە پێچەوانەوە، بە دڵ گوێم لێگرتووی، سەراپام گوێیە، زۆر حەز دەکەم بزانم...

– میرزادە گیان، دەمەوێ پێگەیەکی ئەوتۆم هەبێ شایستەی ڕێز بم، سام و تام و حورمەتم هەبێ... دەمەوێ قەدری خۆم بکرمەوە. حورمەتی خۆم و... مافی خۆم.. بگرم...و

– کەسێک ئەمە نیازو مەرامی بێ، لە ئێستەوە شایستەی قەدرو ڕێزە.

میرزادە، ئەم ڕستە کورتە باو و بلاوەی لەو ڕوانگەیەوە بەکار برد کە قەناعەتی تەواوی بەوە هەبوو کاریگەرییەکی دەروونی زۆر باشی لە سەر جەنەراڵ دەبێت. بە تەبیعەت هەستی بەوە دەکرد، کە ڕستەیەکی وا بۆش و

بێ مانا، بەڵام لەگوێدا خۆش، ئەگەر لە کاتی گونجاو و لەباردا بەکار ببرێ، دەتوانێ ئۆخژن و ئارامی و دڵنیایی بە دڵ و دەروونی مرۆڤێکی وەکو جەنەڕاڵ ببەخشێت، بە تایبەتی ئەگەر لە حاڵێکی وەکو حاڵی ئەودا بێ. بەهەرحاڵ میرزادە، نەیدەویست میوانێکی وەکو ئەم میوانە بە بێ دڵنەوایی بەڕێ بکات.

جەنەڕاڵ، بە ڕاستی بەو ڕستەیەی میرزادە زۆر خۆشحاڵ بوو، دڵی نەرم بوو، هەست و سۆزی جووڵا، زۆر بە گەرموگوڕی و هێمنی دەستی بە قسان کرد. میرزادە هەرچەندە زۆر بەوردی گوێی بۆ ڕادێرا، بەڵام هیچ شتێک لە قسەکانی حاڵی نەبوو. جەنەڕاڵ زۆر بە گەرموگوڕی و بەپەلە دە دەقیقەیەک قسەی کرد، لە یەکێک دەچوو، ئەوەندەی قسە پێ بێ کەوشە فریای دەربڕینی نەکەوێت. ئەنجام ڕوندک کەوتە چاوانی، بەڵام هەر هەموو ئەو قسانەی کردنی، هیچیان بە سەر هیچەوە نەبوو، زنجیرەیەک قسەی چاوەڕوان نەکراوی هەلەق و مەلەق بوون کە هیچ پەیوەندییەکیان بەیەکەوە نەبوو، چۆن لەو کاتەدا بە زمانیا دەهاتن، گلی نەدەدانەوە.

جەنەڕاڵ، لەناکاودا هەستاو گوتی:

- بەسە! ئەوەندە بەسە! تۆ لە مەبەستم حاڵی بوویت و ئێستا هەست بە ئاسوودەیی و دڵنیایی و ئارامی دەکەم. دڵێکی وەکو تۆ، ناشێت لە مرۆڤێکی دڵ بەژان، دڵ بەسوێ تێنەگات. میرزادە گیان نەجابەتی تۆ، نەجابەتێکی نموونەیی و ئایدیالیە! خەڵکی لەچاو تۆدا چین؟ تۆ گەنجیت، من دووعای خێرت بۆ دەکەم، بەو دووعای خێرە بێ کە من بۆتی دەکەم. ئەوەی ڕاستی بێ من بۆیە هاتووم، تا داوات لێ بکەم کە سەعاتێکم بۆ گفتوگۆیەکی گرینگ بۆ دیاری بکەیت کە هیواو ئومێدێکی زۆرم بەم گفتوگۆیە هەیە. میرزادە من جگە لە دۆستایەتی و لێکحاڵی بوونی دڵان هیچی دیکەم ناوێ. من هەرگیز ڕۆژێ لە ڕۆژان دەرەقەتی داوایەکانی دڵم نەهاتووم.

میرزادە گوتی:

- باشە بۆ ئێستا قسان نەکەین؟ من ئامادەم گوێت لێبگرم...

جەنەڕاڵ، بە توندی قسەکەی پێبڕی:




- ئێستا نا! چونکە ئێستا! من ئێستا لە حاڵێکی خەوناسادام! مەسەلەکە زۆر گرینگە، زۆر گرینگ! چونکە ئەو سەعاتەی کە قەرارە گفتوگۆی تیا بکەین، چارەنووسی منی پێوە بەندە. چارەنووسی من وەستاوەتە سەر ئەو سەعاتە گفتوگۆیە. ئەو سەعاتە سەعاتی "من"دەبێ، حەز ناکەم لە ساتێکی پیرۆزی وەکو ئەو ساتەدا کەسێک بێت بە سەراو قسەکەمان پێببڕێت. یەکەم کەسی بێ چاوو ڕوو، ڕووقایم، بێت و قسەکەمان پێببڕێت.

لێرەدا جەنەڕاڵ، سەری وەپەنا گوێی میرزادە نا، بە چپەیەکی سەیر و نهێنیئامێزەوە، بەمەیلەو ترسێکەوە گوتی:

- ڕووداریێکی بێحەیا کە ناکاتە پاژنەی... پاژنەی پێڵاوەکانی تۆ، ئاهـ میرزادە گیان! ناڵێم "پێڵاوەکەی من". ملاحەزە بفەرموو: من باسی پێڵاوەکەی خۆم ناکەم، چونکە لەوە پتر ڕێزو حورمەتی خۆم لەلایە کە ڕاستەوخۆ و بێ پێچە بە دەورە ناوی پێڵاوی خۆم بێنم! بەڵام هەر تۆ لەوە دەگەیت کە من بێزم نایەت ناوی پێڵاوەکەی خۆم ببەم، گەرەکمە شەخسیەتی خۆم بنوێنم. تەنیا تۆ لەمە حاڵی دەبیت، "ئەو" "بە تایەبەتی" لەمە ناگات، میرزادە گیان "ئەو" هیچ شتێک تێناگات. ئەو و تێگەیشتن کوجا مەرحا! . کەسێک دەتوانێ تێبگات کە خاوەن دڵ بێ.

میرزادە، لە کۆتایی ئەم دەردە دڵەدا، هەستی بە جۆرە نیگەرانییەکی ترسامێز کرد، قایل بوو کە سبەینێ لە هەمان کاتدا جەنەڕاڵ ببینێ. جەنەڕاڵ، بەدڵی خۆش و لەشی سووک وخەیاڵی ئاسوودەوە، ڕۆیشت. میرزادە لەنێوان سەعات شەش و حەوتی ئێوارەدا، پەیامێکی بۆ لیبدیف نارد کە سەرێکی بدات.

لیبدیف، زۆر بەپەلە هات، کەوەژوورکەوت گوتی "گەورەییە" بۆ ئەو کە بە دەنگی میرزادەوە بێت و لە خزمەتیا بوەستێ. بە هیچ جۆرێ خۆی نەبردە ئەو بارەی کە لە زەرفی ئەم سێ ڕۆژەدا، بەئانقەست خۆی لە دیداری میرزادە دوورە پەرێز دەگرت.

لیبدیف، بەدەم بزەیەکی دەستکردەوە، لە قەراخ کورسییەک دانیشت، جۆرە مەراییەکی دەستکرد بە سیمایەوە دیار بوو، چاوە چکۆلەکانی خەندان، بەڵام کونجکاو بوون، دەستەکانی هەڵدەگلۆفتن، خۆی وەکو

کەسێکی زۆر ساویلکە دەنواند، کە چاوەڕوانی گفتوگۆ و هەواڵێک بێ کەلای هەمووان ئاشکرا بووبێ و ئەمیش لە مێژبێ چاوەڕوانی بێ.

میرزادە بەم ڕەفتارەی لیبدیف ناڕەحەت بوو. دیار بوو هەموو ئەوانەی دەوروبەری بۆنی شتێکیان کردبوو، چاوە چاوی ئەوە بوون، پیرۆزبایی لێبکەن، قسەیەک بکەن، بزەیەک بکەن، شۆخی و سوعبەتێک بکەن. کیللەر، لە ماوەیەکی کورتا سێ جار بەپەلە چووبووە دیدەنی، بە ئاشکرا دیار بوو بۆ پیرۆزبایی چووبوو، بەڵام هەرسێ جارەکە زۆر بە گەرمی سەری قسەی دادەمەزراند، بەتانی قساندا دەچوو، لەپڕ قسەکەی بە نیوە چڵی دەبڕی، هەڵدەستا و دەڕۆیشت. (ماەیەک بوو کیللەر، سەری کردبووە مەینۆشی وخەڵکی لە هۆڵێکی بلیاردا دەیانبینی کە لەخوت و خۆڕایی فەرتەنەی دەنایەوە.) تەنانەت کولیاش، وێڕی خەمباری و دڵتەنگی خۆی، دوو سێ جاران، هەوڵی دابوو، لە قسەکانیا ئاماژە بۆ ئەو لەگەز و مقۆمقۆیانە بکات.

میرزادە، بە ڕاشکاوی و، بە زمانێکی هەندێ بنجبڕ و، کەمێک تووڕە لە لیبدیفی پرسی کە ڕەئی بەرامبەر بەو وەزع و حاڵەی ئێستای جەنەڕاڵ و هۆی ئەو نیگەرانییەی کە تێی کەوتووە چیەو، زۆر بە کورتی دیدارە دووقۆڵیەکەی ئەو بەیانیەی خۆشیانی بۆ گێڕایەوە.

لیبدیف، بە سارد و سڕی بەرسڤی دایەوە:

- میرزادە، کەس بێ خەم نییە، هەر کەسە و خەمێکی هەیە! بە تایبەتی لەم سەردەمە سەیروسەمەرە و بەخەم ژانەی کە ئێمە تیای دەژین. هەر ئەوەیە و هیچی دی!

لیبدیف، ئەوەی گوت و، وەکو یەکێک ڕەنجا بێت و بەتەمای شتێک بووبێ و نە هاتبێتە دی، بەو ئاوایە بێدەنگ بوو.

میرزادە، بەدەم بزەیەکی تانە ئامێزەوە گوتی:

- کە قسەیەکی فەیلەسوفانەیە!

- فەلسەفە پێویستە. لە مەیدانی پراکتیکی و عەمەلیدا، بۆ ئەم سەردەمەی ئێمە زۆر پێویستە، بەڵام نەگبەتیەکە لەمەدایە کە خەڵکی گوێی نادەنێ، بەڵام میرزادەی بەڕێز، ئەگەر چی لەو مەسەلەیەدا کە بە خۆت دەیزانی،

متمانەی تەواوت بە من کرد، بەڵام ئەو متمانەیە لە سنووریکی دیاریکراودا بوو و لە سنووری هەلومەرجی ئەو مەسەلەیە دەرنەچووە.. من لەمە تێدەگەم و هیچ گلەییەکیشم نییە!

میرزادە گوتی:

- لیبدیف، لەوە دەچێ لەسەر شتێک لە من زیزبی، وایە؟

لیبدیف، دەستی خستە سەر سینگی و بە گەرمی گوتی:

- نا، هەرگیز، بە هیچ جۆرێ. میرزادەی بەڕێز، بەپێچەوانەوە. من دڵنیام کە من لە هیچ ڕوویەکەوە شایستەی ئەو متمانە بەرزە نیم کە تۆ پێت بەخشیم، نە لە ڕووی پێگەی کۆمەڵایەتیەوە، نە لە ڕووی زیرەکی و ئەخلاقیەوە، نە لە ڕووی ئەو سەروەت و سامانەوە کە پێکەوەم ناوە، نە لە ڕووی ڕۆشنبیرییەوە. شایستەی ئەو لوتفەی تۆم. جا ئەگەر بتوانم خزمەتێکی تۆ بکەم، وەکو نۆکەر و خوڵامێک خزمەتت دەکەم، هیچ مەبەستێکی دیکەم نییە. نا، من بە هیچ جۆرێ زویر نیم، بەڵکو خەمبارم.

- بەسە، بەسە لوکیان تیموفیوفیچ!

- ئەوە ڕاستیەکەیەتی! حاڵی حازر ئاوام. کە دەتبینم یان کاتێ لە دڵی خۆما بیر لە تۆ دەکەمەوە، بە خۆم دەڵێم: "من لیاقەت و شایستەیی متمانە و باوەڕی دۆستانەم نییە، شایستەی ئەوە نیم ئەوەی دۆستێک بە دۆستێکی دەڵێت، بە من بگوترێ، بەڵام وەکو خانەخوێیەکی تۆ دەشێت لە هەندێ شوێن و کاتدا، شایستەیی هەندێ شتم هەبێ، شایستەی هەندێ ڕێنوێنیان یان ئاگادار بوون لە هەندێ گۆڕانکاری نزیک و چاوەڕوانکراو بم"..

لیبدیف، بەدەم ئەو قسانەوە، چاوە چکۆلەکانی بڕیبوونە میرزادە، کە بە سەرسامی تەماشای ئەوی دەکرد. هێشتا هەر بەتەمابوو شتێک لە میرزادەوە بزانێ.

میرزادە، بە نیمچە تووڕەیەکەوە گوتی:

- لێت تێناگەم. نازانم مەبەستت چییە...

میرزادە بەدەم ئەو قسانەوە، لەپڕ بە ئاشکرا و لە ناخی دڵەوە لە قاقای پێکەنینی داو گوتی:

- لە ژیانما لە تۆ دووزمانتر و بە ئۆیێنترم نەدیوە.. کە فێڵبازی...

لیبدیف، یەکسەر، گوێ بە گوێی ئەو دەستی بە پێکەنین کرد. بە نیگا گەشەکانیا دیار بوو، کە ئومێد و خۆزیاکانی نەک هەر بوژانەوە، بە ڵکو زیاتریش بوون. میرزادە گوتی:

- لوکیان تیموفیوفیچ دەزانی دەمەوێ چیت پێ بڵێم؟ بەڵام زویر مەبە: من سەرم لە ساویلکەیی تۆ و خەڵکانێکی دیکە سووڕماوە! سەرم لەوە سووڕماوە کە بە خەیاڵی خاوی خۆتان، بەتەمان لەم کات و ساتەدا، من هەواڵێکتان بدەمێ، بەڵام کە من هەرچی سەردێنم و سەر دەبەم، هیچم پێ نییە پێتانی بڵێم، هەست بە شەرمەزاری دەکەم. جا من دڵنیاتان دەکەم، سوێندتان بۆ دەخۆم کە هیچم پێ نییە پێتانی بڵێم، باوەڕبکەن.

میرزادە، دووبارە پێکەنی.

لیبدیف، جۆرە سەنگینی و ویقار و هەیبەتێکی دەستکردی لە خۆی هێنا. ڕاستە هەندێ جار ساویلکە دەنوێنێ و فزوڵیەت و کونجکاوی خۆی ناشارێتەوە، بەڵام ئەمە بەو مانایە نییە کە پیاوێکی خاپینۆک و،بە فێڵ و دەهۆ و، لە بنەوەبڕ نەبوو. هەندێ جار زۆر فێڵبازانە دەمی خۆی دەگرت و وای دەنواند لە ئیجادی هەر کەمدوو بووە. ساردو سڕی و بێ مەیلی میرزادە کردبوویە کارێک، ئەم پیاوە، میرزادە بە نیمچە دوژمنێکی خۆی بزانێ، بەڵام کە میرزادە دەگەڵی نەرم نەبوو، ڕووی نەدەدایە، لەبەر ئەوە نەبوو کە ڕقی لێی بوو، بەڵکو لەبەر ئەوە بوو کونجکاوی و فزوڵیەتی لیبدیف، سەبارەت بە مەسەلەیەکی زۆر هەستار بوو. میرزادە، تا چەند ڕۆژێک لەمەپێش هەندێ لە خەون و خۆزیاکانی خۆی بە تاوان دەزانی، بەڵام لوکیان تیموفیوفیچ کە دەی بینی میرزادە، قسەی بۆ ناکات و ڕووی ناداتێ، ئەمەی وا لێکدەدایەوە کە گوایە نیشانەی ئەوەیە ڕقی لێیەتی، گومانی لێیەتی، بۆیە ڕەنجا بوو، حەسوودی و بەغیلی بە کولیا و کیللەر، تەنانەت بە کچەکەی خۆیشی، ڤیرا لوکیانوڤنا دەبرد. هەرچەندە دەیتوانی لەم ساتەدا هەواڵێکی گرینگ بە میرزادە بدات و لە ناخیشەوە حەزی دەکرد وا بکات، کەچی چارەی دا بە یەکا. دایە بێدەنگی و ورتەی نەکرد.

لیبدیف ئەنجام دوای بێدەنگییەکی کەم گوتی:

– میرزادەی بەڕێز، خێر بوو بە دووتا ناردبووم، خزمەتێکت هەبوو بۆتی ئەنجام بدەم؟

میرزادە، لە فکران ڕاچوو، ئەوسا گوتی:

– دەمویست باسی جەنەڕاڵ بکەم و باسی... ئەو دزییەی کە بۆت گێڕابوومەوە.

– کام دزی، دزی چی؟

– کورە دە بەسە، بۆچی خۆت لە گێلی دەدەی! بە ڕاستی لوکیان تیموفیوفیچ تۆ ئینسانێکی سەیری! ئەم تەمسیل و نواندنەت لە چییە و تاکەی؟ مەبەستم پارەکەتە... پارە... ئەو چوارسەد ڕۆبڵەی کە بە کیفەکەتەوەون بوو، دیار نەماو، بەیانی ئەو ڕۆژەی کە دەچوویت بۆ پترسبۆرگ، هاتیت بۆت باسکردم. ئێستا لە مەبەستم حاڵی بوویت؟

لیبدیف، هەنگێ بە دەنگێکی نزم، وەکو ئەوەی تازە لە مەبەستی میرزادە حاڵی بووبێ، گوتی:

– ئا... چوارسەد ڕۆبڵەکەت مەبەستە! زۆر سوپاست دەکەم میرزادە، کە خەمی منتە و لێم دەپرسییەوە، سوپاسی ئەم خەمخۆرییەت دەکەم، بۆ من مایەی شانازییە، بەلام... پارەکەم دۆزییەوە، ماوەیەکە!

– دۆزیتەوە؟ ها... دەی سوپاس بۆخوا!

– ئەو شوکرانەیەی جەنابت، نیشانەی دڵپاکی و خانەدانی خۆتە، چوارسەد ڕۆبڵ، بۆ بابایەکی هەژار، کە بە ڕەنجی شان پەیدای کردبێت و ڕەشە خێزانێکی بێ دایکی بە کۆڵەوەبێ، کەم نییە...

میرزادە، قسەکەی پێبڕی و گوتی:

– مەبەستم ئەمە نەبوو! هەڵبەتە پێم خۆشە کە پارەکەت دۆزیوەتەوە، بەلام... بەلام چۆنت دۆزییەوە؟

– زۆر بەئاسانی، لەژێر ئەو کورسیەدا دۆزیمەوە کە کۆتەکەمی بە سەرەوە هەڵواسرابوو. بێگومان دەبێ کیفەکە، لە گیرفانی کۆتەکەوە داخزی بێ و کەوتبێتە ژێر کورسییەکەوە.

– ژێر کورسی؟ مەحاڵە... خۆ تۆ پێت گوتم هەموو شوێنێکی بۆ گەڕاویت. ئیدی چۆن لەو شوێنە زەقەدا بەرچاوت نەکەوتووە؟

- بە ڕاستی ئەویٚ گەڕام. زۆر چاک لە بیرمە کە ئەویٚ گەڕام. تەنانەت بۆی کەوتمە سەر چوار چنگۆڵەش، هەر بە تەمەشاکردنەوە نەوەستام، دەستیشم بردە ژێر کورسییەکە، کورسییەکەشم جووڵاند و لابرد، دەستم بە ژێرەکەشیا گێڕا، چۆڵ و هۆڵ، ئەشتەبای لیٚ نەبوو. جارێکی دیکەش تەمەشام کردەوە. پیاو کە شتێک، شتێکی بەنرخ گوم دەکات و خەفەتی بۆ دەخوات و سوورە، لەسەر ئەوەی بیدۆزێتەوە، تووشی ئەو دڵەڕاوکیٚ و وازوازیە دەبێت. سوور دەزانیٚ ئەو شتەی کە بۆی دەگەڕیٚ لەو شوێنە نییە، کەچی پازدە کەڕەت هەمان شوێنی بۆ دەگەڕێتەوە.

میرزادە، بە سەرسامی، لەبن لێوانەوە گوتی:

- باشە... گریمان ئەمەوایە، بەڵام دەربارەی ئەمەی تۆ، چۆن شتی وا دەبێت؟... هەوەڵ جار گوتت پارەکە لەوێندەر نەبووە، کەچی دوایی لە هەمان شوێن دۆزیوتەتەوە! شتی وا چۆن دەبیٚ؟

- بەڵیٚ، لەپڕ لەوێندەر سەری هەڵدا.

میرزادە نیگایەکی گومانامێزی لیبدیفی کرد و لەپڕ لێی پرسی:

- ئەدی جەنەڕاڵ؟

لیبدیف، دووبارە خۆی لە گێلی دایەوە و گوتی:

- جەنەڕاڵ؟ مەبەستت چییە؟

- پەنا بەخوا! دەڵێم کاتیٚ جزدانەکەت (کیفەکەت) لەژێر کورسییەکەدا دۆزییەوە، جەنەڕاڵ چی گوت؟ خۆ ئێوە بە دوو قۆڵی ئەوێندەر گەڕابوون. وانییە؟

- بەڵیٚ یەکەم جار بە دووقۆڵی گەڕاین، بەڵام ئەم جارەیان هیچم پێنەگوت، هەر بەینی خۆمان بیٚ حەزم نەکرد پێی بڵێم کە جزدانەکەم دۆزیوەتەوە. هەر خۆم دۆزیومەتەوە.

- باشە... بۆ؟... پارەکە تەواو بوو، کەمی نەبوو؟

- کە جزدانەکەم کردەوە، تەمەشام کرد پارەکە خشت لە جێی خۆیەتی، تاقە ڕۆبڵێکی کەم نەبوو. میرزادە، کاس و حەپەساو گوتی:

- دەبوایە بەلای کەمەوە، من لەمە ئاگادار بکەیتەوە.

- حەزم نەدەکرد، ناڕەحەتت بکەم، تۆش کێشە و گرفتاریی خۆت هەیە،

ڕەنگــە کێشــەی گەورەش بــن. لــە لایــەکی دیــکەوەوام نوانــد کــە هــیچم نەدۆزیوەتەوە. پاش ئەوەی کیفەکەم کردەوە، پارەکەم ژمارد، دڵنیابووم کە کەمی نییە، ئیدی دامخستەوە و خستمە ژێر کورسییەکە.

- بۆ ئەم کارەت کرد؟

لیبـدیف، بەدەم تەوســخەنێکی کوتـوپڕەوە، دەسـتەکانی بـە خۆشـییەوە لێکدی هەڵسوون و گوتی:

- ئیدی بیرێـک بـوو هـات بـە مێشـکما، حـەزم دەکـرد بـزانم دوای ئەوە چ دەبێ، دەنا هیچ مەبەستێکی تایبەتیم نەبوو.

- یانی جزدانەکە لە پێرێوە لەژێر کورسییەکە کەوتووە؟

- نـە گیانـە، تـەنیا بیسـت و چـوار سـەعات لـەژێر کورسییەکە بـوو. گـوێ بگرە، حـەزم دەکرد، جەنـەڕاڵیش بیدۆزێتەوە. لـە دڵـی خۆمدا گوتم: کە مـن ئاقیبــەت دۆزیــمەوە، بــۆچی جەنــەڕاڵیش، ئەو شــتە زەق و دیــارە، کــە لــە دوورەوە هــاوار دەکــات و دەڵێـت ئەوەتـام وام لـەژێر کورسـییەکە، نـەبینێ! چەنـد جارێـک جـێ گۆڕکێم بـە کورسـییەکە کـرد، لام بـردو هێنـامەوە جێـی خۆی، بە جۆرێ کە کوێرێکیش بە کوێری خۆی هەسـت بـە کیفەکـەی ژێـری بکات، کەچی ئەو جەنەڕاڵە، ئێستاو ئەوسا هیچی بەدی نەکرد. ئەمـە شـەو و ڕۆژێکـی خایانـد، کـەچی هـیچ! هـەر دەتگـوت لەوێش نییـە. ئەو پیـاوە تەواو سـەتحی بـووە، نـازانم چییـەتی: قسـەم بـۆ دەکـات، جۆرەهـا حیکایـەتم بـۆ دەگێڕێتەوە، پێدەکەنێ، هەندێ جار لە قاقای پێکەنین دەدات، کـەچی لـەناکاوا، دەهری دەبێ، لێم تورە دەبێ، دۆ و دۆشاو تێکەڵ دەکات. نازانم بۆ! ئـەنجام لـە ژوورەکە وەدەر کەوتـین بەئانقەسـت دەرگاکـەم دانەخسـت. سـەیرم کـرد هەنـدێک دوو دڵـە، حـەزی لـێ بـوو شـتێک بڵـێ. دیـار بـوو کـە نیگـەرانی جزدانەکە و ئەو پارە مۆڵەی ناوی بوو، بەڵام بێ ئەوەی باسـی ئـەمـە بکـات، لـە پڕێکـا تـوڕە بـوو، سـووری سـوور بـووەوە. هـەر کـە گەیشـتینە سـەر شەقامەکە و چەند شەقاوێک ڕۆیشتین، لـە مـن جیابووەوە و بەلایـەکی دیـدا ڕۆیشت. ئیدی یەکمان نەبینییەوە تا شەوێ کە لە بارِدا یەکمان گرتەوە.

- ئەدی، ئەنجام جزدانەکەت لەژێر کورسییەکە هەڵگرتەوە؟

- نا، هەر ئەو شەوە، لەژێر کورسییەکەدا دیار نەما.

– ئەدی ئێستا لەکوێیە؟

لیبدیف، بەدەم قاقای پێکەنینەوە، نیگایەکی دۆستانەی میرزادەی کرد و گوتی:

– ئەوەتا... لێرەدایە. لەپڕ لەژێر ئەستەڕی کۆتەکەوە سەری دەرهێنا. تەمەشاکە. فەرموو ئەگەر دەتەوێ دڵنیابی، بە خۆت دەستی لێبدە.

قەراغی چەپی بنەوەی پاڵتۆکە، بە ڕادەیەک هەڵتۆقی بوو کە بەئاسانی هەستی پێدەکرا. ئەگەر پیاو دەستی لەو شوێنە بدایە، یەکسەر هەستی بە جزدانێکی چەرم دەکرد کە لە کونێکی گیرفانەکەیەوە داخزی بووە، ژێر ئەستەڕەکەی.

لیبدیف گوتی:

– دەرم هێناو تەمەشام کرد. پارەکە بە دەقی خۆیەوە مابوو، تاقە پولێکی کەم نەبوو. ئیدی خستمەوە هەمان جێگا و ئەوەتا لە دوێنێ بە یانیەوە بەو جۆرە پێمە و جارجاریش بەر لاقم دەکەوێ.

– کەچی هەر گوێی نادەیتێ؟ ناخۆش نییە؟

– نا، هەست بە هیچ ناکەم. ها ها! میرزادەی بەڕێز باوەڕبکە هەرچەندە ئەم مەسەلەیە ئەوە نایەنێ سەری جەنابتی پێوە بیەشێنم –بەڵام باوەڕبکە قەت گیرفانی من نەدڕاون، کەچی ئەم جارە لە شەوێکا ئەو کونەی تێبوو! کە بەوردی تەمەشام کرد لە تۆ وایە یەکێک بە قەڵەمبڕ دایدڕیوە. ناچێتە ئەقڵەوە، وانییە؟

– ئەدی... جەنەڕاڵ!

– دوێنێ و ئەمڕۆ، لە بەیانیەوە تا شەوێ هەر تووڕە بوو، تووڕە بوو ئەمما تورە، بەڵام کە خەیاڵ دەبێ و نەشەدەیگرێ ئیدی کەیفی ساز دەبێ، دەکەوێتە مداراو مجامەلە، زمانی دەپڕژێ و گۆرانی دەڵێت. بە ڕادەیەک هەستی ناسک دەبێتەوە خوڕ خوڕ ڕوندک بە گۆناکانیا دێتە خوارێ، کەچی لەپڕ شێت دەبێ، تورە دەبێ، لێی دەترسم. بە خۆت دەزانی من پیاوی شەڕ نیم. دوێنێ کە بەدوو قۆڵی لە بار بووین، بە ڕێکەوت داوێنی پاڵتۆکەم گرمۆڵە بوو و ئەویش بینی، ئیدی جەنەڕاڵ، بە تیلەی چاو تەمەشایەکی کرد، تورە بوو. ئێستا ماوەیەکە فێر بووە، ڕووبەڕوو تەمەشام ناکات،

مەگەر مەست و کەیف سازبێ، بەڵام دوێنێ دوو جار تەمەشای کردم، تەمەشای چی! ئاگر لە نیگای دەباری، باوەڕبکە تەزوویەکی سارد بە مۆرەغەی پشتما هاتووە. من بە نیازم سبەینێ جزدانەکە دەربێنم، بەڵام بەر لەوەی دەری بێنم، حەز دەکەم شەوێکی دیکەش پێی ڕابوێرم.

میرزادە هاواری کرد:

– بۆچی ئەوەندە ئەزیەتی دەدەی؟

لیبدیف، بە گەرمی گوتی:

– ئەزیەت؟ نا، میرزادە، ئەزیەتی نادەم! بە پێچەوانەوە خۆشم دەوێ، لە دڵەوە خۆشم دەوێ و ڕێزی دەگرم. باوەڕبکە، من ئێستا لە جاران خۆشترم دەوێ و ئیحتوبارێکی زیاتری لەلام پەیدا کردووە.

لیبدیف، بە ڕواڵەتێکی هێندە جیددی و ڕاستگۆیانە ئەو قسانەی کرد، کە میرزادە تەواو پەست بوو، لە لیبدیفی پرسی:

– ئەمە خۆشت دەوێ ئەو هەموو عەزابەی دەدەی، ئەگەر خۆشت نەویستبا چی؟ گوێ بگرە، کە جزدانەکەی بۆ لە شوێنێکی بەرچاو داناویەتەوە، یەکەم جار لەژێر کورسییەکە و دووەم جار لە پاڵتۆکەتدا، مانای وایە دەگەڵتا بە فێڵ نییە، بە ئاشکرا داوای بووردنت لێ دەکات. تێدەگەی؟ عوزر خوایی دەکا! مانای وایە بە ئومێدە کە بە لوتفی خۆت بیبەخشیت، باوەڕ و متمانەی بە دۆستایەتیت هەیە. ئیدی چۆن ڕێ بە خۆت دەدەی، مرۆڤێکی وا، بەو هەموو پاکی و ئەمانەتدارییەوە، بە ڕادەیەک عەزیەت بدەی کە خۆی لە بەرچاو بکەوێ؟

لیبدیف، بە چاوانی کراوەوە گوتی:

– میرزادەی ئابڕومەندو بە ڕێز! ئەی وەچاغزادە و خانەدان، تەنیا تۆ توانیوتە بەم هەموو ڕاستیەوە، بەم هەموو ئینسافەوە، قسە بکەیت، ستاییشی ئەو پیاوە بکەیت. هەر بۆیەش بەم ڕادەیە خۆشم دەوێی و خۆمت لەدەور دەگێرم، هەرچەندە من سەراپام گەندەکاریە، ئەوساش تا ڕادەی پەرستن خۆشم دەوێی! تەواو بڕیاری خۆم دا، هەر ئێستا جزدانەکە دەردێنم، نایخەمە سبەینێ. تەمەشاکە، ئێستا لە بەرچاوی خۆتا دەری دێنم. ئەوە پارەکەیە، یەک عانەی کەم نییە، فەرموو میرزادەی مەرد و ڕەند

بیگرە، با تا سبەینێ لای تۆبێ. سبەی یان دوو سبەی لێتی وەر دەگرمەوە. دەزانی میرزادە، دوورنیە ئەم پارەیە یەکەم شەو لە باخە چکۆلەکەی خۆماندا، کرابێتە ژێر بەردێکەوە، تۆ دەڵێی چی؟

- ئاگاداربە ڕاستەوخۆ و ڕووبەڕوو مەڵێ کە پارەکە دۆزراوەتەوە، مەیدە بە ڕوویا، بەڵام کارێکی وەها بکە، کە هەست بکات، ئەستەری پاڵتۆکەت هیچی تیانەماوە. بە تاڵ بووەتەوە، هەنگێ بە خۆی تێدەگات.

- تۆ وات پێ باشە؟ ئەدی چۆنە بڵێم جزدانەکەم دۆزیوەتەوە و وا بنوێنم پێشتر پێم نەزانیوە؟

میرزادە، بەدەم هزرینەوە گوتی:

- نا، باش نییە، تازە درەنگە. ڕەنگە زۆر خراتر بێت. باشتر وایە هیچ نەڵێی! دەگەڵیا میهرەبان بە، بەڵام... نابێ زۆر پێتەوە دیاربێ کە تۆ... دەورێکی پێشوەختە ئامادەکراو دەبینی،...و... و.. بە خۆت دەزانی...

-دەزانم، میرزادە، دەزانم. دەزانم کە ئەم کارە ناکەم، ئەم کارە بە من ناکرێت، چونکە کاری وا دڵێکی وەکو دڵی تۆی گەرەکە. ئەو حاڵی حازر زۆر بەد مەجاز بووە، لە خۆیەوە هەڵدەچێ. هەندێ جار لە بنی پێمەوە تا تۆقی سەرم بە نیگا دادەبێژێ، جارێ بەدەم هۆڕژنی گریانەوە باوەشم پێدادەکات و ماچم دەکات، جارێ دەمبوغزێنێ و بە ڕقەوە ڕەفتارم دەگەڵ دەکات... لە ساتێکی وەهادا بەئانقەست داوێنی پاڵتۆکەمی نیشان دەدەم تا بیدینێ... ها، ها! .. دەیسا خواحافیز میرزادە... پیموایە مەحتەلیشم کردیت، بە گوتەیەکی دی ناسکترین سۆزم شێواندیت...

- بەڵام بۆ خاتری خوا ئەم نهێنییە بپارێزە، وەکو چۆن پێشتر پاراستبووت.

- زۆر بە پارێزەوە ڕەفتار دەکەم، بەبێ خشپە.

هەرچەندە مەسەلەکە تەواو بووبوو، بەڵام میرزادە لە جاران نیگەرانتر بوو، بە پەرۆشەوە چاوەڕوانی سبەینێی دەکرد کە قەرار بوو جەنەڕاڵ بدینێ.

## فەسڵی چوارەم

قەراری دیدارەکەیان نێوان سەعات یازدە و نیو و دوازدە بوو، بەڵام میرزادە، لەبەر هۆیەکی چاوەڕوان نەکراو، دواکەوت. کە گەییەوە ماڵێ، سەیری کرد جەنەڕاڵ چاوەڕوانیەتی. لە یەکەم نیگاوە هەستی کرد جەنەڕاڵ پەستە، لەوە دەچوو پەستی ئەو چاوەڕوانییە زۆرەبێ.

میرزادە پۆزشی بۆ هینایەوە، بە لەزو ترس و سڵکردنەوەیەکی زۆر سەیرەوە، وەکو ئەوەی میوانەکەی چینییەکی شکستۆک بێ و خەمی ئەوەی بێ نەشکێت، دانیشت. بە عەمراتی بەرانبەر بە جەنەڕاڵ، هەستی بەو جۆرە ترسە نەکردبوو، هەر وێناشی نە دەکرد ئەو جۆرە هەستەی لا دروست ببێ. میرزادە هەر زوو بۆی دەر کەوت ئەو پیاوەی کە هەنوکە لە بەردەمیایە ئەوە نییە کە دوێنێ دیتبووی، زۆر جیاوازە: ئەو پیاوە ئاڵۆز و سڵۆک و سەراسیمەیەی جاران نییە، بەڵکو پیاوێکە بە سام و بە هەیبەت و ویقار، وەکو ئەوەی قەراری یەکجارەکی دابێت و نیازی ژێوان بوونەوەی نەبێت، بەڵام ئەم مەندی ومەنگییەی زیاتر ڕواڵەتی بوو تا واقیعی و ڕاستەقینە بێ. بەهەرحاڵ، ڕەفتاری جەنەڕاڵ سەنگین و قورس و لەبەردڵان و پڕ نەزاکەت بوو. بەرخوردی دەگەڵ میرزادەدا خاکیانە بوو، لە ڕەفتاری کەسانیک دەچوو، کە بە ناهەق و ناڕەوا لە غرووررو کبریایان درابێ و سووکایەتیان پێکرابێ، بە زمانێکی نەرم و دۆستانەی خەمامێز دەدوا.

ئەوجا بەدەم ئاماژەوە بۆ مێزەکەی بەردەمی، زۆر بەویقارەوە گوتی:

- ئەو گۆڤارەم بۆ هێناویتەوە کە ئەو ڕۆژە لیرە بردم.سوپاس.
- ئا، بەڵی، ئەو گوتارەت خوێندەوە جەنەڕاڵ؟ چۆن بوو بەلاتەوە؟ جوانە، ها؟

میرزادە زۆری پێخۆشبوو، کە ئەم دەرفەتەی بۆ قسەکردن بۆ ڕەخسا، قسەکردن لە بارەی شتێکەوە، کە هیچ بارگرژیەکی دەروونی یان سۆزداری لێنەدەکەوتەوە.

جەنەڕاڵ بەرسڤی دایەوە و گوتی:

- ڕەنگە جوان بێ، وتارێکی سەرنجڕاکێش بێ، بەلام زۆر خراپ نووسراوە، بێ ناوەڕۆکە، تەنانەت دەتوانی بڵێی سیخناخە لە درۆ.

جەنەڕاڵ، زۆر بە متمانەوە ئەو قسانەی دەکرد، لەوە دەچوو بەئانقەست، بەو هێواشیە قسان بکات.

میرزادە گوتی:

- بەڵێ، چیرۆکێکی زۆر سادەیە! سەربازێکی پیر کە بەخۆی، سوپای داگیرکەری فەرەنسای دیتووە، کە هاتووەتە ناو مۆسکۆ و لەوێندەر ئۆردوبەزی کردووە، ئیدی هەندێ شتی خۆش دەگێڕێتەوە. هەڵبەتە بیرەوەری شایەدحاڵ بایەخی گەورەی هەیە، ئیدی نووسەرەکەی هەر کێیەک دەبێ با ببێ. وانییە؟

- ئەگەر من لەجیاتیی سەرنووسەرەکە بام، ئەو نووسینەم بلاو نەدەکردەوە، بەلام سەبارەت بە بیرەوەری شایەدحالان، خەڵکی زیاتر باوەڕ بە کابرایەکی درۆزنی، فشەکەری، لەخۆبایی، بەلام لێزان و سەرگەرمکەر دەکەن تا بە پیاوێکی هێژای، شایستەی، بە سەنگ و ئیحتوبار. من هەندێک لە ڕووداوەکانی ساڵی ١٨١٢ دەزانم کە...

- میرزادە، من لێبڕاوم لێرە، لەم ماڵە بڕۆم – ماڵی ئاغای لیبدیف.

جەنەڕاڵ، بەدەم ئەو قسەیەوە، نیگایەکی مانادارى، بەسامی میرزادەی کرد.

میرزادە، کە تیامابوو، نەیدەزانی چی بڵێ، هەر هات بەزاریاو گوتی:

- شوێنی تۆ لە باڤلوفسکە لای... لە ماڵی کچەکەت.

لەو کاتەدا بیری کەوتەوە، کە جەنەڕاڵ بۆ مەسەلەیەکی گرینگ، مەسەلەیەک کە چارەنووسی (جەنەڕاڵ) پێوەی بەندە، هاتووە بۆلای ئەو تا ڕێنوێنییەکی بکات.

جەنەڕاڵ گوتی:

- لای ژنەکەم، یانی لە ماڵی خۆم و ماڵی کیژەکەم.

- ببورە: من...

- میرزادە گیان، من لە ماڵی لیبدیف نامێنم، دەڕۆم، چونکە پەیوەندیم دەگەڵی بڕیوە. دوێشە و دەگەڵی تێکچووم، مخابن کە زووتر ئەم کارەم نەکرد. من خۆمم خۆش دەوێ، حەز دەکەم ڕێزم بگیرێ، بە حورمەتەوە مامەڵەم لەتەکدا بکرێت، تەنانەت ئەوانەش کە دڵیان دەدەمێ، دڵی خۆمیان بۆ دەکەمەوە، دۆستایەتیان دەکەم، حەز دەکەم ڕێزم بگرن، دۆستایەتی بەڕێزەوە خۆشە. میرزادە، من زۆر جار دڵ بە خەڵکی دەدەم، متمانەیان دەدەمێ، بەڵام زۆربەی کات، هەست دەکەم فریوم خواردووە، بە هەڵە چووم. پەشیمانی حاسڵ دەکەم. ئەم پیاوە شایستەی دۆستایەتی من نەبوو.

میرزادە، بە پارێزەوە گوتی:

- ڕاست دەکەی، پیاوێکی هەندێ ڕەت بڵاوە، هەندێ سوخەتی هەیە کە... بەڵام دڵێکی میهرەبانی هەیە، بۆ حاڵی خۆی زیرەکە، هەندێ جاریش کەسێکی ڕوح سووک و خۆشەویستە.

ئەم قسە هەڵبژاردە و پڕ نەزاکەتانەی کە میرزادە بەکاری برد، ئەو زمانە نەرم و نیان و پڕ لە قەدر زانیە، سووکناییەکی تەواویان بەدڵ و دەروونی جەنەڕاڵ بەخشی. هەرچەندە هەندێ جار نیگایەکی گوماناوی تیژ تێپەڕی میرزادەی دەکرد، بەڵام حاڵەتی میرزادە بە ڕادەیەک ئاسایی و جیددی بوو کە هەموو گومانێکی لەلا دەسڕییەوە.

جەنەڕاڵ، دووبارە، دەستی بە قسان کردەوە:

- سەبارەت بەوەی کە خەسڵەتی باشیشی هەیە، من یەکەم کەسم کە دانم بەوەدا ناوە، کاتێ لێی نزیک بوومەوە و ویستم دۆستایەتی بکەم، لە





دڵی خۆدا گوتم هەڵبەتە لایەنی ئەرێنی خۆیشی هەیە. ئاخر خۆ من بە نان و ئاوی ئەونیم، نە پێویستم بە ماڵی ئەوە نە بەمیوانداری ئەو، چونکە بەخۆیشم ماڵ و حاڵ و خێزانی خۆم هەیە. من نامەوێ پاکانە بۆ خۆم بکەم و عەیب و عارەکانی خۆم پەردەپۆش بکەم. من پیاوێکی ئەوەندە ساڵح نیم. لە هەموو شتێکدا توندڕەوم، میانڕەوی نازانم. من بووم بە هاوپیاڵەی ئەم پیاوە، کە خۆزگە ئەو غەڵەتەم نەدەکرد! بەڵام تەنیا لە بەرخاتری مەشرووب نەبوو کە دۆستایەتیم دەکرد، (ببورە میرزادە کە بەم زمانە کاڵو کرچە قسان دەکەم، پیاوی دڵ بریندار لێی ناگیرێ!) بەڵکو دڵبەندی سوخەتە باشەکانی بووبووم، ئەو سوخەتانەی کە خۆت ئاماژەت کردنێ، بەڵام هەموو شتێک سنووری خۆی هەیە، وەک دەڵێن هەموو شتێ بەخوێ و خوێش بە مانا، تەنانەت سیفەتی باشیش. یانی ڕووقایمی بگاتە ڕادەیەک، بێ هیچ سڵکردنەوەیەک، بێ هیچ شەرمێک لە پڕو بە ڕاشکاوی بڵێ کە بە منداڵی، لە ساڵی ۱۸۱۲دا، پیی چەپی لە دەست داوە و لە گۆڕستانی ڤاگانکوفو* ی قەراخ مۆسکۆ ناشتوویەتی، ئیدی ئەم قسەیە لە تام دەردەچێ، نیشانەی بێ حورمەتیە، بەڵگەی ڕووداری و گوساخیە.

– ڕەنگە سوعبەتی کرد بێت، بۆ پێکەنین ئەو قسەیەی کردبێت.

– من لە مەبەستت دەگەم. درۆیەکی سپی کە خاوەنەکەی بۆ پێکەنین بیکات، ئەگەر هەندێ زبرو ناخۆشیش بێ، دڵی بنیادەم نایەشێنێ. ئاساییە پیاو بۆ پێکەنین و دڵخۆشی بەرانبەرەکەی درۆیەکی زەقیش بکات، بە مەرجێ درۆکەی دۆستانە و بێ غەرەزبێ، بەڵام ئەگەر ئەم درۆیە شەقڵێکی بی حورمەتی تیابێ و، ئەم بێ حورمەتیە بەو مەبەستە بێ کە بە هێماو ئاماژە تێت بگەیەنێ کە لە دۆستایەتیت بێزارە، بووی بە بار بەسەرییەوە، لەم حاڵەدا پیاوی نەجیب و خانەدان، هیچ چارێکی نامێنێ، جگە لەوەی خۆی دووربخاتەوە و هەموو پەیوەندییەک دەگەڵ ئەو کەسەدا ببڕێت و بیخاتە قاڵبەکەی خۆی و سنووری خۆی پێ نیشان بدات.

جەنەڕاڵ، بەدەم ئەو قسانەوە سوور بووبووەوە.

میرزادە گوتی:

- نا، لیبدیف، لە ساڵی ١٨١٢دا قەت لە مۆسکۆ نەبووە، چونکە تەمەنی لەوە بچووکترە کە لەو ساڵەدا لە مۆسکۆ بووبێ. هەر لەدایک نەبووە. ئەم قسەیە مایەی پێکەنینە!

- ئەمەیان هەر نەیسە، وازی لێبێنە. گریمان لەو ڕۆژگارەدا، ماوەیەک بووە لەدایک بووە. ئاخر بە چ ڕوویەکەوە دەڵێ سەربازێکی فەرەنسی لوولەی تۆپەکەی کردوەتە ئەو، هەر بۆ کەیف بە گوللە تۆپێک قاچێکی پەڕاندووە، گوایە ئەمیش خێرا لاقە پەڕیوەکەی هەڵگرتووەتەوە، بۆ ماڵی بردووەتەوە و پاشان لە گۆڕستانی ڤاگانکوفو ناشتوویەتی، ئاخر بە چ ڕوویەکەوە شتی وا دەڵێت؟ هەر بەوەندەشەوە ناوەستێ، دەڵێت گۆڕێکی بۆ هەڵبەستووە کە لە دیوێکی نووسراوە: "لاقێکی لیبدیفی کارمەندی دەوڵەت لێرەدا نێژراوە." و لە دیوەکەی دیکەی نووسراوە: "ئەی ئێسکو و پروسکی بەنرخ و ئازیز، تا ڕۆژی ژیانەوە ئاسوودە بنوو". هەر بەمەشەوە ناوەستێ، دەڵێت هەموو ساڵێک ڕێوەڕەسمی ساڵیادی بۆ دەگێڕێت (کە ئەمە خۆی لەخۆیدا کوفرو ناشوکریە) و گوایە هەموو ساڵێک بەو بۆنەیەوە سەفەری مۆسکۆ دەکات. جا بۆ سەلماندنی ئەم ئیدعایەی خۆی دەعوەتی کردووم کە دەگەڵی بڕۆم بۆ مۆسکۆ تا گۆڕەکەی قاچیم نیشان بدات، لە کرملیندا ئەو تۆپە فەرەنسییەم، کە لە دژمن گیراوە، نیشان بدات، دەڵێت کە لە دەروازەکەی کرملین دەچییە ژوورەوە، لە ڕیزی یازدەمیندایە، تۆپێکی چکۆلەی کۆنی فەرەنسیە.

میرزادە، لە قاقای پێکەنینی داو گوتی:

- خۆ بە بەرچاوی هەمووانەوە هەر دوو لاقی ساغ و سەلامەتن. دڵنیابە گاڵتەی دەگەڵ کردویت، لە دڵی مەگرە، زویر مەبە...

- بەڵام بە یارمەتیت با منیش قسەیەک بکەم: کە هەر دوو قاچی دیارن و بە بەرچاوی خەڵکەوەن، ئەمە مانای وا نییە کە چیرۆکەکەی فڕی بە ڕاستیەوە نییە، چونکە بەخۆمی گوتووە کە لاقێکی دەستکردە، عەمەلییە، چرنوسڤیتوڤ بۆی دروستکردووە.

- دروستە دەڵێن لاقێک چرنوسڤیتوڤ دروستی کردبێت، هێندە بێ عەیبە،

خاوەنەکەی دەتوانێ سەمای پێوە بکات.

- دەزانم، چونکە کاتی چرنوسڤیتوڤ، لاقە دەستکردەکەی داهێنا، یەکەم کەس بە منی نیشان دا، بەڵام ئەم داهێنانەی چرنوسڤیتوڤ، زۆر لەو مێژووە تازەترە... ئەمە جگە لەوەی لیبدیف. سوێندی بۆ خواردووم کە ڕەحمەتی هاوسەری، بەدرێژایی ژیانی هاوسەرییان، قەت ڕۆژێ لە ڕۆژان هەستی بەوە نەکردووە کە لاقێکی تەختەیە. کە کەوتمە موناقەشەی حیکایەتەکەی و بۆم سەلماند کە ئەمە هەمووی درۆی شاخدارە و لە هیچ ڕوویەکەوە ناچێتە ئەقڵەوە و مەحاڵە شتی وا ڕووی دابێت، بەرسڤی دامەوە و گوتی:

"جا ئەگەر بۆ تۆ ڕاست بێ کە لەساڵی ١٨١٢دا یەکێک بووبی لە دەربارییانی ناپلیۆن، با بۆ منیش ڕاست بێ کە لاقێکم لە گۆڕستانی ڤاگانکوفو بنێژم."

میرزادە، بە سەرسامی گوتی:

- چۆن؟ چما تۆ...

جەنەڕاڵ، شڵەژا، بەڵام زوو بە سەر خۆیدا زاڵ بوو، بە نیگایەکی گلەیی ئامێز و، نیمچە بێزاری و تەوسێکەوە لە میرزادەی ڕوانی و بە هێمنی و ئەسپایی گوتی:

- میرزادە قسەکەت تەواو بکە، تەواوی بکە، قەیدی نییە من پیاوێکی لێبوردەم. هەموو شتێک بڵێ. لەوە دەچێ بەلاتەوە سەیربێ، کەسێک بەم داماوی و بەلەنگازییە، بەم کەساسی و بێکارییە لەبەردەم خۆتا بدینی، کە شایەدحاڵی ڕووداو و پێشهاتی زۆر گەورە بووە. باشە "ئەو" تا ئێستا لە لای تۆ هیچ زەمێکی منی نەکردووە، لە عەلەییم نەڕۆییوە، لە پاشملەی نەگوتووم؟

- ئەگەر مەبەستت لە "ئەو" لیبدیف بێ، نەخێر هیچم لێی نەبیستووە.

- ئم، دەیسا من تەسەورێکی دیکەم هەبوو. موناقەشەکەی دوێنێی ئێمە لەسەر ئەو وتارە سەیرو سەمەرەیە بوو کە لە گۆڤاری ئەرشیف* دا بڵاو بووەتەوە. لەو موناقەشە یەدا من باسی نادروستی ناوەڕۆکی وتاری

گۆرینم کرد، چونکە من بەچاوی خۆم هەموو ئەو ڕووداوانەم دیتبوون کە باسی دەکردن. میرزادە چییە، تەمەشام دەکەیت و زەردە دەتگرێ، ها؟

- نا، نەخێر.. من...

جەنەڕاڵ، زۆر بە هێمنی لەسەر قسەکەی ڕۆیشت:

- ڕەنگە من بچووکتر لە تەمەنی خۆم بنوێنم، بەڵام بە ڕواڵەتم دەسخەڕۆ مەبە، لە ڕاستیا پیرترم. من لەساڵی ١٨١٢دا دە، دوازدە ساڵان بووم. من تەمەنی خۆم بە تەواوەتی و بە دروستی نازانم. دیارە لە تۆماری خزمەتگوزاریاندا کەمیان کردووەتەوە، بەخۆیشم لە لاوازیدا قاییل بووم، چەند ساڵێکی لێ کەم بکرێتەوە.

- جەنەڕاڵ باوەڕ بکە هیچ بەلامەوە سەیر نییە ئەگەر ئەو ڕۆژگارە، یانی لە ساڵی ١٨١٢دا لە مۆسکۆ بوویی، و... ئاساییە کۆمەڵێک بیرەوەری ئەوسات لە یاد مابێ بیگێڕیتەوە..وەکو هەر یەکێک لەوانەی کە لەو ڕۆژگارەدا هەبوون و لەوێ بوون و ڕووداوەکانی ئەو سەردەمەیان بیرماوە. یەکێک لەوانەی کە بیرەوەری ژیانی خۆیان گێڕاوەتەوە کتێبێکی نوسیووە دەڵێ کە لە ساڵی ١٨١٢دا منداڵێکی بەرمەمکە بووە و فەرەنسایەکان لە مۆسکۆ خواردنیان داوەتێ.

جەنەڕاڵ، بەدەم سەلماندنی ئەو قسانەی میرزادەوە، بە هێمنی گوتی:

- جا میرزادە بە خۆت دەبینی کە ئەو شتەی بەسەر من هاتووە نا ئاسایی بوو، بەڵام هیچ شتێکی نا واقیعی تێدا نییە.زۆر جار حەقیقەت لە خەیاڵ سەیرترو باوەڕنەکردەنی تر دێتە بەرچاو. گارد و هاودەمی ئیمپراتۆر! هەڵبەتە ئەمە هەندێک سەیر دەنوێنێ.

بەهەرحاڵ کە منداڵێکی دە ساڵان، ڕووداوێکی نا ئاسایی بەسەربێت و بیگێڕێتەوە هیچ سەیر نییە، لێی وەردەگیرێ، چونکە دەگەڵ تەمەنەکەیدا دەگونجێت، بەڵام شتی وا لە کوڕێکی یازدە ساڵان قبووڵ ناکرێت، جا بەم پێیە ئەگەر من ئەو ڕۆژەی ناپلیۆن هاتووەتە مۆسکۆ یازدە ساڵان بووبم، هەرگیز نەم دەوێرا لە ماڵەدارینەکەی خۆمان، لە شەقامی "باسمانی کۆن" بێمە دەرێ. نەمدەتوانی لە قسەی دایکم دەرچم کە خۆی لە کونی ژوورەوە

قایم کردووە و لە ترسی فەرەنسیەکان نەوێراوە پەل ببزوێ، نا، ئەگەر پازدە سالان بوایەم نەمدەوێرا بێمە دەرێ، منیش دەترسام، بەلام دیارە هەر دەسالان بووم، بۆیە مانای ترسم نەزانیوە. ئیدی خۆم بە نێو ئاپۆڕای خەلکەکەدا کرد، درم بەقەرەبالغیەکە دا، ئەو ساتەی کە ناپلیۆن لە ئەسپەکەی دابەزی، من گەیشتمە بەر قالدرمەکانی بەردەم کۆشک.

میرزادە، ناڕەحەت لەوەی کە لەزگ بوو سووربێتەوە، بەشەرمێکی ناچاری ئامێزەوە گوتی:

- بێگومان، قسەی تۆیە، ئەو سەرنجەت بەجێیە کە مرۆڤ لە تەمەنی دەسالیدا، مانای ترس نازانێ و زۆر بێباک و بێ پەروایە...

جەنەڕال گوتی:

- هەلبەتە... مەسەلەکە زۆر ئاسایی وەکو هەر ڕووداێکی دیکەی ژیان هات و ڕۆیشت. ئەگەر ڕۆماننووسێک ئەم چیرۆکەی نووسیبا، کەس باوەڕی پێنەدەکرد، دەیانگوت درۆ و دەلەسەیە و ناچێتە ئەقلەوە و دەگەل واقیعدا تێک ناکاتەوە.

میرزادە گوتی:

- ئا! زۆر ڕاستە. منیش تۆزێ لەمەپێش لە دلی خۆمدا بیرم لەمە دەکردەوە. من ئاگام لە تاوانێکی کوشتن هەیە کە لەبەر خاتری دزینی سەعاتێکی بەرباخەل کراوە. لە ڕۆژنامانددا بلاوکراوەتەوە. ئەگەر ڕۆماننووسێک شتی وای نووسیبا، هەنگێ خوێندکارانی بواری سوسیولوجیاو ڕەخنەگران لێی دەهاتنە دەنگ و دەیانکرد بە هەللا و هەرا کە شتی وا نابێت و ناواقیعییە و ئیدی دەیانکرد بە کێوا، بەلام کاتێ ئەم بابەتانە لە ڕۆژناماندا دەخوێنیتەوە، هەست دەکەی لە ڕێگەی ئەم شتانەوە، پەی بە حەقیقەتەکانی ژیانی ڕووسیا دەبەیت.

میرزادە، شادمان بەوەی کە دەموچاوی سور هەلنەگەڕابوو، لە کۆتایی قسەکانیا گوتی:

- جەنەڕال، ئەمە نیشانەی وردی سەرنجی تۆیە، کە توانیوتە هەست بەم دیاردەیە بکەیت!





جەنەڕاڵ، کە چاوەکانی لەخۆشیانا دەبریسکانەوە، هاواری کرد:

– ئەدی وانییە؟ ئاساییە منداڵێک، کوڕێژگەیەک. بێ ئەوەی هەست بە هیچ مەترسییەک بکات، سڵ لە هیچ بکاتەوە، بە تۆبزی خۆی بخزێنێتە ناو جەماوەری خەڵکەوە، تا شکۆو جەلالی کاروان و سام و هەیبەتی جلوبەرگی سوپایی و ئەو پیاوە گەورەیە بدینێ کە بووبوو بەوێردی سەر زاری خەڵکی و لە سەرانسەری دنیادا باس هەر باسی ناپلیۆن بوو. یانی دەتوانم بڵێم من ناوی ئەوم بە شیری دایکمەوە مژتووە. لەو کاتەدا کە لە دوو هەنگاوی منەوە ڕەت دەبوو بەڕێکەوت نیگای لە نیگام هەڵەنگوت. جلەکانم، جلکی منداڵی دەوڵەمەند بوون، کەسوکارەکەم جوانترین جلیان لەبەر دەکردم. لەنێو ئەو حەشاماتە زۆرەدا، من تاقە کەس بووم کە جلکی ئاوهام لەبەربێ، جا ئیدی بۆ خۆت تەسەوری بکە کە دەبێ ئەو دیمەنە چەند کاری لە دڵ و دەروونی کردبێ...

– بێگومان، سەروسیمای تۆ سەرنجی ڕاکێشاوە و سەلماندویەتی کە خەڵکی شار هەموو چۆڵیان نەکردووە، خەڵکانێک، لەوانە هەندێ ئەرستوکرات، بەخۆو منداڵەکانیانەوە لە مۆسکۆ ماونەتەوە.

– دەقاودەق! نیازی ئەوە بوو، ئەرستۆکراتان بەلای خۆیدا ڕابکێشێت! کاتێ چاوە هەڵۆ ئاساکانی بە من کەوت، هەڵبەتە دەبێ منیش بە چاوانی پرشنگدارەوە تەمەشام کردبێت. گوتی: "ئەمە کوڕێکی وریایە. کوڕی کێی؟" (بە فەرەنسی). من بە دەنگێکی پڕ هەڵچوونەوە یەکسەر وەڵامم دایەوە: " کوڕی جەنەڕاڵێکم کە لە مەیدانی شەڕێکا، لەپێناوی نیشتماندا گیانی خۆی بەخت کردووە.". هەنگێ ئەو گوتی: "کوڕە خانەدانە، هەم خانەدان و هەم بوێرو ڕەشید! من خانەدانانم خۆش دەوێت! تۆ منت خۆش دەوێ بچکۆل؟ (بە فەرەنسی). پرسیارەکە زۆر خێرا و کوتوپڕ بوو، هەڵبەتە منیش بە هەمان خێرایی ئەو وەڵامم دایەوە و گوتم: "گیانی ڕووسی، دەتوانێ گەورەیی و دلاوەری گەورە پیاوان، ئەگەر دژمنی وڵاتەکەشی بن، کەشف بکات! ". ئەلهەقی دڵنیانیم کە وەڵامەکەم دەقاودەق هەمان ئەو وشانە بوون یان نا... ئاخر زۆر منداڵ بووم... بەڵام ناوەڕۆکی قسەکانم هەمان ئەو





ناوەڕۆکە بوو! ناپلیۆن سەری سووڕما، کەمێک لە فکران ڕاچوو و پاشان بە دارو دەستەکەی گوت: "من غروور و کبریای ئەم منداڵەم پێ خۆشە! بەڵام ئەگەر هەموو ڕووس وەکو ئەم منداڵە بیربکەنەوە ئەوا.." قسەکەی تەواو نەکرد و خۆی بە کۆشکا کرد. منیش خێرا بەگەڵ دەست و پێوەندەکەی کەوتم. بەغار دووی کەوتم. پیاوەکانی ڕێیان دەدام، چونکە لەو کاتە بە دواوە، بە دۆست و خۆشەویستی ئەویان دەزانیم. هەر هەموو ئەمانە لە چاو تروکانێکدا ڕووی دا... بەڵام ئەوەم لەبیر ماوە کاتێ ئیمپراتۆر گەیشتە هۆڵی یەکەم، لەپڕ لەبەردەم وێنەکەی ئیمپراتۆرە کاتریندا وەستا، نیگایەکی قووڵی کرد، تاوێک لە فکران ڕاچوو. ئەنجام گوتی: "ئافرەتێکی گەورە بوو! " و بەڕێکەوت. لە زەرفی دوو ڕۆژدا، هەرچی لە کۆشک و کرملیندا بوون، دەیان ناسیم. هەموو بە "ئەشرافە چکۆلە" (بە فەرەنسی) ناویان دەبردم. تەنیا شەوان بۆ ماڵ دەگەڕامەوە. کەسوکارم واقیان لەوەوڕمابوو. دوای دوو ڕۆژ بارۆن بازانکوی گاردی ناپلیۆن کۆچی دوایی کرد، بە هۆی شەڕو شۆڕ و هێرش و پەلامارەکانەوە، تەندروستی تێک چووبوو و مرد. ناپلیۆن منی بیرکەوتبووەوە، داوای کردبووم. هاتن دۆزییانمەوە، بێ چەندو چوون بردیانم، جلەکانی، یارۆی کۆچ کردوویان، کە نۆلاوێکی دوازدە ساڵان بوو، لە بەرکردم. بەو جلانەوە بردیانم بۆ لای ئیمپراتۆر. بەئاستەم سەرێکی بۆ دانەواندم، دوای ئەوە پێیان ڕاگەیاندم کە ئیمپراتۆر ڕازی بووە. بە پلەی یاوەری (مرافق) خاوەن شکۆیان دابنرێم. دیارە زۆرم پێخۆش بوو، چونکە لەمێژ بوو، لە دڵی خۆدا جۆرە مەحەبەتێکم بەرانبەری هەبوو.

... ئەوجا... بە خۆت دەزانی کە ئەو جلکە ئاڵا و واڵایە بۆ منداڵێک چەند خۆشە. ئیدی چاکەتێکی کەسکی تۆخم لەبەر دەکرد، دوگمەکانی زێڕ بوون، پشتێن و ڕیشووی درێژی پێدا شۆڕ بووبووەوە، سەری قۆڵەکانی بە قەیتانی سوور ڕازابووەوە، هەموو پەراوێز و قەراخ و سەرقۆڵ و یەخەکەی ئاڵدۆزی بوو. یەخەکەی بەرزو ڕەق و کراوە بوو. پانتۆڵەکەی تەنگ و بەدەن چەسپ، سپی بوو، لە شاموا دروست کرا بوو، ئێلەکێکی





ئاوریشمی سپیم بەسەر پانتۆڵەکەدا لەبەر دەکرد، گۆرەویەکانیشم ئاوریشم بوون، پێڵاوی بەدوگمە و بەرەزوانە دارم لەپێ دەکرد. کە ئیمپراتۆر بۆ ئەسپ سواری دەردەچوو، منیش لە دەستەکەیدا دەبووم. چەکمەی مل درێژم لەپێ دەکرد. هەرچەندەوەزع و حاڵ و ڕەوشەکە باش نەبوو، پێشبینی کارەساتی گەورە دەکرا، بەڵام دابونەریتی دەرباری بەگوێرەی توانا، زۆر بەتوندی ڕەچاو دەکرا. چەند ئەگەری کارەساتەکە زیاتر بوایە، زیاتر دابونەریتی دەرباری(دیوەخانداری پاشایەتی) ڕەچاو دەکرا.

میرزادە، کە بە تەواوەتی نیگەران و شپرزە دیار بوو، لەبن لێوانەوە و بە نیمچە نائومێدیەکەوە گوتی:

- بەڵێ هەڵبەتە، بیرەوەریەکانی تۆ بایەخی خۆیان دەبێ، زۆر سەرنج ڕاکێش دەبن.

دیار بوو جەنەڕاڵ، هەمان ئەو شتەی بۆ میرزادە دەگێڕایەوە کە دوێنێ بۆ لیبدیفی هاوڕێی گێڕابووەوە. بۆیە قسەکانی زۆر ڕەوان و بێ گرێ بوون، بەڵام لێرەدا دووبارە نیگایەکی بە گومانی میرزادەی کرد. ئەوسا بە غروور و کبریایەکی زیاترەوە، لەسەر قسەکانی ڕۆیشت:

- بیرەوەریەکانی من؟ مەبەستت ئەوەیە کە بیرەوەریەکانم بنووسمەوە؟ جارێ نەبووە بە خولیام میرزادە! خەمت نەبێ، حازر و ئامادەیە، لە ئێستاوە خراوەتە سەر کاغەز، بەڵام لە چەکمەجەی مێزەکەما دام ناوە و بە کلیل کلیلم داوە، با کەی گڵەبانی چاوانم کرا هەنگێ بڵاو ببێتەوە. بزانە چۆن ئەوساکە بۆ چەندین زمان پاچڤە دەکرێت، هەڵبەتە نەک لەبەر بایەخە ئەدەبیەکەی، بەڵکو لەبەر گرینگی ئەو ڕووداوانەی کە من، هەرچەندە بستە منداڵێک بووم، بەچاوی خۆم دیتوومن. دەتوانم بڵێم کە بچووکی تەمەنم دەرفەتی بۆ ڕەخساندم کە بتوانم بچمە بنجوبناوانی نهێنی ترین نهێنی ژووری نووستنەکەی ئەو "گەورە پیاوە"وە! شەوان گوێم لە ئاهو ناڵەی "ئەو دێوە خەمناکە کڵۆڵە" دەبوو. هیچ پێی شەرم نەبوو لە حوزوری منداڵێکدا بە ئاشکرا بگری و فرمێسکان بڕێژێ. هەرچەند من پەیم بەوە برد بوو کە هۆی عەزابی ئەو، بێدەنگی ئیمپراتۆر ئەلکساندرە.

میرزادە، بە شەرمێکەوە گوتی:

– بەڵێ ڕاستە. نامەی بۆ ئیمپراتۆر دەنووسی و پێشنیازی سوڵح و ئاشتی بۆ دەکرد.

– هەرچەندە ئێمە هیچ لەمەڕ ناوەڕۆکی نامەکانی نازانین، بەڵام هەموو ڕۆژێ، هەموو سەعاتێ، نامە لەسەر نامەی دەنووسی! یەجگار پەشێوو پەرێشان بوو. شەوێکیان کە هەر هەر دووکمان بووین، بەپەلە خۆم گەیاندێ، فرمێسک هۆن هۆن بەچاویا دەهاتە خوارێ (ئاە کە خۆشم دەویست!) هاوارم کرد: "داوای بوردن لە ئیمپراتۆر ئەلکساندر بکە، بەڵێ داوای بووردنی لێبکە." هەڵبەتە دەبوایە بمگوتبایە: "سوڵح دەگەڵ ئیمپراتۆر ئەلکساندردا بکە" بەڵام چونکە منداڵ بووم ئیدی ئاوا سادە و ساویلکانە بۆچوونی خۆم دەردەبڕی. لە کاتێکا کە بە ژوورەکەدا سەروو خواری دەکرد گوتی: "ئاە کوڕەکەم! (لەوە دەچوو بیری چوو بێت کە من بستە منداڵێکی دەساڵانم، بە لەزەتێکی زۆرەوە قسەی دەگەڵ دەکردم)... ".. ئاە کوڕی خۆم! من ئامادەم پێی ئیمپراتۆر ئەلکساندر ماچ بکەم، بەڵام سەبارەت بە پاشای پروسیاو قەراڵی نەمسا، ڕقێکی ئەبەدیم لێیان هەڵگرتووە، و... بەهەرحاڵ... تۆ هیچ شتێک لە سیاسەت نازانی". ئەوجا وەکو ئەوەی لەپڕ بیری کەوتبێتەوە کە دەگەڵ منداڵێکدا قسان دەکات، بێدەنگ بوو، بەڵام تا ماوەیەک گڕ لە چاوانی دەباری. جا تەسەور بکە ئەگەر بمەوێ هەموو ئەم واریقاتە بنووسمەوە (کە شایەدحاڵی گەورەترین ڕووداو بووم و بەچاوی خۆم دیتوومن) و بڵاوی بکەمەوە، هەنگێ دەبینی کە ئیرادگران و ئەدیبانی لەخۆبایی، حەسوودان و بەغیلان، لاگران، چ فەرتەنەیەک بەرپا دەکەن! نا... نا... ئەو خێرەم ناوێ... زۆر زۆر سوپاست دەکەم! "

میرزادە کەمێک لە فکران ڕاچوو، هەنگێ بە هێمنی و ناسکی گوتی:

– سەبارەت بە لاگران و لاگری، قسەی تۆیە، هەق بە تۆیە، سەدی سەد لەگەڵتم. ماوەیەک لەمەپێش کتێبەکەی (چاراس)* م دەربارەی شەڕی "واترلۆ" خوێندەوە. بەگوێرەی بۆچوونی شارەزایان کتێبەکە، کتێبێکی باش

و جدیە، بە قسەی پسپۆڕان، نووسەرەکەی شارەزاییەکی زۆری لەسەر بابەتەکە هەیە، بەڵام هەر لاپەڕەیەکی هەڵدەدەیتەوە. بە زەقی شادمانی نووسەرەکەی بە نوشوست و کەوتنی ناپلیۆن بەدی دەکەی، یانی نووسەرەکەی هەوڵی داوە کەمترین بەهرە و توانای جەنگی بۆ ناپلیۆن، لەشەڕەکانی دیکەشیدا نەیەڵێتەوە. ئەمە بۆ کتێبێکی وا جیددی زۆر خراپە، لە بایەخی کتێبەکە کەم دەکاتەوە، چونکە ئەم کارە زادەی لاگری و تەرەفدارییە. باشە تۆ بە حوکمی وەزیفە، هەموو کات هەر لەگەڵ... ئیمپراتۆردا بوویت؟

جەنەڕاڵ، لەزگ بوو لە کەیفان باڵ بگرێ، جدیەت و سادەیی و بێ ڕیایی قسەکانی میرزادە، هەموو گومان و دوودڵییەکی لەلا سڕی بووەوە.

– چاراس! ئاە... کە پەستی کردم! هەر ئەو کاتە شتێکم بۆ نووسی، بەڵام (هەنوکە بە جوانی بیرم نەماوە کە دەقاودەق چیم بۆ نووسیبوو). پرسیت ئایا کارەکەم، هەموو کاتەکەی گرتبووم؟ نا، نا! من بە عینوانی یاوەری(مرافق) ئیمپراتۆر دامەزرا بووم، بەڵام من لە هەوەڵەوە، ئەوساش شتەکەم زۆر بە جیددی نەدەگرت، ئەمە جگە لەوەی کە ناپلیۆن هەر زوو ئومێدی ئەوەی لا نەما کە بتوانێ ڕووسەکان بەلای خۆیدا ڕابکێشێت. ئیدی ئاساییە لەو حاڵەدا بەرەبەرە من فەرامۆش بکات، چونکە لە بنەڕەتدا بە مەبەستی سیاسی منی لای خۆی گل دابووەوە. خۆ ئەگەر خۆشی نەویستبام.. هەر بە تەواوەتی فەرامۆشی دەکردم. من ئێستا بە ڕاشکاوی ئەوە دەڵێم، بەڵام من بەدڵ خۆشم دەویست. یانی کاریان لە من نەدەویست: هەر ئەوەندە بوو کە دەبوایە ناو بە ناو سەرێکی دەربارم دابا و خۆم نیشان بدایە، یان ئیمپراتۆر بچوایە بۆ ئەسپ سواری بەگەڵی کەوتبام، هەموو ئیشەکەی من ئەوەندە بوو.

من سوارچاکێکی کارامە بووم. ئیمپراتۆر عادەتی وابوو پێش نانی ئێواری ئەسپ سواری دەکرد. ئەوانەی لەگەڵی دەچووین بریتی بوون لە: داڤوت، مەملوک ڕوستن و، من..

میرزادە، هەر هات بەدەمیاو گوتی:

- کونستانش.

جەنەڕاڵ گوتی:

- نا، کونستان لە دەستەی ئێمە نەبوو. کونستان ئەو دەمە لە هەندەران بوو... نامەیەکیان پێدا نارد بوو بۆ شابانو جوزفین. ئیدی دوو ئەفسەری ئەفسەرانی پاسدار و چەند نێزەدارێکی پولاندییان لە جێی دانابوو. ئیدی هەموو دەست و پێوەندەکانی ئەمانە بوون - هەڵبەتە- جگە لەو جەنەڕاڵ و مارشالانەی کە ناپلیۆن هەمیشە لەگەڵ خۆی دەبردن، تا ڕاوێژ و شیرەتیان پێ بکات و شوێنی لادان و، دابەشبوونی قۆشەن و سوپاکانی بۆ دیاری بکەن. ئەوەندەی لەبیرم مابێ، لە هەموو کەس زیاتر متمانەی بە داڤوت هەبوو، بە زۆری ئەوی دەگەڵ خۆی دەبرد: داڤوت، یەکێکی کەتەی، قەڵەوی، توندو تۆڵ، کەسێکی هێمن و خوێنسارد و بە حەوسەڵە بوو، عەینەکی لەچاو دەکرد، نیگاو نۆڕینێکی سەیری هەبوو! .. ئیمپراتۆر زۆربەی کات شیرەت و ڕاوێژی بەو دەکرد، ڕاوبۆچوونی ئەوی بەدڵ بوو. بیرم دێت جارێک چەندین ڕۆژی یەک لە دووی یەک هەر خەریکی ڕاوێژ و تەگبیر بوون. داڤوت بەیانی و ئێوارە دەوامی دەکرد، گەنگەشە و مجادەلەیان دەکەوتە بەینەوە، ئەنجام وادیار بوو ناپلیۆن هاتە سەر بۆچوون و ڕایەکەی ئەو. ئەمانە لە نووسینگە و ئۆفیسەکەی ئیمپراتۆردا پێکەوە کاریان دەکرد. منیش لەوێ بووم، بەلام هیچ ئاگایان لە من نەبوو، بەلام ناپلیۆن لەپڕ سەری هەڵبڕی، نیگای لە نیگای من هەڵەنگوت، بیرۆکەیەکی سەیر لە چاوانیا پرشنگی دا، لەناکاوا لیی پرسیم: "کوڕۆ، تۆ چیدەڵێی؟ ئەگەر من بێمە سەر مەزەبی ئەرسەدوکس و ڕەعیەت و کۆیلەکانتان ئازاد بکەم، عەروسان(رووس) دووم دەکەون؟ من بە پەستی وەلامم دایەوە: "هەرگیز دوات ناکەون! " ناپلیۆن واقی لە وەلامەکەم ورما. گوتی: "داڤوت فایدەی نییە، ئەمە هەمووی خەیاڵ پلاوە، کوا پرۆژە و نەخشەکەی ترتم پێ بڵێ، من لە میانەی پرشنگی نیشتمانپەروەری، چاوانی ئەم منداڵەوە، بیروبۆچوونی هەموو گەلی ڕووسیام خوێندەوە. فایدەی نییە، ئەم خەیاڵ پلاوەشم کەڕووی هەڵهێنا! "





میرزادە بە بایەخێکی زۆرەوە گوتی:

- بەڵام ئەو نەخشـەیەش کەوازی لێهێنـا، نەخشـەیەکی زۆر بـاش بـوو. تۆ بە نەخشەی داڤوتی دەزانیت؟

- هەرچییەک بێ پێکەوە گەلاڵەیان کرد، بەڵام بیرەکە، بیری نـاپلیۆن بـوو، بیرکردنەوەیـەکی هەڵۆیانـە بـوو، بـەڵام نەخشــە و پرۆژەی دووەمـیش زۆر بـاش بـوو، بیرێکـی مـەزنی تیـا بـوو... یـانی نـاپلیۆن گوتـەنی نەخشــەی "ئەنجوومەنی شێران"* بوو. ئەمەیان بیرۆکەی داڤوت بوو. نەخشـەکە بریتـی بوو لەمـەی کە نـاپلیۆن بـەخۆو قۆشـەن و سـوپاکەیەوە، لـە کرملین هەوار بخـەن، خـانووی داریـن دروسـت بکـەن، مەتـەرێزی قـایم لێبـدەن. تۆپخانـە بەڕیز دابمەزرێنن، زۆرترین ژمارەی ئەسپ بکوژنەوە و گۆشتەکەی بکەن بە قاورمە و هـەرچی دانەوێڵە و ئازووقـەی خـەڵکی هەیـە دەستی بەسـەردا بگرن و تا بەهار دێ، لەوێندەر بمێننەوە و نەجووڵێن. کە بـەهار هـات بـەدەم قوونە شەڕەوە، خۆیان لە ڕووسان دەربازبکەن و لە ڕووسیا وەدەربکەون. نـاپلیۆن ئـەم نەخشـەیەی بـەدڵ بـوو، ئـاهێکی تـازەی وەبـەر هـاتەوە. ئیـدی هــەموو ڕۆژێ بــە ئەســپ ســواری، فەرەیــەکمان بــە دەوری حەســارو شورەکانی کرملیندا دەکرد. ئیدی ئەو فـەرمانی دەدا کە چـی دروست بکرێ و چـی بێتـە ڕوخانـدن، لـەکوێ قوللـەی دیـدەوانی دروسـت بکرێـت، ئێشـکگر لـەکوێ دابنـرێ و کـوێ قـایم بکرێـت. پیـاوێکی وردبـین و چـاو تیـژ و بـە سـەرنج و ئەقڵمەنـد بـوو، یەکســەر بڕیـاری خـۆی دەدا. ئیـدی بەو جـۆرە هەموو شتێک سازکرا، داڤوت، بە تاسـەوە چـاوەڕوانی فـەرمانی یـەکجارەکی بوو. دووبارە بـە دوو قۆڵی کەوتنەوە گفتوگۆ، کەس لەوێ نەبوو، جگـە لـە مــن. نــاپلیۆن هــەر دوو دەســتی لەســەر ســینگ تێـک ئاڵانـدبوون و بــە ژوورەکـەدا دەهـات و دەچـوو. هـەرچیم دەکرد نەمدەتوانی چاو لـە سـیمای بگوازمەوە. دڵم لێکدا لێکدا بە توندی لێی دەدا. داڤوت گوتی: "مـن مـەرەخـەس دەبـم دەچـم دەسـت بـەکاردەبم" نـاپلیۆن گـوتی: "بۆ کـوێ؟" داڤـوت گـوتی: "فەرمان دەدەم کە دەست بە قاورمەی ئەسپان بکرێ."

نـاپلیۆن ڕاجفـری. ئیـدی سـاتی بڕیـاردان بـوو. نـاپلیۆن، لـەپڕ لـە منـی

پرسی: "کورم، تۆ رات چییە دەربارەی نەخشەکەمان؟" هەڵبەتە ئەم پرسیارەی، لەو روانگەیەوە لە من کرد کە راستی و دروستی لە شێت یان لە منداڵ بزانە، بە کورتی پرسیارەکەوەکو ئەوە بوو کە پیاوێکی بە ئاوەز، لەدواساتدا، بۆ دوا بڕیار پەنا وەبەر شێر و خەت بەرێت. هەڵبەتە من لەجیاتی وەڵامی ناپلیۆن بدەمەوە، وەکو یەکێک ئیلهامی بۆ هاتبێ رووم بەلای داڤوتدا وەرگێڕا و گوتم: "جەنەڕاڵ، کە قەراربێ بڕۆن، تا زووتر بۆ وڵاتی خۆ بگەڕێنەوە درەنگە". نەخشە هەڵوەشایەوە. ڕیسەکەیان بووەوە بە خوری.

داڤوت، شانەکانی هەڵتەکاند و بەدەم خوتە و بۆڵەوە وەدەر کەوت! " سەیرە. بووە بە کابرایەکی خورافاتی"* . بۆ سبەینێ فەرمانی پاشەکشە دەرچوو.

میرزادە، بە دەنگێکی زۆر کز گوتی:

– هەر هەموو ئەم شتانە جوانن.. زۆریش سەرنجڕاکێشن..ئەگەر بە راستی وابووبن...

ئەوجا بەلەز قسەکەی خۆی ڕاستکردەوە:

– مەبەستم... دەمەوێ بڵێم...

جەنەڕاڵ، بە ڕادەیەک ئاوێتەی حیکایەتەکەی خۆی بووبوو کە لە زەقترین درۆش نەدەپرینگایەوە. بۆیە گوتی:

– ئاهـ... میرزادە... حەیفت نەکرد... ئەوە دەڵێی " ئەگەر بە ڕاستی وابووبن.." بەڵام باوەڕبکە، ئامادەم سوێند بخۆم. درۆ ناکەم. باوەڕبکە ئەوەی بۆم گێڕایەوە لەواقیع کەمتر بوو، لە حەقیقەت کەمتر بوو، زۆر لە حەقیقەتی سەربوردەکە کەمتر بوو. جا من جارێکی دی دووبارەی دەکەمەوە کە من بە چاوی خۆم دیتوومە کە ئەو پیاوە مەزنە دەگریا، فرمێسکی هەڵدەڕشت، ئەمە شتێکە جگە لە من کەسی دی نەیدیتووە! ڕاستە لە ئاخر و ئۆخردا ئیدی نەدەگریا، کانی فرمێسکانی هیشکی کردبوو، تەنیا ناو بە ناوێک ناڵەیەکی بۆ دەکرد. ڕۆژ بە ڕۆژ چارەی گرژتر دەبوو، ڕەنگی تاریک دەبوو، دەتگوت لە ئێستاوە ئەبەدیەت باڵی ڕەشی بەسەریا کێشا

بوو. هەندێ شەو بە سەعاتان، بە دوو قۆڵی دەمـاینەوە، قورِ و قەپ، ورتـە لە کەسمانەوە نەدەهات، کەچی مـەملوک ڕوسـتن لـە ژوورەکەی تەنیشـتەوە لە غورابی خەوا بوو. تەحا کە ئەم پیاوە خەوی گران بوو! کە باس دەهاتـە سـەر ئەو، نـاپلیۆن دەیگـوت! وزای لـێ بێـنن، خەوی گرانـە، گرانـە! بـەڵام دڵسـۆز و گیـان فیـدای خـۆم و دەربارەکەمـە! " جارێکیـان زۆر خـەمبار و دڵتەنگ بووم، ئیمپراتۆر لەپڕ سەیری کرد، ڕوندک لـە چاوانم قـەتیس ماون. نیگایەکی پڕ میهری کردم و بەسەر سامی گوتی: "تۆ خـەمی منتـە، لـە دوای کوڕەکـەی خـۆم، پاشـای ڕۆمـا، تـۆ یەکـەم کەسـیت کـە هاوسـۆزیم دەگـەڵ دەکەیت، هاوخەمیم دەکەیت. ئەوانی دی هەموو ڕقیان لێمە. هـەر هـەموویان، تەنانەت براکانیشم، هەر کە گلۆڵەم بکەوێتە لێژی، بەخت پشتم تێ بکات، بە بـەرچاوی دژمنـەکانمەوە پشـتم تێدەکـەن. ئیـدی خـۆم پێنـەگیرا، لـە هـۆڕژنی گریـانم داو بەلـەز بـەرە و ڕووی چـووم، ئیدی ئەویش دڵـی پڕ بـوو، خـۆی پێنەگیرا، دەستمان لە ملی یەکدی وەرینا و گریان و فرمێسکمان تێکـەڵ بـوو. بەدەم گریانەوە گوتم: "بنووسـە، ئـا، نامەیـەک بـۆ شـابانو جۆزفین بنووسـە." نـاپلیۆن ڕاجفـری، کـەمیک لـە فکـران ڕاچـوو، ئەوسـا گـوتی: "تـۆ سـێیەمین دڵسـۆزت وەبیرهێنـامەوە، زۆر مـەمنونی تـۆم، هـاوڕێ! " هـەر لەوێـدا و لەو کاتەدا نامەیەکی بۆ جۆزفین نووسی کە بۆ سبەینێ بە کونستان دا ناردی.

میرزادە گوتی:

– کـارێکی زۆر چاکـت کـردووە، لـە گەرمـەی پەشـێوی و دڵتەنگیـدا، سۆزێکی جوان و ناسکت لە دڵیا بێدار کردووەتەوە.

جەنەڕاڵ، بەجۆشوخرۆشێکی زۆرەوە گوتی:

– دەم خـۆش! زۆر جوانـت گوزارشـت لـێ کـرد، ڕێـک ڕەنگدانەوەی دڵـی خۆتە!

سـەیر ئەوە بـوو، فرمێسـکی ڕاسـتی زاییـە چـاوانی جەنـەڕاڵ و لەسـەر قسەکەی بەردەوام بوو:

– بـەڵێ میرزادە، بە ڕاسـتی ئەو دیمەنـە هەیبـەت و شـکۆی خـۆی هـەبوو. دەزانـی خـەریک بـوو لەگـەڵیا بـڕۆم بـۆ پـاریس؟ دەزانـی ئەگـەر لەگـەڵیا

ڕۆیشـــتبام، بێگومـــان دەگـــەڵ ئەودا هەواڵـــەی هـــەمان "دورگـــە گـــەرم و تەریکەکـــەی" * ئەو دەکـرام و دەبـووم بـە هاوتاراوگـەی وی. لـێ مخـابن چارەنووسمان یەک نەبوو و لێکدابڕاین! قەدەرو چارەنووس ئەوی گەیاندە ئەو دورگە گەرمەی، کە لە گینە، جارێک لە جاران، لە ساتێکی دڵتەنگی یـەجگار دژوار و تووشـدا، کـە ڕونـدکی ئەو کوڕیژگـە، بێنەوایـەی بیـر کەوتبێتەوە کە لە مۆسکۆدا، دەستی لە ملی کرد و بە کوڵ بەسەریا گریاو گەردنی ئازاد کرد، بەڵام من بۆ ئامادەیی ئەفسەرانی لاو نێردرام و تووشـی سیستمێکی زۆر قورس و توندو، کۆمەڵێک هاوقەتاری نارەسـەن بـووم... مخابن! .. دوای ئەوە هەموو شتێک هەرەسی هێنا! ..

"نـاپلیۆن، لـە ڕۆژی پاشەکشـەکەدا پێـی گـوتم: نـامەوێ لـە دایکـت جیابکەمەوە، بۆیە دەگەڵ خۆمت نابەم! بـەڵام پڕ بـەدڵ حـەز دەکەم کارێکت بۆ بکـەم." لەو کاتـەدا کـە سـواری ئەسپەکەی بـوو، بـە شـەرمێکەوە گـوتم: بێزەحمـەت، شتێکم لـە ئـەلبوومی خوشـکەکەمدا، وەکو یادگار بۆ بنووسـە." زۆر نیگـەران و خـەمبار بـوو، سـەروچاوی ڕەش داگـەڕا بـوو، گـەڕایەوە، داوای قەڵـەمی لـێ کـردم، ئەلبومەکـەی لێوەرگرتم، قەڵەمەکـەی بەدەسـتەوە گرتبوو، پرسـی: "خوشـکەکەت چەنـد سـاڵانە؟" بەرسـڤم دایەوە: "سـێ سـاڵە" گوتی: "کەواتە کچێکی بچووکە" * لە ئەلبومەکەدا نووسی:

هەرگیز درۆ نەکەی*

ناپلیۆن، هاوڕێی دڵسۆزت* .

بڕوانـــە ئەو ئامۆژگارییـــە میـــرزادە، کـــەیش! لەو ســـاتە هەســـتیارەدا، باوەڕدەکەی؟

میرزادە گوتی:

- بەڵێ... بە ڕاستی پڕ مانایە!...

- ئیدی ئەو پەڕەیـەمان لـە ئەلبومەکە کردەوە، لـە جـام و چوارچێوەمـان گرت، خوشکم تـا مردیش هـەر لـە ماڵەکـەی خۆیدا، لـە شـوێنێکی بـەرچاو و ئەلاحـەدەدا، لـە ژووری میوانـدا هـەڵی واسیبوو. خوشـکم بەسـەر منداڵەوە چوو... ئیدی نـەمزانی ئەو پەڕەیە چـی بەسـەرهات... کەوتـە کوێوە!... نـازانم.

ئاهـ... ئەوە خۆ سـەعات دووی پـاش نیوەڕۆیـە!... میرزادەوەختێکـی زۆرم لێگرتی! بمبورە، بە ڕاستی غەدرم لێ کردیت. جەنـەڕاڵ بـەدەم ئەو قسـەیەوە هەستا.

میرزادە لەبن لێوانەوە گوتی:

- بەپێچەوانەوە... زۆر دڵخۆشت کردم. بە ڕاستی جوان بوو، منەتبارت کردم، زۆر سوپاس بۆ تۆ!

جەنـەڕاڵ، دووبـارە، بـە جـۆرێ دەسـتی میـرزادەی گوشـی، کـە ئێشـی گەیانـدێ. بـــەچاوانی پرشـــنگدارەوە لێـــی ڕوانـــی و وەکـــو ئەوەی لـــەپڕ وەخۆبێتەوە و شتێکی کوتوپڕی بە مێشکدا هاتبێ گوتی:

- میرزادە، تۆ بە ڕادەیەک دڵپاک و سادەیت کە من هەندێ جار بـەزەییم پێتـادێتەوە. کـە تەمەشـای تـۆ دەکـەم دڵـم خـۆش دەبێـت. ئەو خوایـە ڕاوەستاوت بکات و دەست بە باڵتەوە بگرێت! دووعـای خێرت بۆ دەکـەم، هیوادارم ژیانت هەر گوڵزاری ئەشق و مەحەبەت بێ. تازە ژیانی من تەواو! ئاهـ... بمبورە! تکایە لێم ببورە!

بەپەلە وەدەر کەوت، هەر دوو دەستی بە دەموچاویەوە گرت. میرزادە هیچ گومـانێکی لە ڕاستی هـەڵچوون و سـۆزو گودازەکـەی جەنـەڕاڵ نـەبوو. پیرەمێرد بە ئاشکرا بەم سەرکەوتنەی خۆی دڵ خۆش بوو، بـەڵام میرزادە هەستی دەکرد ئەم پیاوە یەکێکە لەو درۆزنانـەی کە بێ پـەروا درۆ دەکـەن، بەدەم لەزەتی درۆوە خۆیان لە بیردەکەن، بەڵام لە هەڕەتی نەشـە و لـەزەتی درۆکردنیشـا، لـەناخی نـاخەوە ترسـی ئەوەیـان هەیـە کـە خـەڵکی باوەڕیـان پێنەکـەن و، نـاتوانن قەناعـەت بـە خـەڵکانێک بکـەن کـە باوەڕیـان پێبکـەن. پیرەمێـرد، بەو وەزع و حاڵـە دەروونـیەوە کـە تیـای بـوو، لـەگین بـوو وەخۆبێتەوە و هەست بکات دنیایـەک درۆی زەق و حەیابـەرەی کـردووە و میرزادە لە ڕووی بەزەییەوە گویی بۆ ڕادێراوە، هـەنگێ هەست بەوە بکات کە سووکایەتی پێکراوە. میرزادە بە نیگـەرانی لـە خـۆی دەپرسـی: "باشـە من کارێکی خراپم نەکرد کە جڵەوم بۆ شل کرد، بەو هـەموو جۆشوخرۆشـەوە، ئەو هـەموو درۆیـە هـەڵڕێژێ؟ بـەڵام میـرزادە، لـەپڕ، کـۆنترۆڵی خـۆی لـە





دەسـت داو لـە قاقـای پێکـەنینی دا. پێکـەنینێ کـە دە دانـە دەقیقـەی تەواو درێژەی کێشا. دوای ئەوە خـەریک بـوو لەسـەر ئەو پێکەنینـە زۆرو بەکوڵـە سەرزەنشتی خۆی بکات، بەڵام هەر زوو هەستی کرد مـادامێکی ئەو هـەموو سۆزەی دەرهەق بە جەنەڕاڵ هەیە و ئەوەندە بەزەیی پێدادێتەوە، هـیچ هـەق نییە سەرزەنشتی خۆی بکات.

مەزەندەکـەی میـرزادە ڕاسـت دەرچـوو. هـەر ئەو ئێوارەیـە نامەیـەکی سەیری لە جەنەڕاڵەوە پێ گەیشت. نامەیەکی کورت بەڵام توند. جەنـەڕاڵ لـە نامەکـەدا پێـی ڕادەگەیانـد کـە بـۆ هەمیشـە پەیوەنـدی دەگـەڵی بڕیـوە، تـا ئێستاش ڕێزی دەگرێت و سوپاسگوزاریەتی، بـەڵام هـەرگیز نـاتوانێ "ئەو بەزەییە" لـە میرزادە قـەبووڵ بکـات. کە خۆی لـە خۆیدا شـکاندنی کەرامـەتی مرۆڤێکە کە تا ئێستا جۆرەها نەگبەتی و بەدبەختی و مەینەتی دیتووە."

کاتێ میرزادە بینی کە جەنـەڕاڵ چووەتەوە لای نینـا – ئەلکسـندروڤنا و کـونجی گۆشـەگیری گـرت، ئیدی خـەمی ئەوی لـە دڵ نـەماو نیگەرانییەکـەی سڕایەوە. بـەڵام، وەکو پێشـتر گوتمـان جەنـەڕاڵ کـە لیـزا ڤیتـا پروکوفیڤنـای دیتبـوو، چەپکـە گـوڵێکی دی بـە ئـاوا دابـوو. هەڵبەتـە لێـرەدا نـاکرێ بـەدووردودرێژی باسـی ئەوە بکـەین. تـەنیا بـە کـورتی و بـە دوو کـەلیمان ئامـاژە بـۆ ئەو مەسـەلەیە بکـەین. جەنـەڕاڵ دوای ئەوەی چەنـەبازی و هەرەزگۆییـەکی زۆری لـە حـوزوری لیزاڤیتـا پروکوفیڤنـا کردبـوو، سـەری یەشاند بوو، کە هـاتبووە سـەر باسـی گانیا، زەمێکی زۆری کردبوو. خـانم زۆر تووڕە بووبوو. ئیدی ئەمری کردبوو بە پاڵ بیکەنـە دەرێ و بـە سـووک و ڕیسوایی دەریـان کردبـوو. بۆیـە ئەو شـەو و ڕۆژەی زۆر بـە نیگـەرانی و ئاڵۆزی بەسەر بردبوو، کۆنترۆڵی خۆی لە دەسـت دابوو شـێت ئاسـا بـە نـاو جادە و بانان کەوت.

کولیـا، هێشـتا بـە دروسـتی نەیـدەزانی چ باسـە. بـە هومـێدی ئەوە بـوو هەرچۆنێ بێ بابی هێور بکاتەوە. بە بابی گوت:

– دەی! هەنوکـە بـۆ کـوێ بچـین؟ جەنـەراڵ دەڵێـی چـی؟ نـاتەوێ سـەری میـرزادە بـدەی؟ قسـەت دەگـەڵ لیبدیفـدا نییـە. پـارەت پـێ نییـە. خـۆ منیش

هەمیشە بێ پارەم و ئێستاش وێڵ و سەرگەردان کەوتینە سەر ئەم جادەیە، چ نەگبەتیەکە!

جەنەراڵ لەبن لێوانەوە گوتی:

- پیاو دەگەڵ ژنا بێ، نەک وێڵ و سەرگەردان لێرە و لەوێ بسوورێتەوە ئەم جیناسە (ڕەگەز دۆزی)* کاتی خۆی باش فریام کەوت... لە یانەی ئەفسەران ساڵی چل و چوار... بەڵێ هەزار و هەشت سەد..و چل و چوار!... ئەوە چییە بە تەواوەتی بیرم ناکەوێتەوە.. ئاهـ. بیرم ناکەوێتەوە... بیرم ناکەوێتەوە... ئەمەم بیر مەخەوە. "هێی گەنجێتی، گەنجێتی من لەکوێی؟ یادت بەخێر! " ئەرێ کولیا ئەمە قسەی کێ بوو؟

کولیا، نیگایەکی لەزو نیگەرانی بابی کرد و بەرسڤی دایەوە:

- باوکە، لە " گیانەمردووەکان "ی گۆگۆڵەوەوەرگیراوە.

جەنەراڵ گوتی:

- گیانە مردووەکان؟.. ئا.. بەڵێ... مردووەکان! .. کە بەخاکت سپاردم، لەسەر کێلی گۆڕەکەم بنووسە: "گیانێکی مردوو لێرەدا نێژراوە! "

ئەدی کولیا ئەم قسەیە هی کێیە: "بۆ هەر کوێ دەڕۆم شەرمەزاری لە دوومە"؟

- نازانم، باوکە

جەنەراڵ لە ناوەندی شەقامەکەدا وەستا، شێت ئاسا هاواری کرد: "یاروبیاگوف هەر نەبووە! یاروشکا یاروبیاگوف!...

ئەوسا لەسەر قسەکانی ڕۆیشت: "کوڕەکەم وا دەڵێ. کوڕەکەی خۆم باوەڕم پێناکات، بەدرۆم دەخاتەوە. ئەو یاروبیاگوفەی بەدرێژایی یازدە مانگ وەکو برای ڕاستیم وا بوو، لە برا براتر بوو، ئەو پیاوەی کە من لەبەر خاتری وی بەشداری ئەو دوئیلەم... کرد... جارێکیان کە دەمانخواردەوە، بەرپرسەکەمان میرزادە ڤیگورتسکی پێی گوت: "ئەرێ یاگریشا* پێم نالێی تۆ ئەم خاچەت، خاچی قەدیسە ئانایەت لەکوێ بوو؟ بەرسڤی دایەوە و گوتی: "لە مەیدانی جەنگدا، جەنگ لە ڕای نیشتمانەکەمدا، وەرم گرتووە! " من هەڵمدایە: "ئافەرین یاگریشا! " ئەمە بوو بە باعیسی

دوئێلێک. پاشـان ئەو ژنـی هێنـا... ماریا پتروفنا سوسـووتوگینی خواسـت و دوای ئەوە لـە مەیدانی جەنگدا کوژرا.. گوللەیـەک هـات، بەسـەر خاچەکـەی سەر سینگی منا، تیغی کرد و ڕێک بە ناوچەوانی ئەو کەوت و کوشتی. بەر لەوەی بمرێـت گـوتی: "هـەرگیز لـەبیرم نـاچێ" ئەوجـا هـەر لەوێ کەوت و گیانی دەرچوو. کولیا من، مـن بـە دڵسۆزی خزمـەتی نیشتمانی خۆم کرد... بـە دڵ و بـە گیـان خزمـەتم کـرد... بـەڵام ڕوو دەکەمـە هـەر کوێیـەک "شـەرمەزاری لـە دوومـە! لـێم نـابێتەوە! ". جـا تـۆ و دایکـت دێنـە سـەر گۆڕەکـەم... "نینـای دامـاو". کولیـا مـن جـاران، زوو زوو، لـە سـەرەتاوە ئاوام گـاز دەکرد، زۆری پێخـۆش بـوو. نینـا! نینـا! تۆ چیت بـە خـۆت کرد؟ چۆن توانیت خۆشت بوێم. تۆ ئەی ڕوح و گیانە بە سەبرو هەدارەکە! کولیا گیـان دایکت گیانی فریشتەی هەیە، گوێت لێیە کولیا، فریشتە!

کولیا، بەدەم گریان و ماچکردنی دەستی باوکییەوە گوتی:

– دەزانم باوکە گیان! دەزانـم! بـا بگـەڕێینەوە بـۆ مـاڵ، بۆ لای دایکە! دەنا بـە دووماندا دێت! بـەغار شـوێنمان دەکەوێ. بـۆچی لێرەوەسـتاویت؟ دەڵێی نازانیت.... بەسە باوکە گیان! بۆچی دەگریت؟

بابی گوتی:

– تۆ دەستم ماچ دەکەی؟ دەستی من؟

– بەڵێ دەستی تۆ، دەسـتانی تۆ! بۆ سـەیرت پێدێ؟ بەسـە، بەسـە! بۆچی لـەم نـاو جادەیـە دەگریـت، لای خـۆی جەنـەڕاڵیت، جـەنگاوەریت، پیـاوێکی سوپاییت! وەرە با بڕۆین!

– باریکەڵڵا کوڕە چکۆلەکـەم، ئافـەرین بـۆ خـۆت و شـیرت کـە ئەو هـەموو ڕێزە لە پیاوێکی ناوزڕاو، سەراپا عـەیب و عـار، دەگریـت! لـەخوا دەپاڕێمەوە کـە ببـی بـە خـاوەنی کـوڕێکی وەکـو خـۆت... "پاشـای ڕۆمـا"* ... "دەیسـا نەفرەتی خوا لەم ماڵە! "..

کولیا، بە هەڵچوونەوە هاواری کرد:

– بەسە، چی بووە؟ بۆ ناتەوێ بۆ مـاڵ بگـەڕێیتەوە. تێک چوویت، ئـەقڵت لە دەست داوە؟




- پەلە مەکە، بۆتی باس دەکەم... ئا باسی دەکەم... هەموو شتێکت بۆ باس دەکەم. هاوار مەکە، با خەڵکی گوێیان لێمان نەبێ... "پاشان ڕۆما"* . ئاهـ چەند بێزارم، چەند دڵم تەنگە.

"ئەی ئەو کەسەی شیرت داومەتێ گۆڕت لەکوێیە؟"

ئەرێ کولیا ئەمە قسەی کێیە؟

- نازانم، نازانم قسەی کێیە! خێراکە با هەر ئێستا بچینەوە ماڵێ! ئەگەر دەتەوی گانیات بۆ مارهەنجن دەکەم... ئاخر دیسان کێوە دەڕۆیت؟

جەنەڕاڵ، خۆی بەرە و قاڵدرمەی بەر دەرگای دەرەوەی ماڵێکی ئەو نزیکانە ڕەکێش دەکرد.

- بۆ کوێ دەڕۆیت؟ ئەمە ماڵی خۆمان نییە!

جەنەڕاڵ، لەسەر یەکەم پلەی بەر دەرگای ماڵەکە ڕۆنیشت. دەستی کولیای گرت و بەرە و خۆی ڕایکێشا، لەبن لێوانەوە گوتی:

- خۆت دانەوێنە، زیاتر، زیاتر، گوێت بێنە... هەموو شتێکت پێدەڵێم... هەموو نەنگ و عەیب و عارێکی خۆمت... خۆت دانەوێنە... گوێت بێنە، با هەموو عەیب و عارێکی خۆمت بە گوێدا بچپێنم.

کولیا، بەدەم گوێگرتنەوە، بەڵام بە ترسەوە هاواری کرد:

- چیتە؟

جەنەڕاڵ، کە وەکو بی ناو ئاو دەلەرزی، لەبن لێوانەوە گوتی:

- "پاشای ڕۆما..."

- ئەوە چ دەڵێی، مەبەستت چییە؟ خێرەوا بە پاشای ڕۆماوە گرتووتە؟... مەبەست لە "پاشای ڕۆما" چییە؟

جەنەڕاڵ، توندتر شانی کولیای گرت و لەبن لێوانەوە گوتی:

- دە... دە... دەمەوێ.. دەمەوێ هەموو شتێکت پێ بڵێم.. ماریا.. ماریا.. پتروفنا.. سو..سو.سو..

کولیا، خۆی لە دەستی دەرهێنا، شانی جەنەڕاڵی گرت و بە سەرسامی و حەپەساوی لیی ڕاما، پیرەمێرد سووری سوور بووبووەوە، لێوەکانی شین هەڵگەڕابوون، ڕەنگ و ڕووی بەرەبەرە دەگۆڕا و گرژ دەبوو. لەپڕ





خاو بووەوە و بە ئەسپایی بەسەر بازووەکانی کولیادا ڕوخا.

کولیا، پڕ بەزار، ڕوو لە شەقامەکە هاواری کرد:

- سەکتە، مەرگی مفاجا.

ئەوسا حەقیقەتەکەی بۆ دەرکەوت.

پەراوێز:

* - .". ڤاگانکوفو..."': گەڕەکێکی قەراخ شاری مۆسکۆیە.

* - .". ئەرشیف.."': گۆڤارێکی مێژووییە لە ساڵی ١٨٦٢دا پارتینوف دایمەزراندووە. هەرچەندە تیراژەکەی کەم بووە، بەڵام هەمیشە بە باشترین بڵاڤۆکی ئەو بوارە دانراوە

* - .". کتێبەکەی چاراس..."': ئەم کتێبە بریتییە لە "مێژووی شەڕی واترلۆ ١٨١٥، کە لە لایەن لیوتینان کولونیل چاراسەوە نووسراوە، کتێبەکە لە ساڵی ١٨٦٤دا لە پاریس بڵاو بووەتەوە.

* - ..". ئەنجوومەنی شێران..."': لە دەقەکەدا بە فەرەنسیە.

* - .". بووە بە کابرایەکی خورافاتی..."': لە دەقەکەدا بە فەرەنسیە.

* - .". دورگە گەرم و تەریکەکەی..." لە دەقەکەدا بە فەرەنسیە.

* - .."کەواتە کچێکی بچووکە.." لە دەقە کەدا بە فەرەنسییە.

* - "هەرگیز درۆنەکەی،هاوڕێی دڵسۆزت..." لە دەقەکەدا بە فەرەنسیە.

* - ..". پیاو دەگەڵ ژنا بێت نەک وێڵ و سەرگەردان" جەنەڕاڵ لێرەدا سوودی لە ڕەگەزدۆزی نێوان هەر دوو وشەی: bobomiو babami babami )کە مانای ژنە) وەرگرتووە.

* - .". گریشا.."': سووکەڵە ناوی گریگوری یە.

* - ..". پاشای ڕۆما.."': لە دەقەکەدا بەفەرەنسیە.

* - "پاشای ڕۆما.." لە دەقەکەدا بەفەرەنسیە.

## فەسڵی پێنجەم

ئەلهەقی ڤارڤارا ئاردالیونوڤنا، کە دەگەڵ براکەیدا باسی خوازگاری ئاگلایا یەپانچینای لە لایەن میرزادەوە کردبوو، هەندێ موبالەغە لە قسە و زانیارییەکانیا هەبوو. ڕەنگە لە داخا، لە داخی ئەوەی خەون و ئاواتەکەی خۆی نەهاتبووە دی (خەونێک کە خۆیشی هەرگیز باوەڕی بەوە نەبوو بێتە دی) ئەو موبالەغەیەی کردبێت، چونکە مرۆڤ زاتەن، کە نەگبەتیەکی بەسەر دێت، یان کارەساتێکی لێدەقەومێ حەز دەکات گەورەی بکاتەوە و خۆی گوناح بنوێنێ. ئیدی بۆ ئەوەی کەمێک باری دەروونی پڕ حەسرەتی خۆی سووک بکات، ویستبێتی، هەندێ لەو تاڵاوە بە براکەشی، هەرچەندە زۆری خۆش دەویست، بنۆشێت. بەهەرحاڵ ڤارڤارا نەی توانیبوو زانیاری وردی لە کیژانی یەپانچین دەست بکەوێ. تەنیا چەند هێمایەکی گۆنگ، چەند ڕستەیەکی پچڕ پچڕ، هەندی قسەی مەتەڵ ئاسای لێهەڵکڕاند بوون و هیچی تر. لەوەشە خوشکەکانی ئاگلایا، بەئانقەست، هەندێ قسەیان فڕێ دابێ، بۆ ئەوەی زمانی ڤارڤارا تاقی بکەنەوە و ڕایکێشنە ناو قسانەوە و شتێکی لێدەربێنن. دووریش نییە هەر بۆ کەیف و لەزەتی ژنانەی خۆیان نەیان ویستبێ سەربکەنە سەر ڤارڤاراو، هەرچەندە هاوڕێی منداڵییانیش بوو، پێی ڕابوێرن، ئاخر ژنان بە تەبیعەت حەز دەکەن بە یەکتر ڕابوێرن و

سەربکەنە سەر یەکدی با دۆست و هاوڕێی منداڵیش بن. هەڵبەتە دوای ئەم هەموو هاتوچۆیە، هەستیان بە نیازو مەرامەکانی ئەم ژنە گەنجە کردبوو، یان بەلای کەمەوە هەستیان بە هەندێ لە مەرامەکانی کردبوو.

لەلایەکی دیکەشەوە، ڕەنگە میرزادەش، لەوەدا هەڵە بووبێ کە هەرچەندە لە نیاز پاکی خۆیەوە بە لیبدیفی گوتبوو هیچ شتێکی تازەی پێ نییە کە پێی بڵێ یان بۆی بگێڕێتەوە و هیچ گۆڕانێکی تایبەتی بەسەر ژیانیا نەهاتووە. هەریەکە و خۆی لەهەنبەر دیاردە و ڕووداوێکی سەیردا دەبینی یەوە. هیچ پێشهات و ڕوداوێکیش لە ئارادا نەبوو، بەڵام جەوەکەی لەوە دەچوو، هەندێ ڕووداوی گرینگ لە ئارادا بێ. ڤارڤارا بە غەریزەی ژنانەی هەڵە ناپەزێری خۆی بۆنی ڕووداوەکانی کردبوو. زۆر زەحمەتە لە ڕووی لۆژیکییەوە پەی بەوە ببرێت کە چۆن هەموو ئەندامانیماڵباتی یەپانچین، لە یەک کاتدا گەیشتبوونە ئەو قەناعەتەی کە گۆڕانێکی گەورە و چارەنووس ساز لە ژیانی ئاگلایادا بەڕێوەیە، بەڵام هەر کە ئەم بیرۆکەیەیان لە هزرا چێبوو، هەموو یەکسەر، پەیان بەوە برد، کە دەمێک بوو، پێشبینی ئەم ڕووداوەیان، کە ئەمڕۆ بە تەواوی زەق بووەتەوە، کردبوو. ڕووداوێک کە لە ڕۆژی "سوارچاکە لاتەکەوە"و بگرە لە پێشتریشەوە، دیار بوو، بەڵام ئەوساکە نەک هەر گاڵتەیان بەو ڕووداوە دەهات و باوەڕیان پێنەدەکرد بەڵکو بە سەخافەتیشیان دەزانی.

خوشکەکانی ئاگلایا بە ئاشکرا ئەوەیان دەگوت. هەڵبەتە لیزاڤیتا پروکوفیڤنا، لەپێش هەموو کەسێکدا پێشبینی هەموو شتێکی کردبوو و لە هەموو شتێک حاڵی بووبوو (تەنانەت لە سۆنگەی ئەوەوە دڵی هاتبووە ژان). بەهەرحاڵ زوو هەستی پێ کردبوو یان درەنگ، ئەمەیان گرینگ نییە. وای لیهاتبوو بە ناو و ناوبانگی میرزادەش پەست و بێزار دەبوو، هەرچی دەکرد ئەم بیرۆکەیەی پێ قووت نەدەچوو، سەری لێدەر نەدەکرد، ئەقڵی نەی دەبڕی. ڕووبەڕووی پرسیارێک بووبووەوە کە دەبوا بە زووترین کات وەلامەکەی بدۆزێتەوە، بەڵام لیزا ڤیتا پروکو-فیڤنای بێنەوا هەرچی دەکرد و دەکۆشا نەک هەر وەلامی بۆ نەدەدۆزرایەوە، تەنانەت نەیدەتوانی و




نەیدەزانی بە ڕوونی و ڕەوانی پرسیارەکە لە خۆیشی بکات. فەقیرە تیا مابوو، مەسەلەکە، مەسەلەیەکی دژوار بوو: "ئایا میرزادە مێردێکی گونجاوە بۆ کیژێ یان نا؟ ئایا ئەمە پرۆژە و بیرۆکەیەکی باشە یان خراپە؟ ئەگەر خراپە (زاهیری، بێ چەندو چوون خراپ بوو) خراپیەکەی لەچیدایە؟ ئەگەر باشە (دوور نییە باش بێت) باشیەکەی چۆنە و لەچیدایە؟" سەرگەڤاری خێزان، ئیڤان فیدوروفیچ، لە سەرەتاوە سەری سووڕما، پاشان ئیعترافی کرد و گوتی: "باوەڕ بکەن، بەدرێژایی ئەو ماوەیە ناو بە ناو هەستم بەوە دەکرد کە شتیک لەئارادایە"! بەڵام کە چاوی بە نیگای زبری هاوسەرەکەی کەوت، خێرا زاری گرت و هیچی دیکەی نەگوت. بەدرێژایی ئەو ڕۆژە هەر بێدەنگ بوو، بەڵام شەوێ کە دەگەڵ هاوسەرەکەیدا بە دووقۆڵی مانەوە، هەستی کرد، دەبێ گرێی دڵی خۆی بکاتەوە و قسەیەک لەو مەسەلەیەدا بکات، لەپڕ زاتی وەبەرخۆی ناو چەند بۆچوونێکی چاوەڕوان نەکراوی دەربڕی. گوتی: "مەسەلەکە چییە؟... (ساتێک بێدەنگی)... "هەڵبەتە ئەگەر ئەمە ڕاست بێ سەیرە... (ساتێک بێدەنگی دی). لە لایەکی دیکەشەوە، ئەگەر کەمێک واقیعبینانە بڕوانینە مەسەلەکە و بەرخودێکی دروستی دەگەڵدا بکەین، هەر بەینی خۆمان بێ، میرزادە پیاوێکی زۆر زۆر باشە، و... و... و... بۆ مەسەلەی ناویش، هەڵگری هەمان ناو و شۆرەتیماڵباتەکەی ئێمەیە.. ئەمەش خۆی لە خۆیدا، ناومان لە کۆمەڵگەدا بەرزتر دەکاتەوە... هەڵبەتە لە ڕوانگەی کۆمەڵگەوە... چونکە.. بەهەرحاڵ.. کۆمەڵگەش دەیەوێ! .. سەرباری هەموو ئەمەش میرزادە، هەرچییەک بێ، داراییەکی هەیە، سەروەتێکی هەیە، با زۆریش نەبێ..

ئیڤان فیودوروفیچ، لێرەدا، لە دەماوەری و وتە پاراوی کەوت، بێدەنگ بوو.

لیزا ڤیتا پروکوفیڤنا کە بینی مێردەکەی بەو شێوەیە لە مەسەلەکە دەڕوانێ، خوای نەما، بە جارێ دەهری بوو. بە ڕای لیزا ڤیتا پروکوفیڤنا، هەر هەموو ئەوەی ڕووی دابوو " گەوجێتی یەکی بێ ماناو لە بەخشین نەهاتوو بوو، بەڵکو تاوانێکی ناماقووڵ بوو، خەیاڵپڵاوێکی کەرانە و پووچ

بوو." یەکەم ئەم "میرزادە نەعلەتیە پیاوێکی نەخۆشە، دووەم بنیادەمێکی گەمژەیە و فرِی بەم دنیاوە نییە و نە کۆمەڵگە دەناسێت و نە دەکارێت شوێنێک بۆ خۆی بکاتەوە: ئاخر بۆ کوێی بەرین و بەکێی نیشان بدەین؟ بابایەکی دیموکرات مەشرەبی بێ سەروبەرە، هیچ پلەو پایەیەکی فەرمی دەوڵەتی نیەو... و... و... ئاخر دۆتمیر بیلوکونسکایا چمان پێدەڵێت و چۆن لە گلەیی ئەو دەردەچین؟ باشە ئەمە ئەو مێردەیە کە بۆ ئاگلایای کیژمان، بە ئاواتمان دەخواست؟

هەڵبەتە ئەم نارەزاییەی دوایی، لە هەموو نارەزایی و پرسیارەکانی دی پتر دڵی لیزا ڤیتایان، وەکو دایک دەیە شان. ئەو نارەزایی و پرسیارەی زۆر بەجیددی بوو. هەرچەند بیری لەم مەسەلەیە دەکردەوە دڵی دایکانەی دەهاتە ژان و روندکی خەمباری بەچاواندا دەهاتە خوارێ. هەرچەندە لەوە دەچوو هەر لە قووڵایی هەمان دڵەوە، دەنگێک بەچپە بڵێت: "ئاخر بۆ میرزادە هەمان مێرد نەبێ کە خەویان پێوە دەبینی، میرزادە عەیبی چییە؟ "

هەر ئەم نارەزاییەی دڵی خۆی بوو کە لیزاڤیتا پروکوفیڤنای ئازار دەدا.

لێ خوشکەکانی ئاگلایا، میرزادەیان پێ خراپ نەبوو، ئەم کاری خێرەشیان پێ سەیر نەبوو. هیچ دوور نەبوو لە کوتوپرێکا و زۆر بەجیددی تەرەفداری لە میرزادە بکەن، بەڵام هەر دووکیان لێبرا بوون کە هیچ شتێک نەڵێن. دەبێ ئەوەش بڵێین لەمێژ بوو لە ماڵباتی یەپانچیندا ئەوە ساغ بووبووەوە کە گەنگەشە و نارەزایی لیزا ڤیتا پروکوفیڤنا دەربارەی هەر پرۆژە و بابەتێکی خانەوادەیی، چەندیش سەرسەختانە و بنجبر بێت، هەر ئەگەری ئەوە هەبوو هەندێ جار بێتە رەداو قەناعەت بە دروستی بابەتەکە بێنێ. یانی لە سەرەتاوە پێداگری زۆری دەکرد، بەڵام زۆر جاریش دڵی نەرم دەبوو و دەهاتە رەدایە.

بەهەرحاڵ، (ئەلکسندرا ئیڤانوڤنا)ش نەدەبوو تا سەر بێدەنگ بێ، دەبوایە هەرچۆنێ بووە شتێک بڵێت. دایکی لەمێژبوو وەکو رازگرو مەحرەمی رازی خۆی هەڵی بژارد بوو، پرس و راوێژی پێ دەکرد، هەنوکەش بەردەوام راوێژی پێ دەکرد، رەئی دەپرسی، بە تایبەتی کە چی لەو بارەیەوە لەلا





بوو: " ئەم مەسەلەیە چۆن دەستی پێ کرد و چۆن گەیشتە ئێرە؟ بۆ کەس هەستی بە هیچ نەکرد؟ بۆ ئەوسا هیچ قسەیەکت نەکرد؟ ئەو سیناریۆ تورەهاتەی "سوارچاکی لات" مانای چی بوو؟ ئاخر بۆچی من، دایکتان، لیزا ڤیتا پروکوفیڤنا، لەجیاتی هەمووتان، ئەم باری قورسی خەمە هەڵگرێت، لە بری ئێوە بیربکاتەوە، پێشبینی هەموو شتێک بکات و ئەوانی دیکەش، هەموو، نان خۆر و جێگر، بێ خەم و خەیاڵ، دەست لە سەر دەست دانیشن و بەوپەڕی خۆێنساردی بڕواننە مەسەلەکە؟"... هتد. ئەلکسندرا ئیڤانوڤنا، لە سەرەتاوە بە پارێز بوو. تەنیا ئەوەندەی گوت کە بیرکردنەوەکەی بابی بە دروست دەزانی: لە رووی کۆمەڵایەتی و لە روانگەی کۆمەڵگەوە، هەڵبژاردنی میرزادە میشکین کە لە بنەماڵەی بە ناوبانگی میشکینەکانە، وەکو زاواو مێردی یەکێک لە کیژانی خانەوادەی یەپانچین، رەنگە کارێکی یەجگار پەسەندبێ. ئەلکسندرا، پاشان بەرەبەرە زاتی پەیدا کرد، گەرم بوو، لەسەر قسەکانی بەردەوام بوو و گەیشتە ئەوەی گوتی کە میرزادە پیاوێکی "گەمژە" نییە و قەتیش رۆژێ لە رۆژان گەمژە نەبووە، بەلام سەبارەت بە مەقام و پێگەی کۆمەڵایەتی، هەر خوا دەزانێ، لە چەندساڵی ئاییندەدا پایەوشایستەیی کۆمەڵایەتی پیاوێک بە چ پێوەر و/پێوانەیەک لەم رووسیایەدا دیاری دەکرێت، بەو پێوەرە پێوانە دەکرێت کەوەزیفەیەکی فەرمی دەوڵەتی هەیە یان بە پێوەرێکی دی. لیزاڤیتا پروکوفیڤنا، نەک هەر ئەو قسانەی ئەلکسندرای پێ قووت نەچوو، بەڵکو زۆریش توورە بوو و گوتی ئەلکسندرا کیژێکی "ئازادیخوازە، هەر هەمووشی ئەنجامی ئەو دۆزە شوومەیە کە ناویان ناوە دۆزی ژنان". دوای نیو سەعاتێک، لیزاڤیتا پروکوفیڤنا چوو بۆ شار، لەوێندەرەوە چوو بۆ کامنی ئوستروف* تا خانم بیلوکونسکایا بدینێ کە بە رێکەوت هەر لەو کاتەدا لە پترسبۆرگ بوو، بەلام قەرار بوو بەو زووانە بۆ سەفەر بڕوات. ئەم خانمە پیرە، دایکی تەعمیدیی ئاگلایا بوو.

پیرەژن، بەوردی گوێی لە دەردە دڵ و گلەیەکانی لیزاڤیتا پروکوفیڤنا گرت، بەلام لەجیاتیی حەسرەت و داخ و کەسەر و فرمێسکی گەرمی

لیزاڤیتـا کـاری تـێ بکـات و ببـێ بـە شـەریکی خـەمی، تـەنیا نیگایـەکی تەوسـامێزی کـرد. بیلوکونسـکایا، ئـافرەتێکی بەسـام و زەبـر و زەنـگ بـوو. قەت کەسی بە هاوتای خۆی نەدەزانی، تەنانەت ئەوانەشی بە هاوتـای خۆی نـەدەزانی کـە دۆسـتایەتی و ناسـیاوی کـۆنی دەگەڵیانـدا هـەبوو. ئێسـتاش لیزاڤیتـا پروکوفیڤنـای بـە سایەنشـینی خـۆی دەزانـی، دەقـاودەق بـە هـەمان نەفەسی سی و پێنج ساڵ لەوەپیش کـە داڵـدەدەری* لیزاڤیتـا بـوو، مامەڵـەی لـە تەکدا دەکرد. هـەرگیز بـە خـووی توندو تـەبعی سەربەسـتانەی لیزاڤیتـا پروکوفیڤنا ڕازی نەبوو. یەکێک لە تێبینی و سـەرنجەکانی ئەوە بـوو کـە ئـەم "خانمانە، عادەتیان وایە شتەکان گەورە دەکەن، مێشـێ دەکـەن بـە گامێشـی، کایـە دەکـەن بەگایـە". ئەوەی کـە هەنوکـە لـە لیزاڤیتـا پروکوفیڤنـای بیسـتبوو، ئەو قەناعەتـەی لا دروسـت نـەکرد کـە ڕووداوێکـی گەورە و نـاخۆش ڕووی دابێ. باشـە ئەگـەر سـەبر بگرن و چاوەڕوان بکـەن بزانن ئاییندە چـی پێیـە، باشـتر نییـە؟ بـە بۆچـوون و قەناعـەتی وی میـرزادە، "گـەنجێکی شایسـتەیە، هەرچەندە نەخۆش وسـەیروسـەمەرە و خەیاڵاتیـە، لەوەش خراتـر بـە ئاشـکرا ماشوقەیەکی هەیە و خەرجی دەکێشێت".

لیزاڤیتا پروکوفیڤنا، زۆر چـاک دەیزانی کـە دۆتمیر بیلوکونسـکایا کوێـی دێشـێت و لـەچی زویـرە، لەناکامیەکـەی یـەڤگینی پـاڤلوفیچ زیـز بـوو، چونکـە دەستەبژێری خۆی بوو.

لیزاڤیتـا پروکوفیڤنـا، لـە جـاران تـوڕەتر و بێزارتـر، بـۆ پاڤلوفسـک گەڕایەوە. ئەمـە لـە کەسوکارەکەی شـاراوە نـەبوو، بـە تایبـەتی وەختـێ پێـی گـوتن "هـەموویان ئـەقڵیان لەدەسـت داوە" کـەس لـە دنیـادا بەو شـێوەیە کاروباری خۆی بەڕێوە نابات، شتی وا لـە مـاڵی کەسـا نییـە، تـەنیا لـە مـاڵی ئەواندا نەبێ "ئەم هەموو پەلە پەلە لەپای چی! چی قەوماوە، خۆ دنیا ئـاخر نـەبووە؟ هـەرچی سـەر دێنم و سـەردەبەم، هەسـت ناکـەم هـیچ پێشـهاتێک لەگۆڕێ بێ! سەبر بگرن، چاوەڕوان بکـەن، بزانن ڕۆژگـار چـی پێیـە! ڕەنگـە ئیڤـان فیودوروڤیچ زۆر شـتی بـە خەیاڵدا بـێ! بۆچی مێش لـەخۆ بکـەین بـە گامیش؟"... هتد.

ئەنجام بەوە شکایەوە کە پێویستە سەبر بگرن، بە خوێنساردی ڕوو بە ڕوی ڕووداو و پێشــهاتەکان ببــنەوە و چــاوڕوان بکــەن. لــێ حــەیفێ، ئــەم ئارامیە دە دەقیقەشی نەخایاند، دوێشە و کە دایکیان لە ماڵ نابێ، لە کامنی ئوستروف دەبێ، ڕووداوێک ڕووی دابوو، ڕیســەکەی دایکیــانی، کــە بریتــی بوو لە ئارام گرتن و چاوەڕوانی، کردەوە بـە خـوری. (لیزا ڤیتا پروکوفیڤنا دانــی بــەیانی چووبــوو بــۆلای بیلوکونســکایا. بــۆ شــەوەکەی میــرزادە، دوای نیوەشەو، بەو خەیاڵەی کە سەعات دەیە چووبوو بۆ ماڵیان). کـە دایکیــان بـە گەرمی دەکەوێتە تاقیب و پرسیار لـە کچـەکانی، جووتـە خوشـکەکەی ئاگلایا زۆر شتی بە دووردرێژی بۆ دەگێڕنەوە. لە هەوەڵەوە گوتیان کـە لـەماوەی سـەفەرەکەی ئەودا "هـیچ شـتێک ڕووی نـەداوە". پاشـان کەوتنـە گێـڕانەوەی ئەوەی ڕووی دابوو. گوتیان میـرزادە هـاتووە، بەڵام ئاگلایـا ماوەیـەکی زۆر، نزیکەی نیو دانە سەعات، خۆی نیشـان نـەدا، ئەویش هـەر چاوەڕوانی کـرد. دوای ئەوە ئاگلایـا لـە نهـۆمی سـەرەوە هاتـە خـوارێ و پێشـنیازی کـرد کـە شەترەنج بکەن. میرزادە، شەترەنجی نەدەزانی و ئاگلایا یەکسـەر کش مـاتی کـرد. ئاگلایـا زۆری دڵ بـەم سـەرکەوتنەی خـۆی خـۆش بـوو، بـە کـەماڵی ئارەزوو کەوتە ڕابواردن بە میرزادە کە گوایە یاری نازانێ، ئەوەنـدەی گاڵتـە پێکـرد، وەکـو کە و چـوو، پیـاو بـەزەیی بـە حاڵیـا دەهـاتەوە. ئەوسـا ئاگلایـا پێشـنیازی کرد کـە بەوەرەق گەمـەی "گەوجبـازی "simpleton بکـەن، ئـەم جارەیان بەپێچەوانەوە دەرچوو: میرزادە زۆر بەڵەد بـوو. وەکـو وەسـتایەکی کارامە و لێهـاتوو ئـەم گەمەیـەی دەکرد. ئاگلایـا کەوتـە گـزی و فێڵبـازی، بـە دزییەوەوەرەقەکانی دەگۆڕی، سەیری دەستەکەی میرزادەی دەکرد، وێڕای ئەمــەش هــەر خــۆی بــە "گەوج" دەردەچــوو... ئەمــە پێــنج شەشــە کــەڕەت دووبـارە بـووەوە. ئاگلایـا، زۆر تـوڕە بـوو، کـۆنترۆڵی خـۆی لەدەسـت دا، تانەوتەشـەری هێنـدە زبرو ناشـرین و قێزەونـی بەسـەر میرزادەدا هەڵڕشـت کە لە پێکەنینی خست، لـە کۆتاییدا کـە ئاگلایا پێی گـوت: "تـا ئەو لێرە بێت، دوو پێی نایەتە ئەم ژوورەو، هاتنەکەشی بەم نیوە شـەوە، دوای ئـەو هـەموو شـتەی کـە ڕووی دا*، خـۆی لـە خۆیـدا نیشـانەی بـێ ئـەقڵی و گوسـاخیە"

ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا، بوو بە زەعفەرانی زەرد. ئاگلایا دوای ئەو قسەیە لە ژوورەکە وەدەر کەوت و شریق دەرگاکەی لە دوای خۆیەوە دا بە یەکا. میرزادە، هەرچەند خوشکەکانی ئاگلایا زۆریان دڵنەوایی کرد و دڵخۆشیان دایەوە، ڕەنگ زەرد و لێو بەبار وەکو مردوو، خۆی ڕەکێش کرد و ڕۆیشت.

دوای ڕۆیشتنی میرزادە، بە چارەکێک ئاگلایا هێندە بەهەشتاو لەسەرڕێرا هاتە بالکۆنەکە، کە فریا نەکەوتبوو فرمێسکەکانی، کە بە زەقی دیار بوون، بسڕێ. بۆیە بەو پەلە پڕوزێیە هاتبووە خوارێ، چونکە کولیا بە خۆی و ژیژکێکەوە هاتبوو. هەموو کچەکان کەوتنە تەمەشاکردنی ژیژگەکە. لێیان پرسی ئەو ژیژگەی لەکوێ بوو، لە وەڵامدا گوتی هی خۆی نییە. بەڵکو هی هاوپۆلێکی خۆیەتی بە نێوی کوستیا لیبدیف، لە ڕێگە بەجووتیارێکی دیتووە و لێیان کڕیوە، هەروەها تەورێکیشمان لە هەمان جووتیار کڕیوە. جا کوستیا لە دەرەوە، لەسەر جادەکەوەستاوە، لە ڕووی نەهات بەو تەورەوە بێتە ژوورەوە. جووتیارەکە لە هەوەڵەوە گوتبووی هەر ژیژکەکە دەفرۆشێت و داوای پەنجا کۆپیکی کردبوو، بەڵام دوایی قەناعەتیان پێ کردبوو کە تەورەکەشیان پێ بفرۆشێت، چونکە پێویستیانە، تەورەکەش، بە ڕاستی تەور بوو نە گاڵتە.

ئاگلایا، زۆر بە مکوڕی کەوتە پاڕانەوە لە کولیا کە یەکسەر ژیژکەکەی پی بفرۆشێت. بە جۆری وەجۆش هاتبوو کە بە کولیای گوت: "کوڕەکە گیان" کولیا ماوەیەکی زۆر نە هاتە ڕەدا و ملی نەدا، بەڵام لەکۆتاییدا ملی داو، کوستیا لیبدیفی گازکرد، کۆستیا بە خۆی و تەورەکەیەوە سەرکەوت، لە شەرما نەیدەزانی چ بکات. لەم کەین و بەینەدا لەپڕ دەر کەوت کە ژیژکەکە هی ئەوان نییە، بەڵکو هی هاوڕێیەکی دیکەی قوتابخانەیانە بە نێوی (پتروف) کە تۆزێ پارەی دابوونی تا کتێبی "مێژوو"* ی شلوسەری، لە هاوڕێیەکی چوارەمیان بۆ بکڕن، ئەم هاوڕێیەیان گوایە پێویستی بە پارە بوو و کتێبەکەی بە هەرزان دەفرۆشت. کە چووبوون بۆ کڕینی کتێبەکە، لە ڕێگا تووشی کابرای جووتیار دەبن و کەڵکەڵەی کڕینی ژیژکەکەیان

دەکەوێتە سەرو دەیکرن، ئیدی پێوە بوون، لەجیاتی کتێبی "مێژوو" ـەکەی شلوسەری دیرۆکنووس، ژیژک و تەور بۆ بتروفی برادەریان بەرنەوە. لێ ئاگلایا، بە ڕادەیەک پێی داگرت، کە کوڕیژگەکان ناچار، ملیان دایە خەت و ژیژکەکەیان پێ فرۆشت. ئاگلایا کە بوو بە خاوەنی ژیژکی خۆی، بە کۆمەکی کولیا لە تلیانەیەکی ناو، بەپارچەیەک سەری بەست و تکای لە کولیا کرد کە یەکسەر و بێ ئەوەی لە ڕێگا، لە هیچ شوێنێک لابدات، بیبات بۆ میرزادە و پێی بڵێت ئەو، ئاگلایا "بە دیاری وەکو ڕێزو حورمەت بۆی ناردووە." کولیا بە خۆشحاڵیەوە ئەم ئەرکەی قەبووڵ کرد و وەعدی دایە کە بەجوانترین شێوە بیگەنێتە دەستی، بەڵام یەکسەر لە ئاگلایای پرسی ئەم دیاریە چ دەگەیەنێ و، ژیژک ڕەمزی چییە، ئاگلایا وەڵامی دایەوە کە ئەمە ئیشی ئەو نییە و هەقی بەسەر ئەمەوە نەبێ. کولیا گوتی دڵنیایە کە ئەم کارە ڕاز و ڕەمزێکی تیایە. ئاگلایا تووڕە بوو و پێی گوت کە منداڵێکی کەللە شەقی فشەکەرە. کولیا وەڵامی دایەوە: ئەگەر ژن نەدەبوو، حورمەتی خۆی نەدەگرت، پێی نیشان دەدا چ وەڵامێکی ئەو ئیهانەیەی دەدایەوە، بەڵام ئەنجام کولیا، بەخۆشحاڵیەوە ژیژکەکەی هەڵگرت و میرزادە خۆت بگرەوا هاتم، کوستیا لیبدیفش بەغار دووی کەوت. ئاگلایا هیچ ڕقێکی لێهەڵنەگرت. کە بینی بە توندی تلیانەکە دەهەژێنێ، هاواری لێکرد: "کولیا گیان، بێزەحمەت ئاگادار بە تلیانەکە لە دەستت نەکەوێ! " کولیاش، وەکو ئەوەی تۆزێ لەمەپێش لێیان نەبووبێ بە شەڕ، لە جێی خۆی وەستا، بە ڕووخۆشی وەڵامی دایەوە و گوتی: "نا، خەمت نەبێ، نایەڵم تلیانەکەم لە دەست بەربێتەوە ئاگلایا ئیڤانۆڤنا، دڵنیابە! " ئەوجا بەپەلە ملی ڕێگای گرت و ڕۆیشت. هەنگێ ئاگلایا بەدەم قاقای پێکەنینەوە، سەرکەوت بۆ سەرەوە و بەوپەڕی شادی و خۆشحاڵی بەرە و ژوورەکەی خۆی ڕۆیشت. ئیدی بە درێژایی ئەو ڕۆژە هەر شادو شەنگوڵ بوو.

ئەم هەواڵە لیزاڤیتا پروکوفیڤنای بەجارێ ئاڵۆزاند. هەرچەندە پێویستی بەو هەموو نیگەرانی و ئاڵۆزبوونە نەدەکرد، بەڵام ئیدی باری دەروونی ئەو ڕۆژگارەی وابوو، زەینی لەوە زیاتر بڕی نەدەکرد. نیگەرانی خانم یەپانچین

گەیشتە لوتکە، زیاتریش لەبەر ژیژکەکە نیگەران بوو. ژیژک! ئاخر ناردنی ژیژک بۆ میرزادە مانای چی بوو؟ ئەمە پەرلەی بەینی خۆیان نەبوو؟ ئەمە نهێنی یەکی بەینی خۆیان نەبوو؟ ئاخر ئەمە چ مانایەکی هەبوو؟ یانی جۆرە بروسکەیەک نییە؟ جەنەڕاڵ یەپانچینی بەلەنگاز، کە بەدڵ پاکی خۆی و لەسەر نیازی خۆی وەڵامی ئەو هەموو پرسیارەی دایەوە کە ناردنی ژیژک بە ڕای ئەو نە پەرلەیە و نە بروسکەیە و نە هیچ پەیامێکی پێشوەختەی تیایە. باشتر وایە شتەکە زۆر ئاسایی وەربگرین و بڵێین "ژیژک، ژیژکە و تەواو، ڕەنگە نیشانەی دۆستایەتی بێ و هەوڵێک بێ بۆ ئاشت بوونەوە، بۆیە ناردنی ژیژکەکە تەنیا سوعبەت و شۆخیەکی پاک و بێگەرد بووە و هیچی دی." هەڵبەتە لیزا ڤیتا بروکوفیڤنا بەو وەڵامە هێندەی دی دەهری بوو.

هەڵبەتە پێویستە بەلەز ئەوە بڵێین کە ڕاڤە و شرۆڤەکەی جەنەڕاڵ زۆر دروست بوو. میرزادە، دوای ئەوەی ئاگلایا ئەو هەموو سووکایەتییەی پێ کرد و دەری کرد، گەڕایەوە بۆ ماڵەکەی خۆی، مات و خەمبار، وەکو ئەوەی خۆڵ و دۆی بەسەرا کرابێ، بە تاقی تەنیا دانیشتبوو. کە دوای، نیو سەعاتێک لەو هەموو خەم و پەژارەیە، چاوی بە کولیا کەوت کە بە خۆی و تلیانەیەکەوەوەژوور کەوت، دنیای تاریکی لە بەرچاو ڕوون بووەوە، دەتگوت ئاسمان درزی تێبووە و کولیای لێ بەربووەتەوە. بە ڕادەیەک گەشایەوە، لە تۆ وایە لە نوێ لەدایک بووەتەوە، مردووە و زندوو بووەتەوە. ئیدی بەپرسیاران کولیای دابێژت، هەر پرسیارێکی دە کەڕەت لێ دووبارە دەکردەوە. بەدەم هەر وشەیەکەوە کە لە زاری ئەو کوڕیژگەیە دەهاتە دەرێ، وەکو منداڵ دەگرژیەوە، دەگەشایەوە، ئازای نقومی پێکەنین دەبوو، هەموو ساتیک دەستی ئەو دوو منداڵە مەکتەبلییەی دەگوشی. کوڕەکانیش گوی بەگوێی وی پێدەکەنین، شادو دڵخۆش تەمەشایان دەکرد. ئەوەی لای میرزادە ساغ بووەوە و چەسپی، هیچ گومانێکی تیا نەما ئەمە بوو کە: ئاگلایا بە خشیویەتی، هیچ ڕقێکی لێ هەڵنەگرتووە، ئیدی دەتوانێ هەر هەمان شەو بڕوات و بیدینێت. بۆ میرزادە ئەمە نەک هەر گرینگ و





مەبەست بوو، بەڵکو هەموو شتێک بوو، مان و ژیان بوو!

ئەنجام بەدەم ئەوپەڕی شادییەوەوەکو یەکێک حاڵ گرتبی هاواری کرد:

- کولیا، ئێمە تاکو ئێستاش هەر منداڵین! چەند منداڵین!... و... و چەند باشە پیاو هەر منداڵ بێ و بە منداڵی بمێنێتەوە!... کولیا، بەوپەڕی متمانەوە، وەکو پیاوێکی گەورە بەرشقی دایەوە:

- میرزادە، مەعلوومە کە خۆشی دەوێی... حەزی لێکردویت... ئەمە هیچ چەندو چوونێک هەڵناگرێت و بڕاوەتەوە!

میرزادە، سوور بووەوە، بەڵام ئەم جارەیان هیچی نەگوت. لە کاتێکا کولیا بەدەم پێکەنینەوە چەپڵەی لێدەدا، دوای تۆزێک میرزادەش گوێ بەگوێی ئەو دەستی بە پێکەنین کرد. ئیدی لەوساتەوە تا شەوێ، هەر پێنج دەقیقە کەڕەتێ دەیڕوانییە سەعاتەکەی تا بزانێ کات چەندە و دەبێ چەندی دی چاوەڕوان بکات.

با بێینەوە لای لیزاڤێتا پروکوفیڤنا. باری دەروونی ئەو لەو ساتەدا گەیشتبووە لوتکەی پەشێوی و پەرێشانی. خۆی پێ کۆنترۆڵ نەدەکرا، خەریک بوو تێک دەچوو. ئەوەتا وێڕای نارەزایی مێردەکەی و کیژەکانی، دەنێرێت بە دووی ئاگلایادا، تا دوا پرسیاری لێ بکات و وەڵامێکی ڕوون ڕەوانی دەست بکەوێ. "پێویستە یەک کەڕەت ئەم مەسەلەیە یەک لایی بکەینەوە. تا ببڕێتەوە و جارێکی دی نەیەینەوە سەری و باسی نەکەین." بەدەم ئەو قسەیەوە لەسەری ڕۆیشت: "ئەگەر ئەوە نەکەم ناگەمە شەوێ، دەمرم! " هەنگێ هەموو زانیان کە مەسەلەکەیان چەند لە خۆ گەورە کردووەتەوە، بەڵام هەرچیان کرد و کۆشا ئاگلایان بۆ نەهاتە قسان، جگە لە دەربڕینی سەرسامی و گاڵتە کردن و پێکەنین بە میرزادە، هیچیان لە زاری ئاگلایا بۆ دەرنەهێنرا. گاڵتەی بە هەموو ئەوانە دەکرد کە پرسیاریان لێدەکرد.

لیزاڤێتا پروکوفیڤنا، چوو بۆ سەر جێگاکەی تا تۆزێ پاڵ بکەوێ، ئەوسا نەگەڕایەوە تا وەختێ پێگەیشتنی چای کە قەرار بوو میرزادەش بۆ ئەو کاتە بگاتە جێ. لیزاڤێتا پروکوفیڤنا، بە پەرۆشەوە چاوەڕوانی هاتنی

میرزادە بوو، کاتێ میرزادە هات، لیزاڤیتا پروکوفیڤنا خەریک بوو شێت دەبوو.

میرزادە، بە شەرم و ترسەوەوەژوور کەوت. بە جۆرێ هەنگاوی دەنا لە تۆ وایە لە تاریکی دایە و بەرپێی خۆی نابینێ. بزەیەکی غەریب نیشتبووە سەر لێوی، بە جۆرێ چاوی بە هەمووواندا دەگێڕا وەک بڵێی لێیان بپرسیت ئەدی ئاگلایا کوا، بۆ لەم ژوورە نییە. هەڵبەتە زۆری پێ سەیر بوو کە ئاگلایا لەوێ نەبوو. ئەو شەوە، هەر خۆیان بوون، کەسی بێگانەیان لەگەڵ نەبوو. تەنانەت میرزادە (س...)ش لەوێ نەبوو. بە هۆی مردنی مامی یەڤگینی پاڤلوڤیچەوە، لە پترسبورگ مابووەوە. لیزاڤیتا پروکوفیڤنا حەزی دەکرد ئەویش لەوێبا، لە دڵی خۆیدا دەیگوت: "خۆزی لێرەبا، هەر نەبا ئەویش شتێکی دەگوت! ".. ئیڤان فیدوروفیچ، خەمین و خەمبار دانیشتبوو، زۆر نیگەران و پەشێو دیار بوو. خوشکەکانی ئاگلایا ئاقڵ و ئاغر، کڕوکپ دانیشتبوون، لە تۆ وایە، پێشوەختە بڕیاریان داوە بێدەنگ بن و قسان نەکەن.

لیزاڤیتا پروکوفیڤنا، تیا مابوو لەکوێوە سەری قسان بکاتەوە. ئاقیبەت بە زەمی خزمەتگوزاری هێڵی ئاسن دەستی بە قسان کرد و بە بێزارییەوە مۆڕەی لە میرزادە دەکرد.

مخابن! ئاگلایا هێشتا نەهاتبوو، میرزادە پەشۆکابوو! هەستی بە پەشێوییەکی زۆر دەکرد، هەرچۆنێ بێ لەبن لێوانەوە گوتی هێڵی ئاسن ئەگەر چاک بکرێ و نۆژەن بکرێتەوە، ڕەنگە سوودێکی زۆر باشی هەبێت، بەڵام کە ئادیلاید، لەناکاوا لە قاقای پێکەنینی دا، میرزادە، بە جارێ نەترەی بەردا، ڕێک لەو کاتەدا ئاگلایا، هێدی و هێمن، سەلارو سەنگین، بە هەیبەت و ویقارەوەوەژووکەوت، بەوپەڕی ئەدەب و نەزاکەتەوەوەلامی سڵاوەکەی میرزادەی دایەوە، ئەوجا بەکاوەخۆ، مەندو مەنگ، چوو لە دیارترین شوێنی مێزە خڕەکە دانیشت. ئەوجا نیگایەکی پرسیار ئامێزی میرزادەی کرد. ئیدی هەموو زانیان کە کاتی ئاشتبوونەوە هاتووە. کاتی ئەوە هاتووە گشت بەدحاڵی بوونەکان پاک بکرێنەوە.

ئاگلایا، بە زمانێکی پڕ متمانە و نیمچە زبر پرسی:

- ژیژکەکەمت پێ گەیی؟

میرزادە، سوور بووەوە، شپرزە و پەشێو، بەرسڤی دایەوە:

- بەڵێ.

-دەی پێمـان بڵێ تـۆ ئەوە بـەچی دەزانـی! چـۆنی لێکدەدەیەوە. ئەمـە بـۆ ئاسودەیی دایکم و هەموو خێزانەکەمان پێویستە.

لەپڕ جەنەڕاڵ، بەشپرزەیی و نیگەرانی هەڵی دایە:

- ئاگلایا... ئەم قسەیە چییە؟

لیزاڤیتا پروکوفیڤنا، کە بەخۆڕایی خۆی شپرزە کردبوو، گوتی:

- لە حەدی خۆت دەرمەچۆ!

کیژێ، یەکسەرو بەتوندی وەڵامی دایکی دایەوە:

- دایکـە، ئەمـە پەیوەنـدی بـە حـەدو حـددەوە نییـە. ئـەمڕۆ ژیـژکێکم بـۆ میرزادە نارد بوو، جا حەز دەکەم بزانم ڕەئی چییە. دەی شازادە گوێم لێتە.

میرزادە پرسی:

- ئاگلایا ئیڤانوڤنا، مەبەستت لەوشەی "ڕەئی" چییە و دەربارەی چی؟

- مەبەستم ڕەئی تۆیە دەربارەی ناردنی ژیژکەکە!...

- ئاگلایـا ئیڤانوڤنـا، مـن پێم وایـە، بـە تەقدیری مـن، دەتەوێ بزانیـت مـن چۆن پشوازیم لە بیرۆکەی ناردنی ژیژکەکە بۆ من... یانی چۆن تەمەشـای مەسـەلەکەم کـردووە... یـانی چـۆن لـە مەسـەلەی نـاردنی ژیژکەکـە حـاڵی بووم... لەم بارەیەوە، من پێم وایە.. بەکورتی...

هەناسەی سوار بوو، بێدەنگ بوو.

ئاگلایا، نزیکەی، پێنج سانیەیەک لەسەری وەستاو گوتی:

- دەی... خـۆ تـۆ هیچـت نـەگوت! .. دەی باشـە.. بـا واز لـە مەسـەلەی ژیژکەکە بێنین. مـن زۆر حـەز دەکـەم سنورێک بۆ هـەر هـەموو ئـەم گۆتـە گۆت و قسـە و قسـەلۆکانە دابنێم کـە تانهـا لەسـەر یـەک کەڵەکـە بـوون. بـە یارمەتیت، حەز دەکەم لە دەمی خۆتی بزانم ئایا تۆ گەرەکتە خوازبێنی من بکەیت یان نا؟ لیزاڤیتا پروکوفیڤنا هاواری کرد:

- پەنا بەخوا.!

میـرزادە، مچـوڕکێکی پێـدا هـات و سـەری لـە بـەرخۆی نـا. ئیڤـان فیدوروڤیچ، لە سەرسامیدا لە جێی خۆی وشک بوو. جووتە خوشک برۆیان وێک هێنایەوە و ڕوویان گرژ بوو.

- درۆ نەکـەی میـرزادە. ڕاسـتی بڵـێ! ئەمانـە لەسـەر تـۆ، بـە پرسـیاری سەیرو سەمەرە مێشکیان بردووم. ئایا ئەم پرسـوجۆیانە هـیچ ڕەگ و ڕیشـە و بنەمایەکیان هەیە؟ قسە بکە!

میرزادە، لەپڕ پشوویەکی وەبەرهاتەوە و گوتی:

- ئاگلایا ئیڤانوڤنا، من داخوازی تۆم نەکردووە، بـەڵام بـەخۆت... بە خۆت دەزانی چەند خۆشم دەوێی و چەندم باوەڕ و متمانە پێت هەیە... تەنانەت بەم ساتەشەوە...

ئاگلایا گوتی:

- من دەمەوێ بزانم ئایا تۆ خوازگاری منیت یان نا؟

میرزادە، بە دەنگێکی کز گوتی:

- بەڵێ خوازگارتم.

ئیڤان فیدوروڤیچ، زۆر بە توندی و هەڵچوونەوە هاتە زمان:

- ئەم شتانە بەو جۆرە چارەسـەر نـاکرێ بـرادەری ئـازیز! تـۆش گلاشـا* گیان، ئەگـەر هـەر ئەمـەت مەبەسـتە، وانـابێ... ببورە میرزادە ببورە دۆستی ئازیز.

ئەوسا وەکو یەکێک لیی قەومابێ، پەنای بۆ ژنەکەی برد:

- لیزاڤیتا پروکوفیڤنا... پێویستە... پێویستە بزانین...

لیزاڤیتا پروکوفیڤنا، بەدەم دەست بادانەوە، کەوتە هاوار:

- نا، من قەبووڵم نییە... من قەبووڵم نییە..

- دایکە، بە یارمـەتیت، بـامنیش قسـەی خـۆم بکـەم. پێم وایـە هـەقی خۆمـە لـەم مەسـەلەیەدا. حیسـابێکم بـۆ بکـرێ و قسـەی خـۆم هـەبێت: ئـاخر ئەمـە پەیوەندی بە چارەنووسی منـەوە هەیـە (ئاگلایـا دەقـاودەق بەو شـێوەیە هاتـە قسان) دەمەوێ ڕەئی خۆم بڵێم و خۆشحاڵم کە هـەمووتان لێرە ئامـادەن و

گوێتان لێبێ... دەی میرزادە بەیارمەتیت، کە تۆ بە نیازی خوازگاری منیت، چۆن شادمانی من مسۆگەر دەکەیت؟

میرزادە گوتی:

– ئەلهەقی ئاگلایا ئیڤانوڤنا، من نازانم چۆن وەڵامی پرسیارەکەت بدەمەوە!... چ وەڵامێک پڕ بەپێستی ئەم پرسیارەیە؟... پاشان... ئایا ئەمە بە ڕاستی پێویستە؟

– وا دیارە زۆر نیگەرانیت، هەناسەت سوار بووە، بێزەحمەت نەفەسێ تازە بکەوە و وەخۆبێرەوە، قومێ ئاو بخۆوە. نا، هەنوکە چایت بۆ دێنین.

– ئاگلایا ئیڤانوڤنا، خۆشم دەوێی، زۆرم خۆش دەوێی... هەر تۆم خۆش دەوێ، کەسی ترم خۆش ناوێ. تکایە شتەکە بەگاڵتە مەگرە. من زۆرم خۆش دەوێی.

– بەڵام ئەمە مەسەلەیەکی هەستیارە. ئێمە منداڵ نین، پێویستە بە جیددی تاوتوێی بکەین... بێزەحمەت پێم ناڵێی سەروەت و سامانەکەی تۆ چییە و چەندە.

ئیڤان فیدوروفیچ، بەواقی وڕەوە و لەبن لێوانەوە گوتی:

– بەسە، بەسە ئاگلایا! ئەوە چییە، ئاخر ئەمە ڕاست نییە، وا نابێ.. نا.. نا... بە ڕاستی ئەمە ڕاست نییە!...

لیزاڤیتا پروکۆفیڤنا، بە ئەسپایی، بەڵام بە دەنگێ کە ببیسترێ گوتی:

– ئەیەڕۆ لەم حەیاچوونە!

ئەلکسندراش، لای خۆیەوە، هەڵی دایەوبە ئەسپایی گوتی:

– شێتە.

میرزادە، بە سەرسامی گوتی:

– سەروەتەکەم؟ مەبەستت پارەیە؟

– بەڵێ، دەقاودەق.

میرزادە، سوور بووەوە، بە دەنگێکی نەوی گوتی:

– حاڵی حازر.. ئا لەم ساتەدا سەدو سی و پێنج هەزار ڕۆبڵم هەیە...

ئاگلایا، بێ هیچ لە ڕووداماننێک، بە دەنگی بەرز و بە سەرسامی گوتی:

- هەر ئەوەندە؟

هەڵبەتە کەم و زۆر ڕەنگی نەگۆڕا بوو. لەسەری ڕۆیشت:

- خراپ نییە، بە تایبەتی بۆ کەسێک کە دەست بڵاوی نەکات...باشە بە نیاز نیت، کارێکی دەوڵەتی بەدەست بێنی؟

- دەمویست، ئیمتیحانێک بدەم و ببم بە مامۆستای تایبەتی.

- بیرۆکەیەکی زۆر باشە. کە هەڵبەتە دەبێتە پاڵپشتێکی باش بۆ دەرامەتمان. ئەدی حەزناکەیت ببی بە یەکێک لە پلەداران و پیاوانی دەربار؟

- پیاوانی دەربار؟ تا ئێستا بیرم لەشتی وا نەکردووەتەوە، بەڵام...

خوشکەکانی ئاگلایا، لەوە پتر بەخۆیان نەوەستان و لە قاقای پێکەنینیان دا. ئەلکسندرا، ماوەیەک بوو کە لەرزەیەکی سووکی بە سیمای ئاگلایاوە دەبینی کە نیشانەی تەقینەوەی پێکەنینێکی کوتوپڕی پێوە دیار بوو و ئاگلایا هەوڵی دەدا بە تۆبزی خەفەی بکات. ئاگلایا کە چاوی بە پێکەنینی خوشکەکانی کەوت، نیگایەکی هەڕەشە ئامێزی کردن کە پێنەکەنن، بەڵام بەخۆیشی هەر دوای ساتێک بە خۆی نەوەستاو لە قاقای پێکەنینێکی شێتانە و بگرە هیستریانەی دا. ئەوجا هەر هەستاو بە غار لە ژوورەکە وەدەر کەوت.

ئادیلاید گوتی:

- من لە هەوەڵەوە دەمزانی ئەم بەزمە بە پێکەنین دەشکێتەوە. هەر لە هەوەڵەوە، لە حیکایەتی ژیژکەکەوە، پێشبینی ئەمەم کردبوو.

لیزاڤیتا پروکوفیڤنا، لەپڕ گڕی گرت و هاواری کرد:

- نا، نەخێر، ئەمەتان لی قەبووڵ ناکەم، شتی وا قەبووڵ ناکەم. بەغار دووی ئاگلایا کەوت. کیژەکانیش بەهەشتاو دووی کەوتن. میرزادە و سەرگەڤاری خانەوادە، بە دوو قوڵی لە ژوورەکەدا مانەوە.

جەنەڕاڵ، لەناکاوا، بێ ئەوەی بەخۆیشی بە تەواوی بزانێ چی دەوێت، گوتی:

- گوێ بگرە لیون نیکولایوفیچ، تۆ تەسەوری شتی وات دەکرد؟...ها؟

میرزادە، بە خەمینی بەرسڤی دایەوە:

- ئەوەندە دەزانم کە ئاگلایا ئیڤانوڤنا، پێم ڕادەبوێرێ، پێم پێدەکەنێ.

- برادەری ئازیز، کەمۆکەیەک سەبر بگرە. با بچم بۆلایان تۆ لێرە بە... چونکە.. تۆ پێم بڵێ لیون نیکولایوفیچ، پێم بڵێ ئەمە چ بوو، چ مانایەکی هەیە؟ برادەری ئازیز باوەڕ دەکەی کە من، وەکو باوکی - ئاخر هەر هیچ نەبێ من باوکیم، وێڕای ئەوەی باوکیم، ئاگام لە هیچ نییە، سەر لەم بەزم و ڕەزمە دەرناکەم! بەلای کەمەوە تۆ بۆم بگێڕەوە، تۆ بۆم باس بکە!

- من ئاگلایا ئیڤانۆڤنام خۆشدەوێ، بەخۆیشی دەزانێ.. پێم وایە لەمێژە دەیزانێ.

جەنەڕاڵ، شانەکانی هەڵتەکاندو گوتی:

- سەیرە... سەیرە!... زۆرت خۆشدەوێ؟

- زۆر زۆر.

- سەیرە. زۆرم بەلاوە سەیرە. مەبەستم، یانی شتێکی غافڵگیرانەیە، باوەڕ نەکردەنیە... خۆشەویستیەکی وا کوتوپڕ... گوێ بگرە برادەری ئازیز... من سەروەت و سامانم بەلاوە گرینگ نییە (هەرچەند وام وێنا دەکرد، سەروەت و سامانەکەت زۆر لەوە زیاتر بێ کەوتت)... بەڵام من بیر لە ئایندەی کیژەکەم دەکەمەوە... بە کورتیەکەی... یانی تۆ دەتوانی، بەختەوەری ئەو دابین بکەیت؟و... و... ئەو چی دەڵێت؟ ئایا ئەم شتە بەلای ئەوەوە گاڵتەیە یان جدیە؟ بەلای ئەوەوە نەک تۆوە؟

ڕێک لەم دەمەدا، دەنگی ئەلکسندرا ئیڤانۆڤنا لەپشت دەرگاکەوە بەرز بووەوە، کە باوکی گاز دەکرد.

جەنەڕاڵ، پەلە پەلی پێکەوت و گوتی:

- برادەری ئازیز بە یارمەتیت. تۆ دانیشە، بیربکەوە، هەر ئێستا دێمەوە.

بەپەلە پروزێ و هەراسانی بە دەنگی کچەکەیەوە چوو. سەیری کرد دایک و کیژ، لەوێندەر، دەستاین لە ملی یەکدی وەریناوە و وەکو بارانی بەهار، ڕووندکان بەسەر یەکدیدا دەبارێنن. فرمێسکەکانی، فرمێسکی شادی، سۆز و ئاشتی و ئاشتەوایی بوو. ئاگلایا لێکدا لێکدا دەست، گۆنا، گەردن و ڕوومەتی دایکی ڕادەمووسی. بەدڵ و بەگیان یەکتریان بەخۆوە دەگوشی.

لیزاڤیتا پروکوفیڤنا، ڕووی کردە مێردەکەی و گوتی:

- ئیڤان فیدوروفیچ تەمەشاکە. ئەمە خۆیەتی، ئەمە ئاگلایای ڕاستەقینەیە!

ئاگلایا، ڕوخساری شادو فرمێسکاوی خۆی لەسەر سینگی دایکی هەڵبڕی و ڕوانییە بابی. بەدەم نەرمە پێکەنینێکی خۆشەوە، بەرە و بابی چوو، بە گەرمی باوەشی پێدا کرد و چەند جارێک ماچی کرد. ئەوسا بەلەز بۆلای دایکی گەڕایەوە و سەرلەنوێ سەری نا بە سینگ و بەرۆکی دایکیەوە، تا کەس نەی بینێ، ئەمجا ما بگری ئەمما گریان. دایکی بەلکەی شاڵەکەی دایپۆشی.

دایکی گوتی:

- بزانە چیمان پێدەکەی؟ بە ڕاستی تۆ کچێکی دڵڕەقی، بزانە چیت پێکردین، فەرموو من نایڵێم تۆ خۆت بیڵێ!

بەڵام لیزاڤیتا، ئەم جارەیان بە جۆرە شادیەک ئەو قسانەی کرد. پێدەچوو پشووی خۆشتر بێ.

ئاگلایا، لەناکاوا هاتە قسان، گوتی:

- ڕاستە! من واهیم! کچێکی شەڕەنگێز و دڵڕەقم، بێ کەڵک و هیچم، من منداڵێکم نازو نازداری کوشتوومی، کەڵکی هیچی پێوە نەهێشتووم! ئەمە بە باوکە بڵێ! ..

بەدەم گریان و پێکەنینەوە گوتی:

- ئا.. بەخۆشی لێرەیە.. ئەوە لێرەی بابۆ؟ گوێت لێ بوو؟

جەنەڕاڵ، بە کەیف خۆشی، کەوتە لستنەوە و بۆن کردنی دەستی ئاگلایا. ئاگلایاش دەستی خۆی نەکێشایەوە. بەخۆشحاڵیەوە گوتی:

- کیژە ئازیزەکەم... ڕوحەکەم! دیارە.. تۆ ئەم گەنجەت خۆش دەوێ؟

ئاگلایا، لەپڕ گڕی گرت، سەری هەڵهێنا و هاواری کرد:

- نا، نا، نا!... من تاقەتی ئەوم نییە... یەک زەڕەش ئەم گەنجەی تۆم خۆش ناوێ! توخوا ئەمەش بوو بە ڕزق! خوام لەو خوایە جارێکی دی شتی وام پێ بڵێی باوکە... ئەم قسەیەم زۆر بەجدیە ها، گوێت لێیە؟ بە ڕاستیمە ها!





ئاگلایا، بە ڕاستی بوو، ئاگر لە چارەی دەباری، چاوانی ئاگریان لێ دەبووەوە.

بابی، سەری لەبەرخۆی نا، چووەوە قاوغەکەی خۆی، بەڵام لیزاڤیتا پروکوفیڤنا، لەپشت ئاگلایاوە، ئاماژەیەکی بۆ کرد، یەکسەر زانی مەبەستی ئەوەیە کە "هیچی لێنەپرسێت".

گوتی:

– جا ئەگەر وایە فریشتەکەم، بە خۆت سەرپشکی، چیت پێخۆشەوابکە، بەڵام لەوێ بە تەنێ دانیشتووە و چاوەڕوان دەکات، باشە نابێ بە ڕووخۆشی و ئارامی تێی بگەیەنین کە بڕوات؟ جەنەڕاڵیش، لەلای خۆیەوە، چاوێکی لە ژنەکەی داگرت.

ئاگلایا گوتی:

– نا، نا. پێویست بەوە ناکات. پێویست بە ڕوبینی و مجامەلە ناکات. تۆ بڕۆ بۆلای، منیش دوای تۆ یەکسەر دێم، دەمەوێ عوزر خوایی بۆ ئەم... گەنجە بێنمەوە، چونکە هەستیم بریندار کرد.

ئیڤان فیدوروفیچ، بەجیددی گوتی:

– وایە، زۆریش نەهەقیت لیکرد.

– کەواتە... ئێوە هەمووتان لێرەبن. من یەکەم جار بە تەنیا دەچم بۆلای، دوای چەند سانیەیەک، ئێوەش یەکسەر بەدووما بێن. وا باشترە.

هەر کە گەیشتە بەردەگا، لەپڕ گەڕایەوە و بە خەمینییەوە گوتی:

– پێکەنین دەمگرێت! هەست دەکەم تامەزرۆی پێکەنینم!

بەڵام دووبارە، بەهەشتاو بەرە و لای میرزادە بای دایەوە.

ئیڤان فیدوروفیچ، بەپەلە لە هاوسەرەکەی پرسی:

– ها؟ چی لەمە حاڵی بوویت؟ ئەمە چییە؟ چی لێ تێدەگەی؟

لیزاڤیتا پروکوفیڤنا، بە هەمان پەلە پەلی مێردەکەی وەڵامی دایەوە:

– من ناوێرم ڕەئی خۆم بڵێم، بەڵام وەکو ڕۆژی ڕوون عەیانە.

– منیش پێم وایە، هەمان ڕەئیم هەیە. وەکو ڕۆژی ڕوون عەیانە. ئاشقە.

ئەلکسندرا ئیڤانوڤناش هەڵی دایە:





- بڵێن شەیدایە! نەک هەر خۆشی دەوێ، بەڵکو شێت و شەیدای بووە، بەڵام ئاشقی چ شتێکی بووە، لەو باشتری نەدۆزییەوە؟

لیزاڤیتا پروکوفیڤنا، بەدەم خاچ کێشانەوە گوتی:

- ئەگەر ئەمە قەدەرو چارەنووسی کیژەکەم بێ، دەیسا خوا لیی موبارەک بکات!

جەنەڕاڵ، بۆی سەلماند و گوتی:

- دیارە ئەمە قەدەریێتی، ئینسان ناتوانێ لە قەدەری خۆی هەڵێ!

هەنگێ، هەموو گەڕانەوە بۆ هۆڵەکە، کە موفاجەئەیەکی تازەیان بۆ لەکەمینا بوو.

ئاگلایا، کە چوو بۆلای میرزادە و ڕووبەڕووی بووەوە، نەک هەر پێکەنین نەیگرت، بەڵکو لە نیمچە شەرمێکیشەوە پێی گوت:

- لە کچێکی سەرشێت، گەوج، لە منداڵێک کە ناز خووی شەڕکردووە ببوورە، لیی مەگرە (بەدەم ئەو قسانەوە دەستی میرزادەی گرت)، باوەڕ بکە، ئێمە هەر هەموومان، بێ ئەندازە ڕێزت دەگرین، لامان بەڕێزی. جا ئەگەر من ڕێم بە خۆدابێ، گاڵتە بەدڵپاکی و ساکاری و میهرەبانی تۆ بکەم. بمبورە، لێم مەگرە، بە شۆخی و لاساری منداڵێکی حەساو بکە. ببورە کە ئەوەندە پێ داگریم لەسەر شتێکی بێ مانا کرد، کە هیچ بایەخێکی نییە و نابێ، ببورە. هەڵبەتە نایەتەدی..

ئاگلایا، بە تاکتیکێکی تایبەتیەوە دوا ڕستەی گوت.

هەموو، باوک و دایک و هەر دوو کیژەکەیان، ڕێک لە کاتی خۆیدا وەژوورکەوتن، کە گوێیان لە ڕستەی "... شتێکی بێ مانا کرد، کە هیچ بایەخێکی نییە و نابێ..." بوو، حەپەسان بە سەرسامی کەوتنە نیگا کردنی یەکدی. زیاتر حەپەساوی جدیەتی وتنەکەی ئاگلایا بوون، بەڵام لەوە نەدەچوو میرزادە تێگەیشت بێت، لەڕادەبەدەر خۆشحاڵ بوو.

میرزادە لەبن لێوانەوە گوتی:

- بۆچی ئەم قسانە دەکەیت؟ بۆچی... تۆ... داوای بوردن لە من دەکەی؟

تەنانەت دەیویست بڵێ کە ئەو (میرزادە) شایستەی عوزرخوازی ئەو

(ئاگلایا) نییە. کێ چوزانێ؟ لەوەشە لە مانای ئەو ڕستەیە "شتێکی بێ مانا کە هەڵبەتە مەحاڵە بێتەدی" حاڵی بووبێ، بەڵام چونکە تەبیعەت و بیرکردنەوەیەکی سەیری هەبوو، بەو قسانە نەک قەڵس نەبووبوو، بەڵکو خۆشحاڵیش بووبوو. بەوە خۆشحاڵ بوو کە بە مەزەندە و خەیاڵی خۆی بۆی هەبوو ودەیتوانی، بچێتە دیدەنی ئاگلایا، گفتوگۆی دەگەڵ بکات، دەگەڵیا دابنیشێت و پێکەوە بچنە پیاسە و گەڕان.. ئەمە بۆ میرزادە ئەوپەڕی خۆشی بوو، خۆشی و شادیەک بوو بەشی سەرانسەری ژیانی دەکرد! (لەوە دەچوو لیزاڤیتا پروکوفیڤنا لەم خۆشی و شادییە بترسێت، بە غەریزە هەستی بەو تەبیعەتەی کردبوو. زۆرشت هەبوو کە لە ناخا لێی دەترسا و نەیدەتوانی بیدرکێنێ.(.

زۆر زەحمەتە پیاو بتوانێ وەسفی ئەو کەیف و خۆشیە بێئەندازەیە بکات کە ئەو شەوە دژوارە میرزادەی تیا بوو. پاشان خوشکەکانی ئاگلایا گێڕایانەوە، ئەو شەوە میرزادە ئەوەندە سەر حاڵ و شادمان بوو، کە بینەر دەیبینی خۆ بەخۆ کەیفی ساز دەبوو و ئۆخژن لە دڵ و دەروونی دەگەڕا. ئیدی هەژدەر هەژدەر قسانی دەکرد، کە لەوەتای شەش مانگەوە کەس شتی وای لێنەدیبوو، واتە لەو بەیانیەوە کە بۆ یەکەم جار تەعاروفی دەگەڵ ماڵباتی یەپانچیندا کردبوو. دیار بوو لەوەتای بۆ پترسبۆرگ گەڕابووەوە، بەئانقەست بڕیاری دابوو کە هەندێ تەریک و کەم دوو بێت. تەنانەت پێش ئەو ئێوارەیە بە ماوەیەکی کەم بە بەرچاوی هەموانەوە، بە میرزادە (س...)ی گوتبوو، کە هەست دەکات پێویستە بێدەنگ بێت، چونکە شێوازی دەربڕین و گوزارشتی خراپە و بەو شێوازە خراپە لە بەهاو نرخی ئەو بیرانە کەم دەکاتەوە کە دەیەوێ دەریان ببڕێت، بەڵام ئەو شەوە، لە هەمووان پتر قسەی کرد، قسەکەری سەرەکی هەر ئەو بوو، ئیدی زمانی پژابوو، هەر پرسیارێکی لێدەکرا، زۆر بە ڕوونی و تامەزرۆیی و دووردرێژی بەرسڤی دەدایەوە، بەڵام هیچ قسەیەکی کۆن و سواو وپواوو بازاڕی لە قسەکانیا نەبوو. لە سەرەتاوە ئەو بیرو ئەندێشانەی کە دەری دەبڕین زۆر قووڵ و ڕەسەن و جیددی و بگرە قورس و گۆنگش بوون.

تەنانەت هەندێ سەرنجی زۆر شەخسی و، بۆچوونی تایبەتی عەرز کرد، کە پاشان تێکڕای گوێگرەکان ڕایان وابوو کە ئەگەر بەو زمانە خۆشبەیان و بژاردەیە دەری نەبڕیبان لەوە بوو، ببێتە مایەی تەوس و تەوانج و تانەوتەشەر و پێکەنینی خەڵکەکە.

هەرچەندە جەنەڕاڵ، حەزی لە جدیەتی گفتوگۆیەکان بوو، بەڵام هەم ئەو و هەم لیزاڤێتا پروکوفیڤنا، پێیان وابوو قسەکانی میرزادە،لەڕادەبەدەر جدین و هەڵقووڵاوی فرە زانیارین، بۆیە لە ئاخر و ئۆخری شەونشینیەکەدا هەستیان بە بێتاقەتی دەکرد.

بەڵام میرزادە لە کۆتاییدا، بە جۆرێ گەرم بووبوو وگوڕی بەستبووەوە کە کەوتە گێڕانەوەی چیرۆک و حیکایەتی کۆمیدی و نوکتەی پێکەنیناوی کە خۆی لەپێش هەمووانەوە پێدەکەنی، ئیدی ئەوانی دیکەش بە دوویا پێدەکەنین، نەک هەر لەبەر ئەوەی حیکایەت و نوکتەکان کۆمیدی بوون، بەڵکو زیاتر پەتای پێکەنینەکەی میرزادە بۆ ئەوانیش سیرایەتی دەکرد.

بەڵام ئاگلایا، بەدرێژایی شەوەکە، مەگەر بە دەگمەن، دەنا نە زاری هەڵهێناو نە بزەیەکی کەوتە سەرلێو، بەڵام بە تاسەوە گوێی بۆ لیون نیکولایوفیچ ڕادێرا بوو تەنانەت بە تامەزرۆییەوە لێی دەڕوانی و چاوی تێ بڕیبوو.

لیزاڤێتا پروکوفیڤنا، دوای تۆزێک بە مێردەکەی گوت:

- تەمەشای چۆن چاوی تێ بڕیوە! چاوی لێ ناگوازێتەوە. چاوی بڕیوەتە دەم و زاری ئەو و وشە بەوشەی قسەکانی قووت دەدات. دەڵێی ئەفسوون کراوە. ئەگەر یەکێکیش پێی بڵێ ئەوی خۆش دەوێ، دنیا ژێر و ژوور دەکات، خێرا لە هۆڕژنی گریانێ دەدات و خۆی لە هەمێزت داوێت.

جەنەڕاڵ شانێکی بۆ هەڵتەکاند و گوتی:

- چار چییە؟ شەڕ دەگەڵ قەدەرا ناکرێت!

جەنەڕاڵ، تا ماوەیەکی زۆر لەوە دواش، زۆر جار ئەو ڕستەیەی دووبارە دەکردەوە، لەوە دەچوو زەینی ئەفسوونی ئەو دەستەواژەیە

بووبێ.

هەڵبەتە دەبێ ئەوەش بڵێین کە جەنەڕاڵ، وەکو بزنسمانێک، لە زۆر ڕووەوە، لەم وەزعە ڕازی نەبوو، دڵی پێی خۆش نەبوو، بە تایبەتی لەو ڕووەوە کە گۆنگ و ناڕوون بوو، بەڵام بڕیاری دابوو کە زمانی خۆی بگرێ و هیچ نەڵێت و سەبر بکات تا بزانێ لیزاڤیتا پروکوفیڤنا چ دەڵێت.

ئەم خۆشی و شادیە زۆری پێنەچوو، بۆ سبەینێ ئاگلایا شەڕێکی دیکەی دەگەڵ میرزادەدا بەرپاکرد، کە لە ڕۆژەکانی دواتریشدا هەمان تاس و هەمان حەمام بەردەوام بوو. ئیدی ئاگلایا بەردەوام گاڵتەی بە میرزادە دەکرد، پێی ڕادەبوارد، وەکو لێبۆکێک ڕەفتاری دەگەڵ دەکرد.

ڕاستە هەندێ جار پێکەوە لە باخەکەدا پیاسەیان دەکرد، یەک دوو سەعاتێک لەژێر کەپرێکی پشت باخەکەوە دادەنیشتن، بەڵام ئەوەی بینرا بوو ئەوە بوو کە میرزادە لەو حاڵەتانەدا، زۆربەی کات ڕۆژنامەیەک یان کتێبێکی بەدەستەوە دەگرت و بە دەنگی بەرز بۆ ئاگلایای دەخوێندەوە.

ڕۆژێک، کاتێ ڕۆژنامەی بۆ دەخوێندەوە،گزوگومەت پێی بڕی و گوتی:

- سەیرە! دەزانی دەمێکە بۆم دەرکەوتووە کە مخابن زۆر نەخوێنەواری. پرسیاری هەر شتێکت لێبکەن، وەڵامی تەواوت پێ نییە، ئیدی چ دەربارەی کاراکتەر و کەسێتیان بێ، چ دەربارەی واریقات و ڕووداوان، چ دەربارەی نێوەڕۆک و بابەتی ئەم کتێب یان ئەو کتێب بێ، یانی بە ڕاستی پیاو دڵی بە حاڵت دەسووتێ.

میرزادە بەرسڤی دایەوە:

- خۆ من پێم گوتبوویت، خوێنەواریم کەمە.

- کەواتە تۆ چیت هەیە؟ شانازی بەچیتەوە بکەم، ڕێزی چیت بگرم؟ دەی بخوێنەوە، نا، نا بەسە، واز لە خوێندنەوە بێنە.

هەر ئەو شەوە، ئاگلایا ڕەفتار و هەڵوێستێکی مەتەڵ ئاسای نواند. بەلای هەموو ئامادەبوانەوە، لە لەگەز دەچوو. تێی نەدەگەیشتن. لوتفێکی زۆری بەرانبەر بە میرزادە (س...) کە لە پترسبۆرگ گەڕابووەوە، نواند، زۆر شتی دەربارەی یەڤگینی پاڤلوفیچ، لێ پرسی. (هێشتا میرزادە لیون

نیکولایوفیچ نەهاتبوو). میرزادە (س..) ڕێگەی بە خۆی دا کە ئاماژە بۆ "ئەو گۆڕانە بکات کە پێدەچوو لەو نزیکانەدا، لە خانەوادەکەیاندا ڕوو بدات" باسی ئەو بیرۆکەیەی کرد، کە لامسەرلایی لە زاری لیزاڤیتا پروکوفیڤناوە داکەوتبوو، کە گوایە لە گینە دیسان زەماوەندەکەی ئادیلاید کەمێک دوابخرێت، تا یەکجاری هەر دوو زەماوەندەکە یەک بخرێ و یەک ئاهەنگ بگێڕن. ئاگلایا کە گوێی لەو قسانە بوو، گڕی گرت، بە جۆرێ دەهری بوو، کە تەسەور نەدەکرا، هەر هەموو ئەوشتانەی بە " قسەی قۆڕ" وەسف کرد، بەڵکو لەوەشی تێپەڕاند، هەر هات بە زاریا و گوتی: "هێشتا بڕیاری نەداوە جێگەی ماشقەی هیچ کەسێک بگرێتەوە".

ئەم قسانە تەنگەی هەمووانی گرت، بە تایبەتی هی دایک و باوکی. لیزاڤیتا پروکوفیڤنا، لە کۆبوونەوەیەکی نهێنیدا دەگەڵ مێردەکەیا، پێشنیازی کرد کە باسی مەسەلەی ناستاسیا فیلیپوڤنا دەگەڵ میرزادەدا بکەنەوە و بە تەواوەتی بیبڕێننەوە.

ئیڤان فیدوروفیچ، سوێندی خوارد کە ئەو قسەیەی ئاگلایا، تەنیا "هەڵچوونێک"ی کوتوپڕ بووە و زادەی هەست کردن بە "شەرم" بووە و هیچی تر. خۆ ئەگەر میرزادە (س..) باسی زەماوەندی نەهێنابا پێشێ ئەو "هەڵچوونە"ش ڕووی نەدەدا، چونکە ئاگلایا. زۆر چاک ئاگادارە کە پەیوەندی نێوان میرزادە و ناستاسیا فیلیپوڤنا، هەمووی بوختان و درۆ و دەلەسەی خەڵکی بەدخوایە، ناستاسیا فیلیپوڤنا بەتەمایە شوو بە ڕوگوژین بکات. جەنەڕاڵ ئەوەشی گوت کە میرزادە هیچ گوناهێکی لەم مەسەلەیەدا نییە، ئەو پەیوەندییەش کە بە درۆی خەڵکی گوایە لەنێوان ئەو و ناستاسیا فیلیپوڤنادا هەبووە، ئێستا نەماوە، نەک هەر نەماوە، بەڵکو ئەگەر ڕاستت دەوێ، هەرگیز ڕۆژێ لە ڕۆژان پەیوەندی وا لەنێوانیاندا نەبووە.

بەڵام میرزادە، لەسەر کەیف و شادیی خۆی بوو، هێز نەبوو بتوانێ سەرو دڵی بگرێت و نارەحەت و نیگەرانی بکات. ڕاستە هەندێ جار تەنکە تەمێکی خەم و بێ ئۆقرەیی لە چاوەڕوانی ئاگلایادا بەدی دەکرد، بەڵام ئەمەی بۆ هۆی دیکە دەگێڕایەوەو، ئەم تەمە خۆ بە خۆ لەبەرچاوی

دەرەوییەوە. ئیدی متمانە و قەناعەت و دڵنیاییەکی جێگیر و نەگۆڕی لەلا چێ بووبوو، هیچ شتێک نەبوو ئەو قەناعەت و باوەڕەی بگۆڕێت. ئیدی لەوە دەچوو زیاد لە پێویست سەر ڕەحەت و ئاسودە و دڵنیابێت، بەلای کەمەوە ئەم سەرنج و بۆچوونە لەلای هیپولیت چێ بووبوو کە ڕۆژێ لە ڕۆژان لە باخەکەدا تووشی بووبوو.

ئەو ڕۆژە، هیپولیت، میرزادەی ڕاگرت و، پێی گوت:

- ها! بیرتە ئەوساکە پێم گوتیت ئاشق بوویت، قسەی من دەر نەچوو؟

میرزادە تەوقەی دەگەڵ کرد، پیرۆزبایی لێ کرد کە ڕەنگ و ڕووی خۆشە و ڕوو لە چاکیە. لەوە دەچوو هیپولیت بەخۆشی هیواو گوڕو تینێکی وەبەرهاتبێتەوە، کە نەخۆشانی سیل، زۆر جار تووشی ئەو حاڵەتە دەبن.

هیپولیت، کە چوو بۆلای میرزادە، بەو نیازە چوو کە بەر تانەوتەشەری بدات کە ئەو کەیف و خۆشیەی لەچییە، بەڵام یەکسەر ئەو بیرەی لە مێشکی خۆی دەرکرد وکەوتە باسی خۆی و گلەییەکی زۆر، دووورودرێژ، بێ سەرو بەری هەڵڕشت.

لەکۆتاییدا گوتی:

- ناتوانی تەسەور بکەی، کە هەر هەموویان، چەند بچووک، بێ ئەقڵ، لە خۆڕازی، خۆهەڵکێش و نەفس نزم و هیچ و پووچن. باوەڕ دەکەیت بۆیە قەبووڵیان کرد دالدەم بدەن، چونکە بە خەیاڵی خۆیان بە زووترین کات دەمرم. ئێستا هەموویان توڕەن چونکە نەک هەر نە مردم، بەڵکو حاڵم باشترە توخوا ئەمە مەخسەرە نییە! گرە و دەکەم کە باوەڕ بە قسەکانم ناکەیت!

میرزادە، حەزی نەکرد بەرسڤی بداتەوە.

هیپولیت، لەسەری ڕۆیشت و گوتی:

- تەنانەت هەندێ جار بیر لەوە دەکەمەوە بگەڕێمەوە بۆلای تۆ و دەگەڵ تۆدا دانیشم! چونکە تۆ بەلای کەمەوە تۆ لەو باوەڕەدانیت کە ئەوان بەو مەرجە جێی کەسێک بکەنەوە کە بە زووترین کات بمرێت، وانییە؟





میرزادە گوتی:

– من وام وێنا دەکرد کە بە مەبەستێکی دیکە دەعوەتیان کردبیت.

– ها، ها! تۆ ئەوەندەش ساویلکە و سا ئەقڵ نیت کە خەڵکی تەسەوری دەکەن! هێشتا وەختی نەهاتووە، دەنا هەندێ شتم دەربارەی ئەم گانیا چکۆلەو، نەخشە و نیاز و خولیاکانی بۆ دەگێڕایەوە. ئەمانە پیلانت دژ دەگێڕن، نامەردانە داوت بۆ دەنەنەوە. گەرەکیانە، کوڵت پێ بدەن، ورە بەربدەی و هەرەس بێنی...بۆیە پیاو حەیفی لێ دێ کە ئەوەندە غافڵ و بێ خەم و خەیاڵ پاڵی لێدەدەیەوە و دەخەوی، بەڵام ئەفسوس تۆ هەر ئەوەیت و ناگۆڕێیت!

میرزادە بە پێکەنینەوە گوتی:

– یانی لەبەر ئەمە دڵت بە حاڵم دەسووتێ! یانی پێت وایە ئەگەر نیگەران و نارەحەت بام، خۆشحاڵتر دەبووم؟

– پیاو کڵۆڵ و بەدبەختێکی بەئاگا بێ، نەک دڵخۆش و شادمانێکی خاپێنراو... گوایە نازانی لەو ماڵەدا هەڤرکێکی سەر سەختت هەیە!

– ئەوەی سەبارەت بە ڕەقیب و هەڤرک دەیڵێیت، زادەی بەدگومانییە هیپولیت. مخابن هەقی ئەوەم نیەوەڵامت بدەمەوە، بەڵام سەبارەت بە گاڤریلا ئاردالیونوفیچ، بێگومان لە من باشتر دەزانیت کە دوای ئەو هەموو شکست و دۆڕانە، ناتوانێ بەئاسانی خۆی بگرێتەوە و بێ خەم و خەیاڵ، سەر ڕەحەت و ئاسوودە دڵ بژی،ئەگەر شتێکی لەبارەوە دەزانی، لەمەوەیە. پێم وایە هەقە لەم ڕوانگەیەوە تەمەشای ئەو شتانە بکرێ. هێشتا دەرفەتی لەبەردەمدایە کە خۆی چاک بکات. هێشتا ساڵانێکی زۆری بە بەرەوە ماوەو، ژیان یەکپارچە پەندو عیبرەتە... کە... کە...

میرزادە، لێرەدا، مینگە مینگی پێکەوت و لەناکاو زنجیرەی بیرەکانی پسایەوە، گوتی:

..–. سەبارەت بە دژایەتی و ڕووخاندنی من... هەر نازانم باسی چیدەکەی، تەقەی سەرم دێ. هیپولیت، تکایە با واز لەم قسەیە بێنین و ئەم مەوزوعە بگۆڕین.

- باشــە، وازی لــێ دێنــین، دەیگــۆڕین. بــە تایبــەتی کــە تــۆ نــاتوانی دەستبەرداری کەرەم و لێبوردەیی دەروونی خۆت ببیت. بەڵێ میرزادە، تۆ تــا بــە خــۆت شــتەکە لــەبنجوبناوان نەکــەی ســووکناییت نایــە. کــە لەبنجوبناوانیشت کرد، بەچاوی خۆت بینیت هەنگێ باوەڕت نایە، ها، ها! ئەرێ پێم بڵێ ئێستا زۆر لێم بێزار نیت، ڕقت لێم نابێتەوە؟

- لەبەرچی؟ لە بەرئەوەی لە هەموومان زیاتر ئازارت چەشتووە و ئازار دەچێژیت؟

- نا، بەڵکو لە بەرئەوەی لیاقەتی ئەو ئازارەم نییە.

- هــەر کەسێک بتوانێت تەحــەمولی ئــازاری زیــاتر لــە خــەڵکی دی بکــات، ئەمــە خــۆی لــە خۆیــدا لیاقــەت و شاییســتەییە. کــە ئاگلایــا ئیڤانوڤنــا، ئیعترافنامەکەی خوێندبوویەوە، خۆزیای دەخواست کە بت بینێ، بەلام...

هیپولیت، وەکو ئەوەی بیەوێ بەپەلە ڕێڕەوی ئەم گفتوگۆیە بگۆڕێت، قسەکەی پێ بڕی و گوتی:

- دەیەوێ دوای بخات بۆ... مەحاڵە بتوانێ... تێدەگەم، تێدەگەم!... ئەرێ بە ڕاست وەکو بیستوومە، گوایە تۆ بە دەنگی بەرز ئەو هەموو وڕاوە بێ سەرو بــەرەت بــۆ خوێنــدووەتەوە. ئەلهــەقی هــەموویم بــەدەم وڕێــنەوە نووسیبوو. هەرچی دەکەم و دەکۆشم ناتوانم باوەڕ بکەم کە کەسێک هەبێ ئەوەندە- ناڵێم دڵڕەق – (چونکە ئەگەر وا بڵێم بۆ خۆم شەرمەزاریە)، بەلام دەڵــێم ئەوەنــدە منــداڵانە و ســائەقڵ و کینــەکێش بــێ، کــە گلــەیی ئەو ئیعترافنامەیەم لێ بکات و وەکو چەکێک دژی من بەکاری بێنێ! مەترسە، باسی تۆ ناکەم، مەبەستم تۆ نییە...

- بــەلام هیپولیــت، بــە ڕاســتی مایــەی داخــە کــە دەبیــنم خەریکــە ئەو بیرەوەریانەت بەدرۆ دەخەیەوە و حاشایان لێدەکەیت، چونکە ڕاستگۆییەکی تەواویان پێوە دیارە! تەنانەت سەخیفترین پەرەگرافیشی کە زۆرن (لێرەدا هیپولیت چارەی دا بەیەکا) ڕەگی لە ئازاردایە، ڕەنگدانەوەی ئازارە، کە فــارەتی ئــازارە، چونکــە دەربڕینــی ئەو ئیعترافــە، خــۆی لــە خۆیــدا ڕووبەڕووبوونەوەی ئازار و ڕەنگە بوێری و ئازایەتییەکی گەورەش بێت.

هەڵبەتە ڕواڵەتی ئەم ئیعترافنامەیە هەرچییەک بێ، هاندەرێکی ڕوحی و دەروونی ڕەسەنی لەپشتە. باوەڕم پێبکە تا زیاتر بیری لێ دەکەمەوە، زیاتر قەناعەتم پێی دێت. هەڵبەتە من نامەوێ داوەری دەربارەی تۆ بکەم. بۆیە ڕاوبۆچوونی خۆمت پێدەڵێم، چونکە بەداخەوەم کە ئەو کاتە قسەم نەکرد...

دەموچاوی هیپولیت سوور بووەوە. وای دەزانی میرزادە گاڵتەی پێ دەکات، بەتەمایە داوێک یان تەڵەیەکی بۆ بنێتەوە، بەڵام کە بەوردی زەینی دەموچاوی دا، بۆی دەر کەوت نەخێر بە ڕاستیەتی و هیچ ڕووبینیەک لە سیمایدا بەدی ناکرێت. ئیدی ڕووی گەشایەوە و گوتی:

- هەر دەبێ بمرم!

لەزگ بوو لەسەری بڕوات و بڵێ: "چۆن دەبێ پیاوێکی وەکو من بمرێت؟.

بەڵام زمانی خۆی گرت. ئەوجا لەسەری ڕۆیشت و گوتی:

- تەسەور ناکرێ ئەم گانیایەی تۆ چ ئازارێکم دەدات. هەر بە مەبەستی دژایەتی من، ڕۆژێ یەخەی گرتووم، دەڵێت ئەوانەی کە گوێیان لە ئیعترافنامەکەی من بووە، لەوەیە سێ چوارێکیان لە پێش مندا بمرن! توخوا ئەمە قسەیە! وا دەزانێ من بەمە خۆشحاڵ دەبم. ها ها!... یەکەم هەموویان هێشتا زندوون و کەسیان نەمردووە، گریمان هەر هەمووشیان لەپێش مندا مردن، ئەمە چ بارسووکیەک دەبێ بۆ من؟ پێم وایە تۆش لەمەدا لەگەڵ بۆچوونەکەی مندایت. لەچاوی خۆیەوە تەمەشای خەڵکی دەکات، وا دەزانێ منیش خۆیم. هەر بەوەندەشەوە نەوەستا، بەڵکو شولی لێ هەڵکێشاوە و هەنوکە پەنای وەبەر جنێوان هێناوە و ڕێک و ڕەوان دەڵێت: هەر کەسێک حورمەتی خۆی بگرێت، لەو حاڵەدا بە بێدەنگی دەمرێت، گوایە ئەم کارانەی من لە ڕووی خۆپەرستی یەوە بووە! توخوا ئەوە بوو بە قسە، ها؟ خوا هەقە خۆی خۆپەرست نییە! خۆ پەرستی لەوەوە بۆ خەڵکی ماوەتەوە! جا خۆپەرستی ئەو جۆرە خەڵکانە چەند چڕو خەستە! خۆش ئەوەیە لە هەموو کەس خۆپەرست ترن و هەست ناکەن کە خۆپەرستن!... ئەرێ میرزادە تۆ هیچت دەربارەی (ستیپان) گلیبوف ناوێکی سەدەی هەژدەیەم

خوێندووەتەوە؟ من دوێنێ بەڕێکەوت شتێکم لە بارەیەوە بەرچاو کەوت و خوێندمەوە...

- ئەم ستیپان گلیوفە کێیە؟*

- ئەمە پیاوێکە لە سەردەمی پەتروسی گەورەدا خرایە سەر قازوخ.

- ئا... بەڵێ! ئێستا بیرم کەوتەوە! پازدە دانە سەعات لە سەهۆڵبەندانێکی بەترەفدا، لەسەر قازوخێک مایەوە، تەنیا یەک فەرەنجی بەسەر شانەوە بوو، بە ڕاستی کەسێکی کۆڵنەدەر بوو، بەو حاڵەوە مرد. بەڵێ ئەمەم خوێندووەتەوە... بەڵام مەبەستت چییە؟ دەتەوێ چی بڵێی؟

- هیچ تەنیا ئەوەم لەخوا دەوێ کە ئەو جۆرە مەرگە بە نسیبی هەندێ کەسان بکات، بەڵام بە نسیبی ئێمە مانانی نەکات. تۆ پێت وایە من تەحەمولی مەرگێکی وەکو مەرگەکەی گلیبوف ناکەم؟

میرزادە، بە شپرزەیی گوتی:

- نا، نا، هەرگیز... تەنیا مەبەستم ئەوە بوو کە پێت بڵێم... مەبەستم ئەوە نەبوو بڵێم ناتوانی وەکو گلیبوف بیت، بەڵام تۆ... زیاتر لە کەسێکی تری ئەو سەردەمە دەچیت کە...

- ئا، دۆزیمەوە: دەتەوێ بڵێی وەکو "ئوسترمان"* ی ئەو سەردەمانە دەچیت نەک لە گلیبوف. دەتویست وا بڵێی؟

میرزادە، بەسەرسامی پرسی:

- کام ئوسترمان؟

هیپولیت، بەواقی وڕەوە گوتی:

- ئوسترمان، دیپلۆماتەکەی سەردەمی پەتروسی گەورە.

بێدەنگی و پەشۆکان بۆ ساتێک باڵی بەسەردا کێشان.

میرزادە، دوای ڕامانێکی کەم، بە ئەسپایی گوتی:

- نا، نا، مەبەستم ئەمە نەبوو. باوەڕ ناکەم بتوانی وەکو ئوسترمان بیت.

هیپولیت، چارەی دا بە یەکا.

میرزادە کە دەیویست مەبەستەکەی ڕوون بکاتەوە، خێرا گوتی:

- بەهەرحاڵ، دەزانی بۆ ئەو قسەیەم کرد، بۆیە ئەو قسەیەم کرد چونکە

خەڵکی ئەو زەمانە (باوەڕ بکە هەمیشە بیر لەمە دەکەمەوە) زۆر جیاواز بوون لە خەڵکی ئەم سەردەم و ڕۆژگارەی ئێمە. وەکو ئەوەی لە ڕەگەزێکی دی بووبن، وەکو ئەوەی ئەسڵ و نەژادێکی دیکە بووبن. خەڵکی ئەو زەمانە مێشکیان ساف و ئارام بووە، بە یەک بیرەوە مژول بوون، بەلام خەڵکی سەردەمی ئێمە، خەڵکی ئەمڕۆ مێشکیان جەنجاڵترە، پێشکەوتووترن، هەستیارترن و دەتوانن لە یەک کاتدا پەیگیری دوو سێ بیرۆکان بکەن، یانی سەرێک و هەزار سەودان... خەڵکی ئەمڕۆ مەیدانی دیدی زۆر فراوانترە، ڕەتی بڵاوە، بۆ هەزار و یەک لاپەل دەهاوێ. دڵنیام هەر ئەمەشە نایەڵێت وەکو خەڵکی ئەو ڕۆژگارە یەکپارچە بن، من مەبەستم لەو قسەیە تەنیا ئەمە بوو نەک...

- من دەزانم، تۆ زۆر لە خۆت دەکەی تا دڵنەوایی من بکەیت. ها، ها!... تۆ بە ڕاستی منداڵی میرزادە! ئاخر من دەزانم ئێوە، هەر هەمووتان بە جۆرێ ڕەفتارم دەگەڵ دەکەن وەکو ئەوەی فینجانێکی چینی بم... ئێوە بەمە من بچووک دەکەنەوە... بەلام گرینگ نییە! زویر نابم. بەهەرحاڵ گفتوگۆیەکەمان هەر نەبێ برێک سەرگەرمکەر بوو! .. میرزادە، بە ڕاستی تۆ هەندێ جار دەبیتەوە بە منداڵ. جا با ئەوەشت پێ بڵێم میرزادە لە دڵی خۆدا تەماحی ئەوەم هەبوو کە زۆر لە ئۆسترمان باشتربم. خۆ بوونە ئۆسترمان لە ناو خێڵی مردوواندا کارێکی ئاسانە... بەهەرحاڵ پێم وایە تا زووتر بمرم بۆ خۆم باشترە، دەنا وام لێدێت بە خۆم خۆزیا بخوازم کە... وازم لێ بێنە! بەدووعا! بەلام پێم بڵێ: باشترین جۆری مردن کامەیە؟ مەبەستم ئەوەیە... شایستەترین مردن بە بۆچوونی تۆ کامەیە؟ عەجیب! بۆ وەڵام نادەیتەوە؟

میرزادە، بە دەنگێکی نەرم و خۆش گوتی:

- بەلامانا برۆ و بەختەوەریمان پێ ڕەوا بدینە!

-ها ها ها! ڕێک چاوەڕوانی ئەم قسەیە بووم! بەهەرحاڵ تۆ... تۆ... تۆ... دەی.. دەی... زۆر باشە! عەجەب پیاوێکی قسەزانی! خودا حافیز، بە دووعا!

پەراوێز:

* ..."-. کامنی ئوستروف..": دورگەیەکە لە ڕووباری نیڤای باکوری پترسبۆرگ.

* ..."-. دالدەدەری لیزاڤیتا بوو...": لە ئەسڵی دەقەکەدا بە فەرەنسیە

* – ..". دوای ئەو هەموو شتەی ڕووی دا..": لە دەقەکەدا بە فەرەنسیە.

..". میـــژووی شلوســـــەر..": فریـــدریک شلوســـــەر (١٧٧٦ –١٨٦٠" دیرۆکنووسێکی ئەڵمانیە کتێبێکی هەیە بە ناونیشانی "مێژووی گشتی."

* – ..". گلاشا..": سووکەڵە ناوی ئاگلایایە.

* – ..". ستیپان گلیبوف.." (عەشیقی) ئودوکسیای یەکەم ژنی پەتروسی گەورە بوو کە تەلاقی دا. بەشداری ئەو شۆڕشەی کرد کە پیاوانی ئایین دژی ئەم ئەمیرەیە و ئەلکسی کوڕی بەرپایان کرد، گلیبوف لەساڵی ١٧١٨ دا لە کینین دادگایی کراو حوکمی خستنەسەر قازوخ درا.

* – ...". ئوسترمان...": ئاندری ئیڤانوفیچ ئوسترمان (١٦٨٦ –١٧٤٧) کوڕی قەشەیەکی خەڵکی فستفالیا بوو، لە تەمەنی هەژدە ساڵیدا هات بۆ ڕووسیا. پترۆسی گەورە لەوەزارەتخانەی دەرەوەدا دایمەزراند، لە گفتوگۆی سوڵحی نیستاد، ساڵی ١٧٢١ و پەیمانی ساڵی ١٧٢٣دا دەگەڵ ئێران، بەشداری کرد. لە سەردەمی ئانا ئیڤانوڤنادا بوو بە سەرۆکی حیزبی ئەڵمانیا، لەقەبی کۆنت و پۆستی ڕاوێژکاری وەرگرت. دوای ڕوخانی ئیڤانی چوارەم لەلایەن ئیلیزابت پتروفناوە، بۆ سیبریا نەفی کرا.

## فەسڵی شەشەم

سەبارەت بەو هەواڵەی کە ڤارڤارا بۆ برایەکانی گێڕابووەوە، هەواڵێکی تەواو دروست بوو: ئاهەنگ و شەونشینیەک لە ڤێلاکەی ماڵی یەپانجیندا ساز دەکرێت کە لە گینە دۆتمیر بیلوکونسکایاش ئامادە بێت و بەشداری تێدا بکات. قەرار بوو میوانەکان ئەو شەوە بگەنەجێ، بەڵام ڤارڤارا وەکو خووی هەمیشەیی خۆی، مەسەلەکەی زیاد لە پێویست بە ئاو و تاوتر گێڕابووەوە. دروستە کە ئاهەنگ و شەونشینیەکە پەلە پەل و شپرزەیی پێوە دیار بوو، بەڵام هۆیەکەی ئەمە بوو " کە هیچ شتێکی ئەم خێزانەوەکو خێزانانی دی نەبوو، لیزاڤیتا پروکوفیڤنا، لە نیگەرانی و بێ سەبری خۆیا دەیویست شتەکە لەوەی پتر دوانەکەوێ و زوو یەک دڵ ببێ و ببڕێتەوە. دایک و باوکەکە خەمی بەختەوەری کیژەکەیان بوو.

ئەمە جگە لەوەی قەرار بوو دۆتمیر بیلوکونسکایا، بە زووترین کات بێت و بگاتە جێ، بە تایبەتی کە بیلوکونسکایا، سەنگ و ئیحتوبارێکی کۆمەڵایەتی گەورەی هەبوو، ئیڤان فیدوروڤیچ و لیزاڤیتا پروکوفیڤنا، ئومێدی زۆریان بەوە هەبوو کە خانم بیلوکونسکایا میرزادە بەگەن بکات، کە ئەمە خۆی لە خۆیدا بەمانای کرانەوەی دەرگای کۆمەڵگەی

ئەرستۆکرات بوو لە دەزگیرانەکەی ئاگلایا، بۆیە ئەگەر لەم زەماوەنەدا شتێکی نائاسایی هەبوایە، ئەوا سەنگ و ئیحتوبارە کۆمەڵایەتییە گەورەکەی دۆتمیر بیلوکونسکایا دەیشاردەوەوپاکانەی بۆ دەکرد. کێشەی هەرە گەورەی دایک و باوکەکە ئەمە بوو کە ئایا لەم زەماوەندەدا هیچ شتێکی نائاسایی هەیە، ئەگەر هەیە تا چ ڕادەیەکە؟ یان شتەکە زۆر ئاساییە و هیچ شتێکی نائاسایی و ناخۆشی تیا نییە؟ بۆیە ڕەئی و بۆچوونی ئاشکرا و دۆستانەی خەڵکانی بە سەنگ و ئیحتوبار و لێزان، لەم کاتەدا، کە بە هۆی هەڵوێستی نادیاری ئاگلایاوە،مەسەلەکە بە تەواوەتی یەکلایی نەکرابووەوە و نەبڕابووەوە، یەگجار گرینگ و پێویست بوو.

بەهەرحاڵ، دەبوایە، بە هەر جۆرێ بووە، درەنگ یان زوو، میرزادە تێکەڵاوی کۆمەڵگە و خەڵکانێک ببێت کە تا ئێستا هیچ شارەزاییەکی لێیان نەبوو. بەکورتیەکەی دەیانویست میرزادە نیشانبدەن و بخەنەبەر چاو. بەهەرحاڵ ئەم دەعوەت و زیافەت و ئاهەنگە، کۆبوونەوەیەکی سادە بوو، زیاتر "دۆستانی ماڵباتەکە"ی لە خۆگرتبوو کە ژمارەیان کەم بوو. جگە لە دۆتمیر بیلوکونسکایا، تەنیا یەک خانمی دیکە دەعوەت بوو کە هاوسەری یەکێک لە ئەشرافە گەورە و خاوەن پایە بە ناوبانگەکان بوو. لەنێوان گەنجانیشدا ئەوەی دیار بوو هەر یەڤگینی پاڤلوفیچ بوو کە قەراو بوو وەکو یەکێک لە یاوەرانی دۆتمیر بیلوکونسکایا بێت.

میرزادە سێ ڕۆژ بەر لە ئاهەنگەکە بە هەواڵی هاتنی ئەم خانمە پیرەی زانی بوو، بەڵام سەبارەت بە سازدانی ئاهەنگەکە تەنیا یەک ڕۆژ پێش شەونشینیەکە پێی زانی بوو. هەستی بەجم و جۆڵ و سەرقاڵی ئەندامانی خانەوادەکە کردبوو. هەندێ ورتەورت و ئاماژەی ئەندامانی خێزانەکە ئەوەیان دەنواند کە دڵنیا نەبن لەوەی میرزادە بەدڵی ئامادەبووان بێ و بچێتە دڵیانەوە و بەگەنی بکەن، بەڵام تێکڕای ئەندامانی خێزانەکە باوەڕیان وابوو کە میرزادە بەو گێلی و ساویلکەییەی خۆیەوە، هەست بەوە ناکات کە بە هۆی ئەوەوە، ئەوەندە نیگەرانن. بۆیە لە ناخی خۆیاندا، بە ترس و گومانەوە سەیریان دەکرد. ڕەنگە نەهەقیانش نەبووبێ، چونکە ئەم ئاهەنگ





و میوانداریە بەلای ئەوەوە گرینگ نەبوو، بیرو خەیاڵی ئەو بەشتێکی ترەوە مژول بوو، خەیاڵی ئەو لای ئاگلایا بوو کە سەعات بە سەعات پەست ترو تورەترو گرژتر دەبوو، ئەمە دڵی میرزادەی بەجارێ کرمێ کردبوو. هەموو ساتێک دەمرد و دەژیایەوە. کە بیستی یەڤگینی پاڤلوفیچش دەعوەتە، زۆر خۆشحاڵ بوو و گوتی لەمێژە خوازیاری دیتنی بووە، بەلام ئەم قسەیە، بەخۆیشی نەیزانی بۆ، بەدڵی کەسیان نەبوو، ئاگلایا بە تورەیی لە هۆڵەکە وەدەر کەوت، بەلام درەنگانێکی شەو، دوای سەعات یازدە. کاتێ میرزادە دەیویست بڕواتەوە بۆ ماڵەکەی خۆی. ئاگلایا فرسەتی هێنا، کە لە دەرەوە، بە دوو قۆڵی چەند قسەیەک دەگەڵ میرزادەدا بکات:

- حەز دەکەم سبەینێ بە ڕۆژەوە نەیەی بۆ ماڵمان، شەو وەرە، کاتێ هەموو میوانەکان کۆدەبنەوە، ئاگاداری کە سبەی شەو دەعوەت و زیافەت و ئاهەنگمان هەیە و میوانمان دێن؟

ئاگلایا، ئەو قسانەی هەندێ بە توندی و زۆر بەجیددی کرد. یەکەم جار بوو کە باسی "شەونشینی" دەکرد، چونکە ئەویش ئەم قەرەباڵغی و بەزمەی لە گیان خۆش نەبوو. هەموو ئەندامانی خێزانەکە پەیان بەوە بردبوو. لەوە دەچوو ئاگلایا. زۆری حەز لێ بێ لەسەر ئەم بەزمە، لەگەڵ دایک و بابیا بیکات بە شەڕێ ئەو سەری دیار نەبێت، بەلام غروور و شەرم ڕێگەیان پێنەدا. میرزادە یەکسەر بۆی دەر کەوت کە ئاگلایاش، جۆرە ترسێکی لە بارەی ئەوەوە هەیە، بەلام دەری نابڕێت و دانی پێدا نانێت. بەخۆیشی لەپڕ هەستی بە جۆرە ترس و نیگەرانییەک کرد.

میرزادە بەرسڤی دایەوە:

- بەڵێ، منیش دەعوەت کراوم.

ئاگلایا، بە ئاشکرا تیا مابوو کە چۆن بەردەوام بێت. بەتورەییەکی کوتوپڕەوە، کە بەخۆیشی هۆیەکەی نەدەزانی و نەیدەتوانی جڵەوی بگرێت گوتی:

- دەکرێ ئینسان بۆ تاقە جارێک لە ژیانتا، بەجیددی قسەت دەگەڵ بکات؟

- بەڵێ دەتوانیت، بۆت هەیە. فەرموو گوێم لێتە. زۆریشم پێ خۆشە.

میرزادە بە ئەسپایی و لەبن لێوانەوە ئەو قسەیەی کرد.

ئاگلایا، بۆ ماوەی چرکەیەک هیچی نەگوت، ئەوجا بە بێزارییەکی ئاشکراوە هاتە قسان:

- من نامەوێ لەم بارەیەوە گەنگەشەیان دەگەڵ بکەم، چونکە هەندێ جار هەیە ئینسان ناتوانێ ناچاریان بکات گوی لە دەنگی ئەقڵ بگرن. من هەمیشە لە هەندی دابونەریتی کۆمەڵگەی ئەرستوکراتی کە دایکم تا ڕادەی پەرستن پابەندیانە، بێزار بووم. من باسی بابە ناکەم، چونکە ئەو هی گلەیی نییە. هەندێ شت هەیە لەو چاوەڕوان ناکرێت. دایکەش بەدەستی خۆی نییە، زاتەن پابەندی دابونەریتانە. تۆ بڕۆ داوای شتێکی تورەهاتی لێبکە، هەنگێ بەچاوی خۆت دەیبینی! بەڵام وێڕای ئەوەش پابەند و گوێڕایەڵی ئەم کۆمەڵگا بۆش و بەتاڵەیە، کە دەکاتە کۆمەڵگەی ئەرستۆکراتی!... دۆتمیر بیلوکونسکایا؟ نامەوێ زەمی بکەم: ئەمە پیرەژنێکی جینگنی، بەد ڕەفتاری ناجسنە، بەڵام زیرەکە، دەزانێ چۆن هەموویان لەسەر قامکی خۆی بخولێنێتەوە، بەلای کەمەوە، ئەم خەسڵەتە بە هێزەی تیایە. بە ڕاستی سەیرە، مەخسەرەیە. ئێمە هەمیشە سەر بەچینی مامناوەندی بووین و، لە ڕووی چینایەتییەوە بەقەد بەرەی خۆمان پێمان ڕاکێشاوە. ئیدی بۆچی دەبێ هەوڵ بدەین خۆمان بە کۆمەڵگەی بالای ئەشرافانەوە هەڵواسین؟ خوشکەکانیشم تینو و تامەزرۆی ئەمەن. هەمووشی خەتای ئەم میرزادە (س..)یە کە ئەو شتەی بردووەتە مێشکیانەوە. باشە بۆچی کە زانیت (یەڤگینی پاڤلوفیچ)ش دەعوەتە، ئەوەندە خۆشحاڵ بوویت؟

میرزادە گوتی:

- گوێ بگرە ئاگلایا، من هەستدەکەم تۆ زۆر ترسی ئەوەت لە دڵە کە نەبا من سبەینێ لەبەرچاوی ئەو خەڵکە، لە مەجلیسی ئەرستۆکراتاندا، پۆتێک بشکێنم و چەپکە گوڵێک بە ئاوا بدەم، وانییە؟

ئاگلایا، سوور بووەوە، گوتی:

- ترسی تۆ؟ جا من بۆ ترسی تۆم بێ؟ خۆ ئەگەر خۆت بکەی بە

مەخسەرە و گەپچارپیش، ئەمە چ پەیوەندییەکی بە منەوە هەیە؟ باشە تۆ چۆن ئەم دەستەواژەیە بەکاردەبەی؟ وشەی "پۆت شکان" مانای چییە؟ ئەمەوشەیەکی زۆر عەوامانەی کرێت و بازاڕیە.

- وشەی سەرزاری... مەکتەبلیانە.

- بەڵێ.. وشەی سەر زاری مەکتەبلیانە، بازاڕیە. ناشرینیشە. وا دیارە بەتەمای سبەینێ ئەو جۆرەوشانە لە ئاخاوتندا بەکاربەری. کە چوویتەوە بۆ ماڵ، لە قاموسا بگەڕێ، هەر وشە و زاراوەیەکی لەم بابەتەت بینی ئەزبەری بکە. ئیدی بەمە دەتوانی هەستێکی زۆر باش لەلایەن منەوە بۆ خۆت مسۆگەر بکەی!...حەیفێ گوایە بەڵەدی چۆن بە ڕێکوپێکی خۆت بە مەجلیساندا بکەیت، ئەمە لەکوێوە فێربووی؟ ئەدی دەتوانی لەو کاتەدا کە هەمووان لێت دەڕوانن، فینجانێ قاوەوەربگری و بە نەزاکەتەوە بیخۆیتەوە؟

- پێم وایە دەتوانم.

- بەداخەوەم: وانەبوایە تێر پێدەکەنیم و ڕابواردنەکەم دەردەچوو. بەلای کەمەوە گوڵدانە چینی یەکەی هۆڵی میوان بشکێنە! زۆر گران بەهایە. تکایە بیشکێنە، لەبەر خاتری من. دیارییە، بیشکێنە و بزانە چۆن دایکە خەمبار دەبێت و بە بەرچاوی هەموانەوە لە حەژمەتاندا، دەست بەگریان دەکات، زۆری خۆش دەوێت. وەکو عادەتی هەمیشەیی خۆت دەستەکانت بجووڵێنە و بەری بدەوە و پارچە پارچەی بکە. هەوڵ بدە بەئانقەست لە جێگایەکی نزیک گوڵدانەکەوە دانیشە.

- بەپێچەوانەوە. هەوڵدەدەم بەگوێرەی توانا لە دووری دانیشم. سوپاس کە ئاگادارت کردمەوە.

- مانای وایە تۆ لە ئێستاوە دەترسیت دەستەکانت بجووڵێنی! من ئامادەم گرە و بکەم کە بە نیازی "بابەتێکی" جدی، زانستانەی بەرز بکەیتەوە و دەست بە شەرح و ڕاڤە و شرۆڤانی بکەیت و ئاستی ڕۆشنبیری خۆت بنوێنی. خۆزیا ئەوەت دەکرد، چەند خۆش دەبوو!

- پێم وایە ئەمە کارێکی گەوجانە دەبێت... ئەگەر لە جێی خۆیا نەبێت و دەگەڵ مەجلیسەکەدا نەگونجێت.





ئاگلایا لە ئەنجامدا بە تەواوەتی بێتاقەت بوو، گوتی:

- گوێ بگرە. بزانە چیت پێدەڵێم. یەک کەڕەت و بۆ هەمیشە پێت دەڵێم: ئەگەر باسی بابەتێکی وەکو سزای ئیعدام، یان باری ئابووری ڕووسیا، یان ئەو تیۆریەی کە دەڵێت (جوانی دنیا ڕزگار دەکات)... دیارە ئەمەم پێ خۆش دەبێت، چونکە گاڵتە و پێکەنینەکەم دەردەچێ، بەڵام لەئێستاوە پێت دەڵێم، ئاگادارت دەکەمەوە: ئەگەر شتی وات کرد، نەخەڵەتابی جارێکی دی خۆتم نیشان بدەیت! حاڵی بوویت؟ بە ڕاستیمە ها، گاڵتە ناکەم، ئەم جارەیان بە ڕاستی بەجدیمە!

بە ڕاستی، هەڕەشەکەی جدیەتی پێوە دیار بوو. تۆنی وشەکانی نا ئاسایی بوون، پرشنگی چاوانی هەڕەشاوی بوون، میرزادە پێشتر قەت شتی وای لێ نەدیتبوو. هەرگیز لەوە نە دەچوو شۆخی بکات و بەگاڵتەی بێت.

- دەزانی ڕەفتاری تۆ جۆرێکە، وام لێدەکەی ناچاربم "بکەومە چەنە بازی"و زۆر نزیکە گوڵدانەکەش بشکێنم. تۆزێ لەمەپێش هەستم بە هیچ ترسێک نەدەکرد، بەڵام ئێستا لە هەموو شتێک دەترسم. دڵنیام بەدڵی ئامادەبوان نابم.

- کەواتە هیچ قسەیەک مەکە، بۆ خۆت بە بێدەنگی دانیشە.

- مەحاڵە، ناتوانم. دڵنیام کە ترس هانم دەدات باخفم، ترس دەکاتە کارێک گوڵدانەکە بشکێنم. دوور نییە پێم بخزێت و تخێلی سەر زەوی ببم یان هەر گەوجیەتێکی دیکەی لەم بابەتەم لێسادر ببێت وەکو پێشتر شتی وام بەسەر هاتووە. ئەمشەو تا بەیانی خەو بەشتی واوە دەبینم، ئاخر بۆ ئەم بابەتەت هێنایە گۆڕی؟

ئاگلایا، نیگایەکی خەمناکی کرد.

میرزادە، بەجیددی گوتی:

- دەزانی چارچییە؟ باشترین شت ئەوەیە کە سبەینی لە بنی نەیەم! خۆم بکەمە نەخۆش و بڕایەوە!

ئاگلایا لاقی کێشا بەزەویداو لە تورەییدا ڕەنگی سپی بوو، گوتی:

- پەنا بەخوا! کەس شتی وای دیتووە؟ دەیەوێ نەیەت! هەر هەموو ئەم ئاهەنگ و شەونشینی و میوانداریە لەبەر خاتری ئەو سازدراوە، ئەویش دەیەوێ نەیەت! بەخوا بابە جوانە! ئاهـ.. خودایا! شا بە تاقەتی ئەو کەسەی مامەڵە دەگەڵ بەبەیەکی چکۆلەی وەکو تۆدا دەکات!

میرزادە، بەپەلە قسەکەی پێ بڕی و گوتی:

- باشە.. باشە.. دێم.. دێم.. شەرت بێ بەشەرتی پیاوان بەدرێژایی شەو نشینیەکە دانیشم و فزەم لێوە نەیەت. ئەم کارە دەکەم.

-باشترین کارێ کە بیکەی ئەوەیە. ئەرێ تۆ تۆزێ لەمەپیش گوتت "خۆم دەکەمە نەخۆش" تۆ ئەم دەستەواژانە لەکوێ دێنی؟ یانی تۆ بەئانقەست بەو جۆرە من دەدوێنی؟ دەتەوێ عینادیم دەگەڵ بکەی، وانییە؟

- ببورە. ئەمەش وشەیەکی عەماوانەی مەکتەبلیانەیە. جارێکی دی دووبارەی ناکەمەوە. من دەزانم ترسی تۆ دەربارەی منە (تکایە دیسان تووڕە مەبە). من ئەمەم زۆر زۆر پێ خۆشە. تۆ نازانی من چەند دەترسم و قسەکانی تۆ چەندم شاد دەکەن، بەڵام دڵنیات دەکەم، کە هەر هەموو ئەم ترس و نیگەرانییە نا بەجێیە، هیچ مانایەکی نییە. خوا شایەتە ئاگلایا تەنیا شادی دەمێنێتەوە. زۆرم پێ خۆشە کە بەم ڕادەیە منداڵیت، منداڵیکی میهرەبان و دڵ و دەروون پاک و بێگەرد! ئاهـ ئاگلایا... چەند جوانی!

هەڵبەتە ئاگلایا لەسەرڕێ بوو کە تووڕە بێت، کەچی لەناکاوا، هەست و سۆزێکی سەیر، کە خۆیشی نەیدەزانی لەکوێوە هات، بەجارێ ڕۆحی فەتح کرد و گوتی:

- باشە تۆ، لەسەر ئەم سەرنجە زبرانەی کە هەنوکە پێمدایت، سەرزەنشتم ناکەیت؟ قەت، لە ئاییندەشا؟

-واز بێنە، ئەمە قسەیە! چۆن ڕێ بە خۆت دەدەی شتی وا بپرسیت؟ بۆچی دیسان خەریکە سوور دەبیتەوە؟ دیسان ڕووت تاریک بوو، خووت بەوەوە گرتووە کە هەندێ جار ڕووتاڵ بیت! جاران وا نەبوویت... من سەرچاوەی ئەمە دەزانم...

- بێدەنگ بە! .. زارت داخە! ..

- باشتر وایە باسی بکەین. زۆر لەمێژە دەمەوێ باسی ئەمەت دەگەڵ بکەم. پێشتریش لەگەڵم باس کردویت... بەڵام بەس نەبوو، چونکە تۆ باوەڕت پێنەدەکردم. ناحەزێک لەنێوانماندایە...

ئاگلایا بەلەز قسەکەی پێ بڕی:

- وس، وس. بێدەنگ. قسە نەکەی!

توند دەستی گرت و بەسیمای ترساوەوە لە سەراپای ڕوانی. ڕێک لەوساتەدا یەکێک بانگی لێ کرد. بە ئاسودەیی دەستی میرزادەی بەرداو بە ڕاکردن ڕۆیشت.

میرزادە، بەدرێژایی شەوەکە ئارامی نەبوو، تایەکی گەرمی لێهاتبوو. سەیر ئەوە بوو ماوەیەک بوو هەموو شەوێک تای لێدەهات. ئەم جارەیان گەیشتبووە نیمچەوڕاوەیەک، بەدەم نۆرە تاوەوڕێنەی دەکرد و بیری لەوە دەکردەوە: باشە ئەگەر سبەینێ لەبەردەم ئەو هەموو میوانەدا فێی لێبێ چ بکات؟ چ دەقەومێ؟ خۆ پێشتر بە بەرچاوی خەڵکیەوە تووشی ئەو حاڵەتە بووبوو.

کە بیری لەمە دەکردەوە خەریک بوو لە ترسا هەترەشی بچێت. بەدرێژایی ئەو شەوە، بەخەیاڵ خۆی لە شەوبێرییەکی سەیر و لەنێو خەڵکانێکی بێگانەدا دەبینییەوە. لە هەمووی خراتر ئەوە بوو کە شانی لە قسان قایم کردبوو، ئەوەی دەیوت نایوتەوە. لەکاتێکا کە دەیزانی پێویستە بێدەنگ بێت، ڕژدتر دەبوو لەسەر قسان. بە درێژایی ئەو ماوەیە هەوڵی دەدا بۆچوونەکانی بە سەر ئامادەبواندا بسەپێنێ. یەڤگینی پافلوفیچ و هیپولیتش لە دەعوەتکراوەکان بوون، لەوە دەچوو زۆر کۆک و تەبا بن.

دوای سەعات هەشت، بەدەم ژانە سەرەوە لەخەو ڕابوو، زەین و مێشکی سیخناخی خەیاڵی پەرێشان و هزرێن غەریب بوو. پڕ بەدڵ، حەزی دەکرد ڕوگوژین بدینێ. بۆچی؟ نەیدەزانی. ئەوسا لێبڕا، بێ ئەوەی هیچ ئەنگێزەیەک لەئارادا بێ، بچن بۆلای هیپولیت. بە ڕادەیەک پەشێو و پەرێشان بوو، کە تێکڕای ڕووداوەکانی ئەم بەیانیە، وێڕای ئەوەی کارێکی زۆریان لە دڵ و دەروونی کردبوو، بە تەواوەتی سەرنجیان ڕانەکیشا بوو،

کە یەکێک لەو ڕووداوانە هاتنی لیبدیف بوو بۆ لای.

سەروسەکوتی لیبدیف زوو پەیدا بوو، تۆزێک دوای سەعات نۆ، بڕێک مەست و خومار بوو. میرزادە هەرچەندە لەو دواییانەدا، زەین و دیقەت و سەرنجی سست بووبوو، بەڵام هەستی بە گۆڕانی کوتوپڕی لیبدیف کرد، ئەمە ئەوەندە زەق بوو، پێویستی بە دیقەتی زۆر و سەرنجی ورد نەبوو. لیبدیف لەوەتای جەنەڕاڵ ئیڤولگین لیی تۆرا بوو و لە ماڵی وی ڕۆیشتبوو، کە هەمووی سێ ڕۆژ بوو، زۆر گۆڕا بوو، شڕو شەپڕێو، چڵکن و پڵکن، جلەکانی یەکپارچە پەڵە و لەکە، بۆینباخەکەی هەمیشە خوار و خێچ، یەخەی پاڵتۆکەی دڕا بوو. تەنانەت لە ماڵیشەوە نەدەحەوایەوە و شەڕی بە دارو بەرد دەفرۆشت، بەگژ سێبەری خۆیدا دەچوو، دەنگە دەنگ و هاواری لە حەوشە بچوکەکەیانەوە دەهاتە دەرێ. ڕۆژێک ڤیرای کیژی بەگریانەوە بۆلای میرزادە هاتبوو و زۆر شتی بۆ گێڕابووەوە.

لیبدیف، ئەم جارەیان بە شێوەیەکی سەیر قسانی دەکرد، بە سینگی خۆیدا دەکێشاو سەرزەنشتی خۆی دەکرد کە کارێکی خراپی کردووە، گوێگر نەیدەزانی دەبێ ئەو کارە خراپە چی بێ...

ئەنجام بە دەنگێکی خەمناک گوتی:

– تەواو، کار لەکار ترازا سزای خیانەت و بودەڵەیی خۆم وەرگرت...شەقەزلەی خۆم خوارد!

میرزادە گوتی:

– شەقەزلە؟ کێ لیی دایت؟... جا بەم بەیانی زووە؟

لیبدیف، بەدەم تەوسخەنێکەوە گوتی:

– بەیانی زوو؟ ئەمە هەقی بەسەر کاتەوە نییە... خۆزگە سزایەکی بەدەنی بوایە... بەڵام سزایەکی مەعنەوی و ئەخلاقیە.... ئەم سزایەی من سزایەکی سایکۆلۆژییە نەک بەدەنی!...

لیبدیف، بەدەم ئەو قسەیەوە، بێ هیچ مجامەلەیەکی دی لەپڕ لێی دانیشت و کەوتە گێڕانەوەی بەسەرهاتەکەی، بەسەرهاتێکی زۆر بێ سەروبەر بوو. میرزادە بە بێزاری سەروچاوی دا بەیەکاو خۆی بۆ

ڕۆیشتن ئامادە کرد، بەڵام لەپڕ هەندێ لە قسەکانی لیبدیف لە زەینیا دەنگیان دایەوە، شپرزە و هەراسان لە جێی خۆی ڕەق ڕاوەستا... ئاغای لیبدیف باسی شتی سەیری دەکرد.

وابزانم لە هەوەڵەوە باسی نامەیەکی کرد، ناوی ئاگلایا ئیڤانوڤناش برا. ئەوجا لیبدیف،بێ پەروا و بێ هیچ پێشەکییەک بە زمانێکی زۆر تاڵ کەوتە تاوانبارکردنی میرزادە، گوایە میرزادە سووکایەتی پێ کردووە، چونکە لە سەرەتاوە سەبارەت بە "کەسێک" (مەبەستی ناستاسیا فیلیپوڤنایە) متمانەی تەواوی پێکردووە و بە مەحرەمی زانیوە، کەچی پاشان پەیوەندیی دەگەڵ بڕیوە و بە شێوەیەکی ئیهانە ئامێز فەرامۆشی کردووە و لەخۆیی دوور خستووەتەوە و تەنانەت خۆی لە وەڵامی "ئەو پرسیارە سادەیەش دەربارەی ئەو گۆڕانە خانەوادەییەی کە بەڕێوە بوو" دزیوەتەوە. لیبدیف بەدەم هەڵڕشتنی فرمێسکی مەستانەوە ئیعترافی کرد کە لە دوای ئەو ئیهانەیەوە ئۆقرەی لێبڕاوە، سەبری سواوە، بە تایبەتی لەبەر ئەوەی زۆر شت دەزانێ... زۆر شت دەربارەی ڕوگوژین، ناستاسیا فیلیپوڤنا، دەستە خوشکێکی ناستاسیا، دەربارەی ڤارڤارا ئاردا لیونوڤنا... و تەنانەت دەربارەی خودی ئاگلایا ئیڤانوڤناش. "باوەڕ دەکەی من ئەمەم لە ڤیراوە، لە تاقە کچە شەرعیەکەمەوە زانیوە... بەڵێ بەڵێ... تاقانە نییە، چونکە سێ کچی وام هەن. باشە کێ نامەی بۆ لیزاڤیتا پروکوفیڤنا ناردووە و لەم نهێنییانەی ئاگادار کردووە؟ ها ها! کێ لەم هەڵس و کەوت و ڕەفتار و کردار و پەیوەندییانەی ناستاسیا فیلیوڤنای ئاگادار کردووە؟.. ها ها ها! دەبێ ئەو نامە نووسە بێ ناو و نیشانە کێ بێ؟ تۆ دەیزانی؟ ئەگەر دەیزانی دەکرێ پێم بڵێی کێیە؟

میرزادە هاواری کرد:

– خۆ تۆ نیت؟..

لیبدیف، مەست و مەستانە بەرسڤی دایەوە:

– بەڵێ منم! ئا ئەمڕۆ. سەعات هەشت و نیو، یانی نیو سەعات پێش ئێستا... نەوەڵڵا سێ چارەک لەمەپێش. بەو دایکە بەڕێزەم ڕاگەیاند کە





دەمەویێ لە شتێکی زۆر گرینگ، هەستیار ئاگاداری بکەمەوە. لە پارچە کاغەزێکدا بۆم نووسی دەمەویێ بۆ کارێکی گرینگ بیدینم. بە یەکێک لە کارەکەرەکاندا بۆم نارد. ئەویش بانگی کردمە ژوورەوە.

میرزادە، بە نەباوەڕییەوە پرسی:

- یانی تۆ ئێستا، تۆزێ لەمەپێش لیزاڤیتا پروکوفیڤنات بینی؟

- بینیم و شەقەزللەیەکی مزریشم خوارد، هەڵبەتە شەقەزللەیەکی مەعنەوی. نامەکەی دامەوە، نەک هەر دایمەوە، بەڵکو بە نەکراوەیی دای بە سەروچاوما، توند یەخەی گرتم و بەپاڵ لە ژوورەکە وەدەری نام... هەڵبەتە بەمانا مەعنەویەکەی پاڵنان و وەدەرنان. ئەگەر چی چیوای نەمابوو بە مانا بەدەنیەکەش وەدەرم بنێت، هەر زۆر نزیک بوو.

- باشە ئەو نامەیە کامە بوو کە بە نەکراوەیی دایەوە بەسەروچاوتا؟

- باشە... ها ها ها! باشە پێم نەگوتوویت؟ بە خەیاڵی خۆم بۆم باس کردبوویت... نامەیەک بوو کە دابوویانە من تا بیگەیەنمە...

- نامەکە لەکێوە بۆ کێ بوو؟

بەڵام هەندێ لە قسەکانی لیبدیف زۆر بێ سەروبەرو نامەفهووم بوون. زەحمەت بوو پیاو بتوانێ هیچیان لێ هەڵێنجێ. ئەوەی میرزادە لە قسەکانی هەڵێنجا ئەمە بوو کە لیبدیف، ئەم بەیانیە نامەیەک لە لایەن کارەکەری ماڵەکەوە درابوو بە ڤیرالیبدیڤا بەو مەبەستەی کە ڤیرا وەکو جاران، وەکو جاران لە هەمان کەسێتییەوە بیگەیەنێتە هەمان کەس. لێرەدا من بەئانقەست هەر بۆ جیاوازی و جیاکردنەوە یەکێک لەم دوو نەفەرە بە "کەسێتی"و ئەویتریان بە "کەس" ناو دەبەم، چونکە جیاوازییەکی زۆر لەنێوان کیژێکی پاک و زۆر نەجیبی جەنەڕاڵێک و ژنێکی هەرزەدا هەیە. بەهەرحاڵ نامەکە لە هەمان کەسێتییەوە بوو کە ناوەکەی بە پیتی "ئا" دەست پێ دەکات.

میرزادە بە سەرسامی پرسی:

- چۆن؟ شتی وادەبێ؟ یانی نامەی بۆ ناستاسیا فیلیپوڤنا ناردووە؟ شتی وا مەحاڵە!...

لیبدیف، بەدەم زەردەخەنەیەکی گەوجانەوە گوتی:

- ناردویەتی و ئەولاتریش. ئەوەندە هەیە ئەگەر ڕاستەخۆ بۆ خودی ناستاسیا فیلیپوڤناش نەبووبێ، بۆ ڕوگۆژین بووە، کە فەرقیان نییە... تەنانەت ئەم کەسێتییەی کە ناوەکەی بە (ئا) دەست پێ دەکات، نامەیەکی دیکەی بۆ ئاغای تیرنیتف ناردووە تا بیگەیەنێت.

لیبدیف، بەدەم چاوداگرتن و بزەیەکی بەماناوە ئەو ڕستەیەی دوایی گوت.

چونکە لیبدیف، هەر ساتەی دەچووە سەر باسێک و، باسەکەی پێشتری خۆی لەبیر دەچووەوە. میرزادە بە بێدەنگی بەدیاریەوە دانیشت تا هەرچی لە هەگبەیدایە هەڵی ڕێژێ، بەڵام لیبدیف بەخۆیشی نەیدەزانی چ دەڵێت. لەپڕی دەکرد نەیدەگرت لە بەتاڵی دەکرد پڕ نەدەبوو، ئێستاش ئەوە ساغ نەبووەوە کە ئایا نامەکان لە ڕێگەی ئەوەوە دەنێردران یان لە ڕێگەی ڤیراوە؟ کاتێ گوتی ئەو نامەیە بۆ ڕوگۆژین بووبێ یان بۆ ناستاسیا فیلیپوڤنا، عەینی شتە، چونکە فەرقیان نییە، گوێگر بەمەدا ئەوەی بۆ دەردەکەوێ کە ئەم نامانە، ئەگەر نامەیەک لە ئارادا بووبێ، لە ڕێگەی ئەوەوە نەنێردراون. گریمان ئەم جۆرە نامەیە هەبووە، چۆن چۆنی، بە چ ڕێکەوتێ کەوتبووە دەستی ئەو. ئەگەری زاڵ ئەوە بوو، کە ڕەنگە بە هەر شێوەیەک بووبێ، لە ڤیرای دزی بێ و بە مەبەستێکی تایبەتی بۆ لیزاڤیتا پروکوفیڤنای بردبێت. ئەمە مەزەندە و ئەنجامگیری میرزادە بوو.

میرزادە زۆر نیگەران بوو هاواری کرد:

- تۆ شێت بوویت!

لیبدیف، بەدەم بزەیەکی فێڵاویەوە گوتی:

- بە تەواوەتی نا میرزادەی مەزن... ئەلهەقی لەپێشا دەمویست بیدەم بە تۆ، بیدەمە دەستی خۆت تا بەوە خزمەتێکم کردبێت... دوایی بیرم گۆڕی و لەدڵی خۆدا گوتم ئەم خزمەتە بەوان بکرێ باشترە. باشتر وایە ڕاستەوخۆ ئەو دایکە بەڕێز و زۆر نەجیبە لە هەموو شتێک ئاگادار بکەمەوە. وەکو چۆن جارێکی تر بە مانایەکی بێ ناو و ئیمزا ئاگادارم کردبووەوە. ئەم جارەش ئەم کارتەی ئەم بەیانیەش، سەعات هەشت و نیو بۆم نارد، بە

ناوی "هەواڵنێری نهێنی تۆ" ئیمزام کرد، ئیدی بەلەز لە دەرگای پشتەوە، لە دەرگای خزمەکارەکانەوە کردیانمە ژوورەوە و خزمەتی ئەو دایکە هەرە بەڕێز و نەجیبە گەیشتم.

- ئێ، چیتر؟

- خۆت دەیزانی: خەریک بوو، لێم بدات. یانی لێی دابام زۆر پیاوانەتر بوو. ئەوەی بەمنی کرد لە لێدان خراتر بوو. نامەکەی دا بەسەروچاوما. هەوەڵ جار وام هەست کرد لە گینە نامەکە لای خۆی گل بداتەوە... دوای بیرکردنەوەیەکی کەم دیقەتم دا کە بیری گۆڕی، نامەکەی تووڕدا و گوتی: "مادامێکی پیاوێکی وەکو تۆیان ڕاسپاردووە بیگەیەنی، دەی بڕۆ بیگەیەنە! .." دیار بوو زۆری لەبەر گران بوو، ئەگەر وانەبوایە شەرمێکی دەکردو بەو جۆرە ڕووبەڕوو تەریقی نەدەکردمەوە. بە ڕاستی ژنێکی تورە و تڕۆیە،

- ئێستا نامەکە لەکوێیە؟

- بەمنە: ئەوەتا!

لیبدیف بەدەم ئەو قسەیەوە، نامەکەی دا بە میرزادە. نامەی ئاگلایا بوو بۆ گاڤریلا ئاردا لیونوفیچ. هەمان ئەو نامەیە بووکە دەبوا گاڤریلا دوای دوو سەعات سەرکەوتوانە بیگەیاندبا خوشکەکەی.

- نابێ ئەم نامەیە لای تۆ بێت.

لیبدیف. هاتە خرۆش و بە گەرمی گوتی:

- هی تۆیە، داومە بە تۆ. بۆ تۆم هێناوە. وا جارێکی دی دێمەوە خزمەتی تۆ، بە دڵ و بەگیان فەرمانبەرداری تۆم. دوای خیانەتێکی نەخوازراو، دەگەڕێمەوە خزمەتی تۆ، نۆکەرتم! بەدەردی توماس موری* ئینگلیزی، لەبەریتانیای مەزن، گوتی دڵم بەرخەنجەر بدە، بەڵام واز لە ڕیشم بێنە. یان باوکی ڕۆما، واتا پاپای ڕۆما، کە من ناوم ناوە باوکی ڕۆما، گوتەنی ئەمە تاوانی خۆمە* .

میرزادە، بە مکوڕی گوتی:

- دەبێ ئەم نامەیە دەستبەجێ بنێردرێ، خۆم مشووری دەخۆم.

- باشە میرزادەی هەست ناسک، نموونەی وێڵ و ماریفەت، باشتر نییە

کە...

لیبدیف بەدەم ئەو قسانەوە، چرۆچاوی خۆی بە جۆرەها شێوە دەگۆڕی، مەرایی و ڕیا فرۆشییەکی دەکرد، هەر مەپرسە. لەپڕ لە سەر کورسییەکەی ڕاپەڕی وەکو ئەوەی دەرزییەکی پێدا کرابێت. بە دەستەکانی ئاماژەی بۆ شتێک دەکردو لە هەمان کاتدا، بە شێوەیەکی کۆمیدیانە چاوی دادەگرت.

میرزادە، بە تورەیی و مەیلەو هەڕەشەوە گوتی:

- مەبەستت چییە؟

لیبدیف، بەدەم مەرایی و کلکە سووتێوە و بە ئەسپایی گوتی:

- پێویستە بەر لە هەرشتێک بیکەیتەوە.

میرزادە، بە تورە بوونێکی ئەوتۆوە بۆی چوو کە لیبدیف بەرە و دەرگاکە هەڵات، بەڵام کە گەیشتە بەردەرگاکە هەڵوەستەیەکی کرد، بە ئومێدی ئەوەی میرزادە لوتفێک بفەرمووێ و بیبەخشێت.

میرزادە، بە خەم و پەژارەیەکی قووڵەوە گوتی:

- ئاخ لیبدیف! پێم ناڵێی چۆن پیاو دەگاتە ئەم ئاستە نزمە؟

لیبدیف، گەشایەوە، یەکسەر لە میرزادە هاتە پێشەوە، لێکدا لێکدا دەیکێشا بە سینگی خۆیدا و بەدەم فرمێسک هەڵڕشتنەوە گوتی:

- من کەسێکی نزمم! سووکم!

- ئەمە خوێڕیاتیە.

- بە ڕاستی وایە: خوێڕیاتیە، وشەیەکی پڕ بە پێستی ئەم حاڵەی منە.

- باشە ئەم ڕەفتارە سەیرە چییە؟ چما تۆ سیخوڕ و جاسووسی! بۆچی نامەی بێ ئیمزا و ناو دەنووسیت، تا ئەم ژنە زۆر نەجیبە، ئەم ژنە ڕەسەن و خانەدانە بترسێنیت؟ بۆچی ئاگلایا هەقی ئەوەی نەبێ بە کەماڵی ئارەزوو، بۆ هەر کەسێکی بوێ، نامە بنووسێت؟ ئەمڕۆ بۆ ئەوە چوویت بۆ ئەوێندەر تا شکاتی لێبکەیت؟ بەتەمای چی بوویت لەم کارەت؟ چ شتێک هانی دایت کە بڕۆیت ئەم دووزمانیە دژی کەسێک بکەیت؟

لیبدیف بەدەم منجە منجەوە گوتی:

- تەنیا لە ڕووی فزولیەت و کونجکاویەکی خێرخوازانەوە ئەمەم کرد، هەروەها ویستم خزمەتی ژنێکی ڕەسەنی خانەدان بکەم کە شاییستەی خزمەتە. بەڵێ...

ئەوجا لەسەری ڕۆیشت:

- ئێستاش ئەمە ملی من و ئەوە شمشێری تۆ، ملم لە موو باریکترە. ئامادەی هەموو سزایەکم. ئەگەر حەز دەکەی هەڵمواسە!

میرزادە، بە بێزارییەوە پرسی:

- بەم حاڵەوە چوویت بۆ لای لیزاڤیتا پروکوفیڤنا؟

- نا، نا، پاکوخاوێنتر و سەرحاڵتر بووم. هێدی ترو بە ئەدەب تر بووم. دوای ئەوەی ئیهانەی کردم و ترۆی کردم، ئەوسا ئەم وەزع و حاڵەم بە سەرهات.

- زۆر باشە، فەرموو برۆ و وازم لێبێنە!

میرزادە، چەند جارێک ئەو داوایەی دووبارە کردەوە. ئەوجا میوانەکەی لێبڕا کە بڕاوت. تەنانەت وەختێ کە دەرگاکەشی کردەوە کە بڕوات، جارێکی دی لەسەر نووکی پێیان گەڕایەوە ناوەندی ژوورەکە، بە ئاماژەی دەموچاو داوای لێکردەوە کە نامەکە هەڵپچڕێت، بەڵام زاتی نەکرد بەدەمی پێی بڵی، ئەوجا بەدەم نەرمە بزەیەکی میهرئامێزەوە وەدەر کەوت و ڕۆیشت.

لە هەر هەموو چەنەبازیە بێ سەروبەرو نامەفهوومەکەیەوە حەقیقەتێک خۆی دەنواند کە بریتی بوو لەوەی ئاگلایا لە گێژاوێکی تووشی نیگەرانی و سەرسامی و پەرێشانیدا دەژیا. شتێک لە ناخی ناخەوە زۆری عەزاب دەدا. میرزادە لەبەرخۆیەوە گوتی: "غیرە و حەسوودیە". لەمەوە دیار بوو کە خەڵکانێکی بەدخواو بەد ڕەسەن دەنووکیان لە سەرێتی و تووشی ترس و دوو دڵی دەکەن، بەڵام سەیرکە لەوەدا بوو کە بەو ئەندازەیە متمانەی پێ کردبوون. بێگومان هەندێ خەیاڵی وێرانکەر و شووم. دزەی کردبووە ناو ئەو سەرە بچووک و بێ ئەزموونەوە، بێ ئەزموون بەڵام گەرم و پڕ لە کبریا...

ئـەم ڕاڤە و شـرۆڤە و ئەنجامگیریانـە، میرزادەیـان نقـومی ترسـێکی بـێ ڕەزا کردبوو، بـە ڕادەیـەک پەشـێو و پەرێشـان بـوو نـە یدەزانی چ بڕیارێک بدات. هەستی دەکرد لەبەردەم کارەساتێکدایە کە دەبێ بـە هـەر نرخـێ بـووە نەیەڵێ ڕووبدات. جارێکی دی تەمەشای ئەدرەسی سەر نامـە مۆرکراوەکەی کرد: ئاهـ.. لەلای ئەوەوە هیچ جێی گومـان نـەبوو، چونکە بـاوەڕ و متمانـەی پێی هەبوو. ئەو ترسەی کە ئەم نامەیە دەیخستە دڵیەوە ئەوە بوو کە بـاوەڕ و متمانەی بە گاڤریلا ئاردالیونوفیچ نەبوو. وێڕای ئەوەش لێبڕا کە بـە خـۆی نامەکـەی بگەیـەنێتێ. هـەر بەو نیازەشـەوە لـە مـاڵ وەدەر کـەوت و ڕۆیشـت، بەڵام لەڕێگا بیری گۆڕی. بە ڕێکەوت لە نزیکی ماڵی پتیتسندا تووشـی کولیـا بوو. ڕای سپارد کە نامەکە بگەیەنێتـە براکـەی، بـەڵام وابنوێنێ کـە نامەکـەی ڕاستـەوخۆ لـە ئاگلایـاوە بـۆ براکـەی هێنـاوە. کولیـا هـیچ چەنـد و چـوونێکی نـەکرد و نامەکـەی گەیاند. هـەرگیز ئەوەشـی بـە بیرا نـەهات کـە ئـەم نامەیـە ئەو هەموو دەستەی کرد بێت.

میرزادە کە بۆ ماڵ گەڕایەوە، ناردی بەشـوێن ڤـیرا لوکیانوڤنـادا کـە بێت بـۆ لای، هـەموو شـتێکی بـۆ گێـڕایەوە، تـا هێدی و هـێمن ببێتەوە و خـەمی نەبێ، چونکە کیژەی داماو بـە دوای ئەو نامەیـەدا بـەدەم گریـانەوە، ماڵەکـەی ژێرو ژوور کردبوو. کە زانـی بـابی نامەکـەی دزیـوە زۆری پـێ سـەیر بـوو. (ئەسا ئیعترافی بۆ میرزادە کرد کە پێشتریش چەند جارێک بـە نهێنـی نامـەی لـەنێوان ڕوگـوژین و ئاگلایـا ئیڤانوڤنـادا هێنـاوە و بـردووە. هـەرگیز بـە بیریـا نەهاتووە کە لـە گینـە ئـەم کـارە بـە قازانجی میـرزادە نـەبێت...) میـرزادە، بـە ڕادەیـەک مشـەوەش بـوو کـە کولیـا بەپەلـە جـوابی بـۆ نـارد بـوو جەنـەڕاڵ نەخۆشـە بەزەحمـەت لـە مەسـەلەکە گەیشـتبوو، بـەڵام ئـەم ڕووداوە بـۆ میرزادە بەخێر گـەڕا، وەخـۆی هێنـابووەوە و ڕۆژەکـەی تـا ئێوارێ لـە مـاڵی نینا ئەلکسندروفنادا (کە هەڵبەتـە نەخۆشـەکەیان بـۆ وێندەر هێنـابوو) بەسـەر بردبوو. حـوزوری لەوێنـدەر لـە ڕووی پراکتیکییەوە هـیچ سـوودێکی نـەبوو، بەڵام سەرباری ئەوەش خەڵکانێک هەن پیاو حەز دەکـات لـە کـاتی لێقەومـان و تەنگانەدا، لە نزیکی بن. کۆلیـا زۆر پەشـێوو پەرێشـان بـوو، هێنـدە بـەکوڵ

دەگریا لە تۆ وایە تێک چووە، بەڵام بەردەوام هەر خەریک بوو، دەهات،دەچوو، مشووری دەخوارد: چوو بە دووی پزیشکا و لەجیاتیی یەکێک سیانی دۆزییەوە، پاشان چوو بە دوای دەرمانسازا، ئەوجا برۆ زەروو پەیدا بکە. جەنەڕاڵ، کەمێک ژیایەوە، بەڵام وەهۆش نەهاتەوە. پزیشکەکان ڕایانگەیاند کە "حاڵی باش نییە و لەغەر غەرەدایە". ڤاریا و نینا ئەلکسندروڤنا بە دیاریەوە بوون و غافڵیان نەدەکرد. گانیا نیگەران و پەرێشان بوو، دەتگوت سام گرتوویەتی، نەیدەویست بچێتە نهۆمی سەرەوە، تەنانەت دەترسا بابی بدینێ. بە نیگەرانیەوە دەستەکانی تێک دەئالاند. لە میانەی گفتوگۆیەکی بێ سەرو بەرەوە، دەگەڵ میرزادەدا، توانی بڵێت: "چ نەگبەتیەکی گەورەیە. بە تایبەتیش لەم کاتەدا! ". میرزادە، بە خەیاڵی خۆی لە هێما و ئاماژەکانی ئەو قسانە گەیشت.

میرزادە، هیپولیتی لە ماڵی پتیتسندا نەبینی. لیبدیف شەوێ بە هەڵەداوان خۆی گەیاندە ئەوێندەر. لە بەیانیەوە، لەدوای "ڕوونکردنەوەکانی" ئەو بەیانیەوە، تا ئەم کاتە خەوتبوو. تەقریبەن مەستی بەری دابوو، هێندە بەکوڵ و دڵ بەدیار نەخۆشەکەوە فرمێسکی دەڕشت لە تۆ وایە برای دایکی و باوکیەتی. بە دەنگی بەرز خۆی سەرکۆنە دەکرد، بێ ئەوەی هۆیەکەی بڵێ. ناوبەناو داوێنی نینا ئەلکسندروڤنای دەگرت و گلەیی لە خۆی دەکرد، کە لەم کارەساتەدا هەر ئەو (لیبدیف) کەمتەرخەم و خەتابارە، خەتا هەر خەتای ئەوە و بەس... هەرچییەکی کرد بێ لە ڕووی فزوڵیەت و کونجکاویەوە بووە... "ڕەحمەتی.. (کەس نەیدەزانی بۆچی لیبدیف بە ڕەحمەتی ناوی جەنەڕاڵی دەبرد، لە کاتێکا هێشتا زندوو بوو.) پیاوێکی هێژاو بلیمەت بوو! " لیبدیف، تاکیدێکی زۆر زۆری لەسەر بلیمەتی جەنەڕاڵ دەکرد، لەوە دەچوو وا تەسەوربکات کە ئەم وشەیە لەم کاتەدا و بۆ ئەم ساتە زۆر گرینگ و بەسوود بێت. نینا ئەلکسندروڤنا، کە چاوی بە ڕاستگۆیی فرمێسکەکانی کەوت، بێ هیچ گلەیەک و بگرە بە زمانێکی میهر ئامێزەوە پێی گوت: "بەسە، بەسە، مەگری! خودا سەبر و هەدارت بدات، خوا دەت بەخشێت! " ئەم قسانەی نینا ئەلکسندروڤنا، کارێکی ئەوتۆیان لە

لیبدیف کرد، کە نەیتوانی تا کۆتایی شەو، نەخۆشەکە بەجێ بێڵێ (ڕۆژەکانی دواتریش، تاکو جەنەڕاڵ مرد، لە بەیانیەوە تا ئێوارێ لە ماڵی وان دەمایەوە). لیزاڤیتا پروکوفیڤنا، ئەو ڕۆژە دووجاران پەیکی نارد بۆ هەواڵپرسینی حاڵی پیرەمێرد. کاتێ میرزادە سەعات نۆی ئەو شەوە، خۆی بە هۆڵەکەی ماڵی یەپانچیندا، کە لەوساتەوە پڕ بوو لە میوان، کرد، لیزاڤیتا پروکوفیڤنا، بەگەرمی ئەحواڵی جەنەڕاڵی لێ پرسی، دیار بوو خەمی بوو. کە دۆتمیر پیلوکونسکایا لێی پرسی: "ئەم نەخۆشە کێیە؟ و نینا ئەلکسندروفنا کێیە؟" لیزاڤیتا پروکۆفیڤنا زۆر بە نەزاکەت و ویقارەوەوەڵامی دایەوە. میرزادە ئەو هەڵوێستەی زۆر خۆش لێهات. میرزادە بەخۆیشی لە وەڵامی لیزاڤیتا پروکوفیڤنادا زۆر بەجوانی و ڕێکوپێکی وەڵامی دایەوە. وەڵام و دەم و دووی هێندە پەسند بوو کە پاشان خوشکەکانی ئاگلایا باسیان کردبوو و گوتبوویان: "زۆر خاکیانە، بە دەنگی نزم، بێ هیچ جرت و فرتێک. مەنگ و بەویقار، بێ هیچ قسەیەکی زیادە، بێ ئەوەی بەخۆڕایی و بێهودە دەست بجووڵێنێ قسانی دەکرد. بە هەیبەتەوەوەژوورکەوت، زۆر سەرکەوتووانە بوو، جلەکانی ئاسایی، بەڵام شیک بوون! " هەڵبەتەوەکو دوێنێ دەترسا، نەک هەر لەسەر کاشیە لووسەکە نەخزی و نەکەوت!... بەڵکو بوو بە مایەی خۆشحاڵی و ڕەزامەندی ئامادەبووانیش.

میرزادەش لای خۆیەوە، پاش ئەوەی دانیشت و تەمەشایەکی دەوروبەری خۆی کرد، یەکسەر ئەوەی کەشف کرد کە ئەم کۆمەڵە، ئەو جروجاوەرانە نین کە ئاگلایا ڕۆحی لێ بردبوون، ئەو ڕمو◌َزن و دێوەزمانەش نین کە دوێشە و هاتبوونە خەوی. ئەمە یەکەم جاری بوو لە ژیانیا گۆشەیەکی ئەو شتە بەسام و هەیبەتە کەشف بکات کە پێیان دەگوت: "کۆمەڵگەی ئەرستۆکرات". لەمێژ بوو، بەگوێرەی نیاز و حەز و پرۆژەکانی خۆی، بە تاسەوە بوو کە خۆی بەم دنیا ئەفسووناویەدا بکات، بۆیە لە دڵی خۆیدا دەیپرسی کە ئاخۆ دەبێ یەکەم تێبینی و سەرنجی، یەکەم هەستی بۆ ئەم کۆمەڵگەیە و لەناو ئەم کۆمەڵگەیەدا چی و چۆن بێت. هەڵبەتە یەکەم بەرخوردی زۆر باش بوو. یەکسەر ئەو هەستەی لا دروست

بوو کە ئەم خەڵکە هەر بۆ ئەوە خوڵقاون کە لە دەوری یەک خڕببنەوە، ماڵباتی یەپانچین خۆیان بە خاوەن دەعوەت و زیافەت نازانن، هەموو هەر یەک خانەوادەن و هیچ "غەوارە"و بێگانەیەکیان تیا نییە و ئەویش لە ناو میواناندا نییە، بەڵکو لەنێو دۆستانی "دڵسۆز" دایە، لەپیاوێک دەچێت کە یەکێک بێ لەوان و دوای دابڕانێکی کورت، بەهەمان نەفەس و بیرو بۆچوونی ئەوانەوە دەگەڕێتەوە ناویان، هەڵس و کەوتی جوان و ناسکیان، سادەیی و ڕاستگۆیی ڕواڵەتیان، گشت ئەمانە جۆرە کاریگەرییەکی ئەفسووناویان لە دڵ و دەروونیا دروست کرد. نەیدەتوانی بە خەیاڵیش گومانی ئەوە بەرێ کە ئەم هەموو خۆشڕەفتاری، سادەیی، نەجابەت، هۆشمەندی و هەست بەرزی و ڕێزداری و ڕێز پەروەرییە، ڕەنگە تەنیا سیناریۆیەکی ڕواڵەتی بێ نێوەڕۆک بێ. وەکو دەڵێن ناوی زل و دێی وێران بێ. ئەلهەقی زۆربەی میوانەکانی، وێڕای ڕواڵەتی بە هەیبەت و شکۆیان، تا ڕادەیەکی زۆر خەڵکانی بێ ناوەڕۆک و بۆش و بەتاڵ بوون، بە هۆی خۆ پەسەندییەوە لەوە غافڵ بوون کە جگە لە ڕواڵەت و ڕواڵەتبازی هیچی تریان نەبوو، ڕواڵەت و ڕواڵەتبازیەکەشیان ئازایەتی خۆیانی تیا نەبوو، چونکە بە میرات لە پێشینانی خۆیانەوە بۆیان مابووەوە و لێیان بووبوو بە عادەت و خوو. میرزادە لە هەوەڵەوە بە ڕادەیەک ئەفسوون بووبوو، کە نەیدەویست بە خەیاڵیش بیر لە شتی وا بکاتەوە و ڕێگەی کەمترین گومان بە خۆی بدات. بۆ نموونەی بەچاوی خۆی دەیبینی کە پیرە مێردێکی بەشەخسیەت و پڕ هەیبەت کە لە تەمەنی باپیری ئەودا بوو، قسەکەی خۆی دەبڕی تا گوێ لە قسەی گەنجێکی باڕی ناپوختەی وەکو ئەو بگرێت. دەیبینی ئەو پیرە مێردە نەک هەر گوێی دەگرت، بەڵکو لەوە دەچوو ڕێزیش لە ڕاو بۆچوونەکانی ئەو بگرێت. زۆر بە لوتف و میهرەوە، بە ڕووخۆشی و ڕووگەشییەکی ڕاستگۆیانەوە مامەڵەی دەگەڵ دەکرد، وێڕای ئەوەی کەپێشتریش یەکیان نە ناسیوە و ئەمە یەکەم جارە کە یەکتر بدینن. لەوە دەچوو ئەم نەزاکەت و ناسکی و خۆش مەشرەبیە کاریان لە تەبع و تەبیعەتی هەستیار و گەرمی میرزادە کردبێت. یان ڕەنگە پێشوەختە لە

باری دەروونیەوە بۆ ئەم گەشبینییە ئامادە بووبێ یان خۆی ئامادە کردبێت.

ئەلهەقی پەیوەندی هەر هەموو ئەمانە، هەرچەندە بە ڕواڵەت دەگەڵ ماڵباتی یەپانچین و دەگەڵ یەکتریدا دۆستانە و توند و تۆڵ دەینواند، بەڵام لەڕاستیا لەوە کزتر بوو کە میرزادە لە هەوەڵەوە و لە سەرەتای تەعاروفکردنی دەگەڵیاندا، وێنای کردبوو. هەندێکیان بە هیچ جۆرێ ماڵباتی یەپانچینیان بە هاوتەراز و هاوتای خۆیان نەدەزانی. هەندێکی تریان لە ناخی دڵەوە ڕقیان لە یەکدی بوو. بۆ نموونە دۆتمیر پیلوکونسکایا بەو پیری و زورهانیەی خۆیەوە، بە درێژایی تەمەنی "ڕقی" لە ژنی ئەو پیرە مێرە بوو کە یەکێک بوو لە گەورە فەرمانبەرانی دەوڵەتی. کە ژنی پیرەمێرەکەش لە لای خۆیەوە حەزی بەچارەی لیزاڤیتا پروکوفیڤنا نەدەکرد.

ئەم "گەورە فەرمانبەرە" کە یەپانچین و خانم یەپانچینی لە سەرەتای گەنجایەتیانەوە، گرتبووە ژێر باڵی خۆی و پشتیوانی لێدەکردن، ئێستا میوانی شەرەف بوو. ڕێزێکی یەجگار زۆری لای یەپانچینەکان هەبوو. جەنەڕاڵ یەپانچین بە ئەندازەی خوایەک ڕێز و حورمەتی دەگرت. ئەوەندە لەلای گەورە و پیرۆز بوو، ئەگەر خوا نەخواستە، بۆ تاقە ساتێک، بە خەیاڵی خۆی بە هاوتەراز و هاوتای ئەو زانیبا، یان بەکەمتر لە زیوسی گەورەی خواکانی ئۆڵەمپی زانیبا، بە دڵ سەرزەنشتی خۆی دەکرد.

ژمارەیەکی دیکە هاتبوون کە چەندین ساڵ بوو یەکتریان نەبینیبوو، ئەمانە خەمسارد و بێ موبالات، لە ناخی خۆیانا هیچ سۆزێکیان بە ڕانبەر بە یەک نەبوو، ئەگەر نەڵێین دوژمن بوون، کەچی، خۆش و بێشێکی وا گەرموگوڕیان دەگەڵ یەکدا دەکرد، لە تۆ وایە دوێنێ لە کۆڕ و ئاهەنگێکی شاد و دۆستانەدا یەکیان دیتبوو.

بەهەرحاڵ، ئاهەنگەکە گەورە نەبوو، ژمارەی ئامادەبووان زۆر نەبوو. جگە لە دۆتمیر بیلوکونسکایا و "کەسێتییە پیرەکە" و ژنەکەی، کە بە ڕاستی پیاوێکی بەسام و هەیبەت بوو، پیاوێکی دیکەشی لێ بوو کە زۆر بەشەخسیەت دیار بوو، ئەمە جەنەڕاڵێک بوو بە لەقەبی بارۆن یان کۆنت و

ناوێکی ئەڵمانی هەبوو. پیاوێک بوو تا حەزکەی کەمدوو و بێدەنگ، گوایە شارەزایەکی زۆر گەورە لە کاروباری دەوڵەت، بە یەکێک لە زاناکان دەژمێردرا، لەو کارگێڕە دەگمەنانە بوو کە "جگە لە ڕووسیا" لە هەموو شتێکی دی دەزانن. لەو پیاوانە بوو کە هەر پێنج ساڵ جارێ قسەیەکی نەستەقی هێندە قووڵ و پڕ مانا دەکەن، کە دەنگ دەداتەوە و دەبێ بەوێردی سەر زاران و دەگاتەوە گوێی گەورە بەرپرسانی وڵات. گوایە یەکێکە لەو پایە بەرزانەی، دوای تەمەنێکی درێژ لە خزمەتی وەزیفیدا(تەمەنێکی بێ ئەندازە درێژ و گۆنگ) کە دەبن بە خاوەن پایەی زۆر بەرز، میداڵ و نیشانان و، سەروەت و سامانێکی زۆر، ئەوسا دەمرن، لەکاتێکا نەک هیچ کارێکی دیار و بەرچاویان نەکردووە، بەڵکو ڕقیانیش لەو جۆرە کارە دیار و بەرچاوانەیە.

ئەم جەنەڕاڵە، لەوەزیفەدا، سەرۆکی ڕاستەوخۆی جەنەڕاڵ ئیڤان فیدوروفیچ یەپانچینی لەمەڕ خۆمان بوو. بۆیە چ وەکو نمەکناسی و وەفاداری، چ وەکو تەبیعەت هەستی دەکرد، چاکەی زۆری سەرۆکەکەی بەسەرەوەیە و بەوەلی نیعمەتی خۆی دەزانی. هەرچەندە ئەم جەنەڕاڵە سوپاییە بە هیچ جۆرێ خۆی بەوە نەدەزانی کە چاکەی بەسەر ئیڤان فیدوروفیچشەوە هەبێ یان وەلی نیعمەتی ئەو بێت، تەنانەت ئەوەندە گوێشی نەدەدایە. ئەم پیاوەوێڕای ئەوەی لەو خزمەتانە ڕازی بوو کە ئیڤان فیدوروفیچ پێشکەشی دەکرد، کەچی ئامادە بوو، هەر کاتێک پێویست بکات و لەباربێ بێ چەندو چوون بیگۆڕێتەوە بە کەسێکی دی.

یەکێکی دی لە میوانەکان، کەسێتییەکی گرینگی پیر بوو، لەوە دەچوو بۆرە خزمایەتییەکی دەگەڵ لیزاڤیتا پروکوفیڤنادا هەبێت، بەڵام لە ڕاستیدا هیچ خزمایەتییەکی دوور یان نزیکی لەگەڵیا نەبوو. پیاوێکی خاوەن پلەو پایەی بەرز بوو، لە ماڵبات و تایەفەیەکی خانەدان و دەوڵەمەند بوو، کە تە و توندو تۆڵ و سەرحاڵ و شەنگۆڵ بوو. پیاوێکی دەماوەر و بەدەم و پل بوو، بەوە ناسرابوو کە لەوەزع و حاڵی ڕۆژ ناڕازی بوو، ڕەفتار و ئەتەکێتی بابایەکی ئەرستۆکراتی ئینگلیزی هەبوو، زەوق و سەلیقەشی هەر

ئینگلیزیانە بوو (بۆ نموونە حەزی لە خواردنی ڕو‌ستی ناسک دەکرد، حەزی لە گالیسکە و گاری گەورە بوو، حەزی لە خزمەتکارانی پیاو بوو بە جلکی فەرمیەوە). ئەمە پەیوەندییەکی خۆشی دەگەڵ کەسێتییە پیرەکەدا (گەورە فەرمانبەرەکە)دا هەبوو و، هەوڵی دەدا بە هەموو شێوەیەک سەرگەرمی بکات. لەو لاشەوە لیزا ڤیتا پروکوفیڤنا، خەیاڵ و بیرۆکەیەکی سەیر ختووکەی مێشکی دەداو وای خەیاڵ دەکرد لەوەیە ئەم بارۆنە کە (زۆر پابەندی فەزیلەت نەبوو گوایە ئەهلی هەوەس و مێباز بوو) لەوەیە ڕۆژێ لەڕۆژان بێتە خوازگاری ئەلکسندرا. لەخوار ئەو میوانە گەورە و دەستڕۆیانەوە، کۆمەڵە میوانێکی کەم تەمەنتر لەوان هەبوون، ئەمانەش خەڵکانێکی زۆر شایستە و بەسەنگ و ئیحتوبار بوون. لەوانە: میرزادە "س..."، یەڤگینی پاڤلوفیچ، میرزادە "ن..." کە کاتی خۆی لە ئەورووپادا هەر خەریکی ڕاوە ژن بووە. ئێستا تەمەنی لە دەوروبەری چل و پێنج ساڵیدا بوو، بالا بەرزێکی بەژن ڕێکوپێک بوو. یانی هێشتا بەشی خۆی قوت و قۆز بوو، دەم و زمانێکی گەرم و پاراوی پێوە بوو. تواناو بە هرەیەکی سەیری حیکایەت خوانی و چیرۆک گێڕانەوەی هەبوو. هەرچەندە سەروەت و سامانەکەی کەمیک لە کزی دابوو، هێشتا مەیلی ئەورووپای دا نە نابوو و زیاتر لە هەندەران دەژیا.

گروپی سێیەمی میوانەکان ئەوانە بوون، کە هێشتا نەگەیشتبوونە ناو (بازنە داخراوەکەی) کۆمەڵگەی ئەرستۆکراتەوە. یانی بە ئەرستۆکرات نەدەهاتنە ژماردن، بەلام جاروبار لە هەندێ بۆناندا، لە کۆڕو مەجلیسی توێژە بالاکانی کۆمەڵگەی ئەرستۆکراتا دەبینران، بۆ نموونە ماڵباتی یەپانچین بە خۆیان لەو توێژە کۆمەلایەتییە بوون. ماڵباتی یەپانچین. لەو ئاهەنگ و میواندارییە کەمانەدا کە سازیان دەکرد، بە حوکمی زەوق و سەلیقەی جوان و دروستی خۆیان بژاردەترین کەسێتی توێژی بالایان دەگەڵ بژاردەترین کەسێتی توێژی خوارتر یانی دەستەبژێری "چینی ناوەڕست" دەعوەت دەکرد و ئاهەنگێکیان ساز دەکرد بەدڵی هەموولایەک. خەڵکەکە لەم ڕووەوە زۆریان ستاییش دەکردن و دەیانگوت ماڵباتی

یەپانچین، خەڵکانێکن قەدرزان و سنووری خۆیان دەزانن، دیارەماڵباتی یەپانچین شانازیان بەو ڕەئی و بۆچوونەوە دەکرد.

یەکێک لە نوێنەرانی چینی ناوەڕاست کە دەعوەتی ئەو ئاهەنگە بوو، ئەندازیارێک بوو بە پلەی کۆلۆنێل، پیاوێکی جیددی و لە دۆستانی نزیکی میرزادە (س...) بوو، میرزادە (س...) بە ماڵباتی یەپانچینی ناساند بوو ولە ڕێگەی ئەوەوە تێکەڵاوی دەگەڵیاندا پەیدا کردبوو. ئەم پیاوە لە کۆڕ و قەرەباڵغیدا کەم دوو بوو، ئەنگوستیلەیەکی نگین درشتی ئاودار لە قامکی شادەیدا بوو، کە پێدەچوو دیاری شاهانە بێ، بە بۆنەی خزمەتەکانیەوە.

کەسیکی دیکەش لەنێو میوانەکاندا بوو کە ئەدیبێکی شاعیری ئەڵمانی نەژاد بوو، بەڵام بە ڕووسی شیعری دەنووسی. پیاوێکی زۆر بەڕێز، نزیکەی سی و هەشت ساڵێک دەبوو، ڕووی کۆڕ و مەجلیسی ئەرستۆکراتانی هەبوو، پیاوێک بوو خۆش دیمەن، ئەگەرچی بە دەموچاو خۆشەویست نەبوو ونەدەچووە دڵەوە. زۆر بایەخی بە جلوبەرگ و ڕواڵەتی خۆی دەدا، لە ماڵباتێکی ئەڵمانی بۆرژوا بوو، بەڵام جێگەی ڕێز و حورمەت بوو. پیاوێک بوو هەڵپەرست. خوا خوای بوو دەرفەتی بۆ هەڵکەوێ خۆی لە خەڵکانی ئەرستۆکرات و پایەبەرز و دەسڕۆ بەرێتە پێشێ و داڵدە و پشتیوانیان بەدەست بێنێ. کاتی خۆی کتێبی شاعیرێکی ئەڵمانی گەورەی لە زمانی ئەڵمانیەوە بۆ زمانی ڕووسی پاچڤە کردبوو، کتێبەکە چاپ بووبوو. زۆر زیرەکانە باسی دۆستایەتی خۆی دەگەڵ شاعیرێکی بە ناوبانگی ڕووسیدا دەکرد کە شاعیرەکە مرد بوو. (گەلێک لە نووسەران زۆر حەز دەکەن بەدرۆ خۆ بەوەوە ڕابنەن کە دەگەڵ فلان نووسەرانی گەورە و بەناوبانگا، بە تایبەتی ئەگەر مردبێ، دۆستایەتیان زۆر خۆش بووە) هاوسەرەکەی (شەخسیەتە پیرە پایەبەرزەکەوە) ئەم شاعیرەی بە ماڵباتی یەپانچین ناساند بوو وناسیاوی و تێکەڵاویان پەیدا کردبوو، ئەو خانمە بەوە بە ناوبانگ بوو کە داڵدە و پشتیوانی ئەدیبان و زانایانە.

ئەلهەقی توانیبووی، لە ڕێگەی خەڵکانی خاوەن پلەوپایەی گەورەوە کە

کاریگەری بەسەریانەوە هەبوو، مووچە بۆ یەک دوو نووسەریش ببڕێتەوە و دابین بکات. ئەم ژنە لە ڕاستیدا ئەو دەسەڵات و کاریگەری و سەنگەی هەبوو. لە تەمەنی چل و پێنجساڵیدا بوو (یانی لەچاو مێردەکەیدا کە پیرەمێر بوو، گەنج بوو) ژنێکی جوان بوو هێشتا (وەکو زۆربەی ئەو ژنانەی دەگەنە تەمەنی ئەو) حەزی لە جلکی فاخیر و ئاڵا و واڵا بوو. لە ڕووی هۆشوگۆشەوە مام ناوەندی بوو، شارەزایی و ڕۆشنبیری دەربارەی ئەدەبیات جێگەی گومان بوو، بەڵام زۆری حەز دەکرد خزمەتی ئەدیبان بکات و دالْدە و پەنایان بدات، بە قەد جلی جوان حەزی لەم کارە دەکرد. زۆر کتێب و بەرهەمی نووسراو و تەرجەمەکراوی پێشکەش دەکرا. دوو سێ نووسەر، دوای ئەوەی ئیزنیان لێ خواستبوو، ئەو نامانەیان، کە لەمەڕ بابەتی گرینگ بۆ ئەو نووسیبوو، بڵاو کردبووەوە.

ئەمە ئەو کۆمەڵگەیە بوو، کە میرزادە لێی بووبوو بە زیوی خالیسە یان زێڕی بێ غەلوغەش. جا بە ڕێکەوت هەر هەموو ئەمانە ئەو شەوە، زۆر خۆشحاڵ و شاد و شەنگوڵ، گەشبین و شاییان بەخۆ بوو. هەمووشیان لەوە بە ئاگابوون کە هاتنی هەر یەکێکیان، شانازیەکی گەورە بوو بۆ ماڵباتی یەپانچین، بەڵام میرزادە (مخابن) ئاگای لەم وردەکاریانە نەبوو. هەرگیز ئەوەی بەبیرا نەدەهات کە بۆ نموونە ماڵباتی یەپانچین لە نەخشە و پلانێکی وا گرینگدا، لە بڕیارێکی وا هەستیاردا کە ئایندەی کیژەکانی پێوە بەند بوو، زات نەکەن و ڕوویان نەیات کە ئەو، واتە لیون نیکولایوفیچ بە کەسێتییە پیرەکە، کە بەداڵدە و پەنای خانەوادەکەیان دەهاتە ژماردن، بناسێنن. لە کاتێکا لەوە دەچوو ئەم پیرەمێردە ئەگەر گەورەترین کارەسات بەسەر خانەوادەی یەپانچیندا بێت بەوپەڕی خەمساردی و بێ موبالاتی وەری بگرێت و هەر گوێی نەداتێ، کەچی ئەگەر کچەکەیان بەبێ پرس و ڕوایێژی ئەو، تۆ بڵێی بەبێ ڕەزامەندی ئەو بەشوو بدەن، نەک هەر زویر بێت، بەڵکو بەسووکایەتییەکی گەورەشی بۆ خۆی بزانێت، بەڵام میرزادە (ن..) ئەم پیاوە قۆز و مەحبووب، وریاو هۆشمەن، ڕووخۆش و زیتەڵە، قەناعەت و باوەڕی تەواوی هەبوو کە ئامادە بوونی ئەمشەوی ئەو لە هۆڵەکەی ماڵی یەپانچیندا، وەکو هەڵاتنی ڕۆژە. ئەوانی زۆر لە خۆی

بەکەمتر دەزانی. بە هۆی ئەمەوە بوو کە بەوجۆرە کراوە و بێپەروا، شادو شنگۆڵ. مامەڵە و ڕەفتاری دەگەڵ خانەوادەی یەپانچین دەکرد. زۆر چاک دەیزانی کە دەبێ لەو ئاهەنگ و شەونشینییەدا، شتێک بۆ سەرگەرمی و خۆشی ئامادەبووان بگێڕێتەوە و گەرموگوڕیەک بە ئاهەنگەکە ببەخشێت. زۆر باش خۆی بۆ گێڕانەوەی ئەو حیکایەتە ئامادە کردبوو، ئیدی قەریحەی کرابووەوە و ئیلهامی بۆ هاتبوو.

میرزادە لیون نیکولایوفیچ، دوای تۆزێک کە گوێی لەو حیکایەتە بوو کە ئەم گەنجە گێڕایەوە، هەستی کرد بە عەمراتی حیکایەتێکی وا جوان و خۆش و سادەی گوێ لێ نەبووە، بە ڕاستی هەر لە زاری دۆن جوانێکی وەکو میرزادە (ن..) دەهات، لە زاری وی جوان بوو. میرزادە نەیدەزانی، ئەم چیرۆکە، حیکایەتێکی زۆر کۆنە، ئەوەندە کاوێژ و، دووبارە کراوەتەوە کە تامی تیا نەماوە، مەگەر هەر خانەوادەی سادە و ساویلکەی یەپانچینەکان، بەشێکی جوان و تازەیان زانیبا، بە داهێنانی ڕاستگۆیانە و خۆ بە خۆی خەیاڵی دەماوەرێکی بە توانای هونەرمەندیان زانیبا، دەنا لە کۆڕو شەونشینیەکانی دیکەی شارا، نەک کەس گوێی لێنەدەگرت، بەڵکو مایەی بێزاری و بێتاقەتیش بوو. تەنانەت شاعیرۆکە ئەڵمانییەکەش، بە هەموو خاکێتییەکی خۆیەوە، دەیویست وا بنوێنێ کە هاتنی بۆ ئەو ئاهەنگە، شانازیەکی گەورەیە بۆ ئەم خانەوادەیە، بەڵام میرزادە تەنیا ڕووە دیار و باشەکانی ئەم هەڵوێستانەی دەبینی، ڕوەکانی دیکەی نەدەبینی. بۆ نەگبەتی ئاگلایاش پێشوەختە پێشبینی ئەم شتانەی نەکردبوو. ئەو شەوە یەجگار جوان و شەنگۆڵ بوو. هەرسێ کیژەکە جلکی زۆر جوانیان لەبەرکردبوو، بەڵام زێدە ڕۆییان نەکردبوو، تەسریحەی قژیان زۆر جوان و تازە بوو، پێشتر بەو تەسریحانەوە نەبینرابوون، ئاگلایا لای یەڤگینی پاڤلوفیچەوە دانیشتبوو وخەریکی گفتوگۆ و گاڵتە و سوعبەتان بوو لەگەڵیا. یەڤگینی پاڤلوفیچ، لە جاران بەویقار و سەنگینتر دەینواند، دیار بوو ئەمەی لەبەر میوانە ئەرستوکراتەکان بوو، بەڵام لەمێژ بوو لە کۆڕ و مەجلیسانی کۆمەڵگەی ئەرستۆکراتاندا ناسرا بوو، وەکو یەکێک لە خۆیان تەمەشایان دەکرد، ئەویش وێڕای ئەوەی گەنج بوو، ئەو مەجلیسانەی پێخۆش بوو،

هەستی بە ئاسوودەیی دەکرد. ئەو شەوە کە هات بۆ ئاهەنگەکە، نەوارێکی ڕەشی لە شەپقەکەی دابوو، ئەمە بووە مایەی سەرنج و ڕەزامەندی دۆتمیر بیلوکونسکایا. هەموو گەنجێکی سەر بە کۆمەڵگەی ئەرستۆکراتی لەم جۆرە بۆنانەدا، بە بۆنەی مردنی مامێکی وەهاوە ئەم کارەی نەدەکرد. لیزاڤیتا پروکوڤیفناش ئەمەی پێخۆش بوو، بەڵام سەرقاڵی و جەنجاڵی و مژولیەکی فرەی پێوە دیار بوو.

میرزادە بینی کە ئاگلایا یەک دووجاران زۆر بەوردی تەمەشای کرد، لەوە دەچوو لە میرزادە ڕازی بێ. وردەوردە دڵی کرایەوە و ئۆخژنی لە دڵ و دەروون گەڕا. لەپڕ هەستی کرد کە ئەو ترس و خەیاڵاتەی کە باڵی بەسەرا کێشا بوو (بەتایبەتی دوای گفتوگۆیەکەی لیبدیف)، تەنیا خەون و خەیاڵاتی ناواقیعی بوو،خەون و خەیاڵاتی نامـاقووڵ و بگرە کۆمیدی و پێکەنیناوی! (لە ڕاستیدا بە درێژایی ئەو ڕۆژە لە هەوڵ و تەقەللای ئەوەدا بووبوو کە قەناعەت بە خۆی بێنێ، کە ئەمە هەمووی خەیاڵاتی پووچە و فریان بەواقیع و ڕاستیەوە نیە) زۆر کەم قسەی دەکرد، لە سنووری وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارانە دەر نەدەچوو کە لێی دەکران. ئەنجام بە بێدەنگی دانیشت و کەوتە گوێگرتن، زۆر خۆشحاڵ و کەیفخۆش دیار بوو. بەرەبەرە جۆرە هاندەرێکی دەروونی لاچێ بوو، هەموو ترسێکی ڕەوییەوە و ئامادە بوو لە هەر ساتێکی گونجاودا بێتە قسان... بەڕێکەوت، بەوەڵامی پرسیارێک هاتە قسان، کە گەرم بوو لەوە نەدەچوو بەو زووانە...

پەراوێز:

* - "تۆماس مۆر...": دەڵێن تۆماس مۆر کە حوکمی ئیعدام درا، لە جەلادەکەی دەپاڕایەوە کە ئاگای لەڕیشی بێت. پێی گوت: "من خەمی ئەوەم نییە ڕیشم ئاسیوی بگاتێ، بەڵام بۆ تۆ گرینگە کە خەڵکی پێت بڵێن بە ڕاستی لە کارەکەیا کارامە و لێهاتووە، چونکە دەقی قەرارەکە ئەوەیە کە لەملم بدەیت نەک لە ڕیشم."

* - "ئەمە تاوانی خۆمە..." لە ئەسڵی دەقەکەدا بە فەرەنسیە.

**فەسڵی حەوتەم**

لەکاتێکا میرزادە، چاوانی بە جوانی و جەماڵی ئاگلایا زاخاو دەدا کە بەشادیەوە سەرگەرمی گفتوگۆ بوو دەگەڵ میرزادە (ن...)و یەڤگینی پاڤلوفیچ دا، گوێی لە کابرا بە تەمەنە ئینگلیز مەشرەبەکە بوو، لەوبەری هۆڵەکەوە، قسەی بۆ (گەورە فەرمانبەرەکە) دەکرد، لە گەرمەی قسەکانیا ناوی نیکولا ئاندریوفیچ پافلیچوفی هێنا. میرزادە بەلەز ڕووی کردە لای ئەوان و کەوتە پەیگیری گفتوگۆیەکەیان.

قسە و گفتوگۆیەکەیان دەربارەی سیستمی تازەی دابەشکردنی موڵکی موڵکدارانی دەڤەری "ز..." بوو کە هەراو هەنگامەیەکی زۆری نابووەوە. دیارە دەبێ قسەکانی کابرای ئینگلیزی مەشرەب مایەی پێکەنین بووبن، چونکە یارۆی "گەورە فەرمانبەر" کە بینی هاوڕێکەی بەو شێوەیە داخی دڵی خۆی هەڵدەڕێژێ، لە قاقای پێکەنینێکی بە کوڵی دا. کابرای ئینگلیز ڕەفتار، بە ڕوونی و ڕەوانی، بە کاوەخۆ قسەی دەکرد، بەئانقەست لە درکاندنی وشەکاندا دەمی خاو دەکردەوە، باسی ئەوەی دەکرد کە چۆن لە سایەی ئەم سیستمە تازەیەدا، ناچار بووە یەکێک لە موڵکە هەرە باشەکانی خۆی، لەم دەڤەرەدا، بە نیوە قیمەت بفرۆشێت، لە کاتێکا هیچ پێویستی بە پارەی کاش نەبووە، هەروەها چۆن لە سایەی هەمان سیستمدا ناچاربووە،

مولکێکی دیکە، کە بیابانێکی کاکی بە کاکی بێ خێرو بێرە و لە دادگادا مەحکەمە و دەعوای لەسەرە هەڵگرێتەوە، مولکێ کە زیانی هەیە، خێری نییە. "جا بۆ ئەوەی خۆم لە گێچەڵی دەعوایەکی دیکە لەسەر ئەو زەویانەی لە میراتی بافیلچوف ماوە، بپارێزم وام بەباش زانی ئەسڵەن دەستبەرداری ئەو بەشە میراتە ببم. بەم پێیە ئەگەر یەک دوو میراتی لەو میراتە بە گێچەڵانەم پێ ببڕێ، بە جارێ ماڵم وێران دەبێ و دەکەومە سەر ساجی عەلی. لە کاتێکا قەرار بوو سێ هەزار (هیکتار) زەوی دەرەجە یەکەم پێ ببڕێ! "

ئیڤان فیدوروفیچ، دیقەتی دا کە میرزادە زۆر بە جیددی گوێی بۆ ئەو گفتوگۆیە هەڵخستووە، لیی نزیک بووەوە و بە ئەسپایی بە گوێیدا چپاند:

– گوێ بگرە... ئیڤان پترۆفیچ، خزمایەتی دەگەڵ نیکولا ئاندریوفیچ بافیلیوفیچ هەیە... وابزانم تۆ تاقیبی خزمەکانی ئەوت دەکرد، وانییە؟

ئیڤان فیدوروفیچ، تا ئەو کاتە دەربەست لە خزمەتی جەنەڕاڵی سەرۆکی ڕاستەوخۆی، خۆیدا بوو، لەبەر ئەو ئاگای لە کەسی دی نەبوو، بەڵام لەپڕو تۆزێ لەمەپێش هەستی کرد کە لیون نیکولایوفیچ بە تەواوەتی فەرامۆش کراوە، بۆیە هەستی بە جۆرە نیگەرانییەک کرد. کە بینی میرزادە هەندێ دوورە پەرێزە، ویستی بیهێنێتە ناو گفتوگۆکانەوە جارێکی دی بە شەخسیاتەکانی ناساند و خستیە بەر سەرنجی وان. کە نیگای ئیڤان فیدوروفیچ لە نیگای ئیڤان پترۆفیچی ئینگلیز مەشرەب هەڵەنگوت، هاتە قسە و گوتی:

– ئەمە لیون نیکولایوفیچە کە دوای مردنی دایک و باوکی، نیکولا ئاندریوفیچ پاڤلیچوف گرتیە خۆی و خستیە ژێر باڵی خۆی. ئیڤان پترۆفیچ گوتی:

– خۆ.. ش.... حاڵم. من تۆم جوان لەبیرە. ئێستا کە ئیڤان فیدوروفیچ تەعاروفی پێکردین، یەکسەر ناسیمیتەوە. زۆر نە گۆڕاویت، ئاخیرجار کە تۆم بینی، تەمەنت هەر دە، یازدە ساڵ دەبوو. کەچی زۆر نەگۆڕاویت...

میرزادە، بەنیمچە سەرسامیەک پرسی:

- بە منداڵی منت دیتووە؟

ئیڤان پتروفیچ لەسەر قسەکەی ڕۆیشت:

- دەمێکە، زۆر دەمێکە!... لە زلاتوفرخۆفۆ بوو، یانی لەو شوێنەدا کە تۆ لە ماڵی دۆتمامەکانی من دەژیای. من ئەو سەردەمە زوو زوو بۆ ئەوێندەر دەچووم... تۆ بیرت نایەت؟ ڕەنگە بیرت نەیەت. تۆ ئەو کاتە نەخۆشییەکت لەگەڵا بوو، ئێستا نازانم چی بوو... ئێستاش لە بیرمە کە بینیمیت زۆر سەرم سوورِما...

میرزادە، بە گەرمی سەری بۆ لەقاند و گوتی:

- من هیچ شتێکم بیر نایەت!

ئیڤان پتروفیچ، زۆر بەجیددی چەند وشەیەکی تری لەو بارەیەوە گوت کە زۆر کاریان لە میرزادە کرد. گوتی ئەو دوو پیرە کچەی کە خزمی پاڤلیشچوفی ڕەحمەتی بوون و لە موڵکەکەی ئەوا، لە زلاتوفرخوفو دەژیان و ئەرکی بەخێوکردنی میرزادەیان پێ سپێردرا بوو، ئەوانە لە هەمان کاتا خزمی ئەمیش بوون (خزمی ئیڤان پتروفیچ). ئیڤان پتروفیچش وەکو خەڵکانی دی سەری لەوە سوورِما بوو کە بۆچی پاڤلیچوف ئەو هەموو بایەخەی بە میرزادە دەدا، بۆچی خۆی کردبوو بە سەر وەگردی ئەو کورە و خستبوویە ژێر پەڕ و باڵی خۆی. " ئەوەی ڕاستی بێ ئەوساکە ئەقڵم بەوە نەدەشکا پرسیاری ئەوە بکەم". ئیڤان پتروفیچ وای گوت، بەڵام بەو قسەیە سەلماندی کە زەینێکی زۆر ڕۆشنی هەیە، چونکە تەنانەت ئەوەشی بیرمابوو کە دۆتمامە گەورەکەی، واتە مارتانیکیتشینا، زۆر لەگەڵ میرزادەدا سەختگیر بوو، ئیڤان پتروفیچ لە سەری ڕۆیشت و گوتی: "تەنانەت جارێکیان لە سەر تۆ لەگەڵی بەشەڕ هاتم، چونکە شێوازی تەربێت و پەروەردەکردنەکەیم بەدڵ نەبوو.. ئاخر ماقوولە منداڵێکی نەخۆش بە زەبری شەلاقان پەروەردە بکرێت... باوەڕ دەکەی... بەڵام خوشکە چکۆلەکەی واتە ناتالیا نیکیتشینا، بەپێچەوانەوە، ڕۆحی بەسەر ئەو منداڵە داماوەوە دەردەچوو، لەڕادەبەدەر دەگەڵیا میهرەبان بوو..." ئیڤان پتروفیچ لەسەری ڕۆیشت: "دەبێ ئیستا هەر دووکیان لە دەڤەری (ز)دا بژین، چونکە

پاڤلیچوف مولکێکی چکۆلە، بەڵام زۆر نایابی لەوێندەر بە میرات بۆ جێ هێشتبوون، هەرچەندە دڵنیانیم کە مابن. پێم وایە مارتا نیکیتشینا بەتەمابوو بچێتە دێر، بەڵام لەوەش دڵنیا نیم. وابزانم ئەو قسەیەم دەربارەی ژنێکی دی بەرگوێ کەوت.. ئا... بیرم کەوتەوە... دەربارەی ژنی دکتۆرێک بوو"..

میرزادە، بەدەم گوێگرتنەوە، پڕ دەبوو لە نەشە و سۆز و میهرەبانی و، چاوەکانی بریقە بریق، لە شادیدا دەدرەوشانەوە. ئەویش لای خۆیەوە زۆر بە گەرمی ڕایگەیاند کە هەرگیز لە خۆی خۆش نابێت، چونکە بەدرێژایی ئەم شەش مانگە لە ناو وڵاتا سووڕاوەتەوە و قەت بیری لەوە نەکردووەتەوە، دەرفەتێ بەدەست بێنێ و سۆراخێکی کۆنە پەروەردەکارەکانی خۆی بکات و سەرێکیان بدات. هەموو ڕۆژێ نیازی بووە ئەو کارە بکات، بەڵام هەر جارەی لەبەر هۆیەک بۆی ڕێنەکەوتووە، بەڵام ئەم جارەیان بەجیددی بڕیاری داوە کە بڕوات بۆ دەڤەری (ز)... میرزادە لەسەری ڕۆیشت: "کەواتە تۆ ناتالیا نیکیتشینا دەناسیت؟ کە ژنێکی چاکە، فریشتەیە! ئەدی مارتا نیکیتشینا بۆ ناڵێ ی... ببورە ئەگەر بڵێم ڕەنگە جەنابت دەرهەق بە مارتا نیکیتشینا، هەندێ دەست داگرتبێ... دروستە سەختگیر بوو، بەڵام نەهەقی نەبوو، ئاخر کێ دەگەڵ منداڵێکی گەمژەی وەکو ئەوسای مندا، تاقەتی نەدەچوو؟ (ها ها! ).. ئەمجا.. تۆ خۆت ئەو سەردەمانە بەچاوی خۆت منت دیوەو... بەڵام بۆچی من تۆم بیر ناکەوێتەوە؟ ئەمە خۆی لە خۆیدا نیشانەی ئەوە نییە کە من... ئاهـ.. پەنا بەخوا! یانی بە ڕاستی تۆ خزمی نیکولا ئاندریوفیچ پاڤلیچوفیت؟

ئیڤان پترۆفیچ، بەدەم بزەیەکەوە، سەراپای میرزادەی دایە بەر نیگاو گوتی:

- ئا.. ئۆ.. دڵنیات دەکەم!

- ببورە... ئەو قسەیەم بۆ ئەوە نەبوو کە خوا نەخواستە گومانم لە قسەکانت هەبێ! .. کێ هەیە بتوانێ، (ها ها!) زەڕەیەک گومانی هەبێ؟ بەڵێ، تاقە زەڕەیەک؟ (ها ها! ). مەبەستم ئەوە بوو کە بڵێم، ڕەحمەتی نیکولا ئاندروفیچ پاڤلیچوف پیاوێک بوو پیاوانە، دڵپاک، جا جوامێر! دڵنیات

دەکەم...

ئادیلاید، بۆ سبەینێ بە دەزگیرانەکەی، میرزادە (س..)ی گوت: "نالێم میرزادە هانکە هانکی پێکەوتووە، بەڵام لە خۆشیا ئەوکی گیرا بوو."

ئیڤان پتروفیچ بەپێکەنینەوە گوتی:

- باشە بۆچی نابێ من خزمی پیاوێکی دڵپاک و دڵاواو جوا... مێربم؟

میرزادە، شپرزە بوو، هەستی بە شەرمێکی زۆر کرد، خێرا و بەگەرمی هەڵی دایە:

- من... من... ئەمەش گەوجێتیەکی دی... ئەمەش قۆرپیاتێکی دی... چونکە من.. من.، چونکە من.. باوەربکە تەتەڵەی زمان بووا من نایڵێم تۆ بیڵێ، من لەچاو ئەم شتانەدا دەکەمە چی، بە تایبەتی بە بەراورد دەگەڵ ئەم کارە گەورانەدا؟ بە بەراورد دەگەڵ جوامێرێکا بەو دڵاواییە! خوا شایەدە پیاوی وەکو خۆی نەبووە، لە هەموو ڕوویەکەوە... وانییە؟ وانییە؟

سەراپای میرزادە دەلەرزی. کەس نەیدەزانی بۆچی وا هاتبوە جۆش و، ئەم هەموو سۆزو گودازە باڵی بە سەراکێشا بوو، کە هیچ دەگەڵ ڕەوتی گفتوگۆیەکەدا تێکی نەدەکردەوە، کەس ئەمەی بۆ هەڵنەدەهات، بەڵام ئەوەندە هەیە دەتوانین بێ چەندو چوون بڵێین، بە جۆرێ هەڵچووبوو، کە لەناخی دڵەوە، زۆر ڕاستگۆیانە دەیویست سوپاس و منەتباری و ئەمەکداری خۆی لەهەنبەر کەسێک و سەبارەت بە شتێک دەرببڕێ، تەنانەت ئەگەر بەرانبەر بە هەموو ئامادەبوانیش نەبێت، بەرانبەر بە ئیڤان پتروفیچ بێ. میرزادە، شادی لێدەچۆرا. ئیڤان پتروفیچ زیاتر لێی ڕاما. کابرای "گەورە فەرمانبەر"ش بەوردی نیگای دەکرد. دۆتمیر بیلوکونسکایا بەوپەڕی تورەیی و بێزاری تەمەشای دەکرد و لێوی خۆی دەکرۆشت. میرزادە (ن..)و یەڤگینی باڤلوفیچ، میرزادە(س..)و کیژەکان و هەموو ئامادەبووان، قسەکانیان بڕی و کەوتنە گوێگرتن. ئاگلایا زۆر بەخەمەوە بوو، ترسی دنیای لێهاتبوو، لیزاڤیتا پروکوفیڤنا بە ڕاستی خوای نەمابوو. ڕەفتاری دایک و کچەکانی سەیر بوو: ئەوان بەخۆیان پێشنیازیان کردبوو کە میرزادە لە شەونشینی یەکەدا کڕوکپ و بێدەنگ بۆ خۆی لەلایەکەوە

دانیشێت، بەڵام کە دیقەتیان دا، بە تاقی تەنیا لە سووچێکا دانیشتووە و زۆر بەکەیف و بەدەماخە، یەکسەر ترسیان لێنیشت، تەنانەت ئادیلاید، دەیویست لەو سەری هۆڵەکەوە، بێ خشپە بە ناو خەڵکەکەدا بێت بۆلای و بیبات بۆ لای گروپەکەی خۆیان کە میرزادە (ن..)شیان دەگەڵا بوو، یانی بیبات بۆلای گروپەکەی دۆتمیر بیلوکونسکایا، بەڵام کە هەنوکە بە کەماڵی ئارەزوو مژولی قسەکردن بوو، ترس و نیگەرانییەکەیان زیاتر بوو.

ئیڤان پتروفیچ، زۆر بەجدی، بێ هیچ بزە و پێکەنینێک گوتی:

- تۆ ڕاست دەکەی، پیاوێکی یەجگار جوامێر و دلاوا بوو... بەڵێ لە هەموو ڕوویەکەوە، مرۆڤێکی بێ وێنە بوو.

دوای هەڵوەستەیەکی کورت لەسەری ڕۆیشت:

- پیاوێکی باش و شایستە و بە ئیحتوبار.

دوای تۆزێکی دی گوتی:

- یانی بە ڕاستی شایستەی هەموو ڕێزێک بوو. بە ڕاستی پێم خۆشە کە دەبینم تۆ لای خۆتەوە...

) گەورە فەرمانبەرەکە) وەکو بڵێی شتێکی وەبیر خۆی دێنایەوە، پرسی:

- پافلیچوف ئەو پیاوە نەبوو کە حیکایەتێکی تایبەتی... لەگەڵ قەشەیەکا... لەگەڵ قەشە.. ناوەکەیم بیرچووەوە، بەڵام کیشەکەی کاتی خۆی هەراو هەنگامە و ژاوەژاوێکی زۆر نایەوە؟!

ئیڤان پتروفیچ گوتی:

- قەشە گۆرۆی یەسوعی بوو. بەڵێ بەرزترین و شایستەترین پیاوانی کۆمەڵگەش ئەو پێشهاتانەیان لێ ڕوودەدات! بەڵام پافلیچوف خانەدان و ئەسڵزادە، دەوڵەمەند و بە ڕاستی پیاوێکی پیاوانە بوو. فەرمانبەری دەربار بوو... ئەگەر لەوەزیفەیا بمابایەوە لەوە بوو کە... بەڵام لەپڕ وازی لەم وەزیفەیە و هەموو شتێک هێناو چووە سەر مەزەبی کاتولیکی و بوو بە یەسوعی، جا بەچ شەوق و زەوقێکەوە! . ئەلهەقی لەکاتێکی باشدا مرد. بەڵێ کە مرد هەموو کەس وایان دەگوت.

میرزادە، واقی وڕمابوو، هەرچی دەکرد جڵەوی خۆی پێنەدەگیرا، بە

ترسەوە هاواری کرد:

- بافیلچوف... بافیلچوف بوو بە کاتولیک؟ مەحاڵە!

ئیڤان پتروفیچ، بەدڵنیایی و بەکاوە خۆ گوتی:

- چۆن "مەحاڵە"؟ میرزادە گیان پێویست بە هەڵچوون ناکات. دەبێ دان بەوەدا بنەی کە... بەڵام تۆ زۆرت ڕەحمەتی خۆشدەوێ... بە ڕاستی پیاوێکی دڵپاک و خۆشباوەڕ بوو، من پێم وایە هەر ئەم دڵپاکیە بوو کە کردیە کارێک ئەو قەشە فێڵبازە تەفرەی بدات. تۆ وەرە لە من بپرسە، کە لەدوای ئەو مەسەلەیە چ دەردە سەری و کێشەیەکم تووش بوو... بە تایبەتی دەگەڵ هەمان گورودا!

ئیڤان پتروفیچ، ئاوڕی لە پیاوەکە دایەوە و لە سەری ڕۆیشت:

- باوەڕ بفەرموو دەیانویست ئیعتراز لەوەسیەتنامەکەشی بگرن و ئیدیعابکەن کە بەشە میراتیان دەکەوێ. ئەوە بوو من ناچار بووم کە پەنا بەرمە بەر توندترین ئیجرائات- تا بیان هێنمەوە سەر ئەقڵ- چونکە لەم کارانەدا زۆر لێزان بوون، دەیانزانی چی دەکەن. بە ڕاستی ئەوانە خەڵکێکی سەیرن! بەڵام.. شوکر بۆ خوا، کێشەکەمان لە مۆسکۆ بوو، بۆیە یەکسەر خۆم گەیاندە کۆنت و ئاقڵمان کردن.

میرزادە، دووبارە هاواری کرد:

- ناتوانی تەسەور بکەی کە چەند دڵم گوشرا!

- بەداخەوەم، بەڵام ئەوەی ڕاستی بێ ئەمانە هیچی گرینگ نین، زوو لەبیر دەچێتەوە، من لەم ڕووەوە دڵنیام.

ئەوجا دیسان ڕووی کردەوە پیرەمێردەکە و لە سەری ڕۆیشت:

- وەکو دەڵێن کۆنتێس ک، هاوینی ڕابردوو، لە هەندەران چووەتە دێرێکی کاتولیکی. لەوەدەچێ هاولاتیانی ئێمە کە دەکەونە چنگی ئەو تەڵەکەبازانە، ئیدی هیچ توانایەکی بەرگریان نامێنێ، بە تایبەتی لە هەندەران.

کابرای پیرەمێرد، بە متمانەوە گوتی:

- من پێم وایە هۆیەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سستی خۆمان. جگە لەوەی

شێوازی تەبشیری ئەوانەش یەجگار ناسک و کاریگەرە... بەخۆشیان خەڵکانێکی بە سام و هەیبەت و بەشەخسیەتن، دەزانن چۆن دەتترسێنن و دڵت نەرم دەکەن و دەتهێننە ڕەدا، لەمەدا بە ڕاستی وەستان. لێتانی ناشارمەوە ئەمەیان لەگەڵ خودی خۆمان کردووە. ترساندومیان، ئەمەیان لەساڵی ١٨٣٢دا، لە ڤینا لەگەڵ کردم، بەڵام من ملم نەدا، خۆم لەچنگیان دەرباز کرد، بە هەڵاتن هەڵهاتم. ها ها! باوەڕبکەن هەڵاتم!...

لێرەدا دۆتمیر بیلوکونسکایا، لەپڕ هەڵی دایە و گوتی:

– برادەری ئازیز ئەوەی من بیستوومە، تۆ هەنگێ دەگەڵ ژنیکی جواندا، لەگەڵ کۆنتیس لیڤیتسکی دا، لەپێناوی ئەو ژنەدا لە ڤێناوە بۆ پاریس هەڵاتبوویت و، دەستبەرداری خزمەت بوویی، دەنا خۆدزینەوە و دوورکەوتنەوە لە یەسوعیەت لە ئارادا نەبووە.

پیرەمێر، کە ئەو یادگارییە خۆشەی بیرکەوتەوە، بزەیەکی بۆ کرد و بەرسڤی دایەوە:

– ئێ... مەسەلەکە هەر دەچێتەوە سە یەسوعیەتەکە، چونکە ئەم مەسەلەیەش پەیوەندی بە یەسوعیەتەکەوە هەبوو.

ئەوسا، ڕووی کردە میرزادە کە بەواقی وڕەوە گوێی هەڵخستبوو وحایرو سەرسام دەمی کردبووەوە، بە زمانیکی شیرین و نەرمەوە گوتی:

– لەوە دەچێت تۆ کەسێکی زۆر مەزەبی بیت، کە ئەمە لەنێو گەنجانی ئەمرۆدا زۆر کەمە.

دیار بوو کە پیرەمێرد، حەزی دەکرد زیاتر میرزادە بناسێت و مەبەستی تایبەتی خۆی لەم بایەخ پێدانەیدا، هەبوو.

میرزادە لەناکاودا گوتی:

– بافیلچوف، پیاوێک بوو ئاقڵ و هۆشن. مەسیحیەکی بێ غەلوغەش و پایەدار. چۆن دەیتوانی بچێتە سەر مەزەبێک... کە غەیرە مەسیحی یە؟ خۆ کاتولیکەری ڕۆمی، فری بە مەسیحیەتەوە نییە!

بەدەم ئەو قسانەوە، چاوانی دەدرەوشانەوە، بە جۆرێ چاوی بە دەوروبەری خۆیا دەگێڕا، وەک ئەوەی بیەوێ بە نیگایەک هەر هەمووان

بدینێ.

پیرەمێرد، نیگایەکی پڕ سەرسامی، ئیڤان پتروفیچی کرد و لەبن لێوانەوە گوتی:

- ئەمە، دەکاتە توندڕەوی.

ئیڤان پتروفیچ، لەسەر کورسییەکەی وەرچەرخاو ڕوو لە میرزادە گوتی:

- بۆچی کاتولیک فڕی بە مەسیحیەتەوە نییە؟ ئەگەر مەسیحیەت نەبێ ئەدی چییە؟

میرزادە بەوپەڕی هەڵچوون و زۆر بەتوندی گوتی:

- یەکەم مەزەبێکی غەیرە مەسیحیە. دووەم مەسیحیەتی ڕۆمانی بەلای منەوە لە خوانەناسی خراترە! بەڵێ ئەمە بۆچوونی منە! خوانەناسی تەنیا بانگەشە بۆ نەهلیزم دەکات، بەڵام کاتولیکیەتی ڕۆمانی لەوەش هێوەتر دەڕوات: بانگەواز و بانگەشە بۆ مەسیحێک دەکات، شێواو، قەڵب، ساختە و دەستکرد، کە ڕێک پێچەوانەی مەسیحی ڕاستەقینەیە. باوەڕبکەن من زۆر دەمێکە گەیوومەتە ئەو قەناعەتە و زۆریش عەزابم پێوە کێشاوە.. کاتولیکیەتی ڕۆمانی، قەناعەتی وایە کە کڵێسا بەبێ مومارەسەی دەسەڵاتی سیاسی، بەبێ هێزێکی پتەوی دەوڵەترانی، ناتوانێ خۆی بگرێت و بمێنێ. بەئاشکرا هاوار دەکات: "ناتوانین"* . بە ڕای من کڵێسای ڕۆمانی ئایین نییە، بەڵکو درێژەی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی ڕۆژاوایە. هەموو شتێکی لەخزمەتی ئەو بیرۆکەیەدایە، تەنانەت دین و باوەڕەکەشی. پاپا قەڵەمرە و و تەخت و تاجی دنیایی بۆ خۆی کۆنترۆڵ کردووە و شمشێری خۆی لێهەڵکێشاوە. ئیدی لەوساوە هەروا هاتووە و هیچ شتێک نەگۆڕاوە، لە سایەی شمشێردا نێرەنگ، درۆ، فریو، خورافات و تورەهات پەرستی زیادی کردووە. ئەوانە گەمەیان بە پیرۆزترین، پاکترین، ڕاستگۆترین، گەرمترین هەست و سۆزی جەماوەری خەڵک کردووە، بەڵێ گەمەیان بە هەموو شتێک کردووە، هەموو شتێکیان لەپێناوی سەروت و ساماندا، لەپێناوی دەسەڵاتێکی ئەهرەیمەنی کاتیدا، فرۆشتووە. ئایا ئەم باوەڕە پێچەوانە و دژی مەسیحیەت نییە؟ ئیدی

چۆن كاتولیكیەت نابێ بەسەرچاوەی خوانەناسی؟ خوانەناسی لە خودی كاتولیكگەری ڕۆمانیوە سەری هەڵداوە! ئەسڵەن خوانەناسی لە كاتولیكیەتەوە دەستی پێ كردووە، بۆچی ئەوانە بە خۆیان باوەڕیان هەبووە؟ ئیدی خەڵكەكەیان بە جۆرێ بێزاركرد كە تەواو پشتیان كردە ئایین و خوانەناسی كەوتە پەرەسەندن. خوا نەناسی بە هۆی درۆ و دەلەسە و بێ ئەخلاقی ئەوانەوە پەرەی سەند. خوانەناسی! خوانەناسی لە وڵاتی ئێمەدا تەنیا لەنێو هەندێ توێژی زۆر كەمی كۆمەڵگەدا دەبینرێ،، یەڤگینی پافلوفیچ گوتەنی لەنێو توێژە " بی ڕەگوڕیشەكاندا" دەبینرێ، كە ئەلهەقی ناوێكی پڕ بەپێستی لێناون، بەڵام لەوێندەر، لە ئەوروپا، جەماوەرێكی زۆری خەڵكی ئیمانیان لە دەست داوە و ڕۆژ بە ڕۆژ لە زیادبووندان. بێ ئیمانی جارانیان بە هۆی نەزانی و درۆوە بوو، بەڵام بێ باوەڕی ئێستایان زادەی نەفرەت و بێزاریە لە كڵێسا و لە مەسیحیەت!

میرزادە، هەڵوەستەیەكی كرد تا نەفەسێك تازە بكاتەوە،چونكە زۆر بەپەلەو یەكبینە قسانی كرد، ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا بوو و هانكە هانكی پێكەوتبوو. ئامادەبووان بە سەرسامیەوە تەمەشایەكی یەكیان كرد. ئەنجام پیرەمێرد كەوتە پێكەنین. میرزادە "ن..." چاویلكەكەی دەرهێنا، لە چاوی كرد و كەوتە ڕوانینی میرزادە لیون نیكولایوفیچ. شاعیرۆكە ئەڵمانییەكە، كە تا ئەو كاتە بە بێدەنگی لەسووچێكا خۆی كزكردبوو، بەدەم بزەیەكی تەوسامێزی دژمنانەوە، هەستاو لە مێزەكەی وان نزیك بووەوە.

ئیڤان پتروفیچ، كە تا ڕادەیەك پەستی و بێزاری پێوە دیار بوو. بە دەنگێكی كشدار گوتی:

- تۆ.. ز.. ۆ.. ڕ، مو.. با.. لە.. غە دەكەی، ئەم مەزەبەش پەیڕەوانێكی زۆری هەیە.. پیاوی بە حورمەت و شایستە و زاناو دانای گەورەی تیایە...

- من باسی پەیڕەوانی ئەم مەزەبەم نەكردووە. باسی نوێنەرانی ئەم مەزەبەم نەكردووە. باسی كڵێسای ڕۆمانیم وەكو خۆی كردووە، باسی ڕۆمام كرد. ماقوولە مەزەبێك بە یەكجارەكی لە ناو بچێ و نەمێنێ؟ من شتی وام هەرگیز نەگوتووە!

- ڕاست دەکەی، بەڵام ئەوەی تۆ دەیڵێی، هەموو کەس دەیزانن و پێویست بە باس کردن ناکات. ئەمە جگە لەوەی... ئەمە کاری زانستی ئایینناسی و خواناسیە...

- نا، نا، تەنیا کاری زانستی ئایینناسی و خواناسی نییە، دڵنیابەوانییە! بەڵکو زۆریش پەیوەندی بە ئێمەوە هەیە، ڕاستەوخۆ ڕووی ئێمەش دەگرێتەوە. جا هەڵەکەی ئێمە لەمەدایە: هێشتا نەگەییوینەتە ئەو قەناعەتەی کە ئەمە هەر مەسەلەیەکی لاهوتی ڕووت نییە! ئەوەش بزانن کە سوسیالیزمیش بەرەنجامی کاتولیکە. سویالیزمیش، وەکو خوانەناسی برای، لە نائومێدیەوە سەری هەڵداوە. کار بۆ وەرگرتنی ئەو دەسەڵاتە ڕوحییە دەکات کە ئایین و مەزەب لە دەستی داوە، کار بۆ شکاندنی تینویەتی دەروونی بەشەری دەکات، ئاشتی لە مەسیحدا نابینێ، بەڵکو لە زەبروزەنگدا دەی بینێ! جا لێرەدا دەبینین ئەمانەش، بە هەمان نەفەسی کاتولیلکگەرییەوە، گەرەکیانە ئازادی بە هۆی عونفەوە دابینبکەن، گەرەکیانە یەکێتی بە زەبری شمشێر و خوێن وەدی بێنن! "نابێ ئیمانت بەخوا هەبێ، نابێ مولک وماڵی تایبەتیت هەبێ، نابێ پیاو هەر خەمی خۆی بێ، یان برایەتی یان مردن، ئەگەر دوو ملیۆن سەر بێتە بڕین! " لەکۆنەوە گوتراوە: "بەکارەکانیانا دەیان ناسن! " وا خەیاڵ نەکەن کە هەر هەموو ئەمانە زەرەریان بۆ ئێمە نەبووە، هیچ هەڕەشەیەکیان بۆ سەر ئێمە نییە! نەخێر... دەبێ فریا بکەوین، کار بکەین.. بەو پەڕی تواناوە کاربکەین. پێویستە کە مەسیحەکەمان، ئەو مەسیحەی ئێمە پاراستوومانە و ئەوان هەر گیز نەیان توانیوە بیناسن، پێویستە ئەو مەسیحە دووبارە لەهەنبەر ڕۆژئاوادا، بگەشێتەوە، بدرەوشێتەوە. پێویستە ڕووبەڕوویان ببینەوە، نەک کۆیلە ئاسا چەشەی یەسوعیەتی وان بخۆین و بە کەماڵی ئارەزوو ڕاومان بکەن، نا.. پێویستە ژیارو شارستانیەتی ڕووسی خۆمانیان لە ناوا بڵاوبکەینەوە. با ڕێگە نەدەین لە بەینی خۆمانا، وەکو توزێ لەمەپێش یەکێک گوتی، بڵێین شێوازی وان لە بڵاوکردنەوەی ئایین دا شێوازێکی ناسکە...

ئیڤان پتروفیچ، کە بەوپەڕی نیگەرانیەوە دەیڕوانییە دەوروبەری خۆی

و تەنانەت جۆرە ترسێکیشی پێوە دیار بوو گوتی:

– بە یارمەتیت، بە یارمەتی خۆت... هەڵبەتە بۆچوونەکانت مایەی ستاییشن، پڕن لە هەستی نیشتمانپەروەری، بەڵام زۆر توندن توند، باشتر وایە لەوەی پتر لەسەر ئەم مەسەلەیە نەڕۆین...

– نەخێر، هیچ توندیەکی تیانیە، بگرە ئەوەی من دەیڵێم زۆر لە حەقیقەت کەمترە، چونکە من ناتوانم وەکو پێویست گوزارشت لە هزر و مەبەستی خۆم بکەم، بەڵام...

– ئا... بە یارمەتیت.. ڕێگەم بدە!

میرزادە، بێدەنگ بوو، بێ جووڵە لەسەر کورسییەکەی دانیشتبوو، سەری بەرز گرتبوو، بەچاوانی پڕ پرشنگەوە لە ئیڤان پتروفیچی دەڕوانی.

پیرەمێردی بە شەخسیەت، بە زمانێکی نەرم و دۆستانە، هێدی و هێمن گوتی:

– وا هەست دەکەم ئەو واریقاتەی لە سەر وەسێتەکەت ڕووی دابوو، زۆر کاری تێکردوویت و وەکو کارەساتێک وەرت گرتووە. زۆر خۆت پێ مشەوەش کردووە... ڕەنگە هۆی تەنیایی بێ. ئەگەر زیاتر تێکەڵاوی خەڵکی و کۆمەڵگە بیت (ئومێدەوارم کە کۆمەڵگەی ئەرستوکرات، بە باشی و گەرمی پێشوازی لە گەنجێکی زۆر باشی وەکو تۆ بکات) ئەم هەڵچوونەت دادەمرکێتەوە و بۆت بە دیاردەکەوێ کە مەسەلەکە زۆر لەوە سادەترە کەوێنای دەکەی!... جا ئەم حاڵەتانە زۆر دەگمەنن... بە ڕای من هەندێکی دەگەڕێتەوە بۆ تێری خۆمان و هەندێکی دیکەی دەگەڕێتەوە بۆ... بێزاری..

میرزادە گوتی:

– دەقاودەق... وایە، زارخۆش، جوانت پێکا! بە ڕاستی لە سۆنگەی "بێزارییەوەیە"! دەگەڕێتەوە بۆ (بێزاری خۆمان). هۆیەکەی تێری نییە، بەڵکو بێزارییە! من لێرەدا نەم پێکا، بۆچوونەکەم دروست نەبوو. ئێمە خەڵکانێکی تینووین، تینویەتیمان نەشکاوە. نەک هەر تینو، بەڵکو تیفەرۆین!... جا وامەزانن ئەم دیاردەیە ئەوەندە سادە و بچووک بێ، کە بە پێکەنین بەرێ بکرێ. بمبورە.. پیاو دەبێ پێشوەختە، پێشبینی بویەر و ڕووداوان بکات.

خەڵکی ڕووس، هەر کە پێی دەگاتە کەنار، هەر کە دڵنیا بوو پێی ناوەتەوشکانی، ئیدی ملی پێوە دەنێت و دەڕوات، شادو خۆشحاڵ گوڕ دەبەستێتەوە. بۆچی وایە؟ ئێوە سەرتان لە کارەکەی پافیلچوف سووڕدەمێنێ، پێتان وایە، ئەوەی لە شێتی یان لە دڵسافی بووە، بەڵام لە ڕاستیدا وانیە، چونکە عاتیفی بوونی ڕووسیایی لەم مەسەلانەدا هەر لای خۆمان بگرە لای ئەوروپایەکانیش مایەی سەرسامیە. کە ڕووسیایەک دەبێ بە کاتولیک و کاتولیکگەری قەبووڵ دەکات، یەکسەر دەبێ بە یەسوعی و لە هەر یەسوعیەک یەسوعیتر دەردەچێ. ئەگەر باوەڕ بە خوانەناسی بێنێ، داوا دەکات بە زەبری شمسیر هەر جۆرە خواناسیەک لە ناو بەرێ! هۆی ئەم توند ڕەوییە چییە؟ سەرچاوەی ئەم شێتایەتییە کوتوپڕە چییە؟ نازانن؟ هۆیەکەی ئەمەیە کە پێی وایە نیشتمانێکی تازەی پەیدا کردووە، کە لێرەدا ئەو نیشتمانەی نەبووە، یان پەی بەوە نەبردووە کە ئێرە نیشتمانیەتی، ئیدی بەم دۆزینەوە تازەیە بە ڕادەیەک خۆشحاڵ دەبێت کە لەپێستی خۆی ناهێورێ. بەخەیاڵی خۆی گەیوەتە کەناری ئارام، پێی گەیشتووەتەوشکایی، خێرا دادەنەوێتەوە و ماچ بارانی دەکات! دیارە ئەمەی لە گەوجێتی نییە، ڕووسەکان لە گەوجێتی یان لە غرووڕەوە ڕووناکەنە خوانەناسی و یەسوعیەت، بەڵکو لە ڕووی تینویەتی سایکولوژیەوەیە، تینوی دنیایەکی باڵاترن، تینوی زەوی و خاکێکی پایەدار و پتەون. تینوی نیشتمانێکن کە جێی ئەو نیشتمانەیان بۆ بگێرێتەوە کە نەک باوەڕیان پێ نەماوە، بەڵکو لە بنەڕەتدا و هەرگیز ڕۆژێ لە ڕۆژان نەیان ناسیوە و قەدریان نەزانیوە! گەلی ڕووسیا زۆر بە ئەسانی ڕوو لە ئیلحاد و خوانەناسی دەکات، ئاسانتر لە هەر گەلێکی ئەم دنیایە. هاوڵاتیانی ئێمە هەر بەوەوە ناوەستن ببنە خوانەناس، بەڵکو بە جۆرێ ڕوو لە ئیلحاد و خوانەناسی دەکەن و باوەڕی پێدێنن وەکو ئەوەی ئایینێکی تازە بێ، غافڵن لەوەی کە ئەمە خۆی لە خۆیدا باوەڕهێنانە بە نەهلیزم و پووچگەرایی. ئێمە تا ئەم ڕادەیە تینوو و تامەزرۆی ئیمان و باوەڕین. " ئەوەی خاکی نەبێ خواشی نییە." ئەمە قسە و بیرۆکەی من نییە، بەڵکو لە سەفەرێکا بازرگانێکی سەر بە مەزەبی کۆنە





دینان پێی گوتم. هەڵبەتە بە هەمان دەق بەکاری نەبرد، بەڵکو گوتی: "ئەوەی نکوڵی لە نیشتمانی خۆی بکات، نکوڵی لە خواش دەکات". تەسەور بکەن لەم رووسیایەی ئێمەدا خەڵکانی زۆر خوێنەوار و رۆشنبیر هەبوون کە پەیڕەوی تەریقەتی (خلیستەکانیان)* کردووە... لیرەدا پرسیار ئەمەیە بۆچی ئەم تەریقەتە لە نەهلیستی و یەسوعی و خوانەناسەکان بەخراتر بزانین؟ خۆ ڕەنگە بیرو باوەڕی ئەمان لە هی ئەوان قووڵتر بێ! نیگەرانی دەروونی بۆ ئەوێی کێشاون!... کەنارەکانی "دنیای تازە، یەنگی دنیا" بە هاوڕێیانی تینوو و تیفەڕۆی کولومبس نیشان بدەن، "دنیای ڕووسیا" بە تاکی ڕووسی نیشان بدەن، زەمینەی بۆ خۆشبکەن کە زێڕ بدۆزێتەوە، ئەو گەنجە کەشف بکات کە لەژێر خاکدایە و لەو پەنهانە، پیشانی بدەن، تێی بگەیەنن، کە چۆن ئاییندەی تیرەی بەشەر بە فەزلی هزری ڕووسی و خوای ڕووسی و مەسیحی ڕووسی، تازە دەبێتەوە و دەبوژێتەوە، هەنگێ دەبینن چ زەبەلاحێکی دادپەروەر،چ حەکیمێکی حەلیم و بەردەبار لەبەر چاوی حیرەتزەدەی دنیادا، حیرەتزەدە و هەراساندا، قوت دەبێتەوە، چونکە ئەوانە جگە لە شمشێر، لە شمشیر و عونف، چاوەڕوانی هیچ شتێکی دی نین لە ئێمە. بەپێی پێوەری وان، ئێمە لە کۆمەڵە خەڵکێکی هۆڤی زیاتر هیچی دی نین، تا ئێستاش وا سەیرمان دەکەن. دیارە ئەم بۆچوونە هەڵەیە، لە ئاییندەدا زیاتریش دەبێ! و...

لێرەدا، بۆیەرێک ڕودی دا کە بە شێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو کۆتایی بە قسەکانی میرزادە هێنا.

ئەم گوتارە دووردودرێژە، ئەم گوتارە گەرموگوڕە، ئەم لێزمەی وشە بێ سەرو بەرانەی کە ڕەنگدانەوەی گێژاوێکی فیکری، هەڵچووی، شێواوی، هەڤدژ بوو، کە هەر هەموو نیشانەی دەرکەوتنی حاڵەتێکی زەینی شپرزە و پەشێوی کوڕێکی گەنج بوو کە کوتوپڕ،بەو ئاوایەو، بێ هیچ ئەنگێزە و سۆنگەیەکی ئاشکرا، هاتبووە جۆشوخرۆش.

هەر هەموو ئەوانەی کە لە ئاهەنگەکەدا بوون و میرزادەیان دەناسی، کە چاویان بەم هەڵچوونە کوتوپڕەی میرزادە کەوت نەک هەر حەپەسان

(بەڵکو هەستیان بە تەریقی و شەرمەزاریش کرد) سەرسامی ئەوە بون، کە ئەم هەڵچوون و جۆشوخرۆشە دەگەڵ تەبیعەتی ئارام و شەرمنانەی ئەودا، دەگەڵ زیرەکی و نەرم و نیانی و پابەندی خۆرسکی ئەودا بەدابونەریتەوە، نەدەگونجا. نەیاندەزانی بۆچی لە خووی ئاسایی خۆی دەرچووە، بۆ ئەم حاڵەتەی لێهاتووە. نە دەچووە ئەقڵەوە بە هۆی ئەو هەواڵەوە بوو‌بێ کە لەمەڕ پاڤیلچوف بیستی.

ژنەکان، لای خۆیانەوە، بەو چاوە سەیریان دەکرد کە ئەقڵی لە دەست داوە و شێت بووە. دۆتمیر بیلوکونسکایا پاشان ئیعترافی کردبوو کە "ئەگەر ئەو دیمەنە یەک تۆزی دی بەردەوام با. هەڵدەهات." دوو میوانە پیرەکە، لەسەرساميدا واقیان وڕما بوو. جەنەڕاڵ (گەورە فەرمانبەرەکەی) سەرۆکی یەپانچین، بە گرژ و پەستی لەسەر کورسییەکەی خۆی بێ جووڵە دانیشتبوو.. کۆلۆنێلە ئەندازیارەکە. بێ خەم و خەیاڵ، هێدی و هێمن، لە جێی خۆی دانیشتبوو، وەک دەڵێن هەر مێشیش میوانی نەبوو. کابرای ئەڵمانی ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا بوو، بەڵام بەدەم بزەیەکی ساختە و فریوکارانەوە، دەیڕاوانیە دەوروبەری خۆی تا بزانێ کاردانەوەی ئەوانی دی چۆنە و چی دەکەن، بەڵام لەگین بوو ئەم فەزیحەتە، ئەم پەشێویە هەر هەمووی بە شێوەیەکی زۆر ئاسایی، لە یەک دوو دەقیقەدا ببڕێتەوە و کۆتایی پێ بێت.تەنانەت ئیڤان فیدوروفیچ کە لەوانی دی بە حەوسەڵەتر بوو، تەواو حەپەسابوو، چەند جارێک هەوڵیدا میرزادە کۆنترۆڵ بکات و سنوورێکی بۆ دابنێ، بەڵام فایدەی نەبوو، بۆیە بەرەو لای وی چوو تا چارێکی بکات. خۆ ئەگەر یەک دوو دەقیقەی تری پێ چووبا و، پێویستی کردبا لە گین بوو بە قسەی خۆش و دۆستانە، بە بیانووی ئەوەی کە نەخۆشە لە هۆڵەکە بیباتە دەرێ و دەری بکات. لەوەش دەچوو بە ڕاستی نەخۆش بێت، بەهەرحاڵ ئیڤان فیدوروفیچ لەلای خۆیەوە قەناعەتی تەواوی بەوە هەبوو کە نەخۆشە و هۆی هەڵچوونەکەشی ئەمەیە... بەڵام ڕێڕەوی ڕووداوەکان ئاڕاستەیەکی تری وەرگرت!...

میرزادە، هەر کە لە هەوەڵەوە، خۆی بە هۆڵەکەدا کرد، دوورترین

شـــوێنی لەو گوڵدانـــە چینـــی یەوە هـــەڵبژارد کـــە ئاگلایـــا زۆری تاکیـــد لێکردبـــووەوە کـــە ئاگـــاداربێ نەیشـــکێنێ. دوای ئەوەی ئاگلایـــا دوێنـــێ ئەو قسەیەی پێ گوتبوو، ئیدی جۆرە پێشبینییەکی باوەڕ نەکردەنی لە مێشک و زەینا چەسپی بوو، کە سبەینێ چەند خۆی دوور بگرێت،چەند خۆی لە هەڵە بپارێزێـت، لـە دڵـی چەسـپیوە ئەو گوڵدانـە هـەر دەشـکێنێ و مەحاڵـە لەو فەزیحەت و کارەساتە بخەلەسێت، هەڵبەتە ئەمە ترس و پێشبینییەکی باوەڕ نەکردەنی بوو. دەیسا با بزانین چ قەوما: شـەوێ، لـە کاتی شەونشینیەکەدا، هەستێکی دیکە، هەستێکی توند و لە هـەمان کاتدا بەلـەزەت، دڵ و دەروونـی داگرت، هـەمان ئەو هەسـتەی کەپێشـتر باسـمان کـرد. ئـەم هەسـتە هـەموو ترس و نیگەرانییەکانی تری لە بیر بردەوە، کە گوێی لە ناوی پافلیچوف بووو ئیڤان فیدۆرۆفیچ بردی بۆ لای ئیڤان پترۆفیچ و بە یەکتری ناساندن، میرزادە لە مێزەکە نزیک بووەوە و لەسەر قەنەفەیەکی نزیکی گوڵدانە چینیە گەورەکـە دانیشـت، گوڵدانەکـە لەسـەر تەپڵـەکێک دانرابـوو کـە لـە ئاسـتی ئانیشکی ئەم وکەمێک لە پشتیەوە بوو.

هەر کە هاتە سەر دوا وشەکانی وتارە دووردرێژەکەی، لەپڕ هەستایە سـەر پێیـان، دەسـتەکانی بـە تونـدی ڕاوەشـاندن و شـانی هەڵتەکانـدن، لـەپڕ...فریادی ئامـادەبوان بـەرز بـووەوە! گوڵدانەکـە کەوتـە لەرەلـەر، لـە هەوەڵەوە لەوە دەچوو بکەوێ بەسە یەکێک لە دوو پیرەمێرە بەڕێزەکەدا، بەڵام باش بوو لـەپڕ بـەم دیـواو بـەلای کـابرای ئەڵمانیدا پێچـی خـواردەوە. کابرای ئەڵمانی لە ترسا بەلەز هەستاو خۆی لادا. گوڵدانەکە بە تـەق و هـۆڕ کەوتە سەر زەوی و شکا، دەنگی شکاندن و فریادی خەڵکەکە تێکەڵ بوو. پارچـە گرانبـەهاکانی، بەسـەر مافورەکـەدا پـەخش و بڵاوبـووەوە! تـرس و سەرسـامی بـاڵی بەسـەر ئاهەنگەکـەدا کێشـا. سـەبارەت بـە میرزادە، کـەس حاڵی بە حاڵی ئەو نـەبێ! زۆر زەحمەتە کەس بتوانێ ئەو حاڵە بەرجەستە بکـات کـە ئەوی تێکەوتبـوو، بـەڵام هـەر چـۆنێ بـێ، ئەگـەر بـە شـێوەیەکی ڕەوتـەنیش بـووە، پێویسـتە ئاماژەیـەک بەو هەستە تایبەتییە بکەین کە لەو دەمـەدا بـاڵی بـە سەراکێشـا، هەسـتێک بـوو بـە ئاشـکرا لـە هـەر هەسـتێکی

دیکەی بە ژان یان ترسناک زەقتر و دیارتر بوو. ئیدی ئەو هەستەی کە لە هەر هەستێکی دی زیاتر حەپەساندبووی، هەستی شەرم، تەریق بوونەوە، حەیاچوون یان ترس و غافڵگیری نەبوو، بەڵکو هەستی ئەوە بوو، هەر پێشبینیەک کە کرابوو، کوت و مت، وەکو خۆی هاتە دی! ئەگەر لێت پرسیبا، ئەمە چ هەستێک بوو،چۆن پێشبینی ئەو وەزعەی کردووە، نەیدەتوانی هیچ وەلامێک بداتەوە، بەلام هەستی دەکرد، کە هێزێکی گۆنگ گەمارۆی دڵی داوە و بەخۆیشی کەوتووەتە چنگی ترسێکی پەنهان و مەیلەو غەیبانی. دوای تۆزێک وای هاتە بەرچاو کە ئاسۆیەکی فراوان لە بەردەمیا دەکرێتەوە و ترسەکەی بەرەبەرە دەڕەوێتەوە و هەستێکی پڕ لە ڕووناکی و خۆشی و جەزمە جێی دەگرێتەوە و ئەم هەستە نەفەسی تەنگ دەکرد و... بەلام ئەوەش ماوەیەکی زۆر کورتی خایاند. سوپاس بۆ خودا کە ئەمە هەمان ئەو شتە نەبوو کە لێی دەترسا. هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و، ڕوانییە دەوروبەری خۆی.

تا ماوەیەکی زۆر لە یەکێک دەچوو ئاگای لەو هەراو زەنایەی دەوروبەری نەبێت. یان بە گوتەیەکی دی زۆرباش لە هەموو شتێک تێدەگەیی و بەڕوونی هەموو شتێکی دەبینی، بەلام وای هەست دەکرد لە دەرێی ڕووداوەکاندایە و لە هیچ شتێکدا بەشدار نییە، وەکو کاراکتەرێکی پەنهان و نادیاری حیکایەتە خورافیەکان چووەتە شوێنێ پڕە لە خەڵکانی نامۆ غەوارەو، ورد ورد تەماشایان دەکات و، حەز دەکات بزانێ چ دەکەن. سەیری کرد پارچەی گوڵدانەکە کۆدەکەنەوە، گوێی لێ بوو، بەپەلە قسان دەکەن، ئاگلایای بینی کە چاوی بڕیوەتە ئەو: ئاگلایا زەرد هەڵگەڕابوو، شکڵ و بیچمی غەریب، زۆر غەریب بوو، بەلام زەڕەیەک نەفرەت یان توڕەیی لە نیگایدا نەبوو، بەڵکو سۆز و مەحەبەت لە چاوانی هەڵدەقوولان. کاتێ تەمەشای ئەوانی تری دەکرد چاوانی دەدرەوشانەوە... لەپڕ ئۆخژەنێکی خۆش، لە دڵ و دەروونی میرزادە گەڕا.

ئەنجام کە سەیری کرد هەمو ئامادەبووان نەک هەر لە جێی خۆدانیشتبوون، بەڵکو بە جۆرێ پێدەکەنین وەکو ئەوەی هیچ شتیک ڕووی

نەدابێت! زۆر حەپەسا! دەقیقەیەکی دیکەش تێپەڕی، دەنگی پێکەنین بەرزتر بووەوە، سەیری ئەویان دەکرد و پێدەکەنین، بە شپرزە بوون و حەپەسانەکەی ئەو پێدەکەنین، بەڵام پێکەنینێکی خۆش و دۆستانە. گەلێک لە ئامادەبووان زۆر بە لوتف و مەحەبەتەوە دەیان دواند، بە تایبەتی لیزاڤیتا پروکوفیڤنا، کە زۆر بە میهرەبانی و ڕووخۆشی و پێکەنینەوە قسانی دەکرد، لەپڕ هەستی کرد ئیڤان فیدوروفیچ دۆستانە دەستی دا بە شانیا، بەڵام لە هەموویان میرەبانتر، ڕووخۆشتر، بە لوتفتر، پیرەمێرە چکۆلەکە بوو! دەستێکی میرزادە گرت، بە نەرمی گوشی، بەدەستەکەی تری بە ئەسپایی پێیدا دەکێشا، داوای لێدەکرد ئارام بێ و گوێ نەداتێ. وەکو چۆن کەسێک دڵخۆشی منداڵێکی ترساو بداتەوە. میرزادە ئەمەی زۆر پێخۆش بوو. ئەنجام وای لێ کرد کە لای ئەوەوە دابنیشێت. میرزادە بە شادییەوە کەوتە نیگاکردنی سەروچاوی پیرەمیرەکە. بە جۆرێ هەناسەی سواربووبوو، کە نە یدەتوانی تاقە وشەیەک بڵێ. ئەنجام، بە هەر مینگە مینگێک بوو هاتە قسان!

-چۆن؟ یانی ئێوە دەمبورن؟و... تۆش لیزاڤیتا پروکوفیڤنا؟

دەنگی پێکەنین بەرزتر بووەوە. لە خۆشیانا فرمێسک زایینە چاوانی میرزادە. شادییەکی ئەوتۆ سەراپای داگرتبوو کە خۆیشی باوەڕی نەدەکرد. ئیڤان پتروفیچ گوتی:

– هەڵبەتە گوڵدانیکی جوان بوو. لە بیرمە لەوەتای پازدە ساڵە لێرەیە... بەڵێ... پازدە ساڵ...

لیزاڤیتا پروکوفیڤنا، بەدەنگی بەرز گوتی:

– چ قەوماوە، خۆ دنیا ئاخر نەبوو! مرۆڤ بە خۆی دەمرێ، چ پێویست دەکات خەفەت بۆ گۆزەیەکی چینی بخوات!

ئەوسا، بە نیگەرانییەکی کەمەوە لەسەری ڕۆیشت:

– زۆرت لەبەرگران بوو لیون نیکولایوفیچ؟ وەرە گیانەوەرە! هەر گوێی مەدەیە! پێم ناخۆشەوا خۆت سەغڵەت کردووە!

میرزادە گوتی:





- باشە ئێوە دەمبوون، "لە هەموو شتێک" دەمبورن؟ هەر لە شکانی گوڵدانەکە نا، بەڵکو لە "هەموو شتێک"

میرزادە دەیویست هەستێت، لێ پیرەمێرەکە دەستی گرت و نەیهێشت بڕوات. لە سەرمێزەکەوە، بە دەنگێکی نزم، بەڵام بە باشی دەبیسترا، بە ئیڤان پتروفیچی هاوڕێی گوت:

- سەیرە، شتێکی زۆر سەیرە!

میرزادە گوتی:

- یانی من کەستانم نە ڕەنجاندووە؟ ئۆخەی خۆشحاڵم ئەگەر هەستی کەستانم بریندار نەکردبێ! خۆ هەر ناشبێ شتی وا بکەم، ئاخر من چ حەدم هەیە خەڵکی وەکو ئێوە بڕەنجێنم؟ تەنانەت بیرکردنەوەش لە شتی وا دەکاتە ناماقووڵی!

- دۆستی ئازیزو وەخۆ وەرەوە، پێویست بەو موبالەغەکاریە ناکات. هیچ پێویست بەو هەموو منەتباریە ناکات، ئەمە هەستێکی جوانە، بەڵام موبالەغە ئامێزە.

- من تەنیا منەتبار نیم بەڵکو دڵبەندی ئێوەم، شادو خۆشحاڵم بەدیتنتان. ڕەنگە هەندێ گەوجانە هەستی خۆم دەرببڕم، بەڵام هەستدەکەم پێویستە، تەنانەت ئەگەر هەر لەبەر خاتری خۆیشم بووە، قسە بکەم، گرێی دڵی خۆم بکەمەوە، ئەوەی لە ناخما پەنگاوەتەوە، هەڵی ڕێژم. ڕەفتاری میرزادە، هەڵچوون و نیگەرانییەکی زۆری پێوە دیار بوو، لەوە دەچوو نەتوانێ بەوشە مەبەستەکانی خۆی بگەیەنێ، ئەوەی لە ناخیا پەنگابووەوە بەوشەی بسپێرێت. بە چاوانیا دیار بوو کە دەیویست یارمەتی بدەن تا قسان بکات. چاوی بە دۆتمیر خانم بیلوکونسکایا کەوت.

خانمی پیر گوتی:

-خۆت سەخڵەت مەکە گیانە، قسە بکە، قسەکەت تەواو بکە. شەرم مەکە. تۆزێ خۆت هێور بکەوە، بێ هیچ ترس و دوودڵیەک قسەی خۆت بکە. ئەم بەڕێزانەی کە لێرەن شتی زۆر سەیرتریان لە تۆ دیتووە، ئەم شتانەیان بەلاوە ئاساییە، هیچ شتێک نەبووە، گوڵدانێکت شکاندووە و خەڵکەکە تۆزی

ترسان.

میرزادە کە بە زەردەخەنەوە گوێی لە دۆتمیر دەگرت، لەپڕ ئاوڕی لای پیرەمێرەکەی دایەوە و پرسی:

– ئایا تۆ نەبووی کە سێ مانگ لەمە پێش خوێندکار پۆدکوموف و فەرمانبەر شڤابرین-ت لە نەفی کردن بۆ سیبریا، ڕزگار کرد؟

پیرەمێر، کەمێک سوور بووەوە، لەبن لێوانەوە داوای لێ کرد کە خۆی هێور بکاتەوە.

میرزادە، لەپڕ ڕوو لە ئیڤان پتروفیچ لە سەری ڕۆیشت:

– دەربارەی تۆش بیستوومە کە ژمارەیەک لەو جووتیارانەی کە کۆنە ڕەعیەتی تۆ بوون، وێڕای ئەوەی دوای ئازاد بوونیان، خراپەشیان دەرهەق کردبوویت، کاتێ ماڵەکانیان سووتا بوو، تۆ بە خۆڕایی دارت دابوونێ تا خانوو بۆ خۆ دروست بکەنەوە.

ئیڤان پتروفیچ، بە شەرمێکەوە گوتی:

– ئاه! ئەمە ڕاست نییە! موبالەغەیە!

بەڵام ئاسوودەیی و ڕەزامەندی بە سیمایەوە دیار بوو. ئەلهەقی ڕاستگۆ بوو لەوەی کە باسی درۆو موبالەغەی کرد، چونکە مەسەلەکە درۆیەک بوو بەر گوێی میرزادە کەوتبوو.

میرزادە، جارێکی دی ئاوڕی لای دۆتمیر بیلوکونسکایای دایەوە و بەدەم زەردەخەنەوە گوتی:

– ئەدی هەر تۆ نەبوویت، کە شەش مانگ لەمەپێش، لە مۆسکۆ، کاتێ نامەیکم لە لیزاڤیتا پروکوفیڤناوە بۆ هێنایت، بە مەحەبەتێکی واوە پێشوازیت کردم وەکو ئەوەی کوڕی خۆت بم؟ کۆمەڵێک ئامۆژگاری دایکانەت کردم کە تا ماوم لە بیرم ناچێت؟

خانمی پیر، بە پەستی وەڵامی دایەوە:

– ئەم هەموو مجامەلەیە چییە؟ ڕاستە تۆ کوڕێکی باشی، بەڵام مەخسەرەی. هەر کەسێک دوو قرۆشی دایتێ، ئەوەندەی سوپاس و ستاییش دەکەی وەکو ئەوەی گیانی ڕزگار کردبێت. بە خەیاڵی خۆت ئەمە

کارێکی باشە؟ لە ڕاستیا ناپەسەندە.

دۆتمیر بیلوکونسکایا خەریک بوو توڕە بێت، بەڵام لەپڕ دەستی بە پێکەنین کرد، ئەم جارەیان شادمانی بە پێکەنینەکەیەوە دیار بوو. سیمای لیزاڤیتا پروکوفیڤنا و ئیڤان فیدوروفیچش ڕووناک بوونەوە.

جەنەڕاڵ،شاد و دڵخۆش، لەبن لێوانەوە، هەمان قسەکانی دۆتمیری، کە زۆرریان کارتێکردبوو، دووبارە کردەوە و گوتی:

- من هەمیشە گوتوومە کە لیون نیکولایوفیچ پیاوێکە کە... پیاوێکە لەوەیە.... بە مەرجێ وەکو دۆتمیر گوتی... لە قسەکردنا خۆی نەپەشۆکێنێ...

تەنیا ئاگلایا لەوە دەچوو خەمین بێ، بەڵام ڕوخساری هێشتا سوور بوو، لەوە دەچوو سووری تووڕە بوون بێ.

پیرەمیرە چکۆلەکە لەبن لێوانەوە بە ئیڤان فیدوروفیچی گوت:

- بە ڕاستی، کوڕێکی ناسکە.

میرزادە، کە سات بە سات نیگەران تر دەبوو، دەستی بە قسان کردەوە. قسەکردنەکەی سات بە سات خێراتر و سەیرتر دەبوو، خۆ بە خۆ جۆشی دەسەند، بەدەم ئەو حاڵەوە گوتی:

- من بەوپەڕی دوو دڵیەوە هاتم بۆ ئێرەو... من... من لە ئێوە دەترسام، لە خۆم دەترسام، زیاتر لە خۆم دەترسام. وەختێ بۆ پترسبۆرگ گەڕامەوە. بە لێنم بە خۆ دا کە بە هەر نرخێ بووە دەبێ خەڵکانی ئەرستۆکرات، خەڵکانی خانەدان و وەچاخزادە کە منیش بە بنەچە یەکێکم لەوان و ماڵباتی من یەکێکە لەو بنەماڵەوەچاخزادانە، بدینم و بناسم. جا ئێستا من لەنێو کۆمەڵێک میرزادانی وەکو خۆمدام، وانییە؟ حەزم دەکرد تەعاروفتان دەگەڵ بکەم... لە نزیکەوە ئاشناتان بم... ئەمە کارێکی پێویست بوو، زۆریش پێویست بوو. زۆر شتی خراپم دەربارەتان بیستووە، ئەوەندەی خراپەم دەربارەتان بیستووە، چاکەم دەربارەتان نەبیستووە. یانی خراپەتان زیاتر دەڵێن تا چاکە، زۆر شتیان لە بارەتانەوە بۆ گێڕاومەتەوە: لە بارەی بچووکی خەم و خولیاکانتانەوە، خۆپەرستیتان، پاشڤەڕۆیی بیرو بیرکردنەوەتان، کەمی خوێنەواری و ڕۆشنبیریتان، دابونەریتی تورەهات و




ناپەسـەندتانەوە. ئاهــ... جـا چیتـان لـەبارەوە نـەگوتراوە و نـە نووسـراوە! ناگوترێ و نانووسرێ! بۆیە ئەمڕۆکە کە هاتم بۆ ئێرە هـەم کونجکاو بووم هەم نیگەران. حـەزم دەکرد بە چاوی خۆم شتەکان بدینم، بە ئـەقڵی خۆم بیربکـەمەوە و وەڵامـی ئـەم پرسـیارە بـدۆزمەوە: ئایـا ڕاسـتە چینـی بـاڵای کۆمەڵگەی ڕووسی، چینێکی پوچەڵی تورەهاتە و بە کەڵکی هیچ نایـەت. کۆن بـووە و سـەردەمی بـە سـەرچووە، زەرەیـەک گـوڕو تینـی تیـا نـەماوە، لەگیانەڵڵادایە و تەنیا بۆ مردن باشە. کەچی هێشتا لـە ڕووی بـەغیلییەوە، لـە ڕووی حەسوودییەوە دژایـەتی پیاوان.... پیاوانی ئایندە دەکات و کۆسپیان دەخاتـە ڕێگـاو، غافڵـە لەوەی کـە خـۆی لـە دوا هەناسـە و لـە گیانەڵڵادایـە: هەڵبەتـە من جـارانیش زۆر قەناعـەت و بـاوەڕم بەو ڕاو بۆچوونانـە نـەبووە، چونکە لە وڵاتی ڕووسیای ئێمـەدا هـەرگیز چینێکی ئەرستۆکراتی ڕاستەقینە نـەبووە. ئەوەی هـەبووە، ئەو دەربارییانـە بـوون کە بـە جلکـی دەربـارییەوە دەناسـران یـان هەنـدێ کـەس بـەڕێکەوت و خـوا بەختـەکی و، خـۆو بـەخت هاتبوونـە ئـاراوە، بـەڵام ئەو چینـە ئەمڕۆکـە بـە تەواوەتـی لـە نـاوچوون و نەماون. ئەوە ڕاستیەکەیەتی، وانییە؟

ئیڤان پتروفیچ، بەدەم تەوسخەنێکی تانە ئامێزەوە گوتی:

- واز لەو قسانە بێنە! مەسەلەکە یەجگار واش نییە!

دۆتمیر خانم بیلوکونسکایا، کە گەیشتبووە تینی، لەبن لێوانەوە گوتی:

- دیسان پەتی پچڕی...

پیرەمێرە بچکۆلەکە گوتی:

- وازی لێ بێنن با قسە بکا*! سەراپای دەلەرزێ!

میرزادە، بە ڕاستی جڵەوی خۆی لەدەست بەر بووبوو، گوتی:

-چی ببینم باشە؟ خەڵکانێکی بیر ناسک، ڕاشکاو، قسـە لـە ڕوو، بە هـۆش و زیـرەک. مـن لێـرە پیـاوێکی بـەڕێزی کۆنسـاڵ دەبینـم کـە بـەدڵ و بـەگیان گـوێ لـە منداڵێکی بـێ ئـەزموونی وەکـو مـن دەگرێـت، سـۆز و مەحەبـەتی لێدەبارێ. خـەڵکانێک دەبینـم کـە لێـت دەگـەن، ئامـادەن لێـت ببـورن. ئەمانـە هــەموو ڕووســی دڵپــاک و دڵاوان، بــە ئەنــدازەی ئەو خەڵکانــەی کــە لــە

هەندەران دیتوومن، میهرەبان و دلۆڤان و ڕاستگۆن، بەهەرحاڵ هیچیان لەوان کەمتر نییە. ئاخر هیچ غافڵگیریەک لەم غافڵگیریە خۆشتر دەبێ؟ ئاهـ... بە یارمەتیتان با ئەم هەستەی خۆم دەربڕم! زۆرم لەم و لەو دەبیست، دەیانگوت کۆمەڵگەی ئەرستۆکراتی، تەنیا کۆمەڵێک دابونەریتی ڕواڵەتی سواو و پواوی کۆنی، پوچەڵی، بێناوەڕۆکە. وەک دەڵێن ناوی زل و دێی وێرانە. زۆر جاریش قەناعەتی تەواوم بەو قسانە دەکرد. کەچی ئێستا بە چاوی خۆم دەبینم کە شتی وا لە وڵاتی ئێمەدا نییە.

ماقوولە پیاو باوەڕ بەوە بکات کە ئێوە هەمووتان یەسوعی و درۆزن و دەغەڵبازبن؟ تۆزێ لەمەپێش گوێم لە سەربردەکەی میرزادە "ن..." بوو: ئایا نوکتە و تەنزێکی سادە و ساکاری دڵسافانە نەبوو؟چاکی و دڵپاکییەکی ڕاستەقینەی تیا نەبوو؟ یانی دەشێت ئەم جۆرە قسانە لە زاری پیاوێکی مردووەوە بێتەدەرێ، پیاوێک کە دڵی وشکی کردبێ و هیچ بە هرەیەکی تیا نەمابێ؟ ئایا مردوان دەتوانن ئەو پێشوازیە گەرمەی کە ئێوە لە منتان کرد لە کەس بکەن؟ ئایا ئەمە خۆی لە خۆیدا هەوێن و ئامیانی ئایندە نییە؟ ماقوولە خەڵکانی وەکو ئێوە تێنەگەن؟ و لەپاش بدەن؟

" گەورە فەرمانبەرەکە"، بەدەم بزەیەکی بڕێک بە ماناوە، گوتی:

– تکایە، خۆت هێور بکەوە دۆستی ئازیز. ڕۆژێکی دی بە دووروودرێژی باسی ئەم بابەتە دەکەین. زۆر خۆشحاڵ دەبم ئەگەر...

ئیڤان پترۆڤیچ، کۆکەیەکی بۆ کرد و لەسەر کورسییەکەی خۆیەوە ئاوڕی دایەوە. ئیڤان فیدوروفیچ پەشێوو پەرێشان بوو. جەنەڕاڵی سەرۆکی ئیڤان فیدوروفیچ، دەگەڵ هاوسەرەکەی "گەورە فەرمانبە"دا سەرگەرمی قسان بوو و میرزادەی فەرامۆش کرد. لێ هاوسەری "گەورە فەرمانبەر" ـــەگە بەدەم گوێگرتنەوە لەو، زۆر جار تەمەشای میرزادەی دەکرد.

میرزادە، بە نەفەسێکی تازەتر و گەرموگوڕترەوە، بەو پەڕی متمانە و تەنانەت هەڤدڵی یەوە، ڕوو لە پیرەمێرە بچووکەکە، درێژەی بە قسان دا.

– نا، نا، باشتر وایە قسان بکەم! دوێنێ ئاگلایا ئیڤانوڤنا قسەکردنی لێقەدەغە کردم، تەنانەت ئەو بابەتانەشی دیاری کرد کە نابێ قسەیان تیا

بکەم، چونکە دەزانیێ کە بێمە سەر باسی ئەو بابەتانە. خۆم دەکەم بە گەپچاڕ! من تەمەنم بیست و حەوت ساڵە، بەڵام دەزانم، ڕەفتار و ئەداو ئەتوارم، ڕەفتاری منداڵە. بۆم نییە گوزارشت لە هزر و بیری خۆم بکەم. زۆر لەمێژە ئەمەم گوتووە. من تەنیا لەگەڵ ڕوگوژیندا، بە ڕاشکاوی، بێ پەردە، بەدڵی کراوەوە قسەم کردووە، ئەویش لە مۆسکۆ... پێکەوە بەرهەمەکانی (پوشکین) هەر هەموویمان خوێندەوە. ڕوگوژین، هیچی دەربارەی ئەم شاعیرە نە دەزانی، تەنانەت ناوەکەیشی نەدەزانی. من هەمیشەو، تا ئێستاش ترساوم و دەترسم بیرەکانم ببنە قوربانی سەروسەکوتی کۆمیدی و مەخسەرەم. جووڵە و ئاماژەکانم نا سەرکەوتوون. پێچەوانەی مەبەست و بۆچوونەکانم دەگەیەنن کە دەبنە بایسی پێکەنین و لەبار بردنی بیرو بۆچوونە سەرەکیەکەم. ئەمە جگە لەوەی کە هەستی میانڕەویشم نییە، وەخت و ناوەخت نازانم... هەڵبەتە ئەمە خاڵێکی گرینگ و هەستیارە، زۆریش گرینگە... من چاک دەزانم باشترین کار بۆ من ئەمەیە بێ جووڵە لە جێی خۆ دانیشم و دەمم لێک بنەم و فزە نەکەم. کاتێ دادەسەکنم و قسە ناکەم، ڕەنگە زۆر ئاقڵ و ئاغر بێمە بەرچاوی خەڵکی، ئەمە جگە لەوەی دەرفەتی بیرکردنەوەم بۆ دەڕەخسێ، بەڵام بۆ ئێستا وا باشترە قسان بکەم.چونکە ئێوە زۆر بە مەحەبەتەوە تەمەشام دەکەن.. بۆیە لێبڕاوم کە قسان بکەم. سیماتان جوانی لێدەبارێ. دوێنێ بەڵێنم بە ئاگلایا ئیڤانوڤنادا کە بە درێژایی ئاهەنگەکە دانیشم و قسە نەکەم...

پیرەمێرە چکۆلەکە بەدەم زەردەخەنەیەکەوە گوتی:

- بە ڕاست؟

- هەندێ جار بە خۆم دەڵێم ئەم بیرکردنەوەیە هەڵەیە، ئاخر ڕاستگۆیی ڕاستەقینە یەکسانە بە جووڵەی سەرکەوتوو. وانییە؟ تۆش پێت وانییە؟

- هەندێ جار با.

- دەمەوێ هەموو شتێکتان بۆ شەرح و شرۆڤە بکەم، هەموو شتێک، هەموو شتێک! ئا... بەڵێ!... ئێوە پێتان وایە من پیاوێکی خەیاڵیم؟ ئایدیالیم؟





نا، نا، باوەڕبکەن بیرەکانم هەر هەموویان سادەن، زۆریش سادەن... باوەڕ ناکەن؟ بزەتان دێ؟ گوێ بگرن... من هەندێ جار ترسنۆکم، قەلەزراوم، چونکە باوەڕم بەخۆ نامێنێ، هەموو متمانەیەک لە دەست دەدەم. تۆزێ لەمەپێش، کاتێ بۆ ئێرە دەهاتم. لە دڵی خۆدا دەمگوت: "باشە چۆن سەری قسان دەگەڵ ئەواندا بکەمەوە؟ دەبێ چۆن دەست پێ بکەم تا بەلای کەمەوە تۆزێکم لێ تێبگەن" زۆر ترسام. زیاتر لە ئێوە ترسام. پێویستی بەو هەموو ترسە دەکرد؟ یانی ئەم ترسانە بۆ من عەیب نەبوو؟ ئاخر بۆ بابایەکی پێشکەوتو خواز، جەماوەرێکی پاشڤەڕۆی نارەسەن چ بایەخێکی هەیە؟ جا ئێستا خۆشحاڵی من لەوەدایە کە گەیشتوومەتە قەناعەتی تەواو کە ئەو جەماوەرە لەواقیعدا بوونی نییە، ئەوەی هەیە خەڵکانێکن کە ژیانیان لێدەچۆڕێ، پڕن لە ژیان! ئێمە نابێ بە تەسەوری ئەوەی کە خۆمان غەریب و سەیرین، نیگەران و نارەحەت بین، وانییە؟ چونکە بە ڕاستی ئێمە مەخسەرە و سا ئەقڵ و شێت و وێڵین، ئێمە خوو وخدەی سەخیفمان هەیە، بێزار و بێتاقەت دەبین، نە دەتوانین لە هیچ بگەین و نە هیچ دەبینین. ئێمە هەموومان واین، هەموومان، ئێوە، من و، ئەوانیش. خۆ لێم زویر نابن کە ڕووبەڕوو پێتان دەڵێم ئێوە مەخسەرە و گەپچارن؟ ئەگەر مەسەلەکەوەهابێ، ئایا ئەمە بەو مانایە نییە کە بشێت بەوەستای پێشکەوتن دابنرێن؟ دەزانن، بە ڕای من ئەگەر پیاو هەندێ جار مەخسەرە و گەپچاربێ باشترە، خەڵکی لەو حاڵەدا خاکیتر و لێبوردەتر دەبن. بەهرە و توانای ئەوەمان نییە بە کەرەتێ هەموو شتێ حاڵی ببین، مرۆڤ بە کەرەتێک ناگاتە کەماڵ! بۆ گەیشتن بە کەماڵ، پێویستە مرۆڤ زۆر شت تێنەگات. تێگەیشتن و دەرکی خێرا، عادەتەن نوقستان و پڕ لە کێماسی دەبێت. من ئەم قسانە بۆ ئێوە دەکەم کە ئەم هەموو شتە دەزانن دەزانن... بێ ئەوەی تێی بگەن. ئێستا وام لێهاتووە کە هیچ ترسێکم لە ئێوە نییە. هیوادارم لە منداڵێکی وەکو من، کە بەو شێوەیە دەتان دوێنێ، زویر نەبن، ئایا دەبێ؟ هەڵبەتە! ئاهـ... دەتوانن کە... دەتوانن لەو کەسانە ببورن کە خراپەیان دەرهەق کردوون، هەروەها لەوانەش کە خراپەیان دەرهەق

کردوون. بوردنی ئەو کەسانەی هیچ خراپەیەکیان بۆتان نەبووە قورسترە، لەبەر هۆیەکی زۆر سادە، ئەوەش ئەوەیە کە هیچ "تاوانێک" یان دەرهەق نەکردوون، بۆیە هەر گلەیی و سکاڵایەکیان لێبکەن لە خۆڕاییە. من چاوەڕوانی ئەوەم لە کۆمەڵگەی ئەرستۆکراتی دەکرد، کاتێ بۆ ئێرە دەهاتم پەلەی وتنی ئەو شتەم بوو، دەمویست بەپەلە ئەوە بڵێم، بێ ئەوەی پێشوەختە بزانم دەبێ بە چ شێواز و زمانێک گوزارشت لەو مەبەستە بکەم...

میرزادە، کە تەواو هاتبووە جۆش، هەر سا نا ساتێ بزەیەکی بۆ دەکرد، لەپڕ بەدەم پێکەنینێکی گرژەوە ڕووی لە ئیڤان پترۆفیچ کرد و بەردەوام بوو: ئیڤان پترۆفیچ چییە، بزەت دێتێ؟ لات وایە من کابرایەکی دیموکراتم، هەواداری یەکسانیم، من لیرەدا پارێزەری "ئەوانم" و من "خەمی" ئەوانمە، وانییە؟ دڵنیابە من خەمی ئێوەمە، خەمی ئێوەمە، خەمی هەموومانمە. من بەش بە حاڵی خۆم میرزادەیەکم سەر بە بنەماڵەیەکی ڕەسەن و وەچاخزادە و حاڵی حازر لە کۆڕی میراندا دانیشتووم. من ئەم قسانەم بۆ بەرژەوەندی و ڕزگاری هاوبەشی خۆمانە، تا چینی ئێمە، بە خوت و خۆڕایی تیانەچێت و مەحو نەبێتەوە. لەبەرئەوەی پێشبینی ئایندەی نەکردووە و بەدەم شەڕەوە هەموو شتێکی لەدەست داوە، تیانەچێت. ئاخر کە بتوانین لە ڕیزی پێشەوەی کۆمەڵدا بین و عیزەتی خۆمان بپارێزین بۆچی مەحو بینەوە و جێی خۆمان بۆ خەڵکی دی چۆڵ بکەین؟ جا با پێشڤەڕۆبین بۆ ئەوەی لە پێشەوە بین، با خزمەتگوزار بین، تا گەورە و سەروەربین.

میرزادە، لەپڕ لێبڕا هەستێ، بەڵام پیرەمیرەکە نەیهێشت. بەو پەری نیگەرانی چاوی لە دورِ چاوانی بڕی.

– گوێ بگرن! من دەزانم قسە بە تەنیا فایدەی نییە. کردار شەرتە کردار، با بە کردار بانگەوازی چاکە بکەین، با ببن بەسەر مەشق، با دەست بەکار بین... من لای خۆمەوە لە ئێستاوە دەست بەکار بووم... و... و... یانی دەشێت مرۆڤ بەدبەخت بێ؟ ئاخر بەدبەختی من کەی جێی خەمە، ئەگەر

من تواناو لیاقەتی ئەوەم هەبێ کە بەختەوەربم؟ باوەڕبکەن من ناچیتە ئەقڵمەوە ئەگەر کەسێک بە ژێر درەختێکدا ڕەت بێ و بە دیتنی دیمەنەکەی خۆشحاڵ نەبێت، یان قسە دەگەڵ کەسێکدا بکات و بەخۆشەویستی ئەو شاد نەبێت... ئاها! ناتوانم ئەمە بە پەیڤان دەربڕم، وشەم لێ چوونەتە قاتی... بەڵام شتی جوان یەجگار زۆرن، هەر هەنگاوێ دەنەین، شتێکی جوان بەرۆکی دیدەمان دەگرێت، ئەوەندە جوانە کە نزمترین ئینسان هەست بە جوانیەکەی دەکەن! تەمەشای منداڵ بکەن، سەیری سپێدەی خوایی بکەن، بڕواننە مەرگ و شێواز و تەرزی ژیانەوەی گیا، چاو لەو چاوانە بکەن کە بەخۆشەویستیەوە لێتان ڕادەمێنن...

میرزادە، مودەتێکی زۆر بوو بە پێوە ئەو قسانەی دەکرد. پیرەمێردە چکۆلەکە، بە ترس و نیگەرانیەوە تەمەشای دەکرد. لیزاڤیتا پروکوفیڤنا بە نائومێدیەوە دەستێکی هەڵتەکاند و هاواری کرد: "ئاه... خودایا!..." چونکە لەپێش هەموانەوە دەیزانی چ کارەساتێ بەڕێوەیە. ئاگلایا، بەهەشتاو لە کاتی خۆیدا، گەیشتە میرزادە تا بیگرێت و نەیەڵێ بکەوێ. سیمای ترساوی ئاگلایا لە خەمینیدا، تەواو شێواو بوو. گوێی لە هاواری هۆڤیانەی ڕوحێک بوو کە "پەلاماری ئەو گەنجە بەلەنگازەی داو کوتای بە عاردیدا". میرزادە یەک تەختە لەسەر مافورەکە کەوت. یەکێک بەپەلە سەرینێکی گەیاندێ و خستیە ژێر سەری.

کەس چاوەڕوانی ئەم کۆتاییە نەبوو. دوای چارەکە سەعاتێک، میرزادە "ن..." و یەڤگینی پاڤلوفیچ و پیرەمێردە چکۆلەکە، هەوڵیان دا بەگوێرەی توانا، گیانێک وەبەر ئاهەنگەکەدا بکەنەوە و ڕەونەقێکی تازەی پێ ببەخشن، بەڵام دوای نیو سەعاتێک، میوانەکان بەدەم دەربڕینی هاوخەمی و داخ و پەژارە و وردە تەعلیقانەوە بڵاوەیان لێ کرد. تەعلیقی ئیڤان پترۆفیچ ئەمە بوو کە "ئەم گەنجە هەواداری سلاڤیەکان* یان شتێکی لەو بابەتەیە، بەهەرحاڵ، کەسێکی ترسناک نییە." پیرەمێردەکە هیچ قسەیەکی نەکرد، تاقە وشەیەکی نەگوت. دروستە کە پاشان، واتە بۆ سبەی و دوو سبەی، هەموویان کەم تا زۆر زویر و نارەحەت بوون. تەنانەت (ئیڤان پترۆفیچ)ش ڕەنجا بوو، بەڵام

زۆر نـا. جەنـەڕاڵ، سـەرۆکی ئیڤـان فیـدوروفیچ، تـا ماوەیـەک لـە ئیڤـان فیدوروفیچ زویر بوو. "گەورە فەرمانبەرەکە" کە پشت و پەنای خانەوادەی یەپانچین بوو، لەلای خۆیەوە، چەند ئامۆژگارییەکی بە گوێی سەرگەڤاری خێزانەکەدا چپاند و زۆر بە ڕاشکاوی و بە لوتفەوە خەمخۆری و پەرۆشی خۆی بۆ ئاگلایا و چارەنووس و ئایینـدەی ئاگلایا دەربڕی. بە ڕاستی پیاوێکی دڵسۆز بوو، بەڵام ئەوەی لەو شەوەدا، سەبارەت بە میرزادە پتر سـەرنجی ڕاکێشـا بـوو، ئەوە بـوو کـە بیسـتبووی سەروسـرێکی دەگـەڵ ناستاسـیا فیلیپوڤنـادا هەیـە. ئەو شـتە کەمـەی لەو بـارەیەوە بیسـتبووی، سەرسامیان کردبوو. تەنانـەت ویستبووی چەند پرسیارێک لەو بارەیەوە بکات.

دۆتمیر خانم بیلوکونسکایاش، دوای ئاهەنگەکە، لە هەستانا بە لیزاڤیتا پروکوفیڤنای گوت:

– چیت پێ بڵێم؟ هەم باشە و هەم خراپ، ئەگەر ڕەئی منت دەوێ، زیاتر مایلە بەلای خراپا تا باش. بە خۆت دەیبینی چتۆ پیاوێکە: نەخۆشە!

ئیدی لیزاڤیتا پروکوفیڤنا لە دڵی خۆیدا بڕیاری کۆتایی دا کە میرزادە بۆ ئەوە ناشێت ببێ بە مێردی ئاگلایا. بۆیە ئەو شەوە بەڵێنی بە خۆی دا کە " تا من لە ژیانا بم نایەڵم ئاگلایا شوو بە میرزادە بکات." بەیانی بە هەمان عەزمی جەزمەوە لە خەو ڕابوو، بەڵام لە کاتی نیوەڕۆژەدا، دوای نیوەڕۆ بە ماوەیەکی کەم، لە ناخی خۆیا تووشی کێشماکێشێکی نائاسایی بوو.

ئاگلایا لە وەڵامی پرسیارێکی هەر دوو خوشکەکەیدا، بە شێوەیەکی گۆنگ و زیرەکانە، زۆر بە پارێزەوە، بە ساردییەکی پڕ ئیفادەوە گوتی:

– من هیچ بەڵێنێکم نەداوەتێ، قەتیش ڕۆژێ لە ڕۆژان بە دەزگیرانی خۆمم نەزانیوە. وەکو هەر کەسێکی دیکە تەمەشام کردووە و تەمەشای دەکەم.

لیزاڤیتا پروکوفیڤنا لەپڕ هەڵی دایە و بە خەمینی گوتی

– چاوەڕوانی قسەی وام لە تۆ نەدەکرد! من دەزانم کە ئەو بە کەڵکی

ئەوە نایە ببێ بە مێردت، سوپاس بۆ خوا کە شتەکە بەم شێوەیە بڕایەوە و کۆتایی هات! بەڵام هەرگیز چاوەڕوانی ئەوەم نەدەکرد ئەم جۆرە قسانە لە تۆ ببیستم! تۆ لە خەیاڵی مندا شتێکی جیاواز تر بووی لەمەی کە ئێستا دەتبینم. زۆر جیاوازتر بوویت. من بەش بەحاڵی خۆم ئەو بە هەموو ئەو میوانانەی دوێنێ ناگۆڕمەوە، هەموو میوانەکان بەلایەک ئەو بە تەنیا بەلایەک. ئامادەم دەستبەرداری هەموویان ببم، بەڵام دەستبەرداری ئەو نابم. ئەوە ڕەئی منە بە ڕانبەری!...

لیزاڤیتا پروکوفیڤنا کە لەو قسانە بووەوە، لەپڕ وەکو ئەوەی لە قسەکانی خۆی ترسابێ، بێدەنگ بوو. ئاهـ... نەیدەزانی لەو ساتەدا چ بێ میهریەکی دەرهەق بە کچەکەی خۆی کردووە! ئاگلایا لە دڵی خۆیدا دوا بڕیاری دابوو. ئەویش چاوەڕوانی ئەو کاتە بوو کە کۆتایی بە هەموو شتێک بێنێ و هەر ئاماژەیەک، هەر کینایە و تەشەرێک، زامێکی قووڵی دەکردە دڵی.

پەراوێز:

* - "ناتوانین..": لە دەقەکەدا بەلاتینییە.

* - "خلیستەکان..": تەریقەتێکە دەگەڕێتەوە بۆ کۆتایی سەدەی هەژدەیەم. تێکەڵەیەکە لە تەسەوف و... داروخانی...

* - "وازی لێ بێنن با قسە بکات..": لە دەقەکەدا بە فەرەنسییە.

* - "هەوادارانی سلاڤیەکان..": ئەو ڕێباز و بانگەوازە سلاڤییەی کە دۆستۆیفسکی کاری تیا دەکرد، هەر ڕێبازێک نەبوو بە مەبەستی بوژانەوە و ژیانەوەی سیاسی هەموو سلاڤییەکان، بەڵکو فەلسەفەیەکی ناسیونالیستیش بوو بۆ چارەسەری گشت کێشە جڤاکی و ئاکارییەکانی ڕووسیا.

## فەسڵی هەشتەم

سەرەتای ئەو بەیانیە بۆ میرزادە زۆر ناخۆش بوو، گیرۆدەی کۆمەڵێک هەستی بە سوێ و ژان بوو. دەکرا هۆی ئەمە بگەڕێنرێتەوە بۆ نەخۆشییەکەی، بەڵام سەرچاوەی خەم و پەژارەکەی زۆر گۆنگ و نادیار بوو، بەئاسانی دیاری نەدەکرا، ئەمە لە هەموو شتێکی دی پتر ئازاری دەدا. ڕاستە ڕووبەڕووی کۆمەڵێک واریقات و ڕووداوی نادیار، زۆر بە ئازار و بەسوێ بوو، بەڵام خەم و پەژارەکەی وی، زۆر لە سنووری بیر و تەسەوری ئەو، هێوەتر دەڕۆیشت. هەرچی دەکرد بۆی بەرهەق نەدەکرا. دەیزانی، بەتەنیا ناتوانێ نیگەرانی خۆی بڕەوێنێتەوە و هێوری بکاتەوە. بەرەبەرە ئەوەی لە دڵ و دەروون چەسپی کە ئەو ڕۆژە پێشهاتێکی نائاسایی و ڕیزپەڕی لێ ڕوودەدا. نۆرەفییەکەی دوێ شەوی، لە چاو خۆیدا سووک بوو. تەنیا کەمێک سەری قورس بوو و، تۆزێک گیانی دەیەشا. هەرچەندە لە ناخا نەخۆش و بریندار بوو، بەڵام مێشک و زەینی بە جوانی کاری دەکرد. زۆر درەنگ لە خەو ڕابوو، یەکسەر واریقاتەکانی دوێ شەوی، بەڕوونی وەیاد هاتنەوە. تەنانەت ئەوەشی وەبیر هاتەوە کە نیوسەعات دوای نۆرە فییەکە، بۆ ماڵەوەیان هێنابووەوە.

زانی، کە پەیکێک لەلایەن خانەوادەی یەپانچینەوە بۆ هەواڵ پرسینی

نێردراوە. پەیکێکی دی لە سەعات یازدە و نیودا دووبارە بۆ هەواڵ پرسینی هاتبوو. بەمە خۆشحاڵ بوو. ڤیرا لیبدیفا، لەپێش هەموو کەسێکا هاتبووە دیدەنی و هەواڵپرسینی. هەر کە چاوی بە میرزادە کەوتبوو، لە هۆڕژنی گریانی دابوو، بەڵام کاتێ میرزادە دڵخۆشی دایەوە و هێوری کردەوە، گریانەکەی بوو بە پێکەنین. میرزادە کە ئەو هەموو سۆز و هاوخەمیەی لە کیژێ بینی، زۆر موتەئەسیر بوو، پەلاماری دەستی دا و ماچی کرد. کچە ڕەنگی سوور هەڵگەڕا، خێرا دەستی ڕاپسکاند و بە نیگەرانیەوە گوتی:

- ئاهـ.. نا، نا، ئەوە چی دەکەی؟

کیژێ کە زۆر پەشۆکابوو، زوو وەدەر کەوت، بەڵام پێش ئەوەی بڕوات، ئەوەی بۆ میرزادە گێڕایەوە کە بابی بەیانی زوو چووە بۆ ماڵی "ڕەحمەتی" (ڤیرا بەو شێوەیە ناوی جەنەراڵ ئیڤولگینی برد). تا بزانێ ئاخۆ شەوێ مردووە یان هێشتا ماوە. دەڵێن جەنەراڵ زۆر نەخۆشە و زاهیری بەو زوانە دەمرێت.

کاتێ لیبدیف پێش نیوەڕۆ بۆ ماڵ گەڕایەوە، بە خۆی هاتە دیدەنی میرزادە و پێی گوت: "پەلەیەتی وتەنیا و بۆ یەک دەقیقە هاتووە تا هەواڵی تەندروستی و سەلامەتیی بەڕێزیان بپرسێت". هەروەها یەکجارەکی چاوێک بە "گەنجینە چکۆلەکەی دا" دەگێڕێت. لەو ماوەیەدا بەردەوام هەر ناڵ و نک و پەکوپۆی بوو، بۆیە میرزادە یەکسەر دەری کرد، بەڵام لیبدیف بەو حاڵەشەوە دەیویست لە چۆنیەتیی تۆرەفێیەکەی دوێشەوی میرزادە بپرسێت، هەرچەند دیار بوو کە لەوسەری مەسەلەکە دێتەوە و بەورد و درشتی زانیوە.

دوای لیبدیف، کولیا هات، ئەویش تەنیا بۆ یەک دەقیقە هاتبوو، بەڵام ئەو بە ڕاستی پەلەی بوو، زۆر نیگەران و خەمبار و نائومێد بوو. داوای لە میرزادە کرد کە هەر هەموو شتەکانی بە ڕاشکاوی بۆ بگێڕێتەوە، ئەوەشی گوت کە دوێنێ تەقریبەن هەموو شتێکیان بۆ گێڕاوەتەوە و زۆری خەم بووە.

میرزادە، بەوپەڕی لوتف و دڵپاکی و مەحەبەتەوە، ورد و درشتی حاڵ

و حیکایەتەکەی بۆ گێڕایەوە. واریقاتەکانی لە سیری تا پیازی بۆ باس کرد. کوڕیژگەی تاین بە جۆرێ حەپەسا، کە زاری لە گۆ کەوت و تاقە وشەیەکی بۆ نەهات، بە بێدەنگی کەوتە ڕوندک ڕژان. میرزادە، هەستی دەکرد، ئەم هەستە یەکێکە لەو ئینتیباعاتانەی کە قەت لەبیر ناچنەوە و لە دڵ و دەروون ناسڕێنەوە و دەکەنە وەرچەرخانێک لە ژیانی مێردمنداڵێک. بۆچوونی خۆی لەسەر مەسەلەکە و چۆنیەتی چارەسەری مەسەلەکە بۆ باس کرد و هەنگێ گوتی کە بە نۆڕینی وی، مەرگی پیرەمێرد، ڕەنگە بگەڕێتەوە بۆ ئەو ترسەی کە دوای ئەو کارە خراپەی لێی سادربوو، کەوتە دڵیەوە، ئەمە گاڵتە نییە، هەموو کەس بەرگەی ناگرێت. کاتێ میرزادە لە قسەکانی بووەوە، چاوانی کولیا پرشنگیان دا و گوتی:

– گانیا و ڤاریا و پتیتسن زۆر تووڕە هاتن! بەتەمانیم دەگەڵیان بە شەڕ بێم، بەڵام لەمڕۆ بەدواوە تەواو، هەر کەسە و بەڕێی خۆی. ڕێمان جیادەبێتەوە! ئاهـ میرزادە، لە دوێنێوە زۆر شتی تازەم بۆ دەرکەوتووە. ئەمە دەبێ بە پەند و دەرس بۆ من! لە ئێستا بەدواوە ئەرکی بەخێوکردنی دایکم دەگرمە ئەستۆی خۆم، لەسەرمە، هەموو پێویستییەکی بۆ دابین بکەم. هەرچەندە ژیانی لە نک ڤاریا مسۆگەرە، بەڵام ئەمە شتێکی...

کولیا، لەپڕ بیریکەوتەوە کە چاوەڕوانین، بەپەلە هەستا، لە حاڵی میرزادەی پرسی، کە گوێی لە وەڵامی میرزادە بوو، بە تاسەوە گوتی:

– هیچی تر نییە؟ بیستم کە دوێنێ... (هەرچەند ئەمە پەیوەندی بە منەوە نییە، هەقی ئەوەم نییە هیچ بڵێم)... بەهەرحاڵ هەر کاتێ پێویستت بە خزمەتکارێکی ئەمەکدار بوو، بۆ هەر کارێک، ئەوا بەندە لە بەردەستا و لە خزمەتتدایە. پێم وایە ئێمە، نە تۆ و نە من، شتاقمان بەختەوەر نین، وانییە؟ بەڵام... من لێت ناپرسم... لێت ناپرسم...

کاتێ کولیا ڕۆیشت، میرزادە بە تاقی تەنیا دەبیرەوە چوو، ئەمما دەبیرەوە چوون! . هەموو هاوڕێکانی پێشبینی بەدبەختی و کلۆڵیان بۆ دەکرد. هەموو گەیبوونە ئەنجامگیری خۆیان، هەموویان لەوە دەچوو شتێک بزانن کە ئەم نەیدەزانی. لیبدیف، هەندێ پرسیاری گۆنگی دەکرد،

کولیا هەندێ ئاماژانی دەکرد، ڤیرا دەگریا. میرزادە، ئەنجام بە تورەیی دەستێکی تەکان دا و ئەو مەسەلەیەی لە مێشکی خۆی وەدەرنا: "نەفرەت لە گومان و دوودڵی. نەخۆشیە!". دەوروبەری سەعات دوو، میرزادە کە بینییماڵباتی یەپانچین "بۆ دەقیقەیەک" هاتوونەتە دیدەنی. ڕووی گەشایەوە و هێور بووەوە. هەر بە ڕاستی بە سەردانێکی یەک دەقیقەیی هاتبوون. لیزاڤیتا پروکۆفیڤنا دوای فراڤین ڕایگەیاندبوو کە بە کۆمەڵ دەچنە پیاسە و گەڕان. ئەو قسەیەی وەکو فەرمان، بنجیڕ و بێ چەند و چوون و هیچ ڕوونکردنەوەیەک کردبوو. هەموو وەدەر کەوتن، واتە لیزاڤیتا و کچەکان و میرزادە "س...". لیزاڤیتا پروکۆفیڤنا بە ڕێگایەکدا ڕۆیی ڕێک پێچەوانەی ڕێگای ڕۆژانی دیکەیان بوو. هەموو زانیان بە نیازی چییە، بەڵام لە ترسی ئەوەی دایکیان تورە نەبێت، بێدەنگیان لێ کرد، ئەویش، وەکو ئەوەی بیەوێ خۆی لە گلەیی و گازاندەی وان بپارێزێ، لە پێشەوە دەڕۆیشت و هەر ئاوڕیشی نەدەدایەوە. ئادیلاید، لە ئەنجاما ئاگاداری کرد کە پیاسە و گەڕان، ئەو ڕاکە ڕاکەیەی ناوێ، ئەگەر وابڕوات بە پێیدا ناگەن.

لیزاڤتا پروکۆفیڤنا، ئاوڕێکی پاشەوەی دایەوە و گوتی:

– ئێمە ئێستا لە نزیکی ماڵەکەی ئەوداین، ماڵەکەی لە سەر ڕێگەمانە. ئاگلایا هەرچییەک دەڵێ با بۆ خۆی بیڵێ، ئەم کوڕە بێگانە نییە، خزمی خۆمانە، بە تایبەتی کە هەنوکە نەخۆشە. جا من سەری دەدەم، کێ دێ لەگەڵما بابێت، کێش بەدڵی نییە با بچێتە پیاسەی خۆی.

هەڵبەتە هەمووان دەگەڵی چوون. میرزادە، یەکسەر و بە شێوەیەکی زۆر لەبار، داوای بوردنی کرد کە دوێشە و گوڵدانەکەی شکاندوە و ئەو فەزیحەتەی ناوەتەوە...

لیزاڤیتا پروکۆفیڤنا گوتی:

– هەر باسی مەکە، گرینگ نییە. من خەمی شکانی گوڵدانەکەم نییە، بەڵکو خەمی تۆمە. کەواتە دەزانیت چ قەوما: کە ئەو شتانە ڕوو دەدا پیاو بۆ سبەینێ بەتەواوەتی هەستی پێ دەکات!... بەڵام گوێی مەدەیە. هەموو کەس دەزانێ کە تۆ بەئانقەست ئەوەت نەکردووە. دەی، ئێمە دەڕۆین! ئەگەر بە

خۆتا ڕادەپەڕمووی و تاقەتت هەیە، بە قسەی من بکە و بچۆ پیاسەیەک بکە و وەرەوە، دووبارە بخەوە. خۆ ئەگەر ویستت وەکو جاران سەردانمان بکەیت، هەر کاتێ دێی وەرە، ماڵی خۆتە. دڵنیابە، هەرشتێک ڕوویدات، تۆ هەر دۆستی خانەوادەی ئێمەیت، بەلای کەمەوە دۆستی منیت. دەسەڵاتی کەسم نەبێ، دەسەڵاتی خۆمم هەیە...

هەموو بەدحاڵی بوون و ناکۆکیەک وەلانرا، ئەوانی دیکەش پشتیوانیان لە دایکیان کرد و هەمان هەستی ئەویان دەربڕی. پاشان هەستان و ڕۆیشتن، بەڵام ئەو پەلەکردنە ساکارانەیەی ئەوان، لە دڵدانەوەی ئەو بەلەنگازە داماوە، هێندەی دی دەردی میرزادەی گران کرد، ئەمە شتێک بوو لیزاڤیتا پروکۆفیڤنا، پەی پێ نەدەبرد. خوڵک کردنی بۆ سەردانیان "وەکو جاران" و دەستەواژەی "بەلای کەمەوە دۆستی منیت" ژاراوی نەشتەر بوو و درا لە جەرگی. بۆنی جۆرە هۆشدارییەکی لێدەهات.

میرزادە، وەزع و حاڵی ئاگلایای هێنایەوە بەرچاوی خۆی. دروستە، هەم لە هاتندا و هەم لە ڕۆیشتندا، بزەیەکی دڵڕفێنی بە ڕوویادا، بەڵام تاقە وشەیەکی لە زار نەهاتە دەرێ، تەنانەت ئەو کاتەش کە ئەوانی دی دۆستایەتی خۆیان بۆ دووپات کردبووەوە، ئاگلایا هەر هیچی نەگوتبوو. وێڕای ئەوەش یەک دوو جار بە دیقەت تەماشای کردبوو. ڕەنگی ئاگلایا لە هەموو کاتێ پتر بزڕکابوو، لەوە دەچوو شەوێکی ناخۆشی گوزەراندبێ. میرزادە لێبڕا هەر ئەو ئێوارەیە "وەکو جاران" سەریان بدات، بە تاسەوە ڕوانییە سەعاتەکەی.

دوای ڕۆیشتنی یەپانچینەکان بە سێ دەقیقەیەک، ڤیرا خۆی وەژوورا کرد و گوتی:

- لیون نیکولایەفیچ، ئاگلایا ئیڤانوڤنا، تۆزێ لەمەوپێش ڕای سپاردم کە پەیامێکی نهێنیت بگەیەنمێ.

میرزادە، بە ڕادەیەک هەڵچوو کە ئازای کەوتە لەرزین. گوتی:

- پەیامی نووسراوە؟

- نەخێر، پەیامێکی زارەکیە، تەنانەت بۆ ئەمەش وەختی تەواوی نەبوو.

داوات لێ دەکات کە ئەمڕۆ بۆ دەقیقەکیش، تا سەعات حەوت یان نۆ لە ماڵ نەچیتە دەرێ. جوان تێنەگەیشتم سەعات حەوتی گوت یان نۆ.

- ئاخر بۆ؟ مەبەستی چییە؟

- نازانم، بەڵام بە ئەمر، ئەمری پێ کردم کە ئەم پەیامەت بگەیەنمێ.

- یانی دەقاودەق بە ئەمر، ئەمری پێ کردیت؟

- یانی دەقاودەق بەو شێوەیە نا، چونکە لەسەر ڕێ بوو وکاتی نەبوو، باش بوو من بە غار خۆم گەیاندێ، بەڵام چونکە بەدەم قسەوە سەری بۆ ئەودیو وەرگێڕا، هەر لە ناوەڕۆکی قسەکەی نەک لە دەقی قسەکەی، حاڵی بووم، بەڵام بە دەموچاویا دیار بوو کە زۆر بە جدیەتی. نیگایەکی ئەوتۆی کردم کە دڵم داخورپا...

میرزادە، دوو سێ پرسیاری دیکەی کرد، بەڵام لەوە زیاتری هەڵنەکڕاند. زیاتر نیگەران و شپرزەبوو. کە ڤیرا ڕۆیشت و بە تەنێ مایەوە، لەسەر تەختەخەوەکەی ڕاکشا و لە فکران ڕاچوو، بەناو خەیالات و لێکدانەوەکانی خۆی کەوت: "لەوەیە تا سەعات نۆ میوانیان هەبێت و بترسێت پۆتێکی دیکە بشکێنم". بەدەم ئەو بیر و خەیالانەوە، بێ سەبر و ئۆقرە، بەدەم تەماشاکردنی سەعاتەکەیەوە، چاوەڕوانی هاتنی شەوی دەکرد.

بەڵام ئەم مەتەڵە بە ماوەیەکی زۆر پێش ڕۆژئاوا، دەگەڵ هاتنی میوانێکی دیدا، کە بووە مایەی دەرکەوتنی مەتەڵێکی تازەی گۆنگ ترو نیگەران ئەنگێزتر لە هی یەکەم، ڕوون بووەوە. دوای ڕۆیشتنی ماڵباتی یەپانچین، بە نیوسەعات، هیپولیت خۆی بە ژوورا کرد. ئەوەندە شەکەت و ماندوو و بێتاقەت بوو، بێ ئەوەی بتوانێ تاقە قسەیەک بکات، وەکو کەسێک ببورێتەوە، خۆی دا بە کۆڵی کورسییەکدا، کۆکەیەکی وشک و توند گرتی، ئەوەندە کۆکی تا خوێنی هەڵێنا. چاوەکانی دەبریسکانەوە، پەڵەی سوور کەوتنە سەر گۆناکانی. کە میرزادە لەبن لێوانەوە چەند قسەیەکی دەگەڵ کرد، هیچ وەڵامێکی نەدایەوە، تەنیا بە ئاماژەی دەست تێی گەیاند کە جارێ وازی لێ بێنێ تا هەناسەی وەبەر بێتەوە. ئەنجام وەخۆ هاتەوە، بە

دەنگێکی قرخن و بە زەحمەتێکی زۆر گوتی:

- من دەڕۆم!

میرزادە هەستا و گوتی:

- دەگەڵت بێم؟

بەڵام لەپڕ بیری کەوتەوە، کە تۆزێ لەوەوپێش پێی ڕاگەیەنرابوو کە نەچێتە دەرەوە، بۆیە ئیدی بێدەنگ بوو.

هیپولیت دەستی بە پێکەنین کرد. بە هانکەهانک و قرخەقرخ گەروی پاک کردەوە و گوتی:

- من خۆم لە تۆ دوور ناگرم. بەپێچەوانەوە، بە پێویستم زانی کە بێم سەرێکت بدەم و باسی شتێکت دەگەڵ بکەم... وانەبووایە ئەزیەتم نەدەدایت. من لای ئەوان دەڕۆم. پێم وایە ئەم جارەیان مەسەلەکە جدیە، کارم کراوە! تەواو. باوەڕبکە بۆ سواڵی بەزەیی ئەم قسەیە ناکەم... تەنانەت ئەم بەیانیە سەعات دە، لەسەر جێگاکەم پاڵ کەوتم و لێبڕام تا هاتنی "ئەو ساتە" هەڵنەستم، بەڵام دوایی ڕەئیم گۆڕی، جارێکی دی هەستامەوە تا بێم بۆ ئێرە، بۆلای تۆ، چونکە پێم واجب بوو.

- زۆر لاواز دیاریت. دەبوایە بنێریت بە دوما من بێم بۆ لای تۆ، نەک تۆ ئەزیەت بکێشی و بۆ لای من بێی.

- ئێ، دەی ئەم قسانە بەسە. بەگوێرەی پێویست و بەپێی ئەتەکێتی کۆمەڵایەتی، هاوسۆزی خۆتت دەگەڵ نواندم. ئا... بیرم چوو: سیحەتت چۆنە؟

- سیحەتم، ئێستا باشە. دوێنێ باش نەبووم...

- بیستم، بیستم. بۆیان گێڕامەوە. گوڵدانە چینیەکە سەرودڵی گرتیت. حەیفێ من لەوێ نەبووم! بەڵام بابێمە سەر ئەو شتەی کە بۆی هاتووم. ئەمڕۆ بە دیداری گاڤریلا ئاردالیونوفیچ شاد بووم کە دەگەڵ ئاگلایا ئیڤانوڤیچدا، لەلای تەختە کەسکەکە ژوانی هەبوو... بە ڕاستی گەوجایەتی هەندێ کەسم زۆر پێ سەیرە. کە گاڤریلا ئاردالیونوفیچ ڕۆیشت، ئەم سەرنجەم بە خودی ئاگلایاش گوت.




ئەوجا هیپولیت، کە بە گومانەوە دەیڕوانییە سیمای میرزادە، کە گوزارشتی لە هیچ شتێک نەدەکرد و، لەسەری ڕۆیشت:

- پێم وایە میرزادە تۆ هیچ شتێکت پێ سەیر نییە. دەڵێن کە مرۆڤ سەری لە هیچ شتێک سوور نەمێنێ، ئەمە نیشانەی ئەوپەڕی بە هۆشییە، بەڵام بە ڕای من ڕەنگە ئەمە نیشانەی گەوجێتییەکی قووڵیش بێ!... هەڵبەتە مەبەستم تۆ نییە... ببوورە... ئەمڕۆ قسەم بە جوانی و بەگوێرەی مەبەستی خۆم بۆ نایەت.

میرزادە هاتە قسان و گوتی:

- لەدوێنێوە دەمزانی کە گاڤریلا ئاردالیونوفیچ...

بەڵام لەپڕ، بە نیگەرانی و پەشێوییەکی ئاشکراوە، بێدەنگ بوو. تەنانەت (هیپولیت)ش لەوە نارەحەت بوو کە نەی توانیبوو وەکو پێویست تیژی بکات.

- دەمزانی! ئەمەم نەزانی بووا... بەهەرحاڵ، پێویست ناکا بۆمی بگێڕیتەوە... ئەدی دیدارەکەی ئەمڕۆشیانت نەبینی؟

- ئەگەر ڕاست بێ خۆت لەوێ بوو بی، هەڵبەتە دەتزانی کە من لەوێ نەبووم.

- گوتم ئێ لە پەنا دەوەنێکا، لە شوێنێکا خۆت مات دابوو بێ. بەهەرحاڵ، من خۆشحاڵم، چونکە خەمی ئەوەم بوو کە نەبا گاڤریلا ئاردالیونوفیچ، دڵی کچەکەی دزی بێ و جێی تۆی لای ئەو، گرتبێتەوە.

- تکایە هیپولیت باسی ئەو شتە بۆ من مەکە، بە تایبەتی بەم شێوازە.

- بە تایبەتی کە بە خۆت هەموو شتێک دەزانی...

- تۆ هەڵەی. من تەقریبەن ئاگام لە هیچ نییە، هەڵبەتە ئاگلایا ئیڤانۆڤنا، چاک دەزانێ، کە من هیچ شتێک لەم بارەیەوە نازانم. تەنانەت ئاگام لەو ژوانەشیان نییە. تۆ ناڵێی ژوانیان هەبووە؟ زۆر باشە... ئێمە هیچ کارێکمان بەمە نییە...

- پیاو سەر لە تۆ دەرناکات! جارێک دەڵێی دەتزانی، جارێک دەڵێی ئاگات لە هیچ نییە، ئێستاش دەڵێی: "زۆر باشە... ئێمە هیچ کارێکمان بەمە نییە..."





بەڵام نا، نابێ ئەوەندەش خۆشباوەڕبیت! بەتایبەتی دەربارەی شتێ کە نەیزانی! هۆی ئەم هەموو خۆشباوەڕیەت ئەوەیە کە ئاگات لە شتەکان نییە. باشە تۆ دەزانی ئەو جووتە خوشک و برایە چ نەخشەیەکیان بەدەستەوەیە؟ ڕەنگە سووسەی شتێکت کردبێ، ها؟

هیپولیت کە چاوی بە جم و جووڵ و ناڕەحەتی میرزادە کەوت، خێرا لەسەری ڕۆیشت و گوتی:

– زۆر باشە، باشە... واز لەمە دێنم... من بۆ کارێکی تایبەتی خۆم هاتبووم، دەمەوێ بۆتی باس بکەم!... خوامەرگ... بۆ نەگبەتی زۆریش دووروودرێژە... حەوسەڵەی گوێگرتنت هەیە؟

– فەرموو، گوێم لێتە.

– چاکە، بەڵام دیسان ڕەئی خۆم گۆڕی: لەباسی گانیاوە دەست پێ دەکەم. تەسەور دەکەی، منیش ئەمڕۆ، لەوێندەر، لای تەختە کەسکەکە مەوعیدم هەبوو؟! جا بۆ ئەوەی بە درۆزن دەرنەچم، دەبێ ئەوەت پێ بڵێم کە من بە زۆری خۆم ئەو دیدارەم ساز کرد، بە بەڵێنی کەشفکردنی ڕازێک ئەو دیدارەم سازکرد. نازانم ئاخۆ زۆر زوو ڕۆیشتبووم یان نا (پێم وایە زۆر زوو بوو)، بەڵام تازە لەتەنیشت ئاگلایا ئیڤانوڤناوە دانیشتبووم، دیقەتم دا گاڤریلا ئاردالیونوفیچ و ڤارڤاریا، قۆڵ لە قۆڵی یەکترا، وەکو ئەوەی پیاسەبکەن، گەیینە ئەوێندەر. کە چاویان بە من کەوت پەشۆکان، حەپەسان، غافڵگیربوون، تەنانەت پێشیان ناخۆش بوو، چونکە چاوەڕوانی ئەوەیان نەدەکرد من لەوێندەر بم. ئاگلایا ئیڤانوڤنا، سوور سوور بووەوە، باوەڕم پێ بکە. بە ڕادەیەک پەشۆکا، خەریک بوو کۆنترۆڵی خۆی لەدەست بدات، ئیدی نازانم لەبەر ئەوە بوو کە من لەوێ بووم یان هەر لەبەر دیتنی گاڤریلا ئاردالیونوفیچ بوو، کە بە ڕاستی پیاوێکی قۆز بوو. بەهەرحاڵ ئاگلایا سوور سوور بووەوە، لە زەرفی چەند سانیەیەکدا، مەسەلەکەی یەکلایی کردەوە. چاوێکی داگرت، نیوە ئاخێزێکی بۆ کرد، بە سەر سڵاوەکەی گاڤریلا ئاردالیونوڤیچ و بزە پڕ مەرایەکەی ڤارڤارای خوشکی سەندەوە. لەپڕ گوتی: "من تەنیا بۆ ئەوە هاتووم کە سوپاسی هەست و





سۆزی ڕاستەقینە و ڕاستگۆیانەی ئێوە بکەم. دڵنیا بن هەر کاتێ پێویستم بەو هەست و سۆزە بێ، پەنای بۆ دێنم" هەنگێ بەئاماژەی سەر بەڕێی کردن، بە دوو قۆڵی ڕۆیشتن، ئیدی نازانم بە ژێرکەوتووی ڕۆیشتن یان بە سەرکەوتووی...

بەڵام سیمای گانیا، گەوجێتیی لێ دەباری. سەری لەم دیمەنە دەر نەکرد، دەموچاوی سوور سوور بووەوە (هەندێ جار دەموچاوی سەیر دەگۆڕی!) بەڵام ڤارڤارا ئاردالیونوڤنا، پێم وایە یەکسەر تێگەیشت بوو، کە تا زووتر بڕۆن و لەوناوە نەمێنن، درەنگە. ڕەفتاری ئاگلایا ئیڤانۆڤنا لەهەنبەر واندا بە ڕادەیەک ئاشکرا بوو، کە خێرا برایەکەی دوای خۆی خست و بردی. ڤارڤارا لە برایەکەی ئاقڵترە، من دڵنیام ئێستا سەرکۆنەی دەکات، بەڵام من بۆ ئەوە چووبووم کە دەگەڵ ئاگلایادا باسی تەرتیبی ئەو دیدارە بکەم کە قەرار بوو دەگەڵ ناستاسیا فیلیپوڤنادا بیکات.

میرزادە هاواری کرد:

- دەگەڵ ناستاسیا فیلیپوڤنا؟

- هێواش، هێواش! لەوەدەچێ سەبرت سوابێ، خەریکە سەرت سووردەمێنێ. ها؟ زۆرم پێ خۆشە کە دەبینم خەریکە لە بەشەران بچیت. جا بەو بۆنەیەوە نوکتەیەکی خۆشت بۆ دەگێڕمەوە. دەزانی من لەهەنبەر چاکە و خزمەت بە کچێکی گەنجی ئاقڵ و ئاغر چ پاداشتێکم وەرگرت؟ ئەمڕۆ شەقازللەیەکی مزرم بە دەستی خوارد!

میرزادە، بە خۆی نەوەستا و پرسی:

- هەڵبەتە، شەقازللەیەکی مەعـ..نەوی؟

- بەڵێ، مەعنەوی نەک بەدەنی. باوەڕناکەم کەس هەبێ دەست لە کەسێکی وەکو من بکاتەوە. تەنانەت ژنیش دەست لە من ناکاتەوە. گانیاش، ڕێ بە خۆی نادات لە من بدات. کەچی دوێنێ، هەر لە خۆمەوە وام بە خەیاڵدا هات کە لەگینە پەلامارم بدات و تا دەجووڵێم بمجووڵێنێ، تێر و پڕم دارکاری بکات... نا... باوەڕبکە. دەزانم ئێستا بیر لە چی دەکەیتەوە. لە دڵی خۆتا دەڵێی: "پێم وایە ناشێت لێی بدرێ، بەڵام دەشێت و پێویستە، لە کاتی

خەوا سەرینێک یان پارچە پەڕۆیەکی تەڕ بخرێتە سەر دەمی و خەفە بکرێ..." تائێستا ئەو بیرەت لە مێشکایە. بەئاشکرا ئەوە لە دەموچاوتا دەخوێنمەوە.

میرزادە، بە نارەزاییەوە گوتی:

- هەرگیز شتی وام بە بیردا نەهاتوە. نازانم... بەڵام دوێشە و لە خەوما یەکێک خەریک بوو بە پەڕۆ کۆنەیەکی تەڕ دەیخنکاندم... پێت دەڵێم ئەو کەسەم کێ بوو. تەسەور دەکەی ڕۆگۆژین بوو! ڕەئیت چییە؟ باشە دەشێت مرۆڤێک بە پەڕۆ کۆنی تەڕ بخنکێنرێ؟

- نازانم...

- وەکو بیستوومە شتی وا دەشێت. دەی باشە، با واز لەمە بێنین و باسی نەکەین. ئێستا دەمەوێ ئەم پرسیارە بکەم: من بە چیا و چۆن دوو زمانم؟ بۆچی ئەمرۆکە بە دوو زمان ناوی بردم؟ تەسەورکە، دوای ئەوەی گوێی لە هەموو قسەکانم گرت، دوای ئەوەی هەموو پرسیارێکی خۆی کرد، ئەوجا ئەو قسەیەی پێ گوتم... بۆ ژن ئاوان! خۆ من لەبەر خاتری ئەو پەیوەندیم دەگەڵ ڕۆگوژیندا بەست و کەوتمە هاتوچۆی (بەهەرحاڵ پیاوێکی خۆشمەشرەفە). بۆ قازانجی ئەو دیدارێکم دەگەڵ ناستاسیا فیلیپوڤنادا بۆ ڕێکخست. تۆ بڵێی کە پێم گوت لە خۆشی "پاشماوە"ی ناستاسیا فیلیپوڤنا پێی بە عارد ناکەوێ، هەست و غرووریی بریندار بووبێ؟ من نکوڵی لەم حەقیقەتە ناکەم. چەندین جار ئەو قسەیەم بە گوێیدا دا، حاشای لێ ناکەم، بەڵام لەبەرخاتری ئەو و لە قازانج و بەرژەوەندی ئەوا ئەم شتەم هەمیشە بەگوێیدا دەدایەوە. دوو نامەم بەم مانا و بام ناوەڕۆکەوە بۆ نووسی، لە دیداری ئەمرۆکەشماندا بە هەمان شێوە ڕەئی خۆمم بۆ دەربڕی... بە ئەرکی خۆمم زانی کە پێی بڵێم ئەمە بۆ ئەو شوورەییە. ئەمە جگە لەوەی کە ئەم وشەی "پاشماوە"یە. داهێنانی من نییە، بەڵکو من لە خەڵکی دیکەم وەرگرتووە، خۆ هەرنەبێ هەموو ماڵی گانیا بەکاری دەبەن، ئاگلایا بە خۆیشی ئەوەی سەلماند. ئیدی بۆ دەبێ پێم بڵێ دوو زمان؟ دەبینم، زۆر بەڕوونی دەبینم، لە نیگاکردنەکەتا دیارە. کە لە

ناخی ناخەوە، گاڵتەت پێم دێ، خەریکە لە پێکەنینا دەکولێی، دڵنیام لە دڵی خۆتا ئەم بەیتە سەخیفانە* بە باڵام دەبڕیت:

لە ڕۆژی خەمناکی
ماڵاوایی منا
با ئەشق
لە شێوەی زەردەخەنەی
ماڵاواییدا
لەسەر لێوانم هەڵبێ...
ها، ها، ها!

بەو جۆرە لە قاقای پێکەنینێکی تووڕەی دا، ما بەدوایا بکۆکێ. بەدەم کۆکە کۆکەوە، بە دەنگێکی قرخن لەسەری ڕۆیشت:

- تۆ تەماشا ئەم گانیایە چۆنە: لەلایەکەوە باسی "پاشماوە" دەکات، لەلایەکی ترەوە بە خۆی لە هەوڵ و هەڵپەی بە دەست هێنانی "پاشماوەیە"؟

میرزادە، قەدەرێکی تەواو بێدەنگ بوو. شۆک بووبوو، ئەنجام لەبن لێوانەوە گوتی:

- باسی دیدارێکت دەگەڵ ناستاسیا فیلیپوڤنادا کرد، وانییە؟

- واز لەو باسە بێنە، خۆ خوانەخواستە ناتەوێ بڵێی بە ڕاستی ئاگات لەوە نییە کە قەرارە ئەمڕۆ ئاگلایا، ناستاسیا فیلیپوڤنا بدینێ؟ بە هۆی هەوڵی منەوە، ڕۆگوژین، لەبەر داوا و دڵی ئاگلایا ئیڤانوڤنا، ناردویەتی بە شوێن ناستاسیا فیلیپوڤنا، کە بە تایبەتی لە پترسبورگەوە بۆ ئێرەبێت، حاڵی حازر دەگەڵ ڕوگوژیندایە، لە نزیکی ماڵەکەی تۆدایە، لە کۆنە ماڵەکەی جارانیایە، یانی لای داریا ئەلکسیفنایە... یانی دەستە خوشکە ناوزڕاو و بەدناوەکەی... جا قەرارە ئاگلایا ئەمڕۆکە بچێ بۆ ئەو ماڵە بەدناوە و بۆ چارەسەری هەندێ گیروگرفتان، گفتوگۆیەکی دۆستانە دەگەڵ ناستاسیا فیلیپوفنادا بکات. گەرەکیانە بە زمانی بیرکاری قسان بکەن. تو شەرەفت، ئەمەت نەدەزانی؟

- ماقووڵ نییە! ناچێتە ئەقڵەوە!

- زۆر باشە! با ماقووڵ نەبێ، با باوەڕکردەنی نەبێ! بەڵام تۆ لەکوێ دەزانیت؟ هەرچەندە، لەم کاولە تەنگ و تەسکەی کە ئێمەی تیادا دەژین، ئەگەر مێشێکیش بفڕێت هەموو خەڵکی پێی دەزانن! بەهەرحاڵ من وا پێم گوتیت... تۆش هەقە مەمنوونی من بیت. دەی بە هیوای دیدار! کە ڕەنگە بکەویتە ئەو دنیا! قسەیەکی دی! دەشێت دەرهەق بە تۆ ڕەفتارێکی خراپ و ناشایستەم کردبێ، ئەمەیان... چونکە ماقوول نییە، بە ڕژەوەندی خۆم بکەم بە قوربانی بەرژەوەندی تۆ، ماقولە؟ تۆ خۆت داوەربە. ئاخر بۆچی بەرژەوەندیی تۆ پێش بەرژەوەندی خۆم؟ من "ئیعترافنامەکەی" خۆم پێشکەش بەو، بە ئاگلایا کرد (ئەوەت نەدەزانی؟) بە مەمنوونیەوە قەبووڵی کرد! ها ها! من هیچ ڕەفتارێکی نا شایستە یان هیچ بەد ڕەفتاریەکم لەهەنبەر ئەو نەکردووە. هیچ هەڵەیەکم دەرهەق بەو نەکردووە. بەڵکو ئەو داوی بۆ من ناوەتەوە و ئیحراجی کردووم، کەچی هێشتا ئەو سووکایەتیم پێ دەکات و دەمبوغزێنێ! من هیچ غەڵەتێکم دەربارەی تۆش نەکردووە، هەرچەندە ڕێگەم بە خۆمدا کە سەبارەت بەو ئاماژەیەک بۆ "پاشماوە"و ئەو شتانە بکەم. بۆیە ڕۆژ و سەعات و شوێنی دیدارەکەت بۆ دیاری دەکەم، ئەوەی ژێر بەڕەت بۆ دەخەمە سەر بەڕە!... هەڵبەتە من ئەمە لە ڕووی ڕق و کینەوە دەکەم نەک لە پیاوەتی و جوامێرییەوە! بە دووعا! من بەقەد کەسێکی زمانگر یان سیلاوی چەنەبازم. جا چاو بکەوە، خێرا فریا بکەوە، ئەگەر خۆت بە پیاو دەزانی، هەوڵوێست بنوێنە. دڵنیام ئەمشەو ئێوە یەکتر دەبینن.

هیپولیت، بەرە و دەرگاکە چوو، بەڵام چونکە میرزادە لە دواوە گازی کرد لە ئاستانەی دەرگاکەدا وەستا. میرزادە لێی پرسی:

- یانی بەقەناعەتی تۆ، ئاگلایا، ئەمڕۆ، بە خۆی دەچێت بۆ لای ناستاسیا فیلیپوڤنا؟

چەند پەڵەیەکی سوور کەوتنە سەر تەوێڵ و گۆناکانی. هیپولیت، تەمەشایەکی دواوەی خۆی کرد و بەرسڤی دایەوە:

- بە تەواوەتی نازانم، بەڵام دوور نییە. زیاتر وا دەبێ، چونکە ناستاسیا

فیلیپوڤنا ناچێ بۆلای ئەو، وانییە؟ خۆ لە ماڵی گانیاش نابێ، چونکە جەنەڕاڵ، خەریکە گیان دەدا، لە حاڵی مردندایە. ڕەئیت بە جەنەڕاڵ، چییە؟

میرزادە، قسەکەی پێ بڕی:

– گوی بگرە. هەر ئەم هۆیە، بۆخۆی، بەتەنیا بەسە کە ئەو شتە سەر نەگرێت، تەنانەت ئەگەر بشیەوێ بڕوات، چۆن دەتوانێ بچێتە دەرێ؟ تۆ عادەتی باوی ئەو ماڵە نازانیت. مەحاڵە بتوانێ بە تەنیا بچێ بۆ لای ناستاسیا فیلیپوڤنا. چما گاڵتەیە!

– تەمەشا میرزادە: بە خۆت دەزانی کەس لەپەنجەرەوە باز نادات، بەڵام ئەگەر ئاگرێک بکەوێتەوە، بەشەخسیەترین پیاو و سەنگیترین ژن ئەم کارە دەکەن. ئەگەر هیچ چارێک نەبێت و پێویست بکات، هەنگێ ئاگلایاش ناچارە ئەم ڕێگەیە بگرێتە بەر، بڕوات بۆ لای ناستاسیا فیلیپوڤنا. باشە کچانی یەپانچین، هیچ کاتێ بۆیان نییە لە ماڵ بێنە دەر و بڕۆن بۆ شوێنان؟

– نا، مەبەستم ئەمە نەبوو...

– باشە، جا ئەگەر مەبەستت ئەوە نییە و مەسەلەکەوانیە، هەر ئەوەندەی زەحمەتە تا لە دەرگای ماڵ دێتە دەرێ، هەنگێ بۆ خۆی ملی ڕێگا دەگرێت و مەرج نییە جارێکی دی بۆ ماڵ هەر بگەڕێتەوە. وەک دەڵێن چوون بەدەست خۆتە، هاتنەوە بە دەست خۆت نییە. هەندێ جار ئینسان ناچار دەبێت، پردی گەڕانەوەی خۆی بڕوخێنێت و بۆ ماڵی داک و بابی خۆی نەگەڕێتەوە. ژیان، هەر فراڤین و شێو و میرزادە "س.." نییە!... لەوە دەچێ، تۆ ئاگلایا تەنیا بە کچۆڵەیەکی مەکتەبلی نازدار بزانی و هیچی تر. من ئەمەم بە خۆی گوتووە، بەخۆیشی هاو ڕەئی من بوو. چاوەڕوانی سەعات حەوت یان هەشت بکە.. ئەگەر من لەجیاتیی تۆ بام، یەکێکم دەنارد چاودێری بکات تا بزانێ کەی لە ماڵ وەدەر دەکەوێت. دەتوانی کولیا بنێری. سەری پێوە نییە بۆ جاسووسی، هەڵبەتە بۆ تۆ و لەپێناوی تۆدا،، چونکە هەموو ئەم شتانە ڕێژەیین... ها ها!...

هیپولیت، دوای ئەو قسەیە وەدەر کەوت و ڕۆیشت. میرزادە هەرچی سەری دێناو دەبرد، پێویستی بە جاسووسی کەس نەبوو، ئەگەر شتی

واشی لە دەست هاتبا و لیّ بوەشاباوە، هەر پێویستی بە جاسووسی کەس نەبوو. ئێستا تەقریبەن بۆی دەرکەوتبوو کە ئاگلایا بۆچی داوای لێکردبوو کە لە ماڵ وەدەرنەکەوێت. ڕەنگە بە نیازبووبێ لە دووی بنێرێت، یان ویستبێتی، لە ماڵەوە بمێنێ، تا ئەو بە ئیسراحەت ژوانی خۆی بکات. ڕەنگە هۆیەکەی ئەمە بووبێ.

میرزادە، سەری دەسووڕا، وای هەست دەکرد هەموو ژوورەکە بە چواردەوریا دەخولێتەوە. لەسەر تەختەکە ڕاکشاو چاوانی لێک نان.

مەسەلەکە بەرەو ئەوە دەچوو، بە یەکجارەکی و بەهەر شێوەیەک بووە، یەک لایی ببێتەوە. نا، ئەو ئاگلایای بە کیژۆڵەیەکی مەکتەبلی نازدار نە دەزانی. ئێستا هەستی دەکرد کە زۆر لەمێژە. لەم ڕۆژە، لە شتێکی لەم بابەتە، دەترسا، بەڵام بۆچی ئاگلایا دەیەوێ ئەو ببینێ؟ تەزوویەکی پێدا هات و هەموو گیانی کەوتە سەر ئاو. تایەکی توندی تازەی لێهات.

نا، میرزادە، بە کچۆڵەیەکی منداڵی نەدەزانی! هەندێ لەو ڕاوبۆچوونانەی کە لەو دواییانەدا دەری بڕیبوون، هەندێ لەو قسانەی لەو دواییانەدا کردبوونی، میرزادەیان تەواو شپرزە و نیگەران کردبوو. هەندێ جاری دی هەستی دەکرد ئەم کیژە لەڕادەبەدەر هەوڵدەدا خۆی زەوت بکات، هەڵچوونەکانی جڵە و بکات، میرزادە ئێستا بیری دەکەوتەوە کە چەند لەو حاڵەی دەترسا. ڕاستە لەم ڕۆژانەی دواییدا هەوڵی دەدا ئەو بیرەوەریانە بێدار نەکاتەوە و ئەم ڕەشبینی یە لە خۆی بتارێنێ، بەڵام چ شتێک لە قووڵایی ئەو ڕوح و دەروونە گەنجەدا دەگوزەرا؟ دەمێک بوو بەدەم ئەو پرسیارەوە دەتلایەوە، ئەگەر چی زۆریش متمانەی بە ئاگلایا هەبوو. بەهەرحاڵ، کەسێ نەمرێ، ئەم ئێوارەیە، هەموو گرێکان دەکرێنەوە، مەسەلەکان یەک لایی دەبنەوە و هەموو شتێک ڕوون دەبێتەوە! کە بیرۆکەیەکی سامناکە! دیسان "ئەو ژنە"! بۆچی هەمیشەوای وێنا دەکرد کە ئەو ژنە، لەدوا ساتا پەیدا دەبێت و داوی چارەنووسی، وەکو پەتێکی پسۆکی قرچۆک دەپچڕێنێتەوە؟ هەرچەندە گێژ و کاس لە حاڵی نیمچەوڕێنەدا بوو، هەنوکە ئامادە بوو سوێند بخوات، کە هەمیشە ئەو

ترسەی لە دڵدا بووە. ئەگەر لەو دواییانەدا هەوڵی دابوو، فەرامۆشی بکات و بیری خۆی بباتەوە، تەنیا لەبەر ئەوە بوو کەلێی دەترسا. ئەدی تەگبیر؟ ئایا ئەو ژنەی خۆش دەویست یان لێی بێزار و وەڕەز بوو؟ بەدرێژایی ئەو ڕۆژە بۆ تاقە جارێکیش ئەو پرسیارەی لە خۆی نەکرد. لەو بارەیەوە یەک دڵ بوو. دەیزانی کێی خۆش دەوێ... ترسی ئەو لە دیداری ئەو جووتە یان لە غەریبی ئەم ژوانە نەبوو، هەروەها ترسی لە نادیاری ئەنگێزەی دیدارەکە، لە ئەنجامەکانی ئەو دیدارە، چاکی یان خراپی، نەبوو، بەڵکو لە خودی ناستاسیا فیلیپوڤنا دەترسا. دوای چەند ڕۆژێک، بیری کەوتەوە کە چۆن بە درێژایی ئەو سەعاتانەی کە بەدەم ورێنەی تاوە بەسەری بردبوو، بەردەوام چاوان و نیگای ناستاسیا فیلیپوڤنای لەبەر چاو بووە، دەنگی ناستاسیای لەگوێدا بووە کە قسەی سەیرو سەمەرەی کردووە، بەڵام دوای بەسەرچوونی ورێنە تایەکەی تەنیا شتێکی کەمی ئەو شتانەی بیر مابوون. بۆ نموونە بە حاڵ ئەوەی بیر مابوو کە ڤیرا شێوی بۆ هێنابوو و خواردبووی، بەڵام بیری نەمابوو و نەیدەزانی کە دوای شیوەکە خەوتبوو یان نا، تەنیا ئەوەندەی دەزانی کاتێ ئاگلایا لەناکاوا هاتە بالکۆنەکە، ئەم لەسەر تەختەکە ڕاپەڕی، تا ناوەڕاستی ژوورەکە بە پیرییەوە چوو، ئیدی بە تەواوەتی وەخۆ هاتەوە و شتەکانی لەلا ڕوون بووەوە. سەعات نزیکەی حەوت و چارەگ بوو. ئاگلایا بە تاقی تەنیا هاتبوو. یەجگار سادەپۆش بوو، لەوە دەچوو لە پەلە پەلیدا ئەو جلە سادەیەی لەبەر کردبێت. ڕەنگی وەکو جاران، وەکو کاتی دوا دیداریان سپیواژ بوو، بەڵام چاوانی گەش و مەندو درەخشان بوون. میرزادە قەت چاوانی ئاگلایای بەو تەعبیرەوە نەبینیبوو.

ئاگلایا بە دیقەت سەرنجی دا. ئەوسا بە دەنگێکی نزم و بە ڕواڵەت ئارام گوتی:

– چییە حازرو ئامادەیت، خۆت گۆڕیوە و کڵاوەکەت بەدەستەوە گرتووە. وا دیارە کەسێک خەبەری داویتێ. دەزانم کێ خەبەری داویتێ: هەبێ و نەبێ ئیشی هیپولیتە، وانییە!

میرزادە، کە لە گیانی خۆی بێزار بوو و لەنیوە مردوو دەچوو، لەبن





لێوانەوە گوتی:

- بەڵێ... ئەو پێی گوتم...

- باشـە... کەواتـە بـا بـڕۆین: هەڵبەتـە دەبـێ لەگـەڵما بێـی بـۆ ئەوێ. خـۆ توانای هاتنە دەرەوەت هەیە، وانییە؟

- دەتوانم... بەڵێ... بەڵام... باشە ئەمە دەبێ؟

لەپڕ بێدەنگ بوو، چونکە نەیدەتوانی تاقە وشەیەکی دیکە بڵێ. ئەمـە تاقـە هەوڵـی ئەو بـوو، بـۆ ئەوەی ڕێگـە لـەم کیـژە سەرسـەخت و کەڵەوەکێشـە بگرێـت و ژێـوانی بکـاتەوە. ناچـار وەکـو کۆیلەیـەکی ئەڵقـە لـەگوێ، دووی ئاگلایا کەوت. هەرچەنـدە بیری پـەرت و مێشـکی جـەنجاڵ بـوو، دەیزانـی کـە ئاگلایا، بەبێ ئەویش (میرزادە) هـەر بـۆ "ئەوێ" دەڕوات، نـاوەڵڵا باشـتر وایـە بەگـەڵی بکەوێـت. دەیزانـی کیـژێ بڕیـاری خـۆی داوە و بـە هـیچ کلـۆجێ لەکەری شـەیتان نایەتـە خـوارێ و بـەم ژێـوان ناکرێتەوە. بە دوو قـۆڵی، بـە بێدەنگی، وەڕێکەوتن، بە درێژایی ڕێگا، مەگـەر بـە دەگمـەن، دەنا ورتـە لـە کەسیانەوە نەهات. میرزادە هەستیکرد، ئاگلایا تەواو شـارەزای ڕێگایـە. کـاتێ پێشـنیازی کرد، کـە ڕێگاکـەیان بگـۆڕن و بـە شـەقامێکی چەپـەک تـرا، بـەڵام هەنـــدێ دورتـــرا بـــڕۆن، ئاگلایـــا بەوردی گـــوێی گـــرت، وەکـــو ئەوەی پێشنیازەکەی تاوتوێ بکات و هەڵی بسەنگێنێ، لەپڕ و بەکورتی گوتی: "هـیچ فەرقێک ناکات! یەک شتە!"

گەیینـە نزیکـی ماڵەکـەی داریـا ئەلکسـیڤنا (خانوویـەکی گەورەی کـۆنی تەختە بوو) سەیریانکرد خانمێکی پۆشتە و پەرداخ و کچۆڵەیەکی تـازە سـاڵ، لە قاڵدرمەکانی پێشەوە دابەزین و سـواری گالیسـکەیەکی کەشـخە بـوون کـە لەبـەر قاڵدرمـەکانی بـەر دەرگـادا چاوەڕوانیـان بـوو. بـەدەم پێکـەنینەوە، بـە دەنگـی بـەرز قسـانیان دەکـرد و هـەر سـەیری ئـەم جووتەشـیان نـەکرد کـە بەرەبـەرە نزیـک دبـوونەوە، لـە تـۆ وایـە هـەر نەشـیان دەبینـین. هـەر کـە گالیســـکەکە دوور کەوتەوە، دووبـــارە دەرگـــا کـــرایەوە، ڕوگـــۆژین کـــە چاوەڕوانی ئەوان بوو، میرزادە و ئاگلایای بردنـە ژوورەوە و دەرگاکـەی لـە دوایانەوە داخست. ڕوگۆژین نیگایەکی پڕ سـەرسامیی میـرزادەی کـرد و بـە

دەنگی بەرز گوتی:

- ئێستا جگە لە ئێمە، هەر چوارمان، کەس لەمماڵەدا نییە!

ناستاسیا فیلیپوڤنا، لە یەکەم ژوورا چاوەڕوانیان بوو. ئەویش جلێکی زۆر سادەی سەراپا ڕەشی پۆشی بوو. لەبەریان هەستاو پێشوازی کردن، بەڵام نە پێکەنی و نە تەوقەشی دەگەڵ میرزادەدا کرد. بەبێ قەراری و نیگەرانی چاوانی بڕیبوونە ئاگلایا. جووتە ئافرەت دوور لە یەکدی دانیشتن: ئاگلایا لە سووچێکی ژوورەکەدا، لەسەر تەختێک دانیشت و ناستاسیا فیلیپوڤنا لە نزیکی پەنجەرەکەوە دانیشت. میرزادە و ڕوگۆژین بە پێوەوەستابوون، کەس خوڵکی دانیشتنی نەکردبوون. میرزادە نیگایەکی وێڵ و پەرێشانی ڕوگۆژینی کرد، نیگای چی، سەرڕێژ بوو لە عەزاب، بەڵام ڕوگۆژین، سووکە بزەیەکی بەسەر لێوەوە بوو، هەر ئەو بزەیە بوو و نەدەگۆڕا.

ئەنجام تەمێکی شووم بەسەر سیمای ناستاسیا فیلیپوڤنادا گوزەری کرد. نیگای ناسازگار، نیمچە تووڕە، زبر، ڕقن و، بوغزنی لە میوانەکەی نەدەگواستەوە. ئاگلایا بە ئاشکرا ناڕەحەت بوو، بەڵام بەهیچ جۆرێ ترسی پێوە دیار نەبوو. کاتێ کەوەژوورکەوت، بەحاڵ تەمەشای هەڤرکەکەی خۆی کرد، ماوەیەک بەچاوانی داخراوەوە دانیشت، وەکو ئەوەی دەبیرێکی قووڵەوە چووبێ. یەک دوو جار نیگای تەوسامێزی، وەک بڵێی بەڕێکەوت، بەژوورەکەدا گێڕا. جۆرە بێزارییەک نیشتە سەر سیمای، وەک ئەوەی بترسێت لە شوێنێکی وادا بلەوتێ. بە حەواس پەرتی جلەکانی ڕێک خستەوە، تەنانەت جارێکیش بە ناڕەحەتی شوێنەکەی خۆی گۆڕی و چوو لەوسەری تەختەکە دانیشت. لەوە نەدەچوو وەکو پێویست ئاگای لە هەموو جم و جووڵەکانی خۆی بێت، بەڵام هەر ئەم بێ ئاگاییە خۆی لە خۆیدا نیشانەی شەڕفرۆشی و مایەی ئەزیەتدانی هەست و بریندارکردنی کەرامەت بوو.. ئەنجام عەزمی جەزم کرد و لێبڕا، ڕاستەوخۆ، چاو ببڕێتە دوڕ ئەو چاوە پرشنگدارانەی ناستاسیا فیلیپوڤنا بڕیبوونیە ئەو، کە یەکسەر و بە ئاشکرا ڕق و بوغزی دژایەتی و هەڤرکی تیایاندا خوێندەوە. هەر دوو





ئافرەتەکە لە فیکەی خۆیان حاڵی بوون. ئاگلایا تەزوویەکی پێدا هات، دوای تۆزێک هاتە زمان و بە ئەسپایی گوتی:

- بێگومان، دەزانیت بۆچی داوام کردووە بۆ ئێرە بێی.

لەماوەی ئەو ڕستە کورتەدا، یەک دوو هەڵوەستەی کرد.

ناستاسیا فیلیپوڤنا، بە زمانێکی وشک و فەرمی بەرسڤی دایەوە:

- نەخێر، هیچ شتێک لەم بارەیەوە نازانم.

ئاگلایا، سوور بووەوە، پێدەچوو لەپڕ هەستی کردبێت کە بوونی دەگەڵ ئەم ئافرەتەدا و لە ماڵی "ئەو ژنە"دا، زۆر نەشازو باوەڕ نەکردەنی بێ، نەچێتە ئەقڵەوە. کە گوێی لە یەکەمین سەدای ناستاسیا فیلیپوڤنا بوو، تەزوویەکی ساردی بە سەراپادا هات، دەتگوت یەک کوندە ئاوی ساردی پێدا کردووە. دیارە "بەرانبەر"کەشی هەستی پێ کرد و پەیی بە هەموو شتێک برد.

ئاگلایا، بە پەستی چاوی بڕینە ئەرزەکە و لەپر و بە دەنگێکی نیمچە نزم گوتی:

- تۆ هەموو شتێک دەزانیت... بەڵام بەئانقەست خۆت لە گێلی دەدەی.

ناستاسیا فیلیپوڤنا، بەدەم تەوسخەنێکی کاڵەوە بەرسڤی دایەوە:

- بۆچی خۆم لە گێلی دەدەم؟

ئاگلایا بە شێوەیەکی ناشیانە و تا ئەندازەیەک مایەی پێکەنین، لەسەری ڕۆیشت:

- دەتەوێ خۆت بنوێنی، هاتنی من بۆ ئێرە، بکەی بە چەکێک و لە سێبەری ماڵەکەی خۆتا دژی من بەکاری بێنی، خۆتم بەسەرا بابدەی..

ناستاسیا فیلیپوڤنا، لەپڕ وەجۆش هات و بەتوندی گوتی:

- خۆت ئەم وەزعەت بۆ خۆت دروستکردووە. تۆ هاتوویت، من بە شوێنما نەناردووی، بەڵکو تۆ داوای ئەم دیدارەت لە من کردووە، کە تائێستاش نازانم بۆ چییە و بە چ مەبەستێکە. ئاگلایا، بە لووتبەرزی و خۆپەسەندییەوە، سەری هەڵبڕی و گوتی:

- ئاگات لە زمانت بێ، من بۆ شەڕە قسان نەهاتووم بۆ ئێرە، چونکە

ئەوە چەکی من نییە، چەکی تۆیە...

- ئاوا.. کەواتە تۆ هەرچۆنێ هاتبی، بە نیازی شەڕ هاتوویت!... من وام تەسەور دەکرد. زۆر لەمە دڵپاکتر و زرنگ تر بیت! ..

ئەو جووتە بە ڕقێکی ئاشکراوە چاویان بڕیبووە چاوانی یەکدی. یەکێک لەم دوو ئافرەتە، ئەوەیان بوو کە ئەو نامە پڕ سۆزو ڕێزو دۆستایەتییەی بۆ ئەمی تریان نووسیبوو، کەچی لەگەڵ یەکەم دیدارو یەکەم دەم هەڵهێناندا، هەر هەموو ئەو سۆز و ڕێز و دۆستایەتییە ڕەوییەوە و هەڵم ئاسا چوو بە ئاسمانا و نەما. ئەمە چۆن لێک بدەینەوە؟ لەو کاتەدا، هیچ یەکێک لەو چوار کەسەی کە لەوێندەر بوون، ئەمەیان بەلاوە سەیر نەبوو. میرزادە کە تا دوێنێ، ئەم وەزعەی لە خەویشا دیتبا باوەڕی نەدەکرد، هەنوکە بێخەم و خەیاڵ وەستابوو و تەمەشای دەکرد، لە تۆ وایە لەمێژە پێشبینی ئەوەی کردووە. خەیاڵی ترین خەون لەپڕێکا بووبوو بەواقیعێکی زەق و زندوو. یەکێک لەو دوو ژنە، لەو کاتەدا، هەستی بە ڕقێکی ئەوتۆ لە ڕەقیبەکەی دەکردو هێندە بەتاسەوە ئەو ڕقەی دەربڕی (بەدەردی ڕوگوژین ڕۆژی دوایی گوتی لەوە دەچوو بە تایبەتی بۆ ئەو مەبەستە و بۆ ئەو جوابە جەنگییە هاتبێ) کە بەرانبەرەکەی، سەرباری خەیاڵپەروەری خۆی، هەر نیازو مەبەستێکی پێشوەختەی لە دڵ و دەروونا بوو، بە گشت مجێزێکی سەیری خۆیەوە، بە هەموو نیگەرانییەکی فیکریەوە، بە هەموو نەخۆشییەکی دەروونی خۆیەوە، نەیدەتوانی تەحەمولی ئەو تانەوتەشەرە ژەهراوی و ژنانەیە بکات کە ڕەقیبەکەی دەری دەبڕی. میرزادە دڵنیا بوو کە ناستاسیا فیلیپوڤنا، بەخوایشتی خۆی نایەتە سەر باسی نامەکان. یەکسەر بە گڕی چاوەکانیا بۆی دەر کەوت، کە ئەو نامانە لەو کاتەدا چەندیان ئەزیەت دەدا، بەڵام ئامادەش بوو، نیوەی تەمەنی بدات، بەو مەرجەی ئاگلایاش باسی ئەو نامانە نەکات. کەچی ئاگلایا لەناکاوا، وەخۆ هاتەوە و بەدەم خۆ زەوت کردنەوە گوتی:

- تۆ لە من نەگەیشتی. من بۆ ئەوە نەهاتووم بۆ ئێرە... تا شەڕت دەگەڵ بکەم، هەرچەندە زۆرم خۆش ناوێی. بەڵکو هاتووم.. تا وەکو دوو مرۆڤ

پێکەوە گفتوگۆ بکەین. من کە داوای ئەم دیدارەم لێکردبوویت، پێشوەختە، بابەتی دیدارەکەم دیاری کردبوو و دامنابوو دەربارەی چی قسە بکەم، جا ئەگەر بە تەواوەتیش لێم تێنەگەیت، من لە بڕیاری خۆم ژێوان نابمەوە، قسەی خۆم هەر دەکەم. ئەگەر بتەوێ لێم تێنەگەیت و خۆت لە گێلی بدەیت، تۆ زەرەر دەکەیت نەک من. من دەمویست وەڵامی نێوەڕۆکی ئەو نامانەت بدەمەوە کە بۆت نووسیبووم. وەڵامەکەشم ڕوو بەڕوو، ڕاستەوخۆ لە دەمی خۆمەوە بژنەوی، نەک لە ڕێگەی نامە و نامەکارییەوە، چونکە ئەمەم پێ باشترو پەسەندترە. جا وەڵامی من بۆ نامەکانت ئەمەیە. من لەیەکەم ڕۆژەوە کە میرزادە لیون نیکولایوفیچم بینی و ناسی، جۆرە سۆز و بەزەییەکم دەرهەق بەوی لا دروست بوو. کە بەواریقاتی ئاهەنگ و شەونشینیەکەی تۆشم زانی، ئەم سۆز و بەزەییەم هێندەی دی لەلا تۆخ بووەوە. بەزەییم بەوەیدا دەهاتەوە کە مرۆڤێکی هێندە دڵساف و سادە بوو وای وێنا دەکرد دەتوانێ بەختەوەر بێت... لەگەڵ ژنێکا... بەم خووخەسڵەتانەوە. ئەوەی من لێی دەترسام ڕووی دا: تۆ نەتتوانی خۆشت بوێ، دەسی دەسیت پێکرد، عەزابێکی زۆرت داو پاشان بەجێت هێشت. تۆ بۆیە نەتتوانی خۆشت بوێ، چونکە زۆر شاییت بەخۆ بوو... نا... شایی نا... باشم نەگوت، بەڵکو مەغروور بوویت.. نا، مەغروریش نا، ئەمەش زاراوەیەکی گونجاو نییە.. باشتر وایە بڵێم خۆپەرستی. تۆ تا ڕادەی.. شێتاتیی خۆپەرستی. باشترین بەڵگەشم ئەو نامانەیە کە بۆ منت نارد بوون. تۆ نە تدەتوانی ئەوت بەو هەموو سادەییەی خۆیەوە خۆش بوێ، ڕەنگە لە دڵی خۆتا لێشی بێزار بووبی و گاڵتەت پێی کردبێت و پێت ڕابواردبێت. تۆ نە تدەتوانی جگە لە نەنگی و عەیبوعار و بەدناوی ڕابردووی خۆت هیچی ترت خۆش بوێ، تۆ لەزەتت لەو سووکی و نەنگی و ناوزڕاوییەی خۆت دەبینی. خۆ ئەگەر ئەم بەدناوی و نەنگیەت کەمتر بوایە، یان هەر نەتبوایە، ڕەنگە بەدبەخت تر بای...

ئاگلایا، کە پێشوەختە ئەو وشە و دەستەواژانەی ئامادە کردبوو، زۆر جار، تەنانەت بەر لەوەی بە خەویش تەسەوری ئەو دیدارەی کردبێ، لەبەرخۆیەوە گوتبوونیەوە، پرۆڤەی لەسەر کردبوون، بۆیە زۆر بەڕەوانی





وخێرایی بۆی دەهات، بە لەزەتێکی زۆرەوە بەکاری دەبردن. ژێراو ژێر بە نیگای بوغزنەوە دەیڕوانییە ناستاسیا فیلیپوڤنا، تا کاریگەریی قسە ڕەقەکانی خۆی لە سیمای پەشێو و نیگەرانیا بخوێنێتەوە.

ئاگلایا، لەسەر قسەکانی ڕۆیشت و گوتی:

- ئەونامەیەت بیرە کە ئەو کاتانە بۆی نووسیبووم؟ بە خۆی پێی گوتم کە تۆ ئاگات لەو نامەیە هەبووە و تەنانەت خوێندووتەوە؟ من کە ئەو نامەیەم خوێندەوە ئیدی هەموو شتێک حاڵی بووم. هەمو شتێکم بە ڕوونی بۆ دەرکەوت، مەزەندە و بۆچوونەکەشم دروست بوو. بە خۆی ماوەیەک لەمەپێش هەر هەموو ئەو وشانەی بۆ سەلماندم کە ئێستا من پێم گوتیت. ئیدی دوای ئەو نامەیە چاوەڕوانم کرد. پێموابوو تۆ ناچار دەبی بێی بۆ ئێرە، چونکە تۆ بەبێ پترسبۆرگ ناتوانی بژی: تۆ لەوە گەنجتر و خشیکتریت کە لە شارۆچکاندا هەڵبکەی و بژیت...

لەکاتێکا کە سوور سوور ببووەوە، (تا ئەو کاتەی کە لە قسەکانیشی بووەوە، ئەو سوورریە لە سیمای نەڕەوییەوە) لەسەری ڕۆیشت:

- ئەمانەش قسەی من نین! .. کە جارێکی دی میرزادەم بینییەوە، زۆرم خەفەت بۆ خوارد، هەستم کرد، سووکایەتی پێکراوە. پێ مەکەنە، چونکە پێکەنینەکەت خۆی لە خۆیدا نیشانەی ئەوەیە کە توانای دەرککردنی ئەمەت نییە...

ناستاسیا فیلیپوڤنا، بە خەمینی و زۆر بە توندی وەڵامی دایەوە:

- بە خۆت چاک دەبینی کە پێناکەنم.

- گرینگ نییە، بۆ من فەرق ناکات، بە ئارەزووی دڵی خۆت پێبکەنە. کاتێ بە خۆم پرسیارم لێ کرد، پێی گوتم کە دەمێکە خۆشی ناوێ، تەنانەت یادو یادگاری تۆش نارەحەت و دڵگرانی دەکات، بەڵام دڵی بە حاڵت دەسووتێ. هەر کاتێ بیر لە تۆ دەکاتەوە، هەست دەکات دڵی "بۆ هەتا هەتایە بریندار دەبێ". حەز دەکەم ئەوەش بڵێم کە من بەعەمراتم، پیاوی وا نەجیب، دڵساف و، لەڕادەبەدەر خۆشباوەڕم نەدیتووە. پاش ئەوەی گوێم لە قسەکانی بوو. هەستمکرد هەر کەسێک بیەوێ، دەتوانێ فریوی بدات، هەر کەسێکیش فریوی بدات، زۆر دڵنیایە لەوەی کە دەیبورێت. من لەبەر ئەوە

خۆشم ویست..

ئاگلایـا، لـەپڕ بێدەنگ بـوو، دەتگـوت حەپەسـا، لـە تـۆ وایـە لـە خـۆی دەپرسـی چـۆن توانیت ئەو قسـەیە بکـەی. بـاوەڕی بـە خـۆی نـەدەکرد ئەو قسەیەی کردبێت، بـەڵام لـە هـەمان کاتدا کبریـاو غروورێکـی بـی ئەندازە، لـە نیگایـا پرشـنگی دا. لەوە دەچـوو ئیـدی دوای ئەو ئیعترافـەی کـە بـە دەمـی خۆی کردی، بەلایەوە گرینگ نەبێ "ئەو ژنە" پێبکەنێ. گوتی:

– مـن هـەموو شـتێکی خـۆم گـوت، بێگومـان دەبـێ ئێسـتا بزانیـت کـە چاوەڕوانی چیم لە تۆ، ها؟

ناستاسیا فیلیپوڤنا، بە هێمنی و ئەسپایی گوتی:

– ڕەنگـە بـزانم، بـەڵام حـەز دەکـەم بـەدەمی خـۆت بڵێـی. لـەدەمی خـۆتی ببیستم.

ئاگلایا، لە تووڕەییدا گڕی گرت. بە توندی و بە شێوەیەکی بنجبڕ گوتی:

– من دەمەوێ لە دەمی خۆتەوە بزانم، تۆ بـە چ هـەقێ یـاری بـە هەسـت و سۆزی وی دەرهـەق بـەمن دەکـەی؟ بـە چ هـەقێک پرکێشـی ئەوەت کـردووە نامە بۆ من بنووسـیت؟ دوای ئەوەی جێت هێشـت، بەو شـێوە نـەنگین و بەو بێ ئابڕووییە ڕەدوکەوتیت، بە چ هـەقێ هەرسـا نـا سـاتێ چ بەو و چ بـە مـن دەڵێی، خۆشت دەوێت؟

ناستاسیا فیلیپوڤنا، بە زەحمەت وەڵامی دایەوە:

– مـن نـەمگوتووە، خۆشـم دەوێ، نـە بەو و نـە بـە تـۆم نـەگووتوە خۆشـم دەوێ،

ئەوجا بە دەنگێکی نزم، کە بەئاستەم دەبیسترا لەسەری ڕۆیشت:

– بەڵام... بەڵام ڕاست دەکەی... من جێم هێشت.

ئاگلایا، بە سەر سامی پرسی:

–چـۆن؟ قـەت نـە تگوتـووە خۆشـت دەوێ، "نـە بـە مـن و نـە بەوت" نەگووتوە؟ ئەدی نامەکانت؟ کێ لێت پاڕایەوە کە ببی بە دەڵاڵی زەماوەند و هەوڵـی ئەوە بـدەی مـن هـان بـدەی کـە شـوی پـێ بکـەم؟ ئەمـە نیشـانەی خۆشەویسـتی نییە، ئەمـە خـۆی لـە خۆیدا ئیعتـراف نییـە؟ تـۆ هـەقی ئێمـەت چییە؟ بۆ دەکەویتە بە ینمانەوە؟ لە سەرەتادا وام وێنا دەکرد دەتەوێ بـەم





کارەت بەینمان تێک بدەیت، بە تۆبزی لەبەر چاومی بخەیت، تا پەیوەندی دەگەڵدا ببڕم. پاشان لە نیازت گەیشتم: تۆ وات خەیاڵ دەکرد، بەم چاو و ڕاوە. ڕیابازی و پەتبازیە کارێکی گەورە دەکەیت و ئەمە بۆ تۆ گەورەییە... بەڵام تۆیەک کە ئەوەندە خۆپەرست بیت، لەکوێ دەتوانی ئەوت خۆش بوێ؟ بۆچی لەجیاتیی نووسینی ئەو نامانە بۆ من، دەستبەردار نەبوویت و بەدەردی خۆتەوە دانە سەکنایت؟ ئێستا بۆچی شوو بەم پیاوە شەریفە ناکەی کە زۆری خۆش دەوێی و شانازی خوازگاری پێ بەخشیویت؟ هۆیەکەی وەکو ڕۆژی ڕوون عەیانە: کە شووت بە ڕوگوژین کرد، ئیدی هیچ بیانوویەکت بەدەستەوە نامێنێ کە گلەیی لە بەختی خۆت بکەیت و مەزلومیەتی خۆت بدەی بە ڕووی خەڵکیدا. ئیدی هیچ پاکانەیەکت بەدەستەوە نامێنێ کە ڕکونی وکینە کێشیەکانتی پێ پینە بکەیت. بەپێچەوانەوە: شووکردنت بە ڕوگوژین، شانازییەکی ئەوەندە گەورەت بۆ دابین دەکات کە سەرو زیادە لێت! . یەڤگینی پاڤلوفیچ سەبارەت بە تۆ دەڵێت کە شیعرێکی یەجگار زۆرت خوێندووەتەوە، لەچاو خۆتا زۆر خوێنەوارو ڕۆشنبیریت... ئەوەندەی حەزت لە خوێندنەوەیە، حەزت لە کار نییە، یانی تەمەڵی و بێکاریت کردووە بە پیشە، خۆپەرستییەکەشت لەولاوە بوەستێ...

- ئەدی خۆت، تۆش بێکارو دەست بە تاڵ نیت؟

ڕەوتی قسەکانت، خۆ بە خۆ و زۆر گەوجانە بە ئاڕاستەیەکی چاوەڕوان نەکراودا دەڕۆیشت. ئەم ڕووداوە بۆ ناستاسیا فیلیپوڤنا زۆر چاوەڕوان نەکراو بوو، چونکە کاتێ بۆ پاڤلوفیسک هاتبوو، وێڕای ئەوەی زیاتر چاوەڕوانی شەڕ بوو تا خێر، هێشتا هەندێ هیوا و ئاواتی لە خەیاڵا هەبوو، دڵی خۆی بە هەندێک خەون و خەیاڵان خۆشدەکرد. ئاگلایاش، سەری لە خۆی سوور مابوو، وەکو یەکێک لە قەدپاڵێکی ڕکەوە داگەڕێ و غل ببێتەوە و نەتوانێ خۆی بگرێتەوە، بەو ئاوایە بەرلێشاوی لەزەتی بێ ڕەزای تۆڵەئەستێنی کەوتبوو و بۆی ڕام نەدەکرا. تەنانەت ناستاسیا فیلیپوڤناش، زۆری پێ سەیر بوو کە ئاگلایای بەو حاڵەوە دەبینی، هێندە بە حەپەساوی وسەرسامی و نیگەرانیەوە سەیری دەکرد وەک بڵێی باوەڕ بە

چاوی خۆی نەکات. ئایا ئەمە هەمان ئەو ژنە بوو کە بە تەسەوری یەڤگینی پاڤلوفیچ، خوێنەرێکی پشوو درێژی دیوانە شیعر و کتێبان بوو یان ئەو ژنە بوو، کە بە قەناعەتی میرزادە، شێت و پەتیارە بوو؟ بەهەرحاڵ ناستاسیا فیلیپوڤنا، هەرچەند هەندێ جار ڕەفتاری ناشایستە و گۆساخانەی هەبوو، بە ڕاستی زۆر لەوە بەحەیاتر، ناسکتر، ئارامتر و خۆشباوەڕتر بوو کە تەسەور دەکرا. ڕاستە، زۆر شتی هەبوون کە زادەی کتێبان و خەون و خەیاڵانی دەروونبینیبوون، بەڵام کەسێکی پڕ سۆز و بەشەخسییەت و یاخیش بوو. میرزادە ئەوەی تیا بەدی کرد: ئێستا ئازارێکی توند، بەسیمایەوە خۆی دەنواند. ئاگلایا ئەمەی بەدی کرد. لە کەرب و کینا لەرزی، بە غرووڕێکی لەوەسف نەهاتووەوە، وەڵامی تێبینییەکەی ناستاسیا فیلیپوڤنای دایەوە:

- چۆن زات دەکەی بەم شێوەیە قسە دەگەڵ من بکەی؟

ناستاسیا فیلیپوڤنا بە سەرسامی پرسیی:

- دیارە بە باشی گوێت لێم نەبووە، مەگەر چم پێ گوتوویت؟

ئاگلایا، لەپڕو، بێ هیچ مدارایەک، بە تەوسەوە گوتی:

- ئەگەر ژنێکی شەریف و پاک بووی، ئەگەر حورمەتی خۆت دەگرت، بۆچی سووک و ئاسان، پەیوەندی خۆت دەگەڵ ئەو پیاوە شەرواڵ پیسەدا، دەگەڵ توتسکی دا، نەبڕی، چ پێویست بەم سیناریۆ و سیناریۆکارییە بوو؟

ناستاسیا فیلیپوڤنا، کەوتە لەرزین، ڕەنگ لە ڕوویا نەما، گوتی:

- تۆ چی دەربارەی وەزعی من دەزانیت، تا ڕێ بە خۆت بدەی سەبارەت بە من داوەری بکەیت؟

- دەزانم، تۆ لەجیاتی بڕۆی کاریک بدۆزیتەوە و بەڕەنجی شان، ڕزقوڕۆزی خۆت پەیدا بکەی، ڕەگەڵ ڕوگوژینی دەوڵەمەند کەوتی، تا پاشان دەوری فریشتەیەکی بەدناو بگێڕیت. هیچیش بەلامەوە سەیر نییە کە توتسکی خەریک بوو لەبەر خاتری ئەم فریشتە بەدناوە خۆی بکوژێت!

ناستاسیا فیلیپوڤنا، کە زۆر بریندار بوو، بە بێزارییەوەگوتی:

- بەسە! تۆش هەر بەقەد ئەو کارەکەرەی داریا ئەلکسیڤنا لە من گەیشتوویت، کە لەم چەند ڕۆژەی پێشوودا دەزگیرانە گەنجەکەی ڕاکێشایە

بەر دادگا. کارەکەرەکەی داریا ئەلکسیڤنا، باش لە تۆ و لە زمانی تۆ دەگات...

- پێم وایە کچێکی شەریفە و بەڕەنجی شانی خۆی دەژی. بۆچی بەو سووکیە باسی کارەکەران دەکەی؟

- من عەیب لەو کەسانە ناگرم کە کار دەکەن، کارکردن عەیب نییە، بەڵکو تۆ بە سووک دەزانم کە باسی کار دەکەی!

- ئەگەر بتویستایە، شەریفانە بژیت، جلشۆریت دەکرد.

جووتە ئافرەت، هەر دووکیان ڕەنگزەرد و لێوبەبار هەستانە سەرپێیان، بە ڕقەوە دەیانڕوانییە یەکدی.

میرزادە، بەپەشۆکاوی هاواری کرد:

- ئاگلایا بەسە، خۆت هێور بکەوە! عەیبە!

ڕوگوژین، لە بزە کەوتبوو، بەدەم لێو هەڵقورتاندنەوە، دەستی لەسەر سینگ تێک هاڵاند بوو و گوێی دەگرت.

ناستاسیا فیلیپوڤنا، کە لە تورەییدا سەراپای هاتبووە لەرزین گوتی:

- تەمەشا، تەمەشا! تەمەشای ئەم کچە بکە! کە بێ ئەقڵم! وام دەزانی فریشتەیە! ئاگلایا ئیڤانوڤنا، ئاخر تۆ چۆن بە بێ دایەنەکەت، بۆ ئێرە بۆلای من هاتوویت؟...دەتەوێ... دەتەوێ... حەز دەکەی ڕێک و ڕەوان، بی پێچ و دەوران، بەڕاشکاوی پێت بڵێم، بۆچی بۆلای من هاتوویت؟ چونکە لە من دەترسیت. بۆیە هاتوویت بۆلام!

ئاگلایا. دەهری و تورە، لەوەی کە چۆن ئەم ژنە، ئەم ڕەقیبەی زاتدەکات بەو گۆساخیە ئەو بدوێنێ، پرسی:

- من لە تۆ دەترسم؟

ناستاسیا فیلیپوڤنا وەڵامی دایەوە:

- بەڵێ لە من! بۆیە لێبڕاوی کە بۆ ئێرە بێی، چونکە لە من دەترسیت. مرۆڤ لە کەسێک ترسا، بە سووکی نازانێ، سووکایەتی پێناکات. تۆ سەیری نەزانی من کە تا ئێستا ڕێزم گرتوویت؟ و دەزانی بۆ لە من دەترسیت؟ تۆ دەتەوێ بەچاوی خۆت ببینی و بزانیت ئایا منی خۆشتر دەوێ یان تۆ، چونکە تۆ غیرە دەکەیت، کەسێکی حەسوودیت، زۆریش

حەسوودیت...

ئاگلایا، لەبن لێوانەوە گوتی:

- پێی گوتووم کە لە تۆ بێزارە، ڕقی لێتە...

- دەشێت، ڕەنگە من شایستەی ئەو نەبم... بەڵام تۆ درۆ دەکەی! چونکە ناتوانێ ڕقی لە من بێ. مەحاڵە قسەی وای کردبێت! وێڕای ئەوەش ئامادەم بتبورم... لەبەر ئەو وەزعەی کە تیایای... من ڕاو بۆچوونێکی باشترم دەربارەی تۆ هەبوو! .. وام تەسەور دەکرد کە زیرەکتر و جوانتر بی لەمەی کە هەی! باوەڕبکە ئەوە تەسەوری من بووە!... بەهەرحاڵ، فەرموو گەنجەکەی خۆت ببە... ببیە... تەمەشاکە.. بزانە چۆن ئەبلەق بووەو، ئاگای لە خۆ نەماوە و خەریکە بەنیگا دەتخوا.. ببیەو، بڕۆ، بەڵام بە مەرجێ، یەکسەر لێرە بڕۆیت! ئا، ئێستا، بڕۆیت!...

ناستاسیا فیلیپوڤنا، بەدەم ئەو قسانەوە، بە سەر یەکێک لە قەنەفەکانا داڕوخا و کەوتە فرمێسک هەڵڕشتن، بەڵام لەناکاوا بیرۆکەیەکی تازەی بەمێشکا هات و لە چاوانیا بلاچەی دا، بەوردی چاوی بڕییە ئاگلایا و هەستا، گوتی:

- دەتەوێ ئەمر... ی پێ بکەم... ئا ئێستا... ئەمری پێ بکەم... چ دەڵێی؟ ئەمری پێ بکەم تا یەکسەر وازت لێ بێنێ، تا هەتا هەتایە لەگەڵ منا بێ و بمخوازێ؟ دەتوانم بە ئاماژەیەک ئەمەی پێ بکەم. هەنگێ تۆ بە دەستی بەتاڵ، بە ڕاکردن، بە تاقی تەنیا، ڕێ و ڕێ بۆ ماڵ بگەڕێیتەوە.. دەتەوێ ئەم کارە بکەم؟ دەتەوێ؟

ناستاسیا فیلیپوڤنا، وەکو شێت بەدەم ئەو قسانەوە هاواری دەکرد. لەوە دەچوو بە خۆیشی باوەڕ نەکات بتوانێ ئەو قسانە بکات. ئاگلایا پەشۆکاوو شپرزە بەرەو دەرگا چوو، بەڵام وەکو ئەوەی لەپڕ لەوێدا بچەقێ لە ئاستانەی دەرگاکەدا وێستاو کەوتە گوێگرتن. ناستاسیا فیلیپوڤنا، لەسەری ڕۆیشت و گوتی:

- دەتەوێ ڕوگوژین ترۆ بکەم؟ واتدەزانی من لەبەر خاتری تۆ شوو بە ڕوگوژین دەکەم؟ دەتوانم ئا ئێستا، لەبەردەمی تۆدا بە دەنگی بەرز بڵێم: "ڕوگوژین بۆ دەرەوە! " و بە میرزادە بڵێم: "لەبیرتە بەڵێنی چیت بەمن دا؟"

خودایا! چۆن خۆم بەدەم ئەمانەوە سووک کردووە؟! ئەرێ میرزادە هەر تۆ نەبووی. کە بەڵێنت دامێ، بۆ هەرکوێ بڕۆم دووم بکەوێ، هەرچییەکم بە سەربێ، وازم لێنەهێنی؟ خۆشت دەوێم و قەت ڕۆژێ لە ڕۆژان دەستبەردارم نابیت و چاو پۆشی لە هەموو خەتاو هەڵەکانم دەکەیت؟ ڕێزو حورمەتم دەگریت.. وات نەگوت؟ بەڵێ.. گوتت، بە دەمی خۆت گوتت، بەڵام من کە لێت هەڵاتم، تەنیا بەو مەبەستە بوو کە ئازادت بکەم. حوری خۆت بی، بەڵام ئێستا ژێوانم لەوە، ڕێگەت نادەم بڕۆیت! بۆچی ئەم خانمەوەکو ئافرەتێکی قەحبە مامەڵەم دەگەڵدا دەکات؟ فەرموو لە ڕوگوژین بپرسە ئایا من ئافرەتێکی خۆفرۆشم؟ لەو بپرسە، پێت دەڵێت!... ئێستا کە بە بەرچاوی تۆوە ئەو هەموو سووکایەتییەی پێکردم، دەتەوێ پشت بکەیتە من و قۆڵ بە قۆڵی ئەوا بکەیت و بڕۆیت؟ دەیسا بەر نەفرەت کەوی گەر بەتەمای شتی وایت، چونکە تۆ تاقە پیاوێکی کە متمانەم داوەتێ.

هەنگێ، شێتئاسا هاواری کرد:

– ڕوگوژین، بڕۆ دەرەوە، پێویستم بە تۆ نییە!

هانکە هانکی پێکەوتبوو، بە زەحمەتێکی زۆر ئەو قسانەی لە دەم دەردەچوو. دەموچاوی شێواوو لێوی وشک بووبوون، دیار بوو کە ئەمە تەنیا لاف و گەزاف و خۆ ڕانانە، دەنا بەخۆیشی باوەڕی بە یەک وشەی ئەو قسانەی خۆی نەبوو، بەڵام دەیویست ئەگەر بۆ ساتێکیش بووە درێژە بە خۆشخەیاڵیەکانی خۆی بدات، خۆی فریو بدات. بە جۆرێ دەهەری بووبوو، میرزادەوای تەسەور دەکرد، دوورنیە خۆی بکوژێت.

ناستاسیا فیلیپوڤنا، لە کاتێکا ئاماژەی بۆ لای میرزادە دەکرد، ڕوو لە ئاگلایا هاواری کرد:

– ئەوەتا لێرەوەسستاوە. تەمەشای بکە. ئەگەر یەکسەر بۆلای من نەهات، ئەگەر لەپێناوی منا دەستبەرداری تۆ نەبوو، هەنگێ بۆ خۆتی ببە. من دەستبەرداری دەبم، حاشا لە تەرح و دیداری!...

جووتە ئافرەت، هەر دووکیان کڕوکپ، حایرو ئەبڵەق، چاویان بڕیبووە میرزادەوەکو ئەوەی چاوەڕوانی وەڵامی ئەو بن، بەڵام میرزادە لەوە نەدەچوو وەکو پێویست لەم تەحەدا توونده گەیی بێت، بێگومان لیی

نەگەیشتبوو. بە سەرو سیمایا دیار بوو کە لێی نەگەیشتووە. ئەوەی ئەو لەبەردەم خۆیا دەی بینی، تەنیا دەموچاوێک بوو، کە نائومێدی و شێتاتی لێ هەڵدەقوولا، دیمەنێک بوو، وەکو پێشتریش بە ئاگلایای گوتبوو. "بۆ هەتا هەتایە دڵی زامدار کرد". ئیدی توانای دیتنی ئەم دیمەنەی نەما، لە کاتێکا ئاماژەی بۆ لای ناستاسیا فیلیپوڤنا دەکرد، ڕوو لە ئاگلایا گوتی:

- چۆن دڵت دێت؟ حەیفت نەکرد. نابینی چەند بەدبەدختە، زۆر بەدبەختە. زۆر!

نەیتوانی یەک وشەی دی بڵێت. ئاگلایا تەمەشایەکی وای کرد کە زمانی لاڵ بوو. تەمەشا چی تەمەشا پڕ لە ڕەنجان و تەژی لە کەرب و کین. هیچی بۆ نەمایەوە. هەر دوو دەستی لە سینگی تێک ئاڵاند، هاواری کرد و بەهەشتاو بەرە و کیژێ چوو، بەلام تازە کار لە کار ترازا بوو. ئاگلایا، نەیدەتوانی یەک ساتیش چاوەڕوانی بکات و لە سەری بوەستێ. دەستی بەدەموچاویەوە گرت، هاواری کرد: "ئاهـ... خودایا!" و لە ژوورەکە وەدەر کەوت. ڕوگوژین دووی کەوت و دەرگای دەروەی بۆ کردەوە.

میرزادەش، بەغار دووی کەوت، بەلام لە ناو دەرگاکەدا دوو دەست توند گرتیان. ناستاسیا فیلیپوڤنا، بە ڕوخساری خەمبار و شێواوەوە، چاوی لە دوڕ چاوانی بڕی و بە لێوانی شین هەڵگەڕاوەوە پرسی:

- دوای ئەو دەکەوی؟ دەتەوێ دووی بکەوی؟

ناستاسیا فیلیپوڤنا، بە سەر میرزادەدا بورایەوە. هەڵی گرتەوە، بردی بۆ ژوورەکەو، لەسەر قەنەفەیەکی دانا، بە حەپەساوی و شپرزەیی بە دیارییەوەوەستا. پەرداخێک ئاو لەسەر مێزێکی چکۆلە بوو. ڕوگوژین کە گەڕایەوە، پەرداخە ئاوەکەی هەڵگرت و سەروچاوی ناستاسیای ئاو پرژێن کرد. چاوانی هەڵهێنان، بۆ ماوەی دەقیقەیەک هیچی نەبینی، دنیا لە بەرچاوی تاریک بوو، بەلام پاشان وەخۆ هاتەوە، تەمەشایەکی دەوروبەری خۆی کرد، تەزوویەکی پێدا هات. بەهەشتاو بەرە و میرزادە تاوی دا و هاواری کرد:

- تۆ هی منی، بۆ منی! کوا ئەو کچە لوتبەرزە ڕۆیی؟ ها ها ها!

بە شێوەیەکی هیستریانە پێدەکەنی، بەدەم پێکەنینەوە لەسەر قسەکانی

ڕۆیشت:

– ها ها ها! خۆ خەریک بوو بە خوتوخۆڕایی، پێشکەش بەو کچەی بکەم! بۆچی ئەوەم کرد؟ بۆچی؟ شێت بووم!... ڕوگوژین تۆ برۆ، برۆ بەلای کاری خۆتەوە... برۆ! ها ها ها!...

ڕوگوژین، بەوردی تەمەشای ئەو دوانەی کرد. بە بێدەنگی بێ ئەوەی تاقە وشەیەکی لە زار بێتە دەر، کڵاوەکەی هەڵگرت و ڕۆیشت. دوای دە دەقیقە میرزادە، لەتەنیشت ناستاسیا فیلیپوڤناوە دانیشت بوو، لە هەمێزی نیگای خۆی گرتبوو، وەکو چۆن منداڵێک دەلاوێنرێ، بەو ئاوایە بە هەر دوو دەست سەروچاو و قژی نەوازشت دەکرد. قاقا بەدەم پێکەنینی ناستاسیاوە پێدەکەنی. کە بیدیبا دەگری، ئەمیش گرژ دەبوو، گریان ئەوکی دەگرت و لە گین بوو لە ئان و ساتا لە هۆڕژنی گریان بدات. میرزادە، کڕوکپ، ورتەی نەدەکرد، بەلام بەوردی، بەدڵ و گیان گوێی بۆ وڕێنە نامەفهوومەکانی ناستاسیا دەگرت. بەدەگمەن تاقە وشەیەکی لێ حاڵی دەبوو، بەلام بەدەم ناسکە بزەوە، بۆی دەگرژییەوە و گوێی لێدەگرت. هەر کە بەئاستەم گەردی خەم و فرمێسک و گلەیی سکاڵاو بێتاقەتیەکی بەسیمایەوە دیتبا، یەکسەر دەستی بە سەرو زوڵفیا دێناو، بەوپەڕی میهرو مەحەبەتەوە دەستی بە گۆنایدا دێناو بە جۆرێ نەوازشتی دەکرد و نازی دەدایە وەکو ئەوەی منداڵێک بێت.

پەراوێز:

* – "ئەم بەیتە سەخیفانە..": ئەم بەیتانە بەشێکن لە چامەیەکی پوشکین بە ناونیشانی "دامرکانەوەی شادیی ڕۆژانی شێتاتی" کە بە یەکێک لە چامە لیریکییە هەرە جوانەکان دێتە ژماردن. ڕەنگە هیپولیت لێرەدا لەژێر باندۆر و کاریگەریی ئەو ڕەوتە ڕەخنەییەدا بووبێ کە لەو ڕۆژگارەدا بەرێبەرایەتیی پیساروف و هاوڕێکانی، باوی پەیدا کردبوو و دژایەتیی شیعرەکانی پوشکینیان دەکرد.

## فەسڵی نۆیەم

دوو هەفتە بە سەر ئەو ڕووداوانەدا بوری کە لە فەسڵی پێشوودا گێڕامانەوە. وەزع و حاڵی قارەمانانی چیرۆکەکەمان، لە زەرفی ئەو دوو هەفتەیەدا، بە جۆرێ گۆڕا، کە زۆر زەحمەتە بەبێ هەندێ ڕوونکردنەوەی پێویست، بتوانین درێژە بە گێڕانەوەی بدەین. بە خۆیشمان زۆر جار هەست دەکەین، لە ئاستی لێکدانەوەی ئەنگیزەی ئەم ڕووداوانەدا دەسەوستانین، بەڵام بە ئەرکی خۆمانی دەزانین کە بەگوێرەی توانا، ڕووداوەکان، بێ هیچ ڕتوش و ڕازانەوەیک، وەکو خۆیان بگێڕینەوە.

ڕەنگە، ئەم تێبینییە بەلای خوێنەرەوە هەم غەریب و هەم نامەفهووم بێ. ئاخر چۆن دەکرێ پیاو شتێک بگێڕێتەوە کە ڕۆشنبینێ یان بیرۆکەیەک یان بۆچوونێکی تایبەتی و شەخسی دەربارەی نەبێت؟ جا بۆ ئەوەی گومانی زیاتر نەیەنینە سەر خۆمان، هەوڵدەدەین بیرۆکەکەی خۆمان بە نموونەیەک ڕوون بکەینەوە، بەڵکو خوێنەری دڵۆڤان، هەنگێ پەی بەوە بەرێت کە دژواریی کارەکەی ئێمە لە چدایە و گیرۆدەی چ ئاستەنگێکین. باشی نموونەکەشمان لەوەدایە، کە ئەو نموونەیەی هەڵمان بژاردووە، نە درێژدادڕییە و نە خۆدزینەوەیە لە بابەتەکە، بە پێچەوانەوە درێژەی ڕاستەوخۆی چیرۆکەکەیە.





دوای پازدە ڕۆژ، یانی لە سەرەتاکانی مانگی تەمووزدا (لە زەرفی ئەم دوو هەفتەیەدا )، چیرۆک و بەسەرهاتی قارەمانەکەمان، بە تایبەتی دوا ڕووداوی چیرۆکەکە، بوو بە داستان و کەوتە سەر زاری خەڵکی، داستانێکی نەنگینی سەیر، کومیدی، باوەڕنەکردەنی و لە هەمان کاتدا ترسناک، کە بەرەبەرە لە گشت کوچە و کۆڵان و شەقامەکانی دەوروبەری ڤێلاکانی لیبدیف و پتیتسن و داریا ئەلکسیڤاو ماڵی یەپانچیندا بڵاو بووەوە، یانی لە هەموو شارو دەوروبەری شاریشدا بڵاو بووەوە. هەموو خەڵکەکە، یان زۆربەی خەڵکی (خەڵکی شارۆچکەکە، خەڵکی ڤێلاکان، گەشتیارانی هاوینە و ئەو خەڵکانەی بۆ گوێگرتن لە موزیک دەهاتن) هەمان چیرۆکیان، بە هەزارو یەک شێوەی جیاواز دەگێڕایەوە. هەموو گێڕانەوەکان ئەوەیان دەگێڕایەوە کە چۆن میرزادەیەکی ناسراو لە ماڵێکی، ناسراوی، بەڕێزدا، پۆتی شکاندووە، وازی لە کیژێکی ئەو ماڵباتە، کە دەزگیران و مارەبڕیبووە، هێناوە و دوای ئافرەتێکی سۆزانی کەوتووە و پەیوەندیی دەگەڵ هەموو کۆنە دۆست و ئاشناکانی بڕیوە و هەر هەموو دابونەریتێکی کۆمەڵایەتی وەژێر پێیان ناوە و لێبڕاوە، بێ گوێدان بە گلەیی و گازاندەی خەڵکی، لە زەرفی چەند ڕۆژێکدا، لە باخ و پارکەکەی پاڤلوڤسکدا دەگەڵ ئەو ئافرەتە سۆزانیەدا، بێ هیچ شەرم و شورەیەک، بێ هیچ لە ڕوودامانێک، بێ منەت و بێ پەروا، وەک ئەوەی نە بای دیبێ و نە باران، بە بەرچاوی خەڵکییەوە، زەماوەند بکات.

زۆر شاخ و باڵی نەنگین لەم چیرۆکە دەنرا. ناو و ناوبانگی زۆر کەسی ناودار و بەڕێزی تێوە گلێنرا بوو، هەر کەسە و لای خۆیەوە شتێکی تازەی پێوە دەنا، ڕاستە شەقڵێکی خەیاڵی و ئەفسووناویی وەر گرتبوو، بەڵام لە لایەکی دیکەشەوە کۆمەڵێک حەقیقەت و ڕاستی حاشا هەڵنەگری ئەوتۆی تیا بوو، کە هەم مایەی سەرنجی خەڵکی بی و هەم مقۆ مقۆیەکی زۆر بنێتەوە.

ئیدی ئەم چیرۆکە بڵاو بووەوە، بوو بە داستانی سەر زاران، بە زۆر شێوە هاتە گێڕانەوە و باسکردن و لێکدانەوە، ناسکترین و هونەریانەترین





گێڕانەوە، (کە لە هەمووان زیاتر جێی باوەڕ بوو) هی ئەو کەسە سەرو زمان خۆش و بەریز و ماقووڵ و ئاقڵانە بوو، کە لە هەر کۆڕو کۆمەڵێکی جڤاکیدا، لەپێش هەموو کەسێکەوە، ئەو جۆرە ڕووداوانە ترش و خوێ بکەن و بۆ خەڵکی بگێڕانەوە و بە ئاو و تاو شرۆڤە و لێکدانەوەی بۆ بکەن. تا لەو ڕێگەیەوە تینویەتی شۆرەتخوازیی خۆیان بشکێنن و زۆر جار سووکنایی دڵی خۆیانی پێ بدەن.

جا بەگوێرەی گێڕانەوەکەی ئەوان، ئەم گەنجە لە بنەماڵەیەکی نەجیمزادە و ڕەسەنە، میر و میرزادەیە، نیمچە دەوڵەمەندە، زاتەن تا ڕادەیەک گێلۆکەیە، کەسێکی دیموکرات و هەواداری ئەو ڕێبازە نەهلیستییە هاوچەرخەیە کە تورگینیف باسی کردووە. ئیدی ئەم گەنجە کە بەحاڵ ڕووسی دەزانێت، حەزی لە کچێکی جەنەڕاڵ یەپانچین کردووە. ئیدی بەرە بەرەوەکو دەزگیرانی کچەکەیان هاتوو چۆیماڵیانی کردووە، بەڵام پاشان ئەم خانەوادەیەی هەڵخەڵەتاندووە، ڕێک بەهەمان شێوازی ئەو خوێندکاری لاهوتە، ئەو گەنجە فەرەنسایییەی لەم ماوانەی پێشوودا ڕیسکەکەی بڵاوکرایەوە. ئەم خوێندکاری لاهوتە کە خوێندن تەواو دەکات، بە خۆی دواوا دەکات بە قەشە دامەزرێ، دیارە مەبەستێکی شاراوەی خۆی دەبێت، پاش ئەوەی هەموو ڕێ و ڕەسمە فەرمی و ئایینیەکانی وەکو دووعا و نوێژ و سوێند خواردن و سرووتەکانی دی جێ بەجێ دەکرێت، دەبێ بە قەشە. بۆ ڕۆژی دوایی لە نامەیەکی کراوەدا بۆ (ئەسقوفەکەی) خۆی بە ئاشکرا ڕایدەگەیەنێ کە چونکە باوەڕی بە خوا نییە، پێی شەرم و نەنگە خەڵکی فریو بدات و ببێ بە بار بەسەریانەوە و لەسەر حسابی وان مووچە و بەرات وەر بگرێت، بۆیە پەشیمانە لەو کارەی دوێنێ ی خۆی و چیتر کاری قەشاتی ناکات، ئیدی ئەم نامەیە لە ڕۆژنامە لیبراڵەکاندا بڵاو دەکاتەوە. جا ئەم میرزادەیەش، ڕێک وەکو ئەو قەشە خوانەناسە فەرەنسایییە دەکات. چاوەڕێ دەکات تا ماڵی بابی کیژێ، ئاهەنگ و شەونشینییەکی گەورە ساز دەکەن، لەو ئاهەنگەدا، میرزادە بە ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکانی بەشەخسیەت و گەورە و ناوداری دەناسێنن. کەچی هەر

بە مەبەستی خۆنواندن و دەربڕینی تەرزی بیرکردنەوەی خۆی لە بەرچاوی ئامادەبووان، سووکایەتی بە هەندێک لەو کەسێتییە گەورانە دەکات، بە بەرچاوی میوانەکانەوە، بە شێوەیەکی ناشرین و بەئانقەست دەزگیرانەکەی دەردەکات. کە خزمەتکار و خزمەتچییەکان، دەیانەوێ لە ماڵەکە دەری بکەن، بەرگرییەکی توند دەکات، خۆی ڕادەپسکێنێ و لەو بگرە و بەردەیەدا گوڵدانێکی چینی زۆر جوانی دەگمەن و بەنرخ دەشکێنێ.

بەدەم گێڕانەوەی ئەم چیرۆکەوە، باسی یەکێک لەو خەسڵەتە ئەخلاقییانەش دەکرا کە لەم سەردەمەی ئێمەدا مۆدی پەیدا کردبوو، ئەویش ئەمە بوو کە ئەم گەنجە سەرشێتە، بە ڕاستی دەزگیرانەکەی، واتە کیژەکەی جەنەڕاڵی خۆشدەویست، کەچی تەنیا بۆ ئەوەی نەهلیستیەتی خۆی بنوێنێ، دەست لە دەزگیرانەکەی بەردەدات وتەحەدای کۆمەڵگە دەکات و بە بەرچاوی خەڵکییەوە، زەماوەند دەگەڵ ژنێکی بەرەڵلای سۆزانیدا دەکات، تا بیسەلمێنێ، کە شتێک نییە بە ناوی ژنی داوێنتەڕ یان ژنی داوێنپاک. تەنیا ژنی ئازاد هەیە و تەواو. ئەو باوەڕی بەو پۆلێنکاریە کۆن و سواو پواوانە نییە کە کۆمەڵگەی ئەرستوکرات دای ناوە و پابەندییەتی، تەنیا باوەڕی بە "دۆزی ژن" هەیە و تەواو، بگرە ژنی سووکی پێ باشترە لە ژنی سەلار و داوێنپاک.

ئەم بۆچوونە، ماقوولیەتێکی تیا بوو، دەچووە ئەقڵەوە، زۆربەی گەشتیارانی پاڤلوڤسک، قەبووڵیان بوو، بە تایبەتی کە دەگەڵ پێشهاتە ڕۆژانەکاندا تێکی دەکردەوە. هەڵبەتە زۆر لایەنی سەربورو چیرۆکەکە هەر گۆنگ و نادیار بوو: دەیانگوت کیژەی بەلەنگاز، ئەوەندە شەیدای دەزگیرانەکەی (هەندێ کەس بە هاوخەوەکەی ناویان دەبرد) دەبێ، کە ڕۆژی دوای دەست لێک بەردانەکەیان، دوای کۆنە دەزگیرانەکەی، کە لە ماڵی ماشقەکەیدا دەبێت، دەکەوێت. هەندێکی دی دەیانگوت، گوایە کوڕەکە، بەئانقەست و تەنیا لە ڕوانگەی پوچگەرایی و نەهلیستی خۆیەوە، بۆ ماڵی ئەو ژنەی کێشاوە، تا تووشی ناو زڕان و ئابڕو چوونی بکات.

بەهەرحاڵ، ئەم واریقات و چیرۆکە ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر بڵاو دەبووەوە

و دەکەوتــە ســەر زاران. بــە تایبــەتی کــە ئەوە ســاغ بووبــووەوە کــە ئەو زەماوەندە نەنگینە خەریکە سەر دەگرێت و لە ئان و ساتدایە.

جا ئێستا ئەگەر یەکێک پرسیار بکاو داوای ڕوونکردنەوەمان لێ بکات (نەک دەربارەی لایەنی نەهلیستی چیرۆک و ڕووداوەکە...) بەڵکو دەربارەی ئەوەی کە ئەم زەماوەندە چەند بە دڵی میرزادە بووە، چەند دەستی خۆی تیا بووە، لەو کاتانەدا لە چ بارێکی دەروونیدا بووە.. هتد، ئەوا دەبێ دان بەوەدا بنەین کە وەڵامی ئەسەحمان پێ نییە و زۆریش ئیحراج دەبین. ئەوەی ئێمە لــە مبــارەیەوە دەیــزانین، تــەنیا ئەوەندەیــە کــە بڕیــاری زەماوەندەکە درابوو. میرزادە، لیبدیف و کیللەر و برادەرێکی لیبدیفی، کە بەو بۆنەیەوە دەعوەت کرا بوو، ڕاسپارد، کە هەموو تەرتیباتێکی پێویست چ لە ماڵەوە و چ لە کڵێسا، بەو بۆنەیەوە فەراهەم بکەن. ئۆکەی دابوونێ کە سڵ لە مەسرەف و خەرجیات نەکەنەوە. ناستاسیا فیلیپوڤنا، سوور بوو لەسەر ئەوەی بە زووترین کات زەماوەندەکە سازبکرێت. کیللەر، سوور بوو لەسەر ئەوەی میرزادە بیکات بە برازا وا، میرزادە قەبووڵی کرد، ناستاسیا فیلیپوڤناش لای خۆیەوە بوردوفسکی بۆ خزمەتی خۆی هەڵبژارد، بوردوفسکی بە خۆشحاڵییەوە ئەم خزمەتەی قەبووڵ کرد. قەرار درا کە لە یەکی تەمووزدا، ئاهەنگی زەماوەندەکە بگێڕدرێ. جگە لەم زانیاریەوردو دروست و حاشا هەڵنەگرانە. هەندێ باس و خواسی دیکەمان لایە کە پیاو سەری سووڕ دەمێنێ، چونکە ڕێک پێچەوانەی زانیارییەکانی پێشووە. بۆ نموونە بە مەزەندەی ئێمە، میرزادە، وەختێ کە لیبدیف و ئەوانی دی ڕاسپارد بوو کە هەموو تەرتیباتێکی پێویست فەراهەم بکەن، ئیدی بیری چووبوو کە مەسەلەی زەماوەند و بووک و زاوا و برازاوا و ئەو شتانە لەئارادایە. ڕەنگە هەر بۆیەش بەو پەلەپەلە ئەوانەی ڕاسپارد بووبێ تا خۆی بەو شتانەوە مژول نەبێت و بیریان لێنەکاتەوە یان هەر بەتەواوەتی فەرامۆشیان بکات و لە مێشکی خۆی بیانسڕێتەوە.

باشە ئەگەر ئەمە ڕاست بێ، ئەو پرسیارە دێتە گۆڕێ کە لەو ماوەیەدا بیری لە چ دەکردەوە؟ چ کەڵکەڵە و سەودایەکی لەسەرا بوو؟ بە نیازی چی

بوو؟ بێگومان میرزادە هیچ گوشاریکی لەسەر نەبوو (بۆ نموونە لەلایەن ناستاسیا فیلیپوڤناوە) ڕاستە ناستاسیا فیلیپوڤنا، حەزی دەکرد بە زووترین کات زەماوەندەکەیان سازبکرێت و، ئەم زەماوەندە پێشنیازی ئەو بوو نەک میرزادە، بەڵام میرزادەش بە کەماڵی ئازادی، ڕەزامەندی لەسەر دابوو، کەس ناچاری نەکردبوو، بەڵام ڕەزامەندیەکەی لامسەرلایی بوو، وەکو ئەوەی بۆ کارێکی ئاسایی بێ و هیچ ئاقیبەتێکی خراپی لە دوو نەبێت.

زۆر بابەتی دیکەی لەم بابەتە سەیرەمان لایە، بەڵام پێمان وایە، ئەم بابەت و ڕووداوانە نەک هیچ تیشکێک ناخەنە سەر چیرۆکەکەمان، بەڵکو ئاڵۆزتریشی دەکەن. بەهەرحاڵ با نموونەیەکی دی بگێڕینەوە.

ئێمە دڵنیاین کە میرزادە، لەماوەی ئەم دوو هەفتەیەدا شەوو ڕۆژ دەگەڵ ناستاسیا فیلیپوڤنادا بوو. دەگەڵی دەچووە پیاسە و گەڕان، پێکەوە دەچوونە کۆری مۆزیک و گوێگرتن لە مۆزیک. هەموو ڕۆژێ دەگەڵی دەچووە گالیسکەسواری. ئەگەر بۆ سەعاتێک لێی دابڕا، نیگەران و بێتاقەت دەبوو. (هەموو نیشانە و قەرینەکان وایان دەردەخست کە بە ڕاستی خۆشی دەوێت). بە سەعاتان بەدیار ناستاسیا فیلیپوڤناوە دادەنیشت و بە دڵ و گیان گوێی لێدەگرت، ناستاسیا عادەتی وابوو، باسی هەر شتێکی کردبا، بەدەم بزە و پێکەنینەوە دەیگێڕایەوە، میرزادەش بە درێژایی کاتەکە گوێی لێ دەگرت و بەدەگمەن قسەیەکی دەکرد.

هەروەها ئەوەش دەزانین کە هەر لەو ماوەیەدا، میرزادە زۆر جار، لەناکاوا دەچوو بۆ ماڵی یەپانچین، بێ ئەوەی ئەمە لە ناستاسیا فیلیپوڤنا بشارێتەوە کە زۆری خەفەت بەمە دەخوارد. هەڵبەتە ئەوەش دەزانین کە ماڵباتی یەپانچین تا ئەو کاتەی لە پاڤلوفسک بوون، ڕوویان نەدەدایە و ڕێگەیان نەدەدا کە ئاگلایا بدینێ. میرزادە، بە بێدەنگی، بێ ئەوەی وشەیەکی لە زار بێتە دەرێ، دەڕۆیشت، کەچی ڕۆژی دوایی وەکو ئەوەی بیری چووبێ کە دوێنێ جوابیان کردووە، دەچووەوە بۆ ماڵیان. هەڵبەتە دیسان قاویان دەدایەوە. ئەوەش دەزانین کە میرزادە، بە سەعاتێک یان کەمێک کەمتر دوای هەڵاتنی ئاگلایا لە ماڵی ناستاسیا فیلیپوڤنا، یەکسەر چوو بۆ

ماڵی یەپانچین بەو خەیاڵ و ئومێدەی کە ئاگلایا لە ماڵەوە دەبینێ. چوونی میرزادە بۆ ئەوێ خێزانەکەی مشەوەش کرد، چونکە ئاگلایا هێشتا بۆ ماڵ نەگەڕابووەوە. خانەوادەکە یەکەم جار لە زاری ئەوەوە بیستیان کە ئاگلایا دەگەڵ ویدا چووە بۆلای ناستاسیا فیلیپوڤنا. دەڵێن گوایە لیزا ڤیتا پروکوفیڤنا، کچەکانی و تەنانەت میرزادە (س..)ش زۆر بە ڕەقی و نادۆستانە ڕەفتاریان دەگەڵ کردبوو. بە قسەی ناخۆش پێیان گوتبوو، نە دەیناسن و نە بیان ناسێت و نە جارێکی دی هاتووچۆیان بکات، بە تایبەتی کە لەو کاتەدا ڤارڤارا ئاردالیوڤنا لەناکاوا خۆی گەیاند بووە ئەوێ وخەبەری بە لیزاڤیتا پروکوفیڤنادا کە ئاگلایا نزیکەی سەعاتێکە لە ماڵی ئەوە و زۆر شپرێو و شپرزە و هەراسانە و دوو دڵە لەوەی بۆ ماڵ بگەرێتەوە.

ئەم هەواڵە کە لیزاڤیتا پروکوفیڤنای زۆر هەراسان کرد. خیلافی تیا نەبوو، ئەلهەقی ئاگلایا کە لە ماڵی ناستاسیا فیلیپوڤنا وەدەر کەوتبوو، مردنی پێ خۆشتر بوو لەوەی جارێکی دی ڕووبەڕووی کەسوکارەکەی ببێتەوە. بۆیە بەلەز پەنای بردبووە بەر نینا ئەلکسندروڤنا. ڤارڤارا ئاردا لیونوڤناش، بەپێویستی زانی بوو، بەپەلەو بێ دواکەوتن هەواڵ بۆ لیزاڤیتا پروکوفیڤنا بەرێ و لە هەموو شتێکی ئاگادار بکاتەوە. دایک و جووتە کچ، بەهەشتاو بەرە و ماڵی نینا ئەلکسندروفنا دەبنەوە، ئیڤان فیدروفیچش کە تازە دەگاتەوە ماڵێ، یەکسەر، دوایان دەکەوێت.. میرزادە لیون نیکولایوفیچش وێڕای ئەوەی دەریان کردبوو، قسەی سارد و سووکیان پێ گوتبوو، بەپەلە دوای ئافرەتەکان کەوتبوو، بەلام لەوێ ڤارڤارا ئاردالیونوڤنایان ڕاسپاردبوو کە نەیەڵێ ئاگلایا بدینێ.

مەسەلەکە بەم جۆرە کۆتایی هات: ئاگلایا، کە بینی دایکی و خوشکەکانی بۆ ئەو دەگرین و هیچ سەرزەنشتێکی ناکەن، خێرا بەسەر دەست و پێیاندا کەوت و بەرە و ماڵ بەگەڵیان کەوت.

دەڵێن (هەرچەندە ئەم دەنگۆیە زۆریش مەعلووم نیە) ئەم جارەش بەخت یاری گاڤریلا ئاردا لیونوفیچ نەبوو: کاتێ ڤارڤارا ئاردالیونوڤنا

دەچێت بۆلای لیزاڤیتا پروکوفیڤنا، گاڤریلا بە تەنیا لای ئاگلایا دەمێنێتەوە، وای بەخەیاڵا دێت کە مردوو لەوە پاکتر ناشۆرردرێ و باشترین دەرفەتی بۆ هەڵکەوتووە، کە ئەشقی خۆی بۆ ئاگلایا ئاشکرا بکات. کە ئاگلایا گوێی لێدەبێت، خەم و فرمێسکەکانی خۆی فەرامۆش دەکات و لە قاقای پێکەنین دەدات و ئەم پرسیارەی لێ دەکات: ئایا ئامادەیە، بۆ سەلماندنی ئەم خۆشەویستی و ئەشقەی خۆی، ئا ئێستا و لەم شوێنەدا، قامکی خۆی لەسەر گڕی مۆمێک ڕابگرێت و بیسووتێنێ؟ دەگێڕنەوە دەڵێن کە گاڤریلا ئاردالیونوفیچ کاتێ گوێی لەو پێشنیازە دەبێت لە سەرسامیا بەنج دەبێت، کە ئاگلایا بە چارەی حەپەساو واقی وڕەوە دەبینێ، لە قاقای پێکەنینێکی هیستریانە دەدات و بەغار بەرە و نهۆمی سەرەوە، بۆ لای نینا ئەلکسندروڤنا دەڕوات، کە کەسوکارەکەی دوای تۆزێک لەوێ دەیبیننەوە.

میرزادە، بۆ سبەینێ ئەم واریقاتەی لە ڕێگەی هیپولیتەوە زانی و بیست، هیپولیت، کە لەبەر نەخۆشی نەی توانیبوو لە جێگا هەستێت، بەپەلە ناردبووی بەشوێن میرزادەدا تا ئەو سەربوردەی بۆ بگێڕێتەوە، کە ئێمە نازانین هیپولیت چۆن بەم سەربورەی زانی بوو، بەڵام کە میرزادە، گوێی لە باسی قامک و مۆمەکە دەبێت، لە قاقای پێکەنینێکی ئەوتۆ دەدات کە هیپولیت سەری سووڕ دەمێنێ. پاشان سەراپای دەکەوێتە لەرزین و دەست بە گریان و هەنسک هەڵدان دەکات...

میرزادە، لەو ڕۆژانەدا، بە شێوەیەکی گشتی زۆر بێقەرار و شپرێو، لەڕادەبەدەر نیگەران بوو. تەنانەت هیپولیت، بەڕاشکاوی گوتبووی، کە میرزادە لە یەکێک دەچێت ئەقڵی تێک چووبێت، بەڵام ئەم بۆچوونە، تا ئەو کاتەش جێی باوەڕ نەبوو.

ئێمە کاتێ ئەم سەربوور و واریقاتانە دەگێڕینەوە و خۆمان لە هەر ڕوونکردنەوە و شرۆڤەیەکی دوور دەگرین، نامانەوێ پاکانە بۆ قارەمانەکەمان بکەین و کارێکی وا بکەین خوێنەر ڕەفتارەکانی بەئاسایی بزانێت و لێی قەڵس و تووڕە نەبێت. بەپێچەوانەوە، ئامادەین لەو بێزاری و ناڕەزاییانەشدا بەشداربین کە میرزادە لە ناو دۆستەکانیا نابویەوە. تەنانەت

(ڤیرا لیبدیف)ش تا ماوەیەک لێی زویر بوو. کولیا و کیللەریش نارەزایی خۆیان دەربڕی. کیللەر وەختێ دەگەڵیا ئاشت بووەوە کە میرزادە کردی بە برازاوا بۆ زەماوەندەکەی. تورەیی و زویر بوونی لیبدیف هەر مەپرسە! بە رادەیەک جیددی بوو، کە کەوتە داونانەوە بۆ میرزادە، پاشان دێینەوە سەر باسی.

ئێمە لە رووی مەبدەئیەوە، بێ هیچ دوو دڵیەک، پشتیوانی لە هەندێ قسانی توند و غەریب، بەلام لە رووی سایکۆلۆژیەوە قووڵ و بەجێ دەکەین. مەبەستم ئەو قسانەیە کە یەڤگینی پاڤلوفیچ، رۆژی شەشەم،یان حەوتەمی دوای رووداوەکەی ماڵی ناستاسیا فیلیپۆڤنا، رووبەڕوو، بەراشکاوی، بە میرزادەی گوتبوو. جا لێرەدا پێویستە ئەوە بگوترێ کە هەموو ئەو کەسانەی راستەوخۆ وناراستەوخۆ پەیوەندیان بە خانەوادەی یەپانچینەوە هەبوو، پێیان وابوو، کە پێویستە، هاوخەمی ئەو ماڵباتە بکەن و پەیوەندیی خۆیان دەگەڵ میرزادەدا ببڕن. بۆ نموونە میرزادە(س..) کە دەیبینی، رووی لێوەدەگێڕا و سلاوەکەی نەدەسەندەوە، بەلام یەڤگینی پاڤلوفیچ ترسی ئەوەی نەبوو کە بە هاتوچۆکردنی لای میرزادە، گلەیی بێتەسەر، هەرچەندە تازە کەوتبووەوە هاتوچۆی خانەوادەی یەپانچین و هەموو رۆژێ سەری دەدان و بە رواڵەت زۆر لە جاران گەرموگوڕتر پێشوازیان دەکرد.

رۆژی پاش رۆیشتنەوەی خانەوادەی یەپانچین لە پاڤلوڤسک، یەڤگینی پاڤلوفیچ چووە دیدەنی میرزادە. کە چووە لای میرزادە، ئاگای لە هەموو ئەو قسەوقسەلۆکانە بوو کە لەشارا، دەماودەمیان دەکرد، رەنگە ئەویش دەوری لە بلاوکردنەوەی ئەو قسانە هەبووبێ. میرزادە، بەدیتنی زۆر خۆشحاڵ بوو، یەکسەر باسی ماڵی یەپانچینی هێنایە گۆڕێ. کردنەوەی دەرگای ئەم بابەتە بەو راشکاوی و راستەوخۆییە، یەڤگینی پاڤلوڤیچی ئاسوودە کرد، گرێی زمانی کردەوە کە راستەوخۆ بچێتە ناو باسەکەوە.

میرزادە هێشتا بەرۆیشتنەوەی ماڵباتی یەپانچینی نەزانی بوو. کە ئەم هەواڵەی لە یەڤگینی پاڤلوفیچەوە زانی، زۆر نارەحەت بوو، بەنج بوو،





ڕەنگی لە ڕووا نەما، بەڵام دوای دەقیقەیەک بە شپرزەیی و پەشۆکاوی سەرێکی لەقاند و گوتی: "هەقی خۆیانە، دەبوایەوا بکەن"؛ ئەوسا بەلەز پرسی: "کێوە چوون؟"

یەڤگینی پاڤلوفیچ، کە بە دیقەت سەرنجی میرزادەی دەدا، زۆری پێ سەیر بوو کە بینی ئەو پرسیارە خێرایانەی لێ دەکات. ئەو پرسیارە سادانە، کە بینی چەند پەشێو و پەرێشانە، بە چ ڕاستگۆییەکی غەریبەوە قسان دەکات، کە بینی لە چ نیگەرانی و پەرێشانی و بێئۆقرەییەکدایە. وێڕای ئەوەش یەڤگینی زۆر بە لوتف و میهرەبانی، میرزادەی لە هەر هەموو ئەو دەنگو باس و ڕووداوانە ئاگادار کرد، کە هیچی دەربارە نەدەزانین. یەڤگینی پاڤلوفیچ، یەکەم کەس بوو لە هەواڵ و دەنگوباسی خانەوادەی یەپانچینی ئاگادار کرد.

یەڤگینی دڵنیای کرد کە ئاگلایا بە ڕاستی نەخۆش کەوتووە و سێ دانە شەوی تەواو بەدەم لەرزو تاوە تلاوەتەوە و خەو نەچووەتە چاوی، بەڵام هەنوکە باش بووە و لە خەتەر خەلەسیووە، بەڵام هێشتا هەر شپرزە و شپرێوە... لە سەری ڕۆیشت: "بەڵام باشە ئێستا ئارامی تەواو باڵی بەسەر ماڵەکەدا کێشاوە و هەموو شتێک هێور بووەتەوە! " هەوڵدەدەن، لە بەینی خۆشیاندا باسی ڕابردوو نەکەن، چ جای ڕووبەڕووی ئاگلایا. دایک و باوکی بە دەستیانەوەیە، یەکسەر دوای زەماوەندەکەی ئادیلاید، بە خێزانی سەفەری هەندەران بکەن، ئاگلایا، سەبارەت بەم پرۆژەیە و یەکەم ئاماژە بەم پرۆژەیە، هێشتا بێدەنگە و هیچی نەگووتوە." بەڵام ئەویش، واتە یەڤگینی پاڤلوفیچ، ڕەنگە سەفەری هەندەران بکات. تەنانەت میرزادە "س.." و "ئادیلاید"یش ئەگەر دەرفەتیان بۆ برەخسێت و کاروباران ڕێیان بدەن، بەتەمان سەفەرێکی دوو-سێ مانگی هەندەران بکەن. یانی جەنەڕاڵ بەتەنیا لە ماڵ دەمێنێتەوە. هەنوکە بە خاوخێزانەوە چوون بۆ موڵکەکەی (کولومینو)یان کە کەوتووەتە بیست فەرسەخی پترسبۆرگەوە، لەوێ خانوویەکی گەورەیان هەیە. دۆتمیر بیلوکونسکایا، هێشتا بۆ مۆسکۆ نەگەڕاوەتەوە، لەوە دەچێ بەئانقەست لێرە مابێتەوە. لیزاڤیتا پروکوفیڤنا،

سوور بوو کە دوای ئەو پێشهات و ڕووداوانە، ئیدی مەحاڵە بتوانن لە پاڤلوڤسک بمێننەوە، بۆیە دەبێ بڕۆن. یەڤگینی پاڤلوفیچ، ڕۆژ بە ڕۆژ هەر هەموو ئەو قسە و قسەلۆک و دەنگۆیانەی لە شارا بڵاو دەبوونەوە، بۆ لیزاڤیتا پروکوفیڤنا دەبرد. ئیدی خانەوادەی یەپانچین، هەستیان کرد، ناتوانن لە ڤێلاکەی (ئیلاگین)شیاندا بژین.

یەڤگینی باڤلوفیچ لەسەری ڕۆیشت:

– هەڵبەتە میرزادە، بە خۆت دەزانی کە ئەو وەزعە بۆ ئەو ماڵە زۆر ناخۆش بوو، نەیاندەتوانی بە حاڵەوە هەڵبکەن، بە تایبەتی کە هەموو سەعاتێ دەیانزانی چ لە ماڵەکەی تۆدا دەگوزەرێ و تۆش کۆڵ نادەیت و، هەرچەند ڕووت نادەنێ و جوابت دەکەن، هەموو ڕۆژێ هەر بۆ "ئەوێ" دەچیت.

میرزادە، سەرێکی بۆ لەقاند و بەرسڤی دایەوە:

– بەڵێ، بەڵێ، هەق بە تۆیە. من دەمویست ئاگلایا ببینم.

یەڤگینی پاڤلوفیچ، لەپڕ بە دەنگێکی خەمین هاواری کرد:

– باشە میرزادەی ئازیز، تۆ چۆن ڕێت دا، ئەو شتانە ڕوو بدەن؟ هەڵبەتە دروستە کە تۆ چاوەڕوانی ئەو شتانەی نەبوویت... غافڵگیر بوویت.. کە ئەوەت دیتووە حەپەساویت، ئەقڵت بە هیچ کوێ ڕا نەگەیشتووە. نەتوانیوە ڕێ لەو کیژە کەللە ڕەقە بگریت، ئەوە لە توانای تۆ بەدەر بووە! بەڵام دەبوایە جیددی بوونی عاتیفە و سۆزی ئەو کیژە دەرهەق بە خۆت دەرک بکەی.. ئەو تۆی خۆش دەویست، حەزی نەدەکرد، کەسی دی لەو خۆشەویستیەیدا شەریک بێ، بەڵام وێڕای ئەمەش تۆ ئەم گەنجەت لە دەست دا، وێرانت کردا."

میرزادە، بە خەمینی گوتی:

– بەڵێ، بەڵێ، هەق بە تۆیە. گوێ بگرە: ئاگلایا تاقە کەسێک بوو لەو ڕوانگەیەوە و بەو چاوە سەیری ناستاسیا فیلیپوڤنای دەکرد! جگە لەو هیچ کەسێکی دی ئەو بۆچوونەی دەربارەی نەبوو، بەو چاوەش سەیری نەدەکرد...

یەڤگینی پاڤلوفیچ کە هاتبووە جۆش گوتی:

- ئاخر قەباحەتەکە لەمەدایە، پیاو لەمە پەستە. مەسەلەکە زەرەیەک جدیەتی تیا نەبوو... ببورە میرزادە... بەلام من... بیرم لە مەسەلەکە کردووەتەوە، زۆریش بە دیقەت وردم کردووەتەوە. من ئاگام لە هەموو ئەو کەین و بەین و پێشهات و ڕووداوانەی ئەم شەش مانگەی دواییە هەیە. مەسەلەکە زەرەیەک جدیەتی تیا نەبوو! تەنیا گەواڵە خەیاڵێکی ڕەوتەنی، خەوێ، خۆزیایەک و، دووکەڵێک بوو. کە مەگەر هەر غیرە و حەسوودی ترسناکی کیژێکی بێ ئەزموون، توانیبای بیگۆڕێت بۆ بابەتێکی جدی!

لێرەدا یەڤگینی پاڤلوفیچ، هەستی بە ئاسوودەییەکی تەواو کرد، بێ هیچ مدارایەکی میرزادە، جڵەوی بۆ زمانی خۆی شل کرد و بێزاری و تورەیی خۆی بە ڕاشکاوی هەڵڕشت. بە ڕوونی و ڕەوانی و بێ گرێ. تەنانەت بە شێوایێکی سایکۆلۆژی قووڵ و پەسەندەوە، بە بەڵگەوە، وێنەیەکی بەرجەستەی پەیوەندییەکانی میرزادەی دەگەڵ ناستاسیا فیلیپوڤنادا، خستە بەرچاوی میرزادە، یەڤگینی پاڤلوفیچ کە کەسێکی قسەزان و زمانپاراو بوو، ئەم جارەیان گەیشتبووە لووتکەی بەلاغەت و دەماوەری. گوتی:

- تۆ لە سەرەتاوە بە درۆیەک دەستت پێکرد، هەر شتێک بە درۆ دەست پێ بکات، بەدرۆ کۆتایی دێت. ئەوە یاسای تەبیعەتە. من لەو کەسانە نیم کە بە گێلت دەزانن، نە ئەو قسانەم قەبووڵە و نە پێیم خۆشە. تۆ لەوە زیرەکتری بە گەمژە دابنرێی، بەلام هەڵبەتە بە خۆتیش دەزانی کە هەندێ شتت هەن لە خەڵکانی تر جیایە. لە خەڵکانی دی ناچیت. من گەیشتوومەتە ئەم ئەنجامگیرییەی کە سەرچاوەی هەر هەموو ئەم شتانەی ڕوویان داوە، یەکەم: "بی ئەزموونی زاتییە" (میرزادە، سەرنجی ئەم وشەیە بدە "زاتی" دووەم: سادە دڵی و ساکاری بی ئەندازەی خۆتە. ئەمە جگە لەوەی کە پێم وایە هیچ هەستێکی میانڕەویت نییە (ئەمە یەکێکە لەو ئافەتانەی کە زۆر جار خۆتیش دانت پێدا ناوە) هەڵبەتە نابێ ئەوەشمان لەبیر بچێت کە یەک دنیا چەمک و بیروڕای سەیر و ناواقیعی و ئەبستراکتت وەر گرتووە و لە مێشکتا کەڵەکە بووە و تۆ لە دڵسۆزی و خۆشباوەڕی خۆتەوە، بە

ڕاوبۆچوون و بیرو باوەڕی ڕەسەن و ئاسایی وەرت گرتوون! جا میرزادە تۆ دەبێ دان بەوەدا بنەیت کە پەیوەندیت دەگەڵ ناستاسیا فیلیپوڤنادا، لە سەرەتاوە، (بەکورتیەکەی) لە سەر بنەمای بیرۆکەی "دیموکراتیکی ڕیفۆرمیستی" و (بەکورت و موختەسەری) "دۆزی ژنان" بووە کە تۆی ئەفسوون کردبوو. من بەوردی ئاگام لەو دیمەنە سەیر و ڕووداوە حەیابەرەیە هەیە کە لە ماڵی ناستاسیا فیلیپوڤنادا، کاتێ ڕوگوژین پارەکەی دەگەڵ خۆیدا هێنابوو، هەیە. ئەگەر حەز دەکەیت و دەتەوێ، جۆری بیرکردنەوەی خۆتت بە تەواوەتی بۆ وردو شیدەکەمەوە و وەکو ئاوێنە دەیدەمە دەست و تەمەشای خۆت بکە، چونکە زۆر بەوردی ئاگام لە حەقیقەتی مەسەلەکە هەیە و دەزانم چۆن و بۆ بەو ئاقارەدا ڕۆیی! کاتێ بە گەنجی لە سویسرا دەژیای، زۆر بیری وڵاتی خۆت دەکرد، هەستت بە غوربەت دەکرد، خەریک بوو بۆ ڕووسیا، وەکو بە هەشتێکی نادیار، پەروباڵ دەر بکەی. زۆر کتێبانت دەربارەی ڕووسیا خوێندەوە. ڕەنگە لە جۆری خۆیاندا کتێبی نایاب بووبن، بەڵام زەرەریان لێ دایت. کە گەڕایتەوە بۆ زێدو زاگەی خۆت تینووتامەزرۆی کارو چالاکی بوویت، بە وتەیەکی دی کەوتیتە کارو کۆشش. لە یەکەم ڕۆژی هاتنەوەتەوە، گوێت بە حیکایەت و بەسەرهاتی خەمناک و بە ژانی، مرۆڤێکی لە خشتەبراوی گومڕا کراوی غەدر لێکراو ئاخێنرا. ئەو سەربورە بۆ تۆ، بۆ تۆی پاک و بێگەرد، شەهڵەوەند و جوامێر گێڕدرایەوە. ئەو مرۆڤەش کە بەسەرهاتەکەی بۆ تۆ گێڕدرایەوە ژن بوو! هەر ئەو ڕۆژە دەیبینی و ئەفسوونی جوانی و شۆخییەکەی دەبیت. جوا نیەکی خەیاڵئەنگێزی ئەهریمەنی (بزانە چۆن دان بە جوانیەکەیدا دەنەم). جا وەرە، شەکەتی میشک و فێ و نەخۆشییەکەی خۆتیش بکە بەسەرباری ئەمە. ئەدی توانەوەی سەهۆڵبەندانی خەمئەنگێزی پترسبۆرگ بۆ ناڵێی کە بە ڕاستی تاقەتبەرە. ئەمە جگە لەوەی کە هەر لەو یەکەم ڕۆژەتا، هایم و حەیران بە ناو شار کەوتبووی، شارێکی بێ سەروبن، نادیار، کە بۆ تۆ نیمچە ئەفسانەیی بوو. زۆر دیمەنی تازە و خەڵک و کۆڕو مەجلیسانت بینی. ڕۆژێک بوو پڕ لە ئاشنایی ڕووداوی

چاوەڕوان نەکراو. ڕۆژێک بوو کە سێ کیژی جوانی خانەوادەی (یەپانجین)ت کە یەکێکیان ئاگلایا بوو، بینی و ناسی.. ئەدی ماندوو بوون و سەرەگێژێکی خۆت بۆ نالێی، ئەوجا وەرە هۆڵی پێشوازیەکەی ناستاسیا فیلیپوڤنا و ئەو بەزم و ڕەزمەی لەوێدا بەرپا بوو... و... لەو وەزع و حاڵەدا، دەتتوانی چاوەڕوانی چی لە خۆت بکەیت؟ بێزەحمەت پێم نالێی؟.

میرزادە سەرێکی لەقاند و دەموچاوی سوور بووەوە و گوتی:

- بەڵێ، بەڵێ، تەقریبەن وا بوو. دەزانی شەوی پێشتر و پێشتریش لە ڤیتاردا نەنوستبووم... هەستم دەکرد وەزعم تەواو نییە...

یەڤگینی پاڤلوفیچ لەسەر قسەکەی ڕۆیشت:

- منیش دەمەوێ لەسەر ئەم بابەتە بڕۆم. دیارە تۆ لەژێر باندۆرو کاریگەری جۆشوخرۆشی خۆتا بوویت. بە گوتەیەکی دی بە دەرفەتت زانیوە، تا لەبەردەم خەڵکیدا، بە ئاشکرا و بێ پەروا، ڕای بگەیەنیت، کەوێڕای ئەوەی بابەل باب میرزادەیت، وێڕای ئەوەی پیاوێکی لە پەڕەی گوڵ پاکتر، قەت ژنێک کە بەخواستی خۆی ڕێگەی بەدکاری هەڵنەبژاردووە، بەڵکو پیاوێکی داوێن پیسی قێزەونی سەر بە چینی ئەرستۆکرات، لە خشتەی بردووە، بە بێ ئابڕوو نازانی. ئەمە شتێکی مەفهوومە و چەند و چوون هەڵناگرێ! بەڵام جەوهەری مەسەلەکە ئەمە نییە میرزادەی ئازیز. ئەوەی گرینگە و پێویستە بیزانین ئەمەیە: ئایا ئەم سۆز و هەستەی تۆ حەقیقەت، ڕاست، ئاسایی بوو، یان هەر جۆشوخرۆشێکی زهنی بوو؟ ژنێکی لەم جۆرە لە باری ئاینییەوە دەبەخشرێ، بەڵام ئایا پاشان کەس پێی دەڵێت کارێکی چاکت کردووە، ئایا شایستەی هەر ڕێز و حورمەتێکە؟ ئایا هەر خۆت، هەر ئەقڵی خۆت، دوای سێ مانگان بە مەسەلەکاندا نەچوویەوە؟ گریمان هیچ خەتایەکی نییە، لە پەڕەی گوڵ پاکترە (نامەوێ زۆر لەسەر ئەم مەسەلەیە بڕۆم). ئایا ئەمە دەبێتە پاکانە بۆ ئەو هەموو غروور و لەخۆباییبوونە ئەهریمەنیەی هەیەتی، بۆ ئەو هەموو گۆساخی و لوتبەرزیە بێ مانایە، بۆ ئەو هەموو خۆ پەرستیە زەقەی ئەو. ببورە میرزادە، کەواهی گەرم بووم، بەڵام...





میرزادە، دووبارە، لەبن لێوانەوە گوتی:

-بەڵێ، ڕەنگەوابێ. لەوەیە هەق بە تۆبێ... بە ڕاستی لەڕادەبەدەر، هەڵچووە. هەڵبەتە تۆ ڕاست دەکەی، بەڵام...

- دەتەوێ بڵێی کە شایستەی بەزەییە، میرزادە گیان؟ ئایا ئەمە ئەو مافەت دەداتێ لە ڕووی بەزەییەوە و هەر بۆ دڵخۆشی ئەو ولەبەر خاتری ئەو، ئافرەتێکی دیکە، کچێکی نەجیب و پاک و خانەدان، لە بەرچاوی پڕ کەرب و کینەی ئەو تەریق بکەیتەوە و بیشکێنیت؟ ئاخر ئەمە چ بەزەیەکە؟ هەست ناکەیت ئەمە زێدەڕۆییەکی لە ئەقڵ بەدەرە؟ ئاخر تۆ کە ئەم کچەت خۆش دەوێ، چۆن توانیت بە بەرچاوی ڕەقیبەکەیەوە بەو جۆرە بیشکێنی، لەبەر خاتری ژنێکی دی دەستبەرداری بیت، دوای ئەوەی کە بە فەرمی لەبەردەم داک و باب و خوشکەکانیا خوازگاریت کرد، وانییە؟ جا لێرەدا پرسیار ئەمەیە (ببورە) ئایا دەشێت لەم حاڵەدا، بە پیاوێکی شەریف و ئابڕوومەند دابنرێی؟ دوای ئەمەش... ئایا کە بەم کچەت گوتووە خۆشت دەوێ کچێکی شایستەی پەرستن، درۆت دەگەڵ نەکردووە، فریوت نەداوە؟

میرزادە، پەست و غەمگین، بە تەریقییەوە گوتی:

- بەڵێ، بەڵێ هەق بە تۆیە. ئاهـ..! ئێستا دەزانم کە چەند خەتابارم، موستەهەقی تیرو تانەم!

یەڤگینی پاڤلوفیچ بە تورەیی هاواری کرد:

- بەڵام هەر بەوەندە تەواو دەبێ؟ بەوەندە دەبڕێتەوە کە بڵێی: "ئاهـ... کە خەتابارم! " تۆ خەتاباری، شایستەی سەرزەرنشتی و کەچی لەسەر هەڵە و خەتایەکانت بەردەوامی! باشە هەنگێ دڵت لەکوێ بوو، دڵی "مەسیحیانە"ی تۆ؟ ئەو کاتە دەموچاویت دەبینی، وانییە؟ باشە ئەو ڕەنج و ئازارەی بە سیمای ئەمەوە بوو، کەمتر بوو لە هیی "دۆسستەکەی" تۆ؟ ئاخر چۆن توانیت ئەم بدینیت و ڕێگەش بدەی ئەم بەزمە ڕوو بدات، پێم نالێی چۆن توانیت؟

میرزادەی بەلەنگاز لەبن لێوانەوە گوتی:

- ئاخر... من ڕێگەی هیچ شتێکم نەداوە...

-چۆن ڕێگەی هیچت نەداوە، مەبەستت چییە؟

- باوەڕ بکە، من بایسی هیچ ڕووداوێک نەبووم!... تا ئێستاش نازانم ئەمە چۆن ڕووی دا... من...لە کاتێکا کە خەریک بوو بەغار لە دووی ئاگلایا ئیڤانوڤنا دەچووم، ڕێک لەو کاتەدا ناستاسیا فیلیپوڤنا بورایەوە، لە هۆش خۆی چوو، ئیدی لەو کاتە بەدواوە ڕێیان نەدام ئاگلایا ئیڤانوڤنا ببینم.

- دەبوایە دوای ئاگلایا بکەوی و ئەوی تر بە بوراوەیی بەجی هێشتبا!

- بەڵێ، بەڵێ، دەبوایە من... هەنگێ ئەو دەمرد! خۆی دەکوشت، تۆ نایناسیت، چ بەلایەکە، هەموو شتێکی لەدەست دێ.. و.. بەهەرحاڵ هیچ فەرقێکی نەدەکرد، چونکە پاشان هەموو شتێکم بە ئاگلایا دەگوت و... تەمەشا یەڤگینی پاڤلوفیچ: هەست دەکەم تۆ ئاگات لە هەموو شتەکان نییە. پێم نالێی بۆ نایەڵن ئاگلایا ببینم؟ ئەگەر ڕێگایان دابام ببینم، هەموو شتێکم بۆ باس دەکرد. دڵنیابە خەتای هەر دووکیان بوو، کەسیان باسی ئەو مەسەلەیەیان نەکرد کە دەبوایە باس بکرێت، ئەمە هۆی ڕاستەقینەی ئەو فەزیحەت و فەرتەنەیە بوو. من مەحاڵە بتوانم، ئەمە بە ڕوونی و ڕەوانی بۆ تۆ شەرح بکەم، بەلام ڕەنگە لە ئاگلایای بگەیەنم.. ئاهـ. خودایا! خودایا! تۆ لێم دەپرسیت لەو کاتەدا دەموچاوی چۆن بوو، هەلات... ئاهـ. خودایا، زۆر چاک لە بیرمە کە لەو کاتەدا دەموچاوی چۆن بوو!...

میرزادە لەپڕ هەستایە سەرپێیان، قۆڵی یەڤگینی پاڤلوفیچی گرت و بەکەسەرەوە گوتی: "... وەرە با بڕۆین... وەرە بڕۆین...

- بۆ کوێ؟

- بچین ئاگلایا ببینین.. وەرە یەکڕاست بچین بۆلای ئەو!...

- پێم گوتیت، لە پاڤلوفسک ڕۆیشتن.. چ بکەین لای ئەو؟

میرزادە، بەو پەڕی بێدەسەلاتیەوە، دەستەکانی لێکدی هەڵسوون و لەبن لێوانەوە گوتی:

- ئەو تێدەگات، ئەو تێدەگات! تێدەگات کە مەسەلەکە "ئەمە" نییە، بەڵکو شتێکی تەواو جیاوازترە!

- چۆن جیاوازتیرە؟ تۆ دەگەڵ ئەو ژنەدا زەماوەند دەکەی! وانییە؟

هێشتاش هەر عینادی دەکەی... بەتەمای زەماوەندی یان نا؟
– بەڵێ... با... زەماوەند دەکەم... دەیکەم!...
– ئەدی ئیتر چۆن دەڵێی کە مەسەلەکە "ئەمە" نییە؟
– نا، مەسەلەکە ئەمە نییە، مەسەلەکە ئەمە نییە... زەماوەندی من گرینگ نییە... زەماوەندی من هیچ نییە!...
– باشە چۆن قسەی وا دەکەی، چۆن گرینگ نییە؟ خۆ ئەمە گاڵتەی منداڵ نییە، وانییە؟ تۆ زەماوەند دەگەڵ ژنێکدا دەکەی کە خۆشت دەوێ، بۆیە زەماوەندی دەگەڵ دەکەی تا بەختەوەری بکەیت. ئاگلایا ئەمە بەچاوی خۆی دەبینێ، دەیزانێت، ئیدی چۆن دەڵێیت، گرینگ نییە، هیچ نییە؟
– بەختەوەری بکەم؟ نا، نا. هەر زەماوەندی دەگەڵ دەکەم و هیچی تر.. تەنیا ئەوەندەی لێ دەوێم کە بیخوازم. ئیدی ئەم زەماوەندەی من دەکاتە چی؟ ئیدی ئەمە بۆ من هیچ گرینگ نییە. خۆ ئەگەر ئەمەم نەکردبایە بێگومان دەمرد. ئێستا دەزانم کە بیرۆکەی شووکردنی بە ڕوگوژین، شێتایەتی بووە! ئێستا لەو شتە دەگەم کە جاران لێی تێنەگەیشتم. گوێ بگرە بزانە چی دەڵێم: کاتێ ئەو دووە سەنگەریان لێکدی گرت و کردیان بە شەڕ، من بەرگەی دیتنی دەموچاوی ناستاسیا فیلیپوڤنام نەدەگرت...
ئەوجا میرزادەوەکو ئەوەی بیەوێ نهێنییەک بدرکێنێ، دەنگی نزم کردەوە و گوتی:
– یەڤگینی پاڤلوفیچ.. من ئەمەم بە هیچ کەسیک نەگوتووە، تەنانەت بە ئاگلایاشم نەگوتووە، بەڵام ڕاستت دەوێ نەمدەتوانی تەحەمولی دیتنی دەموچاوی ناستاسیا فیلیپوڤنا بکەم... تۆ زۆر بە دروستی باسی ئەو ئاهەنگ و شەونشینییەت کرد کە لە ماڵی ناستاسیا فیلیپوڤنادا ساز کرا بوو، بەڵام چونکە ئاگادار نیت، شتێکت پەڕاند: من سەیری "دەموچاویم" کرد. تەنانەت پێشستریش، ئەو بە یانیەی کەوێنەکەیم بینی، تەحەمولی گوزارشتی ئەو دەموچاوەم هەر نەکرد... تۆ دەموچاوی ڤیرا، کیژەکەی لیبدیف بێنە بەرچاوی خۆت: چاوی زۆر لە چاوانی ناستاسیا فیلیپوڤنا جیاوازن..

میرزادە بە ترسێکی ئاشکراوە، بەم ڕستەیە قسەکەی تەواو کرد:

- من لە دەموچاوی ناستاسیا فیلیپوڤنا دەترسم.

یەڤگینی پاڤلوفیچ لێی پرسی:

- لە دەموچاوی دەترسیت؟

میرزادە، ڕەنگی تێکچوو، بەچپە گوتی:

- بەڵێ، شێتە.

یەڤگینی باڤلوفیچ، بەوپەڕی کونجکاویەوە پرسیی:

- تۆ لەمە دڵنیایت؟

- بەڵێ، دڵنیام. ئێستا تەواو دڵنیام. لەم چەند ڕۆژەی دواییدا ئەمەم بە تەواوەتی بۆ ساغ بووەتەوە.

یەڤگینی پاڤلوفیچ بە ترسەوە هاواری کرد:

- باشە تۆ بەتەمای چ بەڵایەک بەسەر خۆت بینی، هەی نەگبەت؟ یانی تۆ لە ترسا زەماوەندی دەگەڵدا دەکەی؟ سەیرە، ناچێتە ئەقڵەوە!... ڕەنگە خۆشیشت نەوێ!

- با با، بە دڵ و بە گیان خۆشم دەوێ! ئەو قسەیە چییە تۆ دەیکەی!... ئەو ژنە منداڵە، هەر بە تەواوەتی منداڵە!... تۆ هەست بەمە ناکەیت!

- وێڕای ئەمەش، ئاگلایات خۆش ویست؟

-بەڵێ، بەڵێ، بە ڕاستی خۆشم دەوێ!

- باشە چۆن دەبێ؟ یانی دەتەوێ بڵێی لە هەمان کاتدا هەر دووکیانت خۆش دەوێ؟

- بەڵێ، بە ڕاستیش وایە.

- میرزادە، بۆ خاتری خوا، جوان بیربکەوە، ئەوە تۆ چ دەڵێی؟

- من بەبێ ئاگلایا... هەر چۆنێ بووە دەبێ بیدینم... دەنا بەو زووانە دەمرم، دوای تۆزێکی دی کە دەخەوم بەدەم خەوەوە و لەخەوا دەمرم... وام دانابوو دوێشە و لە خەو ڕاست نەبمەوە و بمرم. ئاهـ... خۆزیا ئاگلایا دەیزانی، هەموو شتێکی دەزانی... مەبەستم ئەوەیە هەر هەموو شتێکی بە تەواوەتی دەزانی! چونکە لێرەدا زانینی هەموو شتێک پێویستە، زەرووریە

پیاو هەمووو شتێک بزانێ! نازانم بۆچی ئەو توانایەمان نییە، ئەو بەهرەیەمان پێ ڕەوا نەبینراوە کە "هەموو شتێک" دەربارەی کەسێکی دی بزانین، لە کاتێکا ئەم زانینە زۆر پێویست بێ، بە تایبەتی دەربارەی کەسێک کە بە تاوانباری بزانین! ؟. بەهەرحاڵ، هەموو شتەکانم لێ تێکەڵ بووە، وام لێ هاتووە خۆیشم نازانم چ دەڵێم. بە ڕاستی خستمیتە گێژاوێکی ترسناکەوە... ئاخۆ دەموچاوی هێشتاش هەر وەکو ئەو کاتەیە کە بەغار لە ژوورەکە چووە دەرێ؟ ئاهـ... بەڵێ... هەر هەمووی تاوانی منە! بێگومان هەموو تاوانەکان لە ئەستۆی منە، من بە تەواوەتی نازانم خەتاو گوناهەکانم چی بوون، بەڵام هەر هەمووی لە ئەستۆی منە!... یەڤگینی پاڤلوفیچ، شتێک هەیە کە من ناتوانم بۆتی شەرح بکەم، چونکە وشەم لێچووەتە قاتی و ئەو شتەم بۆ نایەتە دەربڕین بەڵام... ئاگلایا ئیڤانوڤنا، تێدەگات! هەمیشە متمانەم پێی هەبووە کە تێدەگات...

– نەخێر میرزادە، تێناگا! ئاگلایا ئیڤانوڤنا لە ڕووی ئینسانیەوە تۆی خۆش ویستووە، وەکو ئافرەتێک... نەک وەکو ڕوحێکی ڕووت. دەزانی چییە میرزادەی داماو، بە مەزەندەی من، لەوەدەچێت کە تۆ لە حەقیقەتدا، کەسیانت خۆش نەویستبێ، نە ئەمیان و نە ئەویان!

– نازانم... دەشێت... دەشێت!... زۆربەی هەرە زۆری ئەوقسانەی تۆ کردنت، ڕاستن یەڤگینی پاڤلوفیچ. تۆ پیاوێکی یەجگار زیرەکی یەڤگینی پاڤلوفیچ. ئاهـ. دیسان سەرم کەوتەوە ژان. وەرە با بڕۆین بۆ لای ئاگلایا، توبی خوا وەرە با بڕۆین... بیبینین، توبی خوا! .

– پێم گوتیت لە پاڤلوڤسک نییە! چوون بۆ کولمینو.

– دەیسا با بڕۆین بۆ کولمینو. وەرە با هەر ئێستا، یەکسەر بڕۆین!

یەڤگینی پاڤلوفیچ هەستا. بە دەنگێکی کشدار گوتی:

– مە.. حا.. لە!

میرزادە گوتی:

– دەیسا شتێکی دی. من نامەیەکی بۆ دەنووسم، تۆ بۆی ببە!

– نەخێر میرزادە، نا! ببورە، لەم ئەرکە بمبەخشە، من ناتوانم ئەم کارە

بکەم.

ئیدی لە یەکدی جیا بوونەوە.

یەڤگینی پاڤلوفیچ، بە جۆرەها هەست و بیری سەیرەوە ڕۆیشت. گەیشتە قەناعەتی تەواو کە ئەقڵی میرزادە کەمێک پارسەنگی دەوێ. "چ ڕازێک لەو دەموچاوەدا هەبوو کە میرزادە لە هەمان کاتدا هەم زۆری لێ دەترسا و هەم زۆری خۆش دەویست؟ دووریش نییە لە داخی دووری ئاگلایا دیق بکات و بمرێت، بەم جۆرە ئاگلایا هەرگیز نەزانێت کە میرزادە بە چ جۆشوخرۆشێکەوە خۆشی ویستووە، چەند شێت و شەیدای بووە! ها ها!... ئاخر پیاو چۆن دەتوانێ دوو ئافرەتی خۆش بوێ؟ هەر یەکەشیانی بە جۆرێکی جیاواز لەویتر خۆش بوێ؟ بە ڕاستی سەیرە... دێوانەی بەلەنگاز! ئاخۆ ئێستا لە چ حاڵێکا بێ؟."...

## فەسڵی دەیەم

بەهەرحاڵ میرزادە، کە لای یەڤگینی پاڤلوفیچ پێشبینی مەرگی خۆی کردبوو، لەپێش زەماوەندەکەیدا، نە لەبێداریاو نە لەخەوا نەمرد. ڕەنگە خەوی خۆش نەبووبێ، پڕ لە مۆتەکە و کابووس بووبێ، بەڵام بە ڕۆژەوە، لەناو خەڵکیدا، بە کەیف و سەرحاڵ و بگرە دڵخۆشیش دەی نواند. ڕاستە هەندێ جار زۆر دڵتەنگ و خەمبار دەبوو، بەڵام تەنیا لەو کاتانەدا ئەو حاڵەی بە سەر دەهات کە تەنیابایە.

بەپەلە تەدارەکی زەماوەند فەراهەم دەکرا، قەرار بوو نزیکەی هەفتەیەک، دوای دیدارەکەی یەڤگینی پاڤلوفیچ، ئەنجام بدرێت. نزیکان و دۆستانی دڵسۆزی میرزادە، هەرچەندە کەسی وای بە دەورەوە نەمابوو، کە چاویان بەو پەلە پەلە کەوت، ئیدی هیچ ئومێدێکیان بەوە نەما کە بتوانن ئەم بەلەنگازی نەگبەتە، ئەم قەلپیاوە، ژێوان بکەنەوە و لەو گێژاوەی ڕزگار بکەن. دەنگۆیەک بڵاو بووەوە کە گوایە جەنەڕاڵ ئیڤان فیدوروفیچ و لیزاڤیتا پروکوفیڤنای هاوسەری، (یەڤگینی پاڤلوفیچ)یان ڕاسپارد بوو کە فریای میرزادە بکەوێ. جا ئەوان کە لە چاکە و دڵسۆزی خۆیان حەزیان کردبوو، ئەم دێوانە داماوە، لەو قۆرتەی، کە تێی کەوتبوو ڕزگار بکەن، نەیاندەتوانی لەوەی پتری بۆ بکەن، چونکە نەباری دەروونی نە باری سۆزداریان ئەوەی هەڵنەدەگرت (کە ئەمەش زۆر ئاسایی بوو) لەوە زیاتری

بۆ بکەن و خۆی لێبکەن بە خاوەن. وەکو پێشتر ئاماژەمان کردێ، زۆربەی ئەوانەی لە میرزادە خڕبوونەوە، پشتیان تێکردو دژی وەستان. ڤیرا لیبدیفا، هەر ئەوەندەی لە دەست دەهات کە تەنیا دەبوو دەگریا، بە زۆریش لە ماڵ نەدەچووە دەرێ و لە جاران کەمتر دەچووە دیداری میرزادە.

کولیا، لەو کاتانەدا مژولی ڕێ و ڕەسمی پرسە و تازیەی باوکی بوو، پیرەمێرد، هەشت ڕۆژ دوای سەکتەی یەکەم، سەکتەی دووەمی دڵ، لێی دابوو و ئەم جارەیان بەرگەی نەگرتبوو و مرد بوو. میرزادە بەشدارییەکی زۆری لە پرسەکەیاندا کرد. لە ڕۆژانی یەکەمی پرسەکەدا، ڕۆژی چەند سەعاتێکی لای نینا ئەلکسندروڤنا بەسەر دەبرد. لە ناشتنی جەنازەکە و ڕێو ڕەسمی چوونە کڵێسادا بەشداری کردبوو. زۆر کەس هەستیان کردبوو، کە لە کاتی چوونە کڵێسا و گەڕانەوە لە کڵێسا، خەڵکانێک کە دیتبوویان، خۆ بەخۆ لە بەینی خۆیاندا کەوتبوونە چپە چپ، هەمان شت لە باخی گشتی و لە جادەوباندا ڕووی دابوو. ئیدی میرزادە بە هەر کوێیەکدا ڕۆیشتبا، چ بە پیادە و چ بە سواری گالیسکە، بازاڕی چپە و قسانی خەڵکی گەرم دەبوو، بە یەکیان نیشان دەدا، ناویان دێناو ناوی (ناستاسیا فیلیپوڤنا)شیان دەبرد. لە پرسەکەی جەنەراڵ دا چاویان بۆ ناستاسیا فیلیپوڤنا گێڕابوو، بەڵام لەوێ نەبینرا بوو. "بێوەژنەکەی کاپتن"ش، لە پرسەکەدا نەبینرابوو. لیبدیف، زوو فریا کەوتبوو و نەی هێشتبوو لە ماڵ بێتە دەرێ. ڕێوڕەسمی نوێژی مردوو، کارێکی زۆری لە میرزادە کرد، زۆری خەفەت خوارد. کە لیبدیف هۆی ئەوەی لێ پرسی بوو، لە وەڵاما گوتبووی کە ئەوە یەکەم جارە لە ڕێوەڕەسمی ئەرتەدۆکسیدا بەشداری بکات، هەرچەندە بەئاستەم بیری ماوە کە بەمنداڵی لەگوندا ڕێوە ڕەسمێکی لەو بابەتەی دیتووە.

لیبدیف، بە ئەسپایی، بەگوێیی میرزادەیا چپاند:

- ئێ ی دنیا، پیاو باوەڕناکات کە ئەم پیاوەی لەم تابووتەدایە، هەمان ئەو پیاوەبێ کە ماوەیەک لەمەپێش بە دەمڕاست هەڵمان بژارد، لە بیرتە میرزادە؟ چاو بۆ کێ دەگێڕی؟

- چاو بۆ کەس ناگێڕم، بەڵام وام هاتە خەیاڵ کە...

- لە ڕوگوژین دەگەڕێی؟
- چما لێرەیە؟
- بەڵێ، لە کڵێسایە.

میرزادە، پەشێوو پەرێشان لەبن لێوانەوە گوتی:

- دەڵێم! وام هاتە بەرچاو کە دیتم. باشە چۆن... چ شتێ گەیاندویەتییە ئێرە؟ دەعوەت کراوە؟

لیبدیف بەرسڤی دایەوە:

- نەخێر کەس دەعوەتی نەکردووە، ئاشنایەتی دەگەڵ ئەمماڵباتەدا نییە. هەموو کەسێک بۆی هەیە بێتە کڵێسا، بۆچی پێت سەیرە؟ من لەم ڕۆژانەدا زۆر دەیبینم. هەفتەی ڕابردوو چوار جار لێرە، لە پاڤلوفسک دیتم.

میرزادە، لەبن لێوانەوە گوتی:

- من تەنانەت تاقە جارێکیش نەمدیوە... لەو ڕۆژەوە.

هەڵبەتە ناستاسیا فیلیپوڤنا، بە میرزادەی نەگوتبوو کە لەو "ڕۆژە" بە دواوە، ڕوگوژینی بۆ جارێکیش نەدیوە. بۆیە میرزادە لەبەر ڕۆشنایی ئەوە، گەیشتبووە قەناعەت کە میرزادە، بەئانقەست خۆی لەو دەشارێتەوە. میرزادە بە درێژایی ئەو ڕۆژە، نقومی بیرو خەیاڵێکی قووڵ بوو، لە کاتێکا ناستاسیا فیلیپوڤنا، زۆر شادو بەکەیف بوو، ئەم شادمانیەی تا شەوێش هەر درێژەی کێشا.

کولیا، پێش مردنی بابی، دەگەڵ میرزادەدا ئاشت بووبووەوە، پێشنیازی بۆ کردبوو، کە کیللەر و بوردوفسکی وەکو شایەد بۆ زەماوەندەکەی دەعوەت بکات (ئەمە کارێکی گرینگ و بەپەلە بوو.) کولیا زەمانەتی خۆشڕەفتاری کیللەری کردبوو و گوتبووی ڕەنگە ئامادەبوونی "باش"ش بێت، بەڵام سەبارەت بە بوردوفسکی پێویستی بە پالاوتن نەبوو، چونکە پیاوێکی "هێمن و خاکی یە". نینا ئەلکسندروڤنا و لیبدیف، هەر دووکیان میرزادەیان ئاگادار کردبووەوە کە ئەگەر بەجیددی بەتەمای زەماوەندە و پەشیمان نابێتەوە، بەلای کەمەوە با لێرە، لە پاڤلوفسک و بەو ئاشکراییە، ئاهەنگ و بەزم نەگێڕێ، بە تایبەتی لەم قەرەباڵغی و جەنجاڵیەی وەرزی

هاویندا، کەوەرزی گەشتیارانە، باشتر وایە ئەم زەماوەندە بەرێتە پترسبۆرگ و لە ماڵدا بیگێڕێت. میرزادە دەیزانی ئەم هەموو ترسەیان لەبەر چییە، بەڵام زۆر بە کورتی وەڵامی دانەوە کە ناستاسیا فیلیپوڤنا، قەراری داوە ئاهەنگەکە لێرە سازبکرێت. بۆ سبەی، وەختێ کیللەر زانی کە بۆ شایەدی و برازاوایی هەڵبژێردراوە، هاتە دیدەنی میرزادە. لە ئاستانەی دەرگاکەدا وەستا، هەر کە میرزادەی بینی، کەڵەموستی لە هەوادا بەرزکردەوە و وەکو یەکێک سوێند بخوات و بەڵێن بدات، هاواری کرد:

- من ئیدی هەرگیز ناخۆمەوە

ئەوجا لە میرزادە چووە پیشێ. هەر دوو دەستی بە گەرمی و بە توندی گوشین و گوتی کە بە هەواڵی زەماوەندەکەی زانی، لە سەرەتادا زۆری لە بەرگران بووە و تەنانەت لە هۆڵی بلیاردەکەدا ناڕەزایی و توڕەیی خۆی بە ئاشکرا گوتووە و دەربڕیوە، بەڵام ئەم توڕەییە تەنیا لە ڕووی دۆستایەتی و دڵسۆزیەوە بووە، حەزی کردووە میرزادە، ژنێک بێنێ کە بەلای کەمەوە هیچی لە دۆتمیرێکی بنەماڵەی ڕۆهان یان ماڵباتی شابو کەمتر نەبێت، بەڵام ئێستا بۆی دەرکەوتووە کە بیرو بیرکردنەوەی میرزادە، دوازدە هێندەی بیرکردنەوەی (تێکڕای) ئەوانەی دەوروبەری، ڕەسەنتر و شەریفترە! چونکە میرزادە لە خەمی شۆرەت و ناوبانگ، سەروەت و سامان و خۆ نواندن و ئەو شتانەدا نییە، تەنیا حەقیقەت و ڕاستی لە نک وی گرینگە! هەڵبەتە ڕەئی گەورە پیاوانی پایە بەرز گرینگ نییە، میرزادە بۆ خۆی بە جۆرێ پەروەردە بووە و لە ئاستێکی خوێنەواری و ڕۆشنبیری ئەوتۆدایە کە نایەوێ خاوەن پایەبێ، بەڵام خەڵکانی گەجەر و گوجەر و بازاڕی، ڕاو بۆچوونی زۆر جیاواز و پێچەوانەیان هەیە. لە سەرانسەری شاردا، لە ماڵانا، لە کۆڕو مەجلیسانا، لە ڤیلاکانا، لە کۆنسێرت و ئاهەنگی مۆزیکا، لە مەیخانەکانا، لە هۆڵێ بلیاردا. ئەم مەسەلەیە، وەکو ڕووداوێکی گەورەی باوەڕنەکردەنی بووە بەوێردی سەر زمانان. تەنانەت بیستوومە کە خۆیان ئامادە دەکەن، بێنە ژێر پەنجەرەکەتان و بە مۆسیقایەکی ناساز و ناخۆش، نارەحەتت بکەن، ئەویش کەی! لەشەوی یەکەمی





زەماوەندەکـەتا!... جـا میـرزادە ئەگـەر پێویسـتت بـە دەمانچـەی پیـاوێکی شەریفە، ئەوا من ئامادەم، بۆ بە یانی شەوی زاوایەتی، بەر لەوەی لە نوێنی زاوایەتی بێیتە دەرێ، دوازدە فیشەکی پیاوانە بتەقێنم."

کیللـەر، ئامۆژگـاری میـرزادەی کـرد، کـە ترومپایـەکی ئـاو پرژێنـی ئـاگر کوژێنەوە، لـە حەوشـەدا دابنـێ، تـا بیکـات بەو خەڵکە فزوڵـەدا، کە ڕەنگـە لـە کـاتی گـەڕانەوەیان لـە کڵێسـا، لێیـان خڕ ببـنەوە و نارەحـەتیان بکـەن، بـەڵام لیبـدیف ئـەم پێشـنیازەی ڕەفـز کـرد و گـوتی: "ئەگـەر کـاری وایـان لەگەڵـدا بکرێ، خانووەکە ژێر و ژوورردەکەن".

کیللەر گوتی:

– میرزادە. دڵنیابە کە ئەم لیبدیفە لەگەڵتا بە فێڵـە! ئەمانـە دەیانەوێ سـەر وەسـێتت بۆ دابنـەن. بـاوەڕ دەکـەی؟ هـەنگێ دەسـتت دەبەسـتنەوە، هـەم لـە ئازادی و هـەم لـە بـەکارهێنانی پارەوپولی خـۆت مـەحرووومت دەکـەن. یـانی لەو دوو شـتـەت مـەحرووم دەکـەن، کـە هـەر هـەمووومان لـەچوار پێیـان جیادەکـاتەوە! مـن ئەمـەم بـەگوێی خـۆم بیسـتووە، چۆنـت بـۆ دەگێـڕمەوە، خیلافی نییە!

میـرزادە، بیـری کەوتەوە، بیرکەوتنەوەیـەکی گۆنـگ، کـە پێشـتر شـتێکی لەم بابەتەی بیستبوو، کە هەڵبەتە بەهەندی نەگرتبوو. ئێسـتاش کە گوێی لـە سەرنجەکەی کیللـەر بـوو، کـەمێک بـە دەمیەوە پێکـەنی و ئیدی مەسـەلەکەی فەرامۆش کرد.

ئەلهەقی لیبدیف، ماوەیەک بوو، بـەم مەسـەلەیەوە خجڵ (سـەرقاڵ) بـوو، جـرت و فـرت دەهـات و دەچـوو. ئـەم کابرایـە عـادەتی وابـوو، کـە دەسـتی دەدایە هەر کارێک هێندەی ورد دەکردەوە و هێندە هەڵپـەی جـێ بـەجێکردنی دەکـرد، ئـەم لاو ئەولای دەکـرد، مەسـەلەکەی بـە تەواوەتـی لـە خـۆی دەئاڵۆزاند، کە بە تەواوەتی لەو مەبەست و ئامانجە دوور دەکەوتەوە کە لـە سەرەتاوە نەخشەی بۆ دانا بوو. یانی کابرایـەک بـوو تـا بڵێی هەڵەشـە، هـەر بۆیـەش لـەژیانا زۆر سـەرکەوتوو نـەبوو. پاشـان تەقریبـەن لـە ڕۆژی زەماوەندەکەدا هات بۆلای میرزادە و ئیعترافی بۆ کرد کە (لیبدیف عـادەتی

وابوو پیلانی دژی هەر کەسێک گێڕابا، دەچوو بۆلای، پەشیمانی خۆی دەردەبڕی و تۆبەی دەکرد، بە تایبەتی ئەگەر لە پیلانەکەیدا سەرکەوتنی بەدەست نەهێنابا) ئەو، واتە لیبدیف بۆ ئەوە خولقا بوو کە ببێ بە تالیران، بەڵام لە نەگبەتی و بەدشانسی خۆیدا، هەر بە "لیبدیف"ی ماوەتەوە، ئەوجا هەموو داو و پلانەکەی خۆی بۆ میرزادە باسکرد کە بە ڕاستی مایەی سەرنجی میرزادە بوو. گوتی کە سەرەتا کەوتبووە گەڕان بە دوای کەسانی ئەرستوکراتی دەسترۆ، تا لە کاتی تەنگانەدا پشتی بگرن. بۆ ئەو مەبەستە چووبوو بۆلای جەنەڕاڵ یەپانچین، بەڵام جەنەڕاڵ، ملی نەدابوو، گوتبووی " هەرچەندە هیوای بەختەوەری بۆ ئەو گەنجە دەخوازێت و چەندیش حەز بکات ڕزگاری بکات، ناتوانێ خۆی لەو کارە بکات بە خاوەن، چونکە دابونەریت ڕێگەی نادات." لیزا ڤیتا پروکوفیڤنا، نەیویستبوو هەر بیبینێ یان گوێی لە باس و خواسی بێ. یەڤگینی پاڤلوفیچ و میرزادە (س..)ش ڕەفزیان کردبوو و دەستیان پێوە نابوو. لیبدیف هەر کۆڵی نەدابوو: ڕاوێژی بە پارێزەرێکی بە تەمەنی کارامەی پسپۆڕی، لە زەبری، دەوڵەمەندی، دۆستی نزیکی خۆی، کە تاڕادەیەک خۆی بە قەرزاری ئەو دەزانی، کردبوو. ئیدی ئەم پیرە پارێزەرە گوتبووی دەشێت ئەم "حەجرە" بخرێتە سەر میرزادە و لەم کارە قەدەغە بکرێت، بە مەرجێ چەند شایەدێکی بە ئیحتوبار شایەدی لەسەر بدەن کە لە ڕووی ئەقڵییەوە تەواو نییە، شێتە. بەهەرحاڵ گرینگ ئەوەیە خەڵکانێکی پایە بەرز و دەسترۆ،پشتیوانی لەم نەخشە و تەگبیرە بکەن. لیبدیف، بەمەش هەر کۆڵی نەدا، ڕۆژێک دکتۆرێکی بۆ ماڵی میرزادە هێنابوو. ئەم دکتۆرەش پیرە پیاوێکی بەڕێز بوو، بۆ گەشتوگوزار هاتبووە پاڤلوفسک و هەڵگری میداڵی سانت حەننە بوو. ئەم دکتۆرەی بەو ناوەوە هێنابوو کە گوایە ماڵەکەی خۆی پێ نیشان بدات، ژێراو ژێریش دەگەڵی ڕێکەوتبوو، کە زەمینە خۆشبکات تا میرزادە معایەنە بکات و، بە شێوەیەکی نافەرمی و گوایە لە ڕووی دۆستایەتیەوە، لە نەخۆشییەکەی میرزادە ئاگاداری بکات.

میرزاە، هاتنی ئەو دکتۆرەی بیرکەوتەوە. ئەوەی بیر کەوتەوە کە

ڕۆژی پێشوو، لیبدیف ویستبووی بە تۆبزی قەناعەت بە میرزادە بێنێ کە نەخۆشە، واتە میرزادە نەخۆشە، دوای ئەوەی میرزادە بە هیچ جۆرێ قەبووڵی نەکردبوو کە خۆی پیشانی دکتۆرەکە بدات، سەیری کردبوو لیبدیف لەگەڵ دکتۆرێکدا خۆیان بە ژوورەکەیدا کرد. لیبدیف، وای لە میرزادە گەیاند، کە گوایە بە دوو قۆڵی لای "تیرنتیف"ـەوە، کە حاڵی زۆر خراپ بووە، دێن و، دکتۆر هاتووە کە سەبارەت بە نەخۆشییەکەی "تیرنتیف" شتێک بە میرزادە بڵێت. میرزادە، ستاییشی هەڵوێستی لیبدیفی کرد و بە گەرمی و ڕووخۆشی پێشوازی لە دکتۆرەکە کرد. یەکسەر کەوتنە باسکردنی هیپولیت. دکتۆرەکە داوای لە میرزادە کرد کە بەوردی باسی دیمەنی خۆ کوژیەکەی هیپولیتی بۆ بکات. میرزادە هێندە بە ئاوو تاو کەوتە گێڕانەوە و شرۆڤەی دیمەنەکە، کە بە ڕاستی کاری لە دکتۆرەکە کرد. ئەوسا باس و خواس هاتە سەر کەشوهەوای پترسبۆرگ، نەخۆشی میرزادە، سویسرا و شنایدەر. دکتۆرەکە بە جۆرێ دڵبەندی شێوازی مالیجەی شنایدەر و سەربورو بە سەرهاتەکانی میرزادە بووبوو کە نزیکەی دوو دانە سەعات بە دیاریەوە دانیشت، بەدەم کێشانی جگەرە نایابەکانی میرزادە و خواردنەوەی بیراندی بە تام و لەزەتی لیبدیفەوە کە ڤیرا بۆی هێنابوو، ڕادەیەک سەرخۆش بوو،کەوێڕای ئەوەی خاوەن ژن و منداڵ بوو، هێندە گۆساخانە کەوتە ستاییش و پیاهەڵدانی ڤیرا، کە کچەی تاینی زۆر توڕە کرد. ئەوسا بە شێوەیەکی زۆر دۆستانە دەعا خوازی کرد و لە میرزادە جیابووەوە.

پزیشکەکە پاش ئەوەی لەلای میرزادە وەدەر کەوت، بە لیبدیفی گوت: "ئەگەر بمانەوێ سەروەسێت بۆ خەڵکی وەکو میرزادە دابنەین، چ کەسێک بۆ سەروەسێتی باشە؟ کاتێ لیبدیف لایەنی تراجیدی ئەو ڕووداوەی بۆ شرۆڤە کرد کە لە ڕوودانا بوو، دکتۆرەکە بەدەم بزەیەکی تانەوتەشەراوییەوە سەرێکی لە قاندو گوتی: "هەر پیاوێک بۆی هەیە هەر کەسێک بخوازێت، ئازادە! ئەو ژنەی، کە بە قسەی تۆ میرزادە، بەتەمایە زەماوەندی دەگەڵ بکات، نەک هەر جوانە، بگرە یەجگار جوانە، ئەمە خۆی

لە خۆیدا، فاکتەرێکە بۆ ئەوەی پیاوێکی دەوڵەمەند ڕابکێشێت، ئەمە جگە لەوەی وەکو بیستوومە سەروەت و سامانێکی زۆری لە توتسکی و ڕوگوژینەوە دەستکەوتووە، کە بریتییە لە ملە مرواری و ئەڵماس و شاڵ و مۆبێلەمانی(کەلوپەلی) ناو ماڵ، کەواتە ئەمە خۆی لە خۆیدا بە هیچ جۆرێ ناکاتە نیشانەی گێلی و گەمشوَکی میرزادە، بەڵکو بە پێچەوانەوە نیشانەی ئاقڵی و زیرەکیە، هەمان زیرەکی و بیرکردنەوەی ڕۆڵەی کۆمەڵگەی ئەرستۆکراتی هەیە، بە ڕژەوەندی خۆی دەزانێ و حیسابی ورد بۆ بەرژەوەندییەکانی خۆی دەکات! "

ئیدی دکتۆرەکە پیی وابوو، دەبێ لەبەر ڕۆشنایی هەموو ئەوانە شایەدی بە قازانجی میرزادە بدات نەک دژی..

ئەم ئەنجامگیریەی دکتۆرەکە، ڕیسەکەی لە لیبدیف کردەوە بە خوری و تەواو نائومێدیَ کرد، لیبدیف لە کۆتایی ئیعترافەکەیدا بە میرزادەی گوت: "لە ئێستا بە دواوە جگە لە دڵسۆزی و فیداکاری هیچ شتێکی دی لە من نابینی، ئامادەم لەپێناوی تۆدا خۆم بە کوشت بدەم، بۆیە هاتووم بۆلات تا ئەم قسەیەت پێ بڵێم"..

میرزادە، لەم چەند ڕۆژەی دواییەدا زۆر خجڵ و مژولی (هیپولیت)ش بوو. هیپولیت زوو زوو لەدووی دەنارد. خانەوادەی هیپولیت. لە نزیکی ئەو و لە خانوویەکی بچووکدا دەژیان. منداڵەکانیان (واتە خوشک و برایەکەی هیپولیت) ژیانی هاوینەواریان زۆر لا خۆش بوو، چونکە بەلای کەمەوە دەیانتوانی لەبرا نەخۆشەکەیان تۆزێ دوور بکەونەوە و بچن لە پارکەکەدا بای باڵێکی خۆیان بدەن و هەوایە بگۆڕن، بەلام دایکە بێنەواکەی، "بێوەژنەکەی کاپتن". بە تەواوەتی دیل و ئەسیری ئەو بوو، میرزادە بەردەوام خەریکی ئاشتکردنەوە و سوڵحی ئەو دوانە بوو. هیپولیت، سوور بوو لە سەر ئەوەی میرزادە بە دایەنی خۆی بزانێ و هەر بە "نو نو"ی ناو دەبرد. هەرچەندە زۆریشی ڕق لێ بوو کە دەوری کۆتری ئاشتی و ناوبژیوانی لەنێوانیاندا دەبینی هیپولیت زۆر لە کۆلیا پڕ بوو، چونکە مەگەر بە دەگمەن، دەنا سەری نەدەدا، لە هەوەڵەوە بە بۆنەی نەخۆشی بابیەوە کە

لە جێگادا کەوتبوو و لە حاڵی مردندا بوو، پاشانیش لەبەر ئەوەی دایکە بێوەژنەکەی بە تەنیا بوو. سەرەنجام هیپولیت، کەوتە گاڵتە کردن، بە زەماوەندی بەو نزیکانەی میرزادە دەگەڵ ناستاسیا فیلیپوڤنا. میرزادە، زۆر تورە بوو، تۆرا و وازی لە هاتوچۆی هێنا. دوای ئەوە بە دوو ڕۆژ "بێوەژنەکەی کاپتن" بەیانیەکی زوو، بە هەڵەداوان و چاو بەگریان، هات بۆ ماڵی میرزادە و تکای لێ کرد کەسەردانیان بکات، دەنا کوڕەکەی خوێنی جگەری (دایکی) دەخواتەوە. هەر وەها گوتی هیپولیت دەیەوێ نهێنییەکی گەورەی بۆ کەشف بکات. میرزادە هاتە ڕەداو یەکسەر بەگەڵ بێوەژن کەوت. هیپولیت بەدەم گریانەوە داوای ئاشتبوونەی لە میرزادە کرد، بەڵام هەر کە فرمێسکەکانی وشک بوونەوە، بایدایەوە سەر هەمان ڕقوکینە کێشیەکەی جارانی خۆی، بەڵام نەدەوێرا وەکو جاران جلّە و بۆ خۆی شل بکات. حاڵی زۆر خراپ بوو، هەموو نیشانەکان ئەوەیان دەگوت کە مردنی نزیکە. هەڵبەتە هیچ نهێنییەکیشی لا نەبوو بۆ میرزادەی کەشف بکات، بەڵام بەوپەڕی پێداگرییەوە، بە هەڵچوونێکی زۆرەوە، کەوێدەچوو دەسکردبێ، میرزادەی لەوەزەنی ڕوگوژین ئاگادار دەکردەوە: " ئاگاداری ڕوگوژین بە، پیاوێکە دەستبەرداری شتی خۆی نابێ، لە قوماشی ئێمە نییە میرزادە، خواردنی ئێمەمانان نییە. خوا نەکا بە شتێکەوە بیگرێ، هەر دەبێ بیگاتێ، هێز نییە پێشی بگرێ." میرزادە بەو مەبەستەی بگاتە ئەنجامێکی دیارو تایبەت لە پرسیاری گرت. هیپولیت هیچ بەڵگەیەکی واقیعی پێ نەبوو، جگە لە سۆزو سەرنجی شەخسی، ئەنجام زۆر خۆشحاڵ بوو بەوەی ترسێکی زۆری خستبووە دڵی میرزادەوە. میرزادە لە سەرەتاوە خۆی لە بەرسڤی هەندی لە پرسیارەکانی هیپولیت دەدزییەوە، کە هیپولیت گوایە بە ناوی ئامۆژگارییەوە پێی دەگوت: "ئەگەر پێویستی کرد. بڕۆ بۆ هەندەران، هەڵێ. قەشەی ئەرتەدۆسکی ڕووسی لە هەموو شوێنێ هەن، دەتوانی لەوێش ژن بێنی". میرزادە تەنیا بزەیەکی بۆ دەکرد و هیچی نەدەگوت. ئەنجام هیپولیت گوتی: "ئەلهەقی من تەنیا خەمی ئاگلایا ئیڤانوڤنامە، لەو دەترسم. ڕوگوژین، دەزانی تۆ چەندت خۆشدەوێ. چاو لە تۆڵەی چاو، دان لە تۆڵەی دان و،

ئەشق لە تۆڵەی ئەشق، تۆ ناستاسیا فیلیپوڤنات لێ هەڵگەڕاندەوە، ئەویش لە تۆڵەی ئەوەدا ئاگلایا ئیڤانوڤنا دەکوژێت. هەرچەند ئاگلایا ئیدی هیچ پەیوەندییەکی بە تۆوە نییە، بەڵام بێگومان کوشتنی ئەو بۆ تۆ یەجگار ناخۆشە، وانییە؟ "

هیپولیت، گەیشتە مەبەست و ئاواتی خۆی: میرزادە بەوپەڕی نیگەرانی و پەرێشانی لە نک وی ڕۆیشت.

ئەم هۆشداری و وریاکردنەوانەی میرزادە لە ڕوگوژین، بە ماوەیەکی کەم پێش زەماوەندەکەی، ڕوویان دا. میرزادە ئەو شەوە، ناستاسیا فیلیپوڤنای، بۆ دواجار بەر لە زەماوەندەکەیان بینی. ناستاسیا نە یدەتوانی میرزادە هێور بکاتەوە، بەپێچەوانەوە لەم دواییانەدا، زیاتر نیگەرانی دەکرد. پێش ئەوە بە چەند ڕۆژێک، لە دایدارێکی دوو قوڵی خۆیاندا، هەستی بە خەمێکی زۆر بە سیمای میرزادەوە، کردبوو. هەموو توانایەکی خۆی خستبووە کار کە دڵخۆشی بداتەوە و شادی بکات، تەنانەت گۆرانیشی بۆ دەگوت. زۆر جار چینەی لە یادگەی خۆی دەکرد کە ڕێگەیەک بدۆزێتەوە و دڵخۆشی میرزادەی پێ بداتەوە. میرزادە زۆر جار وای دەنواند کە لە کانگای دڵەوە پێدەکەنێ. تەنانەت هەندێ جاریش کە ناستاسیا فیلیپوڤنا بەوپەڕی جۆشوخرۆش، بە ئاو وتاو حیکایەتی بۆ دەکرد و نوکتەی خۆشی بۆ دەگێڕایەوە، بە ڕاستی و لە دڵەوە پێدەکەنی. ناستاسیا فیلیپوڤنا کە دەیبینی میرزادە پێدەکەنێ و زۆر دڵی خۆشە، زۆری کەیف بە خۆی دەهات و لەخۆشیان لە پێستی خۆی نەدەهێوری، بەڵام ئێستا وانەبوو، سەعات بە سەعات خەمبارتر دەبوو. ڕەئی میرزادە سەبارەت بە ناستاسیا فیلیپوڤنا، ڕەئی یەکجارەکی بوو، خۆی ساغ کردبووەوە، چونکە ئەگەر وانەبوایە هەنوکە هەموو شتێکی ئەو ژنەی لەلا دەبوو بەلەگەز و مەتەڵۆکی لە هەڵهێنان نەهاتگ. بەهەرحاڵ میرزادە، قەناعەتی تەواوی بەوە هەبوو، کە دەتوانرێ بهێنرێتەوە تایمی خۆی. لە نوێ بونیات بنرێتەوە. هەڵبەتە میرزادە، کاتێ بە یەڤگێنی پاڤلوڤیچی گوت کە ناستاسیا فیلیپوڤنای لە ناخی دڵەوە خۆش دەوێ، ڕاستی دەکرد، بەڵام خۆشەویستیەکەی بەرانبەر بە

ناستاسیا، وەکو خۆشەویستی دایکێک بوو بەرانبەر بە منداڵێکی نەخۆشی، دەغەزاری، خەمین، کە نەتوانێ دەستبەرداری ببێ. میرزادە هەرگیز بۆ کەسی باس نە دەکرد کە چ هەست و سۆزێکی بەرانبەری هەیە، تەنانەت ئەگەر ناچاریش بوایە لەو بارەیەوە قسان بکات، بەوپەڕی بێزاری و نە بەدڵی باسی دەکرد. کە بەتەنیاش بەیەکەوە دەبوون هەرگیز باسی "سۆز و هەستی" خۆیان نەدەکرد، وەکو ئەوەی بەڵێنیان بە یەکدی دابێ باسی شتی وا نەکەن. هەموو کەسێک دەیتوانی بەشداری لە گفتوگۆی ئاسایی و، خۆش و زندوی وان بکات. پاشان داریا ئەلکسیڤنا گێڕابوویەوە کە هەرچەند لەو ڕۆژانەدا ئەوانی دەبینی، سەراپا لە شادی و کەیف و خۆشیا نقوم دەبوو.

ئەو ڕاوبۆچوونەی کە سەبارەت بە باری دەروونی و ئەقڵی ناستاسیا فیلیپوڤنا، لە زەینی میرزادەدا چەسپی بوو، زۆر حیرەت و سەرەگێژکێی لە کۆڵ کردبووەوە. ناستاسیا فیلیپوڤنا، ئێستا ژنێکی دی بوو، زۆر جیاوازتر لەو ژەنەی کە میرزادە سێ دانە مانگ لەوە پێش دەیناسی. هیچ بەلایەوە سەیر نەبوو، کە جاران بەگریان و نەفرین و جنێوەوە ڕەفزی دەکرد شوو بەم بکات و هەنوکە ئەو پەلەی بوو کە بە زووترین کات زەماوەندەکەیان بکەن. میرزادە لە دڵی خۆیدا دەیگوت: "ئەمە نیشانەی ئەوەیە کە وەکو جاران لەوە ناترسێت، کە شووکردنی ئەو، ببێتە مایەی نەگبەتی و بەدبەختی من." بەلای میرزادەوە، ئەم متمانە بەخۆ پەیداکردنە کوتوپڕ و لەناکاوە، ئاسایی نەبوو. ماقوولیش نییە تەنیا زادەی ڕق و نەفرەت بێ لە ئاگلایا، هی ئەوەش نەبوو، لەوە بترسێت کە نەتوانێ دەگەڵ ڕوگوژیندا هەڵبکات. هەڵبەتە ڕەنگە ئەم فاکتەرانە و فاکتەری دیکەش دەوریان هەبووبێ، بەڵام ئەوەی لای میرزادە لە هەموو هۆو فاکتەرێکی دیکەی ئەم هەڵگەڕانەوە و گۆڕانە لەناکاوەی ناستاسیا فیلیپوڤنا ڕوونتر بوو، ئەو هۆیە بوو کە دەمێ بوو پێشبینی کردبوو، ڕوح و دەروونی شەکەت و داماو و نەخۆشی ئەو، لەوەی پتر تەحەمولی مەینەتی نەدەکرد. هەرچەندە ئەم ڕاڤە و شرۆڤەیە، تاڕادەیەک هەندێک حیرەت و پەشێوی و پەرێشانی لە کۆڵ میرزادە دەکردەوە، بەڵام بەدرێژایی ئەو کاتانە نە هیچ ئاسوودەییەکی





خەیاڵی و نە هیچ سووکنایییەکی دەروونی پێ نەبەخشی. هەندێ جار هەوڵی دەدا بیر لە هیچ شتێک نەکاتەوە. سەبارەت بە ژن هێنان و زەماوەندەکەشی، تەنیا وەکو کارێکی ڕواڵەتی ڕۆتینی وەری گرتبوو. چارەنووسی میرزادە بە بۆچوونی خۆی، هەر ئەو بیرکردنەوەیەی هەڵدەگرت نەک زیاتر. سەبارەت بەو جۆرە گلەیی و ناڕەزایی و ئیرادانەی کە یەڤگێنی پاڤلوفیچ و خەڵکانی وەکو ئەو هەیان بوو، میرزادە، دەسەوەستان بوو، هیچ وەڵامێکی پێ نەبوو، بۆیە خۆی لە هەر گەنگەشەیەکی لەو جۆرانە، دەدزییەوە.

ئەوەشی بۆ دەرکەوتبوو کە ناستاسیا فیلیپوڤنا، زۆر چاک دەیزانی، ئاگلایا چ پایەیەکی لە دڵی ئەودا (میرزادە)هەیە. ناستاسیا فیلیپوڤنا، باسی ئەمەی نەدەکرد، بەڵام لە ڕۆژانی سەرەتادا. هەر کاتێ میرزادە لێدەبڕا بچێ بۆ ماڵی یەپانچین، ناستاسیا بە ئاشکرا "ڕووی" گرژ دەبوو، میرزادە ئەمەی لە سیمایدا دەخوێندەوە. بۆیە کاتێ خانەوادەی یەپانچین، پاڤلوڤسکیان جێ هێشت و لەوێندەر ڕۆیشتن، ئیدی ئۆخژن کەوتە دڵ و دەروونی ناستاسیا و ڕووی گەشایەوە و کەیفی کۆک بوو. میرزادەوێڕای هەموو خەمساردی و بێ موبالاتی و سەرنج کوێریەکی خۆی. لە دڵی خۆیدا گومانی ئەوەی دەکرد کە نەبادا ناستاسیا فیلیپوڤنا، ژێراو ژێر کارێکی دزێوی وەها بکات کە ئاگلایا ناچار بێت پاڤلوفسک بەجێ بێڵێ. ئەم گومان و بەدگومانییە زۆری ئەزیەت دەدا. بێگومان ئەو باس و خواس و دەنگۆیانەی کە لە ڤێلاکاندا دەربارەی زەماوەندی وان بڵاوبووبووەوە و کەوتبووە سەر زاران، دوو بەشی لەلایەن ناستاسیا فیلیپوڤناوە بڵاو کرابووەوە تا دیق بە خەنیم و ڕەقیبەکەی (ئاگلایا) بکات. جا چونکە دیتنی ماڵی یەپانچین زۆر زەحمەت و دژوار بوو، ناستاسیا فیلیپوڤنا، ڕۆژێک میرزادەی نایە ناو گالیسکەکەی خۆی، دەستوری بە گالیسکە چییەکە دا کە ڕێک بە بەر پەنجەرەکانی ماڵی یەپانچیندا تێپەڕێت. ئەمە غافڵگیریەکی ترسناک بوو بۆ میرزادە، کاتێ بەمەی زانی، تازە کار لە کار ترازابوو، گالیسکەکە گەیشتبووە بەر ماڵی ئەوان و خەریک بوو تێدەپەڕی. هیچی نەگوت، بەڵام

تا دوو ڕۆژ ئاگای لە خۆی نەبوو، نەخۆش کەوت. ناستاسیا فیلیپوڤنا، جارێکی دی ئەم کارەی دووبارە نەکردەوە.

ناستاسیا لەو چەند ڕۆژە کەمەی بەر لە مەوعیدی زەماوەندەکە، زۆر خەمین و مات بوو، دەبیرێکی قووڵەوە دەچوو. ڕاستە هەمیشە بەسەر خۆیا زاڵ دەبوو، خەم و پەژارەکەی لە خۆی دەڕواندەوە، هەوڵی دەدا شادو بەکەیف بنوێنێ، بەڵام هەر فایدەی نەبوو، نەدەگەڕایەوە سەر کەیف و سەفاکەی جارانی. میرزادە لە جاران زیاتر مدارای دەکرد و بە دەوریا دەهات و بایەخی دەدایە. میرزادە سەری لەوە سوورِما بوو کە ئەم ژنە بە هیچ جۆرێ باسی ڕوگوژینی لەگەڵدا نەدەکرد، بەڵام جارێک پێنج ڕۆژ بەر لەمەوعیدی زەماوەندەکە، داریا ئەلکسیڤنا، ناردی بەشوێنیا کە بەپەلە فریای ناستاسیا فیلیپوڤنا بکەوێت، چونکە حاڵی زۆر خراپە. کە میرزادە گەیشتە ئەوێندەر، سەیری کرد، لە حاڵێکایە، زیاتر لە شێتی دەچێت تا لە نەخۆشی: هاواری دەکرد، دەلەرزی، دەگریا و هاواری دەکرد کە ڕوگوژین لە باخەکەی تەنیشت ڤێلاکە خۆی حەشارداوە. تۆزێ لەمەپێش بە چاوی خۆی بینی، ئەمشەو دێتە سەری و دەیکوژێت... بەچەقۆ دایدەدورێ و دەیکوژێت! بە درێژایی ئەو ڕۆژە ئۆقرەی نەگرت. هەر ئەو شەوە، کاتێ میرزادە چوو بە سەر پێوە هەواڵێکی هیپولیت بپرسێت، " بێوەژنەکەی کاپتن" کە بۆ هەندێ کاروباران چووبووە پتر سبۆرگ و تازە گەڕابووەوە، پێی ڕاگەیاند کە لە پترسبۆرگ ڕوگوژینی دیتووە و پرسیاری بارودۆخی پاڤلوفسکی کردووە. کاتێ میرزادە لە "بێوەژنەکەی کاپتن"ی پرسی بوو چ سەعاتێک ڕوگوژینی دیتووە. سەعاتێکی پێ گوتبوو، ڕێک، ڕێکەوتی ئەو سەعاتە بوو، کە ناستاسیا فیلیپوڤنا، تەسەوری دەکرد ڕوگوژینی لە ناو باخی ڤێلاکەی خۆیدا دیتبوو. کەواتە گومان لەوەدا نەبوو ئەوەی ناستاسیا بە خەیاڵی خۆی دیتبووی، تەنیا واهیمە بووە، تارمایی بووە و هیچی تر! .. ناستاسیا فیلیپوڤنا بە خۆی چوو بۆلای "بێوەژنەکەی کاپتن" و دوای پرسوجۆیەکی ورد، کۆمەڵێک وەڵامی دڵخۆشکەری وەچنگ کەوت و بەوپەڕی ئاسوودەیی و دڵنیایی گەڕایەوە.

ڕۆژێ بەر لە زەماوەندەکە، میرزادە، ناستاسیا فیلیپوڤنای لەوپەڕی شادی و خۆشحاڵیدا بینی: خەیاتەکەی لە پترسبۆرگەوە جلکی بوکێنی و هەموو تەدارەکێکی دیکەی زەماوەندی، وەکو سەرپۆش و تاراو ئەو شتانەی بۆ فەراهەم کردبوو. میرزادە هەرگیز تەسەوری نەدەکرد، ئەوەندە بەو جلانە دڵی خۆش بێ، بەڵام میرزادە، ستایشێکی زۆری جلەکانی کرد و بەمەش هێندەی دی دڵی خۆشکرد، بەڵام ناستاسیا فیلیپوڤنا، شتێکی لەدڵدا بوو، هەرچی کرد و کۆشا نە یتوانی دەری نەبڕێ: بیستبوویەوە گوایە خەڵکی پاڤلوفسک زۆر ناڕازی و تورەن و دەیزانی کە جەماعەتێکی سەرسەری و بەرڵڵا لێبڕاون بیکەن بە فیک و هۆر، هەراو فەرتەنە و ئاژاوە و بەزم و مۆسیقا و تەنانەت شیعرێکیشیان بەو بۆنەیەوە دانابوو. گوایە خەڵکەکەش، یانی خەڵکی پاڤلوفسک، پشتیوانیان لێدەکەن. هەر لە ڕقی ئەمە لێبڕا بوو کە لە جاران زیاتر پۆز لێبدات و خەڵکەکە بە شکۆ و جەلالی خۆی و سەلیقەی جوان و جلوبەرگی فاخیرەوە تووشی شۆک بکات: "دەیسا، ئەگەر ئازان و دەوێرن با بیکەن بە هاوار و فیکە لێدان!" هەر کە ئەو بیرەی بە مێشکا هات، چاوانی کەوتنە پرشنگ دان. خۆزیایەکی دیکەشی لەدڵا بوو، بەڵام بە دەنگی بەرز و ئاشکرا دەری نەبڕی: پڕ بەدڵ حەزی دەکرد کە ئاگلایا یان بەلای کەمەوە نوێنەرێکی ئەو، لە ئاهەنگەکەدا یان لە کڵێسادا ئامادەبوایە و بە دزییەوە سەیری ئەوی کردبا. لە ناخی خۆیدا خۆی بۆ ئەگەرێکی لەو بابەتە ئامادە دەکرد. کە میرزادە، بەدەم ئەو خەیاڵانەوە جێی هێشت، سەعات یازدەی شەو بوو. هێشتا سەعات بە تەواوی نەبووبوو بە دوازدە، کە لای داریا ئەلکسیڤناوە هەواڵی پێگەیی کە بەپەلە فریا بکەوێ "چونکە دیسان وەزعی تێکچووە"، کە میرزادە ڕۆیی سەیری کرد دەزگیرانەکەی دەرگای توند لەسەر خۆی داخستووە و شێت ئاسا دەگری و بەدەم هەنسک هەڵدانەوە فرمێسک هەڵدەڕێژێت. ماوەیەکی زۆر لەپشت دەرگاکەوە قسەیان دەگەڵ کرد. ئەوجا دەرگاکەی لێکردنەوە، تەنیا ڕێگەی میرزادەی دا کە بچێتە ژوورەوە. پاشان بەپەلە دەرگاکەی داخستەوە و لەبەردەم میرزادەدا کەوتە سەرچۆک. (ئەمە هەندێک بوو لەو دیمەنەی کە داریا ئەلکسیڤنا، توانیبووی بیدینێ و پاشان گێڕابوویەوە.(





ناستاسیا فیلیپوڤنا، بە ترسەوە باوەشی بە ئەژنۆی میرزادەدا دەکردو هاواری دەکرد:

- چی دەکەم؟ ئەمە چییە بە تۆی دەکەم؟

میرزادە، سەعاتێکی تەواو بەدیاریەوە بوو. ئێمە نازانین ئەو دووە لەو ماوەیەدا چیان گوت و چیان نەگوت، بەڵام داریا ئەلکسیڤنا گێڕایەوە کە دوای ئەو سەعاتە بە خۆشی و ئارامی لێکدی جیابووبوونەوە. میرزادە هەر ئەو شەوە و جارێکی دیکە پەیکێکی نارد بوو بۆ هەواڵی دەزگیرانەکەی و ناستاسیا فیلیپوڤنا نوستبوو. بۆ بەیانی بەر لەوەی لەخەو ڕابێ، دوو پەیکی دیکە لەلایەن میرزادەوە بۆ ماڵی داریا ئەلکسیڤنا، نێردرا بوون. پەیکی سێیەمیشی بە دوودا نارد بوو، پەیکی سێیەم خەبەر بۆ میرزادە دێنێتەوە کە: "یەک لەشکر لە خەیات و ئارایشگەر لە پتر سبۆرگەوە هاتوون و دەوری ناستاسیا فیلیپوڤنایان داوە و بە خۆیشی وەزعی باشە و بە جۆرێ سەرقاڵی جلوبەرگ و خۆ جوانکردن و ڕازاندنەوەیە، کە لە هەر ژنیکی شۆخ و شەنگی وەکو ئەو بێت. ئیدی کۆبوونەوەیەکی گەورەی سازداوە و خەریکی تەگبیری ئەوەیە کە چ جۆرە جەواهێر و ئەڵماسێک بە خۆیدا بکات".

میرزادە بە تەواوەتی ئاسودە بوو.

ئەوەی لێرە بەدواوە لەمەڕ ئەم زەماوەندە دێتە گێڕانەوە لەلایەن کەسانێکەوە هاتووەتە گێڕانەوە، کە بە خۆیان دیمەنەکانیان دیتووە و لەوە دەچێ ئەوەی گێراویانەتەوە دروست بێ: قەرار بوو سەعات هەشت ڕێوڕەسم و ئاهەنگەکە دەست پێ بکات، ناستاسیا فیلیپوڤنا، لە سەعات حەوتا ئامادەبوو. لە سەعات شەشەوە خەڵکی بەرەبەرە لە دەوروبەری ماڵی لیبدیف و داریا ئەلکسیڤنادا کۆبوونەوە. لە سەعات حەوتا کڵێساش پڕ بوو لە خەڵکی. ڤیرا لیبدیفاو کولیا خەمی دنیایان لێهاتبوو، نیگەرانی میرزادە بوون. زۆر سەرقاڵ بوون، ڕاسپێردرابوون ڤیلاکەی میرزادە ڕێک بخەن بۆ پێشوازی میوان و نان و خوان، هەرچەندە قەرار نەبوو کە دوای ڕێوڕەسم و ئاهەنگی ئایینی لە کڵێسا، ئاهەنگێکی گەورە ساز بکرێ و میوانی زۆر بمێننەوە. لیبدیف، جگە لەوانەی کە دەعوەتکردنیان بۆ ئاهەنگەکە پێویست




بوو، پتیتسن و ژنەکەی، گانیا و ئەو دکتۆرەی کە هەڵگری میداڵی سانت حەننەبوو، داریا ئەلکسیڤنای دەعوەت کردبوو. میرزادە کە سەری لە دەعوەتکردنی دکتۆری گۆرین دەرنەدەکرد و هۆی ئەمەی لە لیبدیف پرسی، لیبدیف بە کەشوفش و خۆپەسندیەوە گوتی: "کەسێکی خاوەن میداڵە، کەسێتییەکی بە ڕێزە، گوڵی ئاهەنگەکەیە، ئەدی چۆن! " میرزادە بەو وەڵامە هاتە پێکەنین.

کیللەر و بوردوفسکی هەردوکیان پاڵتۆیان لەبەر کردبوو. زۆریان لێ جوان بوو. کیللەر، زۆر بە ڕقەوە دەیڕوانییە ئەو گەجەرو گوجەرانەی لە دەوروبەری ماڵەکە کۆبوونەوە، نیگای نەفرەت و شەڕی لێدەباری، ئەمە جۆرە ترس و نیگەرانییەکی خستبووە دڵی میرزادە و ئەوانەی دەوروبەری. ئەنجام میرزادە، لە سەعات حەوت و نیودا بە سواری گالیسکەیەک چوو بۆ کڵێسا. هەڵبەتە پێویستە لێرەدا ئەوەش بڵێین کە میرزادە سوور بوو لەسەر ئەوەی کە هیچ دابونەریتێکی باو فەرامۆش نەکرێت. پێویستە هەموو شتێک بە بەرچاوی خەڵکییەوە و بە ئاشکرا "وەکو چۆن باوە" ئاوا ئەنجام بدرێت. میرزادە، بە زەحمەتێکی زۆر دڕی بە ئاپۆڕاکە دا و بە نێو چەپە چەپ و ورتەورت و غەڵبە غەڵبی خەڵکەکەدا بەرە و ناو کڵێساکە ڕۆیشت. کیللەر لەپێشەوە دەڕۆیشت، بەتوڕەیی و هەڕەشەوە چاوی بە ڕاست و بە چەپدا دەگێڕا و کە کیللەر ڕۆیی تا بووکێ ببێنێ، میرزادە بە شێوەیەکی کاتی خۆی دایە پشت هەیکەلەکەو(میحراب،پەرستگە) دیارنەما. کە کیللەر گەیشتە بەر ماڵی داریا ئەلکسیڤنا، ئاپۆڕایەکی یەجگار زۆری بینی، دوو هێندەی ئەو ئاپۆڕایەی بەر ماڵی میرزادە دەبوو، سێ ئەوەندەش لەوانەی بەر ماڵی میرزادە، سەرکێشتر و گوساختر بوون. هەر کە پێی نایە سەر پلیکانەکان، کەوتنە تەشەران و هوراکێشان، لەزگ بوو دەهەری بێ و لە ئاپۆڕاکە بگەڕێتەوە و ئەوەیان پێ بکات کە بەکەس نەکرابێ، بەڵام باش بوو، بوردوفسکی و داریا ئەلکسیڤنا کە بە پیریەوە هاتبوونە سەر قاڵدرمەکان، فریاکەوتن و مەسەلەکە بەخێر گەڕا. بە دوو قۆڵی دەستیان گرت و بردیانە ژوورەوە. کیللەر تورە بوو، پەلەی ڕۆیشتنی بوو. ناستاسیا فیلیپوڤنا ڕابوو، چووە بەر ئاوێنە، دوا تەمەشای خۆی کرد. وەکو کیللەر پاشان

گێڕابوویەوە. بەدەم پێکەنینێکەوە بە خۆی گوتبوو "ڕەنگی مردووی لێنیشتووە". ئەوجا، ملکەچ و خاکسار کڕنۆشی بۆ ئیکۆنەی سووچی ژوورەکە برد، ئەوسا هاتە بەر دەرگای ماڵەکە. هەر کە بە دیار کەوت. غەڵبە غەڵب و هەراو هەنگامە دەستی پێ کرد. ئەلهەقی غەڵبە غەڵبەکە لە هەوەڵەوە زیاتر پێکەنین و تەشەر و چەپڵە و فیکەکێشان بوو، بەلام دوای تۆزێک دەنگی دی بەرز بوونەوە:

-جوان نییە!

- نە یەکەم کەسە و نە دوا کەس دەبێ!

- شووکردن، هەموو شتێک پەردەپۆش دەکات گەوجینە!

هەندێکی دی کە لێوەی نزیکتر بوون، هاواریان کرد:

- جوانی وا لە دنیادا نییە. ئەشەدو جوانە!

فەرمانبەرێکی فەرمانگایان هاواری کرد:

- دۆتمیرە بە شەرت! من ئامادەم گیانی خۆم لەپێناوی دۆتمیرێکی وادا بدەم. ژیانی خۆم بۆ تاقە شەوێکی دەفرۆشم! *

ناستاسیا فیلیپوڤنا کە هاتە دەرەوە، ڕەنگی سپی هەڵگەڕا بوو، بەلام چاوانی درشتی، دوو کەڵە پشکۆ بوون و، بە فزولیاندا دەچزان. ئاپۆڕاکە، بەرگەی ئەم چاوانەی نەگرت، تورەیەکەیان گۆڕا، بوو بە هورای پێدا هەڵدان. دەرگای گالیسکەکە کرابووەوە، کیللەر دەستی درێژ کرد کە یارمەتی بووکێ بدات تا سواری گالیسکەکە ببێت، بەلام بووکێ لەپڕ هاوارێکی کرد، یەکڕاست بەرە و ئاپۆڕاکە چوو. ئەوانەی کە دەگەڵ بووکێ دابوون، بەجارێ حەپەسان. خەڵکەکە لە بەردەمیا لاکەوتن. لەپڕ ڕوگوژین، لە پێنج شەش مەتری بەر دەرگاکەدا، پەیدا بوو. بووکێ لەنێو ئەو حەشاماتە زۆرەدا چاوانی ئەوی بەدی کردبوو. وەکو شێت بەرە و ئەو غاری دا، هەر دوو دەستی توند گرت و گوتی:

-ڕزگارم بکە! بمبە! بۆ کوێم دەبەی بمبە! خێرا بمبە! ..

ڕوگوژین، لەباڵی نەوی و هەر بەڕفاندن ڕفاندی و، یەکسەر گەیاندیە گالیسکەکەی. ڕوگوژین، لەچاو تروکانێکا، ئەسکەناسێکی سەد ڕۆبڵی لە جزدانەکەی دەرهێناو دایە گالیسکە چییەکە و گوتی:

- بۆ وێستگەی قیتار! ئەگەر بەر لە دەرچوونی قیتارەکە بمانگەیەنیتە ئەوێندەر سەد ڕۆبڵی دیکەشت دەدەمێ! بەلەز خۆی هەڵدایە ناو گالیسکەکە و لەتەنیشت ناستاسیا فیلیپوڤناوە دانیشت و، دەرگای گالیسکەکەی داخست. کابرای عارەبانچی، یەکسەر قامچییەکی سرەواندە ئەسپەکان و بەپەلە بۆی دەرچوو.

کیللەر، پاشان کە ڕووداوەکەی گێرابووەوە، داوای بوردنی کردبوو کە گوایە حەپەساوە و تووشی شۆک بووە، دەنا نەی دەهێشت شتی وا ڕوو بدات. گوتبووی: "ئەگەر یەک ساتی تری بەدەمەوە بوایە، وەخۆ دەهاتمەوە و نەم دەهێشت ئەم شتە ڕوو بدات! " خۆی و بوردوفسکی خەریک بوو، گالیسکەیەک، کە بە ڕێکەوت لەوێندەر وەستابوو، بگرن و بەپەلە دوایان بکەون، بەڵام هەر زوو ژێوان بوونەوە، بەو هەنجەتەی "تازە نایانگەنێ و، ناشکرێ بە تۆبزی بووکێ بگێڕنەوە".

بوردوفسکی کە زۆری لەبەر گران بوو، گوتی:

- ئەمە جگە لەوەی کە میرزادە تازە نایەوێتەوە!

ڕوگوژین و ناستاسیا فیلیپوڤنا، لە کاتی خۆیدا گەیشتنەوێستگەی قیتار. دوای ئەوەی لە گالیسکەکە دابەزین، لەو کاتەدا کە خەریک بوو سواری قیتارەکە ببن. ڕوگوژین بەپەلە، کیژێکی کە بەوێدا ڕەت دەبوو، ڕاگرت. کیژێ سەرپۆشێکی لەسەرو باڵاپۆشێکی ڕەشباوی کۆنی، بەڵام هێشتاش باش و بەکەڵکی لەبەرکردن دەهات، لەبەرا بوو، پەنجا ڕۆبڵی بۆ دەرهێناو گوتی:

- ئەم باڵا پۆشەت نافرۆشی، پەنجا ڕۆبڵت دەدەمێ؟

بەرلەوەی کیژێ وەخۆ بێتەوە و بزانێ مەسەلە چییە، ڕوگوژین پەنجا ڕۆبڵەکەی پەستایە دەستیەوە و سەرپۆش و باڵا پۆشەکەی لەبەر داکەندو دای بەسەر سەرو شانی ناستاسیا فیلیپوڤنادا"، چونکە جلوبەرگە ئاڵاو واڵاو فاخیرەکەی ناستاسیا زۆر بەرچاوی و سەرنجڕاکیش بوو، لەگین بوو، لەوێستگەکە و لە ناو قیتارەکەدا هەندێ سەریەشەیان بۆ دروست بکات. هەنگێ کیژێ تێگەیشت کە بۆچی ئەم پیاوە، ئەم جلە کۆنانەی بەو پارە زۆرە لەو کڕیوە.

هەواڵـی ئـەم ڕووداوە، وەکـو بروسـکە گەیشـتە کڵێسـا. لەو کاتـەدا کـە کیللـەر دڕی بـە حەشـاماتەکە دەدا تـا خـۆی بگەیەنێتـە میـرزادە. ژمارەیـەکی زۆری خەڵکی، کە هیچیانی نەدەناسـی، ڕایانگرت تـا پرسـیاری ڕووداوەکەی لێبکەن. بە دەنگی بەرز قسانیان دەکرد، سەریان دەلەقاندو پێدەکەنین. کەس نەیدەویسـت لـە کڵێسـاکە بێتـەدەرێ. هـەموو دەیانویسـت بـزانن، ئـاخۆ زاوا چۆن ئەم هەواڵەوەر دەگرێت و چ هەڵوێستێکی دەبێت.

میرزادە، خەبەرەکـەی لەبـەر گران بـوو، بـەڵام خـۆی شـپرزە نـەکرد، بـە دەنگێکی نرم کە بەئاسـتەم دەبیسترا گوتی: "مـن لـەم مەسـەلەیە دەترسـام، بـەڵام وێناشـم نـەدەکرد کـە ڕوو بـدات..." دوای کـەمێک بێـدەنگی لەسـەری ڕۆیشت: "بەهەرحاڵ... ئەمە پڕ بە پێستی ئـەم حاڵـەی ئێسـتای بـوو.. بۆ ئـەم حاڵـەی ئێسـتای زۆر ئاسـاییە و هـیچ جێـی سەرسـووڕمان نییـە.." پاشـان کیللـەر ئەو هەڵوێسـت و ئەنجامگیرییـەی میـرزادەی بـە "فەلسـەفەیەکی دەگمەن" وەسف کرد.

دەڵـێن میـرزادە، بـەکاوەخۆ، بێ ئەوەی خـۆی شـێلو بکـات لـە کڵێسـاکە وەدەر کەوتبوو. ئەمـە قسـە و ڕەئـی گەلێک لەو کەسـانە بـوو کـە لەو کاتـەدا دیتبوویان. پاشـان دەیـانگێڕایەوە کە لەوە دەچـوو میرزادە حـەزبکات بەپەلـە بچێتەوە بۆ ماڵ و بەتەنیا دەگەڵ خۆیدا بژی. بەڵام ئەو دەرفەتـەی بۆ نـەلوا. گـەلێک لەو میوانانـەی کـە دەعـوەت کرابـوون، لەوانـە پتیتسـن و گـاڤریلا ئـاردالیونوفیچ و کـابرای دکتـۆر کـە ئەویـش وەکـو ئەوانـی دی بـە نیـازی ڕۆیشتن نەبوو، دوای میرزادە کەوتن. ئەمە جگە لەوەی کە دنیایـەک خـەڵکی سەر سەری و گەجـەرو گوجـەر دەوری ماڵەکـەیان دابوو و لـە ئان و سـاتا بوو پەلاماری بدەن. میرزادە گوێی لـە کیللەو و لیبدیف بوو زۆر بە تونـدی و تـوڕەیی قسـانیان دەگـەڵ چەنـد کەسـێکی بێگـانە و نەناسـدا دەکـرد، کـە دەیانویسـت بـە تـۆبزی سـەربکەون و بێنـە بـەر هەیوانەکـە، بـە ڕواڵـەت لـە کارمەندو فەرمانبەری دەوڵەتی دەچوون. میرزادە چوو بەلایانەوە تـا بزانـێ مەسەلە چییە، زۆر بـە ئـەدەب و نەزاکـەتەوە لیبدیف و کیللـەری لادانـە لاوە. ئەوجا بە زمانێکی پڕ لە ڕێزو حورمـەت ڕوی کـردە یـەکێک لەو بێگانانـە، کـە لەپێش کۆمەڵێکەوە هـاتبووە سـەر قاڵدرمـەکانی بـەردەرگا. پیاوێکی تۆکمـەی

سەرو قژ بۆز بوو، تکای لێ کرد تەشریف بێنێتە سەرەوە و گەورەی بکات. کابرا هەڵوەستەیەکی کرد، وەک بڵێی خەجاڵەت بوو، بەڵام دەعوەتەکەی قەبووڵ کرد، لەگەڵ دوانی دیکەدا هاتنە بالکۆنەکە. تێکڕا حەوت هەشت کەسێک لە ئاپۆڕاکە دابڕان و بێ هیچ لە ڕوودامانێک هاتنە سەرەوە. کەسی دیکە چاوی لێنەکردن و بە دوویاندا نەهاتن. ئەوانەی لە دەرەوە بوون، بە ئاشکرا سەرزەنشتی ئەوانەیان دەکرد کە هاتبوونە ژوورەوە.

کورسی بۆ ئەوانەی کە هاتبوونە ژوورەوە دانرا، خولکی دانیشتن کران، خێر هاتن کران، گفتوگۆ دەستی پێکرد، چایان درایە. هەر هەموو ئەمەیان بەوپەڕی نەزاکەت و ڕووخۆشیەوە دەگەڵدا کرا. ئەم میوانانی ناوەختە سەریان لەم هەموو عیزەت و حورمەتە سووڕما. هەڵبەتە چەند جارێک هەوڵدرا. تا دەکرێ گفتوگۆ و قسەکان بە هێمنی بەڕێوە بچن و ئاراستەیەکی "لەبار" وەربگرن. زۆر پرسیاری ناخۆش و زەق کرا، زۆر سەرنجی حەرامزادانە هاتنە دەربڕین، بەڵام میرزادە، بەوپەڕی ڕووخۆشی و سادەیی وەڵامی هەر هەموو خەڵکەکەی دەدایەوە. دیارەوەڵامەکانی لە هەمان کاتدا هێندە ماقووڵ و قەناعەتبەخشبوون کە خەڵکەکە خۆ بە خۆ دەستبەرداری پرسیارە نەشازو نابەجێیەکانی خۆیان بوون. بەرەبەرە گفتوگۆکان هاتنە سەر باس و خواسی جدی. لەپڕ یەکێک لەو جەماعەتە، یەکێکی زۆر بلێ، بەو بۆنەیەوە کە باسێک هاتبووە ئاراوە، وەکو فیشەکە شێتە چوو بە ئاسمانا، کەوتە سوێندخواردن کە هەرگیز موڵکەکەی (زەوی) نافرۆشێت، دنیاش خرابێ نایفرۆشێت. چاوەڕوان دەکات، خۆی دەگرێت، چونکە "موڵک لە پارە باشترە، ئەوە ڕێبازو باوەڕی ئابووری منە، ئەگەر نایزانی جەناب." جا چونکە ڕووی دەمی لە میرزادە بوو، میرزادە زۆر بە گەرمی پشتیوانی لەو قسە و بۆچوونانەی کرد، بێ ئەوەی گوی بە لیبدیف بدات کە بە گوێیدا دەچپاند کە ئەم بەڕێزە چاوە خانوویەکی خۆی نییە، چ جای موڵک و زەوی. بە عەمراتی ڕۆژێ لە ڕۆژان موڵک و زەوی نەبووە.

نزیکەی یەک سەعات بەم شێوەیە تێپەڕی، میوانەکان لە چا خواردنەوە بوونەوە و هەستیان دەکرد کاتی ڕۆیشتن هاتووە. دکتۆرەکە و کابرای

سەروقژ بۆز، خواحافیزیەکی گەرمیان لە میرزادە کرد. ئەوانی دیکەش بەگەرمی خاترخوازیان لە میرزادە کرد و بەدەم ڕۆیشتنەوە، بەم جۆرە گوتانە دڵخۆشیان دەدایەوە: "گوێ مەدەیە، خێری پێوەبێ، کەس نازانێ خێر لەچیدایە".. هتد. هەندێ لە میوانە گەنجەکان داوای شامپانیایان کرد، بەڵام ئەوانەی لەوان گەورەتر بوون، خێرا پەشیمانیان کردنەوە و ئەوەیان بەکارێکی نابەجێ زانی.

کاتێ هەموو میوانەکان ڕۆیشتن، کیللەر دەمی لەپەنا گوێی لیبدیف ناو گوتی:

– ئەگەر ئێمە بواین، یانی من تۆ، دەمانکرد بە هەراو هەنگامە و جنێودان، دەمانکرد بە شەڕ و فەرتەنە، ئابڕووی خۆمان دەبرد و پۆلیسمان دێنایە سەر خۆمان. کەچی ئەو بە پێچەوانەوە کۆمەڵێک دۆستی تازەی بۆ خۆی پەیدا کرد، جا دۆست نە گاڵتە! من دەیانناسم! "

لیبدیف، کە تازە خەیاڵ بووبوو، ئاهێکی هەڵکێشاو گوتی:

"–تۆ ئەوەی لە زانایان و دانایانت وەشاردووە، لە منداڵانت عەیان کردووە، بەڵێ ئەی باب، چونکە ئیرادەی تۆ وابووە." (بڕوانە ئینجیلی لۆقا، بابی دەیەم). من زۆر دەمێکە هەستم کردووە کە ئەو قەولە ڕێک پڕ بە پێستی ئەوە، جا ئێستا دووپاتی دەکەمەوە کە خواو هەموو ئەولیای پیرۆز ئەم جارە ئەم منداڵەیان پاراست و لەم قۆرتە بێ بنەیان ڕزگار کرد.

دەوروبەری سەعات دە و نیو بوو، دەوری میرزادەیان چۆڵ کرد. سەری دەیەشا. کۆلیا لە دوای هەمووان ڕۆیشت. دوای ئەوەی یارمەتی میرزادەی دا کە جلەکانی داکەنێ، جلی زاوایەتی. بە گەرمی خاترخوازیان لێکدی کرد. تۆ بەخێرو من بە سەلامەت، لێکدی جیابوونەوە. کولیا هیچ باسێکی ڕووداوەکانی ئەو ڕۆژەی نەکردبوو، بەڵام بەڵێنی دابووە میرزادە کە سارەزی سەری بدات. پاشان کولیا گێڕایەوە کە میرزادە هیچ ئاماژەیەکی نەکردبوو کە ئەمە دوا دیداریان دەبیت. ئیدی لە ماوەیەکی کەمدا ئەو ماڵە تەواوچۆڵ بوو، کەسی لێنەما، بوردوفسکی چوو بۆ لای هیپولیت، کیللەر و لیبدیف کەس نەیدەزانی کێوە چووبوون. کەس لە ماڵەوە نەمابوو تەنیا ڤێرا لیبدیفا نەبێت، پاش پاک کردنەوە و ڕێکخستنەوەی

ماڵەکەو، لە کاتی ڕۆیشتندا چووبوو بزانێ میرزادە چ دەکات، سەیری کردبوو، هەر دوو ئانیشکی لە سەر مێزەکەی داداوە و سەری لەنێو هەر دوو دەستی ناوە. ڤیرا بە ئەسپایی لێی چووبووە پێشێ، دەستی خستبووە سەر شانی. میرزادە چاوانی هەڵدەبڕێ، سەرسام و حایر چاوی تێدەبڕێ، دوای نزیکەی دە دەقیقەیەک ئەوجا وەخۆ هاتبووەوە و هەموو شتێکی وەبیر هاتبووەوە، هەنگێ پەشێو پەرێشان تکای لە ڤیرا کردبوو کە بەیانی سەعات حەوت بێ لە دەرگای ژوورەکەی بدات و خەبەری بکاتەوە، بەڵکو فریای یەکەمین قیتاری پترسبۆرگ بکەوێ. ڤیرا قەولی دەداتێ کە خەبەری بکاتەوە. پاشان میرزادە سوێندی دەدات کە ئەم شتە بە کەس نەڵێت. بەڵێنی ئەوەشی دەداتێ. ئەنجام کاتێ ڤیرا دەرگای کردەوە تا بڕوات، میرزادە بۆ جاری سێیەم ڕایگرت، دەستەکانی خستنە نێو دەستی خۆی، هەوەڵ جار دەستی و پاشان نێوچەوانی ماچ کرد، بە دەنگێکی غەریب پێی گوت: "تا سبەی! " ئەمە ئەوە بوو کە ڤیرا بە خۆی گێڕابوویەوە. کیژێ بە خەمینی لەلای ئەو وەدەردەکەوێ، زۆری خەفەت بۆ دەخوات، بەڵام بەیانی هێور دەبێتەوە، لەسەر وەعدەکەی خۆیان سەعات حەوت لە دەرگاکەی دەدات و دەڵێت کە قیتاری پترسبۆرگ نزیکەی چارەکێکی دی دەردەچێ، کاتێ میرزادە دەرگاکەی کردەوە، ڤیرا هەستی کرد حاڵی میرزادە باشە و تەنانەت پێدەکەنێ. شەوێ جلەکانی دانە کەندبوو، بەڵام هەر بە جلەکانیەوە بڕێک خەوتبوو.

گوتی ڕەنگە بۆ ئێوارێ بگەڕێتەوە. بەگوێرەی هەموو قەرینە و نیشانەکان وا دیارە ڤیرا تاوە کەسیک بووە کە میرزادە بە پێویستی زانیبێ، لە سەفەرەکەی خۆی بۆ پترسبۆرگ، ئاگاداری بکات.

پەراوێز:

* ".. - ژیانی خۆم بۆ تاقە شەوێکی دەفرۆشم": دێڕە شیعرێکی پوشکینە (شەوانی میسر).

## فەسڵی یازدەیەم

میـرزادە، دوای سـەعاتێک گەیشـتە پترسـبۆرگ، لـەنێوان سـەعات نـۆو دەدا، لــــە زەنگـــی دەرگـــای مــــاڵی ڕوگـــوژینی دا. لـــــە دەرگـــای حەوشەوەژوورکەوت، ماوەیەکی زۆری پێچوو، کـەس دەرگای لێنـەکردەوە. ئـــەنجام دەرگـــای مـــاڵی پیرەژنەکـــەی دایکـــی ڕوگـــوژین درزی تـێکەوت. کارەکەرێکی پیری پۆشتە و پەرداخ و، جلوبەرگ خاوێن، پەیدا بـوو، هـەر لـە بەردەگاکەوە و بێ ئەوەی بە تەواوەتی بیکاتەوە، گوتی:

- پارفیون سیمیونوفیچ لە ماڵ نییە، تۆ کێت دەوێ؟

- پارفیون سیمیونوفیچ.

- لە ماڵ نییە.

کارەکەرەکە زۆر بە کونجکاوی لە میرزادەی ڕوانی.

- باشە دەکرێ بزانم دوێشە و لە ماڵ بوو یان نا؟ دوێنـێ بـە تـەنیا، هـەر خۆی بۆ ماڵ گەڕایەوە؟

کارەکەرەکـە، بـێ ئەوەی وەڵامـی بـداتەوە، هــەر بەو دەقەوە بەواقـی وڕەوە تەمەشای دەکرد.

- دوێنێ... دوێنێ ئێوارە ناستاسیا فیلیپوڤنای لەگەڵ نەبوو؟

- تکایە جارێ پێم بڵێ تۆ کێی؟

- من میرزادە لیون نیکولایوفیچ مشکینم. پارفیون دەناسم و دەمناسێت.

- لە ماڵ نییە.

پیرەژن بەدەم ئەو قسەیەوە چاوانی داخست.

- ئەدی ناستاسیا فیلیپوڤنا؟

- نازانم. هیچ شتێک لەم بارەیەوە نازانم.

- دەقیقەیەک، ڕوگوژین کەی دەگەڕێتەوە؟

- ئەمەش نازانم.

دەرگا داخرا. میرزادە لێبڕا دوای سەعاتێکی دی بگەڕێتەوە. چاوێکی بە حەوشەکەدا گێڕا. نیگای لە نیگای دەرگاوانەکە هەڵەنگوت.

- ئەرێ پارفیون سیمیونوفیچ لە ماڵە؟

- بەڵێ، لە ماڵە.

- ئەدی بۆ تۆزێ لەمەپێش پێیان گوتم لە ماڵ نییە؟

- لە ڤێلاکەی خۆیا وایان پێگوتی؟

- نە، کارەکەرەکەی دایکی گوتی، بەڵام کە لە دەرگای ماڵەکەی پارفیون سیمیونوفیچم دا، کەس دەرگای نەکردەوە.

دەرگاوانەکە گوتی:

- ڕەنگە چووبێتە دەرەوە. کە دەچێتە دەرەوە بە کەس ناڵێ. تەنانەت هەندێ جار کلیلی ماڵەکەش دەبات، سێ دانە ڕۆژی پێدەچێ.

- تۆ دڵنیای دوێنێ لە ماڵ بووە؟

- بەڵێ، لە ماڵ بوو. هەندێ جار لە دەرگای پێشەوە و بە قاڵدرمە گەورەکەدا سەردەکەوێ و نای بینم.

- باشە دوێنێ ناستاسیا فیلیپوڤنای لەگەڵدا بوو؟

- نازانم. بەدەگمەن بۆ ئێرە دێت. ئەگەر هاتبا لەوە بوو بیدینین.

میرزادە ڕۆیشت، مودەتێک، هایم و حەیران بە شۆستەکەی بەر ماڵەکەیاندا پیاسەی کرد. هەموو پەنجەرەکانی ڤێلاکەی ڕوگوژین داخرابوون. کەچی هەموو پەنجەرەکانی شوقەکەی دایکی کرابوونەوە. ڕۆژێکی هەتاوی گەرم بوو. میرزادە پەڕییەوە بۆ سەر شۆستەکەی بەرانبەر ماڵەکە، تا جارێکی دی، لەوێندەرەوە تەماشای پەنجەرەکان بکات،





نـەک خـرِ داخرابـوون، بـەڵکو پـەردە سـپیەکانی پشـت پەنجـەرەکانیش دادرابوونەوە.

میرزادە، نزیکەی دەقیقەیەک لەویٚ وەستا. شتێکی سەیر: لـەپرِ وای هاتـە بەرچاو کە سووچێکی پاینی یـەکێک لـە پـەردەکان هەڵدرایەوە، دەموچـاوی رِوگوژین دەر کەوت و پاشـان ون بـوو. میـرزادە کـەمێک چاوەرِوانی کـرد، خەریک بوو برِوات و دووبارە لە زەنگی دەرگا بداتەوە، بـەڵام رِەئـی گـۆرِی و برِیـاری دا دوای سـەعاتێکی دی بگـەرِێتەوە " کـیٚ دەزانـیٚ؟ رِەنگـە مـن وام وێنا کردبیٚ...؟"

بەلای میرزادەوە، چار هـەر ئەوە بوو بەپەلـە خـۆی بگەیەنێتـە گـەرِەکی ئیسماعیلوفسـکی، دوا نشـیمەنی ناستاسـیا فیلیپوڤنـا. میـرزادە دەیزانـی، کـاتیٚ ناستاسیا فیلیپوڤنا، سـیٚ هەفتـە لەوەپێش پاڤلوفسـکی جـیٚ هێشـتبوو، هـاتبوو بـۆ ئـەم گـەرِەکە و چووبـووە مـاڵی یـەکێک لـە دەسـتە خوشـکە نزیکـەکانی خـۆی، مـاڵی بێوە ژنـی مامۆسـتایەکی قوتابخانـە، کـە ئافرەتێکی بـەرِێز و بـە حورمەت بـوو، لـە شـوقەکەیا ژووری موبیلـەمانی هـەبوو و بـە کرێـی دەدان، سـەرچاوەی سـەرەکی بژێـوی و ژیـان و گـوزەرانی ئەو ئـەم کرێیانـە بـوو. بۆیە رِێی تێدەچوو، کاتیٚ ناستاسیا فیلیپوڤنـا بـۆ پاڤلوڤسـک گەرِابووەوە، ئەو ماڵەی چۆڵ نەکردبیٚ. هەروەها لەگین بـوو رِوگـوژین، دوێشـە و ناستاسـیای بۆ ئەوێندەر بردبیٚ. میرزادە، گالیسکەیەکی بـەکریٚ گـرت. بەدەم رِێگـاوە بـە خۆی دەگوت دەبوایـە لەوێـوە دەسـت بـەکاربیٚ، چونکـە نـە دەچـووە ئـەقڵەوە ناستاسیا فیلیپوڤنا، یەکسەرو لە شەوی یەکەما بۆ ماڵەکـەی رِوگـوژین بچـیٚ. قسەکەی کابرای دەرگاوانی بیر کەوتەوە کە ناستاسـیا فیلیپوڤنا بەدەگمـەن بـۆ ئەوێنـدەر دەچـیٚ. جـا ئەگـەر لـە کـاتی ئاسـاییدا وابـووبیٚ، چـۆن رِێـی تێدەچیٚ، ئەم جارەیان لای رِوگوژین، لە ماڵی رِوگوژین لایدابیٚ و مـابێتەوە؟ میـرزادە، کـە بەو لێکدانەوە و خـەیاڵانـە دڵخۆشـیی خـۆی دەدایەوە و ورەی خـۆی بـەرز دەکـردەوە، هـیلاک و نیمچـە مـردوو گەیشـتە گـەرِەکی ئیسماعیلوفسکی.

کـە گەیشـتە ئەویٚ، سـەیر لەوەدا بـوو کـە بێوەژنی مامۆسـتایەکە هـیچ





هەواڵێکی نە ئەمڕۆ، نە دوێنێی ناستاسیا فیلیپوڤنای پێ نەبوو. لەوەش سەیرتر ئەوە بوو: هەر هەموو خێزانەکە تێکڕا هاتنە تەمەشای میرزادەوەکو ئەوەی تاپۆیەکی سەیر و عەجیب بێ، هەموو منداڵەکان، کە تێکڕا کیژ بوون، تەمەنیان لەنێوان حەوت ساڵ و پازدە ساڵدا بوو، شیر بە شیر لەدایک بووبوون، یانی یەکی یەک ساڵیان بەین بوو. هەموویان بە دووی دایکیانا هاتبوون، دەوری میرزادەیان دابوو و بەزاری بەشەوە تەمەشایان دەکرد. دوای ئەوان پوورە لاوازە ڕەنگزەردەکەیان هات، کە سەرپۆشێکی ڕەشی بەسەریا دابوو، ئەوسا نەنکیان هات، ئەمە پیرەژنێکی زورهانی عەینەک لەچاو بوو.

بێوەژنی گۆرین، زۆر بەویقارەوە خولکی میرزادەی کرد کە بچێتە ژوورەوە و دانیشێ. میرزادەش قەبووڵی کرد. میرزادە هەر زوو بۆی دەر کەوت کە گشتیان ئەو زۆر باش دەناسن و ئاگایان لەو زەماوەندە هەیە کە دەبوایە دوێنێ ئەنجام بدرێ. هەستی کرد، تینوو تامەزرۆی ئەوەن هەواڵی ئەو زەماوەندەی لێبپرسن، پرسیاری ئەوەی لێ بکەن، خێرە کە هاتووە تاقیبی ژنێک لەوان دەکات، کە بە هەموو حاڵ و حیسابێک، دەبوایە ئێستا دەگەڵ ئەما لە پاڤلوڤسک بێ، بەڵام لە بەر بە ئەدەبی و بەڕێزی خۆیان پرکێشی ئەو پرسیارەیان نەدەکرد.

ئیدی میرزادە، بۆ ئەوەی بە مەراقی سەربوری زەماوەندەکەوە نەمێننەوە، بە چەند وشەیەکی کەم و بە کورتی هەندێ شتی لەو بارەیەوە بۆ گێڕانەوە، بەڵام کە بینی هەر هەموویان، حەپەساون و سەریان لەم شتە سوورماوە و پێیان ناخۆشە، ناچار بوو بە شێوەیەکی گشتی شتەکەیان بۆ بگێڕێتەوە. ئەنجام ئەم کۆمەڵە خانمە بە ڕێز و ئاقڵانە، پێشنیازیان کرد، کە هەرچۆنێ بووە، بە لەز بچێتەوە بۆ ماڵی ڕوگوژین، لە دەرگا بدات و واز نە هێنێ تا لێی دەکەنەوە و هەموو شتێک لە ڕوگوژین خۆیەوە دەزانێ. ئەگەر ڕوگوژین لە ماڵ نەبوو (کە دەبێ بە تەواوەتی تاکید لەمە بکات) یان نەیویست قسە بکات، هەنگێ دەبێ بڕوات بۆ گەڕەکی سیمیونوفسکی، لەوێ بچێ بۆ لای خانمێکی ئەڵمانی کە دەگەڵ دایکیا لەو گەڕەکە دەژی، ئەو

خانمە لە دۆستانی ناستاسیا فیلیپوڤنایە، ئیدی دوور نییە ناستاسیا، کە لە بارێکی دەروونی ناخۆشایە و دەیەوێ خۆی لە خەڵکی وەشێرێ، هەڵاتبێ و چووبێ بۆلای ئەو دوو خانمە.

میرزادە کە هەستا، زۆر بێتاقەت دیار بوو، لە گیانی خۆی بێزار بوو، وەکو ئەو دوو خانمە پاشان گێڕابوویانەوە "ڕەنگی بووبوو بە جاوی سپی". لاقی لە دووی نەدەچوو. میرزادە ئەنجام بە قسەکانیانا ئەوەی بۆ دەر کەوت کە ئەمانە گەرەکیانە یارمەتی بدەن و تاقیبی ناستاسیای بۆ بکەن، دەیانەوێ ئەدرەسی ئەم لە شاردا بزانن، تا ئەگەر سۆراخێکیان دەست کەوت، ئاگاداری بکەن، پێشنیازیان کرد کە ئەگەر هیچ شوێنێک لە شارا شک نابات، لە ئوتێلیکدا ژوورێک بەکرێ بگرێ. میرزادە تۆزێک بیری کردەوە، هەنگێ ئەدرەسی ئەو ئوتێلەی دانێ کە ماوەیەک لەوەپێش لێی دابەزی بوو و لەوێ فێیەکەی بۆ هاتبوو. هەنگێ بەرە و ماڵی ڕوگۆژین وەڕێکەوت. ئەم جارەش نە دەرگاکەی دیوی لای ڕوگۆژین و نە دەرگای دیوی لای دایکی ڕوگۆژینی لێ نەکرایەوە. میرزادە بە ناو حەوشە کەوت، کەوتە تاقیبی دەرگاوانەکە، دوای زەحمەتێکی زۆر دۆزییەوە. کابرا مژولی کاری خۆی بوو، بە حاڵ وەڵامی پرسیارەکانی میرزادەی دەداوە، مەگەر بەدەگمەن، دەنا هەر سەیریشی نەدەکرد، بەڵام بەجیددی تێی گەیاند کە پارفیون سیمیونوفیچ "بەیانی زوو چووە بۆ پاڤلوفسک و مەعلوم نییە ئەمڕۆ بگەڕێتەوە".

میرزادە گوتی:

– چاوەڕوانی دەکەم. بڵێی بۆ ئێوارە بگەڕێتەوە؟

– کێ دەزانێ، لەوەیە تا هەفتەیەکی دی نەگەڕێتەوە؟

– یانی بەم پێیە دوێشە و لێرە بووە، وانییە؟

– بەڵێ... بەڵام! ..

ئەم قسانە جێی باوەڕ نەبوون. زۆر نزیک بوو کە ئەم دەرگاوانە فەرمانی تازەی وەرگرتبێ. جاران زۆر سوێرە قسە بوو، کەچی ئێستا، بە کێردیش زاری لێک هەڵنەدەپچڕا، ڕووی لە میرزادە وەر دەگێڕا. وێڕای

ئەوەش میرزادە لێبڕا دوای دوو سەعاتی دی، جارێکی دی بێتەوە و ئەگەر پێویست بکات چاودێرییماڵەکەش بکات، بەڵام ئێستا دەبوو بڕوات بۆ لای ژنە ئەڵمانییەکە، ئێ بەڵکو خوا بەختەکی هەواڵێکی ناستاسیا بزانێ. بەپەلە بەرەو گەڕەکی سیمیونوفسکی وەڕێ کەوت.

بەڵام لەوێ نەیتوانی ژنە ئەڵمانییەکە حاڵی بکات کەچی دەوێ. لە هەندێ قسەی لامسەرلایی ژنە ئەڵمانییەکەوە ئەوەی بۆ دەر کەوت کە گوایە بەر لە پازدە ڕۆژێک دەگەڵ ناستاسیا فیلیپوڤنادا لێیان بووە بە دەمەقاڵێ و لەوساوە ئیدی ئاگای لێی نییە و بڕیاری داوە بە هیچ جۆرێ خۆی تێنەگەیەنێ "خوای دەکرد شووی بە هەموو میرزادانی دنیا دەکرد".

میرزادە، بەلەز خاترخوازی لێ کرد. لەپڕ ئەوەی بە خەیاڵدا هات کە لەگینە ناستاسیا فیلیپوڤنا چوو بێت بۆ مۆسکۆ، چونکە جارێکی دیکەش، وای کردبوو. هەڵبەتە لەم حاڵەدا ڕوگوژین، ئەگەر لەگەڵیشی نەچووبێ، دوای کەوتووە، دوور نییە لەوێ بە یەکەوە بن. لەدڵی خۆیدا گوتی: "خۆزیا بەلای کەمەوە شوێن پێیەکی دەدۆزییەوە"...

لەپڕ بیری کەوتەوە، کە دەبێ لە ئوتێلێکدا ژوورێ بەکرێ بگرێ. بەلەز بەرە و شەقامی لیتانیایا وەڕێکەوت. لەوێ یەکسەر ژوورێکی گرت. کە بۆیەکە، لێی پرسی خواردنی دەوێ یان نا، بە حەواس پەرتی وەڵامی دایەوە "بەڵێ" بەڵام هەرکەوەخۆ هاتەوە، بە توڕەیی کەوتە گلەیی لە خۆی کە بۆچی داوای خواردنی کردووە، چونکە ئەم خواردنە بەلای کەمەوە بە خۆڕایی نیو سەعاتی دوادەخست، دوایی بیری کەوتەوە خۆ کەس زۆری لێ نەکردووە کە هەر دەبێ ئەم نانە بخوات. لەو ڕاڕەوە تەنگ و تاریکەدا هەستێکی غەریب و سەیر دایگرت، هەستێک کە لە ژان و ژاری ئەوەدا بوو ببێ بە بیرۆکەیەک، بەڵام میرزادە نەیدەتوانی تەسەوری ئەوە بکات کە ئەم بیرۆکەیە چۆن دەبێت و چۆن دەکەوێتەوە. بەوپەڕی نیگەرانی و پەرێشانی لە ئوتێلەکە وەدەر کەوت. سەری گێژی دەخوارد. تیامابوو کە کێوە بچێت؟ دیسان بەهەشتاو بەرە و ماڵی ڕوگوژین وەڕێکەوت. ڕوگوژین، نەگەڕابووەوە. میرزادە، ماوەیەکی زۆر زەنگی لێدا، کەس بەدەنگیەوە

نەهات. ئەوسا لە زەنگی دەرگای ماڵی دایکی ڕوگوژینی دا. دەرگا کرایەوە. گوتیان پارفیون سیمیونوفیچ لە ماڵ نییە و لەگینە تا چەند ڕۆژی دی نەیەتەوە. میرزادە زۆر نارەحەت بوو، کارەکەرەکە بە گومانەوە سەیری دەکرد. ئەم جارەیان دەرگاوانەکە لە هیچ شوێنێکەوە دیار نەبوو، هەرچی کرد و کۆشا نەیتوانی بیدۆزێتەوە.

میرزادە، ئەم جارەش، وەکو جاری پێشوو پەڕییەوە بۆ شۆستەکەی ئەوبەر، مودەتێک چاوی بڕییە پەنجەرەکان، دوایی بەو قرچەی گەرمایە، نزیکەی نیو دانە سەعات و بگرە پتریش بەو سەر شۆستەیەدا هاتووە و چووە. ئەم جارە نە پەنجەرەکان کرانەوە و نە پەردە سپییەکان جووڵانەوە. ئیدی میرزادە گەیشتە قەناعەتی تەواو، جارەکەی دیکەیش چاوی ڕێشکە و پێشکەی کردووە، چونکە دیار بوو پەنجەرەکان لەمێژبوو پاک نەکراونەتەوە و ئەوەندە تەڵخ و تۆزاوی بوون، ئەگەر کەسێکیش لەو دیویانەوە بوەستابا نەدەبینرا. ئیدی دڵنیا بوو کەس لە ماڵ نییە. یەکسەر بەرە و گەڕەکی ئیسماعیلوفسکی بۆ ماڵی بێوەژنەکەی مامۆستایەکە، وەڕێکەوت. لەوێ چاوەڕوانی بوون، ئەم بێوەژنە سەری بە سێ-چوار شوێنا کردبوو، تەنانەت بۆ ماڵی "ڕوگوژین"ش ڕۆیشتبوو، بەڵام هیچ سەروسۆراخێکی دەست نە کەوتبوو. میرزادە لە بەردەرگا گوێی لە قسەکانی گرت، ئەوسا وەژوورکەوت، لەسەر تەختێک دانیشت. ئەوسا بەواقی وڕەوە، وەکو یەکێک تێنەگات باسی چی بۆ دەکرێ، کەوتە نۆڕینی چواردەوری خۆی. شتێکی سەیر بوو: جارێ زەینی تەواو دەمەزەرد دەبووەوە و جارێ بە جۆرێ پەرێشان دەبوو و خاو دەبووەوە کە خۆیشی باوەڕی نەدەکرد. پاشان خەڵکی ماڵەکە گێڕابوویانەوە کە میرزادە ئەو ڕۆژە "زۆر سەیر و غەریب بووە". ئەنجام هەستا، داوای کرد ئەو ژوورانەی پێ نیشانبدەن کە ناستاسیا فیلیپوڤنا کاتی خۆی لێی بەکرێ گرتبوون. شوێنەکەی ناستاسیا دوو ژووری بەرزو ڕووناک و هەتاوگیر بوو، زۆر جوان موبیلەمان کرا بوون، بە ئاشکرا دیار بوو کە کرێیان گران بووە. خانمی ئەم ماڵە پاشان گێڕابوویانەوە کە میرزادە تەمەشای هەموو

کەل و پەلەکانی ناو شووقەکەی کردووە. کە لە سەر مێزێکی چکۆلە چاوی بە ڕۆمانێکی فەرەنسی، ڕۆمانی " مەدام بوڤاری" کەوتبوو، کە ناستاسیا فیلیپوڤنا لە کتێبخانەیەک بە ئەمانەت هێنابووی، وبەکراوەیی لەسەر مێزەکە بوو، سووچێکی لاپەڕە کراوەکەی نوشتاندەوە، مۆڵەتی لێخواستن کە بیبات، هەرچەند گوتیان ئەمانەتیە، لە کتێبخانە هێنراوە، فایدەی نەبوو، هەڵی گرت و نایە گیرفانی. لە قەراخ پەنجەرەیەکی کراوەدا دانیشت. کە لەسەر مێزێکی یاریکردن، چەند ژمارە و هێڵێکی بینی کە بە دەباشیر نوسرا بوون، پرسی کێ لەسەر ئەم مێزە یاری کردووە، وەڵامیان دایەوە کە ناستاسیا فیلیپوڤنا، هەموو شەوێک لێرە دەگەڵ ڕوگوژیندا جۆرەها یاری وەرەقی دەکرد. هەر جارەی جۆرە یارییەکیان دەکرد. زیاتر لەم دواییانەدا خوویان دابووە ئەم وەرەقبازیە، لەوساوە کە ناستاسیا فیلیپوڤنا، لە پاڤلوفسک گەڕابووەوە تا لە پترسبۆرگ ئاکنجی بێ و بژی. ناستاسیا فیلیپوڤنا گلەیی ئەوەی دەکرد کە شەوان بێکارە و "ڕوگوژین"ش تا حەوت نیوەشە و قڕوقەپ دادەنیشێت و متەقی لێوە نایەت و، ناتوانێ باسی هیچ مەوزوعێک بکات و سەرگەرمی بکات. ناستاسیا فیلیپوڤنا زۆر جار دەگریا. ڕوگوژین بۆ سبەینێ کە هات لەپڕ دەستەیەک وەرەقی لە گیرفانی دەر هێنا. ناستاسیا فیلیپوڤنا، زۆری پێخۆش بوو، لە کەیفان دەستی بە پێکەنین کرد، ئیدی بە دوو قۆڵی دەستیان بە گەمە کرد. میرزادە پرسی وەرەقەکان کوان، خانمەکان چەند گەڕان وەرەقەکانیان نەدۆزییەوە چونکە ڕوگوژین هەموو ڕۆژێ وەرەقە کۆنەکانی دەبرد و بۆ ڕۆژی دوایی دەستەیەک وەرەقی تازەی دەگەڵ خۆیدا دێنا.

خانمەکان، میرزادەیان هاندا کە جارێکی دیکەش بچێتەوە بۆماڵی ڕوگوژین و توندتر لە دەرگا بدات، بەڵام نەک ئێستا، بەڵکو "سەری شەوێ بەشکو خوابەختەکی لە ماڵ بێ." بێوەژنەکە بە میرزادەی گوت ئامادەیە سبەی بە ڕۆژەوە بچێ بۆ پاڤلوفسک و لەوێندەر داریا ئەلکسیڤنا بدینێ، بەڵکو ئەمە خوایە سۆراخێکیان دەست بکەوێ. ئیدی پێشنیازیان کرد کە میرزادە سەعات دەی شەوێ بگەڕێتەوە بۆ ماڵی ئەوان تا نەخشەیەک بۆ

سبەینێ دابنێن. سەرباری ئەم هەموو دڵدانەوە و پشتیوانییە گەرمەی لە میرزادە دەکرا. نائومێدییەکی تەواو باڵی بەسەر دڵ و دەروونیا کێشا بوو. لۆژ لۆژ، بەوپەڕی خەم و پەژارەوە، بە پێیان بەناو شەقامە تۆزاوی و گەرمەکانی پترسبۆرگا بەرەو هوتێلەکەی پەل بووەوە. بەدەم ڕێوە شانی بەر شانی مەست و سەرخۆش و سەرگەردانان دەکەوت. لێیان ورد دەبووەوە، تەمەشای دەکردن، بە خۆیشی نەیدەزانی بۆ، ڕەنگە لەبەر ئەوە بووبێ، کە زۆری ڕێکردبێ، ماندوو بووبێ. دەمەو ئێوارێ کە گەیشتە ژوورەکەی خۆی لێبڕا پشوویەکی کەم بدات و ئەوسا بچێ بۆ ماڵی ڕوگۆژین. لەسەر کورسییەک دانیشت، هەر دوو ئانیشکی دادانە سەر مێزێک و لە فکران ڕاچوو.

مەگەر خوا بزانێ چەند بەو دەقەوە مایەوە و بیری لەچی دەکردەوە. لە زۆر شتان دەترسا، بە خۆی هەستی بە زیادبوونی ئەم ترس و نیگەرانییە دەکرد، بەداخەوە دەتلایەوە. ڤیرا لیبدیفای بیرکەوتەوە، لە دڵی خۆیدا گوتی بڵێی لیبدیف شتێک لەم بارەیەوە نەزانێ. خۆ ئەگەر نەشزانێ، لە من زوو ترو ئاسانتر، سۆراخی دەست دەکەوێ. ئەوجا هیپولیتی بیرکەوتەوە، بیری کەوتەوە کە لیبدیف سەری دەدا. ئەنجام ڕوگۆژینی بیر کەوتەوە کە چۆن لەو دواییانەدا بینیبووی: جارێک لە تازیە و جارێک لە باخی گشتیدا، جارێکیش لە ژوورەکەی خۆیدا بینیبووی، کە لەم ڕاڕەوە تاریکەدا، بە چەقۆیەکەوە خۆی لێ مەڵاس دابوو. چاوەکانی بیر کەوتنەوە، کە لە جەرگەی تاریکی یەکەوە تەمەشای ئەوی دەکرد. تەزوویەک بە سەراپایدا هات. ئەو بیرۆکەیەی تۆزێ لەوەپێش لە زەین و مێشکیدا گێژی دەخوارد، لەپڕ لە بەرچاویا بەرجەستە بوو، قاڵبی خۆی وەرگرت...بیرۆکەکەش تەقریبەن بەم جۆرە بوو: ئەگەر ڕوگۆژین، لە پترسبۆرگ بێ، چەندیش خۆی بشارێتەوە، درەنگ یان زوو هەر تاقیبی ئەم، میرزادە، دەکات و چ بە نیاز پاکی و چ بەد نیازی بێ، بە خۆی دێت بۆلای، وەکو چۆن جاری هەوەڵ هاتبوو بۆلای. جا ئەگەر ڕوگۆژین، بە هەر مەبەستێک تاقیبی ئەم، میرزادە بکات، هەڵبەتە لەم ئوتێلەدا، لە هەمان ڕاڕەودا بۆی دەگەڕێ.

"چونکە ئەو ڕەسمی من نازانێ، وا وێنا دەکات وەکو جارەکەی دی لە هەمان ئوتێل لام داوە. ئیدی ئەگەر پێویستی بە دیتنی من بێ لێرەدا بۆم دەگەڕێ. ئیدی کێش دەڵێ وادەبێ؟ لەوەیە زەرورەتی ئەم دیدارە ناچاری بکات"..

میرزادە بەو جۆرە بیری دەکردەوەو، ئەگەری ئەم بیرکردنەوەیەشی بەدوور نەدەزانی. خۆ ئەگەر داوات لێکردبا هۆی ئەمەت بۆ ڕوون بکاتەوە کە بۆچی پێی وایە ڕوگوژین لەپڕێکا هەست بە زەرورەتی دیتنی ئەم، میرزادە، دەکات، یان بۆچی ئەگەری ئەوە دانانێ کە مەحاڵە ئەو دووانە جارێکی دی یەکدی بدینن. هیچ وەڵامێکی پێ نەبوو، بەڵام بیرۆکەکە خۆی لە خۆیدا بە سوێ بوو، ئازاری دەدا. میرزادە لە دڵی خۆیدا دەیگوت: "ئەگەر دڵی خۆش بێ و وەزعەکەی بەدڵ بێ نایەت. ئەگەر وەزعی خراپ بێ دێت، کە بێگومان وەزعی خراپە و ئاسودە نییە."...

هەڵبەتە کە ئەوە قەناعەتی بوو، دەبوایە لە ئوتێل لە ژوورەکەی خۆی وەمێنێ و چاوەڕوانی هاتنی ڕوگوژین بکات، بەڵام وادیار بوو، نەیدەتوانی تەحەمولی ئەم بیرە تازەیەی خۆی بکات، بۆیە دەستی دایە کڵاوەکەی هەستاو بەهەشتاو وەدەر کەوت. ڕاڕەوەکە تەواو تاریک بوو. کە میرزادە گەیشتە نزیکی ئەو شوێنە شوومەی کە جارەکەی دی، ڕوگوژینی بە چەقۆی ڕووتەوە، لێ بینیبوو، لە دڵی خۆیدا گوتی: "چۆنە لەناکاوا، لەو سووچەوە بێتە دەرێ و لە سەر قاڵدرمەکان تووشی یەکتر ببین؟" بەڵام کەس دەرنەکەوت. لە دەرگا چووە دەرێ، گەیشتە سەر جادەکە، خۆر لە ئاوابوونا بوو، جادەوبان زۆر قەرەباڵغ بوو، لە خەڵکیا جمەی دەهات (ئەمە دیمەنی باوی ئێوارانی هاوینی گەرمی پترسبۆرگ بوو) ئیدی بەرە و شەقامی گوروخوفایا بە ڕێکەوت. نزیکەی پەنجا شەقاوێک لە ئوتێلەکە دوور کەوتبووەوە، لە یەکەمین دوو ڕیاندا، لەناو قەرەباڵغی یەکەدا. هەستی کرد یەکێک قۆڵی گرت، گوێی لە دەنگێک بوو کە بە گوێیا چپاند:

– لیون نیکولایوفیچ، وەرە برا، وەرە دەگەڵم، خێراکە دەگەڵم بێ.

ڕوگوژین بوو.

شتێکی سەیر بوو: میرزادە یەکسەر، بە خۆشی و شادییەوە، بەپەلە و تامەزرۆییەکەوە، کە زۆر جار بە تەواوەتی دانی بەوشەکانا نەدەنا، کەوتە گێڕانەوەی ئەوەی کە چۆن چاوەڕوانی ئەوە بووە لە ڕاڕەوی ئوتێلەکەدا بیدینێ.

ڕوگوژین خێرا گوتی:

- خۆ لەوێ بووم وەرە با برۆین!

میرزادە، سەری لەم وەڵامە سوور ما، دوو دەقیقەیەک دەبیرێکی قووڵەوە چوو. هەستی بە ترسێکی گۆنگ کرد، چاوانی بڕییە ڕوگوژین. ڕوگوژین، نیو هەنگاوێک لەپێش ئەوەوە دەڕۆیشت ڕاستەوخۆ تەمەشای پێش خۆی دەکرد، ئاوڕی ئەم لاو ئەولای نەدەدایەوە، گوێی بەو ڕێبوارانە نەدەدا کە ڕووبەڕووی دەهاتن، هەر کە لێی نزیک دەبوونەوە، بە شێوەیەکی میکانیکی خۆیان لێ لا دەدا.

میرزادە، لەپڕ پرسی:

- باشە کە لە ئوتێلەکە بووی، بۆچی لێت نەپرسیم؟

ڕوگوژین ڕاوەستا، تەمەشایەکی کرد، لە فکران ڕاچوو، ئەوسا وەکو ئەوەی بە باشی لە پرسیارەکەی حاڵی نەبووبێ گوتی:

- گوێ بگرە لیون نیکولایوفیچ. لێرەوە یەکڕاست برۆ تا دەگەیە ماڵەکەی من، خۆ دەیزانی؟ من لەو بەری جادەکەوە دێم، بەڵام ئاگادار بە، کە پێکەوە بین...

ڕوگوژین، دوای ئەو قسانە پەڕییەوە بۆ ئەوبەری جادەکە، تەمەشایەکی کرد تا بزانێ میرزادە بە هەمان ڕێگەدا کە پێی نیشان دابوو دەڕوات یان نا، کە بینی میرزادە ڕاوەستاوە و زەق زەق تەمەشای ئەو دەکات، بە دەست ئاماژەی کردێ کە بەرەو شەقامی گوروخوفایا بڕوات. ئەوجا دەستی بە ڕۆیشتن کردەوە، بەردەوام، تەمەشای میرزادەی دەکرد و ئاماژەی دەکردێ کە شان بە شانی ئەو بڕوات. کە زانی میرزادە لێی تێگەیشتووە، لە شەقامەکە ناپەڕێتەوە کە دوای ئەو بکەوێ، ئیدی کەمێک هێور بووەوە و ئاسوودە بوو. میرزادەوای هەستکرد کە ڕوگوژین،

بەتەمای کەسێکە و بۆیە چووەتە ئەوبەری شەقامەکە، تا لێی گوم نەبێت. لە دڵی خۆیدا گوتی: "باشە ڕوگوژین بۆ پێی نەگوت بەتەمای کێیە؟" نزیکەی پێنج سەد شەوقاوێک بەو جۆرە ڕێیان کرد، کە میرزادە بە خوت و خۆڕایی، بێ ئەوەی خۆیشی بزانێ بۆ، سەراپای کەوتە لەرزین، ئەمما لەرزین! . ڕوگوژین هێشتا هەر ئاوڕی لێ دەدایەوە، بەڵام وەکو جاران زوو زوو ئاوڕی لێنەدەدایەوە. بەڵکو ناو بە ناو ئاوڕی لێدەدایەوە. میرزادە کە بە تەواوەتی تاقەتی چووبوو، وەستا و دەستێکی بۆ ڕوگوژین هەڵتەکاند کە بێت بۆلای ئەو. ڕوگوژین بەهەشتاو لە شەقامەکە پەڕییەوە بۆلای ئەم. میرزادە لێی پرسی:

– ناستاسیا فیلیپوڤنا لەماڵی ئێوەیە؟

– بەڵێ.

– ئەوە تۆ بووی کە لەپشت پەردەکەوە تەمەشای منت کرد؟

– بەڵێ...

– ئەدی.... بۆ...

میرزادە، نە یدەزانی چۆن ڕستەکەی تەواو بکات و، چ پرسیارێکی دی بکات. ئەمە جگە لەوەی کە دڵی بە جۆرێ لێی دەدا، بە زەحمەت دەیتوانی قسان بکات.

" ڕوگوژین"ش بێدەنگ بوو، وەکو یەکێک خەون بدینێ، بەو ئاوایە تەمەشای دەکرد... ئەوسا، لە کاتێکا خۆی ئامادە دەکرد، جارێکی دی بۆ ئەو بەری شەقامەکە بپەڕێتەوە، لەپڕ گوتی:

– دەی با بڕۆین. من بۆ ئەوێ دەڕۆم. تۆ پێش بکەوە. با بە جیا بڕۆین... من لەو بەرەوە و تۆ لە مبەرەوە. واهی باشترە... دوایی تیدەگەی بۆ.

کاتێ گەیشتنە شەقامی گوروخوفایا و لە ماڵەکەی ڕوگوژین نزیک بوونەوە، میرزادە هەستی کرد، لاقەکانی لە ژێریا سست بوون، بە زەحمەت لە دووی دەهاتن. سەعات، نزیکی دەی شەو بوو. پەنجەرەی ئەو بەشەی کە پیرەژن تیای دەژیا، هێشتا کرابوونەوە. پەنجەرەکانی شوقەکەی ڕوگوژین، هەموو داخرابوون، پەردەکان دادرابوونەوە و لە تاریکییەکەدا





سپی تر دەیاننواند. میرزادە گەیشتە سەر شۆستەکەی بەرانبەر ماڵەکە، کە بینی ڕوگوژین لە دەستی خۆیەوە، گەیشتە سەر قاڵدرمەکانی بەر دەرگاو ئاماژەی ئەم دەکات کە بچێ بۆلای ئەو، خێرا پەڕییەوە و خۆی گەیاندە لای ئەو.

ڕوگوژین، بەدەم بزەیەکی فێڵاوی و تانەئامێزەوە، بەئەسپایی بە گوێی میرزادەیدا چپاند:

- دەرگاوانەکە نازانێ کە من بۆ ماڵ گەڕاومەتەوە. پێم گوتووە دەچم بۆ پاڤلوفسک، ئەمەم بە کارەکەرەکەی دایکیشم گوتووە. بۆیە کە دەچینە ژوورەوە نابێ کەس گوێی لە دەنگمان بێ.

ڕوگوژین، کلیلەکەی لە گیرفانی دەرهێنابوو، بە دەستیەوە بوو. کە بە قاڵدرمەکانا سەر کەوت، ئاوڕێکی لە میرزادە دایەوە و بە ئاماژە تێی گەیاند کە زۆر بە بێدەنگی سەربکەوێ. بەئەسپایی دەرگای ژوورەکەی کردەوە، میرزادەی وەپێش دا، بە خۆیشی زۆر بە پارێزەوە دووی کەوت، دەرگاکەی توند داخستەوە و کلیلەکەی نایە گیرفانی.

بەئەسپایی گوتی: - لەدووم وەرە!

ڕوگوژین لەوساوە کە میرزادەی لە شەقامی لیتاینایادا بینیبوو، بە دەنگی بەرز قسەی نەکردبوو. پیاو یەکسەر هەستی دەکرد کەوێڕای ڕواڵەتی هێمن و ئارامی، لە ناخا زۆر نیگەران و شپرزەیە. کە چوونە ژووری میوانەوە، لە بەردەرگای ژووری کارکردنەکەیدا، چووە بەر پەنجەرەکە، بە سیمایەکی ڕازئامێزەوە، ئاماژەی بۆ میرزادە کرد کە بچێتە پێشترەوە. ئەوجا گوتی:

- گوێ بگرە ئەم بە یانیە کاتێ لە دەرگات دا، من لێرە بووم، یەکسەر زانیم کە تۆیت. بە ئەسپایی و لەسەر نووکی پێیان خۆم گەیاندە پشت دەرگاکە، گوێم لێت بوو کە قسەت دەگەڵ پافنوتیڤنا، کارەکەرەکەی دایە دا دەکرد. بەیانی زوو ئاگادارم کرد کە هەر کەسێک لە زەنگی دەرگاکەی منی دا، وەڵامی نەداتەوە. ئیدی ئەو کەسە هەر کارێکی هەبێ، یان هەر کێیەک بێ، تۆبی یان هەر کەسێک بێ تۆ ناردبێتت، یان هەر کەسێکی دی بێ.

هەڵبەتە زیاتر مەبەستم تۆ بوو، تەنانەت ناوی تۆشم پێگوت. پاشان کە کۆڵت داو ڕۆیشتی، وام هەست کرد دەچیت لە سەر جادەکەوە تەمەشا دەکەیت، هەنگێ هاتمە بەر ئەم پەنجەرەیە، گۆشەیەکی پەردەکەم لادا تا تەمەشایەک بکەم، سەیرم کرد تۆ لەوێندەر وەستابوویت و ڕێک تەمەشای منت دەکرد. مەسەلەکەواهی بوو.

میرزادە، بە ئەوکی گیراوەوە گوتی:

- ئەدی.. ناستاسیا فیلیپوڤنا کوا، لەکوێیە؟

ڕوگوژین، دوای سووکە هەڵوەستەیەک، بەئەسپایی گوتی:

- ئەو... لێرەیە.

- کوا؟

ڕوگوژین، چاوی هەڵبڕی و، نیگای بڕییە میرزادە. ئەوجا گوتی:

- وەرە. لەگەڵ منا بێ.

هێشتا هەر بە چپە، هێواش، حایرو سەرسام، قسانی دەکرد. تەنانەت کە باسی ئەوەشی کرد کە چۆن لەسەر نووکی پێیان چووەتە بەر پەنجەرەکە و بەدزییەوە سەیری ئەوی، میرزادەی کردووە، هەرچەند ڕاستگۆییەکی ڕواڵەتی بە قسەکانیەوە دیار بوو، بەڵام ڕاز و ڕەمزێک لەپشت قسەکانییەوە پەنهان بوو.

خۆیان کرد بە ژووری کاردا. هەندێ گۆڕانکاری بەسەر ژوورەکەدا هاتبوو، لەچاو دوا دیداری میرزادەدا، هەندێ گۆڕانکاری تیا کرابوو. پەردەیەکی ئەستووری ئاوریشمی کەسکی گوڵدار، بە بن میچەکەوە هەڵواسرابوو و ژوورەکەی کردبوو بە دوو بەشەوە، ئۆفیسەکەی ڕوگوژینی، لە شوێنی نووستنەکەی جیا دەکردەوە. ناو ژوورەکە زۆر تاریک بوو. شەوانی "سپی"ی پترسبۆرگ بەرەو کۆتایی و تاریکبوون دەچوو. خۆ ئەگەر تریفەی مانگی چواردە نەبا، پیاو نەیدەتوانی هیچ شتێک لەم ڤێلایەی ڕوگوژیندا، بە تایبەتی کە هەموو پەردەکانی دادرابوونەوە، بدینێ. ئەلهەقی هێشتا پیاو دەیتوانی دەموچاوی یەکدی بدینێ، بەڵام دیتنێکی هەندێ لێڵ. چارەی ڕوگوژین وەکو هەمیشە زەرد بوو. چاوانی

بڕیبوونە میرزادە و نەیدەگواستنەوە.

میرزادە گوتی:

- باشتر نەبوو مۆمێک داگیرسێنی؟

ڕوگوژین، دەستی گرت، لە سەر کورسییەک دای نیشاندو گوتی:

- نا، پێویست ناکات...

هەنگێ لەهەنبەر میرزادە دانیشت. کورسییەکەی هێندە لە کورسییەکەی میرزادە نزیک بوو، خەریک بوو ئەژنۆکانی لە ئەژنۆی وی گیربن. مێزێکی چکۆلەی بازنەییان لە تەنیشتەوە بوو.

ڕوگوژین، وەکو ئەوەی هانی بدات بمێنێتەوە، گوتی:

- دانیشە، با تۆزێ ئیسراحەت بکەین.

بێدەنگییەکی یەک دەقیقەیی باڵی بەسەرا کێشان. ئەوجا وەکو یەکێک کە خۆی لە مەسەلەیەکی جیددی بدزێتەوە و بکەوێتە پەراگەندە گۆییەکی دووردرێژی بی سەرو بەر، بەو ئاوایە هاتە قسان:

- دڵنیابووم کە بۆ هەمان ئوتێل دەڕۆیت. هەر کە پێم نایە ناو ڕاڕەوەکە، لە دڵی خۆدا گوتم ڕەنگە لەوێ چاوەڕوانم بیت. باشە بۆ ماڵی بێوەژنەکەی مامۆستاش ڕۆیشتی؟ میرزادە، کە خەریک بوو دڵی شەق بەرێ، بەزەحمەت هاتە قسە و گوتی: - بەڵێ...

- تەسەورم دەکرد. لە دڵی خۆدا گوتم لەوێ زۆر چەنەبازی دەکەن... بۆیە بیرم لەوە کردەوە کە بتهێنم بۆ ئێرە و شەوێ پێکەوە بین...

میرزادە، بەدەم هەستانەوە لەپڕ گوتی:

- ڕوگوژین! ناستاسیا فیلیپوڤنا لەکوێیە؟

بەدەم ئەو قسانەوە سەراپای دەلەرزی. (ڕوگوژین)یش هەستا بە سەر ئاماژەیەکی بۆلای پەردەکە کرد و بە ئەسپایی گوتی: - ئەوەتا لەوێ.

میرزادە، لەبن لێوانەوە پرسی: - خەوتووە؟

- دەی... با جارێ بچینە ژوورەوە... بەڵام تۆ... دەی با وەژوورکەوین...

پەردەکەی لادا، هەڵوەستەیەکی کرد، ڕووی کردە میرزادە، بە ئاماژەی سەر پێی گوت:

- بچۆ ژووری!

میرزادەوەژوورکەوت گوتی: - ئێرە زۆر تاریکە.

ڕوگوژین، لەبن لێوانەوە گوتی: - دەتوانی دەوروبەری خۆت بدینی.

- تەنیا تەختە خەوەکە دەبینم.

ڕوگوژین، بە ئەسپایی گوتی: - بچۆ نزیکترەوە.

میرزادە، هەنگاوێک چووە پێشترەوە، ئەوجا هەنگاوێکی دیکەی نا. یەک-دوو دەقیقەیەک بێ جوولە، ڕەق لە جێی خۆی وەستا. ئەم دوو پیاوە کە لە قەراغ تەختە خەوەکە وەستابوون، بە درێژایی ئەو ماوەیەی کەوەستابوون، شتاقیان متەقی لێوە نەهات. دڵی میرزادە، هێندە بە توندی لێی دەدا لەوە بوو، لەو بێدەنگییە مەرگناکەی کە باڵی بە سەر ژوورەکەدا کێشابوو، گوێت لە دەنگی بێ. بەرەبەرە چاوی بە تاریکیی ژوورەکە ڕاهات، دەیتوانی تەختە خەوەکە بدینێ، یەکێک درێژا و درێژ، یەک تەختە، بێ جووڵە لەسەر تەختە خەوەکە نوستبوو. نە کەمترین دەنگ و نە هەناسەی لێوە نەدەهات. یارۆی نوستوو، لە تەپڵی سەریەوە تا نووکی پێی، بە چەرچەفێکی سپی داپۆشرا بوو، ئەندامی لەشی بە باشی نەدەبینرا. ئەو سووکە بەرزی و نزمیەی لەژێر چەچەفەکەوە دەبینرا، ئەوەی دەنواند کە ئینسانێک درێژاو درێژ لە ژێریا نوستووە. بە هەر چواردەوری تەختەکەدا، لە ژێریا، لە سەر ئەو کورسییەی بەرانبەریا، هەر جلوبەرگ بوو و بە تێکەڵ و پێکەڵی فڕێ درا بوو: دیزداشەیەکی فاخیری ئاوریشمی سپی، گوڵ، نەوار. لەسەر تەپڵەکێکی چکۆلەی لای سەرووی تەختەکە بڕێ جەواهێرو ئەڵماس، کە بەخەمساردی و بێ موبالاتی دانرا بوو، دەدرەوشایەوە. لە کۆتایی تەختە خەوەکەوە، لە سەر کۆمەڵێک پارچەی گرمۆڵە بووی تۆڕی، کۆتایی تەختە خەوەکەوە، سەری پێیەکی ڕووت دەرکەوتبوو، لە تۆ وایە لە مەڕ مەڕ تاشراوە، پێیەکی بێ جووڵەی ئەوتۆ کە سامێکی کوشندەی دەخستە دڵەوە.

میرزادە، هەستی دەکرد، تا زیاتر ورد دەبێتەوە و سەرنج دەدات. ئەم بێدەنگییە زیاتر لە بێدەنگی گۆڕستان دەچێت تا ژوورێکی ئاوەدان. لەپڕ

مێشـێک لـە شـوێنێکەوە هـەڵفڕی، بـە گیـزە گیـز هەنـدیک بەسـەر تەختـە خەوەکـەدا سـووڕایەوە، پاشـان هـات لەسـەر تەپڵەکـە چکۆلەکـەی تەنیشـت تەختـە خەوەکـە نیشـتەوە. میـرزادە تەزوویـەکی سـەراپاگیری پێـدا هـات. ڕوگوژین، قۆڵی گرت و گوتی: - با لێرە بڕۆین

به دوو قۆڵی لـە ژوری نووستنەکە وەدەر کەوتن. جارێکی دی لەسـەر هەمان ئەو کورسییانەی تۆزی لەوپێش لەهەنبەر یەکدا، دانیشتن. میـرزادە، سـات بـە سـات پتـر دەلـەرزی، بـە هـیچ کلـۆجێ نیگـای پرسـیارئامێزی لـە ڕوگوژین نەدەگواستەوە.

ڕوگوژین، ئەنجام گوتی:

- لیون نیکولایوفیچ دەبینم دەلەرزی، ڕێک وەکو ئەو کاتانـە دێیـە بـەرچاو کە فێیەکەت بۆ دێت. لە بیرتە چۆن لە مۆسکۆ فێت لێدەهات؟ یان بیرتـە بـەر لە هەر نۆرە فێیەک چیت لێ دەهات؟ باشـە ئەگـەر ئێسـتا نـۆرە فێیەکـەت بـۆ بێت من چیت لێ بکەم...

میـرزادە زۆر بەوردی گـوێی لـێ دەگـرت، هەوڵیـدەدا بـە تەواوەتـی لێـی تێبگات. نیگای پرسیار ئامێزی لـێ نـە دەگواسـتەوە. میـرزادە ئـەنجام بەسـەر ئاماژەی بۆ لای پەردەکە کرد و گوتی:

- ئەمەشت کرد؟

ڕوگوژین، سەری داگرت و بەچپە گوتی: - بەڵێ.

نزیکەی پێنج دەقیقەیەک شـتاقیان متـەقیان لێوە نـەهات. ڕوگـوژین، لـەپڕ وەکو ئەوەی کەس قسەکەی پێنەبڕی بێت، لە سەر قسەکەی پێشـووی خـۆی ڕۆیشت و دووبارە بە میرزادەی گوت:

- ئەگـەر نـۆرە فێیەکـەت بـۆ بێـت، بکەوێتـە هـاوار، هـەنگێ خـەڵکی لەسـەر جادەکە یان لە حەوشەدا گوێیان لە دەنگت دەبـێ، ئیـدی دەزانـن خـەڵکێک لـە شوقەکەدایە، ئیدی بە دەنگ هاوارەکەتەوە دێن و وەژووردەکەون... چونکە هـــەموان وا دەزانـــن مـــن لێـــرە نـــیم. مـــن بۆیـــە تەنانـــەت مۆمێکیشـــم دانەگیرسـاندووە، تـا کـەس لـە سـەر جـادەکەوە یـان لـەنێو حەوشـەوە هـیچ نـەبینێ. کـە دەچمـە دەرێش کلیلەکـە دەگـەڵ خـۆدا دەبـەم، جـاری وا هەیـە





بەسێ چوار ڕۆژ جارێ کەس نایەت ئێرە خاوێن بکاتەوە. ئیدی تا ئێستا وام کردووە. بۆیە نابێ کەس بزانێ کە ئەمشەو لێرە دەبین... میرزادە گوتی:

– دەقیقەیەک. خۆ من لە دەرگاوانەکەش و لە کارەکەرەکەشم پرسی ئایا دوێشە و ناستاسیا فیلیپوڤنا لێرە بووە... کەواتە دەزانن کە بۆ ئێرە هاتووە.

– دەزانم. بە پاڤنوتیڤای کارەکەرم گوت کە ناستاسیا فیلیپوڤنا، دوێنێ بۆ دە دەقیقەیەک هاتە ئێرە و پاشان بۆ پاڤلوڤسک گەڕاوەتەوە. کەس نازانێ کە شەوێ لێرە ماوەتەوە. دوێنێ وەکو چۆن ئەمڕۆ بەدزییەوە دەگەڵ تۆدا وەژوورکەوتم، بەو ئاوایە دەگەڵ ئەوشدا وەژوورکەوتم. لە ڕێگادا وام خەیاڵ دەکرد کە ڕەنگە نەیەوێ بەدزییەوەوەژوور بکەوێ، بەلام وا دەرنەچوو! مەزەندەکەم دروست دەرنەچوو! بەچپە قسەی دەکرد، لەسەر نووکی پێ دەڕۆیشت، داوێنی کراسەکەی هەڵدەکرد، تا خشە خش نەکات، تەنانەت لە سەر قالدرمەکان بە قامکان ئاماژەی کردمێ کە بێدەنگ بم... هێشتا لە تۆ دەترسا، کە لە قیتارەکەدا بووین ترسەکەی لەوەدا نەبوو، چیوای نەمابوو شێت بێت. خۆی داوای کرد کە شەوێ لێرە بمێنێتەوە. من هەوەڵ جار وام دانابوو بیبەم بۆ ماڵی بێوەژنەکەی مامۆستا، بەلام بە قسەی نەکردم. گوتی: "ئەگەر بۆ ئەوێندەر بچم سارەزی میرزادە دەگاتە سەرم و دەمدۆزێتەوە. لە ماڵەکەی خۆتا بمشارەوە، سبەینێ لەگەڵ گەردی بەیانیدا بۆ مۆسکۆ سەرهەڵدەگرم! " بەنیاز بوو لە مۆسکۆوە بۆ ئۆریل "orel"بڕوات. تا ئەو کاتەی چووە ناو جێگاشەوە هەر دەیگوت و دەیگوتەوە سبەی دەڕۆین بۆ ئۆریل...

– دەقیقەیەک جا ئێستا بەتەمای چ بکەی پارفیون؟

– من، جارێ خەمی تۆمە! لەم لەرزینەت دەترسم! ئەمشەو پێکەوە لێرە دەبین. تەنیا ئەو تەختە خەوەم هەیە، بەلام پشتیەکانی سەر هەر دوو قەنەفەکە دەبەین، لەسەر ئەرزەکە، لە نزیکی پەردەکە ڕایان دەخەین و هەر دووکیان بە تەنیشت یەکەوە لە سەریان دەنووین. ئەگەر هاتن و ژوورەکە گەڕان، دۆزییانەوە، هەنگێ پرسیار لە من دەکەن، دەڵێم ئەمە کاری منەو،

یەکسەر دەمبەن، بەڵام جارێ با لێرە، لە نزیکی ئێمە، تۆ و من بخەوێ!...

میرزادە، بە خۆشی و گەرموگوڕییەوە گوتی: - باشە، باش!

- کەواتە هیچ ناڵێین و نایەڵین کەس بیبات.

میرزادە گوتی: - نا، بە هیچ جۆرێ! نا، نا! ..

- منیش وام نیاز بوو کوڕی باش... نەیەڵم بیبەن! ئیدی ئەمشەو تا بە یانی خۆمان مات دەکەین. من بە درێژایی ئەمڕۆ بەدیاریەوە بووم، لای بەیانیەکەی بۆ ماوەی سەعاتێک چوومە دەرێ، دانی ئێوارەش چوومە دەرێ تا تۆ بدۆزمەوە و بۆ ئێرەت بێنم، بەڵام من لە یەک شت دەترسم: دەترسم جەنازەکە، بە هۆی ئەم گەرما بەترەفەوە بۆن بکات. تۆ بۆنی هیچ دەکەیت؟

- دەشێت. نازانم، بەڵام تا بەیانی بۆن دەکات.

- لە مشەماوەم پێچاوە، مشەمایەکی ئەمریکی زۆر نایاب، چەرچەفێکیشم بەسەریا داوە. چوار شووشە بۆن بڕەی جیدانوڤم بە کراوەیی لە دەوری داناوە، شووشەکان هێشتا لەوێن..

- بەڵێ... وەکو ئەوەی لەوێ کردیان... لە مۆسکۆ..

- بۆ ئەوەی بۆن نەکا برادەر. خۆزیا دەتبینی چۆن ڕاکشاوە!... سبەی کە هەتاو هەڵهات، دنیا ڕووناک بووەوە، تەمەشایەکی بکە..

ڕوگوژین لێرەدا کە بینی میرزادە وەکو بیی ناو ئاو دەلەرزێ و ناتوانێ هەستێ و خۆی بە پێوە بگرێت، بە نیگەرانی و سەرسامی پرسی:

- چییە؟ ناتوانی هەستیت؟

میرزادە گوتی: - لاقم لە دووم نایەن... هیی ترسە.. دەزانم... کە ترسەکەم ڕەوییەوە هەنگێ دەتوانم هەستم..

- سەیرکە... با جێگاکەمان چاک بکەم، ئیدی بۆ خۆت پاڵ بکەوە... منیش لای تۆوە پاڵدەکەوم... هەنگێ بۆ خۆ گوێ هەڵدەخەین... چونکە من برادەری ئازیز.. نازانم.. برای ئازیز.. هێشتا هەموو شتێک نازانم... بۆیە ئاگادارت دەکەم... تا پێشوەختە هەموو شتێک بزانیت..

ڕوگوژین، بەدەم ئەو قسنە بێ سەروبەرو پچڕ پچڕانەوە کەوتە

چاککردن و ڕاخستنی جێگا. دیار بوو، کە لە بەیانی زووەوە بیری لەوە کردبووەوە کە چۆن و بەچی جێگەی نووستن فەراهەم بکات. دوێشە و لە سەر قەنەفەکە نوستبوو، بەڵام قەنەفەکەی جێی دوو کەسی لە سەر نەدەبووەوە و ئەویش سوور بوو لەسەر ئەوەی کە لەتەنیشت یەکەوە بنوون. بۆیە هەر هەموو پشتی و گۆشەکانی سەر هەر دوو قەنەفەکەی بە ڕاکێش ڕاکێش لەم سەری ژوورەکەوە بۆ ئەو سەری ژوورەکە برد، لەتەنیشت پەردەکەوە جێگایەکی فەراهەم کرد. بەهەرحاڵێ بوو، جێگەی تەرتیب کرد، ئەوسا چوو بەلای میرزادەوە، بە ئارامی و دلۆڤانی چووە ژێر باڵی و هەڵی ساندو گەیاندییە سەر جێگاکە. کە سەیری کرد میرزادە دەتوانێ بەپێی خۆی بڕوات. لە دڵی خۆیدا گوتی: "کەواتە ترسەکەی ڕەویوەتەوە"، بەڵام میرزادە هێشتا هەر دەلەرزی.

ڕوگوژین، میرزادەی لە دەستە ڕاستەوە، لەسەر جێگە باشەکە، پاڵخست. بە خۆیشی هەر بە جلەکانی بەرییەوە، لە دەستە ڕاستەوە، پاڵکەوت و هەر دوو دەستی تێک پەڕاندو نانیە ژێر سەری. لەپڕ کەوتەوە قسان و گوتی:

- دنیا گەرمە، بێگومان بۆن دەکا... بەڵام دەترسم پەنجەرەکان بکەمەوە. لە دیوەکەی دایکم گوڵدانی پڕ لە گوڵی هەمە جۆر هەن، زۆر بۆنیان خۆشە. بیرم لەوە کردەوە کە بۆ ئێرەیان بێنم، بەڵام ئەو پیرەژنە، پافنوتیفنا، هەستی پێ دەکات، زۆر فزوڵ و کونجکاوە.

میرزادە بۆی سەلماند: - بە ڕاستی وایە، زۆر فزوڵە.

- دەکرا، چەند چەپکە گوڵێک بکڕین و بە چواردەوریا دای بنەین،، بەڵام ڕەنگە پیاو بەو هەمو گوڵەوە و بەم حاڵەوە، زۆر خەمبار بێ و تەحەمولی ئەو دیمەنە نەکات!...

میرزادە گوتی: - پێم بڵێ...

هەنگێ میرزادە،وڕوکاس، وەکو یەکێک لە زەینی خۆیا بۆ پرسیارێک بگەڕێ و بیری نەکەوێتەوە یان بیری بکەوێتەوە و یەکسەر بیری بچێتەوە، لە سەری ڕۆیشت:

- پێم بڵێ... بە چی ئەم کارەت کرد؟ بە چەقۆ؟ بە هەمان چەقۆ؟
- بەڵێ، بە هەمان چەقۆ.
- سەیرکە! پارفیون دەمەوێ شتێکی دیکەت لێبپرسم... پرسیارم زۆرن... دەربارەی هەموو شتێ... بەڵام لە پێش هەموو شتێکا پێم بڵێ با بزانم: ئایا بەتەمابووی، بەر لە زەماوەندی دەگەڵ منا، یانی بەر لە ڕێوەڕەسمی فەرمی، لەبەردەم کڵێساکەدا بەر چەقۆی بدەیت و بیکوژیت؟ بەتەمای شتی وا هەبووی یان نا؟

ڕوگوژین، بە سەرسامی و تورەیی، وەکو ئەوەی باش لە پرسیارەکەی حاڵی نەبووبێ، گوتی:

- نازانم بەتەما بووم یان نا...
- کە دەهاتی بۆ پاڤلوفسک قەت چەقۆت دەگەڵ خۆ دێنا؟
- نەخێر، قەت.

دوای سووکە بێدەنگییەک لە سەری ڕۆیشت:

- سەبارەت بەم چەقۆیە، لیون نیکولایوفیچ، تاقە شتێک کە بتوانم پێتی بڵێم ئەمەیە: ئەم بە یانیە لە چەکمەجەیەکی کلیلدراوم دەرهێنا، چونکە هەموو شتێک لەنێوان سەعات سێ و چواردا ڕووی دا. من هەمیشە لە توێی کتێبی... و.. و... دام دەنا. جا با شتێکی سەیرت بۆ بگێڕمەوە: چەقۆکەم کرد بە ژێر مەمکی چەپیا، هەر حەوت سانتیمەترێک ڕۆیشت... هەر ئەوەتا خوێنی لێهات هەر نیو کەوچک دەبوو کە بە سەر ژێر کراسەکەیدا ڕژا.. زیاتر نە دەبوو...

میرزادە، بەدەم هەڵچوونیکی ترسناکەوە لە جێی خۆی هەستاو گوتی:

- دەزانم... ئەمە دەزانم.. شتم لە بارەیەوە خوێندووەتەوە... پێی دەڵێن خوێنڕێژی ناوەوە... جاری وا ڕێک دەکەوێ تەنانەت یەک دڵۆپە خوێنیشی لێنەیەت.. ئەمە لەکاتێکا ڕوو دەدات، کە چەقۆکە یەکڕاست و ڕاستەوخۆ لە دڵ بدرێت...

ڕوگوژین، لەپڕ بە ترسەوە لە جێگەکەی خۆی دانیشت و گوتی: - وس! گوێت لێیە؟ گوێت لە دەنگێکە؟





میرزادە، کە دەیڕوانییە ڕوگوژین، بە هەمان ترس و دڵەڕاوکێی ئەوەوە گوتی: - نەخێر، گوێم لێ نییە! ..

- دەنگی پێیە! گوێت لێیە؟ لە ژووری میوانە...

بە جووتە گوێیان هەڵخست. میرزادە، بە متمانەوە، بەڵام بە دەنگێکی نزم گوتی:

- گوێم لە دەنگە!

- دەنگی پێ؟

- بەڵێ.

- باشە دەرگاکە کلیل بدەین؟

- بەڵێ...

- دەرگاکەیان لە ناوەوە شیش دا، دووبارە پاڵکەوتنەوە. بێدەنگییەکی دوورودرێژ باڵی بە سەراکێشان. میرزادە لەناکاوا، بە هەمان پەرێشانی و شپرزەییەوە، وەکو ئەوەی شتێکی بیرهاتبێتەوە و بترسێت دووبارە لە بیری بچێتەوە، لە سەرجێگەکەی ڕاپەڕی و گوتی:

- ئا... بەڵێ... دەمویست داوای وەرەقەکانت لێ بکەم! وەرەقی یاری.. دەیانگوت گوایە یاری وەرەقت دەگەڵ دەکرد.

ڕوگوژین، کەمێک لە فکران ڕاچوو و گوتی: - وایە.

میرزادە پرسی: - لەکوێیە.. ئەو وەرەقانە؟

ڕوگوژین، پاش بێدەنگییەکی زۆر گوتی: - لای منە... فەرموو...

بەدەم ئەو قسەیەوە، دەستەیەک وەرەقی پێچراوەی کۆنی لە گیرفانی دەرهێنا و بۆ میرزادەی درێژ کرد. میرزادە لێی وەرگرت. بە خۆیشی نەیدەزانی چی دەکات. هەستێکی پڕ خەم و پەژارە، چنگی نایە دڵی، دڵی دەگوشی. یەکسەر هەستی کرد، کە نەک هەر لەوساتەوە، بگرە لەمێژە هەرچی کردارو گوتاری هەبووە، غەڵەت بووە، بۆ نموونە ئەم وەرەقانەی کە هەنوکە بە دەستیەوەن و زۆری حەز دەکرد بە دەستیان بێنێ، لە ئێستا بە دواوە بە کەڵکی هیچ شتێکی ئەو نایەن، پولێکی قەڵب نایەنن، هەستاو بە داخ و کەسەرێکی بێ پایانەوە، دەستەکانی هەڵگلۆفتن. ڕوگوژین، بێ جووڵە

ڕاکشـابوو، لەوە نـەدەچـوو، ئـەم جووڵەیـەی میـرزادەی بینـی بێـت، بـەڵام چاوەکانی کرابوونەوە و لە تاریکییەکەدا کسکە کسک دەبریقانەوە. میـرزادە لـە سـەر کورسـییەک دانیشـت و نیگـای پـڕ ترسـی بڕییـە ڕوگـوژین. نیـو سەعاتێک بەو جۆرە تێپەڕی. لەپڕ ڕوگوژین بەدەم قاقای پێکەنینەوە، وەک بڵیی بیری چووبوو کە نابێ بەدەنگی بەرز قسە بکات، هاواری کرد:

– ئەو ئەفسـەرە... ئەو ئەفسـەرەت لـە بیـرە؟.. لـە بیرتـە لـە شـوێنی ئۆکستراکەدا چۆن بەبنا گوێیا کێشا؟ ها ها ها!... لە بیرتە؟ ئەدی خوێندکارە سوپایەکە... خوێندکاری کۆلیجی سوپایی... کە بازی دا..

میرزادە، بەدەم شەپۆلە ترسێکی تازەوە لە سەر کورسییەکە ڕاپەڕی. کە ڕوگوژین، لەپڕ هێور بووەوە، میرزادە بە سۆزەوە بەسەریا دانەوییەوە، لەلایەوە دانیشت، دڵی بە توندی لێی دەدا، هەناسـەی سوار بووبوو، چاوی بڕیە سەروسیمای ڕوگوژین و نیگای لێنەدەگواستەوە.

ڕوگوژین، سـەیری میـرزادەی نـەدەکرد، لەوە دەچوو میـرزادەی لـەبیر چـووبێ، بـەڵام میـرزادە بەدەم نیگـەرانی و چـاوەڕوانییەوە هـەر سـەیری دەکـرد. کـات بـە خێرایـی دەڕۆیشـت. دنیـا بەرەبـەرە ڕوونـاک دەبـووەوە. میـرزادە نـاو بـە نـاو، لـەپڕ دەکەوتەوڕێنـە، هـاواری دەکـرد، قاقـا پێدەکـەنی. میـرزادە هـەنگێ بـە ئـارامی، دەسـتە لەرزۆکـەکانی بەسـەرو قژو دەموچاویـا دێنا! و پەیتا پەیتا نەوازشتی دەکرد! هەر ئەوەندەی لە دەسـت دەهـات، لەوە زیـاتری پێنـەدەکرا. میـرزادە دیسـان لـەرزی لێهـاتەوە، لاقـەکانی لـەژێر یـا دەنووشـتانەوە. هەسـتێکی تـازە، زۆر تـازە دای بەسـەر دڵیـا، تووشـی نیگەرانییەکی بێ پایان بوو.

لەو کاتـەدا ڕۆژ بـووەوە. میـرزادە ئـەنجام لەسـەر جێگەکـەی ڕاکشـا. ماندوویـەتی و داخ و کەسـەر زەیفیـان لـێ سـەندبوو. دەموچـاوی خـۆی نـا بەدەموچاوی ڕەنگپەڕیووی بێ جووڵەی ڕوگوژینەوە. ڕوندوکی چاوەکانی، بەسـەر گۆناکـانی ڕوگوژینـدا هاتنـە خـوارێ، بەڵام لەوە دەچـوو هەسـت بـە فرمێسکەکانی خۆی بکات...

بەهـەرحاڵ، وەختایـەک دوای چەنـد سـەعاتێک دەرگـا شـکێنرا و خـەڵکی

وەژوورکەوتن، سەیریان کرد بکوژەکە، بەدەم وڕێنە و تاوە ئاگای لە دنیا نییـە. میـرزادە، لـە نزیکـی ئەوەوە، لەسـەر جێگەکـەی خـۆی، کـڕو کـپ دانیشتووە. هەر جارێ کە یارۆ هاواری کردبا، یان بکەوتبا وڕێنە، میرزادە بەپەلە دەگەیشتە سەری، بە دەستە لە ڕزۆکەکانی، سـەروقژ و دەموچاوی نەوازشـت دەکـرد، بـەڵام میـرزادە ئێسـتا، هـەر پرسـیارێکیان لێدەکرد لێـی تێنەدەگەیی، هیچ کەسێکی لەو خەڵکەی کە ڕژابوونە ژوورەوە و دەوریـان دابوو، نە دەناسییەوە. ئەگەر شنایدەر، لـەم کاتـەدا بە خۆی لە سویسراوە بهاتبایـە تـا کۆنـە نەخۆشـەکەی جـارانی خـۆی معایەنـە بکـات، یەکسـەر ئەو حاڵەی بیردەکەوتەوە کە نەخۆشـەکەی لـە ساڵی یەکـەمی معالەجـەکردنی لـە سویسرا، تیای بوو، لە نائومێدیدا دەستی لێک بڵاو دەکردەوە و وەکو چۆن ئەوسا گوتبووی، ئێستاش دەیگوتەوە: "گەمژەیە! ".

## فەسڵی دوازدەیەم

### کۆتایی

بێوەژنەکەی مامۆستا، هەر کە گەیشتە پاڤلوفسک، خێرا ڕۆیی بۆ ماڵی داریا ئەلکسیڤنا. هەر چییەکی دەزانی بۆی هەڵڕشت، ئیدی بەمە ترسێکی وای کەوتە دڵەوە بە هیچ شتێ ئارام نە دەبووەوە. هەر دوو ئافرەت، لێبڕان یەکسەر بچن بۆ لای لیبدیف، لیبدیف، چ وەکو دۆست و چ وەکو خاوەنی ئەو خانووەی بە میرزادەی بە کرێ دابوو، زۆر نیگەران بوو. ڤیرا لیبدیف، هەر چییەکی دەزانی پێی گوتن. ئیدی (بە تەگبیری لیبدیف) وایان بە باشزانی کە بە سێ قۆڵی بڕۆن بۆ پترسبورگ تا نەیەڵن "ئەوەی لێی دەترسان ڕوو بدات". بەو جۆرە بۆ سبەی، دانی بەیانی، سەعات یازدە، پۆلیس، دەگەڵ لیبدیف و خانمەکان و سیمون سیمنوفیچی برای ڕوگوژیندا، کە لە بەشێکی تری هەمان خانوو دەژیا، هاتن و پۆلیس دەرگای ماڵەکەی ڕوگوژینی کردەوە. ئەوەی زیاتر هانی دان کە دەرگا بشکێنن، ئەوە بوو کە کابرای دەرگاوان گەواهی دا گوایە دوێشە و پارفیون سیمونوفیچی دیتووە، بە دزییەوە، بە ماتە مات، گورگ ئاسا، دەگەڵ هاوڕێیەکیدا، لە دەرگای پێشەوە، لە قاڵدرمەکانی بەر دەرگاکەوە چوونەتە ژوورەوە. ئیدی ئەمە بیانوویەکی باش بوو، دوای ئەوەی زۆریان لە دەرگا داو نەکرایەوە، دەرگا بشکێنن و خۆ بە ژوورابکەن.

ڕوگوژین، تووشی هەوی مێشک بووبوو، بۆ ماوەی دوو دانە مانگ لە

نەخۆشخانە خەوێنرا. کە چاک بووەوە یەکسەر درایە دادگاو بە تاوانی قەتڵ دادگایی کرا. لە لێکۆڵینەوە و تاقیقدا قسە و ئیفادەکانی زۆر ڕاست و دروست و قەناعەتبەخش بوون، میرزادە هەر لە سەرەتاوە لە کەیسەکە دەرکراو تەبرێ بوو. ڕوگوژین، بە درێژایی دادگایەکە زۆر مات و بێدەنگ بوو. پارێزەرێکی یەجگار کارامە و زەبەردەست و دەماوەرو قسەزان بەرگری لێدەکرد. ئەم پارێزەرە، بە بەڵگەی لۆژیکییەوە سەلماندی کە ئەم تاوانە زادە و بەرەنجامی هەوی مێشکە کە زۆر لە پێش ئەنجامدانی تاوانەکەدا لای ڕوگوژین هەبووە، ئەو نەخۆشیەش زادەی خەم و پەژارەی پەنگ خواردووی دڵی تاوانبارو گوشاری لەڕادەبەدەری دەروونی بووە، ڕوگوژین هیچ ناڕەزاییەکی دەربارەی ئەو قسانەی پارێزەرەکەی دەرنەبڕی، بەڵام هیچ قسەیەکیشی بە قازانجی ئەو مەرافەعەیە نەکرد. تەنیا شتێ کە کردی (وەکو لە تەحقیقەکەدا کردی) ئەوە بوو کە بە ڕوونی و ڕەوانی، هەموو وردەکاریەکانی تاوانەکەی خۆی بێپێچوپەنا خستە بەردەست.

سەرەنجام، دوای مداراکردنی باری دەروونی و نەخۆشی، حوکمەکەی بۆ سووک کرا، حوکمی پازدە دانە ساڵ بێگارە زندانی بۆ بڕایەوە و هەواڵەی سیبریا کرا. زۆر بە خەمساردی و حەواس پەرتی وەکو یەکێک خەون بدینێ، قەراری مەحکومیەتەکەی وەرگرت. ئیدی هەمو سەروەت و سامانە مۆڵەکەی، جگە لە بەشێکی کەمی، کە لەو دواییانەدا، لە سەرسەریاتیدا بەفیڕۆی دابوو، هەر هەمووی بۆ سیمیون سیمونوفیچی برای مایەوە، کە زۆر خۆشحاڵی کرد.

دایکە پیرەکەی هێشتا ماوە، لەوە دەچێ ناو بە ناو، کوڕە ئازیزەکەی، پارفیون سیمیونوفیچی، بیربکەوێتەوە، بەڵام بیرکەوتنەوەیەکی گونگ و ئاڵۆز. خوا بەوە ڕەحمی لەم پیرەژنە کردووە، کە هیچ شتێکی دەربارەی ئەو کارەسات و نەگبەتیە نە دەزانی کە لە ماڵەکەیا ڕووی دا بوو.

لیبدیف و کیللەر و گانیا و پتیتسن و گەلێک لە قارەمانەکانی دیکەی ڕۆمانەکەمان، وەکو جاران بۆ خۆ دەژین، گۆڕانێکی ئەوتۆیان بە سەر نە

هاتووە، بۆیە هیچی وامان لە بارەیانەوە پێ نییە کە بیگێڕینەوە. هیپولیت بەوپەڕی دەردو ئازار و پەرێشانیەوە، بە ماوەیەکی کەم بەر لەو کاتەی چاوەڕوانی بوو، نزیکەی دوو هەفتە دوای کوژرانی ناستاسیا فیلیپوڤنا، مرد. هەر هەموو ئەم واریقات و ڕووداوانە زۆریان کار لە کولیا کرد. زۆر لە دایکی نزیک بووەوە. نینا ئەلکسندروفنا، زۆر نیگەرانی ئەوە، هەست دەکات کولیا، لە چاو تەمەنی خۆیا، وەکو پیاوێکی گەورە بیردەکاتەوە. کێ دەزانێ؟ ڕەنگە لە ئاییندەدا ببێ بە پیاوێکی گەورە. پێویستە لەم بۆنەیەدا ئەوەش بڵێین کە هەر ئەو بوو دەورێکی جوانی بینی و زەمینەی بۆ ئاییندەی میرزادە خۆشکرد. کولیا، لەنێو ئەو کەسانەدا کە لەو دواییانەدا ناسی بوونی، یەڤگینی پاڤلوفیچ ڕادوفسکیی لە هەموو ئەوانی دی پتر بە دڵ بوو. کولیا یەکەم کەس بوو کە چوو بۆ لای ئەو و هەرچییەکی دەربارەی ڕوداوەکە و وەزع و حاڵی ئێستای میرزادە دەزانی، بە درێژی بۆ گێڕا بووەوە. مەزەندەکەی کولیا ڕاست دەرچوو: یەڤگینی پاڤلوفیچ، بە ڕاستی لە خەمی ئاییندەی ئەم "دێوانە" بەلەنگازەدا بوو، بە هەوڵ و هیمەتی ئەو، جارێکی دی میرزادە بۆ دام و دەزگاکەی دکتۆر شنایدەر، لە سویسرا، نێردرایەوە.

یەڤگینی پاڤلوفیچ، بە خۆیشی بەو نیازەی ماوەیەکی زۆر لە ئەوروپا بمێنێتەوە، سەفەری هەندەرانی کرد، چونکە بە ڕاستی قەناعەتی وابوو کە "بوونی لە ڕووسیادا زیادە و ڕووسیا پێویستی بەو نییە.". زۆر جار، بەلای کەمەوە هەرچەند مانگ جارێک، دەچوو بۆ دەزگاکەی شنایدەر و سەردانی دۆستە نەخۆشەکەی خۆی دەکرد، بەڵام شنایدەر جار لە دوای جار، نائومێدتر و خەمبارتر دەهاتە بەرچاو، سەری دەلەقاندو میوانەکەی تێدەگەیاند، کە مێشکی نەخۆشەکەی بە تەواوەتی تێکچووە، هەرچەندە بە ئاشکراو بە زەقی نەیدەگوت کە قابیلی چاک بوونەوە نییە، بەڵام ئەوەشی نە دەشاردەوە کە بە ڕەشبینی و نائومێدی باسی ئەسپەک و ماخولیاکەی بکات. یەڤگینی پاڤلوفیچ بەو قسانە خەمبار دەبوو، پیاوێکی هەستیار و دلۆڤان بوو، هەر بەوەدا دیار بوو، کە ڕێگەی دابوو کولیا نامەی بۆ بنێرێت

و هەندێ جار وەڵامی نامەکانیشی دەدایەوە.

هەر لەم بۆنەیەدا خەسڵەتێکی دیکەشی کەشف بووبوو. جا چونکە ئەم خەسڵەتە لە خەسڵەتە باشەکانە، بە پێویستی دەزانین بە خێرایی باسی بکەین. یەڤگینی پاڤلوفیچ، دوای هەر سەردانێکی بۆ دەزگاکەی شنایدەر، جگە لە نووسینی نامە بۆ کولیا، نامەی بۆ کەسێکی دیکەش لە پترسبۆرگ دەنارد، کە بە دووروودرێژی و بەوپەڕی هاوخەمی و هاوسۆزییەوە، باسی میرزادە و نەخۆشییەکەی بۆ دەکرد. لەم نامانەدا، سەرباری هەموو ڕێز و حورمەتێک (بە ئازادیەکی زۆرەوە) گوزارشتی لە هەندێ بیرو هەست و سۆزی ڕاستگۆیانەی خۆی دەکرد. شتێک بوو زیاتر لە دۆستایەتی و خۆشەویستییەکی گەرم دەچوو. ئەو کەسەی یەڤگینی پاڤلوفیچ، ئەم نامانەی (هەرچەندە کەم و درەنگ درەنگ بوون) بۆ دەنارد و شایستەی ئەم هەموو ڕێزو حورمەتە بوو، ڤیرا لیبدیف بوو. هەڵبەتە بە تەواوەتی نازانین کە ئەم پەیوەندیانە چۆن دروست بوو، بەڵام بێگومان یەکێک لە سەرچاوەکانی ئەم پەیوەندییە ئەو کارەساتە بوو کە بە سەر میرزادەدا هات و، ڤیرای بە ڕادەیەک خەمبار و نیگەران کرد، کە لە سوێیا نەخۆش کەوت و لە جێدا کەوت. لەوە بترازێ ئیدی نازانین ئەو پەیوەندی و دۆستایەتییە چۆنی دروست بوو.

بۆیە باسی ئەو نامانەمان هێنایە گۆڕێ، چونکە لە هەندێکیاندا باسی ماڵباتی یەپانچین بەگشتی و ئاگلایا بە تایبەتی، هاتووە. یەڤگینی پاڤلوفیچ، لە نامەیەکیا سەبارەت بە ئاگلایا، کە نامەیەکی هەندێ ئاڵۆز و بەتەمومژ بوو و، لە پاریسەوە ناردبووی، باسی ئەوە دەکات کە ئاگلایا ئیڤانوڤنا، دوای عەشق و دڵدارییەکی توند و کوتو پڕ، بەبێ ڕەزامەندی کەسوکارەکەی شوو بە کۆنتێکی پۆلاندی موهاجیر دەکات و کەسوکارەکەی تەنیا لە بەر ئەوە قایل دەبن، نەبا ئاگلایا فەزیحەت و ڕیسواییەکی گەورەیان بەسەرا بێنێ. یەڤگینی پاڤلوفیچ، دوای بێدەنگییەکی شەش مانگە، نامەیەکی دووروودرێژی بۆ ڤیرا نارد، لە نامەکەیدا باسی ئەوەی بۆ کردبوو، کە لە کاتی دوا سەردانی لە پرۆفیسۆر شنایدەر لە

سویسرا، هەموو خانەوادەی یەپانچین (جگە لە ئیڤان فیدوروفیچ کە بە هۆی کارەوە لە پترسبۆرگ مابووەوە) ومیرزادە (س...)ی لەوێ بینیووە. جا دیدارێکی سەیر: زۆر بە گەرمی و خۆشی پێشوازیان کردووە، تەنانەت ئادیلاید و ئەلکسندرا زۆریان ستاییش کردووە کە "فریشتە ئاسا خەمی میرزادەی داماوی خواردووە"و لەو ڕووەوە خۆیان بە قەرزاربار و منەتباری ئەو زانیوە، بەڵام لیزاڤیتا پروکوفیڤنا کە میرزادەی بەو حاڵی بێ حالەوە، بەو نەخۆشی و کەساسیەوە بینی. لەناخەوە هاتە جۆش، خۆی پێ زەوت نەکراو لە کانگای دڵەوە دەستی بە گریان کرد. دیار بوو هیچ ڕقێکی بەرانبەر ی نەما، دڵی بە تەواوەتی لێی پاک بووەوە. میرزادە "س.." بەو بۆنەیەوە کۆمەڵێک قسەی هەق و ڕاستگۆیانەی پڕ لە هەست و سۆزی جوانی کرد. یەڤگێنی پاڤلوفیچ، هەستی کرد کە میرزادە (س...)و ئادیلاید هێشتا بە تەواوەتی ڕێک نەکەوتوون و نەسازاون، بەڵام لە هەمان کاتدا، وێنای دەکرد کە ڕۆژێ دێ، ئەم ئادیلایدە هارو هاجە، خۆ بە خۆ، لە ناخی دڵەوە، مل بۆ زیرەکی و هۆشنی و ئەزموونداری میرزادە (س..) دەدات و دەگەڵیا ڕێک دەکەوێت و دەسازێت. ئەمە جگە لەوەی کە ئەو مەینەتیانەی بە سەر ماڵباتەکەیاندا هاتبوو، زۆریان کارتێکردبوو و عیبرەتێکی زۆری لێوەرگرتبوون، بە تایبەتی ئەو ریسک و سەرکێشییەی کە ئاگلایا دەگەڵ کۆنتە پۆڵاندیە موهاجیرەکەدا کردبووی. ئەوەی کە ماڵباتی یەپانچین، لەم شووکردنەی ئاگلایا بەو کۆنتە پولاندیە، لێی دەترسان، لە ماوەی شەش مانگدا دەرکەوت، ئەمە جگە لە موفاجەئەیەکی دیکەش کە کەس تەسەوری نەدەکرد. دەر کەوت کە ئەم کابرایە نە "کۆنتە"و نە "کۆنت بووە"، دەربەدەری و موهاجیریەکەشی بە هۆی هەندێ کاری ئاڵۆز و گومان لێکراوەوە بووە. ئیدی بە زمانی لووس، ئاگلایای لە خشتە برد بوو و وای تێگەیاند بوو، کە پیاوێکی خانەدان و خەمخۆر و دڵتەنگ و دڵڕێشی نیشتمانەکەیەتی، ئیدی بە ڕادەیەک، ئەم کیژەی کۆنترۆڵ کردبوو، کە تەنانەت بەرلەوەی شوویشی پێ بکات، بووبوو بە ئەندامی کۆمیتەی هەندەرانی سەربەخۆیی پۆڵاندە. ئەمە جگە لەوەی کە بووبوو بە موریدی

قەشەیەکی ناوداری کاتولیکی، کە مێشکی پڕ کردبوو، لە توندڕەوی ئایینی، بەڵام ئەو سەروەت و سامانە زۆرەی کە گوایە "کۆنت" هەی بوو، بە بڵگە بۆ لیزاڤیتا پروکوفیڤنا و میرزادە"س..." دەر کەوت کە قەت ڕۆژێ لە ڕۆژان شتی وا نەبووە و نییە، هەر هەمووی خەیاڵ بوو. لەوەش خراتر ئەوە بوو کە کۆنت و هاوڕێ قەشە بە ناوبانگەکەی، توانیان دوای شەش مانگ لە گواستنەوەی ئاگلایا، بە ینی ئاگلایا و کەسوکارەکەی بە تەواوەتی تێکبدەن، وایان لێهاتبوو بەچەندین مانگ یەکتریان نەدەبینی!... بە کورتیەکەی، دەردە دڵێکی زۆریان هەبوو، بەڵام لیزاڤیتا پروکوفیڤنا و هەر دوو کچەکەی و تەنانەت میرزادە "س..."ش بە ڕادەیەک مارانگاز بووبوون، تەنانەت لە قسەکردنا زۆر شتیان لە یەڤگینی پاڤلوفیچش دەشاردەوە، هەرچەندە سوور دەیانزانی کە یەڤگینی ئاگای لە دوا حەماقەتەکانی ئاگلایا ئیڤونوڤنا هەیە و دەیزانی گەیشتووەتە کوێ. لیزاڤیتا پروکوفیڤنای بەلەنگاز خوا خوای بوو بە زووترین کات بۆ ماڵ و وڵاتەکەی، ڕووسیا بگەڕێتەوە. بە گوتەی یەڤگینی پاڤلوفیچ، زۆر بە توندی ئیرادی لە هەر شتێکی هەندەران دەگرت. دەیگوت: "لێرە، لە هیچ شوێنێ نازانن، نانیش ببرژێنن، زستانان وەکو مشک دەچنە کونەوە. بەلای کەمەوە ئێستا توانیم وەکو ڕوسێک بۆ ئەم گەنجە کڵۆڵە بگریم". بەدەم ئەو قسانەوە، بە داخ و کەسەرێکی زۆرەوە ئاماژەی بۆ میرزادە کرد، کە ئەوی نە ناسی بووەوە. ئەوجا لە کاتی خواحافیزی لە یەڤگینی پاڤلوفیچ، بە تووڕەییەوە گوتی: "ئیدی ئەم وەهم و خەیاڵاتە بەسە! کاتی ئەوە هاتووە گوێ لە دەنگی ئەقڵ بگرین! هەر هەموو ئەم وڵاتە بیانیانە، ئەم ئەوروپایەی کە ئێوە پێیا هەڵدەڵێن، هەر هەمووی سەرابە، تراویلکەیە.. ئێمە بە خۆیشمان لە وڵاتی غەریبیدا جگە لە تراویلکە ناکەینە هیچ... ئەم قسەیەی منت لەبیربێ.. کەسێ نەمرێ بە چاوی خۆت دەیبینی! "

تێبینی: ڕۆژی سێشەممە ٢٠١٤/٣/١١ لە پاچڤەی ئەم ڕۆمانە بوومەوە کە لەم دوو دەقەی خوارەوە، بە شێوەیەکی بەراوردکارییانە پاچڤەم کردووە، جا ئەگەر ئەمە بووبێتە هۆی ئەوەی هەندێ دەستەواژە و ڕستە و پەرەگرافی دەقە کوردییەکە لە ڕواڵەت و شێوەدا تەواو دەگەڵ سەرچاوەی یەکەمدا تێک نەکاتەوە، ئەوا لەگەڵ دەقی دووەمدا تەواو تێک دەکاتەوە و دیارە پێچەوانەش پێچەوانەیە. هەڵبەتە بەدڵنیاییەوە دەقە کوردییەکە هیچی لەو دوو دەقەی دی کەمتر نییە و بێ چەند و چوون ڕووی مەجلیسی دەقانی هەیە.

* - دوستویفسکی: الاعمال الادبیه الکامله- ١٨ مجلدا ترجمها عن الفرنسییه: د. سامی الدروبی

الگبعه العربیه الپانیه: دار ابن ڕشد للگباعەوالنشر.

نتورک- ایگالیا ١٩٨٥/ مجلد "١٠-١١"

* - ابله: جلد (١،٢)

نوسینده: فیودور میخائیلوویچ داستایوفسکی/مترجم: منو چهر بیگدلی خمسه./چاپ دوم: ١٣٨٩/ نیگارستان کتاب/ تهران



گەمژە

**فەرهەنگۆک**

ئا

ئەداو ئەتوار: ڕەوشت و ئاکار

ئارایشتکار: ئارایشتگەر، مکیاجکار

ئەوک: قورگ، گەروو، بەرمل

ئاسیو: ئازار، بەڵا، زیان، زەرەر

ئاشخانە: مووبەق، چێشتخانە

ئەنگۆ: ئێوە، هەوە، هون

ئەگەرنا: دەنا، ئەگینا، ئەگین، گەرنا

ئێژی: دەڵێی

ئەفسووناوی: سیحراوی، جادوویی

ئیکلام: کڕنۆش، سەرچەماندن بۆ ڕێزگرتن

ئامێز: باوەش، هەمێز

ئەزبەنی: گەورەم، قوبان

ئاران: گەرمەسێر، گەرمیان، زستانەوار

ئۆین: پیلان، دەسیسە، فێڵ و مەکر

ئۆینباز: بەمەکرو فێڵباز، پیلانگێڕ

ئێشک: پاس، کێشک

ئاکنجی: نیشتەجێ

ئالوودە: گیرۆدە، خووپێگرتوو

ئاوەز: هۆش، فام، ئەقڵ

ئاشپەز: شیوکەر، چێشت لێنەر، چێشتچی

ئەنگێزە: هۆ، هاندەر، سۆنگە

ئەستەم: زەحمەت، ئاسێ، دژوار

ئەسەح: ئەکید، خویا، مەعلووم

ئیرەیی: حەسوودی

ئەستێڵ: حەوز





ئیستەرەم: دەمەوێ

ئەستەڕ: بەر، بەری کەواو...

ئاپۆڕا: حەشامات، قەرەباڵغی، حەشیمەت

ئاشووب: پەشێوی و ئاژاوە

ئەوزار: ئامراز، ئامێر، وەسیلە

ئاغەڵ: جێی داکردنی مەڕو بزن لە دەمی سەرمادا

ئەسکەمیل: کورسی

ئاوەز: ئەقڵ

ئاخێز: نیوە هەستان

ئەوقات: پارێزەر

ئۆل: ئایین

ئاریشە: کێشە، گرفت

ئاودڕکە: ئاودڕ، ئەو شوێنەی ئاو دای دڕیبێ

ئاڵچاخ و دەنی: سووک و بێئابڕوو، خوێڕی

ئاوردوو: سووتەمەنی، شەواتەک، ئێزنگ وقەڵاشکەری

ئەرخایەن: دڵنیا، خاترجەم

ئۆفیس: نووسینگە، ژووری کار

ئاخاوتن: قسەکردن، پەیڤین

ئیش: کار

ئاوەژوو: بەرەواژ، سەروخوار، پێچەوانە

ئێزنگ: داری سووتاندن

ئاشچی: چێشتلێنەر، ئاشپەز

ئاوێزە: چلچرا،پلپلە و سڵسڵەی خشڵی ژنان

ئاوارتە: ڕیزپەڕ، جیاکراوە، دوورخراوە، پەڕێنراو

ئەمەک: وەفا، ئەمەگ، نمەکناسی

ئیفترا: بوختان

ئەزبەرکردن: لەبەرکردن

ئەشقی: شەقاوە، بەرەڵا، یاخی، ملهوڕ
ئەرباب: خۆش مەشرەف، ڕووخۆش، خۆش مامەڵە
ئاچەر: هاچەر، کلیل
ئاڵدۆزی: ڕۆکێشی زێڕو زیوو، سورمە ڕێژ، سورمە چن
ئۆردووبەز: جێگەی دابەزین و ئسراحەتی لەشک
ئەڵها: ئارەزوو، کەڵکەڵە.
ئەسپەک: نەخۆشییەکی مێشکە، ماخولیا و جۆرە شێتییەکە.
ب:
باوەژن: زڕدایک، هوی دایک، باجی
باب: باوک
باڵانما: باڵانوێن، ئاوێنەی باڵاڕوان
بەلەز: خێرا، بەپەلە، گورج
بایس: هۆ، باعیس، سەبەب
بلوور: شووشە
بێنەوا: هەژار، بێچارە، داماو
بە تۆبزی: بە زۆر، بە خورتی
بە ڕوحم: بەبەزەیی، دلۆڤان
برنجە: جۆرە کانزایەکە، زەردی سەماوەر(قصدیر)
بەلەنگاز: بێچارە، نەدار، بەسەزمان
بەرۆک: یاخە، یەخە
بەکاوەخۆ: بەهێواشی
بەرسڤ: وەڵام
بەڕک: گیرفان، باخەڵ
بالیفۆکە: سەرینی بچووک، گۆشە
بوری: تێپەڕی
بیلبتون: بە تەواوەتی
بەو ئاوایە: بەو جۆرە، بەو شێوەیە





باریە: لۆسە

بەستێن: ڕۆخ، کەنار، گوێ چەم، دەم چەم، ڕەخ

بێشە: دارستان، لێر

بەرکۆشە: بەرهەڵبێنە

بن پیاڵە: ژێر پیاڵە

بۆرەقنە: ئامال بۆر، مەیلەو بۆر، بۆرباو

بوێر: ئازا، دلێر

بێوەی: بێ زیان، سەلامەت

باڕ: بێچووە مەلی بەهارە

بێزوو: بێزگ، مەگیرانی

بێزگەوان: بێزووکەر

بەلانس: هاوسەنگی

بارتەقا: باتەقا، هەنبەر، بەرانبەر

باجەوان: باجگر

بە سوێ: بە ژان، بە ئازار

بەردەبار: پیاوی زاناو بە تەگبیر

بێدادی: نەهەقی

بەیتاڵ: پزیشکی ئاژەلان

بویەر: ڕووداو

باژێرۆک: شارۆچکە

باشار: دەربردن، خۆراگرتن

بەرایی: پێشایی، بەراهی

بەڵەد: شارەزا، ڕێزان، ڕێنوێن

بەفرە ژیلکە: بەفری زۆر دەنک ورد

بەلەک: پووز

بە خورتی: بە تۆپزی

بالیف: سەرین، پشتی



گەمژە

بەگەنکردن: پەسندکردن

باندۆر: کاریگەریی

بایس: هۆ،باعیس، سۆنگە

بەرخودان: مقاوەمەت

بارخانە: کەلوپەلی بازرگانی، باری لەسەر یەک هەڵچنراو

بەرجەوەن: دیمەن

بۆدڕ: بۆنی توندی ماسی و تەگە

بۆدراو: برژاو، خاوەبرژ

بەڵخ: بەڵغ، کەڕوو

باسریشک: بەفر و باران پێکەوە

بوخچە: پارچەیەکی چوارگۆشەیە بۆ کەلوپەلتێنان

بەدخوا: دڵپیس، لە چاکە بەدوور

بەعزکردن: تۆران. زیزبوون، قسەدابڕان

بن عام: خزمی دوور

بەگەن: پەسند

باپەڕ: نەخۆشی لە سەرماوە، سەرمابوون

بۆز: ڕدێنی ماشوبرنج، شینی ئامل سپی

بیژی: زۆڵ،حەرامزادە، شەیتان و وریا

بەتڵ: بەشێک

بوری: تێپەڕی

بادیهەوا: بە خۆڕایی، بەفیز و دەعیە

بزە: زەردەخەنە

بە خۆی نەوەستا: خۆی پێ زەوت نەکرا

بە خورتی: بە زۆر، بە تۆپزی

بنیچە: ڕەچەڵەک

بەور: دڕندەیەکی بە سامە

بالوکە: شتێکەوەک زیپکەو، زیپکەش نییە





بێ زات: بێ زاخ، ترسنۆک

بە غار: بە ڕاکردن

بڕێک: کەمێک، تۆزێک، هەندێک

بەدڕا: بیرخراپ، نیازخراپ

بژوێن: زەوی پڕ گیا و لەوەڕ، بژوون، زەمەند

باخفم: قسە بکەم.

پ:

پێشخزمەت: نۆکەری بەردەستان

پارک: باخ

پسمام: کوڕە مام، ئامۆزا

پواز: سنگێکە لە درزی داری قەڵشاوی دەنێن تا نەیەتەوە یەک

پۆڕ: باڵندەیەکی خۆش گۆشتە، لە مریشک گەورەترە

پێشکار: خزمەتکار

پەیڤ: وشە، وتە، قسە

پەز: مەڕ، مێگەلە مەڕ و بزن

پەری: فریشتە

پاژ: بەش

پرتەو: تیشک، ڕووناکی

پێکڤە: پێکەوە، بە هەڤڕا

پڕ: زۆر، تەژی

پۆستین: فەروە، کەوڵی تیسکن

پەژمردە: چەرمسی، ژاکاو

پایدۆس: دەست لە کار هەڵگرتن

پۆڵکە: گاگۆز

پەسیو: پەسیڤ، هەڵامەت

پیتاک: باربوو، کۆکردنەوەی دارایی

پێل: شەپۆل





پەسلان: قیامەت، ئەو دنیا

پاتاوە: پێڵاو، کاڵە.

پاتۆق: شوێنی کۆبوونەوە

پۆڕ: قژ

پێشداوەری: حوکمی پێشوەختە

پانکردنەوە: ماستاوساردکردنەوە، ڕووپامایی

پەشم: قسەی قۆڕ و بێمانا

پزیشکیار: یاریدەدەری پزیشک

پەتۆ: بەتانی

پەرکەم: فێ، خوودار، پەتا و هەڵامەت پێکەوە، ئەنفلۆنزا

پێشهات: قەومان، بەسەرهات

پشتیر: گەوڕ، تەویلە

پەتەڕی: پەتیارە، شێتۆکە

پرکێشی: پێداگری، سووربوون، جورئەتکردن

پاکەن: کەوش کەن، جێگەی پێڵاو داکەندن

پەیڤ: وشە

پسۆک: قرچۆک، بەنێک زوو بپسێت.

ت:

تەمەشاڤان: بینەر، سەیرکەر

تەماشاخانە: شانۆ، نمایشسەرا

تەژی: پڕ، لیپاو لیپ، سەر ڕێژ

تا: لا، لایەن

تێشت: نانی بەیانی، قاوەڵتی، بەرقلیان، تاشتی

تالووکە: مەترسی، خەتەر

تەبارە: دەغڵی گەیشتووی نەدوراو، قاییمە دەغڵ

تەژە و ناقۆڵا: گەورە و ناشیرین




تاین: یارۆ، فلان، ناڤبری

تاژی: سەگی ڕاو، تانجی

تەشقەڵە: گەڕ، بیانووپێگرتن

تەیرو تو: باڵندە و مەلان

تەوازۆ: تەوازی، عوزرخوایی، داوای بوردن

تخوب: سنوور، کەوشەن، تخووم

تەوێڵ: ناوچەوان، هەنیە، ئەنی، توێڵ، جەمین

تۆرینۆک: تووڕە و دڵناسک

تەختەبەن: تەختە خەو

تەقوو: بەڵکوو، هاتوو

تاقەتکردن: شاردنەوە، داکردن

تۆلاز: مێباز، چاولەوەڕێن

تیلمە: تیلماسک

تیلاگ: لاسەر

تاوەگاز: تاوانگاز، بە هەتاو سووتاو

تەڵفیزی: تەڵفیسی، تەوس، گاڵتەوگەپ

تەریدە: ڕێگر، چەتە

تورلەک: وەرینی مووی لەش

تۆسن: سەرکێش، نا ڕام

تەڤگەر: نەسرەوت، بزووتنەوە

تەمراندن: کوژاندنەوە

تاری: تاریک

تۆماکۆ: تووتن

تەشبریق: هەورە تریشقە، بروسکە

تووک: نزای خراپ، دووعای شەڕ

تاخ: گەڕەک

تاس: سەر ڕووتاوە، دەغسەر

تەرز: جۆر، نەوع
تەوسخەن: ژارخەن، پێکەنین بە تەوسەوە، پێکەنینی تەوسامێز
تاراوگە: مەنفا
تیز: تەوس، توانج، گاڵتەپێکردن
تامپۆن: دەعم، پێکدادان
تازەمۆد: نۆباو
تەشقی ئاسمان: بڵندایی ئاسمان
تەرە: تاراو، لە لانە تۆراو، ئاوارە
تەرزەکوت: تەرزەشکێن، درەخت یان زەرعاتێک تەرزە لێی دابێت.
تلیانە: قەرتاڵە، سەبەتە، سەبەتەی میوەچنی
ج:
جەگەن: گیایەکە لاسکی سێ سووچە لە زەلکاودا دەڕوێ
جنگن: شەڕانی، دڕ، نەگونجاو
جەلۆ: هەرزە پیاو، سەرسەری
جندەخانە: سۆزانی خانە، قەحپەخانە
جەڕباندن: تاقی کردنەوە، تەجرەبە کردن
جوڕنە: حەوزۆکەی گەرماو
جما: جوڵا، بزوا
جڤاکی: کۆمەڵایەتی
جوابی کرد: دەری کرد، ئیزنی دا
جمکانە: دووانە، جمک، لفانە
جەندەک: تەرم
جیازی: کەلوپەلی بووک بۆ ماڵی زاوا.
جنزەدە: کەسێک جنۆکە دەستیان لێوەشاندبێت
جوونێ: تاقمێک، دەستەیەک، کۆمەڵێک
جەوەندە: مەتارە، کوندەی بچووک بۆ ئاو تێدا هەڵگرتن، دێمکە
جوابە جەنگی: بە دەمدا هاتنەوە.





چ:

چەلەنگ: چوست و چالاک، گورج و گۆڵ، شۆخوشەنگ

چینی: جۆرێ سواڵەتی هەرەباشە، وەکو کاشی

چتۆ: چۆن، چلۆن، کوو

چڕین: وتن (بۆ گۆرانی و قام)

چێڵ: مانگا

چەنگ: ئامێرێکی موسیقایە، هارپ

چەکمە: جەزمە، پووت

چەمەنزار: مێرگ، مێرغوزار، سەوزەزار

چما: بۆچی، ئەڕا، لەبەرچی

چقڵ: دڕک، دڕو، دڕی

چەرچی: فرۆشیاری گەڕیدە، دەستفرۆش

چوغورد: چوغور، چغر، چڕ

چمک: سووچ، گۆشە

چوارنکال: هەرچوارلا

چێبوو: دروست بوو

چەمووش: سڵ، ڕەوەک، لەقەهاوێژ و گازگر

چەرموو: سپی

چەرچی: دێوەرە، فرۆشیاری گەرۆک، دەستفرۆش

چاوساغ: دەسکێش، جاسووس، سیخوڕ

چەلیپا: خاچ، سەلیب

چاوگ: دەستە چیلە

چوون: وەک،

چپەدوو: دووان بە چپە

چەقەن: زەوی تمتم، ڕەقەن.

ح:

حایرمان: سەرسامبوون

حەسار: حەوش

حەنەک: جەفەنگ،قسەی گاڵتەوگەپ

حەشەری: بەر بەتاو، ژنی بە ئاڵۆش

حەژمەت: مەینەت، خەفەت، کەسەر، داخ، خەم

حەجامات: خوێنبەردان

حەوجە: پێویست

حێڵ: گەورە، زۆر گەورە

خ:

خەنی لە خۆتان: خۆشی لە خۆتان

خشکۆک: دەلال، جوانکیلە، جوان، قەشەنگ

خەنەقاندن: خنکاندن، لەسێدارەدان

خوبزە: خوڵام، نۆکەر، خزمەتکار، خزمەتچی

خورجین: هەگبەی لە بەن، جانتای لە بەن، خورج

خا: خات، خاتوون، خانم، یا

خاپاندن: فریودان، تەفرەدان، خەڵەتاندن

خاپینۆک: فریبۆک، فێڵباز

خانەدان: نەجیمزادە، ئەسڵزادە

خودان: خێو، خاوەن، ساحێب

خوڵک: خوڵق

خۆرتی: بە تۆبزی، بە زۆری

خشت: ڕێک، بێ کەم و زیاد

خاکی: بێهەوا، بێفیز

خەرگە: پەڕۆی کۆن و پیس

خوابەختەکی: خۆ و بەخت، بە هەڵکەوت

خەبتین: خەباتکردن

خشکۆک: جوان، خشیک

خویا: ئاشکرا، دیار، ڕوون

خۆرانگاز: تاوە سووت، سووتاو لە بەر خۆر
خەفیە: جاسووس، خەوەرچین، هەواڵدز
خۆڵەکەوە: خۆڵەمێش
خەمرە: کوپەی زۆر گەورە
خەنۆل: خەندەران، دەم بە پێکەنین، ڕووخۆش
خزاگ: عەرەبانەیەک کە بەسەر بەفرا ڕایدەکێشن
خۆشکێنی: بێفیزی، خۆبەزلنەزان
خوو: فێ، پەرکەم
خۆبیوون: سەربەخۆیی
خڕ: هەموو، گشت، تێکڕا
خاترجەم: دڵنیا، ئەرخایەن
خوارنگە: خواردنگە، چێشتخانە
خاکرێز: قووڵکەیەک کە خاک و خۆڵی تێ فڕێ دەدرێ
خانەزا: نۆکەرێک کە لە ماڵی ئاغاکەی لەدایک دەبێ
خاترخوازی: خاترخازی، دووعاخوازی، خواحافیزی
د:
داماو: بێنەوا، بەلەنگاز، بێچارە
دەڤەر: ناوچە، ئاقار، شوێن، جێ
دێرکەوتن: دواکەوتن
دلپاقژ: دڵپاک، بێ فڕوفێڵ، بێ گزی
دەربار: دیوەخان و بارەگای پاشا
دەهری: زۆر توڕە
داگەڕان: هاتنەخوارەوە
دڵنەواز: دڵگیر، مایەی دڵخۆشی
دلۆڤان: بە بەزەیی، دڵنەرم، میرەبان
دیدەوانی: ئێشکگرتن (بە تایبەتی ئێشکی سەر قەڵات و بورجان)
داپیرە: دایە گەورە، نەنک

دەلیڤە: دەرفەت، هەل

درەخت: دار

دەرباریيان: دەستوپێوەندانی دیوەخان و بارەگای پاشایەتی

دڕوو: دڕک، چقڵ، دڕی

دڵڕەش: بێ بەزەیی، ستەمکار، دڵرەق، ڕکوونی

دامە: مۆر

دنگ: دینگ، ئامرازی چەڵتووک کوتان

دەڵەکدان: پاڵنان

دڕدۆنگ: دوودڵ، بەگومان

دوونیەتی: خوێڕیەتی، بچووکی

دەڵەچە: مەرایی کەر، ماستاوچی

دۆنکی: داردەستی حەسحەسی ناو بازاڕ

دیرۆکنووس: مێژوونووس

دەڕەڤی: هەڵەهات، ڕای دەکرد

دەرۆزە: گەدایی، سواڵ

داشۆ: کاکە، براگەورە

دەهری: زۆر توڕە

دەخەبتن: خەبات دەکەن

دۆغری: ڕاست، دروست

داغان: ڕووخان، وێرانکردن

دەغوول: دەسبڕ، خاپینۆک، فێڵباز، گزیکار

دوئێل: مبارەزە

دۆتمام: کیژەمام، ئامۆزا (بۆ کچ)

دەسەنە: بەخشین

دوڕ: ناوەند، ناوەڕاست، چەق

دێر، درەنگ، جێگەی ڕەبەنانی فەڵە

دەستقلێپ: ماڵبەفیرۆدەر





دۆتمیر: کیژەمیر، شازادەخانم

دەقوتاند"بەسەردەبرد

دلاوا: بەخشندە، دڵ تێر، بە دەست و دڵ

دادڤانی: دادوانی، قەزایی

دەمە قاڵە: دەمبۆڵە، دەمقڕە، دەمەقاڵێ

دێر: جێگەی ڕەبەنی خاچپەرست

دمۆر: دومۆر، شووم، نەحس

دەماوەر: قسەزان، وتەپاراو، چەقاوەسوو

دەقەتێ: دەبورێ

دەحکە: مشتومڕ، گەنگەشەی توند

دایەن: ئەو ژنەی شیر دەدات بە منداڵی خەڵکی، ژنی بەخێوکەری منداڵی خەڵکی

دەخەلەساین: ڕزگار دەبووین

دەساوێز: بیانوو، پەڵپ

دەڵەمە: دۆڵەمە، شتێک بە تەواوەتی نەمەیی بێت

دزێو: ناحەز، ناشیرین

دەسەجەمی: بە کۆمەڵ

داشدار: لایەنگر و پارێزەر، پاسەوانی قەڵا

دوم: کلک

دین: شێت

دەلال: جوان و ڕەزاسوول

ڕ:

ڕەقسین: سەما، هەڵپەڕین

ڕنەک: قەشەو

ڕدێن: ڕیش

ڕوندک: فرمێسک، ڕونتک، ئەسر، ئەسرین

ڕۆحانی: پیاوی ئایینی

ڕاز: نهێنی

ڕەژوو: زوخاڵ، خەڵوز

ڕک: کووڕ، ڕژد

ڕابوون: هەستان

ڕۆخانە: ڕووبار، چۆم، چێم، ڕوو

ڕند: جوان، خوشیک، خوشکۆک

ڕمووده: ئالوودە، هۆگر

ڕادەست: خۆبەدەستەوەدان

ڕەند: مێرخاس، مەرد، پیاوانە

ڕەقیب: نەیار، خەنیم

ڕیسک: مغامەرە

ڕیوەڵە: بچکۆلەی لاواز، بێنموود

ڕۆنیشت: دانیشت

ڕووپامایی: مەرایی، دەڵەچەیی، بن ڕیشەیی

ڕامووسان: ماچ

ڕەهەنە: ڕەهەندە، عەوداڵ، ئاوارە، چۆڵگەڕ

ڕەبەن: سەڵت، زوگورت، ڕاهب

ڕەبەنیتە: ڕاهبە، ژنە فەڵەی تەرکە دنیا، ڕەبەنی ژن

ڕاوگە: جێگەی ڕاووشکار

ڕیشخەن: گاڵتەپێکردن

ڕەعیەت: ڕایەت، مسکێن

ڕەزاسووک: ئێسکسووک، ڕەزاشیرین، دەلال.

ڕاجفرین: لەرزین، ڕاچڵەکین

ڕەدا: ڕازیبوون، قاییلبوون

ڕەخ: ڕۆخ، قەراخ، لا، کەنار

ڕازگر: مەحرەمی ڕاز، نهێنی پارێز

ڕۆزا: جۆرە گولێکە، گوڵی پیرۆز





ڕوودار: بێشەرم، ڕووقاییم، بێ چاوڕوو
ڕاڤە: واتا شیکردنەوە، تەفسیر
ڕایە: حەدد، شیاوی
ڕەتبڵاو: هزر و بیربڵاو، پەرتحەواس
ز:
زڕکیژ: کچی مێرد بۆ باوەژن، یان کچی ژن بۆ باوەپیارە
زێدە: زیادە
زەلام: گەورە، ناقۆڵا و تەژە
زار: دەم، دەو
زوڕییەت: وەچە و نەوە و نەتیرە
زێد: زاگە
زاگە: زێد، شوێنی لەدایکبوون، مەفتەن
زوخاڵ: ڕەژوو، خەڵووز
زگڕەش: ڕکوونی، بوغزن، کینە لە دڵ
زەوجین: زەماوەند
زڤڕینەوە: گەڕانەوە
زەیسان: زەیستان، ژنی تازەزاو
زەیەوان: زێوان، نیگابانی گۆڕ و گۆڕستان
زرانی: ئەژنۆ
زارۆک: بچیکان، منداڵان
زەردەکەن: بزە، زەردەخەنە
زەروو: زالو
زیانۆک: بە زیان، زەرەردەر، زیاندەر
زەحف: زۆر، فرە، مشە
زۆڵ: بیژ، حەرامزادە، زۆرزان
زەرگاڵ: پێڵاوی لە مووچندراو، بەلەک پێچ، گۆرەوی تا ئەژنۆ
زێبا: جوان، خشیک، ڕند، خشکۆک





زراف: باریک، شووش.

ژ:

ژێوان: پەشیمان

ژارخەن: پێکەنینی ژەهراوی، پێکەنینی تەوسامێز

ژارۆ: داماو، فەقیر، بەسەزمان

ژنەوتن: بیستن، ژنەفتن

س:

سەرزەنشت: سەرکۆنە، لۆمە

سەڵت: ڕەبەن، بێ ژن و منداڵ، عازەب

سەندەڵ: قاپقاپ، تەقتەقیلە

سپڵە: پێنەزان، بێ ئەمەک، بێوەفا، نمەکحەرام

سۆز: پەیمان، بەڵێن

ستران: گۆرانی، قام، لاوک

ستێران: ئەستێرە، ئەستێران

سپێدە: بەرەبەیان

سەوزەزار: مێرگ، مێرگوزار، چەمەنزار

سەمت: لا، ئالی، ڕەخ

سەربوردە: بەسەرهات، سەرگوزەشتە، سەربهورد

سەرگوروشتە: سەربوردە،

سخێف: جنێو

سەختگیر: توند و بەزەبت و ڕەبت

سیوات: خوێنەواری

سائەقڵ: شێتۆکە

سەربۆز: سەر ماشوبرنج

سیاناو: قوڕاو

سێوی: هەتیوو، منداڵی بێ داک و باب

سیکتر: دەرکردن، ترۆکردن





سونگی: قەمە

سەهەندە: بزۆز، نەسرەوت، زرینگ، ئاژاوەچی

سێبەندی: بێ شەرم و حەیا،

سابرێن: نێری، تەگە

سەرۆ: ئیلهام، سرووش

سازڤان: مۆزیکوان

سەرناڤ: ناونیشان

ستان: شار، پارێزگا

ستاندار: پارێزگار،متەسەڕیف

ساردخانە: مەیتخانە

سۆل: پێڵاوی سووکەڵەی بێ پانییە، نەعل

سەردولکە: گۆرانی هەڵگوتن بە مردوودا

ساڤالۆک: منداڵی تازەزاوی جوانکیلە

سەلبەند: ڕێگەی بە بەرد فەرشکراو

سیسەم: تەختە خەو، تەختە بەن

سوێ: ئازار، ژان

سیخار: زوقم

ساقەتە: لاسکی گیا

سەرگەڤار: سەرۆکی خێزان، گەورەی خێزان

سۆر: سوور، ڕەنگی سوور

سەوقاتی: دیاری

سالول: ژووری ئینفیرادی زیندان

سایمەل: جۆرێ نەخۆشیی ئاژەڵ و ماڵاتە

سووتلی: قەپاتمە، ژنی بێ مارەیی بۆ ڕابواردن

سەربهوورد: سەربردە، بەسەرهات

سیپاڵ: جلک، بەرگ و کول و پەڵ، کۆنەپەڕۆ

سۆزانی: جندە، قەحپە

سیقانەگر: مشتومالّنەگر

سوخەت: سیفەت

سلۆک: سرک، ڕەوەک، سڵ، بەپارێز

سفتە: چەک، کومپیالە، پسوولەی حەواڵە

ساپیتە: ساپیتک، میچ

سۆزە: گۆرانیی خەمبار، سۆز، گۆرانی بە دەنگی نزم

سرووش: سەرۆ، ئیلهام، وەحی

سەرەوگرد: سەرەوسێت

سندم: پێوەندی ئاسن.

ش:

شڕندە: ژنی دەمدرێژی شەڕانی بێحەیا

شڕپۆش: شڕۆڵە، بێ بەرگ و بار

شەیپوور: بۆقی، کەڕەنا

شام: شیو، شیڤ، خواردنی ئێواران

شکەفت: ئەشکەوت

شکەستەنی: ناسک، شتێ زوو بشکێ

شتاقیان، هیچیان، کەسیان

شنگ: هێز، تاقەت، توانا

شەقاو: هەنگاو

شلینگ: پارەیەکە

شاپ: شەق

شەکەت: ماندوو، هیلاک

شوورە: دیوار

شەڕبار: پڕشەڕ، شەڕانی

شەنگوڵ: بە دەماخ، کەیف خۆش

شەبەیخوون: پەلامار و هێرشی شەوانە

شەلاق: شەلاخ، قامچی

شەم: مۆم، شەمالک

شەمدان: مۆمدان، شەمان، جێگەی مۆم

شۆڤار: زمانشڕ، نێوانتێکدەر، جاسووس

شوو: مێرد، هاوسەری ژن

شەکەت: ماندوو. هیلاک

شاشک: مێزەر، پێچی مێزەر، شاشیک

شیرەت: ڕاوێژ، ئامۆژگاری

شیرەتکار: ڕاوێژکار

شادەتنامە: کارنامەی خوێندن

شۆخی: سوعبەت، گاڵتە

شیڤ: شێو، شام، نانی شێوان، نانی ئێوارە

شێلەو بێلە: فێڵ و تەڵەکە

شەواک: گەمژە، گێلۆکە، دەبەنگ، سائەقڵ

شێلو: لێڵ

شلک: ناسک و تورت، سست و خاو

شەجەرە: سەجەرە، لیستی ناوی باب و باپیران

شەلاق: شەلاخ، قامچی، جەڵدە

شەوبێری: شەونشینی، شەوکۆڕ و مەجلیسی دۆست و برادەران، شەڤرونک

شەقڵ: مۆرک

شەڤرونک: شەونشینی، شەوکۆڕ، مەجلیس و ئاهەنگی شەوانە

شەراشو: شەڕانی، جنگن، جینگن

شەپلە: نەخۆشیی ئیفلیجی

شکستۆک: نزیکە شکان، شکستەنی، شتی ناسکی نزیکە شکان.

شەهلەوەند: سوارچاک، لاوی شۆخوشەنگ.





ع:

عاسا: دارعاسا، داردەست

عەیار: زیتەڵ، زۆرزان

عەبەنووس: دارێکی ڕەش و ڕەق و بەنرخە

عەیان: دیار، ئاشکرا، لەبەرچاو

عەگید: ئازا، پاڵەوان، جامێر

عال: نایاب

غ:

غاڕ: ئەشکەوت

غوڕابی خەو: شیرنە خەو، خەوی قورس

غەوارە: غەریبە، بێگانە، نامۆ، ئاوەکی

ف:

فەرمایشت: فەرموودە، قسە

فەرخە: بێچوە مەل و جانەوەران

فشقیات: حەنەک، گاڵتەوگەپ، ئاخافتنی بێ تام

فراڤین: نیوەرۆژە، خواردنی نێوەرۆ

فەرسەخ: فەرسەق

فڕناخ: لووتبەرز، بەدەعییە، ڕوحزل، بە فیز و ئیفادە

فاما: فامیدە، تێگەیشتوو، زیرەک

ڤالا: بەتاڵ، خاڵی، پووک، ئاواڵە، کراوە

فەڕەنگی: ئەورووپایی

فەسات: گاینی ژنی بێگانە بە زۆر

ڤیان: خۆشەویستی، ئەڤین، ئەوین، دڵداری

فەرتووس: زورهان، پیری پەککەوتە

فەزیحەت: نەنگ، ڕیسوایی، مایەی ڕیسوایی

فیزماڵک: خۆدزینەوە

فیوداڵ مولّکدار، دەرەبەگ

فەڵە: دیان، مەسیحی

ق:

قالیچە: مافووری بچووک

قرمز: سوور

قەڕاڵ: پاشا

قەڕاڵنشین: پاشانشین، ئیمپراتۆریەت

قورباقە: بۆق

قاوەڵتی: تاشتی، بەرقلیان، نانی بەیانی، تێشت، قاوەتوون

قووچانی: هەڵهات

قشتیلە: بچووکی جوانکیلە

قالۆر: قاوغ

قاپ: قاچ

قاوغ: قەپێلک، قاپۆرە

قوشقی: توورە، وەرەز، سڵ، ڕەوەک

قەرقەشە: تەشقەڵە، شەرو ناخۆشی

قۆپی: زەلکاوی قامیشەلان

قەڵەمڕەو: سنوور و کەوشەنی ژێر دەسەڵاتی کەسێک یان دەوڵەتێک

قوو: باڵندەیەکە لە قاز سپی ترو زلترە

قەڵایی: کانزایەکی سپیی نەرمە مسی پێ سپی دەکەنەوە

قژاوڵە: تاق تاقکەرە

قاوش: هۆڵ، شوێنی نووستنی بە کۆمەڵ

قەساس: سزا، تۆڵە

قەرەبەخت: بەختڕەش، بەدبەخت، نەگبەت

قامک: پەنجە، ئەنگوست، پل، کلک

قامبێژ: گۆرانی بێژ

قەساو: قەساب

قەلەزراو: ترسنۆک





قەتاندن: بەسەربردن

قاقڕ: زەویی ڕووتەن کە گیای لێ نەڕوێ

قومات: بابۆڵەی ساواتێوەپێچان

قاشوانێ: گۆبازی، قاشوان

قەپاتمە: سۆیتەلی، ژنی بێ مارەیی بۆ ڕابواردن

قەموور: کووڕ، پشتکۆم، قەمبوور

قەستە سەر: دوژمنی زۆر سەرسەخت، خەتەر

قەبە: گەورە

قۆشەن: لەشکر

قرێر: بڕیار، قەرار

قەوماو: بویەر، ڕووداو

قاوەتوون: تاشت، تێشت، قاوەڵتی، نانی بەیانی

قیڕات: گەرماپێو

قرێژە بەرد: خەنە تیلکە،وردە شینایی پێکەوە نووساوی سەربەردان

قاپووت: پاڵتۆ، ساقۆ، بالاپۆش

قەواڵە: سەنەد، بەڵگەنامە

قەوغا: زۆر قەرەباڵغ و ئاوەدان

قرێتە: قرێدە، قلادەی ملی سەگ، ئەڵقەی ملی تاژی

قۆشمە: حەنەکچی، گاڵتەچی

قوڕنە: گۆشە، سووچ، قوژبن، سیلە

قەیچی: مقەست

قاودان: دەرکرن، جواوکردن.

قەبرغە: برک، قەبرخە، خالیگە

قووچاندن: ڕاکردن، هەلاتن. ڕەڤین.

قاقەز قوشی: کۆلارە.

ک:

کوت ومت: ەقاودەق

کوانگە: کوانوو، ئاگردان

کارمامز: بەچکە ئاسک

کودەڵە: بێچووە بەراز

کوختە: کۆخ، خانووی چکۆلەو خراپ

کوڵکە: موو، توک

کولۆ: کوللە

کەچرەوی: لەڕێلادان، تەحریفیەت

کەوەیی: شینکی، شینباو، خۆڵەمێشی

کێوە: بۆ کوێ

کەپەک: سۆس

کۆمەک: یارمەتی، هاریکاری

کلۆر: ناوبەتاڵ

کوریژگە: کوڕی بچووک

کەپوو: لووت، دفن

کەونارا: زۆرکۆن، شوێنەوار

کەسک: سەوز

کۆمیدی: پێکەنیناوی

کامکردن: نەوس تکان

کەزی: پرچ، زلف

کڵاوخود: کڵاوی ئاسنینی شەڕڤان

کەرب: ڕقوکینە

کان: مەعدەن

کێوستان: کۆسار، کۆجاڕ

کۆڵۆنی: موهاجیرنشین، نشیمەن، موستەعمەرە

کەمدوو: کەم قسە



گەمژە

کۆسار: کۆجاڕ، کێوستان

کەوی: ماڵی، دەستەمۆ

کەڤر: بەرد

کەڤرۆک: بەردەڵان

کەندەکار: کەسێک کە لە دار نەخش دەکەنێ

کێشکچی: پاسەوان، نیگابان

کۆ: سڵ، سڵکردنەوە

کەپوو: لووت، دفن

کارگە: وەرشە

کەرپووچ: خشتی سوورەوەکراو

کوند: بوەکوێرە، کوندەپەپوو، بایەقوش

کەودەن: گەوج

کاژستان: بێشەی دارکاژان

کرێت: ناشیرین، کاری خراپ

کەتواری: ڕیالیستی، واقیعی

کەوشەن: مەرز، سنوور، ئاقار، تخووب

کنوکۆ: چوونە بنجوبناوان، تۆژینەوە

کسۆک: سەگ

کەستەک: سندە گڵ، کڵۆ قوڕی وشکەوە بوو

کۆشیار: چالاک، پڕکۆشش

کینەکێش: ڕک هەڵگر، ڕکونی

کەت: تەختەخەو

کەرەمکە: بفەرموو

کەوە ڕۆژ: ڕۆژی بێ هەتاو، سپییە ڕۆژ

کۆما: کۆمەڵێک

کەترەخانە: خانەی پیران

کەشم و نەشم: جوانی و نازو عیشوە





کۆرفام: گێل، گەمژە، دەبەنگ، گەلحۆ، گەلۆر

کەپەنک: فەرەنجی، قاپووتی لباد

کلە سووتە: ڕووپامایی، کلکە لەقێ، ڕیایی و زمانلووسی

کۆجاڕ: کێوسات، کۆسار

کارەکەر: قەرەواش، خزمەتچی مێوینە، جێری

کەڵگیت: کەرکیت، هەپک، شانەی پۆ کوتانی تەون.

کەنیزەک: کارەکەر، کەنیز، قەرەواش.

کەوێڵ: کۆخ، کۆختە،خانووی چکۆلەی یەکچاوە. ئەشکەوت.

کوچەماڵ: کەناس

کەڵەموست: قامکی گەورە، کەڵە ئەنگوست، ئەنگوستە گەورە.

گ:

گۆساخ: چاوقاییم، ڕووقاییم

گەدا: پارسەک، سواڵکەر، دەرۆزەکەر

گورزە: باقەی گەورە

گەرەکمە: دەمەو، دەخوازم

گەمە: یاری، وازی، کایە

گەنج: زێروزیو، ماڵی دنیا

گەردنبەند: ملوانکە

گازکردن: بانگکردن

گۆرین: یارۆ، ناڤبری

گوند: دێ، ئاوایی

گومناو: ناوبزر، نەناسراو

گۆزینگ: قولەپێ

گەڵۆز: ناولینگ

گول: گەڕوگول

گاگۆز: پۆڵکە

گارد: پاسەوانی تایبەت

گۆنگ: ئاڵۆز

گەنگەشە: موناقەشە

گووراو: مەخلووق

گووفەک: زبڵدان، سەرانگوێلک

گازی: بانگکردن

گرۆز: ورکن

گڵکۆ: گۆڕ، ئارامگە

گمێز: پێشاو

گێچەڵ: گەڕ، تەشقەڵە

گەمشەک: گەمژە، گەوشەگ، گەمشۆ، شەواک، گێل، دێوانە

گاڵدان: هاندان بۆ کاری خراپ

گۆڵمەز: زەنازەنا، هەراوزەنا، دەنگەدەنگ

گەوشەک: بڕوانە گەمشەک

گەمشۆ: گێل، دێوانە، کەمفام، کاڵفام

گەوڕ: پشتیر، ئاغەڵ، تەویلە

گۆڵ: سەگی نێر.

ل:

لە کەیفان: لە خۆشیان

لە بیلادەوە: لە ئیجادەوە، لە بنەڕەتەوە

لیرەوار: دارستان، جەنگەڵ، بێشەڵان

لاپرەسەن: فزوڵ، فزوڵی

لۆسە: باری

لەزگ بوو: خەریک بوو، وەخت بوو، نزیک بوو

لێ: بەڵام

لێبڕا: بڕیاری دا

لۆسە: باریە

لاق: قاچ، لنگ





لەزکرن: خێراکردن، پەلەکردن

لایدە: بێگانە

لەهەنبەر: بەرانبەر

لێ: بەڵام

لەیستۆک: بووکەشووشە، بووکەڵە

لەگەز: مەتەڵ، مەتەڵۆک

لەش بەبار: نەخۆش

لەگین: ڕەنگە، لەوەیە

لەوتاوە: پیس بووە

لەز: خێرا، پەلە

لەبڕ: یەکسەری، بە قۆنتەرات

لاشەڕ: بێوەی، سەلامەت، دوورە شەڕ

لاکەوە: لاچۆ، برۆ کەنار

لەنک: لەکن، لەجەم، لەدەف، لەلا

لەگام: چەورە، زگ لەوەڕێن

لێژگە: لێژایی، نشێو

لێبۆک: لەودە، حەنەکچی، فێڵباز، موهەڕیج

لچ: لێوی خوارەوە

لوشکە: لوشک، جووتە

لاتریسکە: لادان لە ڕێگە

لات: نەدار و فەقیر، بێنەوا، پەریشانحاڵ

لەلە: نۆکەری زارۆکبەخێوکەر

لاڤە: پاڕانەوە

لە عەلەیی: لە دژ

لە یەکبینە: بەردەوام، پەیتاپەیتا، لەپەستاو بێ بڕانەوە

لەزێکە: پەلە بکە، خێرا بکە، بلەزە

لوقمان: دکتۆر، حەکیم





م:

موغازە: فرۆشگە، دوکان

مێریڤان: دلۆڤان، میهرەبان

مشوور: تەگبیر، بەخەم کردن

مژوول: سەرقاڵ، سەرگەرم

ملۆموش: ملۆمۆ، گەران و بۆنکردنی زەمین بۆ پەیداکردنی خواردن

مۆڵ: زۆر، فرە، زەحف

مژمژە: مەساسە

میرغەزەب: جەلاد

مەزرا: کێڵگە

مقاش: ماشە

مەگیرانی: بێزوو

مەرزو بۆ: وڵات، نیشتمان

مقەوا: کارتۆن

مەنهۆڵ: زێراب

مەزڵ: قۆناغ، جێی مەبەست

میرەبان: دلۆڤان، میهرەبان

ماڵبات: خانەوادە، بنەماڵە

مدارا: سەبرو حەوسەڵە، دڵراگرتنی دۆست و ئەحباب

مووبەق: ئاشخانە

موغەیری: موغاری، بوغاری، کوانووی نێو دیوار

منجڕ: نەژنەو،سوور لەسەر شتێک

مسکێن: ڕەعییەت، بەرحوکمی ئاغا

مەعلان: پسپۆڕ، لێزان

مخابن: بەداخەوە

مراک: کەوچک، کەچک

مینا، میناک: وەک، وەکو





مەخفەر: پۆلیسخانە، قەرەوڵخانە

مادونی: مۆڵەت، ئیجازە

مەرگی مفاجا: سەکتەی دڵ

مەحزەر: نووسینگەی مارە و تەڵاقان

مەژی: مێشک

مامۆژن: ئامۆژن، ژن مام

مافور: قالی

مەتەرێز: مەتەرێس، سەنگەر

مامێر: ڕەبەنیتەی بەتەمەن

ماسێر: ڕەبەنیتەی گەنج

متوو: هۆگر

مرداو: قۆپی

مالیجە: چارەسەر، عیلاج، معالەجە

مەدام: خا، خاتوون، خانم، خات، یا

مجێز: میزاج، مەجاز

مەحتەل: ماتەڵ، دێرکەوتن

ماخۆلیا: ئەسپەک، نەخۆشییەکی مێشکە، گێژوحۆل

مەکتەبلی: قوتابی

مەخسەرە: گەپچاڕ

مۆڕە: خێسە، ڕوانین بە چاوی زەق و توڕەیی

مەچیر: داوەبەن، دەزوو، تاڵ

مێردەک: بۆرە پیاو

مێژەلۆک: لقی بڕاوەی ڕەز

مەعاف: بەخشراو، ڕەوا

موزیر: زیانۆک، زەرەردەر

میانساڵ: ناڤساڵ

مۆزە مۆز: دەورو خولدان بە مەبەست و تەمایەک

مۆرانە: جانەوەری دارخۆر

مەردمازار: ئەزیەتدانی خەڵکی

مشە: زۆر، فرە

مامێز: مامزە.

مامز: ئاسک، کەژاڵ

مەهوەش: وەک مانگ، مانگ ئاسا.

ن:

نەزاکەت: ئەدەب، سەلاری

نیگابان: پاسەوان

نەیجەزار: قامیشەڵان

نسیبەت: بەڵا، موسیبەت

نەترە: ورە

ناچیز: هیچ، زۆر کەم

نەژاد: ڕەگەز، ڕەچەڵەک، ئەسڵ

ناحەز: ناشیرین

نێچیرڤان: ڕاوچی

نشیمەن: بارەگا، شوێنی دانیشتن

نەزاکەت: لوتف و ئەدەب

نک: کن،لا، جەم، دەف

ناڤبری: ناوبراو

نەژنەو: نەبیست، منجڕ

نمەد: لباد، نیوداشت: نە کۆن و نەتازە

نها: ئێستا، هەنووکە، نهوو

ناڤساڵ: میانساڵ

نووکە: هەنووکە، نهو، نها، ئێستا

نەخاسما: بە تایبەتی

نەسرانی: فەڵە، مەسیحی، دیان

ناباب: ناباو، دژەباو، ناپەسند لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە

نۆبەرە: یەکەم منداڵ، یەکەم بەر

نەپەرژان: دەستنەگەیشتن، فریانەکەوتن، پێڕانەگەیشتن

نێرەوەز: نێرینە، نێر ڕەگەز

نەپرینگانەوە: سڵنەکردنەوە، کۆنەکردنەوە، سڵنەکردن

نیونەخت: یەک دەم، یەک سات

نێش: چزوو

نەساغ: نخۆش

نمەکناسی: ئەمەگداری، وەفاداری

و:

وەمێنێ: بمێنێتەوە

وەکرد: کردەوە

وەشێرت: شاردەوە

وێنا: تەسەور

وار: هەوار، شوێن، مەڵبەن

واز: کراوە، پێچەوانەی داخراو

وێ دەدەم: دەدەمێ

وەقفکردن: تەرخانکردن

وەردەوەدان: لە جارێ پتر کێڵان

وەردیان: زیندانەوان

وەشانخانە: بڵاوەخانە، دارالنشر

وەشانکار: بڵاوکەرەوە، ناشر

وڕاوە: وڕێنە

ودم: مومبارەکی، پیرزی

وشکەبار: میوەی وشکەوەکراو

وەکوژاندن: تەمراندن، کوژاندنەوە



گەمژە

وێمدە: بمدەیە

واز: ئیشتیاو ئارەزووی خواردن

وەزەن: ئازار

وشترالوک: حوشتر خۆرە، عاگول

وازوازی: دەمدەمی مجێز

وێڵ: ماریفەت

وانێک: یارۆ، هین

وڵە: نەمەییوی تەواو

ە:

هانکە هانک: هەناسە برکێ

هەژگ: لکەداری وشکەوەبوو، چڕوچیلکەی ئاوردوو

هەڕوگیف: هەرەشە و گورەشە

هەڵدێر: جێگەی زۆر بەرز و قیت لە شاخ و کێودا

هەزاربە هەزار: شاخی زۆر بەرز و عاسی

هەڵزنان: هەڵگەڕان بۆ سەرەوە

هایم: سەرگەردان، وێڵ

هەنبەر: بەرانبەر

هەترەش: زەندەق، زراو

هەنووکە: ئێستا، نها، نهوو

هۆشن: بەهۆش

هەتەر: مەودای حوکمی چاو

هۆڤی: کێوی، وەحشی

هۆدە: ژوور، ئۆتاغ، دیوو

هزرو هزرین: بیر و بیرکردنەوە

هەیڤ: مانگ

هەیڤەشەو: مانگەشەو

هەدا: سەبر، حەوسەڵە





هەراوزەنا: هەراوهەنگامە

هەڕەمە: تێکەڵوپێکەڵ، گەنم ودانەوێڵەی تێکەڵکراو، هەڕەت، جەنگە، تاف

هاپۆ: مام

هەڵەشە: لەسەر، بێ ئەقڵ

هەرەت: تاف

هەتوان: مەرهەم، مەڵحەم

هەڤرک: ملەکەر، ململانێ، ڕکبەڕکێ

هەڕوو: هەڕە، بڕۆ

هەنگێ: هەینێ، ئەوسا

هەشتاو: پەلە، لەز، خێرا

هاوکوف: دوو کەسی لە یەک ئاستی کۆمەڵایەتی

هاودەستی: هاوبەش لە کەین و بەینان

هەیڤۆک: هەیڤک، مانگیلە، مانگی یەک شەوە

هێورین: حەوانەوە

هاماج: ئۆتمۆسفیر

هەڵاوێردن: جیاکرنەوە

هاتە وەشاندن، بڵاو کرایەوە

هزرڤان: بیرمەند، زانا

هەنیە: تەوێڵ، ناوچەوان

هەلاکەت: گیانەڵڵا، ئاویلکە، ئاوزینگ، حاڵی مردن

هەڵاژیان: ڕاکشان

هاژۆتن: لێخوڕین

هێم: بناخە، بناغە

هاوسونح: هاوساڵ، هاوتەمەن، هاوزا

هاو وازی: هاوگەمە، هاوکایە، هاوبازی

هەوسار: ڕێشمە، دەستە جڵەو

هاوقەتار: هاوکار و پیشە، هاورێ، دۆست

هەمێز: ئامێز، باوەش

هزرین: بیرکردنەوە

هەڵەت: زەرد و ماهی زۆر سەخت.

هەراشتر: گەورەتر، پێگەیشتووتر

هەرە: مشار.

هۆشی: گوڵەوەچنی.

ی:

یاڵ: تووکی سەر ملی شێر و یەکسم

یەک هاوی: یەک جۆر، یەک دەست، بێگۆڕان

یارۆ: فلان

یاتاخ: پێخەف، نوێن

یەختە: خەسێنراو، گوندەرهێنراو

یونیفۆرم: جلکی فەرمی یەکچەشن

یاوەگۆیی: وڕاوە، وڕێنە

یا: خا، خات، خاتوون، خانم، وشەی ڕێزە بۆ ژنی گەورە.

یەغدان: یەخدان، سەنوقی دارینی گەورە.

من دەمێکە چاوەڕوانم کە هەموو شتێکت بۆ بگێڕمەوە، لە هەمو شتێکت ئاگادار بکەم. لەو کاتەوە کە لەوێندەرەوە نامەکەت بۆ ناردبووم چاوەڕوانم، بگرە لەپێشتریشەوە... دوێ شەو تەنیا نیوەی ئەو شتانەم بۆ گێڕایتەوە کە حەزم دەکرد پێتی بڵێم و لێی ئاگادار بیت. جا من تۆ بە شەریفترین و ڕاستگۆترین مرۆڤ دەزانم. زۆر شەریفتر و ڕاستگۆتر لە هەر کەسێکی دی. جا ئەوانەی کە دەڵێن مێشکت... یانی هەندێجار لە ڕووی دەروونیەوە... گوایە مێشکت تەواونیە، نەخۆشە، نابەجایی دەکەن، بێ مروەتیە. من قەناعەتی تەواوم بەم قسەیەی خۆم هەیە و گەنگەشەم لەگەڵ هەمووواندا کردووە. جا ئەگەر هەندێجار جۆرە نەخۆشیەکیش لە ئەقڵ و مێشکی تۆدا سەرهەڵبدا (ببورە کە وا دەڵێم، من هیچ مەبەستێکی خراپم نیە) ئەوا زەین و زیرەکی بنەڕەتی تۆ، لە هی یەک بە یەکی ئەوانە زیاتر و باشترە، زەین و زیرەکی تۆ زیرەکیەکە کە ئەوان بە خەونیش شتی وا بەخۆوە نابینن.



بەرگ : ئیبراهیم ساڵح

